# ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودەکاندا.

نووسینی

محمد ملا فائق شارەزووری

بەرگی دووەم چاپی یەکەم

دار المعرفة
بیروت - لبنان

# ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودەکاندا.

نووسینی

محمد ملا فائق شارەزووری

بەرگی دووەم

چاپی یەکەم

١٤٣١ك

٢٠١٠ز

دار المعرفة

بەیرووت

📖 ناوی کتێب : ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە قورئان و فەرموودەکاندا.

✍نووسینی : محمد ملا فائق شارەزووری.

۞ژمارەی لاپەڕە: ٥٣٧

۞ بەرگی : دووەم

۞نۆرەی چاپ: یەکەم

۞ ژمارەی تیراژ: ٢٠٠٠

۞ چاپخانەی: دار المعرفة

۞ساڵی چاپ : ١٤٣١ز - ٢٠١٠ز.

۞ژمارەی سپاردن: (٤٨٣)ی ساڵی ١٩٩٩ز.

**تێبینی :**

**بۆ دەست کەوتنی ئەم بەرهەمە بە(کۆ) پەیوەندی بکە**
**بەم ژمارە مۆبایلەوە : ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥**

**لەدوعای خێر بێ بەشمان مەکەن**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ (آل عمران :١٠٢).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ (النساء /١).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ (الأحزاب :٧٠-٧١).

أما بعد فإن أصدق الحديث كتابُ الله ، وخير الهدى هدى محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .[1]

سوپاس بۆ خوای گەورە کە ڕێز و شکۆی پێبەخشین و بردینیە ڕیزی ئەوانەی شەرەفی نوسینی ژیانی پێغەمبەرە شکۆدار و خۆشەوستەکەی (محمد) ﷺ پێبەخشیون بۆ ئەوەی خۆیان و کەسانی تر بەهرەمەندتر بن لە نزیک باسەی ئەو پێغەمبەرە بەڕێز و سەروەرە.

---

[1] هذه خطبة الحاجة التي كان الرسول (ﷺ) يفتح بها خطبة * ويعلمها اصحابه * وروي هذه الخطبة ستة من الصحابة (رضوان الله عليم) وقد أخرجها جمع من الأئمة في مصنفاتهم ، مثل : الامام احمد في (المسند) (٢٧٢/٥) ، ومسلم في (الصحيح): (٤٦٧/٥٩٢/٢) ، وفي (١٣٥/٦، ١٥٦، ١٥٧ – بشرح النووي)، وابوداود في(السنن) (٢٨٧/١) رقم (١٠٩٧) ، والنسائي في (المجتبى) (١٠٤/٣ – ١٠٥) و (١٨٨/٣) ، وابن ماجة في (السنن) (١٨٩٢) ، والحاكم في (المستدرك) : (١٨٢/٢ – ١٨٢)، والطيالسي في (المسند) رقم (٣٣٨) ، والبيهقي في (السنن الكبرى): (١٤٦/٧) و (٢١٤/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (١٥٣٥) ، وفي (صحيح النسائي) (١٣٣١) ، وفي (المشكاة) (٣١٤٩) ، وفي (الكلم الطيب) (٢٠٥) ، وانظرها بتوسع في: ( خطبة الحاجة ) ص(١٤-١٩) .

خوێنەری بەڕێز ئەم نوسینەی بەردەستت کۆکردنەوە و پوختەکردن و ڕێکخستنی سەدەها ڕیوایەتی فەرموودەیە لەگەڵ گێڕانەوە و ڕیوایەتی (ژیاننامە نوسان). لەبەر ڕۆشنایی نوسراوە گەورە و بە پێزەکانی کۆن و تازەیی ئەم بوارە، هەوڵدانە بۆ خستنە ڕووی ڕووداوەکان یەك لە دوای یەك وەك (فلیمێك) کە لە پێش چاودا نمایشت بکرێت واهەست بکەیت کە تۆش یەکێکیت لە ئامادە بووانی ئەو ڕووداوە وە تام و چێژی تایبەتی خۆتی لێ وەربگریت.

خوێنەری بەڕێزم ئەم نوسراوەی وەرگیراوە لە قورئانی پیرۆز وە هەروەها کەلك وەرگیراوە لە بۆ چونی زانایانی (تفسیر)ی قورئان. پاشان وەرگیراوە لەو فەرموودانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویانەتەوە لە وتە و هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەرمەی ڕووداوەکاندا، ئەمەش لەدوای کۆکردنەوەی سەرجەم ئەو فەرموودانەوە پاشان پوختەکردنیان و دیاری کردنی (صحیح ،ضعیف) یان لەبەر ڕۆشنای حوکمی شارەزاترین زانایانی بەرز و ناوداری کۆن و تازەی ئەم بوارە، و هێنانی هەر حوکمێك هەرچەنده کەمیش بێت سەبارەت بە یەکلاکردنەوەی پلەی فەرموودەکە. پاشان هەموو بەشەکانی ڕووداوەکان وەرگیراوە لە زۆربەی (طرق+الفظ)ە جیاوازەکانی ئەو باسە و ڕێکخراوە تا وەك یەك فەرموودەی تەواوی لێکدانەبڕاوی لێ هاتووە.

پاشان ئەم باسە وەرگیراوە لە کۆنترین سەرچاوە نوسینەکانی شارەزایانی بواری (أهل المغزي و السير) واتە: ژیاننامە نوسان وەك (عروة بن الزبير) و (الشعبي) و (قتادة) و (الزهري) و (موسى بن عقبة) و (ابن اسحاق) و (طبري) و (ابن سعد) و (واقدي) وەنوسراوە پوخت و بە پێزەکانی زانایانی گەورەی ئەم بوارە وەك (ابن حزم) و (ابن القيم) و (ابن كثير) و (الذهبي) و (ابن حجر). وە هەوڵدراوە ڕووداوەکانی لای ئەمانیش ڕێك بخرێت لەگەڵ یەکدا و پاشان لەگەڵ فەرموودەکاندا وەك یەك باسی تەواو بنوسرێت.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم نوسراوەی بەردەستت ناوی (ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودە صحیحەکاندا) هەڵدەگرێت بەڵام شتێکی ئاشکرایە لای هەمووان کە زۆرێك لە ڕیوایەتەکانی (مرسل)ن یان (ضعیف)ن و زۆربەی زانایانیش هێناویانە تا

پاسرین و بابەتەکانیان پێ دەوڵەمەند تر بکرێت و بەلایانەوە خراپ نەبووە بەمەرجێك ئەو فەرموودانە دووربن لە بواری (العقيدة، احكام الشرعية).

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە زۆر سوپاس و پێ زانین و دەست خۆشی خۆم بکەم لە مامۆستا و برای بەڕێزم کاك (جمال محمود صالح) کە بەڕاستی ڕۆڵێکی گەورە و سەرەکی بینی لە زووتر بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە لەڕووی وەرگێرانی زۆربەی باسەکە لەدوای پێداچونەوەی چەندەها جاری خۆم. داواکارم خوای گەورە بیکاتە یەکێك لە شارەزایان و خزمەتکارانی ئەم ئاینە پیرۆزەی خۆی و زیاتر توانا و زانین و کاری چاکەی پێ ببەخشێت آمین.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە یارمەتیمان بدات بۆ تەواو کردنی ئەم باسە پیرۆزە وە لێمان وەرگرێت وە بیکاتە جێی سودی سەرجەم برایان و خوشکانی موسوڵمانی بەڕێزم و لە هەڵە و نەزانی و کەم و کوڕیەکانمان ببورێت و بمان بەخشێت و هەموولایەکمان شادبکات بەبینینی و بەیەك گەیشتنی هەموو باسکراوانی ناو ئەم ژیاننامەیە لە بەهەشتی بەرین و پڕ لە نازونیعمەتدا بەتایبەت لە سەرو هەموانەوە سەروەری نەوەی ئادەم پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان هاوەڵانی بەڕێزی و تابیعیەکان و سەرجەم پێشینە چاکەکانمان و هەموو زانایانمان. آمین.

محمد ملافایق شارەزووری

١٤/رمضان/١٤٣١ك

## سریە و غەزاکانی نێوان ئوحود و خەندەق

غـەزای ئوحـود ئاسـەوارێکی گرانـی لەسـەر موسـوڵمانان جـێ هێشـت، جولەکـەکان و دووڕووەکـان دووژمنایـەتی خۆیـان ئاشـکرا کـرد بـۆ پێغەمبـەر و ئاینەکـەی و کەوتنـە دوورخستنەوە و ساردکردنەوەی خەڵکی لە چوونە ناو ئاینی ئیسلامەوە.

ئیبن شیهابی زوهری (رحمه الله) دەفەرموێت: (دووڕووەکان لـەکاتی گریـانی موسـوڵمانەکان پیلانیـان دەگێڕا لـە دوورخستنـەوەی خـەڵکان لـە چوار دەوری پێغەمبـەر ﷺ و دەکەوتنـە غەمبارکردنی موسوڵمانان، وە ئاشکرا بوو فێڵ و پیلانـی جولەکـەکان، و دووڕووەکان ئەو قسانەی کـە لەپێشـدا نـەیان دەتـوانی بیڵێن دوای ئـەم کارەسـاتە بـە ئاشـکرا دەیـان وت و جموجۆڵیـان دەست پـێ کـرد. جولەکـەکان قسـەلۆکیان بڵاودەکـردەوە و دەیـان وت: ئەگەر موحەممەد پێغەمبەر بوایە نەیان دەتوانی سەرکەون بەسەریدا، و ئاوهـای بەسـەر نـەدەهات، بـەڵام موحەمـمـەد تـەنها پاشـایەتی دەوێـت جارێـك سـەردەکەوێت و جارێـك دوژمنـانی سەردەکەون، ئەمەش کاری دونیـا ویستیە و دوورە لـە پێغەمبەرایـەتی، دووڕووەکـانیش بـە موسـوڵمانانیان دەووت: گـەر ئێـوە قسـەی ئێمـەتان جـێ بـەجێ بکردایـە ئاوهاتـان بەسـەر نەدەهات)[١].

## سریەی ئەبو سەلەمە بۆ ناوچەی (قطن)

وردەکاریـەکانی ئـەم سـریەیە تـەنها واقیـدی باسـی کـردووە ئـەویش (مـتروك)ە و ڕیوایەتەکەی وەرناگیرێت، بەڵام بۆ ئاشنابوون کورتەکەی باس دەکەین: (هەواڵەکان گەیشتن بـە پێغەمبـەر ﷺ کـە (طلحة) و(سـەلەمە) هـەردوو کـوڕی خوەیلـد خۆیـان و هۆزەکەیان لەگەڵ گوێ ڕایەڵانیان لە (بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمـە)خۆیـان ساز دەکـەن بـۆ جـەنگ و پەلاماردانی موسوڵمانان، بۆیە دەست بەجێ پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نـارد کـە (١٥٠) کـەس بوون وە ئەبوسەلەمەی کردە سەرۆکیان و ئالاکەی دایـە دەسـت، سـریەکە بـەڕێ کـەوتن، لە

---

(١) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٢١٦).

ناکاودا پەلاماری دوژمنیان دا، و دەستیان گرت بەسەر هەندێك وشتر و ئاژەڵدا و دوژمن ڕای کرد، و پاشان لەسەرەتای مانگی (المحرم)دا گەڕانەوە شاری مەدینە)[٢].

## ناردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت:

(پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی سولەمی نادر بۆ لە ناوبردنی سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای نەبیحی هوزەلی پاشان لحیانی) کە لە دۆڵی عورنەی بەردەم دەشتی عەرەفەی پشت مەککەوە بوو، لەوێدا خەڵکانێکی لێ کۆ بوونەوە بە مەبەستی خۆسازدان بۆ هێرش کردنە سەر موسوڵمانان.

عەبدوڵڵاش ڕۆیشت و لە ڕێگەدا لەگەڵ خەڵکانی ئەو ناوچەدا بەرێکەوت بوو خۆی بەیەکێك لە هۆزی خوزاعە دەناساند، و بە هەر کەسێك بگەیشتایە پێی ڕادەگەیاند کە ئەو دەیەوێت خۆی بگەیەنێتە سوفیانی هوزەلی، تا عەبدوڵڵا بە ڕێکەوت خۆی گەیاندە سوفیانی هوزەلی کەلەو کاتەدا لە دۆڵی عورنە بەرێکەوتبوو وە هەموو ئەحابیشەکانی هاوپەیمانانی چواردەوری کەعبەی بە دواوە بووە عەبدوڵڵا دەڵێت: کاتێك کە سوفیانم بینی زۆر زۆری لێ ترسام وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە، پاشان خۆمم بۆ مەڵاس داو لە کەمینیدا بووم بۆی تا خەڵکان ئارام بوون و حەوانەوە پاشان فەرستم لێ هێنا و لە ناوم برد)[٢].

وردەکاریەکانی ئەم بەسەرهاتە لە دوو ڕیوایەتدا هاتووە:

١- ڕیواتەکەی (ئیمام ئەحمەد) لە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

(پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم و پێی وتم: (هەواڵم پێ گەیشتووە کە خالدی کوڕی سوفیان نەبیحی هوزەلی خەڵکان کۆ دەکاتەوە بۆ جەنگ لەگەڵ مندا لە ناوچەی (عورنە) لە ڕیوایەتێکی تردا (لە نەخلە) تۆش بگەرە ئەو کەسە و بیکوژە) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری

---

[١] انظر: (المغازي) للواقدي (٣٤٢/١)، (الدلائل) للبيهقي (٣١٩/٣).

[٢] انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٤٠/٤).

خوا ﷺ شێوەیم پێ بڵێ تا بیناسمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نیشانەی ناسینەوەی نێوان تۆ و ئەو ئەوەیە کە دەیبینیت شەیتانت بیردەکەوێتەوە و هەست دەکەیت لە ڕزۆکە)).

عەبدوڵڵا دەفەرموێت: منیش شمشێرەکەم لەگەڵ خۆم برد تا گەیشتمە لای لە ناوچەی عورنە ئەو لەگەڵ یەکێك لە ژنەکانیدا جێگەیەکیان چاك دەکرد، ئەویش لەکاتی نوێژی عەسردا بوو، کاتێك کە بینیم بەو شێوازە لە ڕزۆکیەی ناسیمەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کرد بووم، لەوێدا ترسام کە هەوڵدانم بۆ لە ناوبردنی ببێتەوە هۆی لەبیر چوونەوەی نوێژەکەم [و لە دڵی خۆمدا وتم: دەترسم هەوڵ و پەلامارەکەم بۆ لە ناوبردنی ببێتە هۆی دواخستنی نوێژەکەم] بۆیە هەر بەرۆیشتنەوە ڕووبە ئەو نوێژەکەم کرد و ئاماژەم بە بەرزکردنەوە و نزم کردنەوەی سەرم دەکرد لە (رکوع) و (سجود)دا تاگەیشتمە لای و ئەو پێی وتم: پیاوەکە کێی ؟ منیش وتم: پیاوێکی عەرەبم باسی تۆ و ئامادەکردنی سوپاکەتم دژ بەو پیاوە پێی گەیشتووە و هاتووم [تاکۆمەکیت بکەم] لەو کارەتدا. وتی: بەڵێ من سەرقاڵی ئەو کارەم. منیش تۆزێك لەگەڵیدا ڕۆیشتم تافرسەتم لێ هێناو بەشمشێرەکەم لێمدا تا کوشتم و هەڵهاتم ئینجا ژنەکانی گەیشتنە سەری و ئەو ناوەم بەجێ هێشت و گەڕامەوە لای پێغەمبەر ﷺ و کاتێك منی بینی فەرمووی: ((افلح الوجه)) واتە: ڕووخسارت ئازاد و ڕزگار بێت و سەرکەوتنت پێوە دیارە. منیش وتم: من ئەوم کوشت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ڕاستت کرد) پاشان هەستا و منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ناو ماڵەکەی خۆی و گۆچانێکی کوڵی دایە دەستم و فەرمووی: ((أمسك هذه عندك يا عبد الله – في رواية– [تخصر بهذه حتى تلقاني])). واتە: ئەمە بە دەستەوە بگرە تاکو بە من دەگەیت. منیش لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ چوومە دەر و ئەو گۆچانەم بەدەستەوە بوو هاوەڵانم پێیان وتم: ئەم گۆچانە چی یە بەدەستەوە؟ وتم: ئەم گۆچانە پێغەمبەر ﷺ پێ بەخشیم و داوای لێ کردم کەلای خۆم بیهێڵمەوە، وتیان: بۆچی ناگەڕێیتەوە پرسیاری ئەو گۆچانە لە پێغەمبەر ﷺ بکەیت؟. منیش گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم گۆچانەت بۆ پێ بەخشیم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((آية بيني و بينك يوم القيامة إنّ أقل الناس المتخصرون يومئذ)) واتە: ئەو گۆچانەم پێ بەخشیت تا نیشانەیەك بێت لە نێوان من و تۆدا لە ڕۆژی قیامەت لەو ڕۆژەدا کە زۆرکەم لە خەڵکان نیشانەی وایان

بەدەستەوە بێت. عەبدوڵڵا دەفەرموێت: عەبدوڵڵای باوکم لەو ڕۆژەوە لەگەڵ شمشێرەکەیدا بوو وە هەردەم لەگەڵی بوو تا مرد و دواجار کرایە ناو کفنەکەی و بەیەکەوە نێژران)[1].

٢- ڕیوایەتەکەی (ابو نعیم) لە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی جوهەنیەوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(جارێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من لي بخالد بن نبيح)). واتە: کێ هەیە خالدی کوڕی نبیح)م بۆ لە ناو ببات. ئەو ڕۆژە (خالد) پیاوێکی هۆزی هوزەیل بوو نیشتەجێی شیوی عورنە لای کێوی عەرەفە بوو عەبدوڵڵا دەفەرموێت: من لەوەڵامدا وتم: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارە ئەنجام دەدەم بەڵام شێوە و ڕوخساری ئەو پیاوەم بۆ ڕوون بکەرەوە. فەرمووی ((اذا رأيتهُ هبتهُ)) واتە: هەرکات ئەو پیاوە ببینیت زۆری لێ دەترسیت. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی تۆی بەم پەیامە ڕاستیە ناردووە تا ئێستا لە هیچ شتێك نە ترساوم.

عەبدوڵڵا بەڕێکەوت تا خۆی گەیاندە کێوەکانی نزیك عەرەفە پێش ڕۆژ ئاوابوون. عەبدوڵڵا دەڵێت: کە بەو پیاوە گەیشتم و بینیم زۆری لێ ترسام ئەو کات دڵنیا بووم ئەمە ئەو کەسەیەکە پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردم.

ئەو پیاوە بەمنی وت: تۆ کێیت؟ منیش وتم: بەدوای کارێکدا هاتووم ئەم شەو جێگەم دەکەنەوە؟ وتی: باشە وەرە لەگەڵم. منیش بەدوایدا ڕۆیشتم و نوێژی عەسرم بە دوو ڕکاتی خێرا ئەنجام دا و ترسام هەستم پێ بکات. هەر لە دوایە ڕۆیشتم تا فرسەتم لێ هێناو بەشمشێرەکەم لێمدا و کوشتم وپاشان ڕام کرد و دەرچووم تا خۆم گەیاندەوە شاری مەدینە و چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە پاشان پێغەمبەر ﷺ کورتە گۆچانێکی پێ بەخشیم و فەرمووی: ((تَخَصَّرْ بهذه حتى تلقاني، واقل الناس المتخصرُون)) واتە: (ئەم کورتە گۆچانە بە دەستەوە بگرە تا بە من دەگەیت لە قیامەتدا چونکە

[1] اخرجه: أحمد (١٦٠٤٨،١٦٠٤٧)، وابو داود (١٢٤٩)، وابو يعلى (٩٠٥)، وابن حبان (٧١٦٠)، والبيهقي (الدلائل) (٤٢/٤) وفي (الكبرى) (٢٥٦/٣) واسناده رجاله ثقات كما قال محقق (مسند أبي يعلى) (٢٠٣/٢)، وقال ابن كثير في (التفسير) (٢٩٥/١): إسناده جيّد، وحسن إسناد أبي داود – الحافظ في (الفتح) (٤٣٧).

کەمترینی خەڵکان لە ڕۆژەدا ئەم نیشانە و کورتە گۆچانەیان بە دەستەوە دەبێت) واتە: کەمترینی خەڵکان لە ڕۆژی کۆتایدا کردەوەی وەهایان دەبێت کە خۆیانی پێ ڕاگرن.

(محەممەدی کوڕی کەعب ﷺ دەفەرموێت: عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی وەسیەتی کرد کە ئەو گۆچانە لەگەڵیدا بکرێتە گۆڕەکەیەوە، ئەوە بوو عەبدوڵڵا وەفاتی کرد و گۆچانەکەی کرایە سەر سکی و کفن کرا و هەر دوو بەیەکەوە نێژران)[5]. ناوی ئەو پیاوە لای هەندێك (سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی نەبیح)ە وەکو موسای کوڕی عوقبە فەرمووی[6]، وەلای هەندێکی تر ناوی (خالدی کوڕی سوفیانی هوزەلی یە) وەکو ئیبن ئیسحاق و و ئیبن هیشام دەفەرموون[7]، وەلای هەندێکی تر ناوی (خالدی کوڕی نەبیحی عەنبەریە)[8].

## ناردنی هەندێك بانگخواز بۆ (الرَّجیع)

هۆزی هوزەیل هەوڵی تۆڵە سەندنەوەی سوفیانی هوزەلی یان دەدا لە موسوڵمانان و بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە دەستیان دایە غەدر وخیانەت و ناپاکی دژ بە موسوڵمانان.

واقدی (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەنو لحیان تیرەیەکی هۆزی هوزەیل بوون چوونە لای خێلی (عەضل و قارە) و هەندێك پارەیان پێ بەخشین تا بڕۆن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و داوای لێ بکەن تا چەند کەسێك لە هاوەڵانی لەگەڵیاندا بنێرێت و خەڵکان بانگەواز بکەن بۆ ئاینی ئیسلام و تێیان بگەیەنن بۆ ئەوەی دواجار ئەوان بتوانن دەست بەسەریان بکەن و پارەیەکیان پێ پەیدابکەن و بیان فرۆشن لە مەککە)[9].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (لەدوای جەنگی ئوحد کۆمەڵێك لە هۆزی (عەضل) و (قارە) هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێکمان موسوڵمان

(٥) أخرجه: أبو نعيم في (الحلية) (٢/٥)، وفي (الدلائل) (٤٤٥)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٦/٢٠٣): رواه الطبراني ورجاله ثقات وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٩٨١): اسناده جيّد.

(٦) انظر: (التاريخ) لابن شبة (٢/٤٦٨)، و(الدلائل) للبيهقي (٤/٤١).

(٧) انظر: (السيرة) لابن هشام (٤/٦١٩)، وابوداود (١٢٤٩)، وابن حبان (٧١٦٠).

(٨) انظر: (التهذيب في اسماء الرجال) للحافظ المزي (١٤/٣١٤).

(٩) انظر: (المغازي) للواقدي (١/٣٥٤).

بووین، ئێمە هاتووین داوات لێ دەکەین کەسانێك لە هاوەڵانت بنێریتەلامان تا ئەم ئاینەمان تێبگەیەنن و قورئانمان فێربکەن لەگەڵ ئەریت و یاساکانی تری ئیسلامدا، پێغەمبەریش ﷺ شەش کەس لە هاوەڵانی لەگەڵ ناردن ئەوانیش: (مورسیدی کوڕی ئەبو مورسیدی غەنەوی، و خالیدی کوڕی ئەلبەکیر، و عاصمی کوڕی ثابتی کوڕی ئەلقلەح، وزەیدی کوڕی دەثنە، و عەبدوڵڵای کوڕی طاریق، و خوبەیبی کوڕی عەدی، وسەرۆکی ئەم کۆمەڵە مورسدی کوڕی ئەبو مورسید بوو) ئەمە لە ڕیوایەتەکەی ئیبن و ئیسحاق و موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبەیردا[١٠]. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان (١٠) کەس بوون وە پێغەمبەر ﷺ ناردنی تا هەواڵی ئەو ناوەی بۆ بهێنن[١١]. ئەمەش بەهێزترە و ڕاستە وەك ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت:

(پێغەمبەری خوا ﷺ مەفرەزەیەکی (١٠) کەسی بۆ هەواڵ گیری نارد، و عاصمی کوڕی ثابتی کردە سەرۆکیان، ئەوان لە (صەفەری ساڵی چواری کۆچیدا)[١٢] بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی (الهدأة)ی نێوان عوسفان و مەککە لە دووری (حەوت میل) لە عوسفانەوە، لەوێدا هەواڵی هاتنی ئەوان درا بە کوڕانی (بنو لحیان) لە هۆزی (هوزەیل)، ئەوانیش نزیك لە دووسەد پیاوی تیرهاوێژیان هەبوو شوێنیان کەوتن و بەدوای شوێن پێیان ڕۆیشتن، [(عاصم) و هاوەڵانی بەڕێکەوتن تا لە پارشێودا گەیشتنە لای ناوی (الرجیع) و لایاندا و حەوانەوە و خورمای عەجوەیان خوارد و ناوکە خورمایەکیان لەو جێگەیە لێ بەر بوویەوە چونکە ئەوان بەشەو دەڕۆیشتن و بەڕۆژیش خۆیان مەڵاس دەدا][١٣] بەنو لحیان) شوێنیان کەوتن تا گەیشتنە جێی حەوانەوەکەیان ئەو ناوکە خورمایە یان لەوێدا دۆزیەوە و وتیان: ئەمە ناوکی خورمای مەدینەییە، پاشان بەشوێنیاندا ڕۆیشتن [تا پێیان گەیشتنەوە] (عاصم

---

(١٠) انظر: (السیرة) لابن هشام (١٢٤/٣)، و(دلائل) للبیهقي (٣٢٦/٣-٣٢٨)، وقد ذکر الصلابي في (السیرة) (١٦١/٢): ان اسناده صحیحة.

(١١) انظر: هذا الموضوع بتوسع في: (السرایا و البعوث النبویة) لبریك محمد (ص:٢٢٨)، والمجتمع المدني للعمري (ص:٨٨).

(١٢) انظر: (المغازي) للواقدي (٣٥٤/١).

(١٣) هذا روایة ابي معشر في (مغازیة) کما قال الحافظ في (الفتح) (٤٨٤/٧).

کە ئەوانی بینی لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەموو ڕایان کرد و چوونە سەر بەرزاییەك [ئەوانیش هاتن و چواردەوریان لێ گرتن] و پێیان وتن: دابەزن خۆتان بدەن بەدەستەوە پەیمانتان دەدەینێ [گەر خۆتان دابەزن و بێنە لامان] کە هیچ کەسێکتان لێ نە کوژین).

لە ڕیوایەتەکەی ئیبن ئیسحاقدا (رحمه الله) [وتیان: سوێند بە خوا ئێمە نامانەوێت ئێوە بکوژین، بەڵام دەمانەوێت پارەیەکتان پێ وەرگرین لای دانیشتوانی مەککە و پەیمان و بەڵێنی خواتان دەدەینێ کەمەتان کوژین][14].

(عاصم)ی کوڕی ثابت کەسەرکردەی مەفرەزەکە بوو وتی: [خەڵکینە] سوێند بە خوا من لەسەر بەڵێنی کافر دانابەزم و [کافر هیچ بەڵێن و متمانەیەکی نیە لای من] [پاشان وتی] [خوایە من ئاینەکەت بۆ دەپارێزم تۆش جەستەم بپارێزە] خوایە ئەم هەواڵەمان بگەیەنەرە پێغەمبەر ﷺ، ئیتر تیرهاوێژە کافرەکان کەوتنە تیر باران کردنیان لە ئەنجامدا عاصم وە حەوت کەسی تریان لێ کوشتن [پاشان گفت و بەڵێنەکەیان لێ دووبارەکردنەوە] و ئەو سێ هاوەڵای کە لە ژیاندا مابوون هاتنە خوارەوە و بەو بەڵێن و گفتەیان خۆیاندا بەدەستەوە ئەوانیش (خوبەیبی کوڕی عەدی و زەیدی کوڕی دەثنە و [عەبدوڵڵای کوڕی طارق]) بوون، کاتێك دەستگیریان کردن بە پەتی کەوانەکانیان بەستنیانەوە و لەوێدا [عەبدوڵڵای کوڕی طارق] وتی: ئا ئەمە یەکەم غەدر و پابەند نەبوونتانە سوێند بەخوا لەگەڵتاندا نایەم با بکوژرێم وەك هاوەڵانم. ئەوانیش ڕایان کێشاو لێیاندا بەڵام هەر لەگەڵیان نەچوو تا دواجار لەوێدا کوشتیان. پاشان خوبەیب و زەیدیان پێش خۆیاندا و گەیاندنیانە شاری مەککەو ئەمەش لە دوای ڕووداوی جەنگی بەدری زۆر تاڵ بەڵای چونکە خوبەیب ئەلحارسی کوڕی عامری کوشت بوو لە جەنگی بەدردا. خوبەیب لای ئەوان بەدەست بەسەری مایەوە [کچەکەی ئەلحارس دەڵێت: کاتێك کوڕانی ئەلحارسی بڕیاری کوشتنی خوبەیبیاندا] خوبەیب داوای موسی کرد تا هەندێك شوێنی بتاشێت بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات بۆ کوشتن، منیش موسێکم پێدا و [ئاگام لەمنداڵەکەم نەبوو تەماشام

---

[14] انظر: (سيرة) ابن هشام (٣/١٢٤).

کرد وا چۆتە ژوورەوە بۆلای خوبەیب] منیش چووم بەدوایدا تەماشا دەکەم خوبەیب منداڵەکەی خستۆتە سەر ڕانی و موسەکەی بەدەستەوەیە، کە ئەوەم بینی زۆر تۆقیم و خوبەیبیش هەستی پێ کردم وتی: دەترسی من بیکوژم؟ من هەرگیز کاری واناکەم (إن شاء الله). کچەکی ئەلحارس دەڵێت: سوێند بەخوا دەست بەسەرم نەدیووە چاکتر بێت لە خوبەیب، وەڵاهی ڕۆژێکیان بینیم هەر دوو دەستی بەسرابۆوە و هێشوە ترێیەکی بەدەستەوە بوو لێ ی دەخوارد لەو کاتەشدا هیچ میوەیەك لە شاری مەککەدا نەبوو، من دەم زانی کە ئەوە (رزق)ێکە خوا پی‌ی بەخشیووە. کاتێك کە خوبەیب یان بردە دەرەوە بۆ ئەوەی لە دەرەوەی (الحرم) بیکوژن خوبەیب بەوانی وت: ڕێگەم بدەن تا دوو ڕکات نوێژبکەم [ئەوان وازیان لێ هێنا تا دوو ڕکات نوێژەکەی خوێند، پاشان چووە بەردەمیان و پی‌ی وتن: گەر لەبەر ئەوە نەبێت بڵێن لە مردن دەترسێت من ئەو نوێژەم زیاتر دەکرد و درێژەم پێ دەدا، ئینجا وتی: خوایە دانە دانەیان سەر ژمێربکە و هەر یەکەیان بە شێوەیەك لە ناو ببە و هیچیان لەسەر زەویدا مەهێڵە بەزیندووی.

[ئیبن هیشام دەڵێت: معاویەی کوڕی ئەبو سفیان ﷺ دەیوت: لەو ڕۆژەدا لەوێ ئامادە بووم لەگەڵ باوکمدا، کەخوبەیب دوعاکەی کرد باوکم منی دا بەسەر زەویدا لە ترسی دوعاکەی خوبەیب، چونکە وا باو بوو دەیانوت: پیاو گەر دوعای لێ کرا خۆی بدات بەسەر زەویدا ئەو دوعایە کاری لێ ناکات] پاشان خوبەیب چەند دێڕە شعرێکی وت [کەباسی خۆگری و نارەحەتی و گەڕانەوەی بۆ لای خوا دەکرد][١٥].

[عورووە (رحمه الله) دەفەرموێت: بە سێدارەدا هەڵیان واسی بوو کاتێك چەکیان لێ نزیك کردەوە بۆ کوشتنی لەو کاتەدا پێیان وت: پێت خۆشە ئێستا موحەممەد لە جێیەکەی تۆدا بێت؟ لەوەلامدا پی‌ی وتن: سوێند بە خوای مەزن پێم خۆش نیە تەنها دڕکێکیش بەقاچیدا بچێت][١٦]. عوقبەی کوڕی ئەلحارس کوشتی و بەم جۆرە خوبەیب یەکەم کەس بوو کە دوو ڕکات نوێژی پێش کوشتنی ئەنجام دا و ئەمەش بووە نەریت بۆ هەموو موسوڵمانێك پێش کوشتن و لە سێدارەدانی.

[١٥] انظر: (السيرة) لابن هشام (٣/١٣٠).
[١٦] انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٣٢٦) من رواية عروة وموسى بن عقبة.

[ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: کاتێك زەیدی کوڕی دەثنە یان هێنایە پێش بۆ کوشتن ئەبو سوفیان پێی وت: زەید سوێنت دەدەم بە خوا پێت خۆشە ئیستا موحەممەد لای ئێمە بێت لەو جێیەی تۆدا و لە گەردنی بدەین و تۆش لە ناو خێزان و منداڵی خۆت بیت؟ زەید وتی: سوێند بە خوا پێم خۆش نیە (محمد ﷺ) ئێستا لە جێگەکەی خۆیدا دڕکێك ئازاری بدات و منیش لای خێزان و منداڵی خۆم بم (واتە: پێغەمبەر ﷺ دوور لە هەموو ئازارێك بێت ئەوەم لاخۆشەویستترە لە بوونم لە ناو ماڵ و منداڵم) ئینجا ئەبو سوفیان وتی: لە ژیانمدا بە چاوی خۆم کەسانێکم نەدیوە هاوڕێیانی خۆشیان بوێت بە وێنەی خۆشەویستی هاوڕێیانی (محمد) بۆ (محمد) لە پاشان نسطاس زەیدی کوشت (رحمه الله)][17].

خوای گەورە دوعاکەی عاصمی کوڕی ثابتی وەرگرت و هەواڵ و بەسەرهاتەکەی عاصم و سەرجەم هاوڕێیانی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ. لە پاشان کەسانێك لە بێ بڕوایانی قورەیش لە دوای بیستنی کوشتنی عاصم پیاوانێکیان نارده ئەو جێگەیە تا (سەرەکەی) عاصمیان بۆ بهێننەوە چونکە عاصم یەکێك لە گەورە پیاوانی قورەیشی کوشت بوو لە جەنگی بەدردا. خوای گەورەش پۆلێك زەردەواڵەی زۆری نارده سەر جەستەی عاصم و بێ بڕوایان نەیان توانی لێ نزیك ببنەوە و هیچ پارچە گۆشتێکی لێ بکەنەوە [18].

لە ڕیوایەتەکەی ئیبن و ئیسحاقدا (رحمه الله) دەفەرموێت: (بێ بڕوایان کاتێك ئەو زەردەواڵانەیان بینی وتیان: لێ ی گەڕێن تا شەو دادێت ئەو جا زەردەواڵەکان دەڕۆن ئێمەش سەرەکەی دەبەین. کە شەو داهات خوای گەورە بارانێکی زۆری باران و شیوەکان پڕبوون و لافاو هات و جەستەی عاصمی برد و بێ بڕوایان هەرچەند دوای ئەوە ئەو ناوە گەڕان نەیان دۆزیەوە. کە ئەم باسە گەیشتەوە بە ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بەندەی بڕوادار دەپارێزێت لە دوای مردنی وەك چۆن پاراستویەتی لە ژیانیدا عاصم چۆن

---

(17) انظر: (السيرة) لابن هشام (٣/١٢٦).

(18) اخرجه: البخاري (٣٠٤٥، ٤٠٨٦)، وعبد الرزاق (المصنف) (٥/٣٥٣) واحمد (المسند) (٧٩٨٢، ٨٠٩٦) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط: اسناده صحيح.

لە ژیانیدا خۆی دەپاراست لەوەی موشریك بەر جەستەی بکەوێت خوای گەورەش ناوها جەستەی عاصمی پاراست لە موشریکەکان لە دوای مردنی)[١٩].

لە ڕیوایەتێکی (ضعیف) لاوازدا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ عەمری کوڕی ئومیەی ضەمری وەك هەواڵ گیرێك ناردۆتە شوێن کوشتنەکەی خوبەیب، عەمر دەڵێت: خۆم گەیاندە ئەو دارەی کە جەستەی خوبەیبی پێوە هەڵواسرا بوو دەترسام کەسانێك لەو جێگەدا پەیدا ببن، من بەسەر ئەو دارەدا سەر کەوتم پەتەکەی خوبەیبم کردەوە و کەوتە سەر زەوی، ئینجا خۆم هەڵ دایە خوارەوە بەپەلە کەمێك خۆم دوور خستەوە لەوێ پاشان گەڕامەوە سەری و دیار نەما وەك ئەوەی زەوی قوتی دابێت)[٢٠].

## کارەساتەکەی بیری (المعونة)

لە دوای چوار مانگ لە جەنگی ئوحود، پیاوێکی کەللە ڕەقی خۆ بەزلزان و ناوداری بەنی عامر کە ناوی (عامری کوڕی طوفەیل) بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ چونکە دەیزانی کە دواجار هەر پێغەمبەر ﷺ سەردەکەوێت و دوا ڕۆژ هەر بۆ ئەو دەبێت، بۆیە دەیویست پێش وەخت شتێك دەس خۆی بخات. هات و چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و (گردیە دەمەقاڵە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و دەنگی بەرز کردەوە لەو کاتەدا ثابتی کوڕی قەیس لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ بە پێوە وەستا بوو وە شمشێرەکەی بە دەستەوە بوو بە عامری وت: عامر دەنگت نزم بکە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ... لەوکاتەدا برازاکەی عامر پژمی و سوپاسی خوای کرد پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە (واتە: وتی: یهدیك الله ویصلح بالك)، پاشان عامر پژمی و نەیوت: (الحمد لله) وپێغەمبەریش ﷺ هیچی پێ نەوت. عامر وتی: وەڵامی ئەو منداڵەت دایەوە و وتت (یهدیك الله ویصلح بالك) بەڵام وەڵامی منت نەدایەوە و هیچیت نەوت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەو سوپاسی خوای کرد وتی: (الحمد لله). عامریش وتی: سوێند بێت بەچەندەها ئەسپ سوارەوە بێمە سەرت پێغەمبەر ﷺ بێ ی

---

[١٩] انظر: (السيرة) لابن هشام (٣/١٢٤).

[٢٠] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤١٩٣)، وأحمد (١٧٢٥٢) وقال محققه: اسناده ضعيف، و البيهقي (الدلائل) (٣/٣٣٢)، وقال الشيخ الأرناؤط في تخريجه لـ (زاد المعاد) (٢/١٢٢): سناده ضعيف.

فەرموو: (یکفیك الله وابنا قیلة) واتە: خـوا بەرپەچت دەداتـەوە پاشان دوو کوڕەکەی قیلە (واتە: هەموو انصاری ناو شاری مەدینە)[٢١].

لەوێدا عامر وتی: [سەرپشکت دەکەم لە نێوان سێ شتدا: شارەکان بۆ تۆ و لادێ کان بۆ من، یان ئەوە تا دەمکەیت بەجێنشین لە دوای خۆت یان ئەوەتا هێرشت دەکەمە سەر بە هەزار ئەسپ سوار و هەزار وشتر سوار][٢٢]. پێغەمبەر ﷺ هەموو وتەکانی ڕەت کردەوە و عامریش گەڕایەوە لای خزمانی خۆی تاخەڵك کۆ بکاتەوە بۆ هێرش کردنە سەر پێغەمبەر ﷺ.

پاشان سەرکردەی بەنی عامر (ملاعب الاسنة) کەناوی (أبـو بـراء) عـامری کـوڕی مالك بـوو گەیشتە مەدینـە و سـەردانی پێغەمبـەری ﷺ کـرد: عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەبوبـەکر ﷺ دەفەرمووێت: (ئـەبو لـبراء عـامری کوڕی مـالکی کـوڕی جەعفـەری (ملاعـب الاسـنة) هاتـەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و [دیاریەکی لەگەڵ خۆی هێنا بوو بەڵام هێشتا هەر (مشرك) بوو].

پێغەمبەریش ﷺ ئیسلامی بۆ باسی کرد بەڵام موسوڵمان نەبوو، وە ئیسلامی ڕەتکردەوە و [پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((إني لا أقبل هدیة مشرك))][٢٣]. واتە: من دیاری کەسێکی هاوتا بڕیاردەر بۆ خوا قبوڵ ناکەم. عامریش وتی: ئەی موحەمەد بۆ پیاوێك لە هاوڕێ کانت بۆ ناوخەڵکانی نەجد نانێریت (تۆ پیاوانێکمان لەگەڵدا بنێرە تا قورئان و سونئەتمان فێر بکەن) و ئەو کات خەڵکانیش ئەم ئاینە قبوڵ دەکەن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من دەترسم کە خەڵکانی ناوچەی نەجد ڕێگەیان پێ بگرن)) ئەویش وتی: "من پەنایان دەدەم تۆش هەر کەسێك دەنێریت بەویستی خۆت بینێرە تا خەڵکان بانگەشە بکەن بۆ ئەم ئاینە". پێغەمبەریش ﷺ مننذری کوڕی عەمری نادر لەگەڵ چل کەس لە

(٢١) اخرجه: الطبراني (الکبیر)(٥٧٢٤)، وقال الهیثمي في (المجمع) (١٢٦/٦) فیه عبد المهمین ضعیف.

(٢٢) اخرجه: البخاري (٤٠٩١)، وأحمد (١٣١٩٥) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرطهما.

(٢٣) اخرجه: الطبراني (الکبیر) (١٩٦٨)، و أبو نعیم (الدلائل) (٤٤٠)، والبزار (١٣٨)، وقال الهیثمي في (المجمع) (٦٨/٦): رجاله رجال الصحیح، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٣٠/٥): رجاله ثقات، و حسنه الشیخ الألباني في (الصحیحة) (١٧٢٧).

هاوڕێیانی[٢٤]. بەڵام ڕاستر وایە وەك لە ڕیوایەتی (صحیح) داهاتووە کە ئەوان (٧٠) کەس
بوون وە مەفرەزە بوون و بۆ چاو دێری ئەو ناوە چونەتە ئەوێ:

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ مەفرەزەیەکی [چاودێری][٢٥]
ناردە ناو خەڵکانی نەجد لە ڕووی زەویەکانی (بنی سلیم) کە ئەو ڕۆژە پێی دەوترا (بئر
المعونة) وە سەرکردە کەشیان ئەلمونذیری کوڕی عەمر بوو وە هەندێك دەفەرموون
سەرکردەیان مورثدی کوڕی ئەبو مورثیدبوو)[٢٦].

لە ڕیوایەتەکەی ئەنەسی کوڕی مالکدا ﷺ دەفەرموێت: (هۆزەکانی ڕەعل و زەکوان
وعوصەیە لە (بنی لحیان) [هاتن وایان ڕاگەیاند کە ئەوان پێشتر لە موسوڵمانان بوون] وە
داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد شاندێکی هاوەڵی بنێرێت بۆ پشتیوانیان دژ بە دوژمنانیان،
پێغەمبەریش ﷺ (٧٠) کەسی لە پشتیوانانی خەڵکی مەدینەی لەگەڵ ناردن)[٢٧].

دەتوانرێت ئەم ڕیوایەتانە ڕێك بخرێت و بوترێت: (ئەوان داوای کەسانێکی موسوڵمانیان
کردووە تا ئاینیان پێ بگەیەنن، وە موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە بەڵام لە ڕاستیدا
نیازی سەرکیان ئەوە بووە کە کۆمەڵێك موسوڵمان لەگەڵ خۆیان بەرن تا لەوێ بیان کوژن
و تۆڵەی خۆیان لە موسوڵمانان بکەنەوە و غەدر وناپاکییان لەگەڵ بکەن)[٢٨].

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت: ([پێغەمبەر ﷺ حەرامی نارد لەگەڵ (٧٠) سواردا]
لە ئەنصار [بۆ لای بەنی عامر][٢٩] ئەوانە ئێمە پێمان دەوتن قورئان خوێنەکان لە کاتی

---

[٢٤] اخرجه: أحمد (١٣٨٥٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن هيشام (السيرة) (١٣٧/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣٨/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٢٩٨).

[٢٥] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٧/١٩).

[٢٦] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٤١/٣) من رواية موسى بن عقبة.

[٢٧] اخرجه: البخاري (٤٠٩٠).

[٢٨] انظر: تفصيل ذلك في (السريا و البعوث النبوية) (ص:٢٣٨).

[٢٩] اخرجه: أحمد (المسند) (١٤٠٧٤) و قال محققه: اسناده صحيح.

ئێمەدا ئەوان بە ڕۆژ دەچوون داریان دەهێنا و دەیان فرۆشت و بە شەویش شەو نوێژیان دەکرد[٣٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (حەفتا گەنجی ئەنصاری ناویان (القرّاء) واتە: قورئان خوێنەکان، لە مزگەوت دەبوون، کە ئێوارەیان لێ دەهات دەچوونە گۆشەیەکی شاری مەدینە [بۆ لای مامۆستایەك سەرتا سەری] شەو [قورئانیان دەخوێند و فێری دەبوون] و نوێژیان دەکرد، خزمانیان وایان دەزانی کە ئەوان هەر لە مزگەوتن، و کەسانی ناو مزگەوتیش وایان دەزانی ئەوان گەڕاونەتەوە لای کەس و کاریان، تارۆژ هەڵدەهات ئینجا دەچوون ئاوکێشیان دەکرد و دەچوون داریان دەهێنا و لای ژوورەکانی ماڵی پێغەمبەر ﷺ دایان دەنا [- لە ڕیوایەتێکی تردا - کە بەیانیان لێ دەبووەوە ئەوانەی کە توانایان هەبوو دەچوون داریان دەبڕی و دەیان هێنا وئاوکێشییان دەکرد ئەوەشی توانای دارایی هەبووایە دەچوون مەڕیان دەکڕی و دەیان هێنا و سەریان دەبڕی و چاکیان دەکرد و لای ژوورەکانی ماڵی پێغەمبەر ﷺ هەڵیان دەواسی بۆ خێر][٣١] – لە ڕیوایەتێکی تردا – [دەفەرموێت: ئەوان بەرۆژ دەچوون ئاوکێشیان دەکرد و ئاویان دەهێنا بۆ مزگەوت، وە دەچوون دار فرۆشیان دەکرد و بە پارەکەی خواردنیان دەکڕی بۆ هەژارەکانی (أهل الصفة) واتە: ئەوانەی بێ کەس وکار بوون و بێ جێگەبوون][٣٢]. [ئەو کۆمەڵە گەنجە هەموویان بەیەکەوە پێغەمبەر ﷺ ناردنی (واتە: بۆ لای ئەهلی نەجد تا بانگەوازیان بکەن بۆ ئیسلام و هەواڵی ئەو ناوە لە نزیکەوە بزانن][٣٣] هەموو بە ڕێکەوتن و پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی لەگەڵ ناردن تا ڕێگەی ئەو ناوچەیەیان نیشان بدات ناوی (موطەلیبی سەهمی) بوو.[٣٤]

---

(٣٠) أخرجه: البخاري (٤٠٩٠).

(٣١) أخرجه: أحمد (١٣٤٦٢،١٢٤٠٢) و قال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والبيهقي (الدلائل) (٣٤٩/٣).

(٣٢) أخرجه: أحمد (١٣٨٥٤) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣٣) أخرجه: أحمد (١٣٤٦٢) و قال محققه: اسناده على شرط مسلم.

(٣٤) انظر: (فتح الباري) لحافظ (٣٩٠/٧).

(هەموو چوون تا گەیشتنە لای (بئر المعونة) (کە ١٦٠کم دوورە لە مەدینەوە) ئەو ناوچەیە هی بەنی عامر و بەردەڵانەکانی بەنی سولەیم بوو لە هەر دووکیانەوە نزیك بوو بەڵام زیاتر لە بەنی سولەیمەوە نزیکتر بوون، کاتێك لای بیرەکە لەوێ دا بەزین ولایاندا حەرامی کوڕی مەلحانیان (لەسەر داوای خۆی) نارد بۆ لای دوژمنی خوا عامری کوڕی طوفەیل تا نامەکەی پێغەمبەرمان ﷺ پێ بگەیەنێت [حەرام بە هەمووانی وت: ئێوە لەم ناوچەیەوە لە من نزیك بن تا دەچمە لایان [گەر ئەوان ڕێگەیان پێدام ئەوا ئێوەشم لێ نزیك دەبێت، وە گەر ئەوان منیان کوشت [ئێوەش هاوەڵانتان ئاگادار دەکەنەوە] ئینجا حەرام و پیاوێکی شەل و پیاوێکی تر ڕۆیشتنەلایان و حەرام پێی وتن: ڕێگەم دەدەن تا [پەیامەکەی پێغەمبەرتان ﷺ پێ ڕاگەیەنم، وتیان: بەڵێ ڕێگەت دەدەین] حەرامیش لەگەڵیاندا دوا و پێی وتن: [ئەی خەڵکانی ناوچەی (بیری معونة) من نێرراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ ئێوە تا شایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) وە (محمد)یش بەندە و پێغەمبەری خوایە ﷺ و ئێوەش بڕواتان بە خواو پێغەمبەرە کەی هەبێت][35].

ئەو لەو قسانە دابوو ئەوانیش ئیشارەتیان بۆ پیاوێکیان کرد تا بچێت لە دواوە حەرام بکوژێت، حەرام قسەی بۆ دەکردن ئەو پیاوەش لە دوایەوە هات و ڕمێکی لە پشتەوە لێداو لەسەر سنگیەوە دەرچوو [حەرامیش کەبینی سەری ڕمەکە لەسنگیەوە دەرچووە و خوێن لە هەمولایەکەوە هاتەدەر ئەویش بە هەر دوو دەستی مشتێك خوێنی بەسەر دەم و چاو و سەریدا ڕژاند][36] وتی: (الله أکبر) بردمەوە سوێند بە خوای کەعبە. بەو جۆرە شەهیدیان کرد وغەدریان لێ کردن و (ئەو دوانەی تریشیان لە ناوبرد)][37] و پاشان عامر کوڕی طوفەیل داوای لە بەنی عامر کرد تا شوێنیان کەون وەلە ناویان بەرن بەڵام ئەوان بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەهاتن وتیان: ئەبو لبرائی سەرکردەیان ڕێگەی داون و پەنای داون و ئێمەش ئەو ڕێگە دانەی ئەبولبراء ناشکێنین و ڕێگریان ناکەین و ئەو بەڵێن نامەیە ناشکێنین. ئینجا عامری کوڕی طوفەیل چوو هەر سێ هۆزەکەی بەنی سولەیم (عصیة و

---

[35] أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٥٤٩).

[36] أخرجه: البخاري (٤٠٩٢).

[37] أخرجه: البخاري (٤٠٩١)، وأحمد (١٣١٩٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

رعل و ذکوان)ی ئاگادارکردنەوە و هانی دان بۆ شوێن کەوتنیان و لە ناو بردنیان، ئەو سێ هۆزەش قایل بوون و [بەنزیکەی (١٠٠) تیرهاویژ، وەشوێنیان کەوتن تا پێیان گەیشتن لە ناو چەی (بئر المعونـة) و چواردەوریان گرتن][٣٨] بێ ئەوەی ئەوان ئاگایان لە خۆیان بێت. ئەوانیش کوتوپڕ ئەوانیان بینی شمێشرەکانیان گرت بەدەستیانەوە و [لەو کاتەدا وتیان: خوایە ئێمە هیچ کەسێك شك نابەین ئەم هەواڵەمان بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا جگە لە تۆ، خوایە سەلامی ئێمەی پێ بگەیەنە و ئەم هەواڵەمانی پێ ڕابگەیەنە] پاشان کەوتنە شەڕکردن لەگەڵیان، بەڵام چونکە دوژمن پێشتر چواردەوری دابوون و لەو جێگانەدا خۆیان قایم کردبوو، وە هەموویان تیرهاوێژبوون، کەوتنە تیرباران کردنی موسوڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە تا هەموویان شەهیدبوون [تەنها پیاوێکی شەلیان کە لەسەر چیاکە بوو] لەگەڵ کەعبی کوڕی زەید مابووەوە، بەڵام کەعب لەناو کوژراوەکاندا بوو وە بەسەختی بریندار کرابوو ئەوان وازیان لێ هێنا بوو کە ئەوان ڕۆیشتن ئەویش توانی خۆی ڕزگار بکات وژیا تا لە جەنگی خەندەقدا شەهید کرا، وە سێ کەسی تریشیان ڕزگاریان بوو کە ئەوانیش (عەمری کوڕی ئومیەی ضەمری لەگەڵ [مونذیری کوڕی موحەمەد کە وشترەکانیان دەلەوەڕاندن، وشترێکیان لێ ون بوو بوو دوور کەوتبوونەوە و بەدوایدا دەگەڕان تەماشایان کرد باڵندە دڵۆپە خوێن لە قاچیان دەکەوێتە خوار و بەسەر ناوچەی دا بەزینی موسوسڵمانەکاندا دەسوڕێنەوە][٣٩] وتیان: سوێند بە خوا شتێك ڕوویداوە وای کردووە ئەو باڵندانە بەسەر ئەوێدا بسوڕێنەوە هاتن و تەماشایان کرد هەموو هاوەڵانیان کوژراون و لەخوێنی خۆیاندا کەوتوون، و ئەسپ سوارە تیرهاوێژەکان بەسەریانەوە وەستاون [ئەوانیش وتیان: سوێند بە خوا ئەوانە هاوەڵەکانی ئێمەیان کوشتووە ئەك بەنوسولەیم و بەنی عامر ئێوە دەڵێن چی ئێستا چی بکەین؟](ئەنصاریەکە بەعەمری کوڕی ئومیەی وت: تۆ دەڵێیت چی؟ عەمریش وتی: وا بە چاکی دەزانم بگەڕێینەوە و هەواڵەکە بەپێغەمبەر ﷺ بگەیەنین، ئەنصاریەکەش (واتە: مونذیر کوڕی موحەمەد) وتی): من خۆمم ناوێت لە دوای

---

[٣٨] أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٩٧٤٣)، والطبراني (الكبير) (٦٧١٩)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٢٧/٦): رجاله رجال الصحيح.

[٣٩] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٤٤/٣) من رواية موسى بن عقبة رحمه الله.

و ئەوان و دوورناکەومەوە لەو جێگەیەی کە مونذیری کوڕی عەمری تیا شەهیدکراووە ناتوانم نارام بم کە پیاوانێك هەواڵی کوژرانی ئەوم پێ بگەیەنن [ئینجا بەرە و ئەوان چوو] جەنگا لەگەڵیان تا کوژرا، و پاشان عەمری کوڕی ئومەیەیان دەست بەسەر کرد، کاتێك هەواڵی ئەوەی پێ دان کە ئەو خەڵکی ناوچەی (المضر) عامر کوڕی طوفەیل پێشە سەری قژی عەمری تاشی و ئازادی کرد لە جیاتی دایکی کە لە سەری بوو بەندەیەك ئازاد بکات و [عامری کوڕی طوفەیل پێی وت: ئەوە کێیە و دەستی ڕاکێشا بۆ یەکێك لە کوژراوەکان؟ عەمریش وتی: ئەوە عامری کوڕی فوهەیرەیە. عامر وتی: لە دوای کوژرانی بینینم بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان تا گەیشتە نێوان زەوی و ئاسمان پاشان هێنرایە خوارەوە و لەسەر زەوی دانرا][40] [لەوێدا عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: لە پاشانیش جەستەی عامری کوڕی فوهەیریان نەدۆزیەوە، وایان دەزانی کە فریشتەکان شاردویانەتەوە وژێر خاکیان ناوە][41] [پاشان عامری کوڕی طوفەیل بە عەمری کوڕی ئومیەی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای هاوڕێکەت (واتە: پێغەمبەر ﷺ) و هەواڵەکەی بۆ باس بکە ئینجا عەمر گەڕایەوە][42] [و جبریل ﷺ پێشتر ئەو هەواڵەی گەیاندبووە پێغەمبەر ﷺ][43]. پێغەمبەر ﷺ بە موسوڵمانانی ڕاگەیاند و فەرمووی: [هاوڕێیانتان هەموو بەرکەوتن (واتە: کوژراون)][44]. [و بەخوای خۆیان گەیشتن و لێیان ڕازی بوو وە ئەوانیشی ڕازی کرد][45]. ئەوان داوایان لە خوا کرد وتیان: [خوایە هەواڵی ئێمە بگەیەنە پێغەمبەر ﷺ][46] و هاوەڵانمان [و پێیان ڕاگەیەنە کە ئێمە بە تۆ گەیشتن و ئێمە ڕازین لە تۆ وە تۆش ڕازیت لە ئێمە] پاشان خوای گەورە

---

[40] أخرجه: البخاري (٤٠٩٣).

[41] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٧/١٩)، والبيهقي (الدلائل) (٣٤٢/٣)، وابونعيم (الدلائل) (٤٤٢)، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٢٧/٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

[42] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٤٢/٣) من رواية موسى بن عقبة.

[43] أخرجه: البخاري (٢٨٠١).

[44] أخرجه: البخاري (٤٠٩٣).

[45] أخرجه: البخاري (٢٨٠١).

[46] أخرجه: مسلم (٦٧٧)، و البيهقي (الدلائل) (٣٤٣/٣).

[چەند ئایەتێکی لە بارەی ئەوانە] ناردە خوارە وە پاشان (نسخ) کرایە وە و دەقەکەشی ئەمەبوو: ((إنّا قد لقينا رَبنا فرضي عنا و أرضانا)) واتە: ئێمە بە خوای خۆمان گەیشتن لە ئێمە ڕازی بوو وە ئێمەشی ڕازی کرد.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [ئەم بینیوە پێغەمبەر ﷺ [خەفەت بخوات لە هیچ مەفرەزەیەك وەك ئەو خەفەتەی ئەوجارە][47]، وە [هیچ کات پێغەمبەر ﷺ زۆر زۆر غەمبار نەبووە بەوێنەی غەمباری ئەو ڕۆژەی][48] [بۆیە پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ [لەدوای ڕکوع لە ڕکاتی دووەمی] نوێژی بەیانیدا دوعای لێ دەکردن][49] و [دەیفەرموو: ((اللهم العن بني لحيان ورعلاً وذكوان و عُصَيّة عصتِ الله و رسوله))][50]. واتە: خوایە نەفرەت بکە لە بەنی لحیان و رَعل و زکوان و عوصەیەکە سەرپێچی خواو پێغەمبەریان کردووە. پاشان فەرمووی ((هذا عمل أبي براء قد كنت لهذا كارهاً متخوفا)). واتە: ئەمە کاری ئەبو بەرائە، من بەمە قایل نەبووم وە ئەم کارەم بەلاوە ترسناك بوو. دواجار ئەم هەواڵەش گەیشتەوە بە ئەبو بەراء و زۆر ئەم کارەی لەسەر گران بوو کە عامر پەنا دانەکەی ئەوی شکاندووە و ئەو کارەساتە تووشی هاوڕێیانی پێغەمبەر ﷺ بووە بەهۆی ڕێگە پێدان و پەنادانی ئەوە وە بووە)[51].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (عەمری کوڕی ئومیە لەوکارەساتە گەڕایەوە و لە ڕێگادا گەیشت بە دووکەسی لە خزمانی (عامری کوڕی طوفەیل) بەیەکەوە لە ژێر سێبەرێکدا لایان داو دانیشتن و عەمر نەیزانی کە ئەو دوانە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داون کاتێك بەیەکەوە دانیشتن لە هەر دووکیانی پرسی ئێوە لە چ هۆز و تیرەیەکن؟. ئەوانیش وتیان: ئێمە لە هۆزی بەنی عامرین، عەمری کوڕی ئومیەش لێیان گەڕا تا خەوتن، ئینجا هەر دووکیانی کوشت لە تۆڵەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەلەسەر دەستی

---

[47] أخرجه: مسلم (٦٧٧).

[48] أخرجه: البخاري (١٣٠٠).

[49] أخرجه: البخاري (٤٠٨٨).

[50] أخرجه: مسلم (٦٧٧-٦٧٩).

[51] أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٥٤٥)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣٨/٣)، والطبراني (الكبير) (٣٥٥/٢٠)، وابن هيشام (السيرة) (١٣٧:٣-١٣٨).

پەنی عامردا کوژران. کاتێك عەمر گەڕایەوە و چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی پێگەیاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لقد قتلت قتيلين لأديهما))[٥٢] واتە: تۆ دوو کەست کوشتوە دەبێت خوێنەکەیان بدەم.

## غەزای بەنونەضیر

جێ ماڵەکانی بەنونەضیری جولەکەنشین (٢) میل لەمەدینەوە دوور بوو – هۆزی بەنونەضیری جولەکە لە دوای جەنگی ئوحوددا شکستی موسوڵمانەکانیان بینی لە و جەنگەدا ئەوانیش وەك موشریکەکان و دوو ڕووەکان لە فرسەت دەگەڕان تا ئەوانیش زەبری کۆتایی بگەیەننە موسوڵمانان. ئەم تەماع و مەرامانەش لە دوای شەهیدکردنی هاوەڵانی (رجيع) و (٧٠) کەسی (بئرا المعونة) زیاتر پەرەی سەند، بەنونەضیر لە دوای ئەمانە کەوتنە خۆ پڕچەك کردن و خۆ قایم کردن و ئامادە باشی بۆ پەلاماردانی موسوڵمانان، ئینجا کەوتنە پیلان گێڕان و هەڵوەشاند ئەوەی پەیماننامەکانیان لەگەڵ موسوڵمانان، و پەنادانی موشریکەکان و پێ ڕاگەیاندنیان بەخاڵە لاوازەکانی موسوڵمانان وەك لە غەزای (سويق)ی پێشوودا باس کرا پیلان و نەخشەیان دژ بە موسوڵمانان گەیشتە ئاستی هەوڵدان و پیلان گێڕان بۆ لە ناو بردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سەر دانەکەیدا بۆ لایان بۆ بژاردنی بەشی خۆیان لە خوێنی ئەو دوو کەسەی کە عەمری کوڕی ئومیەی ضەمیری بەهەڵە کوشتبوونی لە دوای گەڕانەوەی لە (بئر المعونة).

بەروار و مێژووی ئەم غەزایە ڕاستتر ئەوەیەکە لە دوای جەنگی ئوحود بووە وەك پێشەوایانی ژیاننامە نوسان: موسی کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبێر، و ئیبن ئیسحاق، وە ئیبن کەثیر و ئیبن قەیمش ئەمەیان پشت ڕاست کردۆتەوە.[٥٣]

وردەکاریەکانی بەسەرهاتی ئەم غەزایە لە دوو ڕیوایەتی ناسراودا هاتووە:

---

[٥٢] اخرجه: ابن هشام (السيرة)(١٣٨/٣)، والطبراني (الكبير) (٣٦٥/٢٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١٣٢): رجاله ثقات، و ضعفه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٣٠٠).

[٥٣] انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (١٨٠/٣)، و(زاد المعاد) لابن القيم (١١٠/٢)، و(البداية و النهاية) لابن كثير (١٠/٤)، و (السيرة الصحيحة) للعمري (٣٠٤/١).

١- ڕیوایەتی یەکەم: لە (عبد الرحمن بن کعب بن مالك عن رجل من أصحاب رسول الله ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: (بێ باوەڕانی قوڕەیش نامەیەکی ئاگادارکردنەوە و هەڕەشە نامێزیان ناردە سەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و هەندێك لەوانەی کە بە بت پەرستی مابوونەوە لە (ئەوس و خەزرەج) لە دوای جەنگی بەدر لە دەقەکەیدا هاتبوو:

"ئێوەی زۆرینەی دانیشتوانی شاری مەدینە ئەو هاوەڵەی ئێمەتان گرتۆتە خۆ، سوێند بە خوا یان ئەوەتا بەجەنگ دێن لەگەڵیدا و دەری دەکەن لە ناوتاندا، یان ئەوە تا لەگەڵ هەموو عەرەب بەیەکەوە هێرش دەهێنینە سەرتان هەموو جەنگاوەرانتان دەکوژین و ئافرەتانتان بۆ خۆمان بە تاڵان دەبەین".

کاتێك ئەم هەڕەشەیە گەیشتە عبدوڵای کوڕی ئوبەی و ئەو بت پەرستانەی کە لەگەڵیدا بوون هەموو یەکتریان ئاگادارکردەوە و کۆبونەوە و خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و چوو پێیان گەیشت و فەرمووی: ((لقد بلغ وعيد قريش منكم المبالغ، ماكانت لتكيدكم باكثر مما تريدون ان تكيدوا به أنفسكم، فانتم هؤلاء تريدون أن تقتلوا ابنائكم واخوانكم)). واتە: هەڕەشە کەی قوڕەیش بەجارێ کاری گەر بووە لە ئێوەدا و نەیتوانیوە ئەوەتان لێ بکات کەئێوە بەدەستی خۆتان دەتانەوێ بەرانبەر بە خۆتانی بکەن، ئێوە دەتانەوێت بجەنگێن لەگەڵ کوڕان و برایان و خزمانی خۆتاندا و بیان کوژن. کە ئەمەیان بیست لە پێغەمبەر ﷺ ئینجا بڵاویان کرد وە دەست بەرداری ئەو کارە بوون و ئەم هەواڵەش گەیشتەوە بە قوڕەیش پێش جەنگی بەدر.

پاشان بێ بڕوایانی قوڕەیش لە دوای جەنگی بەدر نامەیەکیان ئاڕاستەی جولەکەکان کرد و ئەمەش دەقەکەی بوو: "ئێوەی جولەکە خاوەن چەك و قەڵان، یان ئەوەتا بەجەنگ دێن لەگەڵ ئەو هاوەڵەی ئێمەدا یان ئەوەتا ئاوهاو ئاوهاتان بەسەر دێنین و دەست دەگەیەنینە خرخاڵەکانی ژنەکانتان".

لەدوای گەیشتنی ئەم نامەیە هۆزی بەنونەضیر کۆبون لەسەر غەدر و پەیمان شکێنی وبیاوێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی موحەمەد خۆت لەگەڵ (٣٠) کەس لە هاوەڵانت وەرن، وئێمەش (٣٠) کەس لە زاناکانمان دێن و هەر دوولا لە ناوچەی (المنصف)ی

نێوان هەردوولادا کۆدەبینەوە، لەوێدا بازاناکانمان گوێت لێ گرن، گەر ئەوان تۆیان بەڕاست زانی و باوەڕیان پێ هێنایت ئەو کات ئێمە هەموو باوەڕت پێ دەهێنین.

دواجار پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (٣٠) کەس لە هاوەڵانیدا ڕۆیشتن و جولەکەکانیش (٣٠) کەس لە زاناکانیان لە ماڵ دەرچوون و بەڕێ کەوتن بۆ جێگەی دیاری کراو، لە ڕێگادا هەندێك لە جولەکەکان لە ناو خۆیاندا وتیان: چۆن ئێمە دەستمان پێی دەگات تا لەناوی بەرین لە کاتێکدا ئەو (٣٠) کەسی لە هاوەڵانی لەگەڵدابن کە هەموو یەکێکیان پێی خۆشە فیداکاری بێت و پێش ئەو بمرێت. ئینجا گەڕانەوە و نوێنەرێکی تریان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: تۆ نا توانیت لە ئێمە تێبگەیت وە ئێمەش ناتوانین لێت تێبگەین بە ئامادەبوونی (٦٠) کەس. لەبەر ئەوە خۆت تەنها لەگەڵ (٣)کەس لە هاوەڵانت وەرن، ئێمەش تەنها (٣) کەس لە زاناکانمان دێن تا گوێت لێ بگرن، گەر ئەو سێ زانایەمان باوەڕیان پێ هێنایت ئێمەش هەموومان ئەو کات باوەڕت پێ دەهێنین و بەڕاستت دەزانین.

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (٣) کەس لە هاوەڵانی ڕۆیشتن، جولەکەکانیش ئەو سێ کەسەیان خەنجەریان لە خۆبەست لە ژێر جلەکانیانەوە تا پێغەمبەری پێ لە ناوبەرن و فرسەتی لێ بهێنن، یەکێك لە ئافرەتانی بەنونەضیر کە دڵسۆز بوو بۆ خزمێکی موسوڵمانی خۆی بەم کارەی زانی و ئەو هەواڵەی بە نەهێنی گەیاندە خزمە موسوڵمانەکەی خۆی کە بەنونەضیر دەیانەوێت غەدر لە پێغەمبەر ﷺ بکەن و لەناوی بەرن. ئەو موسوڵمانەش بەڕاکردن و خێرا خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی بگاتە ئەو جێگە دیاری کراوە و هەواڵەکەی پێی ڕاگەیاند. پێغەمبەریش ﷺ دەست بەجێ گەڕایەوە ناو شاری مەدینە بۆ ڕۆژی دوای بەسوپاوە چووە سەریان و ئابلۆقەی دان و پێی وتن: سوێند بە خوا ئێوە هیچ متمانە یەکتان لای من نیە مە گەر پەیمانم بدەنێ لەبەر ئەوە دەبێت پەیمانتان لێ وەربگرم، جولەکەکانیش ئامادە نەبوون هیچ پەیمانێك بدەنە پێغەمبەری خوا، بۆیە لەوێدا پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان لەگەڵیان بە شەڕهاتن ئەو ڕۆژە تا ئێوارە، بۆ ڕۆژی دوای بەسوپاکەیەوە هەڵیان کوتایە سەر بەنوقوریضەی جولەکە و بەنونەضیریان جێ هێشت. وە داوایان لە بەنوقورەیضە کرد پەیمان ببەستن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەوانیش پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پاشان پێغەمبەر و موسوڵمانەکان ئەوێیان جێ هێشت و

گەڕانەوە، وە بۆ ڕۆژی دوای بەسوپاکەیەوە چووە سەر بەنونەضیر و نابلوقەی دان و لەگەڵیان بە شەڕهاتن جولەکەکان قایل بوون بەوەی کە ڕێ بکەن و ئەوێ بەجێ بهێڵن و ئەوەی توانیان بەسەر پشتی وشتر لەگەڵ خۆیانی ببەن جگە لە چەکەکانیان کە دەبێت لەوێ بەجێی بهێڵن.

ئینجا بەنونەضیر کەوتنە کۆکردنەوەی کەل و پەلەکانیان ئەوەی بە پشتی وشتر هەڵبگیرێت هەتا دەرگای ماڵەکان ودارو تەختەکانیان لەگەڵ خۆیان برد و کەوتنە ڕووخاندنی ماڵەکانیان و ئەوێ یان بەجێ هێشت و بەرەو شام ڕەویان کرد و ئەمەش یەکەم کۆکردنەوە بوو بەرەو شام چونکە بەنونەضیر یەکێك بوون لە تیرەکانی جولەکە کەپێشتر ڕاگواستنیان توش نەهاتبوو، لەبەر ئەوەش بووکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگواستن و گەروانش نەبووایە خوای گەورە سزای توندی دەدان لە دونیادا.....)[٥٤].

**ڕیوایەتی دووەم:**

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبەیر ڕەحمەتی خوایان لێ بێت فەرموویانە:

(ئەمەش بەسەرهاتی پێغەمبەری خوایە ﷺ کاتێك لەگەڵ [هەندێك لە هاوەڵانیدا کە ئەبو بەکر و عومەر و عەلیان (خوا لێیان ڕازی بێت) لە ناو دابوو] چوونە لای بەنونەضیر تا ئەو برە پارە بدەن کە بەگوێرەی ڕێکەوتنامەی مەدینە پێویست بوو لەسەریان بیدەن وەك بەشەداری کردنیان لە دانی پارەی خوێنی [دوو کوژراوەکەی بەنی عامر چونکە پەنادرا و بوون لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ] وە پێشتریش بەنونەضیر سیخوڕیان دەکرد بە سەر موسوڵمانانەوە کاتێك کە قوڕەیش هاتبوونە لای کێوی ئوحود بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمانان و پەیوەندیان پێوە کردبوون و هانیان دابوون بۆ دژایەتی کردن و جەنگاندن لەگەڵ موسوڵمانان.

---

(٥٤) أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٩٤٢٢، ٩٧٣٣)، وابوداود (٣٠٠٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٧٨/٣)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٢٣/٧): أخرجه ابن مردويه باسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٥٩٥): اسناده صحيح.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە لایان بۆ ئەو مەبەستە، ئەوان وتیان [پێشوازیت لێ بێت ئەبولقاسم بۆچی هاتویت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پیاوێك لە هاوەڵانم دوو پیاوی لە کیلاب (یاخو بەنی عامر) کوشتووە کە پێشتر پە نادرا و بوون لەلایەن منەوە و داواکراوە لەمن کە پارەی خوێنی هەر دووکیان بدەم ودەمەوێت ئێوەش لەمەدا کۆمەکیم بکەن؟)) وتیان: بەڵێ خۆشە ویستی و رێزمان هەیە بۆت ئەی ئەبولقاسم] دانیشە تا پێویستیەکەت بۆ دابین بکەین و نان بخۆیت لامان و ئێمەش راوێژی ناوخۆمان بکەین تا [کۆمەکیت بکەین لەوەی بۆی هاتووی بەشێوەیەك کە تۆ پێت خۆشە] [دانیشە لامان تا بۆت کۆ دەکەینەوە] پێغەمبەر ﷺ و ئەو هاوەڵانەی کە لەگەڵیدابوون دانیشتن لە ژێر سێبەری دیواری [قەلاکەیاندا و لەو کاتەدا ئەبو بەکر لای راستیەوە دانیشت و عومەریش لای چەپی دانیشت وە عەلیش لەبەردەمیدا دانیشت] و هەموو چاوەڕوانی ئەوانیان دەکرد.

جولەکەکان چوونە ناو قەلاکەیانەوە و شەیتان لەگەڵیان بوو لێ یان جیا نەدەبووەوە و هەموو پیلانیان گێڕا بۆ لە ناو بردنی پێغەمبەر ﷺ و لەناو خۆیاندا وتیان: هیچ کات ئەوەندە لێمان نزیك نابێت تا ئێمە لە ناوی بەرن و بحەوێینەوە و ئەم بەڵایەمان بەسەرەوە لابچێت و بێ ترس ژیان بەسەر بەرین [و ئێستاش کێ دەچێتە سەربانی ئەو خانوە و بەردێکی گەورەی بەسەردا بخاتە خوارەوەو رزگارمان بکات لە دەستی] پیاوێکیان کە ناوی [عەمری کوڕی جەحاش بوو] وتی: گەر پێتان باشە دەچمە سەربانی ئەوماڵەی کە [ئەو لە ژێر سێبەری دیوارە کەیدایە] و بەردێکی بەسەردا بەردە دەمەوە و دەیکوژم. [ئەو پیاوە چوو تا ئەو کارەی ئەنجام بدات وەك خۆی دەیویست] و لەوێدا خوای گەورە جبریلی ﷺ نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵی پیلانەکەیان و گفتوگۆیان لە ناو خۆدا بۆ ئەنجام دانی ئەو کارەیان پێ گەیاند، خوای گەورەش پێغەمبەری پاراست. لەوێدا پێغەمبەر ﷺ هەستاو وەك بەرە و پێویستی دەست بە ناو بچێت [و پاشان ئەبو بەکر و عومەر و عەلی ﷺ بەدوایدا چوون] و هاوەڵانی تری هەر لە شوێنی دانیشتنەکانی خۆیاندا مانەوە و پێغەمبەر ﷺ دەس بەجێ گەڕایەوە بەرەو شاری مەدینە و [جولەکەکانی دوژمنی خوا هەر لە چپەچپ و پیلان گێڕانی خۆیاندا بوون، کاتێك کە پیلانی خۆیان گێڕا و نەخشەی خۆیان تەواو کرد بۆ لە ناو بردنی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا سەرکردەکانیان هاتن و لەگەڵ

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیشتن و چاوەڕێی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد] زۆر لەوێ چاوەڕێیان کرد، تا لەدوایدا پیاوێك لەمەدینەوە هات و پرسیاریان لێکرد لە بارەی پێغەمبەر ﷺ و پیاوەکە وتی: پێی گەیشتم [دەگەڕایەوە ناو شاری مەدینە و گەیشتبووە کۆڵانەکانی مەدینە] جوولەکانیش لەوێدا وتیان: موحەممەد پەلەی کرد و چاوە ڕێی نەکردین تا ئەوەی بۆی هاتبوو بۆی جێبەجێ بکەین. پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوێیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە[و پاشان قورئان دابەزی بۆ [سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و پیلانی دوژمنانی خوای ئاشکرا کرد و ئەم ئایەت پیرۆزە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ (المائدة: ١١). واتە: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەبێ یادی نازونعمەتەکانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە، کاتێك هۆزی بەنو نەضیر ویستیان دەست درێژی بکەنە سەرتان، خواش دەست درێژییەکەی ڕاگرتن و (ئێوەی پاراست دەی کەواتە لە خوا بترسن و پارێزکاری بن، دەبان ئیمانداران هەر پشت بەخوا ببەستن (تا هەمیشە فریایان بکەوێت)﴾ دوای ئاشکرابوونی غەدر و پیلانەکەیان، خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کرد [هێرش بەرێتە سەریان و بجەنگێت لەگەڵیاندا] و ڕایانگوازیت و دووریان بخاتەوە لە مەدینە، و بەرە و هەرجێگەیەك کە خۆیان دەیانەوێت ڕەوبکەن. [پێغەمبەریش ﷺ هەستا بە ئەنجامدانی فەرمانەکەی خواو داوای لێ کردن کە لە شاری مەدینە دەرچن و ئەوێ بەجێ بهێڵن. جولەکەکان وتیان: بۆ کوێ مان دەردەکەیت و بۆ کوێ بڕۆین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بۆ جێگەی (الحشر) (واتە: وڵاتی شام) کاتێ: دوو ڕوەکانی مەدینە ئەمەیان زانی کەچ کارەساتێك ڕووبەڕووی براو پشتیوانە جولەکەکانیان هاتووە نوێنەری خۆیان ناردەلای جولەکەکان و پێیان وتن: ئێمە لەگەڵتانین هەتا مردن گەر جەنگان [ئێمە لەگەڵتانین] و سەرتان دەخەین وە گەر دەرکران [هەموو لەگەڵتان دێیین] و لێتان جیانابینەوە دواناکەوین.

سەرکردەی جولەکە ئەو ڕۆژە (حيى بن الأخطب) بوو، جوولەکەکان متمانەیان بە بەڵێنەکانی دووڕووەکان هەبوو، لە هەمان کاتدا ورەیان بەرز بۆوە و شەیتان خەیاڵی سەر

کەوتنی خستە دڵیانەوە لەوێدا هەموو بانگیان لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کرد وتیان سوێند بە خوا هەرگیز دەرناچین وە گەر بجەنگیت لەگەڵماندا ئێمە لەگەڵت دەجەنگین.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دایە هاوەڵانی هەموو چەکیان هەڵگرت و لە [مانگی (ربیع الأول)دا] بەڕێکەوتن بۆ ئەنجام گەیاندنی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا و جەنگاندن لەگەڵ جولەکەکانی بەنو نەضیر. جولەکەکانیش خۆیان لە خانوو قەڵاکانیاندا قایم کرد. پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کاتێك گەیشتنە نزیك خانوو و کوڵان و قەڵاکانیان نەیان ویست بواری شەڕ کردنیان بدەن لە خانوو و قەڵاکانیاندا خوای گەورەش ورەی بەرز و ژیری پێبەخشین و بواری بۆ ڕەخساندن و پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا خانووە نزیکەکانیان بڕوخێنرێت و هەندێك لە دارخورماکانیان ببڕدرێت یان بسوتێنرێت [بۆ ئەوەی جێگەی شەڕگەکە فراوان تر بێت بۆ جەنگ] [جولەکەکانیش دەیان وت: موحەمەد تۆ ڕێگریت دەکرد لە خراپەو خراپەکارانت گازندە دەکرد ئەی بۆ چی تۆ دارخورماکان دەبڕی و دەیان سوتێنیت.] [دیسان لەوێدا جولەکەکان موسوڵمانانیان لە کەداردەکرد لە دوای ڕوخاندنی هەندێك لەماڵەکانیان و بڕینی هەندێك لە دارخورماکانیان و پێیان دەوتن: ئایە درەخت چ تاوانێکی هەیە خۆ ئێوە خۆتان بە چاکەکار دەزانن]. خوای گەورە جولەکەکان و دووڕووەکانی تۆقاند و هیچیان نەیان توانی دەست لە موسوڵمانان بکەنەوە. هەر کاتێکیش موسوڵمانان پێشی خانوویەکیان بڕوخاندایە زیاتر دەتۆقین و دواوەی خانووەکانی خۆیان دەڕوخاند و لێی دەرباز دەبوون ورەو هێزی ئەوەیان نەبوو کە بێنە دەر بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دا.

بەم جۆرە موسوڵمانان ماڵ بەماڵیان ڕووخاند [و جولەکەکان هەر کات کوڵان و خانوویەکیان لە دەست بدایە لە دواوە کونیان دەکردو پاشان دەیان گرت وەك شورایەکیان لێ دەکرد] کاتێك نزیك بوو جولەکەکان دواهەمین خانوویان بڕوخێت و هەر لە چاوەڕوانی بەڵێنی دووڕووەکاندا بوون تا بەتەواوەتی بێ هیوا بوون [ئەو کات ورەیان بە تەواوی ڕووخاو خۆیان دا بەدەستەوە، و پێغەمبەریش ﷺ ڕێکەوت لەگەڵیان کە خوێنیان نەڕێژێت و لەوێ دەریان بکات و بیان نێرێتە ناوچەی (اذرعات)ی شام] و هەر کەلو پەل و پارە و شتومەکێکیان لەسەر پشتی وشتر بۆیان دەڕوات لەگەڵ خۆیان ببەن] جگە لە چەك و

قەڵغانەکانیان کە پێویستە بەجێی بهێڵن و لەگەڵ خۆیان نەیبەن. [لە هەموو بەنو نەضیردا تەنها دوو پیاویان موسوڵمان بوو یەکێکیان (یامینی کوڕی عومەیر) بوو ئەوی تریشیان ناوی (ئەبو سەعدی کوڕی وەهەب] بوو [یەکێکیان بەوی تری وتبوو: سوێند بەخوا ئێمە باش دەزانین کە ئەوە پێغەمبەری خوایە ئیتر چاوەڕوانی چی بکەین با موسوڵمان بین و خوێن و ماڵمان پارێزراو دەبێت. هەر لە شەودا ئەو دوانە بە نهێنی هاتن موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند وخوێن وماڵ وسامانیان پارێزراو بوو][٥٥] ئیتر جولەکەکان تەواو شپرزە بوون و (ئەوەی توانیان لە ماڵ وسامانەکانیان باریان کردە سەر پشتی وشترەکانیان. و پیاوی وایان هەبوو خانووەکەی خۆی دەڕوخاند و چوارچێوەی دەرگاکەی دەهێناو باری دەکردە سەرپشتی وشترەکەی و خۆی ئامادە دەکرد. [موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ منی نارد بۆ لای بەنونەضیر و ماوەی سێ ڕۆژی دانێ تا خۆیان ئامادەبکەن و ئەوێ بەجێ بهێڵن][٥٦] بەڵام لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ ماوەی دە ڕۆژی دانێ تا خۆیانی تیا ئامادە بکەن و ئەوێ بەجێبهێڵن][٥٧].

پاشان ئەوێیان بەجێ هێڵاو هەریەکەیان بەلایەکدا ڕۆیشت و کوڕانی ئەبیل حەقیقی سەرکردەیان ماڵ و سامانێکی زۆریان لە ئاڵتون و زیو لە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەگەڵ خۆ برد کاتێك کە دەرچوون خوای گەورەش ئەو چەند ئایەتەی سورەتی (الحشر)ی سەبارەت بەوان دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَنْ يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ

---

(٥٥) أخرجه: أبونعيم (الدلائل) (٤٢٧)، والواقدي (المغزى) (١/٣٥٣).

(٥٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٣٦٠).

(٥٧) أخرجه: الواقدي (المغازي) (١/٣٦٩) - والصالحي (السيرة الشامية) (٤/٤٥٥).

﴿الْفَاسِقِينَ﴾ (الحشر: ١ – ٥) [٥٨]. [هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بەپاکی و بێگەردی یادی خوایان کردووە، هەر ئەویش باڵادەست و دانایە. ﴿١﴾ ئەو خوایە ئەو زاتەیە، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەنانی کتێب، هەڵیکەندن لە شوێنەواریان و ناچاری کۆچی کردن لە یەکەم دەست پێکردنی کۆکردنەوەو دەرکردنیاندا، ئێوە بەتەما نەبوون و گومانتان نەدەبرد ئاوا بەئاسانی بڕۆن، ئەوانیش گومانیان وابوو کە بەڕاستی قەڵاکانیان بەرگریان دەکات لە ویست و فەرمانی خوا، ئەوسا ئیتر لە لایەکەوە خوا بەڵای بەسەر هێنان کە بەخەیاڵیاندا نەهاتبوون و حسابیان بۆ نەکردبوو، ئەوسا خوا ترسێکی فڕێدایە دڵیانەوە، بەناچاری دەستیان کرد بەکاولکردنی خانووبەرەو ماڵەکانیان بەدەستی خۆیان و دەستی ئیمانداران، کەواتە: ئەی خاوەن بیروهۆش و دوور بینەکان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەربگرن (جوولەکە هەروا بۆیان ناچێتە سەر). ﴿٢﴾ خۆ ئەگەر خوا چۆلکردنی لەسەر بڕیار نەدانایە، ئەوە هەر لە دنیادا سزای دەدان، لە قیامەتیشدا سزای ئاگری دۆزەخ بۆیان ئامادەیە (چونکە زۆر دڵڕەق و پیلانگێڕن). ﴿٣﴾ ئەو سزایە بەهۆی ئەوەوە بوو بەڕاستی ئەوانە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد، ئەوەش دژایەتی ئاینی خوا بکات، با چاك بزانێت خوا سزاو تۆڵەی زۆر بەئێش و ئازارە. ﴿٤﴾ هەر درەختێکی تەڕتان بڕی بێت یان وازتان لێ هێنابێت و لەسەر بنجی خۆی ما بێت (لە خەیبەردا)، بەفەرمانی خوا بووە و ویستی ئەوی لەسەرە، تا تاوانباران و لە سنوور دەرچووەکان سەرشۆڕ و خەجاڵەت بکات]. دایکی بڕواداران عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: **[پێغەمبەر ﷺ ڕایگواستن بەرەو شام چونکە ئەوان لەو بەشەی جولەکە بوون کە پێشتر ڕاگواستنیان نەهاتبووە ڕێ و خوای گەورە پێویستی کردبوو لەسەر جولەکە**

---

[٥٨] أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/ ٥٥١)، وابن هيشام (السيرة) (١٤٣/٣) عن ابن اسحاق، و أبو نعيم (دلائل) (٤٢٥، ٤٢٦) عن عروة بن الزبير، و البيهقي (دلائل) (١٨٠/٣، ٣٥٩) عن موسى بن عقبة و عروة بن الزبير رحمهما الله تعالى.

هەریەکێکیان بەشی خۆی لە دەربەدەری و ڕاگواستن بەرکەوێت گەر ئەمەیان توش نەهاتایە خوای گەورە سزای دەدان بە کوشتن و کۆیلایەتی].[59]

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەنونەضیر ڕاگوێزران و ژنان و منداڵان و سامانەکانیان بە سەر پشتی وشترەوە بەڕێکەوتن بەفیز و لە خۆباییەوە و لە دوایانەوە دەف بەدەست و جوزەلە لێدەر و گۆرانی بێژیان بە دواوە بوو گۆرانیان دەووت بە شێوەیەک لە و زەماندا وێنەیان نەبوو، لەوکارەیاندا [ویەکێک لەسەرکردەکانیان پێستە وشترێکی پڕ لە خشڵ وزێڕو زیوی بەرزکردبۆوە و بەفیزەوە دەیووت: ئا ئەمەمان ئامادەکردووە بۆ بەرز کردنەوە و نزمکردنەوەی زەوی، و گەر دارخورماشمان لەپاش بەجێ مابێت خورماکانی خەیبەرمان بەسە. ئینجا هەموو کەل و پەل و پێویستیەکانیان بەسواری (٦٠٠) وشتربارکرد و هەندێکیان بەرەو خەیبەر ڕۆیشتن و هەندێکیان بەرەو (اذرعات) ی شام وە هەندێك لە سەرکردە و ناودارەکانیان کەڕوویان کردبووە خەیبەر: سەلامی کوڕی ئەبیل حەقیق و حویەی کوڕی ئەخطەب و کینانەی کوڕی ئەلڕەبیعی کوڕی ئەبیل حەقیق، ئەوانە چوونە خەیبەر و دانیشتوانەکەی بە گەورەو سەرکردەی خۆیانیان قبوڵ کردن][60].

هەندێك لە موسوڵمانەکانی (انصار)ی ناو شاری مەدینە ویستیان ڕێگربن لە چوونی هەندێك لە منداڵەکانیان کە پێشتر ببوونە جولەکە و لەگەڵ بەنو نەضیر دەژیان.

ئیبن و عەباس ﷺ دەفەرموێت: " هەندێك لە ئافرەتانی ناو شاری مەدینەکە منداڵیان بۆ نە ئەما و زوو دەمردن، بەڵێنیان دەدا گەر منداڵیان بۆ بمێنێت بیکەنە جولەکە، کاتێك بەنونەضیر ڕاگوێزران و هەندێك لەمنداڵانی ئەنصاریان لە ناودا بوون، ئەنصاریەکان وتیان: ئێمە ناهێڵین منداڵەکانمان لەگەڵیان بڕۆن، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی

(٥٩) أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٩٧٣٢)، والحاكم (المستدرك) (٢/٤٨٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و البيهقي (الدلائل) (٣/١٧٨)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٣/١٧٨).

(٦٠) أخرجه: الواقدي (المغازي) (١/٣٧٤)، والصالحي (السيرة الحلبية) (٢/٥٦٥).

دابەزاند:﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...... ﴾ (البقرة: ٢٥٦).واتە: [زۆرە ملێ نیە لە قبووڵ کردنی هیچ ئاینێکدا]".[١١]

پاشان دەسکەوتەکانی بەنونەضیر سەرجەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تا لە هەج کارێکدا خۆی دەیەویت بەکاری بهێنێت، وەك ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت: "سامانەکانی بەنونەضیر لەو دەسکەوتانە بوو کە بەتایبەت خوای گەورە بەخشیبوی بە پێغەمبەرﷺ و موسوڵمانان ڕۆڵیان نەگێڕا بوو لە دەس بەسەراگرتینیدا. لەبەر ئەوە ئەو سامانە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خواوە ﷺ و خواردنی ساڵێکی خێزانەکانی لێ جیادەکردەوە و پاشا ماوەکەشی هەموو بەکاردەهێنا بۆ کڕینی ئەسپ و چەك وتفاقی سەربازی بۆ تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورەدا".[١٢]

لەوێدا پێغەمبەرﷺ لەو دەسکەوتانە بەشی (المهاجرین) واتە: کۆچکارانی یەکەم جاری شاری مەککەی دا تا ئەرکی سەرشانی (الأنصار) کەم بێتەوە، و لە (الأنصار) دا تەنها بەشی دوو کەسی هەژاروکەم دەستی دا ئەو دووانەش (سیماکی کوڕی خەرشە، سەهلی کوڕی حونەیف) بوون.

لە دوای ئەو دابەشبونە کۆچکاران خانووەکانی (الانصار)یان بەجێ هێشت و نیشتە جێی خانووەکانی بەنونەضیر بوون و نۆژەنیان کردە وە بۆ خۆیان.[١٣]

بەم جۆرەش خوای گەورە ڕاگواستنی بەنونەضیری کردە هۆکاری شکاندنی ورەوهێزی جولەکە و دوو ڕووەکان لە شاری مەدینەدا و بەنوقورەیضەی ناچارکرد پەیمان لەگەڵ موسوڵمانان تازە بکەنەوە لە کاتی ئابڵوقەدانی بەنونەضیر وە دوو ڕووەکانیش هەرگیز بەڵێنی خۆیان نەهێنایە دی، و جولەکەکان بۆیان ڕوون بووە کە چیتر نابێت پشت بەستن بە دووڕووەکان. بەم جۆرەش قەوارەی موسوڵمانەکان زیاتر بەهێزبوو لە دوای ڕزگاربوون

---

[١١] أخرجه: ابوداود (٢٦٨٢)، والنسائي (الكبرى) (١٠٩٨٢)، و البيهقي (الكبرى) (٩/ ١٨٦)، وابن حبان (١٤٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٣٣).

[١٢] أخرجه: البخاري (٣٠٣٣، ٤٨٨٥)، ومسلم (١٧٥٧)، وابوداود (٢٩٦٥).

[١٣] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٤٤)، والبيهقي (الدلائل) (٣/١٨٢).

لە بەنونەضیر و کەڵك وەرگرتن لە زەوی زارەکانیان و سوك کردنی ئەرکی سەر شانی (الأنصار)ی دانیشتوانی شاری مەدینە.[٦٤]

## غەزای نەجد

ئەم غەزایە بۆ تەمێ کردنی ئەو هۆزانە بوو کە لەئامادەکردندا بوون بۆ هێرش کردنە سەر موسوڵمانان. هەواڵ گەیشتە مەدینە کە هەر دوو هۆزی بەنو محاریب وبەنوسەعلەبە وبەنی غەطفان لە خۆ ئامادەکردندا بۆ پەلاماردانی شاری مەدینە پێغەمبەر ﷺ دەس پێشخەری کرد لە ئامادەکردنی سوپایەك لە موسوڵمانان و هێرشیان بردە سەر هۆزی بەنو لحیان کە پێشتر خوبەیب و هاوڕێیانیان شەهید کرد بوو لە بیری (الرجیع)ی ناوچەی نەجد. کاتێك دوژمنان هەواڵی ئامادە بوونی سوپای موسوڵمانانیان پێ گەیشت بە هەموو لایەکدا هەڵهاتن و لە بەرزای چیاکاندا خۆیان قایم کرد.[٦٥]

## غەزای بەدری کۆتایی

دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بۆ ئەم جەنگە بۆ ئەوە بوو بەڵێنی خۆی ببات سەر کە لە دوای تەواوو بوونی جەنگی ئوحود دا بووی بە ئەبوسوفیان کە ساڵی ئاینەدە هەردوو سوپا بەیەك بگەن لەمەرزی بەدردا.

عوروەی کوڕی زوبیر و موسای کوڕی عوقبە (رحمهما الله) فەرموویانە:

(پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی ئاگادار کردەووە کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەیەك گەیشتنی سوپای ئەبو سوفیان لەبەدر. پێغەمبەر ﷺ بەڕاستی ڕاستگۆ و پەیمان بەرە سەر بوو. لەو کاتەدا شەیتان پیاوانی خۆی (واتە: دووڕووەکان) هاندا تا بە ناو موسوڵماناندا بلاوبنەوە و پڕو پاگەندەی ترسناکیان لە ناودا بلاوبکەنەوە و بیان ترسێنن و پێیان بڵێن: هەواڵمان پێ

---

[٦٤] انظر: (السيرة النبوية الصحيحة) (٣١٠/١).

[٦٥] انظر: (السيرة) لابن هشام (٣٢١/٣)، و (البداية) لابن كثير (٨١/٤)، و (التاريخ) خليفة بن خياط (ص:٧٧).

گەیشتووە کە قورەیش سوپایەکی گەورەی ژمارە زۆری وەك تاریکی شەوی بۆ ئامادەکردوون و ئاواتیانە پێتان بگەن و لە ناوتان ببەن ئێوەش وریابن و مەڕۆن.

خوای گەورەش موسوڵمانانی لەو ترس و دڵە ڕاوکێیەی شەیتان و دوو ڕووەکان پاراست و هەموو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بوون. خۆیان سازدا بۆ دەرچوون و هەندێك کاڵای بازرگانیشیان لەگەڵ خۆ برد وتیان: دەچین گەر بە ئەبوسوفیان گەیشتین ئەوا ئەو کارە بووکە بۆی چووین، وە گەر پێی نەگەیشتین ئەو کات کاڵاکانی خۆمان دەفرۆشین و مامەڵە دەکەین. چونکە بەدر مەرزێکی بازرگانی بوو هەموو ساڵێك بازرگانەکان ڕوویان تێ دەکرد و کڕین وفرۆشتنیان تێدا ئەنجام دەدا.

موسوڵمانان لە [مانگی شەعباندا مەدینەیان بە جێ هێشت و بەڕێ کەوتن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوی ئەبو سوفیان] ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوچەی بەدر [و لەوێ هەشت ڕۆژمانەوە و چاوەڕێی ئەبوسوفیانیان کرد] و پێویستی خۆیان لەو ناوە بەجێ گەیاند و مامەڵەی خۆیان کرد. وە ئەبوسوفیان نەخۆی و نەسوپاکەی نەهاتنە ئەو جەنگە و لەوێدا [مەخشی کوڕی عەمر ضەمری کەپێشتر پێغەمبەرﷺ پەیمانی ئاشتی لەگەڵ مۆرکرد بوو وەك سەرکردەیەکی بەنو ئەضومرە لە غەزای وەدان] لەوێدا مەخشی کوڕی عەمر وتی: سوێند بە خوا ئێمە هەواڵی ئەوەمان پێگەیشتبوو کە ئێوە هەموو لە ناوچوون، ئێستا چی ئێوەی گەیاندووەتە ئەم مەرزە؟ [ئایا بۆ بەشەڕهاتن لەگەڵ قوڕیش گەیشتونەتە ئەم مەرزو کانیاوە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ((بەڵێ ئەی برای کوڕی ضەمرە))] لەوێدا پێغەمبەر ﷺ مەبستی بوو مەخش ئەم هەواڵە بگەیەنێتە قورەیش. دواجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئێمە لەسەر بەڵێنەکەی ئەبو سوفیان بۆ بەشەڕهاتن لەگەڵیان هاتوینەتە ئێرە گەر تۆش ئارەزووت لێ یە ئێمە پەیمانەکەمان لەگەڵتان هەڵدەوە شێنینەوە و بەشمشێرەکانمان لەگەڵتان بەشەڕ دێین و ئەم شوێنە بەجێ ناهێڵین [تا خوای گەورە نێوان ئێمە و ئێوە یەك لا دەکاتەوە] ؟ مەخشی کوڕی عەمر وتی: [ناسوێند بە خوا ئێمە هیچ پێویستمان بەجەنگ کردن لەگەڵ تۆ نیە]و پەنا بەخوا پەیمانەکەمان لەگەڵتان دەبەینە سەر و دەستان لێ ناکەینەوە.

دواجار وادەگێڕنەوە کە پیاوێکی خوزاعی ناوی (حومام) دەبێت بەوێدا تێ دەپەڕێت و موسوڵمانان دەبینێت و دەڵێت: ئەوانە کێن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئەوانە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانیەتی و چاوەڕوانی ئەبو سوفیان و قورەیش دەکەن. دواجار ئەم پیاوە خوزاعیە خۆی دەگەیەنێتە قورەیش.

عوروە (رحمه الله) دەفەرموێت: [ئەو پیاوە خوزاعیە کە دەگاتە ناو شاری مەککە هەموو لێ کۆدەبنەوە و هەواڵی مەرزی بەدری لێ دەپرسن] و ئەویش لەوەڵامیاندا دەڵێت: موحەممەد و هاوەڵانی لەوێ چاوەڕوانی ئێوە دەکەن [و دواتر باسی ئامادە باشی موسوڵمانانی دەکەن و دەمەقاڵەیان لەگەڵ بەنی ضومرە، ئەم هەواڵەش قورەیش بە تەواوی دەتۆقێنێت]. ئەبو سوفیان دەڵێت: سوێند بە خوا هەواڵەکانی ڕاستە. ئینجا قورەیش هەموو کەوتنە خۆ ئامادەکردن و پارە کۆکردنەوە و هاندانیان و کەمتر لە ئوقیە ئاڵتونیان لە کەس وەر نەدەگرت [پاشان ئەبو سوفیان لەگەڵ سوپای مەکە] بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی (میجەنە) لە (عوسفان) لەوێ ماوەیەك مانەوە پاشان ئەبو سوفیان و هاوەڵانی کەوتنە ڕاگۆڕینەوە و بڕیاریان هاتە سەر ئەوەی هەموو بگەڕێنەوە [وتیان: ئەی کۆمەڵی قورەیش لەشکر کێشیتان لەم ساڵدا بەکەڵك نایەت] بەڵکو لە ساڵێکدا بەکەڵك دێت کە باران زۆر باری بێت و لە وەڕی باش هەبێت بۆ ئاژەڵەکانتان [وشیری باش هەبێت بۆ خواردنەوەتان، بەڵام ئەم ساڵتان وشکە ساڵیە و لەبەر ئەوە من وا دەگەڕێمەوە و ئێوەش بگەڕێنەوە. پاشان هەموو گەڕانەوە و دانیشتوانی مەککە ئەم سوپایەیان ناونا: سوپای (سوەیق) واتە: شۆربا و پیان دەووتن ئێوە دیارە تەنها بۆ شۆربا خواردن ڕۆیشتوون).[66]

ئیبن وعەباس رضي الله عنه دەفەرموێت: (لەوێدا ترسنۆکان گەڕانەوە، و ئازاکان خۆیان بۆ جەنگ و مامەڵە ئامادەکرد و کە چوونە جێ شەڕگە کە لەوێ کەسیان نەبینی و کەوتنە کڕین و فرۆشتن ومامەڵە وخوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ فَانْقَلَبُوا

---

(٦٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٣٨٦-٣٨٧)، وابن هشام (السيرة) (٣/١٦٤، ١٦٥)، والطبري (التاريخ) (٢/٥٥٩) واللفظ لموسى بن عقبة و الزيادات لعروة وابن اسحاق.

بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴾ (آل عمران: ١٧٤)[٦٧].

[ئەوسا ئیتر موسوڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و نازو نیعمەتی خوایی دا، هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو)، خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە]. بەم جۆرە خوای گەورە سەربازەکانی خۆی شکۆمەند کرد و ڕێز و پایەیانی لە ناو سەرجەم عەرەبدا بەرزکردەوە و موشریکەکانی تیا سەر شۆڕکرد و بۆ هەموو کەسی دەرخست کە چەندە ترسنۆك و بێ وەرەن و پاشان موسوڵمانان بە سەلامەتی و شکۆمەندی و قازانجی باشی کالاکانیانەوە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە.

## غەزای (دومة الجندل)

هەواڵ گەیشتە مەدینە کەهەندێك لە خێڵە عەرەبەکان خۆیان کۆکردۆتەوە لە ناوچەی (دومة الجندل) بەمەبەستی پەلاماردانی ئەو کاروانە بازرگانیانەی کە بەناوچەکەدا تێدەپەڕن، وەلە بیری ئەوەدان کە لەمەدینە نزیك ببنەوە و پەلاماری بدەن.

لەسەر ڕوودانی ئەم غەزایە تەنها دوو گێڕانەوە هەیە:-

١-لە گێڕانەوەکەی (ابن اسحاق)دا (رحمه الله) بەم شێوەیە دەفەرموێت: (دواتر پێغەمبەر ﷺ غەزای (دومة الجندل)ی ئەنجام دا وە (ابن هیشام) دەڵێت: [ئەو غەزایە لە (ربیع الاول)دا ڕوویدا پێغەمبەر ﷺ سیباعی کوڕی عورفطەی غفاری] بەسەرکاری مەدینە دانا لە شوێنی خۆی تا دەگەڕێتەوە. ابن اسحاق دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دوچاری هیچ ڕووبەڕووبونەوەیەك نەبۆوەتەوە بەرلەوەی بگاتە شوێنی مەبەست پاشان گەڕاوەتەوە بەدرێژایی ماوەی ئەو ساڵە لەمەدینە مایەوە)[٦٨].

---

[٦٧] اخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٦٣٢)، و النسائي (التفسير) (١٠٣) وقال محققه: حديث صحيح، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٢١/٦): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير سعيد بن المنصور و هو ثقة، وقال السيوطي في (اسباب النزول) (ص: ٦١)، وفي (الدر المنثور) (١٠١/٢): أخرجه النسائي وابن أبي حاتم و الطبراني بسند صحيح.

[٦٨] اخرجه: ابن سعد (طبقات) (٤٧/٢)، والطبري (التاريخ) (٥٦٤/٢)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٨٩/٣)، وابن كثير (البداية) (١٠٥/٤)، وابن هشام (السيرة) (١٦٨/٣).

٢- لە گێڕانەوەکەی (واقیدی)دا کە گێڕانەوەیەکی درێژە بەڵام لەڕووی (سند)ەوە بەهێز پێنابەسترێت، چونکە واقیدی لەو ڕووەوە گوێ پێنەدراوە تەنها بەمەبەستی شارەزابوون باسی دەکەین.

واقیدی (رحمه الله) دەڵێت: (عبدالرحمن کوڕی عبدالعزیز لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبکرم بۆمان دەگێڕنەوە، کەهەردووکیان ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوە، بەڵام یەکێکیان زیاتر لەوی تریان بێجگە لەوانیش کەسانی تر دەیگێڕنەوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ دەیویست نزیک ببێتەوە لە ناوچەکانی شام، چونکە بە نزیک بونەوەی موسوڵمانان ترس و بیم دەخاتە نێو دڵ و دەروونی قەیسەری ڕۆمەکان وە هەواڵیش گەیشتبووە پێغەمبەر ﷺ کە لە ناوچەی (دومة الجندل) خێڵێکی زۆری تێدایە خەریکی چەتەگەری و پەلاماردانی ئەو کاروانە بازرگانیانەن کە کەلوپەل و پێویستی خەڵك بۆ شارەکان دەبەن و بە ناوچەکەیاندا تێدەپەڕن، چونکە بازاڕێکی گەورە لە ناوچەکەدا هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا دەیانویست لە مەدینە نزیک ببنەوە تا هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆیان دەرچوو لەمەدینە و ڕووە و ناوچەکەیان ڕۆیشت، موسوڵمانان بەشەو دەڕۆیشتن و بەڕۆژیش لە بۆسەدابوون و بە پەنهێنی دەڕۆیشتن پێغەمبەر ﷺ ڕێبەرو چاوساغەکەی لە بەنی (عوذرة) لەگەڵ خۆیدا برد کە ناوی (مذکور) بوو بەمەبەستی ڕێگا نیشان دان و شارەزای ناوچەکە. پێغەمبەر ﷺ بە پلانێکی ورد ڕێگەی دەبڕی لەڕێگای سەرەکی لایدابوو تاکو سەریان لێ تێك بدات و لە پڕ هەڵبکوتێتە سەریان کاتێك گەیشتە نزیك (دومة الجندل) شوێن هەڵگرەکە هەواڵی دایە کە لەوەڕگا و مەڕو ماڵاتی بەنی (تمیم) لەو ناوەدا نزیکن دواتر لەپڕ هێرشیان کردە سەر مەڕو ماڵات و شوانەکانیان و دەسکەوتێکی زۆریان لێ گرتن وە هەندێکیان لێدەسگیرکردن ئەوانی تریش هەریەکە بەلایەکدا ڕایان کرد، هەواڵ گەیشتە خەڵکی (دومة الجندل) ئەوانیش ڕایان کرد و بڵاوەیان لێکرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ چووە ناوچەکەیان، وهیچ کەسێکیان بەرچاو نەکەوت چەندین ڕۆژ لەوێ مایەوە تیپە چەکدارەکانی بەملاولادا دەنارد پاشان لەکاتی گەڕانەوەدا محمدی کوڕی موسلمەی ئەنصاری کەسێکی لێ دەسگیرکردن و هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێکرد لەبارەی خەڵکەکە وتی: دوێنێ ڕایان کرد پێغەمبەر ﷺ باسی ئیسلامی بۆ کرد، ئەو کەسەش موسوڵمان بوو پاشان گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە)[٦٩].

---

(٦٩) أخرجه: الواقدي المغازي) (١/٤٠٣، ٤٠٤)، ونقله البيهقي في (الدلائل) (٣/٣٩٠).

## غەزای (بني مصطلق) یان (مریسیع)

بني مصطلق لقێك بوون لەهۆزی خوزاعە (خوزاعەش هۆزێکی قەحطانی یەمەنی بوون)، (مصطلق) ناوی باپیرە گەورەیانە ناوی خۆی جونیمەی کوڕی سەعدی کوڕی عەمر بوو، ئەو غەزایە لەمانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویدا بەپێی ڕاسترین فەرموودەی زانایانی سیره لەوانە (موسای کوڕی عوقبە، عورِوەی کوڕی زوبەیر، قەتادە، ابن سعد، حاکم، ابن قتیبة، البلازی، الذهبي، ابن قیم، ابن حجر، ابن کثیر) وەهەروەها ئەوەی ئەم بۆچونە پشت ڕاست دەکاتەوە ئامادەبوونی سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصارییە ﷺ لەو غەزایەدا چونکە سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصاریی لە پاش غەزای (بني قوریظة) بەشەهیدی مرد بەهۆی خوێن بەربونی شادەماری قۆڵی کە لە غەزای خەندەقدا دوچاری ببوو، غەزای (بني قوریظة)ش لە مانگی (ذي القعدة) لە ساڵی پێنجەمدا دارِوویداوە بەپێی ڕاسترین بۆچوون و غەزای بەنی مصطلقیش لەپێش ئەو دابووە[٧٠].

بۆ ئەنجامدانی ئەم غەزایە هۆکار گەلێك هەبوون لەوانە: بەشداری کردنی ئەم خێڵە لەگەڵ هاوپەشدانەرەکانی مەککە لە غەزای ئوحوددا، وەهەروەها لەڕووی جوگرافیەوە شوێنی نیشتەجێبونیان کەوتبووە سەر ڕێگای سەرەکی نێوان مەککە و مەدینە ئەمەش وایکرد بوو ببنە لەمپەر لەبەردەم بڵاوبونەوەی ئیسلام لەو ناوچانەدا وەیەکێکیش لەبتە گەورەکانی عەرەب لە ناوچەکەیاندا بوو کە ناوی (مناة)ە و زۆرێك لە خێڵە عەرەبەکان بەگەورەیان دەزانی وەدەیان پەرست وە لەڕووی ماددی و مەعنەوی قازانجیان لێ دەکرد.

سەرەتای ئەمەش کاریان دەکرد بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و چەك و سەربازو دانانی کۆسپ لەڕێگەی بانگەوازی ئیسلامیدا بەتایبەتی دوای نسکۆی ئوحود لەبەر ئەوانە زۆر پێویست بوو هێزو توانا سەربازیەکانیان تێك بشکێنرێت و لەناوببرێن و پەیکەری (مناة)

---

[٧٠] أنظر: (فتح الباري) (٥٤٦/٧)، (البداية) (١٥٦/٤)، (تاريخ الاسلام) (٢٧٢/٢)، وأخرجه: ابن قتيبة (المعارف) (ص: ٧٠)، ابن سعد (الطبقات) (٦٣/٢)، البلاذري (انساب الاشراف) (٦٤/١)، البيهقي (دلائل النبوة) (٤٤/٤، ٤٥)، وانظر (مرويات غزوة بني المصطلق) (ص: ٩٧) و (سبيل الهدى والارشاد) (٣٥٥/٤).

برۆخێنرێت لەبەرئەوە دەسەڵاتیان نەگاتە لوتکە و هیچ پێگەیەکی ئاینی و سەربازی و بازرگانیان نەمێنێت، ناوچەکەشیان بلکێنرێت بەدەوڵەتی ئیسلامی تازە گەشەسەندووەوە، و فراوان کردنی دەسەڵاتی موسوڵمانەکان بەسەر ئەو ناوچانەدا بۆ بێ هێزکردنی قورەیش و ترساندنی خێڵە عەرەبەکانی تربوو کەهەمان بیرکردنەوەی قورەیشیان هەبوو.

ئیبن اسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (بە پێغەمبەری خوایان ﷺ ڕاگەیاند کە (بني مصطلق) بەسەرکردایەتی حارثی کوڕی ئەبو ضیرار خۆیان کۆکردۆتەوە بەمەبەستی هێرش هێنانە سەر مەدینە)[٧١].

واقیدی دەڵێت: (... ئەسپ سوارە کانیان لەناوچەکەی خۆیان هاتنە دەرەوە و پێشڕەویان کرد بەرەو مەدینە هەواڵەکەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیاند ئەویش بوریدەی کوڕی حەصیبی ئەسلەمی نارد بۆ دڵنیابوون لەڕاستی هەواڵەکە، ئەویش پاش دڵنیابوون لەڕاستی هەواڵەکە گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەلەهاتنی سوپاکە ئاگاداری کردەوە پێغەمبەری خواش ﷺ خەلکی کۆکردەوەو پێ ڕاگەیاندن)[٧٢].

ئیبن سعد (رحمه الله) دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ بوریدەی کوڕی حەصیبی ئەسلەمی نارد بۆ ئەوەی زیاتر لە بارودۆخەکە ئاگاداری بکاتەوە ئەویش خۆی وانیشاندا کە بۆ هاوکاریان هاتووە تا دواجار لە مەبەستیان تێگەیشت کە دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر مەدینە وئەویش هەواڵەکەی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ)[٧٣]. پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی موسوڵمانانی هاندا بۆ بەشداری کردن و دەرچوون بۆ ئەو غەزایە، لەم غەزایەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوسەری بەڕێزی عائیشەی کچی ئەبوبکری صدیقی لەگەڵ خۆیدا برد، هەروەك خۆی دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە سەفەر بکات یاخود دەربچێت بۆ غەزایەك تیروپشکی لەنێوان هاوسەرەکانیدا ئەنجام دەدا هەرکامێکیان ناوی دەرچووبایە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد)[٧٤].

---

(٧١) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٦٠٨)، ابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٧)، ابن كثير (البداية) (٤/١٨).
(٧٢) أخرجه: الواقدي (المغازي) (١/٤٠٤)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٤/٤٦).
(٧٣) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢/٦٣).
(٧٤) أخرجه: البخاري (٤١٤١).

(غەزای (بني مصطلق) ڕوویدا پێغەمبەری خوا ﷺ تیروپشکی لەنێوان هاوسەرەکانیدا ئەنجامدا هەروەك کاری هەمیشەی بوو من لەناویاندا دەرچووم)[٧٥]. لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دوشەممە دەرچووین لەمەدینە کە تەنها دوو شەو لەمانگی شەعبان مابوو [(٧٠٠) حەوت سەد جەنگاوەر][٧٦]. [وە (٣٠٠) سێ سەد ئەسپ سواری لەگەڵدا بوو][٧٧]. زەیدی کوڕی حارثی کردە سەرکاری مەدینە لە جێگای خۆی. لە گێڕانەوەیەکی تردا [ئەبوزەری غەفاری یاخود نومەیلەی کوڕی عبدوڵڵای لیثي داناوە][٧٨].

پێغەمبەری خوا ﷺ بەپەلە موسوڵمانانی کۆکردەوە و بەخێرایی ڕۆیشتن دووڕووەکان بەسەرکردایەتی عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بۆ یەکەم جار لەم غەزایەدا بەشدار بوون بەمەبەستی دەستخستنی دەسکەوتی شەڕو دروست کردنی پەشێوی و ئاژاوە نانەوە و دڵە ڕاوکێ لەناو موسوڵمانانەدا و هەوڵدان بۆنانەوەی جیاوازی و دوبەرەکی و ناکۆکی لە نێوانیاندا لەبەر ئەمانە بەشداری ئەم غەزایەیان کرد، لە ڕێگادا موسوڵمانەکان سیخوڕێکی (بني مصطلق) یان دەسگیرکرد بەر لەگەیشتنیان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ جابری کوڕی عبدوڵڵای ئەنصاری نارد بۆ کارێکی نهێنی و پێویست کاتێك گەڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لەسەر پشتی وشترەکەی، جابر ﷺ دەڵێت: (أرسلني رسول الله ﷺ [لحاجة] وهو منطلق الى بني المصطلق [فرجعت] واتيته وهو يُصلي على بعيره [ووجهه على غير القبلة] فسلّمتُ عليه فلم يرُدّ عليّ [فأشار اليّ] وقال لي بيده هكذا (واومءَ زهير الراوي بيده نحو الارض) وأنا اسمعه يقرأ يُومِيء برأسه فلما فرغ [دعاني فقال]: ((ما فعلت في الذي أرسلتُك له [انك سلّمت عليّ آنفاً وأنا أصلي](و)[انه لم يمنعني ان أردّ عليك الاّ اني كنت أصلي]))[٧٩]. واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ [بۆ کارێکی پێویست منی نارد] لەو کاتەی کە دەرچووم بۆ غەزای (بني مصطلق)

---

[٧٥] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٥١/٣).

[٧٦] أخرجه: الذهبي (تاريخ الاسلام) (٢٣٠/١).

[٧٧] أخرجه: الواقدي (المغازي) (٤٠٤/١).

[٧٨] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٤٥/٣).

[٧٩] أخرجه: احمد (١٤٥٩٤)، البخاري (١٢١٧)، مسلم (٥٤٠)، النسائي (١١٨٨)، ابن ماجة (١٠١٨) و اللفظ لمسلم والزيادة للبخاري واحمد وغيرها..

کاتێك [گەڕامەوە] پێیگەیشتم نوێژی دەکرد لەسەر پشتی وشترەکەی [بێ ئەوەی ڕووی لەڕوگە (قیبلە) بێت] سەلامم لێکرد وەڵامی نەدامەوە [ئاماژەی بۆ کردم] بەدەستی کە لەڕوگە ... دابنیشم منیش گوێم لێ بوو قورئانی دەخوێند لە نوێژەکەیدا (زوهێری راوی کە ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە بەدەستی ئاماژەی ڕوەو زەوی کرد) کاتێك تەواو بوو [بانگی کردم] فەرمووی: ((چیت کرد بۆ ئەو مەبەستەی ناردمیت [تۆ سەلامت لێکردم بەر لە ئێستا و منیش نوێژم دەکرد] [وەڵامم نەدایەوە هیچ شتێك ڕێگر نەبوو لەوەڵامدانەوەت تەنها نوێژکردنەکەم نەبێت])).

دواتر موسوڵمانان گەیشتنە ئاوەکانی (بني مصطلق) کە کەوتبوە نێوان (کدید) بەدوری (١٢٠کم) و عەسفان بەدوری (٨٠کم) لە مەککەوە موسوڵمانان لەناکاو هێرشیان بردە سەریان بێ ئەوەی ئاگایان لەخۆیان بێت ماوەیەك خۆیان ڕاگرت و شەڕیان کرد پاشان خوای گەورە تێکی شکاندن و بەزین و هەموویان دەسگیرکران تەنها سەرۆکەکەیان نەبێت کە ناوی (حرثي کوڕی ضرار) بوو، لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ هێرشی بردە سەر (بني مصطلق) کە لەبێ ئاگایدابوون خەریکی ئاودانی ئاژەڵەکانیان بوون شەڕکرا لەگەڵ ئەوانەی شەڕیان کرد و هەندێکیان کوژران و ئەوانی تریش دەسگیرکران، لەو ڕۆژەدا (جویریە کچی حارث) دەست پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت پاشان بووبە هاوسەری بەڕێزی)[80].

لەگێڕانەوەی ئیبن وئیسحاقیش (رحمه الله) دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تاگەیشتە سەر ئاوی (مریسیع) کە ئاوێکی (بني مصطلق) بوو ئەم غەزایە بەناوی غەزای ((مریسیع) هاتووە کەبەناوی ئەم ئاوەوە یە). لە ناوچەی (کدیری بەرەو کەناری دەریا) پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانەکانی ئامادەکرد و خەڵکەکەشی بەرە و ناوچەکە کێشان و شەڕ دەستی پێکرد خوای گەورەش (بني مصطلق)ی تێکشکاند ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوانی تریش لەگەڵ ماڵ و منداڵ و ئاژەڵەکانیان بوون بەدەسکەوتی موسوڵمانان و پێغەمبەری

[80] أخرجه: احمد (٤٨٧٣)، والبخاري (٢٥٤١)، ومسلم (١٧٣٠)...

خواش ﷺ دابەشی کردن بەسەر موسوڵماندا)[٨١]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: (پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و منداڵێکی ئێجگار زۆری دەستکەوت و بەسەر موسوڵمانەکاندا دابەشی کرد لە ناویاندا (جویریەی کچی حارث) هەبوو کە گەورەی ئافرەتانی هۆزەکەی بوو).[٨٢] لە گێڕانەوەیەکی تردا: (لەئەنجامدا (١٠) دەکەسیان لێکوژرا ئەوانی تریش هەمووی بەدیل گیران)[٨٣].

حافظ ابن حجر هەردوو گێڕانەوەکەی کۆکردۆتەوە و دەڵێت: (پێدەچێت لەکاتی دەست پێکردنی شەڕەکەدا (بني مصطلق) کەمێك خۆیان ڕاگرتبێت کاتێك کوژراو زۆر بوو لە ناویاندا شکستیان خوارد و ڕایانکرد و کتوپڕ موسوڵمانەکان گەیشتنە سەریان ئەوان لەسەر ئاوەکە خۆیان گرتەوە و ڕیزیان بەست و دامەزران وەك خۆئامادەکردن دووبارە بۆ جەنگ و دواجار شەڕەدەستی پێکردەوە لەنێوانیاندا پاشان موسوڵمانەکان سەرکەوتن بەسەریاندا)[٨٤]. دروشمی موسوڵمانەکان لەم غەزایەدا بریتی بوو لە (ئەی سەرکەوتوو بکوژە، بکوژە).

لە سنانی کوڕی وبرەی جوهەنی ﷺ دەفەرموێت: [كنا مع رسول الله ﷺ في غزوة المريسيع (وهي) غزوة بني المصطلق فكان [شعارنا]: ((يا منصور امِت امِت))][٨٥]. واتە: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری غەزای (مریسع)مان کرد کە غەزای (بني مصطلق) بوو دروشممان بریتی بوو لە (ئەی سەرکەوتوو بکوژە، بکوژە). پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك لەخاکی دوژمندا مایەوە وبتە گەورەکەی کە ناسرابوو بە(مناة) تێکشکاند وە بتخانەکەی

---

[٨١] اخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٦٠٤)، وابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٦)، وسنده ضعيف كما قال الشيخ الالباني في تخريج (فقه السيرة) (ص: ٣٠٨)، واخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٤٦).

[٨٢] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٤/٤٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (٦/١٤٢): رجاله ثقات.

[٨٣] اخرجه: الواقدي (المغازي) (١/٤٠٧).

[٨٤] انظر: (فتح الباري) (٧/٥٤٢).

[٨٥] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٩١٣)، والطبراني (الكبير) (٦٤٩٦) واسناده حسن كما قال الهيثمي (المجمع) (٦/١٤٥)، وقال الارناؤوط في تخريج (زاد المعاد) (٣/٩٩): اخرجه ابو الشيخ في (اخلاق النبي ﷺ) (ص: ١٥٥) (رقم: ٤٧٤) باسناد منقطع، وقال صاحب (صحيح السيرة) (رقم: ٤٠٩): اسناده حسن.

ڕوخاند. لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای (مریسیع) کۆتای پێهێنا هەرلەو شەودا (مناة)ی گەورەی تاغوەتی تێکشکاند و پەرستگاکەشی ڕوخاند کە کەوتبووە نێوان سەروی (مشلیل)و دەریاوە)[٨٦].

## هەوڵدان بۆ هەڵگیرساندنی ئاژاوە لەنێوان کۆچکارەکان و ئەنصاریەکاندا

سەرۆکی دووڕووەکان عبدوللای کوڕی ئوبەی هەلێکی قۆستەوە ئەویش بەڕووداوێك بوو لە نێوان کەسێکی کۆچکارو یەکێکی ئەنصار ڕوویدا ویستی بەم جۆرە دەمارگیری خێڵایەتی بورژێنێت وە ئاژاوە و پەشێوی و ناکۆکی بنێتەوە لە نێوان کۆچکردوەکان و پشتیوانەکان لەڕاستیدا ئەو ڕووداوە بووە هۆی دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی ئەوان بۆ موسوڵمانان.

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەڵێت: (بەشداری ئەم غەزایەمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکانێکمان لە عەرەبە دەشتەکیەکان لەگەڵدا بوو پەلەمان دەکرد بۆ گەیشتن بە ئاوەکە بەڵام دەشتەکیەکان هەموو جار پێشمان دەکەوتن، یەکێك لەوان زووتر گەیشتە سەرئاوەکە حەوزێکی لێدروست کرد و چواردەورەکەی لەبەرد هەڵچنی و ڕێکی خست بۆ [هاوەڵەکانی] خۆی هەتا دێن لەوێدا: پیاوێکی ئەنصاری هات بەرەوە لای حەوزەکە و ڕێشمەی وشترەکەی شل کردوەوە بۆئەوەی ئاو بخواتەوە کۆچەریەکە ڕێگەی نەدا [ئەنصاریەکەش بەردێکی لەدیواری حەوزەکە دەرهێناو فڕێیدایە ناو ئاوەکە وئاوەکەش ڕژاو لەبەری ڕۆیشت و لێڵ بوو وە کەمی کردەوە، کۆچەریەکەش توڕەبو دارێکی بەرزکردەوەو کێشای بەسەری ئەنصایەکەداو سەری شکاند])[٨٧].

لەگێڕانەوەکەی ئیبن اسحاقدا دەڵێت: (کاتێك غەزای (بني مصطلق) تەواو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئاوەکە خێوەتگەی هەڵدا بە مەبەستی ماوەیەك مانەوە لەوێدا، خەڵکەکەش ئاویان دەبرد، عومەری کوڕی خەطاب ﷺ کرێ گرتەیەکی لە هۆزی غەفاری

---

[٨٦] اخرجه: ابن ابي حاتم (التفسير) (٤/ ٢٥٠)، وقال الحافظ في (الفتح) (٨/ ٨٣٧): مرسلٌ جيد.

[٨٧] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٠٤١)، والترمذي (٣٣١٣) وقال حسن صحيح واللفظ له، والحاكم (٢/ ٤٨٨) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٤٠): صحيح الاسناد.

لەگەڵ بوو بەناوی (جەهجاهی کوڕی مەسعود) جڵەوی ئەسپەکەی بۆ ڕادەکێشا لەسەر ئاوەکە لەگەڵ سینانی کوڕی وەبرەی جوهەینی هاوپەیمانی بنی عوف کوڕی خەزرەج بوو بەشەڕیان)[٨٨].

دوو گێڕانەوەی تریش هەن چۆنیەتی ڕوودانی ئەم کارەساتەمان بۆ باس دەکەن کەلە نێوان ئەو دوو کەسەدا ڕوویداوە: -

لە جابرەوە ﷺ دەڵێت: ([لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری غەزای (بني مصطلق) مان کرد][٨٩] [لەناو کۆچەریەکان کەسێکی سوعبەتچی هەبوو بەدەستی لەپشتی ئەنصارییەکی دا ئەنصاریەکەش زۆر تورەبوو لەسەر ئەمە بوو بەشەڕیان ئەنصارییەکە هاواریدە کردە][٩٠] ئەنصارییەکان و کۆچەریەکەش هاواری دەکردە کۆچکارەکان [خەڵکەکەش کۆبونەوە لەسەر هەردوولایان هەندێکیان دەیانوت: کۆچکارەکان هاوار بمان گەنێ و فریامان کەون هەندێکیش دەیانوت: ئەنصاریەکان بمان گەنێ و فریامان کەون][٩١]. [ئینجا بوو بەکێشمە کێشمیان تاوەکو کەوتنە ناوبزیوانیان][٩٢]. دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست فەرمووی: ((ما بال دعوى الجاهلية)) (ئەوە چیە هاوارکردنی سەردەمی نەفامی دەکەن) [پاشان فەرمووی: ئەو کێشەیە چیە؟][٩٣] وتمان: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مێرد منداڵ بوو بەشەڕیان].[٩٤] یەکێك لە کۆچەریەکان لە یەکێکی ئەنصاری داوە. فەرمووی: ((دعوها فانها منتنة – وفي رواية [خبيثة]: [لابأس لينصر

---

[٨٨] أخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٦٠٤)، وابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٥)، واللفظ له، والبيهقي (الدلائل) (٤/٤٦)، ويؤيده رواية عروة وقال عنه الحافظ (الفتح) (٨/٧٣٨): مرسل جيد، واصله في الصحيحين، وقال صاحب (صحيح السيرة) (٤١٣): حسن لغيره.

[٨٩] أخرجه: احمد (المسند) (١٥٢٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

[٩٠] أخرجه: البخاري (٤٩٠٣).

[٩١] أخرجه: احمد (المسند) (١٤٦٣٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

[٩٢] أخرجه: ابن ابي حاتم (التفسير) (٥/٢٧) وقال الحافظ (الفتح) (٨/٨٣٧): مرسل جيد.

[٩٣] أخرجه: البخاري (٣٥١٨).

[٩٤] أخرجه: مسلم (٢٥٨٤).

الرجل أخاه ظالماً او مظلوماً، فان كان ظالماً فلينههُ فانه له نُصرة وان كان مظلوماً فلينصـرهُ))[٩٥].
واتە: (وازی لێ بهێنن ئەوە بۆگەنە لە گێڕانەوەیەکی تـردا [ئـەوە پیسـە] هیچی تێدا نییە هەموو کەسێك با براکەی خۆی سەربخات ئەگەر ستەم کاربێت ڕێگەی نەدا ستەمەکەی بکات ئـەوەش سـەرکەوتنە بۆ ئـەو ئەگەر ستەم لێکراو بوو پشتی بگرێـت و سـەریبخات.
[جابر ﷺ دەڵێت: ئەنصاریەکان ژمارەیان زۆرتر بـوو لـە کۆچکەرەکان لەسـەرەتای هاتنیان بۆ مەدینە پاشان کۆچکاران ژمارەیان لەوان زیـاتربوو][٩٦]. (هـەواڵی ئـەم ڕووداوەش گەیشت بـە عبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی) (سـەرۆکی دووڕووەکـان) لـە گێڕانەوەیـەکی تـردا: (هـەموو دووڕووە دڵ نەخۆشەکان خۆیان دایە پـاڵ عبـدوڵڵای کوڕی ئوبـەی و پێیـان وت: تۆ جێی ئومێدمان بویت و هانت دەدایـن ئێستاش سود و زیانـت بەدەست نییـە وە ئـەو جل شڕو گەڕییدانەت بەسەر ئێمەدا زاڵکرد کە (مەبەستیان لـەتازە کۆچکاران بـوو)[٩٧]. (عبـدوڵڵای کوڕی ئوبەی توڕەبوو پاشان وتی: [ئەوەشیان پێمان کرد ئێمە بەسەر خۆماندا زاڵمان کردن لـەوڵاتی ئێمـەدا زۆربـوون و زیادیـان کـرد].[٩٨] [تاکار گەیشتە ئـەوەی بەگژمانـدا دێن و شەڕمان لەگەڵ دەکەن][٩٩]. دواتر بەئەوانەی دەورو پشتی خۆی وت: (ئێوە هیچ مەبەخشن بەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردان بۆ ئەوەی لـەدەوری کۆنەبنـەوە و بـڵاوەی لێبکەن (مەبەستی خێڵەکیە کۆچکارەکان بوون) چونکە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ خواردنیـان دەخوارد و لە مزگـەوت دەمانـەوە ئەنصارییەکانیش خواردنیـان بـۆ ئامـادە دەکـردن پاشـان وتـی: (ئەگەر ئەوانە دەوری (محمد) یان چۆڵ کرد ئینجا خواردن بۆ (محمد)بەرن بۆ ئەوەی بۆ خۆی لێی بخوات لەگـەڵ ئەوانـەی لەگەڵیـدان پاشـان بـە هاوەڵـەنی خـۆی وت)[١٠٠]: [وەڵڵاهـی ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مـەدینە دەبێت بـە هێـزو خـاوەن دەسـەڵاتەکانمان بـێ هێـزو زەبونـەکانی شار

---

[٩٥] أخرجه: احمد (١٤٤٦٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، ومسلم (٢٥٨٤).
[٩٦] أخرجه: البخاري (٤٩٠٥).
[٩٧] أخرجه: ابن ابي حاتم (التفسير) (٥/٢٧)، وقال الحافظ في (الفتح) (٨/٨٣٧): مرسل جيد.
[٩٨] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٥).
[٩٩] أخرجه: البخاري (٣٥١٨). أخرجه: البخاري (٣٥١٨).
[١٠٠] أخرجه: الترمذي (٣٣١٣)، وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٤٠): صحيح الاسناد.

دەربکەین ئینجا ڕووی کردە ئامادەبووانی دەوری خۆی لە خزمەکانی و پێی وتن: ئەوە خۆتان چیتان بە خۆتان کرد، وڵاتتان بۆ خستنە سەر پشت و ماڵتان لەگەڵ بەش کردن وەڵاهی ئەگەر دەستان بەسامانی خۆتانەوە بگرتایە و هیچتان پێ نەبەخشینایە [ئەوکاتە لە وڵاتەکەتانەوە بەرەو شوێنێکی تر دەڕۆیشتن][(١٠١)]. زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێت: (من لەپشتی مامەوە سواری وشترەکە بووم گوێم لە قسەکانی عبدوللا بوو ئێمە لە خاڵوانیان بووین] قسەکانم بۆ مامم گێڕایەوە ئەویش ڕۆیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت: [پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بەشوێن عبدوللای کوڕی ئوبەیدا] ئەویش هات دەستی کرد بە سوێند خواردن و نکۆڵی کرد و [بیانوی هێنایەوە] [بەوەی ئەو قسانەی نەکردووە] هاوەڵەکانی ئەو دووڕووەش هاتن سوێندیان خوارد لەسەری، وە پێغەمبەری خواش ﷺ باوەڕی پێکردن منیش بەدرۆ خرامەوە و [ئەنصاریەکانیش کەوتنە سەرزەنشت کردنم])[(١٠٢)]. [هەندێك هاوەڵانی عبدوللای کوڕی ئوبەی لەبەردەم پێغەمبەردا دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرێت ئەو مێرد منداڵە بە هەڵەدا چوو بێت و قسەکانی ئەوی جوان نەبیست بێت و تێی نەگەیشت بێت].[(١٠٣)] [دواتر وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی بەدرۆ خستەوە] [مامم هات بۆ لام وتی: ئەوەت دەویست پێغەمبەری خوا و موسوڵمانان لێ تورە بن] [لێرەدا دوچاری خەم و خەفە تێکی گەورە بووم هاوشێوەی نەبوو لە ژیانمدا] [گەڕامەوە ماڵەو زۆر بەدڵتەنگی وغەمباریەوە].[(١٠٤)] (دواتر نوستم). [عومەری کوڕی خەطاب ﷺ کاتێك ئەوەی بیست هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی]: [لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باڵەگەردنی ئەو دووڕوە بدەم پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (([یاعمر] دعه لا یتحدث الناس ان محمداً یقتل اصحابه][(١٠٥)] [لا ولکن اذن بالرحیل])). واتە: (([ئەی عومەر] وازبهێنە خەڵکی دەڵێن محمد ﷺ هاوەڵانی خۆی دەکوژێت]. [ئەو کارە

---

[(١٠١)] اخرجه: ابن هشام (السیرة) (٣/٢٤٦).

[(١٠٢)] اخرجه: البخاري (٤٩٠١-٤٩٠٣).

[(١٠٣)] اخرجه: ابن هشام (السیرة) (٣/٢٤٦)، والطبري (التاریخ) (٢/٦٠٤)، والبیهقي (الدلائل) (٤/٤٦).

[(١٠٤)] خرجه: الترمذي (٣٣١٤)، وصححه الشیخ الالباني في (صحیح الترمذي) (٢٦٤١).

[(١٠٥)] اخرجه: البخاري (٣٥١٩)، ومسلم (٢٥٨٤)، ابوداود (٢٧٥٣)، ابن حبان (٥٩٩٠) واللفظ له.

ناکەین بەڵکو فەرمان دەدەم بە ڕۆیشتن و بارکردن لێرە])، ئەویش لەکاتێکدا بووی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تیایدا نەدەڕۆیشت خەڵکەکەش هەستان و بارییان کرد...

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: [لەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری ڕۆیشتنی دا و ڕۆیشتن گەیشتن بە ئوسەیدی کوڕی حوضەیری ئەنصاری سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وەڵامی دایەوە و پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵاهی تۆ لە کاتێکدا دەڕۆیت کاتی ڕۆیشتن نییە هۆکارەکەی چیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((او ما بلغك ما قال صاحبكم))؟ واتە: ((ئەت زانیوە و پێت نەگەیشتووە هاوەڵەکەتان چی وتووە؟ وتی: کام هاوەڵ ئەی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی: (عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) وتی: چی وتوە؟ فەرمووی: ((زعم انه ان رجع الى المدينة اخرج الأعز منها الأذل)) واتە: ((پێی وایە بگەڕێینەوە بۆ مەدینە دەسەڵات دارەکان زەبوونەکان دەردەکەن)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا تۆ ئەو وەدەر دەنێیت لە مەدینە ئەگەر حەزبکەیت وەڵاهی ئەو بێ ڕێزو زەبوونە و تۆش دەسەڵاتدار و بەڕێزی لامان، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمی بنوێنە لە بەرامبەری دا وەڵاهی کەخوای پەروەردگار تۆی بۆ ناردین خزمەکانی خەریکی دروست کردنی تاجی پاشایەتی بوون بۆی تا بینێنە سەری ئێستا وا هەست دەکات تۆ دەسەڵاتت لێ زەوت کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە خەڵکەکەی بە ڕۆیشتن سەرقاڵ کرد هەتا ئێوارە وە شەوەکەشی تابەیانی، سەرەتای ئەو ڕۆژەش هەر لە ڕۆیشتندابوون هەتا گەرمای ڕۆژ زۆری بۆ هێنان ئینجا لە شوێنێک خستیان پاش کەمێک بەهۆی زۆر ڕۆیشتنیانەوە خەویان لێکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ڕۆ ڕۆیشتنەی بۆ ئەوە کرد تا خەڵکەکە سەرقاڵ بکات قسەو قسەڵۆک لە سەر عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی نەکەن کە سەربکێشێت بۆ نانەوەی ئاژاوە لەناو موسوڵمانەکاندا].[١٠٦]

[زەید دەڵێت کاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتم.... سەرم داخستبوو بەخەمباری پێغەمبەری خواش ﷺ گەیشتە لام و گوێچکەی ڕاتەکاندم بە زەردەخەنەوە تەماشای کردم ئەوەندە دڵخۆشی کردم وەك ئەوەی کەبە ئەمری لەدونیادا بمێنمەوە پاشان ئەبوبکری صدیق پێم گەیشت و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ وتیت؟ منیش وتم: هیچ

---

(١٠٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٦).

شتێك تەنها ئەوەندە نەبێت دەستی بەگوێچکەمدا هێناو بەڕومدا پێکەنی ئەویش وتی: مژدەت لێبێت پاشان عومەری کوری خەطابیش پێم گەیشت بەهەمان شێوەی ئەبوبکرم وەڵامم دایەوە کاتێك ڕۆژ بووەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی (المنافقین)ی بۆمان خوێندەوە].[١٠٧] [پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردمە لای خۆی منیش هەستام چووم [سورەتەکەی بۆ خوێندمەوە دواتر فەرمووی: ((انّ الله قد صدّقك [یازید] فدعاهم النبي ﷺ (اي: المنافقین) لیستغفر لهم فلوّوا روؤسهم وكانوا رجالاً اجمل شيء)). واتە: خوای گەورە ڕاستگۆیی تۆی دەرخست (ئەی زەید) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دووڕووەکانی کرد بۆ ئەوەی داوای لێخۆش بۆنیان بۆ بکات لەلای خوای گەورە بەڵام ئەوان کەوتنە سەر بادان بە لەخۆبای بونەوە و گوێڕایەڵی نەبوون و هەمووشیان پیاوانێکی ڕوخسار جوان بوون][١٠٨].

## هەڵکردنی بایەکی بەهێز بۆ مردنی سەرکردەیەکی دووڕووەکان

لەڕێگای گەڕانەوەدا بایەکی توندی بەهێز بەسەر موسوڵمانەکاندا هەڵیکرد بەجۆرێك ترسیان لێنیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندن کە ئەوە لەبەر مردنی گەورە پیاوێکی دووڕووەکان هەڵیکردووە، ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (لەدوایدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی ڕۆیشتنی بۆ خەڵکەکە دەرکرد و ڕێگای حیجازی گرتەبەر هەتاوەکو گەیشتە حیجاز لەسەرو ئاوەی ئەقیع لەسەر ئاوێکی هەڵقوڵاوی سارد و سازگار دابەزین و خستیان کە ناوی (بقعاء) بوو پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت [کاتێك نزیك مەدینە بونەوە][١٠٩]. بایەکی بەهێز بەسەر خەڵکەکەدا هەڵیکرد [هەتا وای لێ هات بارەکانی دەخستن][١١٠]. [وە

---

[١٠٧] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٠٤١)، الترمذي (٣٣١٣)، والحاكم (٤٨٨/٢) وصححه ووافقه الذهبي، و صحح اسناده الشيخ الالباني رحمه الله في (صحيح الترمذي) (٢٦٤٠).

[١٠٨] أخرجه: البخاري (٤٩٠٣، ٤٩٠٢، ٤٩٠١).

[١٠٩] أخرجه: مسلم (٢٧٨٢)، احمد (١٤٣٧٨) وقال محققه: حديث صحيح اسناده قوي على شرط مسلم.

[١١٠] أخرجه: ابن حبان (٦٥٠٠) وقال محققه: حديث صحيح.

زۆری نەمابوو سوارەکانیش بخاتە ژێرخۆڵەوە و بزربیان بکات].[١١١] خەڵکەکە ترسان لێنیشت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لا تخافوها فانما هبّت لموت عظيم من عظماء الكفار – في رواية [بعثت هذه الريح لموت منافق] فلما قدموا المدينة وجدوا رفاعة بن زيد بن تابوت أحد بني قينقاع وكان عظيماً من عظماء يهود [وكان قد اظهر الاسلام وكان] كهفاً للمنافقين مات في ذلك اليوم – في رواية [فوجدنا منافقاً عظيم النفاق مات] يومئذ))[١١٢]. واتە: ((لێی مەترسن ئەوە هەڵیکردووە لەبەر مردنی یەکێك لەسەرکردەکانی بێ باوەڕان. لە گێڕانەوەیەکی تردا [ئەو بایە نێردراوە بۆ مردنی دووڕوویەك] کاتێك گەیشتنەوە مەدینە بیستیان ڕیفاعەی کوڕی زەیدی کوڕی تابوت مردووە کەیەکێك بوو لەسەرکردەکانی جولەکەی بنی قەینوقاع [کە بەڕواڵەت موسوڵمان بونی خۆی ئاشکرا کردبوو] لە ژێرەوەش لەگەڵ دووڕووەکان دەستی تێکەڵ کردبوو بەمردنی لەو ڕۆژەدا کەلێنێکی لە ڕیزی دووڕووەکاندا دروست کرد)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا [بینیان ئەو ڕۆژە دووڕوویەکی گەورە لە دووڕووەکانن مردووە]. لەگێڕانەوەیەکی تردا جابر ﷺ دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم بایەکی بۆگەنی پیس هەڵیکرد فەرمووی: ((اتدرون ما هذه؟، هذه ريح الذين يغتابون المؤمنين)) واتە: ((دەزانن ئەو بایە چیە؟ ئەوە با وبۆنی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی باوەڕداران دەکەن)). لە گێڕانەوەیەکی تردا ((ان أناساً من المنافقين اغتابوا أناساً من المسلمين فبعثت هذه الريح لذلك))[١١٣] واتە: ((خەڵکانێك لەدووڕووەکان غەیبەتی خەڵکانێك لە موسوڵمانەکانیان کردووە لەبەر ئەوە ئەو بایە هەڵیکردووە)). ئەمەش موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ

---

(١١١) أخرجه: مسلم (٢٧٨٢).

(١١٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٤٧)، والطبري (التاريخ) (٢/٦٠٤)، ومسلم (٢٧٨٢)، واحمد (١٤٣٧٨) وقال محققه: حديث صحيح، ابن حبان (٦٥٠٠) وقال محققه: صحيح، وابو يعلى (٢٣٠٧)، واللفظ لابن اسحاق والزيادة للمسلم وابن حبان.

(١١٣) أخرجه: البخاري (الادب المفرد) (٧٣٣، ٧٣٢) وحسنه الشيخ الالباني رحمه الله في (صحيح الادب المفرد) (٥٦٢، ٥٦٣).

ئەگەر نا دیاردە ئاسایەکان هیچ پەیوەندیەکیان نییە بە ژیان و مردنی هیچ کەسێکەوە (بۆ زیاتر دڵنیای سەیری باسی مردنی ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەری خودا ﷺ بکە).

ئەم ڕووداوەش هەریەکە لە موسای کوڕی عوقبەو عوروەی کوڕی زوبەیر باسیان کردووە و دەڵێن: (کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە سەر ئاوی (بقعاء) لەسەر ڕێگای عوسفان خەڵکەکە باریان دادەگرت و پشتیان لێکردەوە و بەمەبەستی حەسانەوە و سرەوتن، دوچاری بایەکی بەهێز بوون بە جۆرێك ترسیان لێنیشت وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بایە چیە لەم کاتەدا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مات اليوم منافقٌ عظيم النفاق، ولذلك عصفت، وليس عليكم منها بأس ان شاءالله، وكان موته غائظاً للمنافقين)) واتە: ((ئەمڕۆ یەکێك لە گەورەی دووڕووەکان مردووە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم بایە هەڵیکردووە (انشاءالله) بۆسەر ئێوە هیچ زیانێکی نابێت، مردنەکەشی دووڕووەکانی خەفەتبار و توڕەکردووە)). لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا بایەکەی خست و خەڵکیش خۆیان کۆکردەوە و بۆ ئەوەی بڕۆن، لەناو وشترەکاندا وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ دیارنەما، هاوەڵە بەڕێزەکان بەپەلە ڕۆیشتن بۆ دۆزینەوەی، یەکێك لەدووڕووەکان کەلەناو ئەنصاریەکاندا بوو وتی: ئەوە ئەوانە وابەگورجی بۆ کوێ دەڕۆن؟ هاوەڵەکان وتیان: بۆگەڕان بەدوای وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ونبووە، دووڕووەکەش وتی: ئایە خوا بۆ پێی نالێت وشترەکەی بۆ کوێ چووە و لە کوێیە! هاوەڵەکان قسەکەیان پێ ناخۆش بوو پێیان وت: خوا بت کوژێت دووڕووی دەکەیت، ئەی بۆچی غەزادەکەیت کە ئەوە لە دڵتدایە؟ دووڕووەکەش وتی: هاتووم لەگەڵتان تاکو شتێکم لەدونیادا دەست بکەوێت، وەڵلاهی (محمد) هەواڵی زۆر گەورەترمان لە ونبونی وشترەکەی پێدەدات! هاوەڵەکانی سەرزەنشتیان کرد و پێیان وت: وەڵلاهی تۆ و ئێمە هەرگیز بەیەکەوە هەڵناکەین ئەگەر بمانزانیایە ئەوە لەدڵ و دەروونتدایە بۆ ساتێکیش لەگەڵ تۆدا نەدەبووین، دووڕووەکە ماوەیەك لەگەڵیان مایەوە، پاشان هەستا و بەجێیهێشتن خوای گەورەش بەویستی خۆی قسەکانی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ و گوێ بیستی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دووڕووەکەش گوێی لێبوو ((ان رجلاً من المنافقين شمتَ ان ضلّتْ ناقةُ رسول الله ﷺ فقال: افلا يُحدِّثُهُ الله بمكان راحلته، وان الله عزوجل قد أخبرني بمكانها، ولا يعلم الغيب الا الله وانها في هذا الشعب المقابل لكم وقد تعلّق زمامُها بشجرةٍ)) واتە:

((پیاوێك لەدووڕووەکان خۆشحاڵە کە وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بزربووە دەڵێت: ئەوە بۆ خوا شوێنی وشترەکەی پێ ناڵێت تالێی نەگەڕێن من خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوم کەلەکوێیە، هیچ کەسیش غەیب نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت وشترەکە ئەوەتا والە ناو ئەو دۆڵەی بەرامبەرتانە ڕێشمەکەی بەدارێکەوە گیربووە و بەستراوەتەوە پاشان هێنایانەوە بەو شێوەیەی کە فەرمووی، دووڕووەکەش بە خێرایی ڕۆیشت تاگەیشتە ئەو کەسانەی کە قسەکەی لە لاکردبوون ئەوانیش لەشوێنی خۆیان دانیشتبوون و کەسیان لەشوێنی خۆیان هەڵنەستابوون وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا هیچ کەسێك لەمنێوە لە شوێنی خۆی هەڵنەستاوە و چوو بێت بۆ لای (محمد) قسەکانی منی بۆ گێڕابێتەوە؟ وتیان، وەڵڵاهی شتی وانەبووە کەسمان لە شوێنی خۆی هەڵنەستاوە لەدوای ڕۆیشتنی تۆ لەلامان، وتی: من گوێبیستی قسەکانی خۆم بووم لە لای محمد ﷺ وەڵڵاهی دەڵێت ئەمڕۆ موسوڵمان بووم، من گومانم هەبوو لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو. گەواهی دەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ هاوەڵەکانی وتیان بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی داوای لێخۆش بوونت بۆ بکات لای خوای گەورە، پاشان چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە دانی نا بە تاوانەکەیدا و پێغەمبەریش ﷺ داوای لێخۆش بونی بۆ کردلای خوای گەورە جابر ﷺ دەڵێت: پاشان گەڕاینەوە بۆ مەدینە بینیمان ئەو ڕۆژە یەکێك لەسەرانی دووڕووەکان مردووە)[١١٤].

## عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی نوبەی داوای مۆڵەت دەکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کوشتنی باوکی

عەبدوڵڵا هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوابوو ﷺ ناوی خۆی (حرباب) بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی گۆڕی بۆ عبدوڵڵا (واتە: بەندەی خوا) پاشان خوا لێی ڕازی بێت لەجەنگی یەمامە لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن شەهید کرا.

عکرمە و ابن زید دەڵێن: (عبدوڵڵا لەڕووی باوکیدا کەناوی عەبدوڵلای کوڕی نوبەی بوو لەسەر ڕێگای چونە ژوورەوەی مەدینە ڕاوەستا بوو پێی وت: بوەستە سوێند بە خوا

---

(١١٤) أخرجه: ابو نعيم في (الدلائل) (رقم: ٤٤٣)، والبيهقي في (الدلائل النبوة) (٤/٥٩).

ناچیتە ناو شار هەتاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتت نەدات کاتێك پێغەمبەر هات داوای مۆڵەتی چوونە ناو شاری لێکرد پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی داو عەبدوڵلای کوڕی لەگەڵیدا ڕۆیشت هەتا بردیە ناو مەدینە).[115] وە پێی وت: (وەڵلاهی ناچیتە ناو شار هەتاوەکو دانی پێدانەنێیت کە تۆ زەبوون و بێ دەسەڵاتیت و پێغەمبەری خوا ﷺ دەسەڵاتدار و ڕێزدارە، ئەویش دانی پیاناو ئەوەی کرد).[116] عەبدوڵلا هەربەوە نەوەستا داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بۆ ئەوەی باوکی بکوژێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی نەدا وە داواشی لێکرد ئەوەندەی لە ژیانیدا ماوە بە باشترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: [عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا وتی: سوێند بەو زاتەی ڕێزی لە تۆ گرتووە ئەگەر بتەوێت کەللە سەریت بۆ دێنم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((لا ولكن برّ اباك واحسنْ صحبتهُ)) واتە: ((نەخێر بەڵکو چاکە لەگەڵ باوکت بکە و بەباشترین شێوەش ڕەفتاری لەگەڵدا بنوێنە))].[117] لە گێڕانەوەیەکی تردا ((بل نترفق به ونحسن صحبَتهُ ما بقي معنا)) واتە:((بەڵکو نەرم و نیان دەبین لەبەرامبەریدا و بەباشترین شێوەش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەین ئەوەندەی لەژیانیدا ماوە لەگەڵماندا)). لەوە بەدواوە ئەگەر هەر کارێکی نەشیاوی بکردایە ئەوە خزمەکانی ڕووبەڕووی دەبونەوەو زۆر بە توندی سەرزەنشتیان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئەوەی پێگەیشت لە بارەی هەڵسوکەوتی خزمەکانی لەگەڵ عەبدوڵلادا بە عومەری کوڕی خەطابی فەرموو: ((كيف ترى يا عمر اما والله لو قتلتهُ يوم قلت لي: اقتله لأرعدت له آنفٌ لو امرتُها اليوم بقتله لقتلته))

---

[115] أخرجه: ابن كثير في (التفسير) (٣٧٢/٤)، (البداية) (١٥٨/٤)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٤١٤): حسن لغيره.

[116] أخرجه: الترمذي (٣٣١٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٤١).

[117] أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٢٣١)، والبزار (٢٧٠٨)، وابن حبان (٤٢٨)، الحميدي (١٢٤٠)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣٤/٤)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٣٤/٨): أخرج ابن منده نحوه باسناد حسن، وقال الهيثمي (المجمع) (١٥٧٦١): رواه البزار ورجاله ثقات، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٢٢٣): اسناده حسن.

قال: قال: عمر: قد والله علمتُ لأمر رسول الله ﷺ أعظمُ بركةً من امري))[١١٨]. واتە: ((دەبینی ئەی عومەر سوێند بەخوا ئەگەر بمان کوشتایە ئەو ڕۆژەی کەپێت وتم بیکوژم ئەوە باروودۆخەکە دەشڵەژا لەبەرژەوەندی ئەو خەڵکمان پێوە نەدەما، ئاوی بەرزدەبووە بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ فەرمان بکەم بە کوشتنی خەڵکەکە دەیکوژن)) عومەر وتی: "بەدڵنیاییەوە دەزانم فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ بەرەکەتدار ترو بەجێترە لەبیرو بۆچونی من".

## ڕووداوی ئیفك(واتە: بوختان)

دوای هەرەس هێنانی دووڕووەکان لەهەڵگیرساندنی ئاژاوە و دووبەرەکی نانەوە و وروژاندنی دەمارگیری سەردەمی نەفامی لە نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووداوێکیان فۆستەوە ئەویش دواکەوتنی دایکی باوەڕداران عائیشە بوو لە سوپای موسوڵمانان بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێ ئازار بدەن وەتانەو تەشەر لە کەسایەتی ڕێزدار وبەرزی بدەن دوای ئەوەی شکستیان خوارد لە تانەدان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام خوای گەورەش پیلانەکەی پوچەڵ کردنەوەو ڕیسواو نائومێدی کردن.

وە پاکی و عیفەت و ڕاستگۆیی کچی ڕاستگۆی لە ئاسمانەوە نارده خوارەوە بۆ سەر زەوی لە سورەتی (نور)دا، چۆنیەتی ڕوودا و چیرۆکەکە عائیشە (رضی الله عنها) بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر بەنیازی سەفەر بووایە تیروپشکی لە نێوان هاوسەرەکانیدا دەکرد هەرکامێکیان ناوی دەربچوایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، [کاتێك غەزای (بنی مصطلق) هاتە پێش وەك کارێکی هەمیشەی تیروپشکی لەنێوان هاوسەرەکانیدا کرد].[١١٩] ناوی من دەرچوو و منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشتم ئەمەش دوای دابەزینی ئایەتی (حجاب) بوو، منیان هەڵدەگرت لەناو کەژاوەدا و لەسەر پشتی وشتر دایان

---

(١١٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٤٨/٤)، والطبري (التاريخ) (٦٠٨/٢)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٤١٤) والحديث حسن لغيره، وفي رواية عن عروة قال: (استأذن حنظلة بن ابي عامر وعبدالله بن عبدالله بن ابي ابن سلول في قتل ابويهما فنهاهما عن ذلك) أخرجه ابن شاهين باسناد حسن الى عروة كما قال الحافظ في (الاصابة) (٣٦١/١) (١٨٦٣).

(١١٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٥٤/٣).

دەنام، [ئەگەر بە نیازی ڕۆیشتن بوونایە کەژاوەکەیان دادەگرت و وشتریان بۆ ئامادەدەکردم منیش دەچوومە ناو کەژاوەکەوە ودادەنیشتم، ئینجا ئەو کەسانەی تەرخان کرابوون دەهاتن، پایەکانی کەژاوەکەیان دەگرت و بەرزیان دەکردەوە بۆ سەرپشتی وشترەکە دوای دانانی بەحەبل توند دەیان بەستەوە ئینجا ڕێشمەی وشترەکەیان دەگرت و دەڕۆیشتن، کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزاکە بۆوە گەڕایەوە بەرەو مەدینە، هەتاوەکو لە مەدینە نزیک بونەوە لە شوێنێك لایاندا و خستیان بەمەبەستی حەسانەوە، بەشێك لەشەو لەوێدا مانە و پاشان فەرمانی ڕۆیشتنی دەرکرد خەڵکەکەش کەوتنە ڕۆیشتن] [١٢٠]. من لەسەرو بەندی خۆئامادەکردن بۆ ڕۆیشتن [هەستام چووم بۆ سەرئاو ملوانکەیەکم لە ملدابوو کەنقێمکی لەسەر بوو لە شاری (ظفار)ی یەمەن دروست کرابوو] ڕۆیشتم هەتاکو لەسوپاکە دوورکەوتمەوە (بەمەبەستی دەست بەئاو گەیاندن) کاتێك تەواو بووم [ملوانکەکەم لەملدا نەمابوو بێ ئەوەی بزانم من گەڕامەوە لای کەژاوەکەم] دەستم لەگەردنمدا دەبینم ملوانکەکەم پساوە دەستم برد بۆ ملوانکەکەم بینیم نەماوە لەو کاتەشدا خەڵکەکە خەریکی بارکردن و ڕۆیشتن بوون، [گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی ڕۆیشت بووم بەدوایدا گەڕام تا دۆزیمەوە] [١٢١]. دوای ئەوەی ملوانکەکەم دەست کەوتەوە ئەو کەسانەش کە کەژاوەکەوی منیان هەڵدەگرت هاتبوون کەژاوەکەیان هەلگرتبوو خستبوویانە [سەر] پشتی وشترەکەم لەبەر ئەوەی بەگەلەکۆمەکی [کەژاوەکەیان بەرزدەکردەوە وایانزانی بوو من لەناویدام]، ئافرەتانیش لەو ڕۆژگارەدا سوکەڵەبوون گۆشتن و قەڵە و نەبوون پارویەکیان خواردن دەخوارد خەڵکەکەش هەستیان بەگۆڕان نەکردبوو لەکەژاوەکەدا [پاشان بەرزیان کردبۆوە وشترەکەیان پێش خۆیان دابوو] ڕۆیشت بوون دوای ئەوەی سوپاکە ڕۆیشت. هاتمەوە [شوێنی خۆم] هیچ کەسێکی لێنەبوو [کە بانگی بکەم و وەڵامم بداتەوە] چوومە [هەمان شوێنی] پێشوم واگومانم برد کەئەوان هەستیان کرد بێت منیان لەگەڵ نەماوم و دواتر بەدوامدا دێنەوە کاتێك [لەشوێنەکەی خۆم] دانیشتبووم خەو زۆری بۆهێنام نوستم، صەفوان کوڕی موعطلی سولەمی لەدوای سوپاکەوە دەمایەوە بەمەبەستی کۆکردنەوەی کەل

---

(١٢٠) أخرجه: نفس المصدر.

(١٢١) أخرجه: نفس المصدر.

و پەل بەجێماوی سوپاکە، سەفوان دێتە لای شوێنەکەی من ڕەشایی مرۆڤێکی نوستووی بەرچاو دەکەوێت لەمن نزیک دەبێتەوە دەمناسێتەوە چونکە پێش فەرزبوونی بالاپۆش (حجاب) منی بینی بوو [کەمنی بینی وتی: (اناالله واناالیه راجعون) ئەوە ژنەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ. من خۆم لەجلەکانم پێچابوو] لەدەنگی ئەو بەخەبەرهاتم [سەرەتا بەگەڕانەوەی ترسم لێنیشت][١٢٢]. [کاتێك ناسیمەوە دەم و چاوم داپۆشی وەڵاهی ئەمن قسەیەکم لەگەڵ کرد نەقسەیەکیشم لەو بیست تەنها وشەی (اناالله....) نەبێت ئینجا وشترەکەی نزیك کردەوە لێم و منیش هەستام و سواربووم][١٢٣]. ئینجا ڕێشمەی وشترەکەی گرت بەدەستیەوە ڕۆیشت بەرەو سوپاکە [ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو لەناو عەرەبدا باو بوو جێگەی سەرسوڕمان نەبوو] هەتا گەیشتین بەسوپاکە [وەڵاهی خەلکەکە نەیانزانی کە منیان بەجێ هێشتووە هەتاکو بەرەو لایان چووین]، خەلکەکە لایاندابوو لە گەرمایی دوانیوەڕۆدا ئینجا ئەوەی خۆی خستە تاوانەوە کەوتنە قسەو قسەلۆك لەبارەی منەوە [بوختانچیەکان دەستیان کرد بەقسە هۆنینەوە و سەربازگەکەیان شلەژاند بوو بەبوختان و قسەی نابەجێ خوای گەورە زاناترە بەوشتانەی ئەوان دەیان وت]. ئەوەی سەرکردایەتی بلاوکردنەوەی ئەو درۆ و بوختانەی دەکرد(عبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول) بوو. [عوروە دەڵێت: پێم گەیشتووە کە عبدوڵلای کوڕی ئوبەیی درۆ و بوختانەکەی بلاودەکردەوە و کلك و گوێی بۆ دەکرد و بەچرپە چرپ بەگوێی خەلکی دەدا]، هاتینەوە مەدینە و نەخۆش کەوتم نەخۆشیەکی [زۆر توند] [ماوەی یەك مانگ بەسەر ڕووداوەکە تێپەڕی بوو]. خەلکی کەوت بوونە قسەکردن لەسەر قسەی بوختان چیەکان [من هیچ شتێکم لەبارەوە نەدەزانی] [وە هیچ شتێك لەبارەی ئەو بوختانەوە بەمن نەگەیشتبوو دواجار قسەکە گەیشتبووە پێغەمبەر ﷺ و دایکم و باوکم نەزۆر و نەکەم هیچیان لەو بارەوە بۆ من باس نەدەکرد]، تەنها ئەوە نەبێت شتێکم لە دەم و چاوی پێغەمبەردا بەدی دەکرد ئەو سۆزو بەزەییەی جارانم نەدەبینی لەکاتی نەخۆشیەکەمدا [جاران کەنەخۆش

---

(١٢٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٨/٢٣).

(١٢٣) أخرجه: البخاري (٤١٤١).

دەکەوتم سۆزو بەزەییەکی زۆری دەنواند لە بەرامبەرمدا بەڵام ئەم جارەیان ئەوەم تێدا بەدی نەکرد] [وە دایکم لەلام بوو کە نەخۆش بووم] [لەبەردەم دەرگا کە داوەستا] پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە سەلامی کرد پاشان فەرمووی: ((نەخۆشەکەتان چۆنە ئێستا؟)) [هیچ قسەیەکی تری نەکرد] [پاشان ڕۆیشت ئەمەش گومانی لەلا دروست کردم بەڵام هەستم] بەهیچ شتێك نەکرد هەتاکو چاك بومەوە شەوێك لەگەڵ دایکی (میسطەحی کوڕی ئوثاثە) دەرچووم بۆ دەست بەئاو گەیاندن ئێمە دەرنەدەچووین تەنها بەشەو نەبێت ئەوە پێش ئەوەی ئاودەست لە نزیك ماڵەکانماندا دروست بکەین، چونکە نەریتی عەرەبە کۆنەکانمان هەبوو دەچوینە دەرەوە [پێشتر بێزمان دەکردەوە ئاودەست لە ماڵەکانماندا دروست بکەین] دوای ئەوەی تەواوبووین لەگەڵ دایکی میسطحی کوڕی ئوثاثە هاتینەوە [کەدایکی پوری ئەبوبکربوو] [لەبەردەمی ماڵماندا دایکی میسطح قاچی لەکراسەکەی گیربوو] ساتمەیەکی کرد (واتە دایکی میسطەح) و وتی: ئای لەناوچیت میسطح، پێم وت: [ئەوە چۆن ئەو قسەیە بەکوڕەکەت دەڵێیت].[١٢٤] خراپت وت [بێدەنگ بوو پاشان ساتمەیەی تری کرد بەهەمان شێوە قسەم لەگەڵ کرد، بۆ جاری سێهەم ساتمەیەکی کردەوە و هەمان قسەی بە مسطەح وتەوە]، منیش بەڕوویدا هەڵشاخام وتم: خراپترین قسەت کرد دەرهەق بە پیاوێك کەبەشداری غەزای بەدری کردووە [وتی: وەڵلاهی لەبەر تۆ قسەی پێدەڵێم وتم: لەبەر چی بۆ من] [وتی: بۆ نەتزانیوە ئەی کچی ئەبوبکر؟ وتم: چیم نەزانیوە؟] وتی: ئەی هاوار بۆ نەت بیستووە [چی دەڵێن؟ وتم: چی دەڵێن؟] ئینجا هەواڵی دامێ بە قسەو قسەلۆکی و بوختانچیەکان [وتم: تۆ ئەوەت بیستوە لەبارەی منەوە؟ وتی: بەڵێ سوێندبە خوا] [ئەوانە ئەوە دەڵێن] [ منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و زۆر بێتاقەت بووم] نەخۆش کەوتم بەرەبەرە نەخۆشیەکەم زیادی کرد [لەو کاتەی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە سەلامی کرد و فەرمووی: حاڵت چۆنە؟ وتم: ڕێگەم بدە] [بچمەوە ماڵی باوکم] دەڵێت: من دەمویست لە دەنگ و باسەکە دڵنیابم لە ڕێگەی دایکم و باوکمەوە پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێگەی پێدام و [منداڵێکی لەگەڵ ناردم] و گەیشتمە ماڵی باوکم [لەدەرگا چوومە

(١٢٤) أخرجه: البخاري (٤٧٥٧).

ژوورەوە بینیم دایکم ئوم رومان لەخوارەوەیە باوکیشم ئەبوبکر لەسەرەوە بوو نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند دایکم پێی وتم: چ شتێك تۆی هێنایەوە ئەی کچی شیرینم؛ منیش دەنگ و باسەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەو وتەکان کاریگەر نەبوون بەلایەوە، وەك چۆن بەلای منەوە کاریگەربوو، وتی: ئەی کچی شیرینم لەسەرخۆبە گوێ مەدەیە، وەڵاهی هیچ کاتێك نەبووە ئافرەتێکی وەك تۆ جوان لەلای پیاوێك بێت و خۆشی بوێت] [قسەو قسەلۆکی بۆ هەڵنەبەسترێت] وە ئیرەی پێنەبرێت، وتم: باوکیشم بەمە دەزانێت وتی: بەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خواش ﷺ؟ وتی: بەڵێ، منیش [وتم: (سبحان الله) خەلکی بەو جۆرە لەبارەی منەوە قسەدەکەن] هەنسکم دەدا و دەگریام و فرمێسك لەچاوم نەدەوەستا ئەبوبکری باوکم گوێی لەدەنگم بوو لەسەربان قورئانی دەخوێند هاتە خوارەوە بەدایکمی وت: ئەوە چیەتی؟ دایکم پێی وت: ئەو قسانەی بیستووە کەدەربارەی دەوترێت، چاوەکانی پڕ بوون لەفرمێسك وتی: سوێندت لێ دەخۆم ئەی کچی شیرینم دەبێت بڕۆیتەوە بۆ ماڵی خۆت منیش گەڕامەوە ماڵەوە] ئەو شەوە دەستم بەگریان کرد تا بەیانی و فرمێسك وشك نەبۆوە لەچاوم وەخەویشم لێنەکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی هەریەك لە علی کوڕی ئەبی طالب و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد پرسیاری لێکردن دەربارەی من کە لێم جیاببێتەوە، ئوسامە ئاماژەی [بەو پاکیە کرد کەلەبارەی منەوە دەیزانی وە دەشیزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ] چ خۆشەویستیەکی هەیە بۆ هاوسەرەکەی [بەچاکترین شێوە باسی کرد وتی]: هاوسەری خۆتە ئەی پێغەمبەر خودا ﷺ سوێندبە خودا لە چاکە بەولاوە هیچی لێی نەبیستراوە [ئەوەی باس دەکرێت درۆ و بوختانە] بەڵام علی کوڕی ئەبوطالب وتی: خوای گەورە پەکت ناخات و دەروت لێدەکاتەوە و ئافرەتی هاوشێوەی ئەویش زۆرن بۆ زیاتر دڵنیا بوونیشت پرسیار لەو ئافرەتە خزمەتکارە بکە ڕاستت پێ دەڵێت: ئینجا [پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ماڵەوە و پرسیاری دەربارەی من لە خزمەتکارەکە کرد] پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی بورەیرەی کرد [تاکو پرسیاری لێ بکات] فەرمووی: ((ئەی بوریرە هیچ شتێکت لێ بینیوە جێگەی گومان بێت))، بوریرە وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بەحەق بۆ ناردووین هیچم لێ نەبینیوە بۆی بشارمەوە، تەنها ئەوە نەبێت ئەو ئافرەتێکی تازە پێگەیشتووە جاری واهەیە لەسەر هەویرەکەی خەوی لێدەکەوێت و پەلەوەرە ماڵیەکان دێن لەهەویرەکە

دەخۆن [هەندێك لە هاوڵەكان خۆیان لێ مرو مۆچ كرد] لەگێڕانەوەیەكی تردا [علی كوڕی ئەبوطالب ﷺ هەستا و لێیدا و خستی بـەرزەوی دا] و پێی وت: لەگەڵ پێغەمبـەری خوا ﷺ ڕاستگۆبە، ئەویش وتی: (سبحان الله) وەڵلاهی هیچ شتێك لـەبارەوەی نـازانم بەخراپـە وەك ئەوەی زەرەنگەر دەیزانێت لە پوختە كردنی زێڕدا لەناو كانزاكانـدا عائیشـە (رضي الله عنها) دەفەرموێـت: ئـەو باسـە گەیشـتەوە بـە صـەفوان كـە قسـەكانی بـۆ هەڵبەسـترا بـوو، وتـی: [وەڵلاهی هیچ شوێنێكی ئافرەتم نەدیوە بە ناشەرعی].

[لەو بارەوە و هاوسەرەكەی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بە ئەبو ئەیوبی وت: بیستوتە كە خەڵكی چی دەڵێن، قسەكانی بوختان چیەكانی بۆ گێڕایەوە ئەویش وتی: (سبحان الله) بۆ ئێمە نەهاتووە قسەی لەبارەوە بكەین پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەوە بوختانێكی گەورەیە][١٢٤]. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێكیان [لەسەر مینبەرەكەیەوە] وتارێكی بۆ موسوڵمانانـدا لەبەر بێ ئابڕوییەكانی عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی. لەگێڕانەوەیەكی تردا [عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ وتاردان لەسەر من سەرەتا دەستی كرد بەسوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار پاشان فەرمووی]: [ئەی كۆمەڵانی موسوڵمان] كێیە لە ئێوە بڕوبیانوومان پێدەگرێت و ئازارمان دەدات بە قسە وتن بە هاوسەرەكەمان، وەڵلاهی لە چاكەو خێر بەولاوە هیچ شتێكم لێ نەدیوە، باسی پیاوێك دەكەن كە لەچاكە و خێر بەولاوە هیچمان دەربارەی نەزانیوە. (لە گێڕانەوەیەكی تردا) فەرمووی: [ڕێگەیەكم بۆ دابنێن لەسەر خەڵكانێك كە قسەو قسەڵۆك دروست دەكەن، وەڵلاهی هیچ خراپەیەكم لێ نەدیوە لەگەڵ ج كەسێكیش، وەڵلاهی هیچ خراپەیەكی لەبارەوە نەزانراوە [هیچ كاتێكیش نەهاتۆتە ماڵەكەم گەر من لەماڵەوە]نەبووبم، بۆ هەرسەفەرێكیش چووبم لەگەڵمدا بووە و دانەبڕاوە] سەعدی كوڕی موعازی ئەنصاری هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەڵلاهی من پشتیوانت دەبم ئەگەر لەهۆزی (ئەوس)ە ئەوە خۆمان دەیكوژین وەئەگەر لەبراكانیشمانە لە هۆزی خەزرەج فەرمانت بدە و چی بڵێیت جێبەجێی دەكەین. سەعدی كوڕی عوبادەكە گەورەی خەزرەجیەكان بوو پیاوێكی خواناسیش بوو لێرەدا دەمارگیرێ،

---

(١٢٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣/٦٣) (رقم: ١٤٠) وفي (مسند الشامين) (٢٤٢٥).

جولاندی و هەستاو بەسەعدی وت: وەڵلاهی درۆدەکەیت ناتوانیت بیکوژیت [ئەگەر لەهۆزەکەی خۆت بوایە حەزت نەدەکرد بکوژرێت] ئوسەیدی کوڕی حوضەیر هەستاو وتی: وەڵلاهی تۆ درۆ دەکەیت لەوەدا، سوێندبە خودا دەیکوژین، تۆش دووڕوویت پشتگیری لەدووڕووەکان دەکەیت ئەوس و خەزرەج خەریك بوو ببێت [بەشەڕیان ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر (منبر) دوانگەکەی] هاتە خوارەوە و بێدەنگی کردن، لەگێڕانەوەی ئیبن عباس دا ﷺ [ئەو ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە ﴿ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴾ (ال عمران: ١٠١) ئەم ئایەتەی بۆ دووبارە دەکردەنەوە هەتاکو هێوربوونەوە پاشان دەستیان کردە ملی یەکتری و ئاشت بونەوە و ڕۆیشتن][١٢٦]. پێغەمبەری خودا ﷺ بێدەنگ بوو ئەو ڕۆژە من هەربەشم گریان بو فرمێسك لە چاوەکانم نەدەبڕا خەویش نەدەچووە چاوەکانم دایکم و باوکم لەلام بوون دوو شەو ڕۆژێك لەسەریەك گریام هەتا گومانم وابوکە گریان جەرگی پارچە پارچە  کردووم دەڵێت: دایکم و باوکم لەلام دانیشتبوون منیش هەردەگریام، ئافرەتێکی ئەنصاری [داوای هاتنە ژوورەوەی کرد تا بێت بۆلام پارمەتیم بدات][١٢٧] منیش ڕێگەم دا هاتە ژوورەوە و دانیشت لەگەڵمدا دەگریا. (لەگێڕانەوەکەی ئوم ڕوماندا (رضي الله عنها) دەڵێت): [لەکاتێکدا من لەلای عائیشە دانیشتبووم ئافرەتێکی ئەنصاری هات وتی: خوای گەورە وابکات بە فلان و فلان، ئوم ڕومان وتی: لەبەرچی؟ وتی: کوڕەکەی منیش بەمجۆرە قسە لەسەر بوختانەکە دەکەن وتی: قسەی چی؟ ئافرەتەکە وتی: قسەو قسەی ئاوا دەڵێن، عائیشە پێی وت: پێغەمبەری خوداش بەم جۆرە بیستویەتی؟ وتم: بەڵێ وتی: ئەبوبکریش وتی: بەڵێ، ئوم ڕومان دەڵێت: عائیشە بەلادا هات و لەهۆش خۆی چوو، کە هاتەوە سەرخۆی دوچاری لەرزو تایەکی توندبوو، دامپۆشی ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ هاتەوەو فەرمووی: ((ما شان هذه))؟ ئەوە چیەتی؟ ئێستا چۆنە وتم: لەرزو تای گرتووە فەرمووی: ((فلعلّ في حديثٍ تُحدّث به)) واتە: (لەوانەیە بەهۆی ئەو قسانەوە بێت

---

[١٢٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٨/٢٣).
[١٢٧] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٤/٢٣).

کە دەربارەی دەکرێت) وتم: بەڵێ][١٢٨]. [عائیشە دەڵێت: باوکم و دایکم لەلام بوون کاتێک پێغەمبەری خودایش ﷺ دوای ئەوەی نوێژی عەسری کرد هاتە ژوورەکەم و دایکم و باوکم لەولاولام دانیشتبوون]،[سەلامی کرد و دانیشت] وەلەو ڕۆژەوەی بوختانەکەم بۆ کرابوو لەلام دانەنیشتبوو وەماوەی مانگێک بوو هیچ لە وەحی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ نەهات بوو لەبارەی منەوە، دەڵێت: [کە دانیشت] [سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد] و [پاشان فەرمووی]: (([یا عائشة فانه بلغني عنك كذا وكذا فان كنتِ بريئةً فسيبرئكِ الله، وان كنتِ المتِ بذنبٍ – وفي رواية – [ان كنت قارفتِ سوءاً او ظلمت] فاستغفري الله وتوبي اليه فانّ العبد اذا اعترف بذنبٍ ثم تاب [الى الله] تاب الله عليه])) واتە: (([ئەی عائیشە قسەی ئاواو ئاوام پێگەیشتووە لەبارەی تۆوە ئەگەر تۆپاکیت و دوریت لەو کارە خوای گەورە پاکی تۆ دەردەخات، وەئەگەر دوچاری ئەو کارەبوویت] لەگێڕانەوەیەکی تردا [ئەگەر ئەو تاوانە خراپەت ئەنجام داوە] ئەوە داوای لێخۆش بوون لەخودابکە و تۆبە بکە چونکە ئەگەر بەندە دانینا بەتاوانی خۆیدا و پاشان تۆبەی کرد خوای گەورەش تۆبەی لێوەردەگرێت])) [عائیشە دەڵێت: ئافرەتێکی ئەنصاری لەو کاتەدا هاتبوو لەبەردەم دەرگاکە دانیشتبوو پێم وتن: ئەوە بۆ لەبەردەمی ئەو ئافرەتە ئەو شتانە باس دەکات پێغەمبەری خودا ﷺ ئامۆژگاری کردم] کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە قسەکانی بۆوە فرمێسکەکانم سڕییەوە و[ڕووم کردە باوکم وتم]: لە جیاتی من وەڵامی بدەرەوە وتی: وەڵڵاهی نازانم چی بە پێغەمبەری خودا ﷺ بڵێم ئینجا [ڕووم سوڕاند بۆلای دایکمدا] و بەهەمان شێوە بە ئەویشم وت ئەویش نەیتوانی وەڵام بداتەوە، عائیشە دەفەرموێت: [سوێند بەخوا ئەوەی لەو ڕۆژگارە بەسەر ماڵی ئەبوبکردا هات بەسەر هیچ بنەماڵەیەکی تردا نەهاتووە]، کاتێک ئەوان بێدەنگ بوون] من ئافرەتێکی تازە پێگەیشتوو بووم زۆرم لە قورئان لەبەرنەبوو [سوپاس و ستایشی خوای گەورەم کرد بەوەی کە شایستەیەتی] ئینجا وتم: وەڵڵاهی دەزانم گوێ بیستی قسانێک بوون کە خەڵکی لەبارەی منەوە دەیڵێن، تا لەدەروونتاندا جێگیربووە وە باوەڕیشتان پێکردووە [ئەگەر من بڵێم ئەو کارەشم نەکردووە] [و خوای پاک و بێ هاوتاش ئاگادارە

---

[١٢٨] اخرجه: البخاري (٤١٤٣).

کەمن پاك و ڕاستگۆم] ئەو کات ئێوە باوەڕم پێناکەن، وەهیچ سودێکی نییە لەبەر [ئەوەی
چۆتە دڵتانەوە و برینداری کردوون] وەئەگەر بڵێم ئەو کارەم کردوە لەبەر ئێوە خوای
ئاگادارە کە من بێ بەریم و ئەرمکردووە ئەوکات ئێوە باوەڕم پێدەکەن و [دەڵێن بۆ دواجار
چووە ژێرباری و ساغی کردەوە لەسەر خۆی] وەڵڵاهی هیچ ناڵێم تەنها ئەو قسەیەی باوکی
یوسف دەڵێمەوە[لەو کاتە ناوی یعقوبم بیرچوو بوو] کە دەیفەرموو: (﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ
بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرًاۖ فَصَبۡرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ (یوسف:١٨)
واتە: (ئارامگرتنێکی جوان ئارام دەگرم خوا پشتیوانم بێت لەسەر ئەوەی ئێوە بۆم باس
دەکەن) پاشان ڕووم سوڕاند و پاڵ کەوتم لەسەر جێگاکەم ئومێدەواربووم خوای پەروەردگار
پاکیم دەربخات بەڵام [وەڵڵاهی گومانم بەوە نەدەبرد کە خودای گەورە] وەحی لەبارەی
منەوە بنێرێتە خوارەوە بخوێنرێتەوە لە مزگەوتەکان و نوێژی پێبکرێت، من خۆم لەوە بە
بچوکتر دەبینی کەخودا لە قورئاندا قسەم لەسەر بکات بەڵام بەهیوای ئەوەبووم لە خەودا
شتێك بە پێغەمبەری خودا ﷺ نیشان بدات و [پاکی منی بۆ ڕوونبکاتەوە] وەڵڵاهی هێشتا
قسە دەکرا کەس لەدانیشتنەکە هەڵنەستا بوو کە (وەحی) بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزی
ئێمە هەموو بێدەنگ بووین پێغەمبەر ﷺ ئەو حاڵەتەی بەسەرداهات کە پێشتر دوچاری
دەبوو زۆر بەتوندی عارەقەی دەکرد وەك دەنکە مرواری لەلەشی دەردەچوو ئەگەر
لەڕۆژێکی زستانیشدا بووایە [لەبەر قورسی ئەو قورئانەی کەبۆی دەهاتە خوارەوە]
[ئێمەش بە پۆشاکێك دامان پۆشی و سەرینێکی پێستەمان خستە ژێر سەری من کاتێك
بینیم بەو شێوەیە زۆر دڵخۆش بووم هیچ باکم نەبوو، چونکە دەمزانی پاك و بێ گوناهم و
بەدەستە هێشتا هیچ لە پێغەمبەری خودا ﷺ دیاری نەدابوو دەترسام گیانیان دەربچێت لە
ترسا نەکو ئەو قسانەی خەڵکی دەیکەن ڕاست دەربچێت] [ئەبوبکری صدیق دەڵێت:
تەماشای پێغەمبەری خودام دەکرد دەترسام کەشتێك لە ئاسمانەوە بێت و گەڕانەوەی
نییە، وە تەماشای عائیشەم دەکرد بێداربۆتەوەو باکی نییە دڵخۆش دەبووم و بەردەوام

سەیری ئەملاولام دەکرد][١٢٩] کاتێك وەحی تەواو بوو ڕووی گەشایەوە و [دانیشت] [من هەستم پێدەکرد کەناوچەوانی گەش دەبۆوە] و پێدەکەنی، وابزانم یەکەم وشەی کەفەرمووی پێی وتم: ((یا عائشة احمدي الله فقد برّأكِ الله – في رواية – [أبشري يا عائشة فقد انزل الله براءتكِ])). واتە: ((عائیشە سوپاسی خوا بکە خوای گەورە پاکی تۆی دەرخست) لە گێڕانەوەیەکی تردا[مژدە بێت ئەی عائیشە خوای گەورە پاکی تۆی لە ئاسمانەوە دەرخست] وتم: [سوپاس بۆ خودا، دایکم پێی وتم: هەستە] [سەری پێغەمبەری خودا ﷺ ماچ بکە و سوپاسی بکە دەڵێت: من زۆر توڕەبووم][١٣٠] وتم: نەخێر وەڵڵاهی هەڵناستم و سوپاسی ئەو ناکەم، [بەڵکو سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە پاکی منی دەرخست]، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوار ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَٰذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ﴾ (النور: ١١). واتە: [بەدڵنیاییەوە ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (وا خۆیان نیشان دەدا کە لەخۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیمانداران لە دووڕووکان جیابێتەوە، ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچییانە لە گەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورە و هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە.دەبوایە هەر کە ئەو بوختانەتان بیست ئیمانداران لەپیاوان و لە ئافرەتان گومانی چاکیان بەخۆیان ببرایە بوختانێکی ئاشکرایە].

لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [کاتێك خوای گەورە پاکی منی ناردە خوارەوە ئەبوبکری باوکم سەری ماچ کردم. وتم: بۆچی پاساوت بۆ نەدەووتم ئایا ئێستا عیفەتی من دەرکەوت؟ وتی: [أي سماء تظلني وأي ارض تقلني إن قلت مالا أعلم][١٣١] واتە:[چ ئاسمانێك سێبەر دەکات بەسەرمەوە و چ زەویەك دەمگرێتە خۆی گەر من بدوێم

---

(١٢٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٧/٢٣).

(١٣٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣/رقم: ١٤٩).

(١٣١) أخرجه: البزار (٢٦٦٥)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٥٣٠٢): رواه البزار ورجاله رجال الصحيح.

سەبارەت بەباسێك كە ئاگاداریم لێی نەبێت؟] [پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ چوو بۆ مزگەوت وتارێكی بۆدان و ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە خوای گەورە لەسەر ڕووداوی ئیفك ناردویەتیە خوارەوە، ئینجا فەرمانی دا (حەد) وسزای بۆختان بسەپێنرێت بەسەر میسطحی كوڕی ئوثاثە و حەسانی كوڕی ثابت و حەمنەی كچی جەحش ئەمانیش موسوڵمانی ڕاستەقینە بوون، بەڵام كەوتنە تاوانەكەوە و بەڕوونی قسەیان لەسەر بوختانەكە دەكرد]. عائیشە دەڵێت: كاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە لەسەر پاكی من ئەبوبكری صدیق كەلەوە و پێش هاوكارە (میسطحی) دەكرد بەهۆی خزمایەتی و نەداریی ئەوەوە وتی: وەڵلاهی لەمەودوا بە هیچ جۆرێك هاوكاری میسطح ناكەم لەبەر ئەو قسەیەی لەبارەی عائیشەوە (رضي الله عنها) كردوویەتی خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند لەسەر ئەبوبكر ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (النور:٢٢) واتە: [ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە باسوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچکەران لە پێناوی خودا نەدەن، (لەبەر ئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختامەکەدا) دەبا لێببووردەبن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە] ئەبوبكر وتی: بەڵێ وەڵلاهی پێم خۆشە خوای پەروەردگار لێم خۆش بێت یارمەتیەكەی گەڕاندەوە بۆ میسطح و [بڕیاری دا هەرگیز لێی نەبڕێت] لەوەو پێش پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری كرد بوو لەزەینەبی كچی جەحش، و فەرموو بووی: ئەی زەینەب هیچ شتێك دەربارەی عائیشە دەزانیت؟ هیچت لێدیوە؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ گوێ و چاوی خۆم دەپارێزم لەخراپە بەخودا لە چاكە بەو لاوە هیچ لەبارەی نازانم، عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت: لەناو هاوسەرەكانیدا ئەو هاوشانی من بوو لەهەموو ڕوویەكەوە بەڵام خوای گەورە پاراستی بەهۆی لەخواترسانەكەیەوە [چاكە ئەبێت نەیگوت لەبارەی منەوە] [بەڵام خوشكەكەی حەمنەی كچی جەحش لەبەر زەینەب وەك بەربەرەكانی لەدژی من كەوتە ناو بوختانەكەوە] و [هەستا بەبڵاوكردنەوەی بەمەش خۆی توشی سزا كرد و دوچاری سزای (حەد) بوو] [لەگەڵ ئەوانی تردا] [كە بەگەرم وگوڕی قسەیان تێدا كرد میسطح و حەسان و حەمنە لەگەڵ سەركردەی دووڕووەكان (عبدوڵڵای

کوڕی ئوبەیی) کەڕۆڵی سەرەکی دەگێڕاو خەڵکی بۆ کۆدەکردەوە و بەناویاندا بڵاوی دەکردەوە][١٣٢].

بەم جۆرە خوای گەورە پارێزگاری لە خێزانی پێغەمبەرەکەی کرد ﷺ ئەو ئایەتە ڕاچڵەکێنەرانەی نــاردە خــوارەوە و پلانـــی دووڕوومەکـــانی پوچــەڵکردەوە و ترســاندنی بەسزایەکی گەورە وە هەروەها بوختانەکەیانی ڕونکردەوە و وە موسوڵمانانیشی ئامۆژگاری کرد و بە ئاگای هێنان لە دووڕووەکان و ئاکارە پیس و پیلانگێڕیەکانیان لەسەرئەم ڕوداوە.

زەمەخشری (رحمه الله) دەڵێت: ((ئەگەر قورئان هەموو سەیر بکەیت و چاو بگێڕیت بەو سزایانەی کە خوای گەورە سەرپێچی کارانی پێدەترسێنێت نابینیت لە هیچ جێگایەك بەئەندازەی ئەو بوختانەی بۆ عائیشە کراوە توڕەبوو بێت...بەو شێوەیە کەبوختانچیەکانی بەئەفرەت کردووە لەدونیا و دواڕۆژدا، وەبەڵێنی سزایەکی گەورەی پێداون لەڕۆژی دوایدا بەجۆرێك زمان و دەست و قاچیان دێتە گۆو گەواهیان لەسەر دەدات بۆ ئەو بوختان و درۆیەی هەڵیان بەست، خوای گەورەش سزایەکی شایستە بەخۆیانی بۆدانـاون، تـابزانن کە خوای گەورە حەقەو ئاگادارە.....ئەم سزایە بۆ هاوبەش بەیداکەران و بت پەرستانیش بڕیارنەدراوە مەگەر بۆ کەسێك هاوشێوەی ئەوان بێت لە بنێ ئابڕویدا ئیبن عباس رضي الله عنه لە بەصرە دەیوت: هەرکەسێك تاوانێك بکات و تۆبە بکات خوای گەورە تۆبەی لێوەردەگرێت، تەنها کەسێك نەبێت کەقسە لەسەر عائیشە بکات ئەمەش بۆ گەورە نیشاندانی ئەو درۆ و بوختانەیە، خوای گەورە پاکی چوارشتی بەچواری تـر دەرخستووە پـاکی یوسفی دەرخست بە زمانی شەهیدەکەی)وشهد شاهد من أهلها) وە پاکی موسای دەرخست لەبەرامبەر قسەی جولەکـەکان کـە دەیـانوت: عەیـبـدارە لاشـەی بـەو بـەردەی کـە جلـەکانی بـرد لـەکاتی خۆشوشتندا، وەپاکی مریەمی دەرخست بە قسەکردنی کۆرپەلەکەی لەناو بێشکەکەدا کە بانگی کـردوو وتـی: مـن بەنـدەی خـوام، وەخـۆی پـاکی عائیشـەی دەرخسـت بـەو ئایەتـە

---

[١٣٢] أخرجه: البخاري (٢٦٦١، ٤١٤١، ٤١٤٣، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧)، مسلم (٢٧٧٠)، احمد (٢٥٦٨٠)، ابوداود (٤٧٣٥)، الترمذي (٣١٨٠)، ابن ماجة (٩٧٠)، عبدالرزاق (٩٧٤٨)، الطبراني (الكبير ١٤٨-١٣٣/٢٣)، والنسائي (عشرة النساء) (٤٥)، ابن حبان (٤٢١٢)، البيهقي (٣٠٧/٧) وابو يعلى (٤٩٢٧)، واللفظ للبخاري في روايته والزيادات لابن هشام والطبراني وغيرهم.

گەورانەی کە لە قورئاندا ناردویەتیە خوارەوە کە هەتاهەتا دەخوێنرێتەوە. سەیربکەن خودا پاکی عائیشەی چۆن بەرزکردوەتەوە بەسەر ئەواندا، ئەوەش بەهۆی پایە بەرزی پێغەمبەری خودامانە ﷺ ئەمەش بۆیە ئاگاهێنانەوە و دەرخستنی بەرزی پلەوپایەی سەروەری ئەوەی ئادەمە کە هەڵبژاردەی سەرەتاو کۆتایی مرۆڤەکانە وە نیشانە و بەڵگەی خودایە بۆگشت جیهان هەرکەسێك دەیەوێت لە پلەو پایەی پێغەمبەری خودا ﷺ تێ بگات باسەیری ئایەتەکانی ئیفك بکات و ورد بێتەوە کە چۆن خوای گەورە توڕەبوو لەو کەسانەی قسەیان بۆ هاوسەرەکەی هەڵبەستووە و بوختانەکەشیانی پوچ کردەوەتەوە و پەردەی لەسەر لاداوە))[١٣٣].

## صەفوان لە حەسانی کوڕی ثابت دەدات

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەگێڕێتەوە لە محمدی کوڕی ئیبراهیمی تەمیمی کە دەڵێت: حەسانی کوڕی ثابت لەڕووداوی ئیفکدا زیاد لەپێویست لەسەر صەفوانی کوڕی موعطل قسەی کرد بوو تەنانەت بە هۆنراوەش دژایەتی دەکرد وەك ئەم دێڕە شیعرە:

امسی الجلابیب قدعزوا وقدکثروا

وابـن الفضـریعة امسی بیضة البلد

صەفوان شەوێکیان کەدەهاتەوە لەماڵی خاڵوانی لەناوچەی بەنی ساعدە ڕێگەی بەحەسان گرت و شمشێرێکی لەسەریدا لەو کاتە دا ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسی ئەنصاری خەطیبی پێغەمبەری خودا ﷺ بەسەریدا ڕاگەیشت، صەفوانی گرت و تونند دەستەکانی بەستەوە بەگەردنی دابە پەتێکی ڕەش، و بردی بۆ دیوەخانی بنی حارثە لە ڕێگادا گەیشتن بە عبدوللای کوڕی ڕەواحە پێی وت: ئەوەچیە؟ ئەویش وتی: تۆ پێت سەیر نیە بە شمشێرەکەی لە حەسانی داوە، وەللاهی وابزانم کوشتویەتی عبدوللا وتی: ئایە پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگادارە بەوکارەی کە کردوتە؟ وتی: نەخێر، وتی: وەللاهی کارێکی

[١٣٣] انظر: (الکشاف) (٣/٦٧).

خراپت کردووە بەرەڵای بکە بابڕوات، ئینجا چون بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە و فەرمووی: کوڕی موعطل لەکوێ یە؟ صەفوان هەستاو لەخزمەتیدا وتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((ما دعاك الى ما صنعت))؟ واتە: ((چی وای لێکردیت ئەو کارە بکەیت؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو بە قسەکانی ئازاری داوم زیاد لەپێویست وەبەهۆنراوە لەبارەی منەوە دەدوێت و بەوەش نەوەستا شیعری داشۆرینی لەسەر وتوم، منیشی توڕەکرد ئێستاش من لەخزمەتدام بۆ هەر تۆڵەیەك کە لێم وەرگرنەوە.

وەلەگێڕانەوەی موسای کوڕی عوقبە دا دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((خذوه فان هلك حسّان فاقتلوه به فخذوه فاسروه واوثقوه)) واتە: بیبەن لای خۆتان بیبەستنەوە ئەگەر حەسان مرد بیکوژنەوە] ئەم هەواڵە گەیشتە سەعدی کوڕی عوبادە سەرداری خەزرەجیەکان ئەویش لەگەڵ خزمەکانی ڕۆیشتن بۆلایان و پێی وتن: ئەو پیاوە بنێرنەوە ئێمەش بەگوێمان نەکرد ئینجا پێی وتن: دەچن قسە بەخزم و کەسی پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێن و ئازاریان دەدەن، بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە ئێوە سەریان دەخەن، سەعد توڕەبوو لەبەر پێغەمبەری خودا ﷺ و موهاجیرەکان و وتی: ئەو پیاوە بەردەن و بینێرنەوە دیسان بەگوێیان نەکرد، هەتاکو نزیك بوو ببێت بەشەڕ لەنێوانیاندا و ئینجا بەریاندا و ئەویش لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ ماڵەوە، وڕێزی گرت و بەرگ و پۆشاکی نوێی لەبەرکرد ئینجا ناردیەوە، دەگێڕنەوە کاتێك صەفوان چوو بۆ مزگەوت نوێژ بکات، پێغەمبەری خودا ﷺ چاوی پێکەوت فەرمووی: ((من كساك كساه الله من ثياب الجنة)) واتە: ((ئەوە کێ پۆشتەی کردیتەوە خوای پەروەردگار لەجل و بەرگی بەهەشت پۆشتەی بکات)) وتی: سەعدی کوڕی عوبادە].[١٢٤]

ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (حەسانم بۆ بانگ بکەن) هێنایانە خزمەتی و لەگێڕانەوەی عوروە لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [حەسان هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ داوای کرد تۆڵەی بۆ لە صەفوان وەربگرێتەوە لەسەر ئەو شمشێرەی

---

[١٢٤] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٧٦).

کە لێیداوە][١٣٥]. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((یا حسان اتشوهت علی قومك ان هداهم الله للأسلام یقول: (تنفّستَ علیهم)، یا حسان احسن فیما أصابك))؟). واته: (ئەی حەسان دەتەوێت خەڵکانێك بشێوێنیت و ناشیرینیان بکەیت کە خودای گەورە ڕێنمای کردوون بۆ ئیسلام واتە: ڕقەبەرایەتیان دەکەیت ئەی حەسان بە جوانی بجوڵێرەوە بەرامبەر ئەو کارەی دوچارت هاتووە، ئەویش وتی: ئەوە خۆت سەرپشك بە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ جاریەکی قیبطی پێ بەخشی بەناوی (شیرین) کەلەگەڵ ماریە لەلایەن (مقوقس)ی میسری بەدیاری بۆی هاتبوو پاشان عبدالرحمن کوڕی حەسانی لێ بوو [هەروەها باخێکی گەورەی دارخورمای پێ بەخشی کە (ابوطلحە) ی ئەنصاری دابووی بە پێغەمبەر ﷺ ][١٣٦].

## ئازادکردنی گیراوەکانی (بنی مصطلق)

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزای (بنی مصطلق) ژمارەیەکی زۆر پیاو ئافرەتی بەدیل گرت و هەموویان دابەش کرد بەسەر موسوڵمانەکاندا لەناویاندا جوەیریەی کچی حارثی کوڕی ضراری سەرکردەی (بنی مصطلق)ی تێدا بوو محمدی کوڕی جعفری کوڕی زوبەیر لە عورووەوە ئەویش لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەڵێت: [کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گیراوەکانی دابەش کرد جوەیریەی کچی حارث بەر ثابتی کوڕی قەیس کەوت یان بەر کوڕە مامەکەی ثابت کەوت [کە ناوی صەفوانی کوڕی مالیك بوو] جویریە کتابەکەی کە بۆ کۆیلایەتی دەنوسرا [لەسەرخۆی (نۆنۆقیەی) نوسی] کەبیداتە خاوەنەکەی کاتێك بیەوێت خۆی ئازاد بکات جوەیریەش ئافرەتێکی جوان و بەرچاوی خوێن شیرین بوو هەرکەسێك چاوی پێ بکەوتایە دەچووە دڵیەوە، هاتە خزمەت

---

(١٣٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٦/٢٣) (رقم: ١٥١)، والبيهقي (الكبرى) (٥٦/٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٣٦/٩) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(١٣٦) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٦١٧/٢)، ابن هشام (السيرة) (٢٥٧/٣)، البيهقي (الدلائل) (٧٤/٤)، ابن كثير (البداية) (١٨٦/٤)، وقال الحافظ ابن حجر في (تعجيل المنفعة) (ص: ١٢٨) سنده صحيح وقد وصلها موسى بن عقبة في مغازيه عن هشام بن عروة عن ابيه عن عائشة رضي الله عنها.

پێغەمبەری خودا ﷺ و داوای لێکرد هاوکاری بکات، لە ئازاد کردنەکەیدا عائیشە دەڵێت: وەڵڵاهی یەکەم جار کەبینیم لەدەرگای ژوورەکەم وەستا خۆشم نەویست زانیم ئەگەر پێغەمبەر چاوی پێبکەوێت دەکەوێتە بەردڵی (دیارە سەیرکردن بۆ مەبەستی هاوسەرگیری بووە چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر لەوە گەورەتر بووە و سەیری ئافرەت نامەحرەمی نەکردووە) چووە ژوورەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من جوەیریەی کچی حارثم گەورەی هۆزەکەی لەو بەڵایەی من توشی هاتووم خۆت بەئاگاداری کە من بووم بەکەنیزەك و ئەوەیش لە بەڕێزت شاراوە نییە، لەدابەشکردنەکەدا بەر ثابتی کوڕی قەیس یان کوڕە مامەکەی کەوتم لەسەر(نۆ ئۆقیە) کتابەکەم نوسیەوە بۆ ئازاد کردنم منیش هاتومەتە خزمەتت تاکو یارمەتیم بدەیت ئازادم بکەن پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((فهل لك في خيرٍ من ذلك))؟ واتە: ئایە لەوە باشترت ناوێت؟ وتی چی لەوە باشترە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((أقضي عنكِ كتابتكِ وأتزوجكِ))؟ واتە: ((پارەی ئازادکردنەکەت لەسەر من و خوازبێنیت دەکەم بۆ هاوسەرگیری؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕازیم فەرمووی: بەڵێ منیش بەڵێنی خۆم جێبەجێ دەکەم. عائیشە دەڵێت: [هەواڵەکە گەیشتە خەڵکی کەپێغەمبەری خودا ﷺ جوەیریەیی کچی حارثی هێناوە خەڵکی وتیان: ئەوان هەموو بوون بە خزمی پێغەمبەری خودا ﷺ ئیتر ئەوانیش گیراوەکانیان ئازادکرد و ناردیانەوە بەهۆی هاوسەرگیریەکەی سەدکەس لە خزم و کەسی خۆی ئازادکرد لە (بني مصطلق) ئەمزانیووە هیچ ئافرەتێك لە جوەیریە بەخێرو بەرەکەت تر بوو بێت بۆ هۆزەکەی][137].

---

[137] اخرجه: احمد (٢٦٣٦٥)، وقال محققه: سنده حسن، والطبراني (الكبير) (٤٩/٢٤)، ابوداود (٣٩٣١)، ابن حبان (٤٠٥٤، ٤٠٥٥) وقال محققه: اسناده قوي، الحاكم (٢٦/٤)، البيهقي (الكبرى) (٧٤/٩) و (الدلائل) (٤٩/٤)، ابو يعلى (٤٩٦٣) وقال محققه: اسناده صحيح، ابن هشام (السيرة) (٢٥٠/٣) (رقم: ٨٠٢) وقال محققه: اسناده حسن، وحسن اسناده الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٣٢٧)، وفي (الارواء) (١٢١)، وقال الارناؤط في تخريج (زاد المعاد) (١١٣/٣): اسناده صحيح، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٦٤٥) حديث حسن، واللفظ لابن هشام والزيادات لابي داود والحاكم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئیبن هیشام (رحمه الله) دەڵێت: (وتراوە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە لە غەزای (بنی مصطلق) جوەیرییەی کچی حارثی کوڕی ئەبو ضراری لەگەڵدابووە ئەو لەگەڵ گیراوەکانی تر لەناو سوپاکەدا بوو کەگەیشتنە مەدینە باوکی جویریەی کچی حارثی کوڕی ئەبو ضرار هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی بارمتە و(فدیەی) کچەکەی بدا و ئازادی بکات کاتێك گەیشتە دۆڵەکانی (عەقیق) سەیرێکی ئەو وشترانەی کرد کە هێنا بووی، دڵی چووە سەردوانیان شاردیەوە لەناو دۆڵێك ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەی محمد کچەکەم گیراوە لە لاتان ئەوە (فدیە) و بارمتەکەیەتی بۆم ئازاد بکەن، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((فاین البعیران اللذان غیبتهما بالعقیق في شعب كذا وكذا))؟ واتە: ((ئەی کوا ئەو دوو وشترەی کەلەناو دۆڵی عەقیق شاردوتەتەوە؟ حارث وتی: (أشهدا ان لااله الاالله وانك رسول الله) واتە: (شایەتی دەدەم کەهیچ خوایەك نی یە تەنها (الله) نەبێت وەشایەتی دەدەم کە تۆش پێغەمبەری خودایت)، وەڵڵاهی بێجگە لەخودا کەس ئاگادار نەبوو کە شاردومەتەوە، پاشان حارث خۆی و دوو کوڕی لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر لە هۆزەکەی موسوڵمان بوون، وەناردی دوو وشترەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ جوەیرییەی کچیشی ئازادکرد و بەباشترین شێوەش موسوڵمان بوو پێغەمبەری خودا ﷺ داخوازی کرد لەباوکی ئەویش لێی مارەکرد و پێغەمبەریش ﷺ چوارسەد درهەمی کردە مارەی[١٣٨]. ئەمەش گێڕانەوەیەکی پچڕاو بوو (مقطوع) بەڵام لە گێڕانەوەیەکی (مرسل) دا هاتووە لە ئەبو قەلابە دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ جویریەی لەگەڵ گیراوەکانی (بنی مصطلق) دەستگیر کرد، پاشان مارەی کرد باوکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: کچەکەم نابێت بکرێتە کەنیزەك و پێویستە ئازادی بکەن پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بانگی بکەیت خۆی سەرپشك بێت باشتر نییە؟)) وتی: بەڵێ هات بۆ لای وە کێشەکەی بۆ باس کرد وجوەیرییەش وتی: خوا!

(١٣٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٥٠) وقال الحافظ في (الاصابة) (٣/٢٥٠) اخرجه ابن عابد في المغازي منقطعاً.

پێغەمبـەری خـودا ﷺ هەڵدەبـژێرم)[١٣٩]. شـەعبی دەڵێـت: (خـۆی ئـازادکرد وە هـەموو گیراوەکانی هۆزەکەی وە ناویشی (برة) بوو][١٤٠]. پێغەمبـەری خـودا ﷺ ناوەکـەی گـۆڕی بـە (جویریە)لە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە ئەویش لە جویریـەی کچـی حارثـەوە دەڵێت: (نـاوی (بـرة) بـوو پێغەمبـەری خـودا ﷺ گـۆڕی بـە (جـوەیریـە) نـاوی (بـرة)ی پێنـاخۆش بوو)[١٤١].

دوای ئەوەی (بنی مصطلق) موسوڵمان بوون پێغەمبەری خـودا ﷺ داوای لێکـردن کـە زەکات لە ماڵەکانیان دەربکەن [لە عەلقەمەی کوڕی ناجیەی کـوڕی جوندبـەوە دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەهەمان ساڵی ڕووداوی (مریسیع) دابوو کاتێک (بـني مـصطلق) موسـوڵمان بوون پێی فەرموون: ((ان من تمام اسلامكم ان تؤدوا زكاة اموالكم))[١٤٢]. واتـە:((لـە کامڵبونی موسوڵمانیتان ئەوەیە کە زەکاتی سامانەکانتان بدەن))].

---

[١٣٩] أخرجه: ابن منده (٢/ ٥٠)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٤/٢٦٥) (رقم: ٢٥١) اخرجه الترمذي وابن منده من مرسل ابي قلابة باسناد صحيح، وانظر: السيرة الصحيحة (٢/٤١٣).

[١٤٠] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٣١١٨)، الطبراني (الكبير) (١٥٤)، قال الهيثمي في (المجمع) (٩/٢٥٠) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

[١٤١] أخرجه: احمد (٦/٤٢٩)، مسلم (٢١٤٠)، الحاكم (٤/٢٧) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي

[١٤٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٨/٧/٨) وقال الشيخ الالباني في الصحيحة (٣٢٣٢): اسناده حسن.

# حارث و هۆزەکەی دێنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەکاتی ماڵەکانیانەوە

حارثی کوڕی أبو ضراری خوزاعی ﷺ دەفەرموێت: (هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بانگی کردم بۆ موسوڵمان بوون منیش موسوڵمان بووم بەدڵنیایی تەواوە وەپاشان داوای لێکردم کە زەکات بدەم منیش دانم پێداناو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێمەوە بۆ ناو هۆزەکەم بانگیان دەکەم بۆ ئیسلامەتی و زەکات دان هەرکەسێك وەڵامی دامەوە زەکاتەکەی کۆدەکەمەوە تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فلان کات و ساتدا نێردراوێکی خۆت بنێرە تازەکاتە کۆکراوەکەی پێدابنێرم کاتێك حارث زەکاتی ئەو کەسانەی کۆکردەوە کەبە پیر بانگەوازەیەوە هاتبوون ئەو کاتەش هات کەبەڵێن بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەرەکەی تێدا بنێرێت بەڵام کەسی نەنارد حارث وای گومان برد کە خوای پێغەمبەرەکەی لێ توڕەبوون داوای کرد زەکاتەکەی بۆ کۆکەنەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێکی بۆ دیاری کردووم وابڕیا بووە زەکاتەکە ببات کەلەلامانە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز پێچەوانەی بەڵێنی خۆی هەڵسوکەوت ناکات، وادەبینم نێردراوی نەناردووە لەبەر توڕە بوونێك بووبێت با ئێمە بڕۆین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەو لاشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی دیاریکراودا وەلیدی کوڕی عوقبەی ناردبوو بۆ وەرگرتنی زەکاتە کۆکراوەکەی لای حارث، کاتێك وەلید لەڕێگا پێیان دەگات لەبەر کۆنە قینێك ترس لێدەنیشێت و دەگەڕێتەوە دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حارث زەکاتی نەدامێ و ویستیشی بمکوژێت لە گێڕانەوەیەکی تردا [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چوومە ناو ئەو هۆزە لەناو نەفامیدا ڕۆچووبوون جلی جەنگ و شەڕیان پۆشی بوو زەکاتیان نەدەدا][143] [پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر توڕەبوو][144]، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەپەلە سریەیەکی لە هاوەڵانی نارد بۆ لای حارث، حارثیش بەرەو مەدینە دەهات [لەگەڵ

---

(١٤٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦/١٨)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٣٢/٧): اسناده حسن.

(١٤٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (٧٨/٢٥)، البيهقي (٥٤/٩)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٠٨٨).

کۆمەڵێك لە خزمەکانی وە لەگەڵ بارە زەکات و بەخشینەکان هەتا لەدەرەوەی مەدینە گەیشتنە نێردراوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە چاویان پێکەوت وتیان: ئەوە حارثە کاتێك بەرەو ڕوویان هاتن وتی: بۆلای کێ نێردراون؟ وتیان بۆ لای تۆ. وتی: بۆچی؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ وەلیدی کوڕی عوقبەی ناردوە بۆ لات گەڕاوەتەوە دەڵێت: گوایە تۆ زەکاتت نەداوە و نیازی کوشتنیت هەبووە، وتی: ڕاست نییە سوێند بەو خودایەی محمدی بەڕاستی ناردووە نەدیومە و نەهاتووە وە کاتێك حارث هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((منعت الزكاة واردت قتل رسولي))؟ واتە:((زەکات نادەیت ودەتەوێت نێردراوەکەشمان بکوژیت)). حارث وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بەحەق ناردووە چاوم پێی نەکەوتووە وە منیش هەرلەبەر ئەوە هاتمە خزمەتان کاتێك نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهات بۆ لامان ترسام کە تووڕە بوونێك بێت لە خوداو و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ (وە لە گێڕانەوەیەکی تردا) وتیان: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێگەیشت کە نێردراوەکەت تەشریف دێنێت شادمان بووین وتمان پێشوازی دەکەین][145]. [ئێمە زانیبومان کە نێردراوەکەت لە نیوەی ڕێگادا گەڕاوەتەوە ئێمە لەوە ترساین بەهۆی گەیشتنی پەیامێکی تۆوە گەڕابێتەوە کە لە ئێمە توڕەبووبێت وە پەنادەگرین بەخودا لە توڕەبوونی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ. پێغەمبەری خواش ﷺ بایەخی پێدان و دڵنەوایی کردن وە خوای پەروەردگار بە وەحی قسەکانی پشت ڕاست کردنەوە][146]، ئایەتەکانی سورەتی (حجرات)ی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴾(الحجرات:٦)[147] واتە: [ئەی

---

(145) أخرجه: ابن ابي عاصم (الافراد) (٣٠٩/٤)، الطبراني (الكبير) (٦/١٨) وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٣٢/٧) اسناده حسن.

(146) أخرجه: الطبري (التفسير) (٧٨/٢٥)، البيهقي (٤٥/٩)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٠٨٨).

(147) أخرجه: احمد (١٨٤٥٩) وقال محققه: حسنٌ بشواهده، الطبراني (الكبير) (٣٣٩٥)، الواحدي (اسباب النزول) (ص: ٢٩٢)، ابن ابي حاتم (الافراد) (٢٣٥٣)، البيهقي (٥٥/٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١١٠/٧): فيه يعقوب بن حميد وبقية رجاله ثقات، وقال السيوطي في (اسباب النزول) (ص: ١٩٦) وفي

ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر كەسێكی متمانە پێ نەكراو هەواڵێكی گرنگی بۆ هێنان؛ خێرا بڕوای پێ مەكەن، بەڵكو سەرنج بدەن، لێی بكۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە ئەوەكو ئازار وناخۆشی و گیروگرفت بۆ خەڵكی دروست بكەن بەنەزانی، جا دوای پەشیمان دەبنەوە لەو كارەی كە پێی هەستان].

لە گێڕانەوەیەكی تردا [ئەوەی پێیان بوو دایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ وە پێشنیازی كرینەوەی ئەو شتانەی خۆیان خستە ڕوو تا لە پێغەمبەری خوای ﷺ بكڕنەوە پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ((ارجعوا بنفقاتكم لا نبيع شيئاً من الصدقات حتى نقبض)) واتە: ((بگەڕێنەوە وكەل و پەل و پارەكانتان ببەنەوە چونكە ئێمە هیچ لە زەكاتەكان نافرۆشینەوە تا بەدەستمان نەگات)) ئەوانیش گەڕانەوە بەرەو شوێنی خۆیان، پاشان كەسێكی تری لەگەڵ ناردن بۆ وەرگرتنی ئەو زەكاتەی كە لە لایان مابوو][١٤٨].

(الدر المنثور) (٨٧/٦): اخرجه احمد وسنده جيد، وقال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٣٤/٧) اسناده صحيح.

[١٤٨] اخرجه: ابن ابي حاتم (الافراد) (٣٠٩/٤)، والطبراني (الكبير) (٦/١٨)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٣٢/٧): اسناده حسن.

# غەزای خەندەق

مێژووی ڕوودانی ئەم غەزایە:-

ئەم غەزایە لە مانگی شەوال ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویداوە، بەپێی بۆ چوونی زۆربەی زانایان و مێژوو نوسانی ئیسلامی وسیرەی پێغەمبەر ﷺ لەوانە (ابن إسحاق و قتادة و أبو عوبيدة و ابن سعد و واقيدی و البيهقی و الذهبی)[١٤٩].

# هۆکاری ڕوودانی ئەم غەزایە

بۆ ڕوودانی ئەم غەزایە گەلێك هۆکار هەبوون لەوانە ئەوە بوو کە قورەیشییەکان دوچاری نوشوستی یەکی گەورە هاتبوون لە ڕزگارکردنی ڕێگای بازرگانیان بەرەو شام، لەبەرامبەریشدا سریە و نێردراوە سەربازیەکانی موسوڵمانان چالاکانە کەوتبوونە جمووجۆڵی سەربازی لەدوای غەزای (ئوحود)وە بەجۆرێك بە تەواوی دەستیان گرت بوو بەسەر ناوچەکەدا و ڕێگا بازرگانیەکانی نێوان مەککە و مەدینەیان خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، لەولاشەوە قورەیشییەکان دەیان ویست خۆیان پرچەك و بەهێز بکەنەوە و پارێزگاری بکەن لەسەرکەوتنە سەربازیەکەی (ئوحود) یان بەشێوەیەك سنورەکانیان لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان دوورخەنەوە لەمەترسی و دەستەبەری دڵنیای تەواو بکەن بۆ چالاکیی یە بازرگانیەکانیان.

ئەوە لەڕوویەکەوە لەڕوویەکی ترەوە: جولەکەکانی بنی (نضير) لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەری کردن لە مەدینە بەهۆی پیلان گێڕیان بەرامبەر پێغەمبەر ﷺبەرەو خەیبەر ڕۆیشتن و لەوێ گیرسانەوە، ڕقیشیان بەرامبەر موسوڵمانان لێ دەچۆڕا کاتێك بەتەواوی لەخەیبەر جێگیر بوون کەوتنە پیلان گێڕان و دانانی پیلانێکی یەکلا

---

[١٤٩] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٣٩٤)، وابن هشام (السيرة) (٤/١٧٠)، وابن سعد (الطبقات) (٢/١٦٥)، وابن القيم (الزاد) (٣/٢٦٩)، والذهبي (تاريخ الاسلام) (ص:٢٨٣)، والواقدي (المغازي) (٢/٤٤٠)، وابن حجر (الفتح)(٧/٥٠٠)، وابي عبيدة (الاموال) (ص:٢٣٥)، وقال الهيثمي (المجمع)(١٠١٧١): رواه الطبراني ورجاله ثقات من قول ابن اسحاق.

کەردەوە بۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسوڵمانان و گەڕانەوە بۆ جێگە و ڕێگەی خۆیان و دەرخستنی هێز و ڕۆڵی پیلان گێڕانیان، ئەوەش لەڕێگەی بەستنی ڕێکەوتننامەیەکی سەربازی بەهاوپەیمانی لەنێوان جولەوکەکان و قورەیشییەکان و هۆزەکانی غەطفان، بۆ ئەو مەبەستەش شاندێکی جولەکەکان بەڕێکەوتن کەپێك هاتبوون لەهەریەك لە (سەلامی کوڕی ئەبو حەقیق و حوییی کوڕی ئەخطب و کینانەی کوڕی ڕەبیع، هوزەی کوڕی قیس وائیلی و ئەبو عەمار).

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (هۆی ڕوودانی غەزای خەندەق ئەوە بوو کەشانێك لەکەسە باڵا دەستەکانی جولەکەکان کەپێك هاتبوون لە (سەلامی ئەبوحەقیقی نەضری هوزەی کوڕی قیس وائیلی و ئەبو عەمار) لەگەڵ چەندین کەسی ترلە بەنی نەضر و بەنی وائیل، و کۆمەڵە و هۆزەکانیان کۆکردەوە لەدژی پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای قورەیشییەکان لەشاری (مەککە) کەوتنە جۆشدان و بانگ ردنیان بۆشەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ وە گڕوتینیان دان و پێیان وتن: ئێمەش لەگەڵتانداین و پشتیوانیتان دەکەین بەجۆرێك هەتاکو لەڕەگ و ڕیشەی دەردێنین، قورەیشییەکان پێیان وتن: ئەی کۆمەڵەی جولەکە ئێوە لەزاناکانی جولەکە و خاوەن یەکەم کتێبی ئاسمانین وە زانیاریتان هەیە بەوشتەی کەئێمە و محمد لەسەری ناکۆکین ئایە ئاینی ئێمە باشترە یاخود ئاینی محمد؟ وتیان: بەڵکو ئاینی ئێوە چاکترە لە ئاینی ئەو بەڕاستی ئێوە شایستەتر و ڕاستڕن لەئەو. لەگێڕانەوەیەکی تردا [وە ئێوە ڕێنمای کراون ڕێگەی ڕاستڕتان گرتۆتە بەر لە محمد و شوێن کەوتوانی) لەبارەیانەوە ئەم ئایەتەی سورەتی (النیساء:٥١) هاتۆتە خوارەوە: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا ﴾[١٥٠]. واتە: [ئاخۆ سەیری ئەوانەت نەکردووە کە بەشێك

[١٥٠] لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە لە ئیبن عباس ﷺ دەڵێت: لما قدم كعب بن الاشرف مكة قالت له قريش: انت خير اهل المدينة وسيدهم؟ قال: نعم، قالوا: [نحن اهل السقاية والسدانة فنحن خيرٌ ام هذا الصنبور المنبتر من قومه انه خيرٌ منا؟ قال: انتم خيرٌ منه فنزل على رسول الله ﷺ ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ ونزلت ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ

لەکتێبی (تەورات)یان پێدراوە؟ کەچی باوەڕیان بەجبت و، تاغووت و فالگرتنەوەو جادوو و شەیتان هەیە، واتە: پەیڕەوی لەبەرنامە دنیاییەکان دەکەن!! بەموشریك و بێ باوەڕەکان دەڵێن: ڕێ و ڕێبازی ئەوانە (موشریك وکافرەکان) لەڕێی باوەڕدارەکان چاکترە].

دەڵێت: [ئەوەیان بۆ ئەوە وت وەك ئیرەیەك بەرامبەر بە عەرەبەکان کەخودای گەورە محمدی لەناو یان هەڵبژاردووە وکردویەتی بە پێغەمبەرﷺ]. کاتێك ئەمەیان وت بەقوڕەیشییەکان زۆر دڵخۆش بوون بەگورجی وەڵامی داخوازیە شەڕانگێزەکانیان دانەوە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بکەن دواتر کەوتنە خۆکۆکردنەوە وخۆئامادەکردن بۆ ئەو مەبەستە. پاشان شاندە جولەکەکە ڕۆشتن هەتا گەیشتنە لای غەطەفان کەلە ئەوەی (قیس عیلان) بوون بەهەمان شێوەش بانگیان کردن بۆشەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ وە پێشیان ڕاگەیاندن کەبۆ ئەو مەبەستە خۆشیان پشتگیرو هاوکاریانن و لەگەڵیاندا دەبن، وە قورەیششیان لەگەڵدایە بۆ ئەو مەبەستە هەر بۆیە ئەوانیش کۆك بوون لە گەڵیان و لەو بارەوە ڕازیان کردن[151].

---

أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴾. واتە: (کاتێك کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتە مەککە قورەیشییەکان پێیان وتن تۆ باشترین و گەورەترین پیاوی مەدینەی؟ وتی: بەڵێ وتیان: ئێمە ئاودەر و نان دەری ماڵی خوداین دەرگاوانی کەعبەین ئایا ئێمە چاکترین یاخود ئەو وەجاخ کوێرە کەدابڕاوە لەخزم و کەسی خۆی پێی وایە باشترە لە ئێمە؟ وتی: ئێوە باشترن لە ئەو. بەوهۆیەش ئایەتی: ﴿ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴾ وە هەروەها ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا ] هاتەخوارەوە). اخرجه: الطبري (التفسير) (٩٧٨٦)، والبزار (٢٢٩٣) وقال ابن كثير (التفسير) (٤/٥٦٠): وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (التفسير) (٧٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن حبان (٦٥٧٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(151) اخرجه: ابن هشام(السيرة) (٣/١٧٠)، والطبري (١١/٢٥١)، وقال الهيثمي (المجمع)(٦/٧) فيه يونس بن سليمان لم اعرفه وبقية رجاله رجال الصحيح، واخرجه السيوطي (اسباب النزول) (ص:١٠٦) موصولاً، وقال صاحب (صحيح السيرة) (٤٢٤): مرسل رجاله ثقات، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٢/٤١٩): اسناده صحيح الى عروة ولكنه مرسل، واورده ابن كثير في (التفسير) (١/٥١٣) من رواية ابن اسحاق باسناد حسن الى ابن عباس.

# دەرچوونی هاوبەش پەیداکەران بەرەو مەدینە

موسای کوڕی عوقبە و ئەبوشیهابی زوهری دەفەرموون: (قورەیشییەکان بەسەرکردایەتی ئەبو سوفیان و بەهاوکاری ئەوانەی لەگەڵیان بوون لەهاوبەش پەیداکەرانی عەرەب و سەرکردەی جولەکەکانی بەنی نەضری کەناوی حویبی کوڕی ئەخطب بوو بەڕێکەوتن بەرەو مەدینە، وەلەهەمان کاتدا داوای هاوکاریان کرد بوو لە عویەینەی کوڕی حوصەینی کوڕی حوزەیفەی کوڕی بدر ئەویش وەڵامی داخوازیەکەی دانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی گوێڕایەڵیان دەکرد لەهۆزی (غەطەفان) هەموو لەگەڵیان بەڕێکەوتن کوڕانی ئەبوحەقیق لەناویاندا کینانەی کوڕی ڕەبیعی کوڕی ئەبوحەقیق چالاکانە خۆی گەیاندە ناو (غەطەفان)و کەوتە جۆشدانیان لەسەر بەژداری کردنیان لەو شەڕە یەکلاکەرەوە بە بۆ چوونی خۆیان لەبەرامبەردا نیوەی بەروبومی خەیبەریان بۆ هەیە، دەڵێن گوایە حاریثی کوڕی عەوفی مریی کەلە بەنی (مرە) بووە بە عویەینەی کوڕی حوصینی و غەطەفانیەکانی و تووە: ئەی خزم و کەسی خۆم بەگوێی من بکەن واز لەشەڕکردنی ئەو پیاوە بهێنن (مەبەستی پێغەمبەری خودا بووە ﷺ) لێی گەڕێن باخۆی لەگەڵ دوژمنەکانی لە عەرەبەکان یەکلای بکاتەوە. پاشان شەیتان بەسەریاندا زاڵ بوو چاو چنۆکی و تەماعیان بەری قورگی گرتن و چاویان تەنها ئەوی دەدیت، پاشان هەموو چوونە ژێرباری فەرمانی عویەینەی کوڕی حوصین لەسەر ئەوەی شەڕ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بکەن وە نامەیان نوسی بۆ هاوپەیمانەکانیان لە بنی أسدی کوڕی خوزەیمە بۆ ئەو مەبەستە و طولیحە لەگەڵ ئەوانەی گوێڕایەڵیان دەکرد لە بەنی (أسد) بەدەم داخوازیەکەیانەوە چوون (لە وغەطەفان) دوو هاوپەیمانی یەکتر بوون لەناوچەکەدا، هەر لەومیانەدا قورەیشییەکان نامەیان نوسی بۆ پیاو ماقوڵانی بەنی (سولەیم) کە ئەوەی خۆیان بوون لەنێوانیاندا پەیوەندی خزمایەتی هەبوو ئەبونەعور لەگەڵ ئەوانەی گوێڕایەڵی بوون لە بەنی (سولەیم) بەدەم داخوازیەکەیانەوە چوون بۆ پشتیوانی قورەیشییەکان[١٥٢].

---

(١٥٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٩٨/٣).

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (قورەیشییەکان دەرچوون بەسەرکردایەتی ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، و غەطەفان بەسەرکردایەتی عویەینەی کوڕی حوصینی کوڕی حوزیفەی کوڕی بەدر، وە حاریثی کوڕی عوفی کوڕی ئەبوحاریثەی موری لەبەنی مورە، و مسعری کوڕی رەحیلە .....لەگەڵ ئەوانەی کە گوێڕایەڵیان دەکرد لەخزمانی خۆی لەهۆزی (ئەشجەع))[153].

هەموویان رێکەوتن لەسەر شوێنی کۆبونەوەی سوپاکەیان قورەیشییەکان و هاوپەیمانەکانیان هەموو لە (مر الظهران) کۆبونەوە کە شوێنەکە (٤٠) چل کم لە (مککە)وە دوورە، هاوپەیمانەکانیان بەئەمەك بوون بەرامبەر بەڵێنەکانیان لە بەنی (سولەیم) و کینانە و خەڵکی (تهامە) و حەبەشەیەکان[154].

## خەندەق هەڵکەندن

دوای ئەوەی موسوڵمانەکان هەواڵیان پێگەیشت کە قورەیش و هۆزەکانی تری عەرەب خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ هێرش هێنانە سەریان و شەڕکردن لەگەڵیاندا، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەری خودا ﷺ وەك کاری هەمیشەی هەستا بەڕاوێژکردن بە هاوەڵانی بۆ ئەوەی هەم دڵیشیان جێگیرکات و پەیوەستبن بەیەکتری وە هەم رێگە چارەیەکی گونجاو راستیشی دەست کەوێت بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەم بارودۆخە چاوەڕوان نەکراوە، لەوکاتەدا یەك لەهاوەڵە بەڕێزەکان بەناوی سەلمانی فارسی ﷺ بۆ چوونی خۆی خستە روو کە ئاماژە کردن بوو بەهەڵکەندن و لێدانی خەندەق بەچوار دەوری خۆیان هەروەك وتی: (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە لەوڵاتی فارسدا کاتێك گەمارۆ بدراینایە لەلایەن هێزێکی دەرەکیەوە ئەوە خەندەقمان بەچواردەوری خۆمان لێدەدا)[155].

---

[153] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧١/٣).

[154] أنظر: (السيرة الصحيحة) للعمري (٤١٩/٢)

[155] أخرجه: الطبري (التاريخ) (٥٦٦/٢)، والواقدي (المغازي) (٤٤٥/٢)، وابن هشام (السيرة) (١٧٤/٣) أخرجوه كلهم بدون اسناد، وانظر (ضعيف تاريخ الطبري) (رقم: ٢١٥).

پێغەمبەری خودا و هاوەڵانی نەخشەکەیان پێ باش بوو بەکۆی دەنگ پەسەندیان کرد و هەستان بەهەڵ کەندنی خەندەق لەناوچەیەك کەڕووی والا بوو بۆ هێرش کردنە سەریان و تاکە ڕێگە بوو کەبتوانن لێیەوە زەبریان لێ بوەشێنن بۆ ئەوەش کە هەردوو ناوچەی بەردەڵانی (گەرمی واقم و ناوچەی بەردەڵانی ڕەشی وەبرە) بەیەکەوە ببەستنەوە کەدەکەوێتە بەردەم هاوبەش پەیدا کەرەکان.

لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە لە عەمری کوڕی عەوفی موزنی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نەخشەی هەڵکەندنی خەندەقی پەسەند کردوو دەستی پێکرد لە ڕۆژی ئەحزابدا لەناوچەی (أجم السمر) کە دەکەوێتە شوێنی نیشتەجێ بوونی (بەنی حارثە)وە هەتاکو دەگاتە ناوچەی (میداد)، پاشان هەر چل گەزەی دابەش کرد بەسەر (دە) کەسدا بۆ ئەوەی هەڵیکەنن، دواتر کۆچکردووەکان و پشتیوانەکان کەوتنە کێبەرکێ لەسەر سەلمانی فارسی لەبەر ئەوەی نەخشەکەی دانا و پیاوێکی بەهێزیش بوو، پشتیوانەکان دەیان وت: سەلمان لە ئێمەیە، کۆچکردووەکانیش: دەیان وت: سەلمان لە ئێمەیە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((سلمان منا اهل البیت)) واتە: ((سەلمان لە ئێمەیە لە ئەهلی بەیت))[156].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گوێ بیستی هاوەڵانی بوو لەسەر کۆبونەوەیان بۆ هەڵکەندنی خەندەق بەدەوری مەدینەدا پێغەمبەری خودا ﷺ خۆشی کاری تێدا دەکرد بەمەبەستی هاندان و جۆشدانی موسوڵمانان بۆ کارکردن تێیدا هەر بۆیەش موسوڵمانەکانیش لەگەڵیدا خەندەقیان هەڵدەکەند وە پێغەمبەری خودا ﷺ بێ گوێدانە ماندویەتی و شەکەت بوون بەردەوام بوو کۆڵی نەدەدا و هاوەڵانیش چاویان لێ دەکرد و بەهەمان شێوە بەڵام کەسانێك لە دووڕووکان بەخاو خلیچکیەوە کاریان دەکرد و خۆیان وەك کەسێکی بێ هێزو نەشارەزا دەردەخست لە کارکردندا و ناوبەناو خۆیان دەدزیەوە بۆ ماڵەوە بەبێ ڕوخسەت و ئاگاداری پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵام کاتێك یەکێك لە

---

(156) أخرجه: الحاكم (٣/٥٩٨)، وقال الذهبي: سنده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٣/٤١٨) وفي سنده كثير بن عبدالله متروك، والطبراني (الكبير) (١٠١٣٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠/١١١): فيه كثير بن عبدالله وقد ضعفه الجمهور وبقية رجاله ثقات، وضعفه الشيخ الالباني في (السلسلة الضعيفة) (٣٧٠٤)، و (ضعيف الجامع) (٣٢٧٢).

موسوڵمانان بیویستایە بۆ کارێك بڕوات کەپێویست بوو لەسەری جێبەجێی بکات دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ باسی دەکرد و داوای ڕوخسەتی لێ دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پێویستە ئەویش ڕێگەی پێدەدان کاتێکیش کارەکەیان تەواو دەکرد دەست بەجێ دەگەڕانەوە شوێنی کارکردنیان بۆ ئەوەی خێرو پاداشتیان دەسکەوێت لە سەری هەر بەوهۆیەوە خودای پەروەردگار ئەم ئایەتە پیرۆزەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور: ٦٢) ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی ئەو موسوڵمانانە هاتە خوارەوە کە گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەیان دەکرد و بەتەمای پاداشت و بەدەست هێنانی خێری زیاتر بوون و بەژداری هەڵکەندنی خەندەقەکەیان دەکرد پاشان خوای پەروەردگار دەربارەی ئەو دووڕووانەی کەخۆیان لەکار گردن دەدزیەوە و بەبێ ڕوخسەت خواستن لە پێغەمبەری خودا دەڕۆیشتنە ماڵەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور: ٦٣)[١٥٧] واتە: [ئەی باوەڕداران ئەکەن بانگی پێغەمبەر بکەن، وەك ئەوەی خۆتان لە نێوان یەکتردا بانگی یەك دەکەن (چونکە دەبێت ڕێزی پێغەمبەری خودا ﷺ تایبەت بێت) بێگومان خودا دەزانێت بەوانەی خۆیان پەنهان دەکەن و خۆدەدزنەوە لە کارو فرمان، دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بەئێش ببن].

عومەیری (رحمه الله) دەفەرموێت: (موسوڵمانەکان بڕیاریاندا بەهەڵکەندنی خەندەق کە درێژ دەبۆوە لە (أم الشيخين) هەوارگەی بەنی حارثە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتاکو ناوچەی

(١٥٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٢/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٤١٠/٣) والطبري (التاريخ) (٥٦٥/٢)، وقال محققه في (ضعيف تاريخ الطبري) (رقم: ٢١٦): اسناده مرسل.

(میداد) لە ڕۆژئاواوە، پێنج هەزار گەز بوو (واتە: نزیکەی (٥)کم (٥٤٤) مەتر)ە و...
پانیەکەی نۆ گەز پان بوو (واتە: نزیکەی (٤) مەترو (٦١)سم).
قوڵیەکەشی (٧) تا (١٠) گەز بوو (واتە: نزیکەی (٣) مەتر (٢٣٤)سم) بۆ هەریەک لە ...
کەسی موسوڵمانەکان هەڵکەندنی چل گەزی بۆدانرا بوو (واتە: هەرکەسێکیان (١) مەتر (٨٨٤)سم بەردەکەوت). کۆچکردووەکان هەڵکەندنی ناوچەی قەڵای (راتج) یان گرتە ئەستۆی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ قەڵای (ذباب)، پشتیوانەکانیش لە قەڵای (ذباب)ەوە بۆ کێوی (عبید) لە ڕۆژئاواوە[158]. ماوەی هەڵکەندنی خەندەق (٩) تا (١٠) ڕۆژی پێچوو بێ باوەڕەکانیش دوای چواردە ڕۆژ گەیشتنە سەر خەندەقەکە[159].

## پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا بەژداری هەڵکەندنی خەندەق دەکات

پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی هەستان بە هەڵکەندنی خەندەقەکە لەبارو دۆخێکی سەختدا کە ئەوکات هەوایەکی سارد و بایەکی بەهێز و باری گوزەرانی خراپ و کەس بەروبوم، لەگەڵ دژواری و قورسی کارکردندا لە خەندەق لێدانەکە و گواستنەوەی خۆڵ و خاشاکی ناو خەندەقەکە بەپشتیان، بەڵام بەوپەڕی ورەبەرزی و لە خۆبردووی و بێ ماندوو بوون کارەکەیان ئەنجام دەدا. پێغەمبەری خودا ﷺ کاری لەگەڵ دەکردن و هاوبەشی ناسۆری و نارەحەتیەکانیان بوو مژدەی خودای پێدەدان و خۆشی دەخستە دڵەکانیانەوە و هۆرەی بەکۆمەڵی لە هۆنراوەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی لەگەڵدا دەوتنەوە و بەمەبەستی جۆشدانیان، کەکاریگەری باشی هەبوو لەسەر تەواوکردنی کارەکەیان بەو پەڕی گورج و خێرایی وە سوک کردنی ئەو بارە دەروونیە نالەبارەی کەتیایدا دەژیان بەهۆی ئەو بارو دۆخانەی کەباسمان کرد ئەوەش لەچەندین گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە:-

---

[158] اورده: العمري (السيرة الصحيحة) (٢/٤٢١)، وشوقي ابو خليل في (غزوة الخندق) (ص: ٩٢).
[159] اورده: الحافظ (الفتح) (٧/٥٠١) عن موسى بن عقبة، و اورده ايضاً شوقي ابوخليل (غزوة الخندق) (ص: ٩٣).

لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچوو بۆ غەزای (خەندەق) کۆچکردووەکان و پشتیوانەکان کەوتنە خەندەق لێدان بەدەست لەبەرە بەیانێکی ساردا، هیچ کۆیلە و بەردەستێکیان نەبوو کاریان بۆ بکات، کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەو حاڵەتەدا بینینی کە دوچاری چ ماندویەتی و برسیەتیەك هاتوون فەرمووی: (ئەی پەروەردگار ژیان تەنها ژیانی دوارۆژە لەپشتیوانەکان و کۆچکردووەکان خۆشبە). ئەوانیش وەڵامیان دایەوە وەدەیان وت:

نحن الذين بايعوا محمداً على الجهاد ما بقينا أبداً

واتە: (ئێمەین ئەوانەی پەیمانمان داوە بە محمد ﷺ لەسەر تێکۆشان و جیهاد کردن بە بەردەوامی لە ژیاندا)[١٦٠].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (کۆچکردووەکان و پشتیوانەکان خەندەقیان هەڵکەند بەدەوری مەدینەدا و خۆڵ و خاشاکە کەشیان بەشانیان دەگواستەوە) و دەیان فەرموو:

نحن الذين بايعوا محمداً على الاسلام ما بقينا أبداً

واتە: (ئێمەین ئەوانەی پەیمانمان داوە بە محمد ﷺ لەسەردەست گرتن بەئیسلامەوە هەتا ماوین لە ژیاندا).

پێغەمبەری خودا ﷺ لەوەڵامیاندا دەی فەرموو: ((اللهم إنه لاخير الأ خيرُ فبارك الأنصار والمهاجرة)) واتە: ((ئەی پەروەردگارە هیچ خێرو چاکەیە نی یە تەنها خێرو خۆشی ڕۆژی دوایی نەبێت و خودایە فەرو بەرەکەت بخەیتە پشتیوانەکان و کۆچکردووەکان))[١٦١].

لە بەرائەوە ﷺ دەفەرموێت: [لەکاتی ڕوودانی غەزای (ئەحزاب)دا و کە پێغەمبەری خودا ﷺ بڕیاری هەڵکەندنی خەندەقی دا ئێمە لەگەڵیدا بووین ئەوان خەندەقیان هەڵدەکەند و ئێمەش خۆڵمان دەگواستەوە بەشانی خۆمان][١٦٢] من بینیومە پێغەمبەری خودا ﷺ خۆڵی خەندەقی دەگواستەوە. لەگێڕانەوەیەکی تردا [وەخشتی دەدایە

---

(١٦٠) أخرجه: البخاري (٤٠٩٩)، ومسلم (١٨٠٥)، والبيهقي (الدلائل) (٣/٤١٠).
(١٦١) أخرجه: البخاري (٤١٠٠).
(١٦٢) أخرجه: البخاري (٢٩٦١)، والترمذي (٣٨٥٧)، وابن حبان (٥٧٨٩).

دەستیان](١٦٣) هەتا خۆڵ سەر پێستی سکی لەمن شاردبۆوە و ئەم دەبینی لەوڕۆژەدا قژی زۆر بوو گوێم لێ بوو لەوکاتەی کەخۆڵی دەگواستەوە بەشێوەی هۆزە چەند پارچە هۆنراوەیەکی کوڕی ڕەواحەی رضي الله عنه دەگوتەوە دەی فەرموو:

((اللهم لو لا انت ما أهتدينا ولا تصدّقنا ولا صلّينا

فانزلن سكينة علينا وثبتْ الأقدام ان لاقينا))

واتە: (ئەی پەروەردگارە ئەگەر تۆ نەبوایەی ئێمە ڕێنمای نەدەکراین نەزەکاتمان دەدا و نەنوێژیشمان دەکرد تۆقرە و ئارامی برژێنە بەسەرمان خۆڕاگر و جێگیرمانکە لەکاتی ڕوو بە ڕو بوو نەوەدا).

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەم دێڕەی خوارەوەشی لەکۆتایدا دەوتەوە:

إن الأُلى قـــد بغوا علينا وان ارادوا فتنة أبينا

واتە: (دوژمن هێرشی زۆرداری هێناوەتە سەرمان ئەگەر بیانەوێت بەرەو شرکمان بەرنەوە پشت هەڵدەکەین و دژیان دەوەستین).

لەکۆتای هەر بەیتێکدا مەدی دەدایەوە و درێژی دەکردەوە لەگێڕانەوەیەکی تردا دەنگی بەرز دەکردەوەو: (ابينا ابينا).(١٦٤)

لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا (ضعيف) لەسەلمانەوە رضي الله عنه دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەر قازیمەیەکی دەدات لەزەوی لەغەزای خەندەقدا دەی فەرموو:

بسم الله وبه هُدينا ولو عبدنا غيره شقينا

يا حبذا ربّاً وحب ديناً(١٦٥)

واتە: بەناوی خودا و بەویش ڕێنموی گراوین جگە لەویش هەرشتێکی تر بپەرستین زەبون و ڕیسوا دەبین خۆزگە بەخۆمان بۆخوداکەمان وە خۆزگە بەخۆمان بۆئاینەکەمان.

---

(١٦٣) أخرجه: احمد (٢٦٤٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابو يعلى (١٦٤٥)، وقال الحافظ في (الفتح) (٥١٠/٧): اسناده صحيح.

(١٦٤) أخرجه: البخاري (٣٤٠٤)، (٤١٠٦) و (٤١٠٦)، ومسلم (١٨٠٣)، والبيهقي (الدلائل) (٤١٢/٣).

(١٦٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤١٤/٣)، وقال ابن كثير في (البداية) (٩٦/٤): حديث غريب.

لەئەبو سەعیدی خودری ﷛ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ عەماری کوڕی یاسر ﷛ دەبینی لەکاتێکدا خەریکی هەڵکەندنی خەندەق بوو کە تۆزو خۆڵی سەری دەسڕیەوە و لایدەدا و دەیفەرموو: ((بُؤس ابن سُمية تقتلك فئةٌ باغية)) واتە: ((وای بۆ کوڕی سومیە کۆمەڵ و تاقمێکی یاخی دەتکوژن))[١٦٦].

# کەم بوونی خواردەمەنی لەکاتی هەڵکەندنی خەندەقدا

غەزای خەندەق لەساڵێکی قات و قڕی و نەهاتی دا ڕوویدا لەگەڵ ئەوەشدا کەمی بەرو بوم و بەگران بەدەست هێنانی ئەو خۆراکە پێویستانەی کە پێویستی سەرەکی ڕۆژانەی هەموو تاکو خێزانێك بوون لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا موسوڵمانەکان زۆر لەخۆ بوور دوانە و تێکۆشەرانە کەوتنە کارکردن لەهەڵکەندنی خەندەقەکەدا و خۆیان و ماڵ و منداڵیان بەربەرەکانی ئەوبرسیەتیە سەختەیان دەکرد، خوای گەورە وەك موعجیزەیەك لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا ﷺ خواردنی کەمی زۆرکرد بۆیان وەك بەرکەتێکی خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، ئەنەسی کوڕی مالیك باسی پێخۆر و خواردنەکانیانمان بۆ دەکات دەفەرموێت: (بەژداربوانی غەزای خەندەق بەئەندازەی مشتێك جۆیان بۆ دەهێنرا کەمێك بەزیان تێکەڵ دەکرد لەبەر کۆنی ڕەنگی دەگۆڕا ئەوەندە کۆن بوو بۆنیشی لێدەهات کاتێك ئامادە دەکرا بۆ خواردن لەبەربرسیەتی ناچار بوون بیخۆن لەبینیان دەگیرا لەبەر زبریەکەی)[١٦٧].

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷛ دەفەرموێت: (لەغەزای خەندەقدا لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بووین دەستمان کرد بەهەڵکەندنی خەندەق سێ ڕۆژ بەسکی برسیەتی ماینەوە هیچ شتێکمان نەخوارد بوو بێتاقەت بووین لەکاتی هەڵکەندنەکەدا بەردێکی [گەورە] هاتەڕێمان هیچمان بۆ لەگەڵ نەکرا چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتم: ئەو بەردە

[١٦٦] اخرجه: مسلم (٧٢٤٩)، واحمد (٢٦٤٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي (الكبرى) (٨٢٧٥)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٢٩٣/١٥).

[١٦٧] اخرجه: البخاري (٢٨٣٦، ٤١٠٠)، والحاكم (١١٧/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

پێغەمبەری خودا فەرمووی ﷺ: ((ئاوڕشێنی خەندەقەکەدا، [پێغەمبەری خودا فەرمووی ﷺ: ((ئاوڕشێنی
بۆتە ڕێگر لەبەردەمان لەناو خەندەقەکەوە]))  ئێمەش ئاوڕشێنمان کردوو [ئێمەم
بکەن] [من خۆم بۆی دەچمە خەندەقەکەوە]
پێغەمبەر هەستا و [هات] بەرەولای بەردە گەورەکە [لەبرسیەتیدا] بەردی لەسکی بەستبوو
بوو، دەیفەرموو: [برسیەتیەکی لەڕادە بەدەرم بە پێغەمبەری خودا ﷺ وە بینی سکی
بەقوڵدا چوو بوو  ئەویش پاچەکەی گرتە دەست یاخود پیکە کە و سێجار ناوی خودای
هێنا وتی: (بسم الله)، پاشان کێشای بەبەردەکەدا و وردو و خاشی کرد و کردی بەلمی وورد
کاتێك ئەوەم لە پێغەمبەری خودا بینی ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مۆڵەتم بدە
سەر [لەماڵەوە] دەدەم ؟ دەفەرموێت: ڕوخسەتی دام و ئینجا چوومە ماڵەوە خێزانم هات
پێم وت: دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات من شتێکم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بینیوە ناتوانم ئارام
بگرم لەسەری، [پێغەمبەری خودام بینی ﷺ لەبرسا سکی بەپشتیا نوسابوو] هیچت
لەخواردن لەلایە؟ [ئەویش چووە دەرەوە و تورەکەیەکی هێنا بەئەندازەی جامێك جۆی
تێدابوو] وتی: جامێك جۆ و چتیرێکمان هەیە (چتیر: ئەو بزنەیەکە تەمەنی گەیشتووەتە
(٦) مانگی بەرەو ژوور)، دەفەرموێت: جامە جۆکەمان کرد بەئاردو چتیرەکەشمان سەربڕی
و چاکمان کردوو و کردمانە مەنجەڵەوە و جۆیەکەمان دوای ئەوە کردبە ئارد و
هەویرەکەمان شێلا [لەدەرفەتێکدا] گەڕامەوە خزمەکەت پێغەمبەر ﷺ و [لەلای دانیشتم]
ماوەیەك لەلای مامەوە، پاشان بۆ جاری دووەم داوای ڕوخسەتم لێکرد و مۆڵەتی پێدام و
کەچومەوە ماڵەوە بینیم [هەویرەکە هەڵهاتووە] و [گۆشتەکەش] ئامادەیە پێم وت کە
هەویرەکە بکات بەنان و گۆشتەکەش لەناو مەنجەڵدا دابنێت لەسەر سێ بەردەی ئاگردانەکە
[نزیك بوو بکوڵێت] [خێزانەکەم وتی: لەخزمەت پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانیدا شەرمەزارم
نەکەیت] (مەبەست ئەوە یە کەزۆر خەڵك بانگ نەکەیت) دەفەرموێت: [کاتێك ڕۆژ بەرەو
و ئاوابوون چوو پێغەمبەری خودا ﷺ دەیویست دەست هەڵگرێت و بگەڕێتەوە چونکە ئێمە
بەڕۆژ کارمان دەکردوو کاتێك ئێوارە دادەهات دەگەڕاینەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆمان]
دەفەرموێت: پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەدزیەوە پێم وت: ئێمە تۆزێك
خواردنمان ئامادەیە لەماڵەوە ئەگەر خۆ تو پیاوێك یان دووان یان [چەند کەسێك] لەوانەی
لەگەڵتان بێنەوە تا لەخزمەتاندابین؟ فەرمووی: (چی یە و چەندە)؟ پێم وت: جامێك جۆ

و چێترێکە. فەرمووی: ((كثيرٌ طيّبٌ] ارجع الى اهلك فقل لها لا تنزع البرمة من الأثافي ولا تخرج الخبز من التنور حتى آتي)) واتە: (([زۆرە و بەپێزە] بڕۆوە لای خێزانەکەت پێی بڵێ با گۆشتەکە لەسەر ئاگردانەکە دانەگرێت و نانیش لەتەندورەکە دەرنەهێنێت (واتە: هەویرەکە نەکات بەنان هەتاکو دەگەمەلاتان)). ئینجا بەخەڵکەکەی فەرموو: (([يا اهل الخندق ان جابراً قد صنع لكم سوراً فحيهلا بكم] قوموا الى بيت جابر)) واتە: (([ئەی خەڵکینە ئەوە جابر خوانێکی بۆ ئامادە کردوون] هەستن بابڕۆین بۆ ماڵی جابر)) دەڵێت: پاشان [ئەمری کرد بەبانگکەرێك بانگ بکات لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو بڕۆن بۆ ماڵی جابری کوڕی عەبدوڵڵا. جابر ﷺ دەڵێت: وتم (إنا لله و إنا إليه راجعون) شەرمەزاریەك دایگرتم تەنها خودا پێی ئاگادار بوو [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((گۆشتەکەتان لەسەر ئاگر دامەگرن و نانەکەش لێمەکەنەوە و چێتر پێوەی مەدەن هەتاکو من دێم))] دەڵێت: [چوومەوە لای خێزانم] و وتم: دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات [شەرمەزار] بووین ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی هەموو بەرەو و ماڵی ئێمە دێن. [ئەویش وتی: ئەوەش تۆ بزانی بەهۆی تۆوە بوو منیش پێم وت: ئەوەی پێت وتم جێبەجێم کرد]، وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری کرد خواردنەکە [چەندە؟] وتم: بەڵێ، وتی: کەواتە خوا و پێغەمبەری خودا ﷺ باشتر دەزانن [ئێمە ئاگادارمان کردۆتەوە بەوەی کەلەماڵماندا هەیە]، دەفەرموێت: هەندێك لەو خەمەی ماندووی کردبووم بەوقسانە سوك بوو لەسەرم و [خەموو خەفەتێکی زۆر لەڕوومدا دەرکەوتبوو] وتم: بەدڵنیایەوە ڕاست دەکەیت، دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی هێنا و [خەڵکەکەش لەخزمەتیا بوون] و ئینجا هاتە ژوورەوە پاشان بەهاوەڵانی فەرموو: ((وەرنە ژوورەوە] بەلەسەر خۆی و بێ پاڵە پەستۆ کردن)) [دەڵێت: ئینجا دانیشت] [هەویرەکەم هێنایە خزمەتی فوی پیرۆزی پیاکرد و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد و پاشان [چوو بۆلای قاورمەی گۆشتەکە و بەهەمان شێوەی هەویرەکە دوعا و نزای بەرەکەتی بۆ کرد ئینجا فەرمووی: ((ادعي خابزة فلتخبز معك واقدحي من برمتكم ولاتنزلوها)) واتە: ((بانگی هاوسەرەکەت بکە بانانەکە بکات لەگەڵت بەڵام گۆشتەکە دامەگرە و سەرەکەی لەسەرلابە و لێی دەربێنە))] پاشان دوعای نزای بەرەکەتی بۆ تەندووری نانەکە و قاورمەی گۆشتەکە کرد، لەتەندورەکە نانمان دەردێنا و گۆشتمان لە سەر

ئاگردانەکە دەردێنا، [نانەکەمان کەرت دەکرد و پارچە گۆشتێکمان لەسەر دادەنا سەری مەنجەڵە گڵینەکە و تەنورەکەمان دادەپۆشیەوە کاتێك لێمان دەردێنا پاشان دەکرایەوە لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ] پاشان لەقاپ دەکرا بەتێکوشە دەخرایە نزیك بەردەمیان، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((با لەسەر قاپێك حەوت یاهەشت کەس دابنیشێت)) کاتێك ئەوان تێریان دەخوارد، سەرقاپی تەندورەکە و سەری مەنجەڵی گۆشتەکەمان لادەدا دووبارە پڕدەبوونەوە وەك جاری یەکەم ئینجا دەمان کردەوە بەتێکوشە و لەقاپدا پێشکەشمان دەکردەوە بۆ هەندێکی تر، هەربەو شێوەیە بەردەوام بووین هەرجارێکیش سەری تەنور و مەنجەڵی گۆشتەکەمان لادەدا دەمان بینی کەپڕ بۆتەوە وەك ئەوەی هیچی لێ نەخورابێت هەتاکو موسوڵمانەکان تێریان خواردلێی، وە هەندێك لە لەخواردن مایەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((خەڵکی دوچاری برسێتیەکی ناڕەحەت بوون بۆخۆشتان بخۆن و خواردنی لێبدەن بەخەڵکانیش)) ئەو ڕۆژە بەردەوام ئەوانەی لێیان خوارد هەشسەد کەس بوون. (لەگێڕانەوەیەکی تردا) (١٠٠٠) هەزار کەس دەبوون[١٦٨].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەفەرموێت: (ئەبوطلحەی ئەنصاری و کەناوی زەیدی کوڕی سەهلە و زڕبابی ئەنەسە بە ئوم سولەیمی هاوسەری فەرموو: [گوێم لە دەنگی پێغەمبەری خودا بوو ﷺ زۆر بەکزی] وادەزانم برسیەتی وای لێکردبێت هیچ شتێك شك نەبێت. ئەویش فەرمووی: بەڵێ، (ئەنەس ﵁ دەفەرموێت): چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێنا پاشان سەر پۆشێکی هێنا تێوەی پێچا بەجۆرێك کولێرەکان کەوتنە سەریەك [پاشان خستیە ژێر جلەکەی منەوە] (چونکە ئوم سولەیم دایکی ڕاستەقینەی ئەنەس بوو شووی بە ئەبوطلحە کردبۆوە دوای مردنی مالیك کوڕی نضری هاوسەری) دواتر گەڕاندمیەوە و هەندێکیانی لەشوێنی خۆی دانایەوە پاشان ئەبوطلحە منی نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشتم بینیم پێغەمبەری خودا ﷺ لەمزگەوت بوو هەندێك خەڵکیش لەخزمەتیا بوون [چوومە خزمەتیان ڕاوەستام] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ئەبوطلحە تۆی

[١٦٨] اخرجه: احمد (١٥٠٢٨) وقال محققه: حديث صحيح واللفظ له والزيادات: للبخاري (٤١٠١، ٤١٠٢)، ومسلم (٢٠٣٩)، وابن هشام (السيرة) (١٧٣/٣) وقال محققه: اسناده حسن من طريق احمد، والحاكم (٣٠/٣)، والطبراني (الطوال) (٥١).

ناردووە؟)) وتم: بەڵێ. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی بەوانەی لە خزمەتیا بوون ((هەستن بابڕۆین)) ئینجا هەستان بەرەو ماڵی ئەبوطلحە کە وتنەڕێ منیش پێش لەوان بۆی دەرچووم لەناویان دابووم هەتاکو گەیشتمە لای ئەبوطلحە و هەواڵەکەم پێدا ئەویش وتی: ئەی دایکی سولەیم پێغەمبەری خودا ﷺ و لەگەڵ هاوەڵانی تەشریفیان هێناوە بەرەو ماڵی ئێمە ئەوەندەشمان پێخۆر لەماڵە ومنی یە کەبەشی خزمەت گردنی هەموویان بکات؟ ئوم سولەیم وتی: خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ باشتر دەزانن، ئەبوطلحە چووەدەرو و هەتا [گەیشتە] خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ پێغەمبەری خودا کاتێك تەشریفی هێنا ئەبوطلحەی لەخزمەت دابوو ئەوە بوو هەردوکیان هاتنە ژوورەوە و، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ئوم سولەیم هەرچیتان هەیە بیهێنە)). ئەویش نانەکەی هێنایە خزمەتی و دواتر پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمری کرد کە نانەکە ورد بکات و پارچە پارچەی بکات وە بیکاتە تێکوشە و ئینجا لەناو دیزەکەیدا پێخۆری بۆ هێنا کەرۆنە کەرەکەی تێدا بوو پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندەی خودا ویستی نزای بەسەردا خوێند پاشان فەرمووی: ((با دە کەس بێنە ژوورەوە)) ئینجا ئەو دە کەسە هاتنە ژوورەوە و تێریان خواردوو چوونەدەر پاشان فەرمووی: ((با دە کەسی تربێنە ژوورەوە). بەو شێوەیە خەڵکەکە هەموویان تێریان خوارد و تێر بوون کەژمارەیان حەفتا کەس یاخود هەشتا کەس دەبوون)[١٦٩].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (سەعیدی کوڕی مینا بۆی گێڕامەوە کە کچێکی بەشیری کوڕی سەعدی ئەنصاری ﷺ خوشکی نوعمانی کوڕی بەشیری ﷺ دەفەرموێت: (دایکم عمرەی کچی ڕەواحە بانگی کردم، دوو مشت خورمای پێدام و خستیە کۆشمەوە پاشان پێی فەرمووم: کچەکەم برۆ ئەمە ببە بۆ باوکت و خاڵت عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە با بۆ خۆیان بیخۆن، ئەویش دەڵێت: وەرم گرت و بۆی دەرچووم، لەرێگادا بەلای پێغەمبەری خودا ﷺ رۆیشتم من لەباوکم و خاڵم دەگەڕام پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((وەرە کچەکەم ئەوە چیە پێتە؟)) دەڵێت منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە خورمایە دایکم بێیدا ناردووم کەبیدەمە باوکم بەشیری کوڕی سەعد و خاڵم عەبدوڵڵای کوڕی

---

[١٦٩] أخرجه: البخاري (٥٣٨١)، ومسلم (٢٠٤٠)، ومالك (٢٢٢/٢)، وأحمد (٢١٨/٣)، والترمذي (٣٦٣٠)، وابن حبان (٦٥٣٤).

ڕواحە وەك پێخۆر بیخۆن، فەرمووی: ((بیهێنە بۆلای من)) دەڵێت: منیش ڕۆم کرد هەردوو دەستی پێغەمبەری خوداوە ﷺ پڕی نەکردن، پاشان ئەمری کرد پۆشاکێکی بۆڕاخەن، ئینجا خورماکەی خستە سەر پۆشاکەکە و پەرشو بڵاوی کردەوە پاشان بەو کەسەی فەرموو کەلە خزمەتیا بوو: ((بانگ بکە با خەڵکی خەندەقەکە هەموو بێت بۆ نان خواردن)) خەڵکی خەندەقەکە کۆبوونەوە لەسەر ئەو خورمایە، بەو شێوەیە هەموو لێیان خوارد هەر زیادی دەکرد هەتاکو خەڵکی خەندەق لەسەری هەستان، کەچی خورما کە هەر زیاد بوو لەچوار چێوەی پۆشاکە ڕاخراوەکە دەکەوتە ئەملا و لای چارشێوەکەوە)[١٧٠].

# پێغەمبەر ﷺ مژدەی فەتح کردنی وڵاتی فارس وڕۆم دەدات بەهاوەڵانی

لەناو ئەو بارودۆخە دژوار و سەختەدا پێغەمبەری خودا ﷺ مژدەی ڕزگاربوون و سەرکەوتنی دەدا بەهاوەڵانی، وە ورەی بەرزدەکردنەوە و گیانی بڕوا بوون بە خودا پاشان بەخۆیانی تێدا بەهێز دەکردن لەوکاتەدا خودای گەورە کۆشك و تەلارەکانی شام و (مەدائن)ی کیسرا و یەمەنی پیشاندا وبەهاوەڵانی بەڕێزی ڕاگەیاند کەخودای گەورە کلیلەکانی ئەو جێگانەی پێ بەخشیوە، ئەوەش لەچەندین گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە: لە ئەبوسەکینە کەکەسێکە لەئازاد کراوەکان (واتە: لەوانەیە کەمژدەی ئازاد بوونی لەئاگر پێدراوە). لەکەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد بەهەڵکەندنی خەندەق، بەردێکی گەورە هاتە ڕێگەی هاوەڵان، بووە هۆی ڕێگریان لەهەڵکەندنی خەندەقەکەدا توانایان بەسەریدا نەدەشکا، پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا و قازمەکەی گرتە دەست، عەباکەی سەرشانی لەلایەکی خەندەق دانا و فەرمووی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ واتە: ﴿وە گشت وتەکانی پەروەردگارت (قورئان) و سەرجەم بڕیارەکانی، لە ڕاستیی ودادگەرییدا، تەواو بەئەنجام

---

(١٧٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٣/٣)، وابو نعيم (الدلائل) (رقم: ٤٣١)، والبيهقي (الدلائل) (٤٢٧/٣)؛ وقال ابن كثير (البداية) (٩٨/٤) فيه انقطاع، وقال الحافظ العراقي في تخريج (الإحياء) (٣٨٤/٢): اسناده جيد.

گەیشتوون و بێ وێنەن و هیچ کەسێ: دەسکاریی وئاڵوگۆڕیان تیادا ناکات هەرئەو خۆی چاك دەبیسێ و، باش زاناو ئاگادارە بەهەمور شتێك.] دەست بەجێ سێیەکی تاشە بەردەکە وردوخاش بوو سەلمانی فارسی ﷺ بەدیاریەوە وەستا بوو سەیری دەکرد کەبڵێسەی ڕووناکی لێبەرزبۆوە لەگەڵ پێداکێشانی پێغەمبەری خودا ﷺ جۆن بڵێسەیەك. پاشان بۆ جاری دووەم قازمەیەکی تری لێداو فەرمووی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ بەشێکی تری وردوو خاش بوو، بڵێسەیەکی تری لێبەرزبۆوە جۆن بڵێسەیەك سەلمان ﷺ بینی، پاشان بۆ جاری سێیەم پیایدا کێشایەوە و فەرمووی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ بەشەکەی تریشی وردوو خاش بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ هاتەدەرەوە عەباکەی هەڵگرتەوە و دانیشت.

سەلمان ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆم بینی کاتێك قازمەکەت لەبەردەکە دەدا لەگەڵ لێدانی هەر قازمەیەك ڕووناکیەك بەرزدەبۆوە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: (سەلمان ئەوەت بینی)؟ وتم: بەڵێ بەوزاتەی تۆی بەهەق ناردووە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فاني حين ضربتُ الضربة الأولى، رُفعتْ لي مدائنُ كسرى وما حولها ومدائن كثيرة، حتى رأيتها بعينيّ)) واتە: (من کاتێك قازمەی یەکەمم پێداکێشا، مەدائینی کیسرام پیشاندرا دەوروو پشتی مەدائینیش وشاری زۆریش، هەتا بەچاوی خۆم هەموویانم بینی).

ئەوانەی لەخزمەتیا بوون لەهاوەڵانی پێیان فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، دوعامان بۆ بکە لەخودا کەبۆمان فەتح بکات و ماڵ و جێگەیان ببێتە غەنیمە و دەستکەوتمان وەبەدەستی ئێمە دەسەڵاتیان تێدابچێت و کاول بێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ دوعای بۆ کردن بەو شێوە: ((ثم ضربتُ الضربة الثانية فرُفعتْ لي مدائن قيصر وما حولها، حتى رأيتُها بعينيّ)) واتە: (فەرمووی پاشان قازمەی دووەمم پێداکێشا شارەکانی قەیصر و دەورووپشتیم پیشاندرا هەتاکو و بەچاوی خۆم هەموویانم بینی).

بەهەمان شێوەی جاری پێشوو ئەو هاوەڵانەی کە لەخزمەتیدا بوون داوایان کرد کەدوعایان بۆ بکات کەخودای گەورە فەتحی بکات بۆیان و ببێتە دەستکەوت و غەنیمەتیان

ئەویش بۆیان پاڕایەوە لەخودای گەورە بەو شێوەیەی کە دەیان ویست. ((ثم ضربتُ الثالثة فرفعتْ لي مدائن الحبشة وما حولها من القُرى حتى رأيتها بعينيّ)) (پاشان کەجاری سێیەم لێیم دا کۆشکو تەلاری حەبەشەم پیشاندرا و ئەوەی لەدەورو پشتی بوو لەشارو ئاوەدانی بەچاوی خۆم بینیم) پێغەمبەری خودا ﷺ لەوکاتەدا فەرمووی: ((دعوا الحبشة ما ودعوكم واتركوا الترك ما تركوكم)) واتە: (واز لەحەبەشە بێنن ئەوەندەی ئەوان واز لەئێوە دێنن دەست بەرداری (تورک) بن مادام ئەوان دەست بەردارتانبن[١٧١] (ولاتی حەبەشە (ئەتیوبیای) ئێستایە).

بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەفەرموێت: (لەوکاتەدا کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێکردین بەخەندەق لێدان لەیەکێك لەچاڵەکان توشی بەردێکی [بەهێز و گەورە] بووین باج و قولینگ هیچ کاری تێنەدەکرد هەر بۆیە سکالآمان بردە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی ڕێگە چارەیەکمان بۆ دانێت ئەویش تەشریفی هێنایەلامان و [کاتێك بینی] قازمەکەی بەدەستەوە گرت و[جلەکەی سەر شانی داناو] فەرمووی: ((بسم الله)) و پێیدا کێشانێك پێیدا کێشا سێیەکی تێکشکاند و [گوێم لەگرمەیەك بوو هەرگیز گرمەی وام نەبیست بوو][١٧٢] فەرمووی: (([الله اکبر] کلیلی گەنجینەکانی شامم پێدرا وەڵلاهی من ئێستا کۆشك و تەلارە سورەکانی دەبینم [لەم شوێنەی خۆمدا])) پاشان بۆجاری دووەم پێیدا کێشایەوە بەشی دووەمی تاوێرەکەی پارچە پارچە کردوو [گوێ بیستی گرمەیەك بووم هاوشێوەی نەبووە ونەم بیست بوو] فەرمووی: (([الله اکبر] کلیلی گەنجینەکانی وڵاتی فارسم پێدرا وەڵلاهی من ئێستا کۆشك و تەلارە سپی یەکانی مەدائینم لێ دیارە [لەم شوێنەی خۆمدا]))، پاشان جاری سێیەم قازمەکەی کێشا بە بەردەکەدا و فەرمووی: (([بسم الله] [گوێم لەگرمەیەك بوو هاو شێوەی ئەوەم گوێ لێ نەبیبوو هەرگیز] ئەوەی مابوو

---

(١٧١) أخرجه: ابو داود (٤٣٠٢)، والنسائي (الكبرى) (٤٣٨٥)، وفي (الصغرى) (٦/٤٤) واللفظ له، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٦١٥)، و (صحيح النسائي) (٢٩٧٦)، و (الصحيحة) (٧٧٢)، و (صحيح الجامع) (٣٣٨٤).

(١٧٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣/٢٥٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١٣٩): رواه الطبراني باسنادين في احدهما: حيي بن عبدالله وثقه ابن معين وضعفه جماعة وبقية رجاله رجال الصحيح.

لەپاش ماوەی تاشە بەردەکە وردوو خاشی کردو فەرمووی: (([الله اكبر] کلیلی گەنجینەکانی یەمەنم پێدرا وەللاهی من ئێستا دەرگاکانی (صنعاء) دەبینم لەم شوێنەی خۆمدا))[١٧٣].

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی خەندەقیان هەڵدەکەند لەبرسا بەردیان لەسکیان بەست بوو ... فەرمووی: (برۆن بابچین بۆلای سەلمان ﷺ بەدەست بەردێکی گەورەوە گرفتارە و کاری بۆ ناکرێت لەگەڵی و توانای بەسەریدا ناشکێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی بەهاوەڵانی: ((دعوني فاكون اول من ضربها فقال: بسم الله)) واتە: ((لێم گەرێن با من یەکەم کەس پێیدا بکێشم فەرمووی: بسم الله)). قازمەیەکی پێدا کێشاو پارچەیەکی وردوو خاش کرد کەسێ یەکی بەردەکە بوو فەرمووی: (الله اكبر) ئەوە کۆشك و تەلارەکانی ڕۆمە بەخودای کەعبە).

پاشان جارێکی تریش لێی دایەوە پارچەیەکی تری وردوو خاش کرد و فەرمووی: ((الله اكبر قصور فارس وربِّ الكعبة)) واتە: ((الله اكبر) کۆشك و تەلارەکانی ولاتی فارس ئەوەتان بەخودای کەعبە)) دەفەرموێت: دووڕووەکان لەوێدا وەستا بوون وتیان: ئێمە خەندەق هەڵدەکەنین لەدەوری مەدینە ئەویش بەڵێنی کۆشك و تەلاری ولاتی فارسی و ڕۆمامان پێدەدات)[١٧٤].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ دەفەرموێت: (من لەخزمەت پێغەمبەری خودا دا ﷺ بووم لەغەزای خەندەق دوو پاچە کۆڵەی بەدەستەوە بوو زەوی بۆ هەڵدەکەندن بەردێك هاتە ڕێگای و بەپێکەنیەوە پێی وترا: چ شتێك بەپێکەنینت دێنێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ فەرمووی: ((ضحكتُ من ناسٍ يؤتى بهم من المشرق في

---

[١٧٣] أخرجه: احمد (١٨٦٩٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن ابي شية (٣٧٩٧٥)، وابو نعيم (الدلائل) (٤٣٠)، والنسائي في (الصغرى) (٤٣/٦) وفي (الكبرى) (٤٣٨٥)، وابو يعلى (١٦٨٥) وقال محققه: اسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٤١٧/٣)، وقال ابن كثير (البداية) (١٠١/٤): حديث غريبٌ، وقال الحافظ في (الفتح) (٥٠٥/٧) و (الكافي الشاف) (٣٥٠/١): اسناده حسن.

[١٧٤] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٥٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١٤٠): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير عبدالله بن احمد بن حنبل ونعيم العبدي وهما ثقتان.

الكبول يساقون الى الجنة)) واتە: ((بەخەڵکانێك پێ دەکەنم لەخۆرهەڵاتەوە دەهێنرێن لە زنجیردان و بەرەو بەهەشت دەبرێن))[١٧٥].

## کۆکردنەوەی ژن و منداڵ لەناو قەڵای بەنی حارثە

لەدوای تەواو بوونی خەندەق لێدان پێغەمبەری خودا ﷺ ژن و منداڵەکانی لە یەکێك لە قەڵا قایم و سەختەکانی مەدینە دا دانان کەئەویش قەڵای بەنی حارثە بوو ئەوەش لەبەر ئەوە بوو تاکو شوێنێکی ئاسایش و ئارامیان بۆ مسۆگەر بکات دوور بێت لەهەر مەترسیەکی دوژمن بۆ سەریان وە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی موسوڵمانەکانیش و نەهێشتنی دڵە ڕاوکێی و سەرقاڵبوونیان بەماڵ و منداڵیان تا دڵنیابن کە لەمەترسیدا نین و بەوورەیەکی بۆلاینەوە ڕاوەستا و جێگیریان بکات لەسەر بەرگری کردن و جەنگ کردن دژ بەدوژمنەکانیان لە زوبێری کوڕی عەوامەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشت بۆ غەزای خەندەق خێزانەکانی وە پوری کەناوی صەفیەی کچی عبدو المطلب (دایکی زوبەیر) بوو لەناو قەڵایەك دانیان بەناوی (فارع)[١٧٦] ئەو قەڵایەش لەقایم ترین و پتەوترین قەڵاکانی مەدینە بوو هەروەك ڕافعی کوڕی خودیج ﷺ دەفەرموێت: (قەڵانەبوو پارێزراوتر و قایمتر بێت لەقەڵا بەنی حارثە پێغەمبەری خوداش ﷺ ژن و منداڵە کانی لەناو ئەوێدا دانا)[١٧٧] پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ سوپاکەی ڕێکخست و پشتیان دایە پاڵ کێوی (سلع) لەناو مەدینە و ڕووە و خەندەق دەیان ڕوانی بەسەر دوژمناندا ئەو خۆڵ و خاشاکەی لەخەندەقەکە دەریان دابوو خستبوویانە لای موسوڵمانەکان و ڕێکیان خست تا ببێتە ساترێکی بەرگری بۆ موسوڵمانەکان هەتا دوژمنیش نەتوانێت بەهۆی نزیکی لەخەندەقەوە دایڕو خێنێت و بڕی

---

(١٧٥) أخرجه: احمد (٥/٢٣٨) برقم (٢٢٨٦) وقال محققه: اسناده ضعيف. واصل الحديث عند البخاري (٣٠١٠) بلفظ: ((عجب الله من قومٍ يدخلون الجنة في السلاسل)).

(١٧٦) أخرجه: البزار (١٨٠٧)، وابويعلى (٦٨٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الاوسط) (٣٧٥٤) وابن هشام (السيرة) (٣/١٨٥) وقال محققه (٧٢٣): الحديث حسنٌ لغيره.

(١٧٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٣٧٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (٦/١٣٣): رجاله ثقات.

بکاتەوە پاشان خۆیان تێخزێنە ئەمبەر و دوچاری شەڕی دەستەو یەخەیان بکەن[١٧٨]، ژمارەی سوپای موسوڵمانەکان سێ هەزار جەنگاوەر بوون سی و شەش ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو[١٧٩].

## گەیشتنی سوپای موشریکەکان و (بێ باوەڕەکان)

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەخەندەق هەڵکەندن بۆوە، و تەواوی گرد بەر لەهاتنی قوڕەیشییەکان بۆ نزیك سنوری شاری مەدینە، قوڕەیشییەکان هاتن بەکۆمەڵ لە (الأسیال) لەناوچەی بیری (رومة) کەدەکەوێتە نێوان (جرف) و (زغابة) دابەزین بەدە هەزار کەسەوە لە ئەحابیشەکان و ئەوانەی شوێنیان کەوتبوون لەهۆزی (کینانە)و خەڵکی (توهامە) و (نجد) یەکانیش ڕۆیشتن بەرەو مەدینە هەتاگو لەناوچەی (زنب نقمی) دابەزین و لەوێدا خستیان لای کێوی (ئوحود)ەوە[١٨٠].

ئیبن مسعود ﷺ باس دەکات کە قوڕەیش و ئەحابیشەکان و ئەوانەی تر کەلەگەڵیان هاتبوون لەعەرەب چوار هەزار کەس بوون سێ سەد ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو هەزارو پێنج سەد وشتریان پێ بوو پاشان بەنی (سولەیم) چوونەتە پاڵیان کەحەوسەد کەس بوون.

ئینجا بەنی (فوزارە) کە هەزار کەس بوون و بەنی (ئەشجەع) کە چوارسەد کەس بوون و بەنی (مورە) کە ئەوانیش چوار سەد کەس بوون لەگەڵ ئەوانیشدا بەنی (ئەسەد)ی کوڕی خوزەیمە و (غەطەفان) ئەوەی کەمابۆوە، کۆی گشتی سوپاکەیان دەهەزار جەنگاوەر بوون[١٨١]. بەو شێوەیە سوپای موشریکەکان لەباکوری مەدینە دابەزین و خستیان هەروەك دایکی باوەڕداران عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت دەربارەی ئەو ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ ﴾: ئەوە ڕۆژی غەزای خەندەق بوو[١٨٢].

---

[١٧٨] أنظر: (السيرة الصحيحة) (٢/٤٢٥).

[١٧٩] أنظر: (السيرة) (لابن هشام) (٣/١٧٦)، و (فتح الباري) (٧/٤٠٨).

[١٨٠] أنظر: (السيرة) لابن هشام (٣/١٧٥)، وقال صاحب (صحيح السيرة) (٤٣٠): مرسل رجاله ثقات.

[١٨١] أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢/٦٦).

[١٨٢] أخرجه: البخاري (٤١٠٣).

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت ﷺ: (چەند ئەسپ سوارێکی قورەیشییەکان کەدیارترینیان عەمری کوڕی عەبدودی عامیری و عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل و هوبەیرەی کوڕی ئەبووهەهب هەردووکیان مەخزومین؛ (دواتر ئەم دوانە موسوڵمان دەبن هوبەیرە شاعیری قورەیش بووە مێردی ئوم هانی کچی ئەبو طالب بوو ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ، عیکرمەش لەغەزای یەرمووك شەهید بوو یەکێك بوو لەو سێ بریندارەی کەلەبەر یەکتر ئاویا نەخواردەوە تاکو هەرسێکیان شەهید بوون) ضیراری کوڕی خەطابی کوڕی مەرداس شاعیری قورەیش بوو لەهۆزی (محاربی کوڕی فیهر) بوو جل و پۆشاکی جەنگیان پۆشی بوو خۆیان بەزرێ قایم کرد بوو لەوێدابە ئەسپەکانیانەوە هاتنە دەرو هەتاکو بەلای چادری بنی (کنانە)دا تێپەڕ بوون وتیان: ئەی بنی (کنانە) ئامادەبن بۆ شەڕ و جەنگ بەرپاکردن ئەمڕۆ دەزانن کێ سوارچاکی مەیدانە پاشان بەرەو ڕووی خەندەقەکە ئەسپەکانیان ئاودەن بەخێرای تا گەیشتنە لێواری خەندەقەکە کاتێك چاویان کەوت بەو خەندەقە گەورەی کەلەبەردەمیاندا هەڵکەندراوە وتیان وەڵڵاهی ئەمە فێڵ و پلانێکی تازەیە عەرەب هەرگیز ئەم جۆرە تەکتیکە و فرو فێڵەی بەکارنەهێناوە)[١٨٣].

موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك تاقم و هۆزە جیاوازەکان دابەزین لەدەور و بەری مەدینە بەنی (قورەیظە) کە جولەکە بوون دەرگای قەڵاکانیان داخست بەسەر خۆیاندا)[١٨٤].

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس و فەضلی برای و خزمەت کارەکەیان ئەبو ڕافیع هاتنە ڕیزی موسوڵمانەکانەوە بەکۆچ کردووی کە لەگەڵ قورەیش و ئەحزاب هاتبوون بەرەو مەدینە لەوێدا خۆیان دزی بۆوە و بەپەنهانی هاتبوونە ناو شاری مەدینە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (گەیشتنمان بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەساڵی (٥) کۆچی بوو؛ دەرچووین قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵ قورەیش دەڕۆیشتین لەغەزای (ئەحزاب)، من و براکەم فەضل، وە خزمەتکارەکەمان ئەبو ڕافیع هەموو لەگەڵ یەکدا بووین هەتاکو گەیشتینە (عەرەج) ئینجا لەڕێگەی سەرەکی لاماندا چووینە سەر ڕێگەی (ڕکوبە)وە لەوێشەوە

---

(١٨٣) أنظر: (السیرة) (لابن هشام (١٧٩/٣)).

(١٨٤) أخرجه: ابن کثیر (البدایة) (١٠٣/٤).

چووینە سەر ڕێگەی (الجثجاثة) هەتا گەیشتینە لای ماڵەکانی بەنی (عەمرى كوڕی عەوف) لە (قوبا) لەوێشەوە چووین بۆ ناو شاری مەدینە، گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خودا و ﷺ بینیمان لای خەندەقەکەدا بوو، من ئەو ڕۆژە تەمەن هەشت ساڵان بووم وە براکەم (فەضل) (١٣) ساڵان بوو)[١٨٥] لەو کات و ساتە دژوار و پڕمەترسیە پێغەمبەری خودا ﷺ پەیمانی لەهاوەڵانی بەڕێزی وەردەگرت.

حاریثی کوڕی زیادی ساعدی ﷺ دەفەرمووێت: (من هاتمە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەغەزای خەندەقدا لەکاتێکدا ئەو پەیمانی لەخەڵکی وەردەگرت لەسەر کۆچکردنیان) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پەیمان لەمە وەرگرە؟ فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) وتم: کوڕی مامم حوطی کوڕی یەزید یاخود یەزیدی کوڕی حوطە. دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لاابایعکم ان الناس یهاجرون الیکم ولا تهاجرون الیهم والذي نفس محمد بیده لا یحب رجلٌ الانصار حتی یلقی الله تبارك وتعالی الاّ لقي الله وهو یحبه ولا یُبغض رجلٌ الانصار حتی یلقی الله الاّ لقي الله وهو یبغضه))[١٨٦] واتە: ((پەیمان لەئێوە وەرناگرم چونکە خەڵك بۆلای ئێوە کۆچ دەکات ئێوە بۆلای ئەوان کۆچ ناکەن سوێند بەوزاتەی گیانی محمدی بەدەستە هەر کەسێك ئەنصاری خۆش بوێت هەتا دەگاتە لای خودای پەروەردگار خوداش ئەو کەسەی خۆشی دەوێت، و هەر کەسێکیش ڕقی لە ئەنصار بێت هەتا دەگاتەوە خزمەت خودای پەروەردگار خوداش ڕقی لەئەو کەسە دەبێت)). بەوشێوە (ئەحزاب) بە هەموو گرۆهو هۆزو و قەبیلەکانەوە هاتن کەخاوەنی هێزو توانایەکی گەورە بوو لەڕووی ژمارەی سوپای بێ ئەندازە و کەلوپەلی سەربازی چەند و چۆنی تۆکمەی ئەو کاتە هەموو پێکەوە هاتن و لە هەموو لایەکەوە موسوڵمانانیان گەمارۆدا بوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بیرو باوەڕی

---

[١٨٥] اخرجه: الطبراني (الاوسط) (٣٦٢٤)، وقال الهيثمي في (الجمع) (رقم: ٩٩٢٧): رواه الطبراني في الاوسط من طريق عبدالله بن عمارة الانصاري عن سليمان بن داود بن الحصين وكلاهما لم يوثق ولم يُضعّف، وبقية رجاله ثقات.

[١٨٦] اخرجه: البخاري (التاريخ الكبير) (٢/٢٥٩)، والطبراني (الكبير) (٣٣٥٦)، واحمد (١٥٥٤٠) وقال محققه: اسناده قوي. واللفظ له، والطحاوي (شرح مشكل الآثار) (٢٦٣٦)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٦٧٢): اسناده حسن.

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خودا ﷺ دوچاری ڕاچڵەکین و لاوازی نەبوون بەڵکو دڵنیایی و چەسپاویان لەسەر پەیڕە و کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەکەیان زیاترو دامەزراوتر بوو هەروەك خودای بالآدەست خۆی ستایشی هەڵوێستی بوێر و جوامێرانەیان دەکات دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾ (الاحزاب:٢٢).

## موشریکەکان هەوڵی هێرش کردنە سەر موسوڵمانەکان دەدەن

موشـریکەکان زۆر هەوڵیانـدا لـە خەندەقەکـە بپەڕنـەوە ئەسـپ سوارەکانیان هەموو شەوێك بەدەوری خەندەقەکەدا غارغارێنیان بوو لەدەرفەتێك دەگەڕان کە موسوڵمانەکان بێ ئاگا بنوو ئەوان بتوانن لەکە لێنێکەوە دزەبکەن و بپەڕنـەوە ودەست لـە موسوڵمانەکان بوەشێنن و بێ ئاگایی بەرگریکاری موسوڵمانەکان بەهەل بـزانن بۆیـە کۆمـەڵ پەڕینەوەیان بەلام موسـوڵمانەکان زۆر بـەوردی چاودێری جمو جۆڵی موشـریکەکانیان دەکرد بـەردەوام لەئامادە باشیادا بوون بۆ هـەر ڕووبـەڕوو بوونەوەیـەك وەپلانـەکانیان پوچـەڵ دەکردنەوە ڕۆژانی گەمارۆکە درێژەی کێشا لەو ماوەیەدا تەنها تیر باران کردن ڕووی دەدا بە بێ ڕودانی هیچ ڕووبەڕوو بونەوەی توند لەنێوانیاندان، هەنـدێك لەسوارچاکەکانی قـورەیش بێتاقەت بوون لەدرێژە خایاندنی ماوەی گەمارۆکە و چاوەڕوانی بێ تاقەت کەری بـەو شێوە نـەبوون بۆیـە لەهەوڵـدا بـوون تاهێرشێکی ستـەمکارانە ئـەنجام بـدەن وە بپەڕنـەوە لەخەندەقەکە بۆیە ناو چەیەکی تەسکی خەندەقەکەیان هەڵبـژارد و بەهـەل زانـی و بـەوپێ یـە توانیان دزەبکەن و بپەڕنـەوە لێی هەربەپەلـە کەتیبەیـەك لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ لێیـان هاتنە دەست و پێشیان پێگرتن و توانیان ئەسپ سوارە هێرش بـەرەکان ناچاری ڕاکردن بکەن و سەرکردەکەشیان کە عەمری کوڕی عەبدود بوو بکوژن.

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ و موسوڵمانەکان وەستا بوون بەرامبـەر بـە (ئـەحزاب) وە دوژمنەکانیشیان گـەمارۆیان دابـوون بـەلام هـیچ ڕووبـەڕوو بونەوەیەکی سەربازی بەشێوەی تێك بـڕژان ڕووی نـەدا لەنێوانیانـدا تـەنها ئـەوە نـەبێت

چەند سوارچاکێکی قورەیش لەناویاندا عەمری کوڕی عەبدود و عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل و هوبەیرەی کوڕی ئەبو وەهبی مخزومی ضیراری کوڕی خطاب خۆیان ئامادە کرد و بەرگی جەنگیان پۆشی پاشان دەرچوون بەئەسپەکانیانەوە ٠٠٠٠ئینجا شوێنێکی بەرتەسکیان ڕەچاو کرد لەخەندەقەکەو لەئەسپەکانیان خوڕی و لەوێوە پەڕینەوە و کەوتنە ناو قوڕاوێك چەقین لەنێوان خەندەق و کێوی (سەلەع)دا عەلی کوڕی ئەبوطالب ﷺ لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانان بۆیان چوون هەتاكو گەیشتنە سەریان لەو دەروازەی لێوەی پەڕی بوونەوە بەئەسپەکانیانەوە و هەوڵیاندەدا بەخێرای بەرەو ڕوویان بڕۆن، عەمری کوڕی عەبدود لەپاڵەوانە ناسراوەکانی قورەیش بوو بەژداری غەزای بەدری کردبوو لەوێدا بریندار ببوو، بەژداری غەزای ئوحدی نەکردبوو کاتێك غەزای خەندەق هات بەژداری کرد و پەڕۆیەکی بۆناسینەوەی لەنێوان چاوانی خست بوو بۆ ئەوەی پایەی خۆی دەرخات و ببینرێت، کاتێك خۆی لەسەر ئەسپەکەی بوو وتی: کێ بۆم دێتە مەیدان بۆ شمشێربازی؟ عەلی کوڕی ئەبوطالب بۆی چووە مەیدان و پێی فەرموو: عەمر تۆ شەرت و پەیمانت لەگەڵ خودا بەستووە کە هەرکەسێکی قورەیشی داوای دوو شتت لێ بکات یەکێکیان بۆ جێبەجێ بکەیت، پێی وت: بەڵێ، عەلی فەرمووی: من بانگت دەکەم کەباوەڕ بەخودا و پێغەمبەرەکەی و ئاینی پیرۆزی ئیسلام بێنی.

وتی: پێویستم بەوە نیی یە، فەرمووی: کەواتە داوای دابەزینت لێ دەکەم بۆ شەڕە شمشێر، بەعەلی وت: بۆچی ئەی کوڕی برام وەڵڵاهی من پێم خۆش نیە تۆ بکوژم، عەلی پێی فەرموو: (بەڵام وەڵڵاهی من پێم خۆشە بتکوژم)، عەمر ڕقی هەستا کە ئەو قسەی گوێ لێ بوو، لەئەسپەکەی خۆی هەڵدایە خوارەوە و لەدەم و چاوی ئەسپەکەی داو کوشتی، پاشان بەرە و ڕووی عەلی ڕۆیشت، کەوتە شەڕە شمشێر لەگەڵیدا و یەکتریان دەهێنا و دەبرد ئەوە بوو عەلی ﷺ دواجار کوشتی و ئەسپ سوارەکانی تر لەترسان بەشکست خواردوی بەپەلە لە خەندەقەکەوە ڕایان کردەوە ٠٠٠٠ عیکرمەی کوڕی ئەبو جەهل لە پەلە پەلیان و لەترسان (ڕمەکە)ی لەبیر چوو لەو ڕۆژەدا لەبەرئەوەی کە بەسەر عەمردا هات و ڕای کرد ٠٠٠٠)[١٨٧].

---

[١٨٧] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٨٠)، والحاكم (٣/٣٢) (رقم: ٤٣٨٥) وقال محققه: سنده الى ابن اسحاق صحيح وهو معضل، والبيهقي (الدلائل) (٣/٤٣٧).

بەو شێوەیە شکستیان خوارد و ڕایان کردو و کەلاکی عەمری کوڕی عەبدود لەبان لەگۆڕەپانی جەنگ بە جێهێشت ئەویش لەهەندێك گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە:

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لەموشریکەکان کوژرا لەغەزای خەندەقدا داوایان کرد کەبیشارنەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی نەدان کەبیشارنەوە تاپارەی خوێنەکەی بدەن)[193] بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ پارەی خوێنەکەی وەرنەگرت، لەئیبن عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمانەکان لەغەزای خەندەقدا پیاوێکیان لەموشریکەکان کوشت و ئەوان داوای کەلاکەکەیان کردبۆ وە لەجیاتی ئەوەش پارەیان نارد بوو، لەگێڕانەوەیەکی تردا: [دوانزە هەزار درهەمیان ناردبوو][194] لەگێڕانەوەیەکی تردا [دە هەزار][195] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لاشەکەیان بدەنەوە کەلاکە کەی پیسە و پارەی خوێنەکەشی پیسە [نەخێر لەلاشەکەیدایە و نەخێر لەپارەی خوێنە کەشیدایە]))[196].

ئیبن هیشام (رحمه الله) دەفەرموێت: (ئەوەش کەلاکی عەمری کوڕی عبدود بوو).

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەڵکو ئەوە کەلاکی نوفیلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغیرە بوو) (نوفەیل ئەو کەسە بوو کەلە سریەکەی عەبدوڵلای کوڕی جەحش ڕایکردو بەدیل نەگیرا)، عیکرمەش ﷺ لەم قسەیەدا پشتگیری دەکات: (نوفیل لەئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و کوژرا لەغەزای خەندەقدا، ئەبو سوفیان فدیە و پارەی خوێنەکەی نارد سەد و شتر بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەتی کردەوە و فەرمووی: ((بیبەنەوە ئەو کەلاکە پیسە))[197].

---

(193) أخرجه: الحاكم (٣/٣٢) وصححه ووافقه الذهبي.

(194) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٤٠).

(195) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٣٩٢).

(196) أخرجه: احمد (٢٢٣٠، ٢٢٤٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، والترمذي (١٧١٥)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٢/٣٨٧) وبرقم (١٨٦٧١)، والطبراني (الكبير) (١٢٠٥٨)، والحاكم (٣/٣٢)، والبيهقي (الكبرى) (٩/١٣٣)، وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢/٢٦١): صحيح مقطوع، وقال عن الطريق الاخرى في (ضعيف الترمذي) (ص: ١٩٠): ضعيف الاسناد.

(197) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٣٩٣١، ٣٧٩٧٩) وقال محققه: اسناده صحيح الى عكرمة.

لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە (ضعیف) کە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس بەتیر پیاوێکی لەموشریکەکان پێکا وە لە غەزای خەندەقدا بەجۆرێك پێغەمبەری خودای ﷺ هێناوەتە پێکەنین، لە عامرەوە ئەویش لە باوکیەوە سەعدی کوڕی ئەبی وە قاس ﷺ دەفەرموێت: (سەعد یەکێکە لەو دەکەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە): (لەکاتی غەزای خەندەقدا پیاوێك خۆی زرێ پۆش کردبوو تاسەری لوتی ئاسن بوو قەڵغانی لەدەست بوو، پاشان فەرمووی بەوشێوە بەرەوپشت کەوت، دەفەرموێت دەستم برد بۆ جوعبەی تیرەکانم تیرێکم دەرهێنا کەخوێنی پێوەبوو خستمە بەرکەوانەکەم، کاتێك قەڵغانەکەی هەڵدەسوڕان تێم گرت لەبیرم چوو تیرەکە بەرکوێێ کەوت ئەو پیاوە بەپشتا کەوت و قاچەکانی دەجوڵاند ئەوشێوەش پێغەمبەری خودای ﷺ هێنایە پێکەنین تاددانی خرپی دەرکەوت وتم: بەچی پێدەکەنی وتی بەجوڵانەوەی ئەوپیاوە)[١٩٨].

پێغەمبەری خودا ﷺ دروشمی موسوڵمانەکانی دانا کەبریتی بووله (ئەوان سەرناکەون) بۆ ئەوەی لەشەودا ئەگەر لەگەڵ دوژمندا دوچاری پێك هەڵپژاندنی دەستەویەخە بوون یەکتری بناسنەوە:

لەموهلەی کوڕی ئەبو صخرەوە دەفەرموێت: گوێم لەکەسێك بوو ئەمەی لە پێغەمبەر دەگێڕایەوە (لەگێڕانەوەیەکی تردا) لەبەرائی کوڕی عازبەوە بووە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودای ﷺ کەلەلێدانی خەندەق بۆوە لە شەوێکدا ترسی ئەوەی هەبوو ئەبوسوفیان هێرش بێنێتە سەریان فەرمووی: (([اني لا أرى القوم الاّ مُبَيّتكم الليلة] ان يّتم فليكن شعاركم حم لاينصرون))[١٩٩] واتە: (([من وادەبینم کە بێ باوەڕەکان ئەمشەو هێرشتان

---

[١٩٨] اخرجه: احمد (١٦٢٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، والترمذي (الشمائل) (٢٣٤)، والبزار (١١٣١)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٣٥/٦): رواه احمد والبزار ورجالهما رجال الصحيح غير محمد بن محمد بن الأسود وهو ثقة، وضعفه الشيخ الالباني في (مختصر الشمائل) (١٩٩) واصل القصة عند مسلم (٢٤١٢) وان ذلك وقع في أحد.

[١٩٩] اخرجه: النسائي (الكبرى) (٨٨٦) – (عمل اليوم) (٦١٧)، واحمد (٦٥/٤)، وابوداود (٢٥٩٧)، والترمذي (١٧٤٩)، والحاكم (١٠٧/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٦٢) و (صحيح الترمذي) (١٣٧٥).

بهێننە ئەسەر] بۆیە واباشە لەئامادەباشی دابین وە ئەگەر پەلاماریش دران بادروشمتان (ئەوان سەرناکەون بێت)). لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((انكم تلقون عدوّكم غداً فليكن شعاركم حم لأينصرون)). واتە: ((ئێوە سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمنەکانتان دەبنەوە بادروشمتان: (ئەوان سەرناکەون بێت)[٢٠٠] بێ باوەڕەکان لەهەوڵدابوون بۆ هێرش وپەلامار و خۆنزیکردنەوە لەخەندەق هەرکاتێك ئەوهەوڵەیان دەدا موسوڵمانەکان بۆیان بوچەل دەکردەوە بەتیر بارانکردنیان، لە دەرفەتێکدا توانیان دزەبکەن و نزیك ببنەوە لەموسوڵمانەکان لەیەکێك لەوتیربارانکردنە دەستەو یەخانەدا تیرێك بەرشانی سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصاری کەوت.

لەدایکی باوەڕداران عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کەئەو لەقەڵای بەنی حارثە دا بوو کەلە قایمترین و پتەوترین قەڵاکانی مەدینە بوو وە دایکی سەعدی کوڕی موعاذیش ﷺ لەگەڵدا بوو لەو قەڵایە، عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (ئەوە بەرلە دابەزینی ئایەتی (حجاب) بوو، سەعد بەلاماندا تێپەڕی زرێیەکی کورتی لەبەر کردبوو کەئەڵقەکانی هەموو دەرهات بوو کێردێکی بچوکی بەدەستەوە بوو بەگورج و گۆڵی و خۆدەرخستنێکەوە دەڕۆیشت ئەم دێڕە هۆنراوەی دەوت:

لبث قليلا يشهد الهيجا حمل
لاباس بالموت إذا حان لأجل

واتە: (پاش کەمێکی تر ئەم شەڕ و جەنگە هەڵمەتی بوێرانە دەبینێت باکمان نی یە لەمردن ئەگەر ئەجەل کاتی هات).

دایکی فەرمووی: بگە پێیان وەڵلاهی دواکەوتیت ئەی کوڕەکەم عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت پێم وت: ئەی دایکی سەعد وەڵلاهی پێم باشبوو کەزرێکەی سەعد لەوەی ئێستای باشتر بووایە دەفەرموێت وتم: دەترسم کەلەوێیەوە تیرێکی بەرکەوێت دواتر سەعدی کوڕی موعاذ بەتیرێك پێکرا کەبەر شانی کەوت و شاڕەگی پچڕاند هەروەك عاصم کوڕی عەمەری کوڕی قوتادە دەفەرموێت: لەلایەن حەبانی کوڕی قەیسی کوڕی عەرقە کەلە بەنی عامری کوڕی لوئەی بوو کاتێك تیرەکەی تێگرت وتی: بیگرە لەمن کوڕە

---

(٢٠٠) اخرجه: النسائي (عمل اليوم والليلة) (٦١٥) وقال محققه: رجاله ثقات.

عەرقەم، سەعد پێی وت: خودا ڕووت بەئاگر بسوتێنێت ئەی خودایە ئەگەر غەزایەکمان ماوە لەگەڵ قوڕەیش ئەوە بمهێڵەوە بۆ ئەو غەزایە خۆت دەزانی هیچ شتێکم ئەوەندەی جیهاد کردن لەلا خۆشەویستر نی یە لەگەڵ ئەو کەسانەی کەئازاری پێغەمبەرەکەی تۆیان داوە و بەدرۆیان خستۆتەوە لەجێگا و ڕێگای خۆی وە دەریان ناوە ...)[٢٠١].

لەگێڕانەوەیەکی تر خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (لەغەزای خەندەق دا دەرچووم بەرەو خەندەق شوێن پێی خەڵکەکەم هەڵگرت گوێم لەتەپەی سەر ئەرزەکە بوو لەدوای خۆمەوە دەفەرموێت ئاوڕم دایەوە سەعدی کوڕی موعاذم بینی کوڕە براکەی حاریش کوڕی ئەوسی لەگەڵ بوو قەڵغانی لەدەست بوو دەڵێت لەسەر زەویەکە دانیشتم، سەعد خۆی زرێ پۆش کردبوو بەڵام لەملاولاوە سەرشانەکەی دەرچوو بوو من ترسام لەوەی لەلاکانی ئاسنی زرێکەوە تیری بەر کەوێت دەفەرموێت: سەعد لەگەورەترین کەڵە پیاوانی ئەنصار بوو وە باڵا بەرز بوو کەتێپەڕی ئەم دێڕەی بەئاوازەوە دەوت:

لبث قليلا يدرك الهيجاء حمل ما أحسن الموت إذا حان لأجل

دەفەرموێت: ئینجا هەستام خۆم گەیاندە باخێك کەهەندێك لەموسوڵمانەکانی لێ بوو عومەری کوڕی خەططابیان ﷺ لەناودا بوو، پیاوێکی بەئاسن پۆشراویان لەگەڵدا بوو.

عومەر ﷺ فەرمووی: چ شتێك تۆی هێناوەتە ئێرە وەڵلاهی تۆ نەترسی، تۆ دڵنیای لەوەی دوچاری بەڵاو دەستگیر کردنێك نابیت. دەفەرموێت: ئەوەندەی سەرزەنشت کردم ئاخۆزگەم دەخواست کە زەوی ببوایەتە دوو لەت و لەوکاتەدا بچوومایەتە ناوی دەفەرموێت: پیاوەکەی تر ئاسنەکەی سەر دەمو چاوی لابردو سەیر دەکەم طلحەی کوڕی عوبیدوڵلایە، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی عومەر ئەمڕۆ تۆ زۆرت قسەکرد بەرامبەری ئەمڕۆ ڕاکردن و لایەنگری لەکوێ یەو بۆ کێ یە تەنها بۆ لای خودای پەروەردگارە دەفەرموێت: سەعد ﷺ پێکرا بەتیری کەسێك لە بێ باوەڕەکانی قوڕەیش کەناوی ئیبن عەرقەم بوو پێی وت: بیگرە لێم من ئیبن عەرقەم بەرشانی کەوت شاڕەگی سەر شانی بڕی

[٢٠١] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٨٢/٣) وقال محققه (٧٢٠): اسناده حسن، والطبري (التأريخ) (٥٧٤/٢) والبيهقي (الدلائل) (٤٤٠/٣)، واحمد (١٤١/٦)، والحاكم (٢٠٧/٣) وصححه.

ئەویش دوعای لێکرد لەلای خودای پەروەردگار ٠٠٠٠ وە برینەکەی خوێنی لێ دەڕۆی و نەدەوەستا ٠٠٠)[٢٠٢]. بەو شێوەیە سەعد پێکراو بریندار بوو لەو شوێنەی دایکی باوەڕداران عائیشە (رضي الله عنها) مەترسی لێ نیشتبوو لەسەری ئەو ڕوداوە هەردوو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خودای ﷺ خەمبار کرد، هەروەك عەمری کوڕی شرحبیل ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا سەعدی کوڕی موعاذ بەتیر پێکرا لەغەزای خەندەقدا خوێنەکەی بڕایە پێغەمبەردا ﷺ ئەبوبەکر ﷺ هاتە خزمەتی و فەرمووی: هاوار پشتم شکا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی) (لەسەر خۆیە ئەبوبەکر) ئینجا عومەر هات ﷺ فەرمووی: (إنا لله وإنا اليه راجعون)[٢٠٣] پێغەمبەری خودا ﷺ بەدەستی خۆی شوێنی برینەکەی بەئاگر بۆداخ کرد بۆ ئەوەی دوچاری خوێن بەربوون نەبێت و برینەکەی نەئاوسێت و کێم نەکات.

لەجابرەوە ﷺ دەفەرموێت: (سەعدی کوڕی موعاذ تیرێك بەرشانی کەوت پێغەمبەری خودا ﷺ شوێن برینەکەی بەدەستی خۆی بەمقاش داخی کرد دەفەرموێت: پاشان ئاوسا و کێمی کرد دووبارە داخی کردەوە)[٢٠٤]. پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی گواستەوە بۆ مزگەوتی (فەتح) لەلای خەندەقەکە بۆ ئەوەی لەنزیکەوە ئاگاداری بێت و بەسەری بکاتەوە هەروەك دایکی باوەڕداران عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (سەعد ﷺ بەتیرێك پێکرا کەبەر شانی کەوت لەغەزای خەندەقدا پیاوێك تیرەکەی لێدا ئیبن عەرقەی پێ دەوترا، پێغەمبەری خودا ﷺ بردیە مزگەوت و خێمەیەکی بۆهەڵدا بۆ ئەوەی چارەسەر بکرێت و لەنزیکەوە چاودێری بکات)[٢٠٥].

---

[٢٠٢] أخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حديث حسن، والبخاري (٤١٢٢) مختصراً، وابن ابي شيبة (المصنف) (١٨٦٤٣)، وابو نعيم (الدلائل) (٤٣٣)، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن، وصححه الحافظ في (الاصابة) (٢٧٤/١)، وقال ابن كثير (البداية) (١٢٣/٤): هذا الحديث اسناده جيد.

[٢٠٣] أخرجه: احمد (فضائل الصحابة) (١٥٠٢) باسناد جيد – كما قال محقق (المصنف) (لابن ابي شيبة) تحت الحديث رقم (٣٢٩٨٨).

[٢٠٤] أخرجه: مسلم (٥٧١٢)، واحمد (٣١٢/٣)، والحاكم (٤١٧/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

[٢٠٥] أخرجه: مسلم (٤٥٧٣) واللفظ له، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٦١).

لەیەکێك لەڕۆژەکانی گەمارۆکەدا موشریکەکان هەستان بەهێرشێکی توند و تیژ و کتیبەیەکی بەهێزو پڕچەکیان بە ئاراستەی بارەگای پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێشڕەویدا بوو موسوڵمانەکان ئەو ڕۆژە هەتا شەو داهات بەجۆرێك لەبەر سەر گەرمیان بەجەنگەوە نوێژی عەصریان بۆنەکرا، ئەو ڕووداوەش پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی زۆر خەمبار کرد بەجۆرێك پێغەمبەری خودا ﷺ دوعای لەموشریکەکان کرد لەدوای کۆتای هاتنی ئەو دەورەی تری جەنگ، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو نوێژانەی کەلەدەستیان چوو بوو بەکۆمەڵ بۆ هاوەڵانی کرد. لەئیبن سەعدەوە ﷺ دەفەرموێت: (موشریکەکان پێغەمبەری خودایان ﷺ سەرقاڵی جەنگ کرد و بواری چوار نوێژیان پێنەدان (نیوەڕۆ و عصر و مەغرب و عیشا) لەغەزای خەندەقدا)[٢٠٦] ئەوەش پێغەمبەری خودای ﷺ خەفەت بارکرد وە دوعای لەموشریکەکان کرد، هەر وەك عەلی ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ لەغەزای ئەحزابدا دانیشت بووە لەسەر لێوارێك لەلێوارەکانی خەندەقەکە و فەرمووی: ((ملأ الله علیهم بیوتهم و[بطونهم] وقبورهم ناراً کما شغلونا عن الصلاة الوسطی [صلاة العصر] حتی غابت الشمس))][٢٠٧] واتە: ((خودای گەورە ماڵ و سك و قەبرەکانیان پڕبکات لەئاگر هەروەك سەرقاڵی جەنگیان کردین بەو هۆیەوە نوێژی عەسرمان چوو هەتا خۆرئاوا بوون).

پاشان پێغەمبەری خودا لەگەڵ هاوەڵانی لەدۆڵی (بطحان) دەست نوێژیان گرت هەروەك لەجابرەوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (عومەری کوڕی خەطاب ﷺ هات لەغەزای خەندەقدا لەدوای خۆرئاوا بوون قسەی بە موشریکەکانی قورەیش دەوت، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەوڵ و تەقەلای زۆرمدا بۆ ئەنجامدانی نوێژی عەسر بەلام هەتا خۆر نزیك بوو لەئاوا بوون ئەوجا فریا کەوتم پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی وەڵڵاهی منیش

(٢٠٦) أخرجه: النسائي (١٧/٢)، واللفظ له والزيادة لأبي يعلى (٢٦٢٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٦٣٩).

(٢٠٧) أخرجه: البخاري (٤١١١)، ومسلم (١٤٢٣).

هێشتا ئەو نوێژەم نەخوێندوە). لەدۆڵی بطحان دابەزین و پێغەمبەری خودا ﷺ دەست نوێژی گرتوو و ئێمەش بەهەمان شێوە دەست نوێژمان گرت)....)[٢٠٨].

نافع بە عەبدوڵلای کوڕی عومەری فەرموو: (پێغەمبەری خودا ﷺ لە کوێ نوێژی دەکرد لەغەزای ئەحزابدا؟ فەرمووی: ئەو نوێژی لەناو شیوێك دەکرد لای کاولگەیەك هەر لەوێدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئیزنی ڕۆیشتنی دا بەخەڵکەکە پاشان فەرمانی پێکردم کە بانگیان بکەمەوە منیش فەرمانەکەم جێ بەجێ کرد)[٢٠٩].

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی بۆکردن بەشێوەی یەك لەدوای یەك هەروەك عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (....فەرمانی کرد بەبیلال بانگ بدات و پاشان قامەتی کرد و نوێژی نیوەڕۆی کرد هەروەك چۆن لەکاتی خۆیدا بەئاسای دەیکرد پاشان داوای لێکرد قامەت بۆ نوێژی عەسر بکات و نوێژی عەسریشی بۆکردن وەك کاتی ئاسای چۆن دەکرێت پاشان قامەت بۆ نوێژی شێوان کراو نوێژی شێوانیش وەك کاتی خۆی بۆکردن و پاشان قامەت بۆ نوێژی عیشا کراو نوێژی عیشاشی وەك کاتی ئاسای خۆی بۆکردن)[٢١٠] لەگێڕانەوەیەکی تردا: (پاشان فەرمووی: ((ما علی وجه الارض قوم یذکرون الله غیرکم))[٢١١] واتە: ((ئێستا لەسەر ڕووی ئەم زەمینە خەڵك نیە یادی خودا بکات جگە لەئێوە)).

---

(٢٠٨) خرجه: البخاري (٤١١٢)، ومسلم (١٤٢٨)، (١٤٢٥).

(٢٠٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٣٧٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١٤٩): رجاله ثقات.

(٢١٠) أخرجه: النسائي (١٧/٢)، وابن ابي شيبة (٣٧٩٦٩) والزيادة له، والطيالسي (٢٩٥)، وابن خزيمة (١٧٠٣) و قال محققه: صحيح، وابن حبان (٢٨٩١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٦٣٩) و (الثمر المستطاب) (١٠٩/١).

(٢١١) أخرجه: البزار (٣٦٥)، والطبراني (الاوسط) (١٢٨٥) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٩١٥): رواه البزار والطبراني في الاوسط وفيه عبدالكريم بن ابي المخارق وهو ضعيف.

# خیانەتکردنی بەنی قورەیظە و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی مەدینە

لەوکاتەوە پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە نوسراوێکی نوسی لەنێوان موسوڵمانەکان و جولەکەکان کەناسراوە بە (پەیمان نامەی مەدینە) لەو پەیمان نامەیەدا هات بوو: (جولەکەکان خەرجی خۆیان هەیە وە موسوڵمانەکانیش خەرجی خۆیان، وەلەنێوانیاندا پەیمانی پشتیوانی کردن و سەرخستن هەیە دژ بەهەر کەسێك کەجەنگ لەگەڵ خەڵکی ئەم هاوپەیمانیەدا بکات)[٢١٢]. وە لەنێوانیاندا ئامۆژگاری و پرس و ڕاوێژ و چاکەکاری هەیە لەوە بەدواوە لەگەڵ یەکتریدا خراپەکاری و تاوان نابێت هەبێت وەلە بەندێکی تردا هاتووە: (جولەکەکان هاوڕاو یەك دەنگ دەبن لەگەڵ باوەڕداراندا هەرکات شەڕیان لەگەڵدا کرا.... لەنێوان هەردوولادا پشتیوانی و سەرخستنی یەکتری هەیە دژ بەوکەسانەی هەڵ دەکوتنە سەر شاری مەدینە، بە پەیمان نامەکەش پێویستی دەکات لەسەر جولەکەکانی بەنی قورەیظە و موسوڵمانەکان کەبەرگری بکەن و بجەنگن دژی هەرکەسێك کەهێرش و پەلامار دێنێتە سەر شاری مەدینە، وەلەپرس و ڕاوێژی یەکتردابن وەببنە یەك هێزی چەق بەستوو دژ بەهەر دوژمنێکی پەلاماردەر، بەڵام جولەکەکان ئەو پەیمانەیان شکاند و باڵیان دایە پاڵ ئەحزاب بۆ دژایەتی کردنی موسوڵمانەکان بەو شێوەیە هەوڵ و تەقەلاکەی حویەیی کوڕی ئەخطەب سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەگەڵ بەنی قورەیظەدا و بەشێنەیی بەرەو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە و دژایەتی کردنی موسوڵمانەکانی بردن.

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (حویەیی کوڕی ئەخطەبی ئەضیری دوژمنی خودا ڕۆیشت بەرەو بەنی قورەیظە هەتاکو گەیشتە لای کەعبی کوڕی ئەسدی قورەیظی کە سەربەرشتیاری هەموو پەیمان و بەڵێنەکانی بەنی قورەیظە بوو کەلەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەستبویان بەنوێنەرایەتی هۆزەکەی، وەپەیمان بەجێ هێنان و بردنە سەری ئەو پەیمان

---

[٢١٢] أورده: العمري في (السيرة الصحيحة) (٢٧٥/١) وقال: الوثيقة ترتقي بمجموعها الى مرتبة الأحاديث الصحيحة.

نامەیەی دایە پێغەمبەری خودا ﷺ، کاتێک کەعب هەواڵی هاتنی حویەیی کوڕی ئەخطەبی بەرگوێ کەوت دەرگای قەڵاکەی لەسەرخۆی داخست)[٢١٣].

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەنی قورەیظە دەرگای قەڵاکانیان داخست بەڕووی حوییەدا چونکە بەپیاوێکی بەد و خراپیان دەزانی وە زۆر بەڕەش بینیەوە دەیان ڕوانیە حویەیی کوڕی ئەخطەب، وە وتیان: بە هیچ جۆرێك ناچینە پاڵ ئەوانە هیچ شتێکمان لەوان نەبینیوە (واتە: لە موسوڵمانەکان) لە پەیمانی شکێنی ئێوەش نازانین کێ شکست دێنێت لەجەنگەکەدا، چونکە حویەیی هۆزەکەی خۆی (بەنی نضیر) دوچاری لەناوبردن کرد بۆیە پێویستە ئاگاداری خۆتانبن وەبەقسەکانی فریوو نەخۆن، حویەیی لەشەودا هاتە بەردەرگای قەڵاکەیان و ئەوان لەسەر خۆیان داخست بوو وە گەورەکەیان لەو ڕۆژگارەدا کەعبی کوڕی ئەسەد بوو، بەجولەکەکانی بەنی قورەیظەی وت: [ئەو پیاوە (مەبەستی حویەیی بوو) خراپەکار و بەدە وەمن ڕەشبینیم بەرامبەری، باحویەیی دوچاری بەدبەختی و چارەڕەشیتان نەکات، ئینجا حویەیی بانگی کرد: ئەی بەنی قورەیظە ئایا وەڵامم نادەنەوە؟ ئایا ناتانەوێت بێمە ناوتان؟ وە میوان داریم ناکەن؟ بەدڵنیایەوە ژمارەیەکی زۆرم لەسوپای بێ شومار کۆکردۆتەوە؟ بەنە قورەیظە وتیان: وەڵڵاهی دەرگای لێ دەکەینەوە پاشان حویەیی وتی: ئایا کەعب لەکوێ یە؟ هاوسەرەکەی وەڵامی دایەوە وتی: لێرەنی یە دەرچووە بۆهەندێك پێداویستی خۆی: حویەیی وتی: بەڵکو لەلاتە لەسەر سفرەی نان خواردنەکەیە و نان دەخوات و نایەوێت لەو خواردنەی ئێوارەی بەشم بدات [حویەیی بانگی کرد: هاوار بۆ تۆ کەعب دەرگاکەم لێ بکەوە، ئەویش وتی: هاوار لەدەست تۆ حویەیی، تۆ کەسێکی خراپەکار و چارەڕەش و ڕسوایت وازم لێبێنە من پەیمانم بە محمد ﷺ داوە بەهیچ جۆرێك ئەو گرێ بەستە هەڵ ناوەشێنمەوە کەلەنێوان من و ئەو دایە ؤ وەڵڵاهی لەڕاست گۆی و ئەمەکداری بەولاوە هیچی ترم لەو پیاوە نەدیوە، وتی: هاوار بۆ تۆ دەرگاکەم لێ بکەوە قسەت لەگەڵدا دەکەم، وتی: بەهیچ جۆرێك نایکەمەوە. وتی: وەڵڵاهی بۆیە دەرگای قەڵاکەت لەسەرت داخستووم لەترسی ئەوەی تالە نان خواردنەکەت بەژدار

(٢١٣) أورده: ابن هشام (السيرة) (١٧٦/٣) والطبري (التاريخ) (٥٧٠/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٤٢٨/٣).

نەیم لەگەڵتدا و خواردن بخۆم بەوە کەعبی تووڕە کرد]، کەعب وتی: دەرگاکەی لێ بکەنەوە بابێتە ژوورەوە پیاوێکی خراپەکار و شومە وەڵلاهی هیچ ڕێگەیەکی چاکەو خێری لێی ناوەشێتەوە بۆمان دانێت، [حویەیی هاتە ژوورەوە کاتێك هاتە ناویان لەناو قەڵاکە وتی: ئەی بەنی قورەیظە سەربەرزی و شکۆمەندی ڕۆژگارم بۆ هێناون، هاتووم سوپایەکی بێ ئەژماری وام بۆ هێناون کە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕووبەڕووی بوەستێتەوە وە دەست کەوتێکی بێ ماندو بوونم خستۆتە بەردەستان، گەورەکەیان کەعب پێی وت: بەڵێنی دەستکەوتی بێ ماندو بوون و سوپای بێ ئەژمارمان پێ دەدەیت کەسەر شۆڕو زەلیلمان بکەن و پشتمان تێ بکەن، بانگەوازی دەریای هەتا هەتایی دەدەی بەگوێماندا کەلێمان جیا نابێتەوە وەڵلاهی تەنها بەڵێنێکی پڕ کەش و فش و لەخشتەبەرو پڕ لەخۆبای بوونە].

حویەیی وتی: من هاتووم شکۆمەندی و سەروەری زەمانەم بۆ هێناون تۆ ئەوە بۆ من لێ گەڕێ، [قوڕەیشم بەهەرچی سەرکردەو پیاو ماقوڵەوە هەیە هێناوەتە (مجمع الاسیال) لە (دومە)، وە هەردوو هاوپەیمانەکەشم ئەسەد و غەطەفان [بەسەرکردە و پیاو ماقوڵانیەوە هێناوە لە (ذنب نقمی) خستوو من بەتەنیشتی (ئوحود)دوە، بەڵێن و پەیمانیان پێ داوم کەناگەڕێنەوە و واز ناهێنن هەتا محمد ﷺ و یارانی لەڕەگ و ڕیشەوە دەرنەهێنین. کەعب پێی وت: وەڵلاهی تۆ هاتوویت زەلکاو و ڕیسوایی ڕۆژگارت بۆ هێناوم بەڵێنی هەورێکی بێ بارانم پێ دەدەیت کەدێت و دەڕوات وهەورە بروسکەو چەخماخەی هەیەو هیچی تر، باشان لەناو دەچێت خوا لەناوت بەرێت (حویەیی) ! وازم لێ بێنە لەسەر ئەو پەیمانە کەلەسەریم ئەم دۆخەمان لێ تێك مەدە من هیچ شتێکم لە محمد ﷺ نەدیوە تەنها ڕاست گۆی و وەفاداری نەبێت] لەناوچیت (حویەیی) وازمان لێبێنە لەسەر ئەو پەیمانە لەگەڵ ئەو پیاوە هەمانە (مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ) من هیچ کەسێکم نەدیوە ڕاستگۆ ترو بەئەمەکتر بێت لە (محمد) ﷺ و هاوەڵانی وەڵلاهی بەزۆر ئاینی خۆیان بەسەردا نەسەپاندووین وە ماڵیان لێ زەوت نەکردووین وە ئێمە ڕقمان لەهیچ شتێکی محمد و کردەوەی تۆش نابێتەوە تەنها ئەوە نەبێت تۆ بانگمان دەکەیت بۆ لەناو چوون و فەوتان، ئێمە خودات بیر دەخەینەوە کەتەنها لەو داخوازیەی هەتە وازمان لێ بێنیت، وتی: وەڵلاهی بەهیچ جۆرێك دەست

هەڵناگرم تارۆژی قیامەت نابێت محمد لەئاسایش و دڵنیایدا بژی، وە ئێمەو ئەو سوپا و لەشکرە زۆرەش لێك جیا نابینەوە هەتا لەبەینی نەبەین.

عەمری کوڕی سەعدی قورەیظی وتی: ئەی کۆمەڵەی یەهود ئێوە پەیمانتان بە (محمد) ﷺ داوە لەسەر ئەو شتانەی کەخۆتان باش دەیزانن کەخیانەتی لەگەڵدا نەکەن و وەپشتیوانی و کۆمەکی دوژمنان نەکەن بۆ سەری، وە سەرخەرو پشتیوانی بن لەدژی هەر کەسێك هەڵکوتێتە سەر (یەثریب - واتە: مەدینە)، کەواتە بەئەمەك بن لەسەر ئەو پەیمانەی کەمۆرتان کردووە و تائێستا لەسەرین، ئەگەر پشتیوانیشی لێ ناکەن و سەری ناخەن دەڵێی گەڕێن باخۆی لەگەڵ دوژمنەکانی یەکلای بکاتەوە ئێوە خۆتان کەنارگیربگرن. [حویەیی لەکۆڵ کەعب نەبۆوە تاناچار بەهەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی کرد و بەو مەرجەی پەیمانی لەگەڵدا ببەستێت و بەڵێنی پێ بدات ئەگەر قورەیش و غەطەفان گەڕانەوە و هیچیان بۆ لەگەڵ (محمد) ﷺ نەکرا ئەوا حویەیی لەگەڵ کەعب بچێتە قەلاکەیانەوە هەرشتێك دوچاری ئەوان بوو لەزەرەرو زیان بەر ئەویش بکەوێت]، لەوکاتەدا گوێڕایەڵیان کرد و ناپاکیان کرد بەرامبەر ئەو پەیمانەی کەپێشتر بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانەکانیان دابوو، [کەعبی کوڕی ئەسەد پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە و نکۆڵی کرد لەوەی کەپەیمان لەنێوان خۆی و پێغەمبەردا ﷺ هەبێت] هەموویان کۆك بوون لەو ناپاکیەدا تەنها سێ کەسیان نەبێت لە بەنی (شەعیە) بەناوی ئەسەد و ئوسەید و ثەعلەبە...)[٢١٤]. بەو شێوە جولەکەکان بوون بەهاو پەیمانی موشریکەکان لەسەر جەنگ بەرپا کردن لەدژی پێغەمبەری خودا ﷺ سەعیدی کوڕی موسەیب رضي الله عنه دەفەرموێت: (بەنی قورەیظە کەوتنە پیلان گێڕان لەدژی پێغەمبەری خودا ﷺ وە نامەیان نوسی بۆ موشریکەکانی مەککە و عوینەیەی کوڕی حوصەین و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لەغەزای (ئەحزاب)دا کەدامەزراو و خۆڕاگربن لەشوێنی خۆتان ئێمە پەیمانمان لەگەڵ موسوڵمانەکان

---

(٢١٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٠٠) عن موسى بن عقبة واللفظ له، والزيادة لابن اسحاق كما في (السيرة) (٣/١٧٦)، مع زيادة رواية سعيد بن المسيب كما في (المصنف) لعبد الرزاق (٩٧٣٧).

هەڵوەشاندۆتەوە و دژایەتیان دەکەین هەتا لەناو کولانەیان دەخەین و لەناوەوە لێیان دەدەین)[٢١٥].

چەندین پڕو پاگەندا بڵاو بۆوە بەناو موسوڵمانانندا کە بەنی قورەیظە پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە و ئەوان دەتوانن کەلەپشتەوە جەنگ لەگەڵ موسوڵمانەکان بەرپابکەن و بەسەریاندا بدەن، پێغەمبەری خودا ﷺ زوبەیری کوڕی عەوامی نارد ﷺ بۆ ئەوەی لەڕاستیەتی هەواڵەکە ئاگاداریان بکاتەوە:

لەجابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ دەفەرموێت: (لەغەزای خەندەقدا کاتێك بارودۆخەکە زۆر ناڕەحەت بوو وەبەشێوەیەکی ترسناك پەردەی سەند پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((کەسێك هەیە هەواڵی بەنی قورەیظەمان بۆ بێنێت))؟ ئەوە بوو زوبەیر ڕۆیشت هەواڵەکەی هێنا پاشان بارودۆخەکە زیاتر شڵەژا و سەختتر بوو. ئەو کارەی سێ جار دووبارە کردەوە و لەدوایدا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((هەموو پێغەمبەرێك حەواری هەیە حەواری منیش زوبەیرە))[٢١٦].

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتی غەزای خەندەقدا من و عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەی مەخزومی لەناو قەلایەکدا بووین کەهاوسەرەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ تێدا بوو قەلای حەسان بوو، [ئەو خۆی چەماندەوە منیش سەرکەوتمە سەر پشتی بۆ ئەوەی سەیر بکەم تابزانم چۆن شەڕ دەکەن دواتر من پشتم چەماندەوە بۆ ئەوەی عومەر سەرکەوێتە سەر پشتم تائەویش بەهەمان شێوە سەیر بکات] بەو شێوە ئەو منی بەرز دەکردەوە منیش ئەوم بەرز دەکردەوە جارێکیان منی بەرز کردەوە باوکم بینی و ناسیمەوە کاتێك بەوێدا تێدەپەڕی بەرەو بەنی قورەیظە بەسواری ئەسپەکەی چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ داوای لە موسوڵمانان کرد و فەرمووی: ((کێ هەواڵی بەنی قورەیظەمان بۆ

---

[٢١٥] أخرجه: الحاكم (٣/٣٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤٣٦)، وقال الحافظ في الفتح (٧/٥١٩) (اخرجه: الطبراني والبيهقي في الدلائل باسناد صحيح الى الزهري عن عبدالرحمن بن عبدالله بن كعب عن عمه عبدالله بن كعب.

[٢١٦] أخرجه: البخاري (٣٧١٩)، ومسلم (٢٤١٥) والترمذي (٣٧٤٥)، وابن ماجه (١٢٢)، وابن حبان (٧٩٨٥).

دێنێت؟...)). تتتا دواجار باوکم بەو کارە هەستا [منیش سەیری باوکمم دەکرد بەتاوبان جارێك لێرە تێپەڕی و جارێك لەولا تێپەڕی هەرشتێکی بەرز هەبوایە گورج دەگەیشتە سەری، کاتێك ئێوارە داهات هاتە لامان لەقەڵاکە پێم وت: باوکە گیان ئەمرۆ تۆم بینی ئەوە چیت دەکرد] وەڵڵاهی من تۆم ناسیەوە کاتێك بەمناوەدا تێدە پەڕیت بۆلای بەنی قورەیظە [فەرمووی: منت بینی ئەی کوڕە شیرینەکەم؟ وتم بەڵێ] فەرمووی: وەڵڵاهی ئەی کوڕەکەم پێغەمبەری خودا ﷺ دایك و باوکی بەقوربان کردم و فەرمووی: (دایك و باوکم بەقوربانتبن)[٢١٧].

لەگێڕانەوەیەکی واقیدیدا (رحمه الله) هاتووە: (کەئەو ڕۆیشتووە و پاشان گەڕاوەتەوە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بینیم قەڵاکانیان ڕێك دەخست و خۆیان ئامادە دەکرد و ڕێگاو بانە کانیان چاك دەکرد و مەڕو ماڵاتیان کۆدەکردەوە)[٢١٨].

بەوجۆرە بەڵگەیەکی زۆر بەردەست کەوت ئەوەیان پشت ڕاست دەکردەوە کەبەنی قورەیظە پەیمانەکە یان شکاندوە و هەڵیا وەشاندۆتەوە هەر لەبەر ئەمەش پێغەمبەری خودا ﷺ شاندێکی لەدیارترین پیاوانی ئەنصاری نارد بەرەو بەنی قورەیظە تالەو دەنگو باسە دڵنیابن و بچنە ناو قەڵاکانیانەوە، وە ئەگەر ڕاست بوو لەئاکامی کارەکەیان بیان ترسێنن و وەهەواڵەکەش بگەیەنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وە بانگیشیان بکەنەوە بۆ بەڵێن و پەیمان بەستنێکی تازە هەتا بۆیان بکرێت:

موسی کوڕی عوقبە و زوهری (رحمه الله) دەفەرموون: *(پێغەمبەری خودا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی ئەشهلی و سەعدی کوڕی عوبادە و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە و خەواتی کوڕی جوبەیری نارد بۆلای بەنی قورەیظە بۆ قسەکردن و گفتوگۆ لەبارەی پەیمانەکەوە وەهەروەها هاندانیان بۆ پابەند بوون پێیەوە، وەترساندنیان لەئاکامی دوای شکاندنی پەیمانەکە، لەگێڕانەوەکەی ئیبن ئیسحاقدا (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ

---

(٢١٧) أخرجه: البخاري (٣٧٢٠)، ومسلم (٢٩١٦)، والترمذي (٣٧٤٣)، والبزار (٩٦٦)، والبيهقي (الدلائل) (٣/٣٤٩) والزيادات له.

(٢١٨) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٤٥٧).

فەرمووی پێیان: ((بڕۆن سەیر بکەن بزانن ئایا ڕاستە ئەو دەنگو باسەی لەبارەی بەنی قورەیظەوە پێمان گەیشتووە یاخود نا ئەگەر ڕاست بوو ئەوە بە ئامێزەو ناڕاستەوخۆ پێم بڵێن وە بەناو خەڵکی دا بڵاوی مەکەنەوە با شپرزەنەبن وەئەگەر لەسەر پەیمانەکەش پەنەمەك بوون و وەك خۆیان مابوونەوە ئەوە بە ئاشکرا لە ناو خەڵکدا باسی بکەن).

ئەوانیش ڕۆیشتن هەتاکو گەیشتنە بەردەرگای قەڵای بەنی قورەیظە و داوای کردنەوەیان کرد پاشان دەرگای قەڵاکەیان بۆ کرایەوە ئەوانیش چوونە ژوورەوە، داوای دووبارە گەڕانەوە بۆ بەستنی پەیمان وە تازە کردنەوەی بەڵێنیان لێکردن، وتیان: ئیستا ئێمە ئەو کارەبکەین پاش ئەوەی ئێوە هەردوولای ئێمەتان شکاند [مەبەستیان لە دوو باڵە شکاوەکە ڕاگوێزانی بەنونەضیر و بەنوقەینوقاع بوو].[موسوڵمانان لەوێدا قسەی زۆر ناشیرینتریان لێ بیستن وە هەڵسوکەوتی دوژمنکارانەیان لێ بینین ئینجا پێغەمبەری خوایان ﷺ خستەوەیادیان تا زیاتر هۆشیاریان بکەنەوە، ئەوانە وتیان: پێغەمبەری خودا کێ یە؟ هیچ گرێ بەستن و پەیمانێك لەنێوان ئێمە و (محمد)دا نی یە]. پاشان دەریان کردنەدەرەوە و جنێو و قسەی ناڕێکیان بە پێغەمبەری خودا وت زۆر بەناشیرینی، سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ قسەی ناشیرینی پێ وتنەوە، زۆر تووڕەبوو لێ یان. سەعدی کوڕی موعاذیش ﷺ بەسەعدی کوڕی عوبادەی فەرموو: "وەڵاهی ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین، وە لەنێوانمان قسەی ناشرین زۆر زیاتر لە پێویست کرا پاشان سەعدی کوڕی موعاذ بانگی کردن و فەرمووی: "ئێوە دەزانن کە چ شتێك لە نێوان ئێمە و ئێوەدا هەیە ئەی بەنی قورەیظە وەمن دەترسێم ڕۆژێکی وەك بەنی نەضیر چاوەڕێتان بکات و بەڵکو تاڵتریش لەو ڕۆژەتان بە سەر بێت، وتیان: عەورەت و بیسایی باوکت خوارد؟. فەرمووی: ئەو قسە ناشیرینەتان نەوتایە و لەوە باشترتان چاکتر لەوەتان بوتایە وگونجاو تر بوو بەحاڵتان ئینجا گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتێکدا هیچ شتێکی دڵخۆش کەریان لەلانەبوو لەناخۆشی بەولاوە، کاتێك هاتنەوە خزمەت پێغەمبەری خودا لە دەم و چاویاندا بێزراوی و ناڕەحەتی بەدی کرد لەو هەواڵەی کەزانییان. فەرمووی: ((دەنگ و باسی ئەوانەی پشتەوەتان (مەبەست بەنوقورەیظەیە)؟ وتیان: ((عەضل و قارە) (واتە ناپاکی هۆزی (عەضل و قارەیان) دووبارەکردۆتەوە کە لەسەر ئاوی (ڕەجیع) بەرامبەر (خوبەیب) و هاوەڵانی کردیان) ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ

هاتوینەوە خزمەتت لەلایەن پیسترین و ناپاکترین دروست کراوی خودا و دوژمنکارترین دروستکرا و بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ وە هەواڵیان دایە دەربارەی ئەو قسانەی کردبوویان، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێکردن کە ئەم دەنگ و باسە بڵاومەکەنەوە و بەنهێنی با لای خۆتان بێت. پێغەمبەری خودا ﷺ پاشان ڕووی سوڕاندەوە بەلای هاوەڵانی کە لەناو ناڕەحەتی و دژواریدا بوون و مەترسی یەك ڕووی تێکردبوون زۆر بەهێزتر لەغەزای (ئوحود) ؛ کاتێك بینیان پێغەمبەر ﷺ بۆ لایان دێت وتیان: دەنگ و باسی پشت خۆمان لەبەنی قوڕەیظە چی یە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ فەرمووی: [خێر دەبێت و مژدەی پێدان و دڵخۆشی دانەوە]. پاشان بەجلەکانی خۆی داپۆشی و ڕاکشا بۆ ماوەیەکی درێژ هاوەڵان ترس و دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتیان زۆر زیاتر بوو کاتێك بینیان پێغەمبەری خودا ﷺ ڕاکشاوە بۆیان دەرکەوت کە هیچ هەواڵێکی دڵخۆشکەری لە بەنی قوڕەیظەوە لا نییە، پاشان سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: ((ابشروا بفتح الله ونصره)) [٢١٩] واتە: ((مژدەتان لێ بێت بەسەرکەوتنی خودا و ڕزگار بوون لەم دۆخە)).

سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ زۆر پەستبوو بەو ناپاکیە ی بەنی قوڕەیظە و لەدڵی دەرنەدەچوو بۆیە نزای کرد کە خودا چاوی ڕۆشن کاتەوە بەلەناوچوونی بەنی قوڕەیظە، لە جابرە ﷺ دەفەرموێت: [لەغەزای ئەحزابدا سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ تیرێك بەرشانی کەوت شادەماری باسکی بڕی پێغەمبەری خودا ﷺ بەئاگر بۆی داخ کرد و دەستەکانی ئاوساو کیمی کرد ئەویش وازی لێ هێنا، دواتر دوچاری خوێن بەربوون بوو جارێکی تریش داخی کردەوە بەئاگر و دووبارە هەڵئاوسایەوە سەعد کاتێك ئەوەی بینی فەرمووی: ئەی خودایە گیانم دەرنەچێت هەتاکو چاوم ڕۆشن دەبێتەوە بە لەناوچوونی بەنی قوڕەیظە ئینجا سەری دەمارەکەی بەستەوە و یەك تك خوێنی لێ نەهات][٢٢٠] پێغەمبەری خودا بەو

---

[٢١٩] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٠٣) عن موسى بن عقبة عن ابن شهاب الزهري، وابن اسحاق (سيرة ابن هشام) (٣/١٧٧)، والطبري (التاريخ) (٢/٥٧١).

[٢٢٠] اخرجه: الترمذي (١٦٤٧) وحسنه كلٌ من الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٢٨٧)، والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٢١١).

پەری ورەبەرز و دامەزراویەوە وەستا بەرامبەر ناپاکی و پەیمان شکێنی بەنی قورەیظە وە هەموو هۆکاری بەرەنگاری و پارێزگاری خستەکار و بەکارهێنا بۆ دەستەبەرکردنی گرنتی پاراستنی موسوڵمانان و بەرزکردنەوەی ورەیان، بۆ ئەو مەبەستە چەندین کەتیبەی سەربازی لە هاوەڵانی پێك هێنا و فەرمانی پێکردن کە دەرچوونی سەربازی بەشێوەی خۆنواندن ئەنجام بدەن بە هەموو لایەکی شاری مەدینەدا بەتایبەتی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باشوور بۆ ڕێگەرتن لە هەر دزەکردنێکی هێزەکانی دوژمن لەو ناوچەنەدا. سەلەمەی کوڕی ئەسلەمی ئەنصاری بەدووسەد کەسەوە نارد و زەیدی کوڕی حاریثش بەسێ سەد کەسەوە نارد تا پارێزگاری لە شاری مەدینە بکەن و بەوناویدا بگەڕێن بۆ دورخستنەوەی مەترسیەکانی پەیمان شکێنی بەنی قورەیظە لە پشتەوە و وە (الله اکبر) بکەن بەدەنگی بەرز بۆ ترساندنی بەنی قورەیظە وبەرزکردنەوە ورەی موسوڵمانان، پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی بەتایبەت بەژداری دەکر لەگەڵ هاوەڵان لە پاسەوانی کردنی خەندەقەکەدا هەتاکو بارودۆخەکە هێوربۆوە][٢٢١].

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بەژن ومنداڵەکان کرد لەقەڵای بەنی حارثەدا ئەگەر کەسێکیان دی لێیان نزیك دەبێتەوە ئەوان شمشێرەکانیان بەرزبکەنەوە و هەڵیسوڕێنن بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان لەڕێگەی بریسکەی شمشێرەکانەوە بزانن کە دوژمن هەڵیکوتاوەتە سەر ئەو ناوچەیە.

ڕافعی کوڕی خودەیجی ئەنصاری ﷺ دەفەرموێت: (هیچ قەڵایەك نەبوو قایمتر وپارێزگاریتر بێت لەقەڵای بەنی حارثە، پێغەمبەری خودا ﷺ ژن ومنداڵ وکۆیلە وپیروپەکەوتەکانی لەناودانابوو وەفەرمووی پێیان: ((ئەگەر هەستان بەبوونی کەسێك کرد لێتان نزیك دەبێتەوە شمشێرەکانتان هەڵسوڕێنن بابریسکێتەوە)). پیاوێکی بەنی ثەعلەبەی کوڕی سەعد کە پێ دەچوو جولەکە بێت ناوی (نجدان) بوو لەبەنی جحاش بوو بەسواری ئەسپەوە هات بۆلایان، هەتاکو هاتە بەردەم قەڵاکە پاشان بە ئافرەتەکانی وت: "وەرنەخوارەوە بۆ لام لەخێرو چاکە بەولاوە بۆ ئێوە هیچم پێ نی یە". ئەوانیش شمشێریان بەرزکردەوە و هەڵیان سوڕاند، هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ بینیان و بەپەلە

[٢٢١] اخرجه: الواقدي (٢/٤٥٠)، وابن سعد (٢/٤٨).

بەرەو لای قەلاکە ڕۆیشتن پیاوێکیان لەگەڵ بوو لەبەنی حارثە ناوی ظلوهەیری کوڕی رافع بوو فەرمووی: "ئەجدان وەرە دابەزەبۆم بۆ شەڕی دەستەو یەخە لەگەڵ یەکتر ئەویش هات تا ڕووبەڕووی ببێتەوە ظلوهەیر بەنەسپەوە هەڵیکوتایە سەری و کوشتی...)[٢٢٢].

صەفیەی کچی عەبدولطلب (رضي الله عنها) پوری پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا بەکارێکی پاڵەوانانە و سیخوڕێکی جولەکەی بەنی قورەیظەی کوشت کە دەیویست دزەبکاتە ناو قەلاکەیان، لە زوبەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچوو بۆ غەزای (خەندق)، هاوسەرەکانی لەگەڵ پوری خۆی صفیە لەناو قەلایەك دانا بەناوی (فارع) وەحەسانی کوڕی ثابتیش ﷺ لەگەڵیان بوو: (لەوانەیە بەهۆی نەخۆشی و بەساڵاچوونیەوە بووبێت) خەلکانێك لەجولەکەی بەنی قوڕەیظە دەهاتن بۆ قەلاکە بۆ ئەوەی دەستیان بگات بەهاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ وە لەپڕ هەلکوتنە سەریان... جولەکەیەك هات هەتاکو گەیشتە دەوروبەری ئەو شوێنەی کە هاوسەرەکانی پێغەمبەری ﷺ لێ بوو لەگەڵ صفیەی پوری، صفیە فەرمووی: بە حەسان: هەستە بۆی بیکوژە فەرمووی: وەڵلاهی من ناتوانم ئەو کارە بکەم ئەگەر توانای ئەوەم هەبووایە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەر دەچووم [ئینجا صفیە بە پۆشاکێك دەمامکی خۆی کرد و تەورێکی گرت بەدەستەوە بۆی چووە خوارەوە سەری لە لەشی جیاکردەوە...] پاشان سەرەکەی هەلگرتەوە وبەرەو لای جولەکەکان هەڵیدا، جولەکەکان وتیان: ئێمە وامان زانیبوو (محمد) کەسی بەسەرماڵ و خێزانیەوە جێ نەهێشتووە کە بەرگریان لێ بکات لە شوێنی خۆیدا بۆیە ڕۆیشتن و بلاوەیان لێ کرد)[٢٢٣].

---

[٢٢٢] أخرجه: الطبراني (الكبير)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٣/٦): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

[٢٢٣] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٨٤/٣) (٧٢٣) وقال محققه: حديث حسن لغيره، والحاكم (٥٠/٤) وقال: روي باسناد صحيح، والطبراني (الكبير) (٨٠٤/٢٤، ٨٠٩)، وفي (الاوسط) (٣٧٥٤) والبزار (١٨٠٧)، و ابي يعلى (٦٨٣)، وابن سعد (٣٤/٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٤٥) رواه البزار وابو يعلى... واسنادهما ضعيف وقال (١٠١٤٦): رواه الطبراني ورجاله الى عروة رجال الصحيح ولكنه مرسل واللفظ للحاكم والطبراني والبزار.

# زیادبوونی مەینەتی موسوڵمانەکان

سوپای موشریکەکان گەمارۆی سەر موسوڵمانەکانیان تا دەهات زیاتر توندتر دەکرد وە جوولەکەکانی بەنی قورەیظەش چوونە پاڵیان، بەمەش دژواریەکان بۆ سەر موسوڵمانەکان سەختر بوو دوچاری بەگیرهاتنێکی ناوازە و سەختگیربوونەوە و ترس و دڵەڕاوکێ و شڵەژان وەك مۆتەك باڵی بەسەردا کێشابوون هەروەك خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ (الأحزاب ١٠-١١) واتە: ﴿کاتێکیش دوژمنان لە سەروخوارتانەوە هاتنەسەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبڵەق بوون، دڵەکان گەیشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی ئیمانداران)﴾ بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا موسوڵمانەکان بڕوا ومتمانەیان زیاتر دەبوو بەرامبەر خودای گەورە وە زیاتر ملکەچی خوداو پێغەمبەر ﷺ دەبوون و باوەڕیان پتەوتر دەبوو هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٢٢) واتە: ﴿کاتێك ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خوا وپێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێداوین (کەتاوا دژایەتی ئاینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووەکان نەخشەو پیلان دەکێشن بۆ ریشەکێش کردنی)، دیارە کە خودا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لە پێشهاتندا، بێگومان ئەو دژایەتیە باوەڕوملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن (واتە: سور تر بوون لەسەر ئیمان)﴾ دووڕووەکانیش دووڕووی و کردەوەی پیس و ناپەسندیان دەرکەوت و هەڵوێستەکانیان بەترسنۆکی و داچڵەکین و ورە ڕوخاوی و سەرشۆڕی ودرۆکردن ناوزرد دەکرا و نیشانەی ناسراوی ئەوان بوو بەرامبەر بەبەڵێنەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ هەروەك خودای گەورە و باڵادەست هەڵوێستە ناجوامێرەکانیان و ئەو قسە نابەجێ یانەیان کە دەیان کرد بۆ داروخاندنی ورەی موسوڵمانەکان لە قورئاندا بەجوانی ڕوونی کردۆتەوە بۆ موسوڵمانان وەك لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ

وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾ (الأحزاب: ١٢) واتە: ﴿کاتێك دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدابوودەیان وت: بەڵێنی خودا وپێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن بوو، هیچی تر نەبوو﴾ یاخود
دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ
ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ
سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ
ٱلْأَدْبَٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا
تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ
لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ
ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ
عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟
فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ
يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا
قَلِيلًا ﴾ (الأحزاب ١٣–٤٠) ئەم ئایەتانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە دووڕووەکان کەسانێکی ترسنۆك وبێ متمانەن بەرامبەر بەبەڵێنەکانی خودای گەورە لە کاتی ناڕەحەتی و دژواریدا لەگەڵ ئەوەشدا زۆر چەقاوەسوبوون بەرامبەر بە پێغەمبەری خودا ﷺ، وە لە بارودۆخە سەختەکاندا نەدەگەڕانەوە بۆ لای خودا و بە پەناگیری ڕاستەقینەیان دانەدەنا وە هەڵدەستان بە چەندین کرداری دزێوی ترسنۆکانە و سەر شۆڕکەرانە لەکاتی کارکردن و دەست پێکردنی شەڕدا ئەوان داوای ڕوخسەتیان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد بەچەندین بڕوبیانوی بێ بنەما کە گوایە ماڵەکانیان والا وبێ سەنگە ڕوبەربەستە و بەردەستی دوژمنەکانە بەو شێوەیەش مەبەستیان بوو لەمردن ڕاکەن و نەجەنگێن لە پێناوی خودادا لەبەر ئەوەی باوەڕیان بەدیاریکردنی ئەجەل نەبوو لەلایەن خوداوە هەر بەوەش نە دەوەستان خەڵکی تریشیان هاندەدا تا سەنگەرەکانیان جێ بهێڵن و بەرەو ماڵەکانیان

ڕابکەن بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو پەیمانەی کە لەسەری بوون بەرامبەر بە خودا و پێغەمبەرکەی ﷺ.

موسای کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك بارودۆخەکە سەختگیر ونارەحەت بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەوێدا خەڵکانێکی زۆر دووچاری دووڕووی بوون و قسەی زۆر نارێك و نابەجێیان دەکرد چۆن قسەکردنێك !. کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی کە خەڵکەکە دووچاری چ بارودۆخێکی سەخت و بڕ مەترسی و نارەحەت بونەتەوە کەوتە مژدە پێدانیان و فەرمووی: ((والذي نفسي بيده لَيُفرّجَنّ عنكم ما ترون من الشدة واني لأرجو ان اطوف بالبيت العتيق آمناً وان يدفع الله عزوجل إليّ مفاتيح الكعبة ولَيُهلكنّ الله كسرى وقيصر ولَتُنفقنّ كنوزهما في سبيل الله عزوجل)) واتە: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەو بارودۆخە سەختەی دووچاری بوون و دەیبینن لەسەرتان لادەچێت و من وا دەبینم و تکام وایە کە تەوافی ماڵی خودا بکەم بەبێ ترس و بەو پەڕی ئاسایشەوە وە خودای گەورە کلیلەکانی کەعبە دەخاتەوە دەستم وە خودای گەورە کیسرا و قیسەر لە ناو دەبات و ئێوەش گەنجینەکانیان لە پێناوی خودادا دەبەخشن)).

پیاوێك لەوانەی لەگەڵیدا بوو بەهاوەڵانی وت: سەرتان سوڕنامێنێت لە محمد بەڵێنی تەوافی بەیت و دابەشکردنی گەنجینەکانی فارس و ڕۆممان پێدەدات لە کاتێکدا ئێمە لێرەدا هیچ کەسێکمان ناتوانێت بەدڵنیایەوە بچێت بۆ سەر ئاو وەڵڵاهی ئەو بەڵێن پێدانەی ئەو هیچ نی یە تەنها چاو بەستی و فریودانە" هەندێکی تریان لەوانەی لەگەڵیدا بوون دەیان وت: "ڕێگەمان بدە بچینە ماڵەکانمان چونکە والآ و کراوەن بەڕووی دوژمن دا"

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (ئەوسی کوڕی قەیظی لەبەنی حارثەی کوڕی حاریث بوو دەی وت: "ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ماڵکانمان هیچ شورایەکیان نی یە بەئاسانی دەستی دوژمن دەیان گاتێ و [کەوتونەتە دەرەوەی مەدینە] ڕوخسەتمان بدە. ئەو کەسە لە ناو کۆمەڵێك لە پیاوانی هۆزەکەی ئەم قسەی دەکرد وتی لە جیاتی ئەوانیش ڕوخسەتمان پێبدە تا بڕۆین و بگەڕێینەوە بۆ ماڵکانمان وە [بۆلای ژن ومنداڵەکانمان] و

فریایان کەوین چونکە لە دەرەوەی مەدینەدان)[٢٢٤]. هەندێکی تریان دەیان وت: "ئەی خەڵکی یەثریب ئیتر ئێرە شوێن و جێگای ئێوە نی یە تیایدا ڕاوەستاو و خۆڕاگر نابن لەبەر ئەوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان... لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکان خۆڕاگر ودامەزراو بوون بەبینینی ژمارەی زۆری کۆمەڵ وتاقمەکان و سەختی و دژواری بارودۆخەکە زیاتر باوەڕیان دەچەسپا و دڵنیاتر دەبوون بەرامبەر بەڵێنەکانی خودای باڵا دەست کەبەڵێنی پێدا بوون.... تا دەهات بارودۆخەکە سەختر و گەمارۆکە توند تر دەبوو لەسەر موسوڵمانەکان ئەوەندە سەرقاڵی کردبوون بەشەو بەڕۆژ بواری حەسانەوەیان نەبوو...)[٢٢٥].

ئیبن عومەر ﷺ هەڵوێستێك لە هەڵوێستە ڕاست و پڕ لەباوەڕی هاوەڵانمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بۆ سەرخستنی خودا و پێغەمبەر ﷺ داوایانە. ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: (خاڵم عوثمانی کوڕی مەظعون ناردمی بۆ ئەوەی بچم تا لێفێکی بۆ بێنم منیش چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەلای خەندەقەکە بوو بۆ ئەوەی داوی ڕوخسەتی لێ بکەم ئەویش ڕێگەی پێدام و فەرمووی: ((بە هەر کەسێك گەیشتی لە ڕێگا دا پێیان بڵێ کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانتان پێ دەکات کە بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان [واتە: بۆ ئەوانەی پێشتر ڕێگەی گەڕانەوەی پێدا بوون بۆ ماڵەوە])). ئەویش لە ڕۆژێکی زۆر ساردا بوو، ڕۆیشتم لە ڕێگادا بەخەڵکەکە گەیشتم پێم وتن: کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: وەڵلاهی یەك یا دوانیان نەبێت هەواڵەکەیان پشت ڕاستکردەوە ئەوانی تر هەموویان بەگورجی گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ)[٢٢٦].

بەتها گەمارۆی موشریکەکان موسوڵمانەکانی دوچاری تەنگ پێ هەڵچنین و بارگرژی نەکردبوو، بەڵکو بارودۆخی ناوخۆ ئەوەندەی تر زیاتر ترس و بیم و پەرێشانی و ئازار

---

(٢٢٤) اخرجه: ابن اسحاق (السيرة) (١٧٨/٣) عن عروة بن الزبير ﷺ، والبيهقي في (الدلائل) (٤٣٥/٣)، والطبراني (الكبير) (١٦٦/٣).

(٢٢٥) اورده: البيهقي (الدلائل) (٤٠٢/٣، ٤٠٤، ٤٠٦)، وابن عبدالبر في (الدرر في اختصار المغازي والسير) (ص: ١٦٩-١٧٧).

(٢٢٦) اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٣٦٩)، والبيهقي (الدلائل) (٤٣٥/٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٥): رجاله رجال الصحيح، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٥١٢/٧): اسناده صحيح.

وەمینەتی خستبووە ناویان.....خواردەمەنیەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر دەبوو دێوەزمەی برسێتی بێ بەزەیی باڵی بەسەردا دەکێشان، هاوکات لەگەڵ سەرماو سۆڵەی شەوانی درێژی زستاندا لەگەڵ ئەو جەنگە دەروونیە لەڕادەبەدەرەی کە لەدڵی دووڕووەکانەوە بەرپاکرا بوو بەناو ڕیزی موسوڵمانەکاندا بەشێوەیەکی سەرشۆڕانە و ترسنۆکانە ونەزۆکانە.... شەونخونی سەخت لەو شەوە درێژانەدا بەجۆرێك بوو کە محمدی کوڕی مەسلەمی ﷺ دەفەرموێت: (لە غەزای خەندەقدا شەو ڕۆژمان وەك یەك بوو هەتاکو خودای گەورە دەروی لێکردینەوە و ڕزگارمان بوو). پاشان پەیمان شکێنی بەنی قوڕەیظەش بەسەرداهات نیشانەیەکی ترسناك و پیلانگێڕیەکی پڕ مەترسی تر بوو بۆ سەربازگەی موسوڵمانە خۆڕاگر و دامەزراوەکان، تا دەهات ناڕەحەتی زیاتر دەبوو باردۆخەکە پڕ مەترسی تر دەبوو بەجۆرێك پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی بە هیچ کەس لە هاوەڵانی نەدەدا کە بەرەو مەدینە بڕۆنەوە مەگەر چەك لەگەڵ خۆیان ببەن وەك ئامادە باشیەك لە ناپاکی بەنی قوڕەیظە..)[٢٢٢].

ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ داوای ڕوخسەتی گەڕانەوە بەرە و ماڵەوەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد بۆلای هاوسەرەکەی کە تازەبوك بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد کە چەکەکەی لەگەڵ خۆی ببات وەك ئاگا لە خۆبوونێك بەرامبەر ناپاکی بەنی قوڕەیظە ئەم ڕووداوەش ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ([کوڕە مامێکم لە ئەو ماڵەدا بوو (ئامازەی بۆ ماڵێکی ئەوێ کرد)]، تازە زاوا بوو کە دەرچووین بۆ غەزای خەندەق لە خزمەت پێغەمبەری خودادا ﷺ، ئەو گەنجە داوای ڕوخسەتی چوونەوە بۆ ماڵی لە پێغەمبەری خودا دەکرد ﷺ لە کاتی نیوەڕۆدا دەگەڕایەوە بۆلای هاوسەرەکەی، ڕۆژێکیان داوای ڕوخسەتی کرد و فەرمووی: [ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوخسەتی چوونە ماڵەوەم دەوێت من تازە زاوام ئەویش ڕێگەی دا]، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((چەکەکەت بەدەستەوە بگرە و لەگەڵ خۆت بیبە من دەترسێم بەنی قوڕەیظە زیانت پێ بگەیەنن)). پیاوەکەش چەکەکەی هەڵگرت و پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بینی ئەوا هاوسەرەکەی لەبەر دەرگادا وەستاوە ویستی ڕمەکەی درێژ کات بۆی تا لێیدات پێی، لەو

---

[٢٢٢] انظر: (دراسة في السيرة) لد. عمادالدين خليل، نقلاً عن (المغازي) للواقدي (٢/٤٦٥-٤٨٩).

کاتەدا غیرەی جولا، هاوسەرەکەی پێی وت: لەسەرخۆبە و ڕمەکەت بکێشەرەوە و پەلەمەکە و برۆ ژوورەوە سەیر بکە و بزانە چ شتێك منی وەدەرناوە، ئینجا چووە ژوورەوە بینی مارێکی گەورە لەسەر جێگای نوستنەکەی خۆی لول داوە وجنگلی خواردووە، ئەویش بەڕمەکەی بۆی چوو تا لێیبدا و بیکوژێت ئەوە بوو مارەکەی کرد بەسەری ڕمەکەوە پاشان نووکی ڕمەکەی چەقاند بەزەویدا مارەکەش پەلەقاژەی کرد [بەسەر نوکی ڕمەکەو و گەنجەکەش کەوت و مرد]، نەزانرا کامیان زووتر لە ناوچوون مارەکە یاخود گەنجەکە؛ ئێمەش هاتینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەمان بۆ باس کرد وە پێمان وت: کەداوا لە خودا بکات تا زیندوی کاتەوە بۆمان، فەرمووی: ((داوای لێخۆش بوون بۆ هاوەڵەکەتان بکەن)). پاشان فەرمووی: ((ان بالمدینة جناً قد أسلموا، فاذا رأیتم منهم شیئاً فآذنوه ثلاثة أیام، فان بدالکم بعد ذلك فاقتلوه، فانما هو شیطان)) واتە: ((لە ناو شاری مەدینەدا جنۆکەی لێ یە موسوڵمان بوون، هەر کاتێك شتێکتان لەوانە دیت داوای ڕۆیشتنیان لێ بکەن تا سێ ڕۆژ، ئەگەر لە دوای ئەوە دەرکەوتنەوە وخۆیان پیشان دان بیان کوژن ئەوانەیان شەیتانین))[228].

لەو کاتەدا ترس و دڵە ڕاوکێی هاوەڵان زۆر زیادی کرد و هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ داوایان لێکرد کەلە خودا بۆیان بپاڕێتەوە تا ئەو ترس و ڕاچڵەکینەیان لەسەر لاببات، ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (لەغەزای خەندەقدا وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ شتێك نی یە کە نزای پێ بکەیت وبیڵێیت لای خودا چونکە وا دڵەکانمان لەم کاتەدا گەیشتووتە گەرووومان لە ترسان؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە بڵێن: ((اللهم استرعوراتنا و آمن روعتنا)) واتە: ((خودایە عەیب و عارمان بپۆشە و ترس ودڵەڕاوکێمان لەسەر لابدە و بیگۆڕە بەئاسایش))، پاشان ئەوە بوو خوای گەورە بای بەڕووی بێ باوەڕاندا هەڵکرد و ورەوتوانایی ڕوخاندن)[229].

[228] اخرجه: مسلم (٥٨٠٠)، ومالك (٩٧٦/٢)، وابوداود (٥٢٥٩)، والبغوي (٣٢٦٤)، والطحاوي (مشکل الاثار) (٩٤/٤) واللفظ لمسلم والزيادات لابي داود ومالك.

[229] اخرجه: احمد (٢/٣)، والبزار (٣١١٩)، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٠١٨).

پێغەمبەری خودا ﷺ کەوتە ئامۆژگاری و هاندانی هاوەڵانی لەسەر ئارامگرتن و دامەزراوی بەرامبەر بەدوژمنەکان. پاشان دوعای کرد لە موشریکەکان:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئەوفا ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری ﷺ لە چەند ڕۆژێکدا کەتێدا دوچاری ڕووبەڕوو بوونەوە بوو لەگەڵ دوژمنەکانی چاوەڕێ کرد هەتاکو خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایدا ئینجا هەستا لە ناویاندا فەرمووی: ((یاایها الناس لاتتمنوا لقاء العدو واسألوا الله العافیة فاذا لقیتموهم فاصبروا واعلموا انَّ الجنّة تحت ظِلال السیوف [ودعا رسول الله ﷺ علی الاحزاب] فقال: اللهم منزل الکتاب سریع الحساب مجري السحاب اهزم الاحزاب اللهم اهزمهم وزلزلهم [وانصرناعلیهم])) [٣٣٠] واتە: ((ئەی خەڵکینە ئاواتە خوازی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن مەکەن بەڵکو داوا لە خودا بکەن کە بتان پارێزێت و تەندروستیتان باش بکات ئەگەر ڕووبەڕووش بوونەوە ئارامگرو دامەزراو بن وەباش بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە، ئینجا [پێغەمبەرﷺ دوعاشی لە ئەحزاب کردوو] فەرمووی: ئەی خودای دابەزێنەری قورئان تۆ حساب ولێپرسینەوەت خێرایە و هاتو چۆپێکاری هەورەکانی ئەم پارت و تاقمە موشریکانە تێك بشکێنە خوایە تێکیان بشکێنە و ژێر پێیان دوچاری ڕاچڵەکین بکە و ئێمەش زاڵ بکە بەسەریاندا)). لەگێڕانەوەیەکی تردا پاشان فەرمووی: ((اللهم ربنا وربهم ونحن عبادك وهم عبادك ونواصینا ونواصیهم بیدك وانصرنا علیهم))[٣٣١].

واتە: (ئەی خوایە تۆ پەروەرگاری ئێمە و ئەوانیشی، ئێمە بەندەی تۆین ئەوانیش بەندەی تۆن چارەنوسی ئێمە و ئەوانیش بەدەست تۆیە سەرمان بخە بەسەریاندا). لەگێڕانەیەکی تردا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لاتتمنوا لقاء العدو، وسلوا الله العافیة فاذا لقیتموهم فاثبتوا واذکروا الله وان اجلبوا و صاحوا فعلیکم بالصمت)) واتە: ((ئاواتە خوازی ڕووبەڕوبونەوەی دوژمن مەکەن، بەڵکو داوای پارێزگاری وسەلامەتی لە خودا بکەن، ئەگەر دوچاری ڕووبەڕوو بوونەوەش بوون

---

[٣٣٠] اخرجه: البخاري (٢٩٦٥، ٤١١٥)، ومسلم (١٧٤٢، ٤٥١٧) واللفظ لهما.

[٣٣١] اخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٥١٤)، والبیهقي (الكبری) (١٥٢/٩).

خۆڕاگر و دامەزراوبن و یادی خودا بکەن وەگەر لەهەموو لایەکەوە هەڵیان کوتایە سەرتان و هاوار و قیژە قیژیان بەسەردا کردن ئێوە بێ دەنگ بن))[٢٣٢].

لەگێڕانەوەکەی جابری کوڕی عەبدوڵلاّدا هاتووە ﷺ دەفەرموێت: (کە پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مزگەوتی (ئەحزاب) عەباکەی دانا و هەستا، دەستەکانی بەرزکردەوە و لێکی نزیک کردنەوە و کەوتە دوعاکردن لە موشریکەکان، نوێژی نەکرد، پاشان تەشریفی هێنایەوە و دووبارە دوعای لێکردنەوە وئەمجارەیان نوێژی کرد)[٢٣٣].

خودای گەورە نزاکەی گیراکرد و موسوڵمانەکانی سەرخست و دوژمنەکانی دوچاری شکست خواردن کردن لە ڕۆژی چواری شەممەدا لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا، لەجابرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ سێ ڕۆژ لەسەر یەك دوعای کرد لە ناو مزگەوتی (فەتح) دا لە ڕۆژی دووشەممە و سێ شەممە و چوار شەممەدا، خودای گەورە نزاکەی گیراکرد و بۆی جێبەجێ کرد لە ڕۆژی چوار شەممەدا لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ وعەسردا لەدەم وچاویدا مژدەی خۆشی و سەرکەوتن دەبینرا و هەستی پێ دەکرا..))[٢٣٤].

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر زکری وەلاّمدانەوەی خودای دەکرد: (لبيك اللهم لبيك) واتە: (خوایە وەلاّمی دوای وەلاّمت دەدەمەوە لەگوێڕایەڵیتدا).

لە ئیبن عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم دێڕەی دەفەرموو: ((لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك إنّ الحمد لك و الملك لاشريك لك)). واتە: ((خوایە وەلاّمی دوای وەلاّمت دەدەمەوە لە گوێڕایەڵیتدا، هیچ هاوبەشێکت نی یە و ستایش وموڵك هەموو شایستەی تۆیە هیچ شەریك و هاوبەشت نی یە)) ئەمەی فەرموو لەوپەڕی

---

[٢٣٢] اخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٥١٨)، والبيهقي (الكبرى) (١٥٣/٩).

[٢٣٣] اخرجه: احمد (١٥٢٣٠) وقال محققه: اسناده ضعيف. واوردناه للعلم فقط.

[٢٣٤] اخرجه: احمد (١٤٥٦٣) وقال محققه: اسناده ضعيف. والبخاري (الادب المفرد) (٧٠٤)، والبيهقي (شعب الايمان) (٣٨٧٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٢/٤) ورجال احمد ثقات، وقال المنذري (الترغيب) (١٧٨٨): واسناد احمد جيد، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (١١٨٥)، و (صحيح الادب المفرد) (٥٤٢).

نازونیعمەتدا لەڕۆژی عەرەفە لە کاتی حەجدا و لەناڕەحەترین و سەختترین کاتیش دا لەغەزای خەندەقدا ئەمەی فەرمووە)[٢٣٥] . لەوڕۆژە دژوار و سەختانەدا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دارخومایان بینی بەروبومی دەرکەوت و سەری دەردەهێنا بەمە زۆر شاد و دڵخۆش بوون چونکە بژێوی ژیانیان لە بنچینەدا پشتی بە بەروبومی دارخورماکانیان بەستبوو، لە عورەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووبەڕووی موشریکەکان بۆوە لە غەزای خەندەقدا ڕۆژێکی زۆر سەخت و دژواربوو موسوڵمانەکان هەرگیز دوچاری ڕۆژگاری هاوشێوەی ئەو ڕۆژە نەبوو بوون، پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتبوو ئەبوبەکری صدیقش ﷺ لەخزمەتیابوو، ئەو کاتە ساتەوەختی دەرکەوتنی بەروبومی خورمابوو، ئەوان زۆر پڕی دڵخۆش دەبوون کاتێك دەیان بینی بەجۆرێکی لە ئەندازە بەدەرە ئەبو بەکرﷺ سەری بەرز کردەوە دارخورمایەکی بینی چونکە لەلقێکدا دەرکەتبوو ئەوە یەکەم لق بوو کە بینی بەدەستی ئاماژەی بۆ کرد: ئەو لقە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خورمای دەرکەوتووە. بەو پەڕی دڵخۆشیەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری کرد و بەزەردەخەنە و خۆشحاڵیەوە فەرمووی: ((اللهم لاتنزع منا صالح ما أعطينا)) واتە: ((ئەی خوایە بێ بەشمان مەکە لە باشترین و چاکترین بەروبومی و ئەوانەی کە پێمان دەبەخشی))[٢٣٦].

## هەوڵدان بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ غەطەفاندا

گەمارۆکە تا دەهات توندتر وسەختر دەبوو لەسەر موسوڵمانەکان پێغەمبەری خودا ﷺ هەوڵیدا سوپای موشریکەکان لێکبترازێنێت، بۆ ئەو مەبەستەش غەطەفانی هەڵبژارد چونکە ئەوان هیچ ئامانجێکی ڕامیاری و ئاینیان نەبوو لەڕووی بیروباوەڕەوە لەو جەنگەدا بەڵکو ئەوان بۆ داخوازی ماڵ و سامان و دەستکەوتی شەڕ هاتبوون بەتەنها ئەو مەبەستەیان هەبوو، بەپێچەوانەی دوو دوژنە سەرەکیەکەی تری کە قورەیش و جولەکەکان بوون، پێغەمبەری خودا ﷺ پەیوەندی کرد بەسەرکردەکانی غەطەفانەوە دوان لەسەرکردەکانیان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کەئەوانیش حارثی کوڕی عەوف

---

(٢٣٥) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٤٨/٧).

(٢٣٦) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٦٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

وعویەینەی کوڕی حوصەین بوو بەنهێنی لەگەڵیاندا کۆبونەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا بە وتوێژ لەگەڵیاندا بەوەی کەسێ یەك یاخود نیوەی بەروبومی مەدینەیان بداتێ بەو مەرجەی لەو جەنگە پاشە کشە بکەن و قورەیش بەتها جێ بهێڵن باسی ئەو ڕووداوە لە دوو گێڕانەوەدا هاتووە کەیەکیان پلەکەی (حسن) وە و ئەوەی تریشیان لاوازە (ضعیف)ە.

١- لەسەعیدی کوڕی موسەیبەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی بەشوێن عویەینەی کوڕی حوصەین کوڕی بەدری فوزاری کە ئەو لەو ڕۆژگارەدا سەرۆکی موشریکەکانی هۆزی غەطەفان بوو لەگەڵ ئەبوسوفیاندا بوو پێی فەرموو: ((دەڵێی چی ئەگەر سێ یەکی بەروبومی ئەنصارت بدەینێ ئایا تۆ دەگەڕێیتەوە خۆت و ئەوانەی لەگەڵتدان لە هۆزی غەطەفان و لەڕیزی ئەحزاب دێیتە دەرەوە و پشتیان تێ دەکەیت؟ عویەینە وەڵامی دایەوە: وتی ئەگەر نیوەی بەروبومەکەم بدەنێ ئەو کارە جێ بەجێ دەکەم...)[٢٣٧].

پاشان حاریث و عویەینە هاتن بۆ دانوستن لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ هەروەك ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (حاریثی کوڕی عوفی موڕیی غەطەفانی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەی محمد ﷺ نیوەی بەروبومی خورمای مەدینەمان بدەیە دەست هەڵدەگرین ئەگەر نا ئەم شارەت لێ پڕدەکەم لە ئەسپ سوار و پیاوی شەڕکەر؟ فەرمووی: ((بوەستە با ڕاوێژ بەسەعدەکان بکەم (سەعدی کوڕی عوبادەی خەزرەجی و سەعدی کوڕی موعاذی ئەوسی هەردووکیان سەرۆکی ئەنصار بوون). پاشان [وەناردی بەشوێنیاندا وپێی فەرموون: ((ان عيينه بن حصن سألني نصف تمر كما على ان ينصرف بمن معه من غطفان ويخذل بين الاحزاب واني قد اعطيته الثلث فابى الا الشطر﴾ [اني قد علمت ان العرب قد رمتكم عن قوس واحدة وان الحارث سألكم تشاطرون تمر المدينة فان اردتم ان تدفعوه عامكم هذا في امركم بعدُ])) واتە: ((عویەینە کوڕی حوصەین داوای نیوەی بەروبومی مەدینەی لێکردووم بەو مەرجەی کەبگەڕێتەوە بەخۆیی و ئەوانەی لەگەڵیدان لە هۆزی غەطەفان وبێنە دەرەوە لە ڕیزی ئەحزاب و پشتیان تێ بکەن وەمنیش سێ یەکی

---

[٢٣٧] اخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧) عن سعيد بن المسيب ومراسيله صحيحة.

بەروبومەکەم داوەتێ ئەو پێی ڕازی نی یە تەنها بەنیوەی نەبێت] [من چاك دەزانم کەعەرەب هەموویان خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ تان وەحاریثیش داوای نیوەی بەروبومی خورمای مەدینە دەکات ئەگەر دەتانەوێت ئەوە ئەم ساڵ بیدەنێ و لەمەو دواش خۆتان چۆنی بەباش دەزانن ئاوا بکەن]))؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە بە وەحی لە ئاسمانەوە بۆت دابەزیوە، ئەگەر وایە ئێمە ملکەچی فەرمانی خوداین یاخود بەبیروڕای خۆتە وای بۆ دەچێت بۆچوونی ئێمەش لەوەدا شوێن بۆچوون و بیروڕای تۆ دەکەوین ئەگەر بتەوێت بەسەرماندا جێبەجێی بکەیت، وەڵلاهی ئێمە و ئەوان چۆن دەبینیت هەر ئاوهابووین لەسەردەمی بت پەرستی ئەوان نەیان توانیوە یەك دەنکە خورمامان لێ بستێنن مەگەر بەکڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕ و میوانداری نەبێت وە ڵلاهی ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا کەمترین شتمان نەدەدانێ چۆن ئێستا دەیان دەینێ لەکاتێکدا خودای گەورە سەربەرزی کردووین بەئیسلام. ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە لای حاریث (کەوەك نوێنەری ئەو کات لای موسوڵمانان بوو) وە ئەوەی پێ ڕاگەیاندن...)[٢٢٨].

٢- ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: کاتێك باردۆخەکە زۆر سەخت و دژوار بوو لەسەر موسوڵمانان و ناڕەحەتی کردن پێغەمبەری خودا ﷺ هەروەك عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە و کەسانی تریش کەناویان نەهاتووە لە محمدی کوڕی مەسلەمەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیهابی زوهەیری باسیان کردووە و فەرموویانە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای عویەینەی کوڕی حوصەینی کوڕی حوزەیفەی کوڕی بەدری فوزاری و حاریثی کوڕی عەوفی کوڕی ئەبو حاریثی موڕیی کە هەردووکیان لەسەرکردەکانی غەطەفان بوون سێ یەکی بەروبومی مەدینەی پێدان بەو مەرجەی خۆیان و ئەوانەی لەگەڵیاندا لە سوپاکەیان بگەڕێنەوە و پشت لە دوژمنەکانی موسوڵمانان بکەن ئەوەبوو لەنێوان پێغەمبەر

[٢٢٨] اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٣/٦) (٥٤٠٩)، والبزار (١٨٠٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٣٢/٦) رواه البزار والطبراني، ورجال البزار والطبراني فيهما محمد بن عمرو وحديثه حسن وبقية رجاله ثقات، وقال محقق (المصنف) لابن ابي شيبة (٣٧٩٧١): رواه البزار موصولاً باسناد حسن، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٤٢٧/٢): رواه البزار والطبراني واسنادهما حسن. واللفظ للبزار والزيادات للطبراني وعبدالرزاق.

وئەواندا دانوستان ڕوویدا و گرایە کتابێك نوسرا بەڵام مۆرنەکرا و یەکلایی نەبۆوە ئەو سوڵحە، وە ئەو سوڵحە ڕەزامەندی یەکجاری مابوو کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی ڕەزامەندی نیشان بدات ناردی بەشوێن سەعدی کوڕی موعاذ وسەعدی کوڕی عوبادەدا (رضي الله عنهما) وەکەوتە ڕاوێژکردن لەگەڵیان ئەوەی ڕوویدابوو بۆی باس کردن، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر ئەوە کارێکە خۆت پێت خۆشە و دەتەوێت ئەنجامی بدەیت یاخود شتێکە خودا فەرمانی پێکردوویت هەر چۆنێك بێت پێویستە جێبەجێی بکەین، یاخود کارێکە و لەبەرژەوەندی ئێمەدا دەیکەیت؟ فەرمووی: ((بل شيءٌ أصنعه لكم، والله ما اصنع ذلك الاّ لأنني رأيتُ العرب قد رمتكم عن قوسٍ واحدةٍ وكالبوكم من كل جانبٍ فاردتُ ان اكسر عنكم من شوكتهم الى امرٍ ما)) واتە: ((بەڵکو شتێکە لەبەرژەوەندی ئێوەدا دەیکەم، وەڵڵاهی تەنها لەبەر ئەوەی دەبینم عەرەب بەتێکڕا خۆیان کۆکردۆتەوە و بوون بەیەك بۆتان و لەهەموولایەکەوە لەبۆسەدان بۆتان و دەیانەوێت پەلامارتان بدەن ویستم بەشتێك لەهێزو توانایان تێك بشکێنم بۆتان ئەوەندەی بکرێت و لەتوانادا بێت)).

سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە و ئەوان لەسەر شیرك وبت پەرستی بووین، خودامان نەدەناسی و بەندایەتیشمان بۆ نەدەکرد ئەوان ئەیان دەتوانی یەك دەنکە خورماشمان لێ بخۆن مەگەر بەکڕین و فرۆشتن و میوانداری ئەبێت ئێستا دوای ئەوەی کە خودا ڕێزی لێ گرتووین بەئیسلام و ڕێنمای کردووین و موسوڵمان بووین و بەهۆی تۆوە بەعیزەتی کردووین ماڵی خۆمانیان پێ بدەین وەڵڵاهی ئێمە کاری وانا کەین و پێویستمان بەوە نی یە، وەڵڵاهی هیچ شتێکیان نادەینێ مەگەر شمشێر ئەبێت هەتاکو خودای گەورە نێوان ئێمە وئەوان یەکلا دەکاتەوە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە تۆ و پەیمانەکە)) سەعدی کوڕی موعاذ ڕێکەوتننامەکی وەرگرت و ئەوەی تێیدا نوسرابوو ڕەشی کردەوە و فەرمووی: " دەبا شەڕمان لە دژ بەرپابکەن "[٢٣٩].

---

(٢٣٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧٨/٣) (رقم: ٧١٦)، والطبري (التأريخ) (٥٧٢/٢)، وهو مرسل، واورده محمد بن طاهر البرزنجي في (صحيح تأريخ الطبري) (برقم: ١٤٩).

# بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بۆ پەرتەوازەکردنی ڕیزی دوژمنان

لەنێوان ڕیزەکانی دوژمن دووبەرکی و درزتیکەوتنێکی سەرەتایی دەستی پێکرد بەهۆی نەبوونی متمانەی هەریەکەیان بەوی تریان و باوەڕ نەبوونی تەواویان لەبەشداریکردنیان لەو جەنگەدا، پێغەمبەری خودا ﷺ هەوڵی زۆری دا بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی ئەو ناکۆکی و دووبەرەکیە و وەقۆستنەوەی ئەو هەلە بۆ لێکترازاندنی بەرەی موشریکەکان، لە کۆتاییدا ئەو هەڵمەتە ڕاگەیاندنە جەنگیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا وە بووە هۆی چاندنی گیانی دوو دڵی و گومان و نەمانی متمانە لە نێوان سەرکردەکانی (ئەحزاب)دا لە موشریکەکان وجولەکەکان ئەوەش هێزو وریایی تێك شکاند وپارچە پارچەی کردن ئەو کردارەش تێك ناگیرێت لەگەڵ بنچینەی شەرعیەکان بەتایبەتی ئەو بنچینەیەی کە دەفەرموێت: (جەنگ فرِوفێڵ و تاکتیکە).

لەو بارەوە دوو گێڕانەوە هەیە گێڕانەوەی موسی کوڕی عوقبە و ئین و موسەیب و عوروە کەگێڕانەوەیەکی باشە(حسن)ە لەگەڵ گێڕانەوەکەی ئیبن ئیسحاق کە بەبێ ئیسنادە. ئێمە لێرەدا هەر دوو گێڕانەوەکە باس دەکەین:

١- موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (ئەبوسوفیان ناردی بۆلای بەنی قورەیظە کەمانەوەمان لەم شوێنە درێژەی کێشا و هەرچی پێمان بوو لە ئازوقە خواردمان و هیچ شتێکمان بەدەستەوە نەماوە کە پشتی پێ بەستین، گەروا بڕوات دوچاری قات و قڕی دەبین وئابڕومان دەچێت، ئێمە دەمانەوێت هێرش بکەینە سەر محمد و هاوەڵانی تا خودا نێوانی ئێمەو ئەوان یەکلای دەکاتەوە و بەلایەکدا دەیخات ئێوە لەم بارەوە دەڵێن چی؟ هەر بەهەمان شێوەش وتیان: ئەوە بۆ چوونێکی زۆر باشە ئەگەر دەتانەوێت هێرش بکەن و دەست و بردی لێ بکەن ئێمە لەگەڵتانین بەمەرجێك ئێوە چەندەها پیاوتان بەبارمتە بنێرنە ناومان.

لەگێڕانەوەیەکی تردا [بەنی قورەیظە ناردیان بۆ لای ئەبوسوفیان: کە چەندین پیاوی خۆتان بەبارمتە بنێرنە لامان با لەناو قەڵاکانمان بن لەگەڵماندا بەمەبەستی متمانە بەیەك کردن هەتاکو ئێمە لەلای خۆمانەوە لە پشتەوەی مەدینە شەڕلەگەڵ محمد بکەین

وتێوەش لە لای سەروی خەندەقەوە شەڕ لەگەڵ محمد بکەن ئەوکارەش زۆر سەخت و دژوار بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ کەلە دوو لاوە جەنگ بکات لەگەڵ دوژمنەکانی][٢٤٠] لەو کاتەدا پیاوێك لە بەنی ئەشجەع هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەناوی نوعەیمی کوڕی مەسعود [کە هەر دوولا (قورەیش و جولەکەکان) متمانەیان پێ دەکرد و کەسایەتیەکی باوەڕ پێکراویان بوو] لەگەڵ ئەوەشدا قسەی لە لانەدەما و زوو بڵاوی دەکردەوە و دەیهێنا و دەیبرد ئەوەی بیستبوو کە قورەیش و غەطەفان نێردراویان ناردوە بۆ لای بەنی قورەیظە و وە ئەوەش کە پێیان گەیشتۆتەوە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی ئاماژەی بۆ کرد ئەوەش لەکاتی عیشادا بوو نوعەیمی کوڕی مەسعودیش هات هەتاکو چووە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەناو دەوارەکەی خۆی کە تورکی بوو چەندین کەس لە هاوەڵانیش لە خزمەتیابوون پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: دەنگ و باس چی یە؟ وتی: [من لە لای عویەینە و ئەبوسوفیان بووم] وەڵلاهی تۆ توانای ڕووبەڕووبونەوەی ئەوانت نی یە هەموویان خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ هێرش هێنانە سەرتان ئەوان دەیانەوێت لەپڕ هەڵکوتنەسەرتان بۆ ئەو مەبەستەش ناردوویانە بۆ لای بەنی قورەیظە: کە مانەوەیان لێرەدا درێژەی کێشاوە و هەرچی پێیان بووە بەدەستیانەوە نەماوە و دوچاری وشکە ساڵی و قات و قڕی بوون، ئێمە پێمان خۆشە لەپڕ پەلاماری محمد و هاوەڵانی بدەین بە زووترین کات ئازگارمان بێت لە دەستیان بەنی قورەیظەش لە وەڵامدا وتویانە: ئەوە باشترین بیروڕایە هەر کاتێك ویستان دەست پێ بکەن ئەو کات چەندین کەسایەتی خۆتان بەبارمتە بنێرنە لامان ئینجا مەگەر خۆتان دەنا یەك کەس پێشمان ناکەوێت لە هێرش کردنە سەریان. [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((دەگونجێ خۆمان فەرمانمان بەوشێوە پێ کردبن)) نوعەیم پیاوێك بوو قسەی لە لای نەدەما هەستا و فەرموودەکەی پێغەمبەری بیست و بردی بۆ ناو (ئەحزاب) عومەر ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر ئەو کارەت فەرمانێکە لە خواوە لەسەری سوربەو جێ بەجێ بکە وە گەر تەنها بیروڕای خۆتە ئەوە قورەیش و بەنی قورەیظە پلەو پایە وناستیان زۆر لەوە نزمترە کەکەسێك بەناوی تۆوە وتەیان لە بارەوە بڵێت گوایە کە تۆ فەرموتە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ئەو

(٢٤٠) اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٦٥) وقال محققه الحديث من مراسيل عروة والإسناد اليه صحيح.

پیاوەم بۆ بگێڕنەوە)) ئەوانیش گێڕایانەوە][٢٤١]. پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((من شتێکت بەنهێنی لاباس دەکەم لای کەس مەیدرکێنە و باسی مەکە)) ئەویش وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەوانە (مەبەستی بەنی قورەیظە بوو) نێردراویان ناردووە سوڵح بکەین تا من بەنی نەضیر بگێڕمەوە بۆ سەر ماڵ و موڵکی خۆیان)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا: [جولەکەکان وەك دڵنیاییەك ناردوویانە بۆ لام گەر من ڕازی بم ئەوان چەندین پیاوی گەورە و خانەدان لە قورەیش و غەطەفان بەبارمتە وەردەگرن و تەسلیم بەمنیان دەکەن تا بیان کوژم][٢٤٢]. نوعەیم لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا ڕۆیشت بەرەو لای غەطەفان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((جەنگ فرۆفێڵ و تاکتیکە بەڵکو خودا بەهۆی ئەم کارەوە شتێکمان بۆ بکات)) [نوعەیم ڕۆیشت هەتاکو گەیشتە لای عویەینە و ئەبوسوفیان وتی: دەتانەوێت گوێ بگرن فەرموودەیەکی محمدتان پێ بڵێم کە ڕاستە و گومانی تێدا نی یە وتیان: بەڵێ، وتی: من لەخزمەتیا کاتێك باسی بەنی قورەیظەم کرد لە بارەی پەیمان شکێنیەکەیانەوە. فەرمووی: ((لەوانەیە خۆمان فەرمانمان پێکردبن بەو کارە)) ئینجا نوعەیم بەعویەینە و ئەبوسوفیانی وت: کەبەنی قورەیظە دانوستانیان کردووە لەگەڵ محمد لەسەر ئەوەی کە هاوئاینەکانیان لەبەنی نەضیر بۆ بگێڕێتەوە سەر جێگا و ڕێگای خۆیان و موڵکەکانیان پێ بداتەوە... لەبەرامبەردا ئەوان ئەو بارمتانەی کە لە ئێوەی وەردەگرن بیدەنێ و لەگەڵ ئەودا لە دژی ئێوە بجەنگن و هەر دوولا دووبارە بگەڕێنەوە سەر ئەو پەیمانەی کە پێشتر لە نێوانیاندا بوو. ئەبوسوفیانیش ڕۆیشت بۆ لای پیاو وماقوڵانی قورەیش و وتی: لە ناو خۆتاندا ڕاوێژم بۆ بکەن بەڕاستی ئەوەندە ڕایان گرتین تا بێ زاریان کردین و لە تاقەتماندا نەما ئەوانیش شاری خۆیانە، وتیان: ئێمە پێمان وایە بگەڕێنەوە و چیتر لێرەدا نەمێنینەوە بێ هۆ، بەڕاستی ئەو قسانەی کە نوعەیمیش دەیکرد هەموو بەڕاست گەڕان.... بەڕاستی ئەو جولەکانە خەڵکانێکی خائن و ناپاکن ئەو

[٢٤١] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧) عن سعيد بن المسيب ومراسيلة صحيحة عند اهل العلم.

[٢٤٢] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٤٧)، وقال محققا (السيرة) لابن هشام (٣/١٨٦) رقم (٧٢٤): اسناده حسن.

کەسانەی کە بۆ بارمتە دانرا بوون گوێ بیستی ئەم قسانەبوون وتیان: وەڵاهی ئێمە بەهیچ جۆرێك ناچینە ناو قەڵاکانیانەوە چونکە لە خۆمان دڵنیانین کە بەرامبەرمان هیچ شتێك نەکەن، ئەبو سوفیان وتی: با پەلە نەکەین هەتاکو نێردراوی خۆمان دەنێرین بۆلایان تاکو بەڕوونی بۆمان دەرکەوێت ئەوان بەنیازی چین. ئەبوسوفیان عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و چەند سوار چاکێکی نارد بۆ لایان و ئەو شەوەش شەوی شەممە بوو ئەوان گەیشتنە لایان و کەوتنە قسەکردن لەگەڵیان  و وتیان: ئێمە سبەینێ دەست بەشەڕکردن دەکەین ئێوەش وەرنە پاڵمان و تا هێرش بکەینە سەریان، ئەوانیش وتیان: سبەینێ شەممەیە و ئێمەش هەرگیز لەشەممەدا شەڕ ناکەین، عیکریمە وتی: ئێمە توانای مانەوەمان نەمانەوە لێرەدا هەرچی پێمان بوو وە لەدەستمان دابوو هەمووومان خوارد و هیچمان بەدەستەوە نەمانەوە و هیچ لەوەڕێکیش دەست ناکەوێت پشتی پێ ببەستین بۆ ئاژەڵەکانمان، جولەکەکان وتیان: ئێمە لەڕۆژی شەممەدا هیچ کارێکمان بەجەنگ و هەرا نی یە، بەڵام ئەگەر دەمێننەوە بۆ ڕۆژی یەك شەممە و بارمتەکانیشتان دەنێرن بۆ لامان تا لە گەڵماندا بن لەقەڵاکە ئەوکات ئێمە دەست بەکاردەبین لەگەڵتاندا ئینجا عیکریمە گەڕایەوە وتەواو نائومێد بوو لە پشتیوانیان، [ئەبوسوفیان وتی: ئێوە لە ناو بۆ سەو پلانی فرت و فێڵاوی بەنی قورەیظە دان بارکەن بابڕۆینەوە] ...)[٢٤٣].

٢- گێڕانەوەی دووەم گێڕانەوە ئیبن ئیسحاقە (رحمه الله) دەفەرموێت: (پاشان نوعەیمی کوڕی مەسعود کوڕی عامر....هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ: من موسوڵمان بووم و خزمەکانم بە موسوڵمان بوونەکەمیان نەزانیوە فەرمانم پێبکە بەهەرشتێك خۆت دەتەوێت و پێت باشە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((انما انت فینا رجلٌ واحدٌ فخذّل عنا ان استطعت فانّ الحرب خدعة)). واتە: ((تۆ لە ناو ئێمە تەنیا

---

[٢٤٣] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤٠٤/٣) عن موسى بن عقبة وهو من اصح المغازي كما في رواية البيهقي (الدلائل) (١٠١/٣) عن محمد بن الضحاك قال: (كان مالك رحمه الله اذا سأل عن المغازي قال: عليك بمغازي الرجل الصالح موسى بن عقبة فانه من اصح المغازي). واللفظ هنا له والزيادات لعبد الرزاق وعروة وسعيد بن المسيب رحمهم الله تعالى.

کەسێکی ئەوەندەی دەتوانێت خەڵکمان لەکۆڵ کەرەوە و دووبەرەکی بخەناویان چونکە جەنگ فروفێڵ و پلانە)).

نوعەیمی کوڕی مەسعود ﷺ ڕۆیشت هەتاکو گەیشتە لای بەنی قورەیظە کە دۆست و هاونیشنی سەردەمی نەفامیان بوو پێی وتن: ئەی بەنی قورەیظە ئێوە دەزانن من چەندە ئێوەم خۆش دەوێت بەتایبەتی ئەو دۆستایەتی و گەرم و گوڕیەی کە لەنێوانمان دا هەیە. وتیان: ڕاست دەکەیت: هیچ کەس لەوان ناگاتە پایەی تۆ لای ئێمە پێی وتن: قورەیش و غەطەفان وەك ئێوە نین، ئەم شارە شاری خۆتانە و ژیان و گوزەرانتانی تێدایە و ماڵو ژن و منداڵ و مۆڵکتان لەسەریەتی ناتوانن بۆ شوێنی تر بڕۆن و دەست بەرداری بن قورەیش و غەطەفان هاتوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ محمد ﷺ و هاوەڵانی، ئێوەش پشتیان دەگرن لە دژی محمدا لەکاتێکدا ئەوان مەنزلگا وژن و منداڵ و مولکیان لە شوێنێکی ترە وەکو ئێوە نین بەردەست بکەون ئەگەر هەلێکیان بۆ ڕەخسا هەڵدەکوتنە سەر مەدینە و داگیری دەکەن ئەگەرنا شکست خواردن بەو جۆرە کاریان تێ ناکات و دەگەڕێنەوە سەر جێگا و ڕێگای خۆیان، ئێوەش لەگەڵ ئەو پیاوەدا لێرە بەتها جێ دەهێڵن و ئێوەش تەنها توانای خۆڕاگرتن و بەرەنگاری ئەوتان پێ ناکرێت، ئەگەر بەقسەی من دەکەن مەچنە شەڕەوە لەگەڵیاندا لە دژی محمد ﷺ هەتاکو چەندین کەس لە پیاو ماقوڵانیان بە بارمتە لێ وەرنەگرن کە بۆ دڵنیایی و متمانە لە ژێر ڕکێفی خۆتان بن لەسەر ئەوەی کەلەگەڵیان دەچنە جەنگی محمدەوە ﷺ هەتاکو لایەك بەلایەك دەبێت لەگەڵ ئەودا (مەبەستی (پێغەمبەر ﷺ) بوو وتیان: بەڕاستی ئامۆژەت بەڕەنی و بۆ چونێکی جوان کرد.

پاشان ڕۆیشت لەلای ئەوان هەتاکو گەیشتە لای قورەیشیش بە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و ئەو پیاوانەی لەگەڵیدابوون لە هۆزی قورەیش وت: ئێوە دەزانن من چەندەم خۆش دەوێن و چەندەش جیاوازی لەنێوان من و محمدا ﷺ هەیە ئەو شتێکی پێ ڕاگەیاندووم پێم وایە ئەرکە لەسەرم وەك ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بەئێوەی ڕابگەیەنم بەمەرجێك نهێنی بێت وبەکەس نەڵێن. وتیان: زۆر باشە وا دەکەین. وتی: بزانن کەجولەکەکان پاشگەزبوونەتەوە لەوەی کەڕوویداوە لەنێوان خۆیان ومحمددا ﷺ جولەکەکان نێراوی خۆیان ناردوتە لای (محمد) و پێیان وتووە: ئێمە پەشیمانین لەوکارەی کەکردمان لەهەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە ئایە بەوە لێمان ڕازی دەبیت کە چەندین پیاو

ماقوڵ و سەرکردەی هەر دوو هۆزی قورەیش و غەطەفان وەربگرین و بەبارمتە و ببەیند دەستان تا لەگەردنیان بدەیت، پاشان ئێمە لەگەڵتدا دەبین لەدژی ئەوانەی تریان هەتاکو لەرەگ و ریشەوە دەریان دێنین ئەویش بەنێراوە کەیاندا وەڵامی بۆ ناردونەوە ورازی بوو لەبەر ئەوە ئەگەر جولەکەکان ناردیان بۆلاتان داوای بارمتەیان لێکردن لەپیاوانتان ئەوە بەهیچ جۆرێك تەنها یەك کەسیان نەدەنێ. پاشان رۆیشت هەتاکو گەیشتە لای هۆزی غەطەفان و وتی: ئەی هۆزی غەطەفان ئێوە خزم و کەسی هۆزی خۆمن وەخۆشەویسترین خەلکین لەلام وەنابینم لای ئێوە بێ رێزو بێ بایەخ سەیر بکرێم وبۆ چوونەکانم پشت گوێ بخرێت؟ وتیان: راست دەکەیت تۆ لای ئێمە پشت گوێ ناخرێت و جێگەی بایەخ پێدانی؟ وتی: ئەوەی پێتان دەڵێم بانهێنی بێت لە نێوانمان لای کەس باسی مەکەن. وتیان زۆر باشە وا دەکەین ئەو قسە و باسە چێ یە؟ پاشان نوعەیم ئەوەی بەقورەیشی وتبوو بەئەوانیشی وت چ هۆشیاریەکی بەواندا بوو بەئەوانیشی دا کەوریایی خۆیان بن.

کاتێك شەوی شەممە هات لەمانگی شەوال ساڵی (٥) کۆچی خودای گەورە پشتیوانی لە پێغەمبەرەکەی کرد ﷺ بەوەی کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و سەرکردەکانی غەطەفان عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل لەگەڵ چەندین کەسی تر لە قورەیش و غەطەفانییان نارد بۆ لای بەنی قورەیظە وپێیان وتن: ئێمە هیچی تر ناتوانین لێرەدا بمێنینەوە ئەسپ وشترەکانمان خەریکە لەناودەچن لەبێ لەوەرپاندا سبەی وەرنەدەرەوە بۆ جەنگ کردن هەتاکو هەلکوتینە سەر محمد ﷺ و سزای بدەین بەجۆرێك هیچ شتێك نەهێڵینەوە لەنێوان خۆمان و ئەودا ئەوانیش نوێنەریان ناردەوە بۆ لایان و پێ یان وتن: کە سبەی رۆژی شەممەیە ئێمە لەو رۆژەدا هیچ شتێك ناکەین، ئێوە شاراوە نییەلاتان کە لەمێژووی ئێمەدا قەومەکەمان لەوەوپێش لەورۆژەدا کارێکیان کردووە و دوچاری سزا بوون، ئێمە لەگەڵ ئەوە نین و بەژداریش لەگەڵ ئێوەدا ناکەین بەوەی شەڕ لە دژی محمد ﷺ بکەین مەگەر چەندین کەسی خۆتان بەبارمتە بدەن بە ئێمە بۆ دڵنیابوون و متمانەی نێوانمان وە لە زۆر رێکیفی ئێمە دابن ئەوەك ئێوە شکست بخۆن پاشان بەپەلەو هەڵەداوان بگەرێنەوە بۆ جێگە و رێگەی خۆتان و ئێمەش لێرەدا بەجێ بهێڵن بەتەنها ئەو پیاوەش لەولاتی ئێمەیە و ئێمەش توانای رووبەروبونەوەو بەرەنگاری ئەومان نی یە.

کاتێك نێردراوەکانیان گەڕانەوە بەو وتانەی کە بەنو قورەیظە پێیان وتبون، قورەیش و غەطەفان وتیان: وەڵڵاهی ئەو قسانەی نوعەیمی کوڕی مەسعود دەیکردن هەمموو ڕاست دەرچوون، ئەوانیش نێردراویان ناردوە بۆ لای بەنی قورەیظە و پێیان وتن: وەڵڵاهی ئێمە یەك کەستان بەبارمتە لەنێوان خۆماندا بۆ نانێرین تا لەلاتان بێت، ئەگەر دەتانەوێت جەنگ بکەن ئەوە وەرنە خوارەوە لە قەڵاکانتان و لەگەڵ ئێمەدا بن و شەڕ بکەن، بەنی قورەیظەش، لەوکاتەدا کە کۆتا نێردراوی موشریکەکان نێردرایەوە بۆ لایان بۆ ئەو مەبەستە وتیان: ئەوەی نوعەیمی کوڕی مەسعود بۆی باس کردن بەڕاست گەڕا، ئەوانە هیچ شتێکیان ناوێت تەنها شەڕکردن نەبێت لەگەڵیان لە دژی محمد ﷺ، ئەگەر هەلێکیان بۆ ڕەخسا ئەوا لە دەرفەتێکدا دەستی خۆیان دەوەشێنن وە گەرنا دوچاری شکست بوون ئەوان بەپەلەو ڕاکردن خۆیان دەگەیەنە وەجێگەو ڕێگەی خۆیان ونێوانی ئێمە و ئەوپیاوەش جێ دەهێڵن لەشوێن و هەواری خۆماندا تا ئێمە خۆمان بە تەنها ڕووبەرووی ببینەوە. ئینجا ناردیان بۆ لای قورەیش وغەطەفان وتیان: وەڵڵاهی هەتاکو بارمتەکانی خۆتانمان پێ نەدەن ئێمە بەشداری لەم جەنگەدا ناکەین ئەوانیش ڕەتیان کردەوە و ڕازی نەبوون، خودای گەورەش لێکی جیاکردنەوە و دووبەرکی خستەناویانەوە[٢٤٤].

[٢٤٤] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٨٥/٣) رقم (٧٢٤) عن ابن اسحاق بدون اسناد، وكذلك فعل الطبري في (التاريخ) (٥٧٧/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٤٤٥/٣)، وقد ضعف هذه الرواية الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٣٣٢) وكذلك العمري في (السيرة الصحيحة) (٤٣٠/٢) واورده محمد بن طاهر البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (رقم: ٢٢٢).

# زانینی بارودۆخی موشریکەکان

وردی موشریکەکان ڕووخا بەهۆی درێژبوونەوەی گەمارۆ وئابلوقەکەی سەر شاری مەدینە و هەلکردنی زریان و بایەکی بەهێزی وەها کەخێمە و دەوارەکانی هەلکەندو وئاگرەکانی کوژاندنەوە و مەنجەڵەکانیانی سەرەو نخون دەکردنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی گرۆهـ و تاقمەکان زۆر لێك دوور بوو لەبیروڕادا قورەیش دەیویست دەست لەموسوڵمانەکان بووە شێنێت ولەبنیان دەربهێنێت بۆ دەستەبەرکردن و دڵنیاکردنی ڕێگای بازرگانیان و سەرخستنی بیروباوەڕی پوچی بت پەرستی، بەڵام دەشتەکی و خێڵەکییەکان سەرکەوتنێکی خێرایان دەویست کەهەڵکوتنە سەرمەدینە و تاڵانی بکەن و دەسکەوتێکی باش دەست بخەن، وەجولەکەکانیش کەوتبونە گێژاوی گومانەوە لە هەڵوێستەکەی خۆیاندا لەوەدا کە بەژداری جەنگ نەکەن و نەچنە ناویەوە لەترسی ئەوەی ئەحزاب بەتەنها جێیان بهێڵن لەبەرامبە موسوڵمانانندا)[٢٤٥].

پێغەمبەری خودا ﷺ هەستی بەجموجوڵێکی نائاسایی دەکرد لە ناو ڕیزەکانی سوپای موشریکەکان بۆیە دەویست یەکێك لەهاوەڵانی بنێرێت بۆ ئەوەی دەنگ و باسی ئەوانی بۆ بهێنێت، بۆ ئەم کارە گرنگەش حوزەیفەی کوڕی یەمانی ئەنصاری هەڵبژارد ﷺ چونکە ئەو دەیزانی کە حوزەیفە زۆر بەجوانی و بەو پەڕی شارەزایەوە توانای خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو کارە گرنگ و ترسناکە کە داوای لێکراوە بەبێ کەم و کوڕی ئەنجامی بدات. ئەم ڕووداوەش حوزەیفە ﷺ خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە بەدرێژی ئێمەش دەمانەوێت چیرۆکەکە بەگشتی و بێ کەم و کوڕی باس بکەین هەرلەبەر ئەوەش ڕووداوەکەمان کۆکردەوە لەکۆمەڵێك سەرچاوە و هەوڵماندا وە گونجاو و یەك لە دوای یەکی لەنێوان ڕووداوەکەدا هەبێت لەدوای ئەوانە ڕەوداوەکەش بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت.

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵی دووبەرکی و ناکۆکی نێوان موشریکەکان و ئەو لێك جیابونەوەی خودا خستیە ناو ڕیزەکانیانەوە گەیشتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو کارەی کە لەلایەن نوعەیمەوە ئەنجامدرا [پێغەمبەر ﷺ ویستی

[٢٤٥] انظر: (السيرة النبوية الصحيحة) (٢/٤٣٠).

کەسێك بنێرێت بۆ ئەوەی بزانێت کەموشریکەکان چیان بەسەر هاتووە و دەنگ و باسیان چی یە] پێغەمبەر ﷺ لەخەندەکە هاتە دەرەوە و بانگی حوزەیفە کوڕی یەمانی کرد ﷺ وە ناردی بۆ ناویان بۆ ئەوەی سەرنج بدات تا بزانێت موشریکەکان ئەمشەو چی دەکەن....

حوزەیفە ﷺ دەفەرموێت: [شەوی غەزای ئەحزابمان بینی و بەزداریمان کرد و هەموو بەدانیشتنەوە ڕیزمان بەستبوو بەرامبەر دوژمنەکانمان، ئەبوسوفیان و ئەوانەی لەگەڵیدا بوو لە ئەحزاب کەوتبونە لای سەرومان وە وبەنی قورەیظە و جولەکەکانیش کەوتبوونە لای خوارەوەمان وە پشتەوەمان، ئێمە دەترساین لەوەی دەستیان بگات بە ژن ومنداڵەکانمان، هیچ شەوێکی وەك ئەو شەوەمان بەسەردا نەهاتووە، ئەوەندە تاریك و شەوە زەنگ و بایەکی بەهێزی تێدا هەڵکردبوو ئەوەندە بەهێز بوو نوزەنوز و دەنگی دەهات، دەتوت زریان و هەورەتریشقەیە تاریکییەکەی بەجۆرێك بوو کەس ئەنگوست و قامکی خۆی نەدەدیت، لەوکاتەدا دووڕووەکان داوای ڕوخسەتی چوونە ماڵەوەیان لەپێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد کە گوایە ماڵەکانیان دەکەوێتە دەرەوەی شار و هیچ بەربەست و ڕێگرێکی لەبەردەم دانی یە و دوژمن بەئاسانی دەستی پێیان دەگات لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیان نەدەکرد تەنها لەبەر خۆ دزینەوەیان بوو، هەرکەسێکیان داوای ڕوخسەتی بکردایە ئەوانی تریان یەك لەدوای یەك خۆیان دەدزیەوە ئێمەش لەوێدا تەنها سێ سەد کەس دەبووین یاخود نزیکەی سێ سەد کەس] [وە ئەو شەوە بایەکی زۆر بەهێز هەڵیکردبوو وەزۆر ساردیش بوو] [خەڵکەکە کەسی بەدەوری پێغەمبەری خوداوە ﷺ نەمابوونەوە بڵاوەیان لێکردبوو... تەنها دوانزەکەس لە خزمەتیدا مابوونەوە].

[پێغەمبەر ﷺ شەو نوێژی دەکرد لەکاتێ نیوەشەودا، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی: ((من رجلٌ يقوم فينظر لنا ما فعل القوم ثم يرجع؟)) يشترط له رسول الله ﷺ الرجعة ((اسأل الله تعالى ان يكون رفيقي في الجنة)) واتە: ((ج کەسێك هەڵدەستێت بڕوات تا بزانێت ئەو موشریکانە دەنگ وباسیان چی یە و چی دەکەن پاشان هەواڵەکەمان بۆ بهێنێت و بگەڕێتەوە؟)) پێغەمبەری خودا ﷺ مەرجی بۆ دانا کە بگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ کارێك ئەنجام بدات: ((فەرمووی داوا دەکەم خودای گەورە بیکات بەهاوەڵم لەبەهەشتدا)) هیچ کەسێك لە ناو خەڵکەکەدا هەڵنەستا لەترسی برسیەتی و سەرما و مەترسی دوژمن]

[ئێمەش خۆمان بێ دەنگ کرد وهیچ کەسمان وەڵاممان نەدایەوە بۆ جاری دووەم و سێیەم دووبارەی کردەوە و فەرمووی]: [((الا رجلٌ يأتي بخبر القوم يكون معي يوم القيامة)) واتە ((ئایە کەسێك نی یە دەنگ و باسی ئەو موشریکانەمان بۆ بێنێت ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دا لەگەڵ مندا بێت))] [کاتێك هیچ کەس هەڵ نەستا] [یەك بەیەك تەماشای کردین هەتاکو گەیشتە سەر من منیش هیچ شتێکم پێ نەبوو لەسەرما وە لە دوژمن بمپارێزێت تەنها ئەو کراسە نەبێت کە هی هاوسەرەکەم بوو لەسەر چۆکم تێنەدەپەڕی دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ گەیشتە لام و من لەسەر چۆك دانیشتبووم فەرمووی: ((ئەوەکێ یە؟)) منیش وتم: حوزیفەم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێم خۆش نەبوو هەستم هەتاکو ئەمنێرێت فەرمووی: ((هەستە))] [کاتێك (بەناوی خۆم بانگی کردم) هیچ شتێکی بۆ نەهێشتمەوە کەبوارم پێبدات کە هەڵنەستم فەرمووی:

((حوزەیفە بڕۆ ناو موشریکەکان بزانە چی دەکەن و بەنیازی چین [بەهیچ جۆرێك جموجۆڵێکی مەترسیدار لە دژیان ئەنجام نەدەیت] لەبەر ئێمە وهیچ قسەیەکیش ناکەیت هەتاکو دەگەڕێتەوە لامان چونکە ئەوان جوڵەیان ناناساییە و هەواڵێکیان لەلاهەیە هەرشتێك هەبوو ئەو هەواڵ و دەنگ و باسەمان لەوانەوە پێ بگەیەنەرەوە))] [وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ناردووە بۆیە لەبەرت هەڵنەستام شەرمم کرد لەتۆ ولەبەر برسیەتی وسەرما بوو ئەو هەڵوێستەم نواند [کاتێك باسی برسیەتم کرد پێغەمبەری خودا ﷺ پێ کەنی] و فەرمووی: ((بڕۆ ئەی کوڕی یەمان ترست نەبێت لەسەرما و گەرما هەتاکو دەگەڕێیتەوە لام))] [ئینجا منیش ڕۆیشتم] [ومن لە هەموویان زیاتر سەرما و دڵەخورپەم بوو کەڕۆیشتم پێغەمبەری خودا ﷺ بۆم پاڕایەوە لەخودا و فەرمووی: ((اللهم احفظه من بين يديه ومن خلفه و عن يمينه و عن شماله وعن فوقه ومن تحته)) واتە: (خودایە بیپارێزە لەپێشەوەی و لەپشتەوەی و لەلای ڕاستی و لەلای چەپی و لەلای سەرەریەوە وە لە ژێرەوەی [هەتاکو دەگەڕێتەوەلامان]))، وەڵلاهی هەرچی ترس لە دڵەڕاوکێ و سەرما لەلاشەمدا بوو هیچی نەما وهەستم بەهیچ دڵە خورپەو سەرمایەك نەدەکرد] [شمشێر و تیروکەوانەکەم هەلگرت و پاشان خۆم توند و تۆلکردەوە و بەرەو لای ئەوان بەڕێکەوتم][دەت وت لەناو حەمامدا دەڕۆم] [ڕۆیشتم هەتاکو گەیشتمە ناویان

سەربازەکانی خودا و ئەو بایە بەهێزە ئەوەی پێیان نەگرابوو لەوەو پێش پێی کردبوون هیچ مەنجەڵێکیان بەسەر ئاگرەوە نەمابوو قلْپی نەکردبێتەوە وئاگریانی کوژاندبۆوە وهەرچی دروستیان کردبوو لەدەوارو ڕەشماڵ هەموو تێك وپێك دابوو][لەسەربازگەکەیان نزیك بوومەوە سەیرم کرد ڕووناکی ئاگرێکیانم بەدی کرد دەسوتێت و پیاوێکی زلەی کەتە لەدەوریەتی بەدەستی خەریکی ئاگرەکە بوو فوی لەچیلکەوچەواڵ و پشکۆگان دەکرد بەر لەوکاتە ئەبو سوفیانم نەبینی بوو ئەم دەناسی] [لەوێدا بینیم خەریکی داگیرساندنی ئەو ئاگرە بوو کۆمەڵێکیش لە خۆییان بەدەوریەوە بوون] [هەرچی ئەحزاب و گرۆهەکانی تر بوو هەریەکە بەلایەکدا بلاوەیان لێ کردبوو وەلەدەوری ئەو نەبوون] [پشتی خۆی بەئاگرەکە گەرم دەکردەوە، تیرێکم خستە ناو کەوانەکەم و ویستم [لەژێر ڕووناکی ئاگرەدا] تێیگرم ئینجا فەرموودەکەی پێغەمبەرم ﷺ بیرکەوتەوە کەفەرمووی: ((هیچ کارێکی تۆقێنەرانە مەکە بەرامبەریان و مەیان وروژێنە ئەگەر من تێم بگرتایە دەمپێکا و بەری دەکەوت))] [ڕۆیشتم لە ناویان دانیشتم ئەبوسوفیان هەستی کرد یەکێك هاتۆتە ناویان لەخۆیان نی یە] [هەستا و وتی: هۆزی قوڕەیش با هەر یەك لە ئێوە تەماشا بکات بەدیقەت تا بزانێت کێ لەتنیشتیەوەیەتی] [کەسێکیان وتی: ئاگادار بن پێدەچێت سیخوڕێکی دوژمن لە ناوتاندا هەبێت] [هەرکەسێکتان لەناو کۆڕی دانیشتنەکەدایە با دەستی ئەو کەسەی تەنیشتی خۆی بگرێت] [منیش بەدەستی ڕاستم] دەستی ڕاستی ئەو کەسەم گرت [کەلای ڕاستم بوو] پێم وت تۆ کێت؟ وتی: فلانی کوڕی فلانم، [پاشان بەدەستی چەپیشم دەستی ئەو کەسەم گرت کە وتبووە لای چەپمەوە پێم وت [تۆ کێی؟ وتی: فلانم].

ئینجا دڵخۆش بووم و ماوەیەك لەناویاندا بێ کێشە مامەوە، پاشان ئەبوسوفیان وتی: ئەی هۆزی قوڕەیش وەڵاهی ئێوە هیچی تر ناتوانن لێرەدا بمێننەوە و ئیتر شوێن و جێگای ئێوە نی یە ئەوەتا هەموو وشتر وئەسپەکانمان خەریکە لە ناودەچن لەبەر بێ لەوەڕی و نەبوونی خۆراك بۆیان [بەنی قوڕەیظەش ڕاستیان نەکرد لەگەڵماندا] و بەپێچەوانەوە جوڵاونەوە و ئەوەی لە ئەوانیشەوە پێمان گەیشتووە زۆر ناخۆشە و جێگەی دڵخۆشی نی یە، ئەوەتا دەبینن دوچاری ئەو بایە بەهێزەش بووین و چی پێکردووین، ئەدەتوانین بەدڵنیایەوە ئاگرێك بکەینەوە و ئەمەنجەڵەکانمان بۆ لەسەر ئاگردان ڕادەوەستێت و هیچ

پەسارگەو دەوارو ڕەشماڵێکمان بەپێوە نەماوە با باربکەین و بڕۆینەوە ئیتر من نەمزانیبوو
چی تر لێرە نامێنمەوە پاشان هەستا ڕۆیشت بۆلای وشترەکەی کەبسترابۆوە چووە سەر
پشتی دانیشت و تێیخوڕی هەڵیساند لەسەر سێ قاچ هەستا وەڵلاهی هێشتا پەتەکەی
قاچەکەی تریانی نەکردبۆوە کە هەستا لەوێدا گەر لەبەر ئەو پەیمانەی پێغەمبەری خوا
نەبووایە ﷺ کەپێ سپاردبووم هیچ شتێك نەکەم هەتاکو دەگەڕێمەوە خزمەتی ئەگەر
بمویستایە لەوێدا دەم توانی بەیەك تیر بیکوژم] [ئەو خەڵکانە لەوێدا لێم نزیك بوونەوە
بەنی عامربوون دەیان وت: ئەی بەنی عامر: بارکەن بابڕۆینەوە چی تر ناتوانین لەم
شوێنەدا بمێنینەوە ئەو بایەش کەوتبووە ناو سەربازگەکەیانەوە کارێکی پێکردبوون
بەجۆرێك یەك بستیش لەناو ئەوان تێنەدەپەڕی وەڵلاهی گوێم لە دەنگی وردە بەرد بوو
بایەکە دەیهێنا و دەیکێشا بەدەوارو ڕەشماڵەکانیاندا و تەواو هەراسانی کردبوون].

[حوزەیفە ﷺ دەفەرموێت: ئینجا گەڕامەوە دەتوت لە ناو حەمام دادەڕۆم] [لەنیوەی
ڕێگاکەدا بووم و یاخود نزیکی نیوەی بووم گەیشتم بەبیست یاخود لەو نزیکانە لەئەسپ
سوار کە دەمامکی خۆیان کردبوو فەرموویان: هەواڵ بدە بەهاوەڵەکەت کەخوای گەورە بێ
باوەڕەکانی لەکۆڵ کردۆتەوە ولەدەستی ئەوان پاراستویەتی] [ئینجا گەیشتمەوە خزمەت
پێغەمبەری خودا ﷺ دووبارە دوچاری سەرمابوومەوە هەر کەکارەکەم تەواوکرد و گەڕامەوە
لەرز دایگرتمەوە] [ولەسەرمادا کەوتمە لەرزین] [کەگەیشتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ
لەوکاتەدا ئەو بەپێوە وەستابوو نوێژی دەخوێند جلێکی خەت خەتاوی لەبەردا بوو کە هی
یەکێك لە هاوسەرەکانی بوو بەخۆی دا دابوو] [لە ناو نوێژەکەیدا] [ئاماژەی بۆ کردم
بەدەستی موبارەکی کەلێی نزیك ببمەوە منیش نزیك بوومەوە بۆ جاری دووەمیش ئاماژەی
بۆ کردمەوە کەنزیك ببمەوە منیش نزیك بوومەوە] [کاتێك منی دیەوە بەو شێوە خستمیە
پاڵ خۆیەوە] و [بەشێك لەو پۆشاکەی کەبەخۆیدا دا بوو بەسەرم دا شۆڕی کردەوە بۆ
ئەوەی گەرمم بکاتەوە] پاشان گەڕایەوە و کڕنوشی خۆی بردەوە و منیش لەناو
پۆشاکەکەدابوو [پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك دوچاری غەزای ئەحزاب بوو یاخود هەر
نارەحەتیەکی توش ببوایە نوێژی دەکرد] کاتێك [لەنوێژەکەی بۆوە] و سەلامی دایەوە
[فەرمووی: ئەی کوڕی یەمان دەنگ وباسی ئەو خەڵکە چی یە؟)). وتم: ئەی پێغەمبەری

خودا ﷺ هیچ کەسێك بەدەوری ئەبو سوفیانەوە نەماوەتەوە و تەنها چەند کەسێك نەبێت هەموویان بڵاوەیان لێکردووە و ئەو ئاگری بۆ دەکردنەوە خوای گەورە دوچاری سەرمایەکی کردبوون وەك ئەوەی ئێمە توشی هاتین بەڵام تکامان وایە کەپاداشتی لەسەر وەربگرینەوە لەلایەن خواوە ئەوان بەتەمای ئەوەنین] [پاشان دەنگ و باسی موشریکەکانم پێ ڕاگەیاند وەك ئەوەی بینیبووم وە پێشم ڕاگەیاند کە کاتێك من جێم هێشتن ئەوان باریان دەکرد و دەگەڕانەوە] [کاتێك هەواڵەکەم پێی ڕاگەیاند ئەوەندە پێ کەنی هەتاکو ددانەکانی دەرکەوتن لەتاریکی شەودا] و[پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو عەبایەی بەسەر شانیدادا بوو وە نوێژی پێوە دەکرد لەبەری کردم لەبەر ئەو کارە و بەهێواشی ڕۆیشت لەلام منیش خەوم لێکەوت هەتاکو کاتی نوێژ بەیانی کاتێك بەیانی بۆوە پێغەمبەری خودا ﷺ هات و فەرمووی: ((هەستە ئەی خەواڵو)) خودای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ (الأحزاب: ٩) واتە: ﴿ئەی ئەوانەی ئیمان ویاوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتەکانی خودا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست لەم جەنگەیە کەخودا یارمەتی دان) کاتێك سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان ئێمەش بایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردەسەریان کە ئەتان دەبینین خوی گەورە بینا بوو بەهەوڵ وکۆششتان (چۆن خەندەقتان هەڵدەکەند وپاساوانیتان دەکرد)﴾ غەطەفانیش بەکارەکەی قوڕەیشیان زانی ئەوانیش بەهەمان شێوە دواتر بەگورج وگۆڵی و بەپەلە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان][٢٢٦].

---

[٢٢٦] اخرجه: مسلم (٤٦١٦) مختصراً، واحمد (٢٣٣٣٤) وقال محققه: حديث صحيح وهذا اسناد حسن مرسل، وابن هشام (السيرة) (١٨٧/٣)، وابو نعيم (الدلائل) (٤٣٢)، والحاكم (٣١/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٨٠٩) - وابو عوانة (٦٨٤٢)، والبيهقي (الكبرى) (١٤٨/٩) وفي (الدلائل) (٤٥٠/٣، ٤٥١، ٤٥٤) و (٤٠٦/٣) وقال الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٧٣): حديث حسن، واللفظ لابن اسحاق والزيادات لمسلم وابي عوانة والحاكم والبزار وابي نعيم والبيهقي.

# گەڕانەوەی سوپای موشریکەکان

خاتوو عائیشە دایکی باوەڕداران (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (خودای باڵا دەست بایەکی نارد سەر موشریکەکان و باوەڕدارانی پاراست لەوەی دوچاری جەنگ و هەرابن و هەر خاوەن هێز و دەسەڵاتی لەبن نەهاتووە ئەبوسوفیانیش بەخۆی و ئەوانەی کەلەگەڵیدا بوون گەڕانەوە وگەیشتنەوە خاکی (توهامە)، و عویەینەی کوڕی حوصەینی کوڕی بەدر و ئەوانەی لەگەڵیدا بوو گەڕانەوە و گەیشتنەوە خاکی (نەجد) وە بەنی قورەیظەش چوونەوە ناو قەڵاکانیان و خۆیان تێیدا قایم کرد)[٢٤٧].

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (لەو ساتەدا ئەبو سوفیان بانگی بارکردن و گەڕانەوەی کرد وتی: باربکەن و بابڕۆینەوە، ئەوانیش کەلوپەلی قورسیان بارکرد و رۆیشتن بە وشترەکانیان وە ئەسپەکانیشان بۆ ماوەی سەعاتێك لەشەودا وەستان تا بەتەواوی بڕۆن پاشان ئەوانیش بۆی دەرچوون، غەطەفان هاوار و دەنگۆی کەلوپەل پێ چانەوە وبارکردنی قورەیشیان بەرگوێ کەوتبوو ناردیان بۆلای، هەواڵیان بۆ هاتەوە کەباریان کردووە و گەڕاونەتەوە ئینجا ئەوانیش کەوتنە بڵاوەکردن و ڕۆیشتن بەجۆرێك نەدەپرژانەوە سەر هیچ شتێك خودای باڵادەستیش بەر لە بارکردن و ڕۆیشتنیان بایەکی ناردە سەریان بۆ ماوەی زیاتر لە دەشەو هەتا هەرچی دروستیان کردبوو بۆ حەوانەوەی خۆیان لە ڕەشماڵ و دەوار و لەسەر زەویەکەی ئەوێدا خوای گەورە هەمووی تەختی زەویەکە کرد بۆیان هەتا وای لێکردن لەسەر زەویدا سەخترین ناوچە بێت بەلایانەوە و وەلەهەموو شوێنێك زیاتر ڕقیان لێی بێت بەو جۆرە پەرتەوازە بوون بڵاویان لێکرد ئەو نارەحەتیەی بایەکە هێنابوویە سەریان زۆر سەخت بوو لەگەڵ ئەو سەربازە نادیارانەی خوای گەورە نەدەبینران

[٢٤٧] أخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حديث حسن، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن، وابن ابي شيبة (٢٠٨/١٤) والطبراني (٥٣٣٠)، وحسن اسناده الحافظ في (الفتح) (٤٣/١١)، وحسنه ايضا الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٧).

هەروەك خوای بالآدەست دەفەرمویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ (الاحزاب: ٩))[٢٤٨].

سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەفەرمویێت: (...دەستیان کرد بەبارکردن و ڕۆیشتن خوای پەروەردگار بایەکی ناردەسەریان وترسی خستە ناو دڵیان ناگرەکانی کوژاندنەوە و هەموو خێمە و دەوارەکانیان پچراند لێك ترازا و بەشکست و سەرشۆڕیەوە گەڕانەوە بەبێ جەنگ بەرپابوون هەر لەوبارەیەوەکە خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾ (الاحزاب ٢٥) واتە: ﴿خوا کافرانی تێکشکاند و گێڕاندنیەوە دواوە بەخۆیان و کینەو ڕقیانەوە هیچ دەستکەوتێکیان دەست نەکەوت و هەر خوا خۆی ئیماندارانی لە جەنگ پاراست (هەر خۆیشی بەبایەکی بەهێز ولەشکری تایبەتی کافرانی تێکشکاند) جا هەمیشە و بەردەوام خو بەهێزە و بەدەسەلاتە﴾. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی هاندا بەگورجی تا شوێنیان بکەون ئەوەبوو شوێنیان کەوتن هەتا گەیشتنە ناوچەی (حمراء الاسد) پاشان گەڕانەوە)[٢٤٩].

پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی دا بە هاوەڵانی کە قوڕەیش لە دوای ئەم ڕۆیشتنەیانەوە هەرگیز جارێکی تر ناتوانن هێرشیان بێننە سەر و لەناو مەدینەدا شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە خوای گەورە هێز ودەستەڵاتی موسوڵمانان زیاد دەکات ئەوەندە توانایان پێ دەبەخشێت کە ئەوان غەزا لەگەڵ قوڕەیش دەست پێ دەکەن و هێرشیان بۆ دەبەن.

لە سولەیمانی کوڕی صەرد ﷺ دەفەرمویێت: (گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەو کاتەدا کە ئەحزاب ناوچەکەیان چۆڵ کرد هەستا و فەرمووی: ((الآن نغزوهم ولا يغزوننا ونحن نسير اليهم)) [٢٥٠] واتە: ((ئێستا و لە ئەمڕۆ بەدواوە ئێمە دەچین بۆیان و غەزایان لەگەڵ دەکەین ئیتر ئەوان ناتوانن بێننەوە سەرمان)).

---

[٢٤٨] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٠٦).

[٢٤٩] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧)، وابو نعيم (الدلائل) (٤٣٦).

[٢٥٠] أخرجه: البخاري (٤١١٠).

جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا یغزونها بعدکم ابداً ولکن نغزوهم))[٢٥١] واتە: ((لەدوای ئەم غەزایە هەرگیز ناتوانن هێرشتان بێننە سەر بەڵکو ئێمە بۆیان دەچین و غەزایان لەگەڵ دەکەین)).

بەو شێوەیە موشریکەکان گەڕانەوە لەدوای ئەوەی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی شاری مەدینەیان دا بۆ ماوەی بیست وچوار ڕۆژ یاخود مانگێک[٢٥٢]. سەرەڕای ئەو ماوە درێژەش کە گەمارۆ درابوون تەنها هەشت کەس لە موسوڵمانان شەهید بوون لە ناویاندا سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ سەرکردەی ئەوسەکان و ئەنەسی کوڕی ئەوس و عەبدوڵای کوڕی سەهل و طوفەیلی کوڕی نوعمان و ئەعلبەی موڕی لەبەنی غەنمە و کەعبی کوڕی زەید کەشەل بوو لە (بئر المعونة) ڕزگاری بوو بەبریندراری وە ئەنەسی کوڕی موعاذ ﷺ، وەلە موشریکەکانیش سێ کەس کوژران[٢٥٣]. پێغەمبەری خودا ﷺ بەسوپاس گوزاری خودای گەورە وە گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە هەروەك عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك لە غەزا یاخود حەج و عەمرە تەواو دەبوو وە دەگەڕایەوە سێ جار(الله اکبر)ی دەکرد و پاشان دەیفەرموو: ((لاإله الاّ الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير آيبون تئبون عابدون ساجدون لربنا حامدون صدق الله وعده ونصر عبده وهزم الأحزاب وحده))[٢٥٤]. واتە: (هیچ پەرستراوێك نی یە بەحەق تەنها الله نەبێت تاك و تەنها و بێ هاوبەش، موڵکو سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە وە ئەویش بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە گەڕاینەوە و تۆبەمان کرد و بەندایەتی و سوجدە دەبەین سوپاس وستایش بۆ

---

(٢٥١) اخرجه: البزار (١٨١٠)، وقال الهيثمي (١٣٩/٦): رجاله ثقات، وقال الحافظ في (الفتح) (٥١٦/٧): اسناده حسن.

(٢٥٢) اخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٧٣/٢) باسناد رجاله ثقات من مرسل سعيد بن مسيب ومراسيله قوية وهو اقوى ما ورد حول مدة الحصار. كما قال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٢٠١/٢).

(٢٥٣) اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٤٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٧٠): رجاله رجال الصحيح، وابن هشام (السيرة) (٢٠٨/٣)، وابن سعد (٦٨/٢).

(٢٥٤) اخرجه: البخاري (٤١١٦).

پەروەردگارمان دەکەین بەڵێنی خودا ڕاست بوو بەندەی خۆی سەرخست و هەر خۆشی تاقم و کۆمەڵەکانی بێ باوەڕانی تێکشکاند).

سەعیدی کوڕی موسەیب ﷺ دەفەرموێت: (لەکاتێکدا خودای گەورە کۆمەڵی بێ باوەڕانی تێشکاند و پەرتەوازەی کردن حویەیی کوڕی ئەخطبی نضیری جولەکە لەگەڵ موشریکەکان بۆی دەرچوو هەتاکو گەیشتە ناوچەی (روحاء) لەوێدا ئەو پەیمان و بەڵێنەی بیرکەوتەوە کە دابووی بەبەنی قورەیظەی هاو ئاینی خۆی بۆیە لەوێوە گەڕایەوە ناویان هەتا لەگەڵیاندا بێت و ئەویش چووە ناوقەڵاکانیان)[٢٥٥].

## غەزای بەنی قورەیظە

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەیانی بۆوە خودای گەورەی خاوەن دەسەڵاتی بێ سنور دەروی خێری لە پێغەمبەرﷺ موسوڵمانەکان کردەوە و چاوی ڕۆشنکردنەوە بەوسەرکەوتنەی کەپێی بەخشین، ئینجا گەڕانەوە بەرەو شاری مەدینە لە دوای ئەوەی کە دوچاری تاقیکردنەوەیەکی سەخت و دژواربوونەوە وەڕووبەڕووی گەمارۆیەکی نارەحەتی دوژمن بوون لەزستانێکی سەخت دا بۆیە کاتێك گەڕانەوە زۆر ماندوو بوون و چەکەکانیان دانا)[٢٥٦].

بەو شێوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ و موسوڵمانەکان گەڕانەوە لەو غەزایە دوچاری شەکەتی وماندویەتیەکی زۆر هاتبوون، بەڵام خودای گەورە (جوبرەئیل ﷺ)ی ناردە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و فەرمانی پێکرد بەدەرچوون بۆ غەزای بەنی قورەیظە: خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (....پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە مەدینە وچەکەکەی داناو فەرمانی کرد دەوارێك هەڵدرێت لەمزگەوتدا بۆ سەعدی کوڕی موعاذ تا لە نزیکەوە ئاگای لەبرینداریەکەی بێت [وە پێغەمبەری خودا ﷺ چووە شوێنی خۆشۆردن تا خۆی بشوات] [لەوکاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ سەری شانە دەکرد لایەکی داهێنا بوو لایەکی

[٢٥٥] اخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧) عن سعيد بن المسيب ومراسيلة صحيحة.

[٢٥٦] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٠٧) من كلام موسى بن عقبة رحمه الله.

تری مابوو (جوبرەئیل ﷺ) هاتە خزمەتی لەسەر ئەسپەکەی بوو زرێی لەبەردابوو [ئینجا کەسێك لە (أهل البیت) هاتەلامان سەلامی لێکردین ئێمە لەماڵەوە بووین پێغەمبەر ﷺ بەگورجی هەستا و هەتاکو لەدەرگای مزگەوتەکە ڕاوەستا لەلای شوێنی جەنازەکان] [منیش بەشوێنیدا لە درزی دەرگاکەوە بەدەمیە وە چووە دەرەوە] بۆ لای جوبرەئیل ﷺ [منیش بەشوێنیدا لە درزی دەرگاکەوە [بەدەمیە وە چووە دەرەوە] بۆ لای جوبرەئیل ﷺ [سەرمان خستی و پشتیوانت بووین لە سەر شانەکانیشی تۆزو خۆڵی لەسەر بوو فەرمووی: [سەرمان خستی و پشتیوانت بووین لە دژی شەڕکەرەکان] وا دەبینم کەچەکت داناوە، وەڵلاهی فریشتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە و دایانناوە [وە بەدوای موشریکەکان کەوتین هەتاکو (حمراء الأسد)] لەگێڕانەوەیەکی تردا [جوبرەئیل ﷺ فەرمووی بەپێغەمبەری خودا ﷺ: (خودای گەورە لێت خۆش بێت ئەوە چەکەکەت داناوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) فەرمووی: (بەڵام لەو کاتەوە دوژمن بۆت هاتوون ودابەزیون لەدەورت ئێمەی فریشتە چەکمان دانەناوە و ئێستاش ئێمە واین بەشوێنیانەوە و خوای گەورە دوچاری شکستی کردوون و تێکی شکاندوون [تۆش وەرە دەر بۆیان و جیهادیان لەگەڵ بکە، فەرمووی: ((بۆ کوێ))؟ فەرمووی (بۆ ئێرە) و ئاماژەی بۆ لای بەنی قورەیظە کرد][٢٥٨] وە پێی فەرموو: (خوای گەورە فەرمانت پێ دەکات کە شەڕ لەگەڵ بەنی قورەیظەدا بکەیت وەمن و ئەوفریشتانەی کەلەگەڵمدان پشتیوانیتان دەکەین و ئەوان دوچاری ڕاچڵەکین وهەڵتەکاندن دەکەین] تۆش دەرچۆ بۆ لای بەنی قورەیظە و شەڕیان لەگەڵدا بکە [لەسەر ئەو پەیمان شکێنیەی کردیان] [پێغەمبەری خودا بەگورجی بەدەم داخوازیەکەیەوە هاتەدەرەوە و فەرمووی: (([هذا جبریل یأمرني ان اذهب الی بني قریظة] فلبی رسول الله ﷺ لأمته [وقال لأصحابه: عزمت علیکم الاّ تُصلّوا صلاة العصر حتی تأتوا بني قریظة])) [٢٥٩] واتە: (([ئەوە جوبرەئیلە فەرمانم پێ دەکات کە بڕۆم بۆ سەر بەنی قورەیظە]

---

[٢٥٧] اخرجه: احمد (٢٦٣٩٩) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط مسلم.

[٢٥٨] اخرجه: البخاري (٤١١٧).

[٢٥٩] اخرجه: ابو نعیم (الدلائل) (٤٣٦)، والحاکم (٣٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشیخ الالباني في (فقه السیرة) (ص: ٣٣٩): حدیث صحیح.

ئینجا زرێکەی لەبەرکرد و فەرمووی بەهاوەڵانی: [فەرمانتان پێدەکەم کەس نوێژی عەسر نەکات هەتاکو دەگەینە بەنی قورەیظە])). ئینجا فەرمانی کرد بانگ بدرێت بەناو خەڵکدا تا بڕۆن و دەرچن بەرەو بەنی قورەیظە [وفەرمانی پێکردن چەکەکانیان هەڵگرن ئینجا خەڵکەکە بەدەم داواکەیەوە چوون و خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ] پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە دەرەوە و ڕۆیشت [بەلای کۆمەڵێک لەئەنصاریەکاندا] لەبەنی غەنم [کەچاوەڕێی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد] و ئەوان دراوسێ مزگەوت بوون ولەدەور و پشتی بوون پێغەمبەر پێی فەرموون: [((هیچ کەسێك بەلاتاندا تێنەپەڕی))؟] فەرموویان: [دوحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی بەلاماندا تێپەڕی لەسەر ئێسترێك بوو] لەگێرانەوەیەکی تردا [لەسەر ئەسپێکی بەڵەك بوو قوماشێکی قەیفەی ڕووکار سوری لە ژێردا بوو][زرێشی پۆشی بوو]. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە دوحیە نەبوو [ئەوە جوبرەئیل بوو نێردراوە لەلایەن خوداوە بۆ لای بەنی قورەیظە قەڵاکانیان هەڵدەتەکێنێت وترس دەخاتە دڵیانەوە] دوحیەی کەلبی ڕیش و شێوەی دەم و چاوی لە جوبرەئیل دەچوو ﷺ [واتە: جوبرەئیل ﷺ لەسەر شێوەی ئەو دادەبەزی]))[٣٦٠].

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت: (ئێستا دەڵێی تەماشای ئەو تۆز وخۆڵە دەکەم کە بەرز دەبۆوە لەکوچەوکۆڵانەکانی بەنی(غەنم) لەو کاتەدا کۆمەڵی فریشتەکان لەگەڵ جوبرەئیلدا ﷺ دەڕۆیشتن بەرەو لای بەنی قورەیظە)[٣٦١].

کەعب ﷺ دەفەرموێت: (...پێغەمبەری خودا ﷺ بڕیاریدا و فەرمانی بەخەڵکەکە کرد هیچ کەسێك نوێژی عەسر نەکات مەگەر لەبەنی قورەیظە نەبێت و فەرمووی: ((لا یصلین

---

[٣٦٠] أخرجه: احمد (٢٥١٩٧) وقال محققه حسن، وابن ابي شيبة (المصنف) (٢٩٨/١٤)، والطبراني (٥٣٣٠)، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن، وحسنه ايضاً الحافظ في (الفتح) (٤٣/١١) والشيخ الألباني في (الصحيحة) (٦٧). واللفظ له، والزيادات لـ: الحاكم (٣٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (٧٩/١٩) وعبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧)، وابو نعيم (الدلائل) (٤٣٦)، والبيهقي (الدلائل) (٧/٤، ١٢، ١٤) وصححه الحافظ في (الاصابة) (٢٧٤/١)، و (الفتح) (٥١٩/٧).

[٣٦١] أخرجه: البخاري (٤١١٨).

احدٌ العصر الا في بني قريظة)) واته: ((با هیچ كەسێك نوێژی عەسر نەكات مەگەر لەبەنی قوڕەیظە نەبێت)) [خەڵكەكە] چەكیان هەڵگرت وزرێیان پۆشی و دەرچوون كاتێك گەیشتنە بەنی قوڕەیظە كاتی خۆرناوابوون بوو.

لەگێڕانەوەیەكی تردا [هەندێكیان لە ڕێگادا وتیان: نوێژ ناكەین هەتاكو نەگەینە بەنی قوڕەیظە و هەندێكیان وتیان: ئێمە نوێژ دەكەین ئەوە بۆ ئەوە نەبوو كە هەر نوێژنەكەین بەڵكو بۆ ئەوەبوو بەپەلە بگەینە بەنی قوڕەیظە])[٢٦٢] خەڵكەكە كەوتنە ناكۆكی [لەكاتی خۆرناوابووندا] لە سەر نوێژی عەسر هەندێكیان وتیان: نوێژی خۆتان بكەن پێغەمبەری خودا ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە هەر نەیكەن، هەندێكی تریان وتیان: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی بۆ بڕیارداوین كە بەهیچ جۆرێك نوێژ نەكەین هەتاكو دەگەینە بەنی قوڕەیظە وە ئێمە لە ژێر ئەمرو فەرمانی پێغەمبەرداین هیچ گوناهمان لەسەر نانوسرێت، كۆمەڵێكیان نوێژیان كرد بەبڕوای تەواو بە تەمای پاداشت و كۆمەڵێكی تریشیان نوێژیان نەكرد هەتاكو گەیشتنە بەنی قوڕەیظە ولەوێ دابەزین لەو كاتەدا خۆرناوابوو ئینجا نوێژیان كرد بەو پەڕی بڕوای تەواو بەنیازی پاداشت دواتر ئەوەیان [بۆ پێغەمبەر ﷺ باس كرد] پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ كەسێكی [لەو دوو كۆمەڵە] سەرزەنشت نەكرد)[٢٦٣].

پێغەمبەری خودا ﷺ كە ڕۆیشت عەبدوڵلای كوڕی ئوم مكتومی لەجێگای خۆی دانا لەشاری مەدینە بۆ سەرۆكاری شارەكە[٢٦٤]. عوروەی كوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ عەلی كوڕی ئەبو طالیبی ﷺ نارد بۆ پێشڕەوی سوپاكەو ئاڵایەكی دایە دەست وفەرمانی پێكرد كەبڕوات سوپاكە ببات و لای قەڵای بەنی قوڕەیظە بیان وەستێنێت ئەویش فەرمانەكەی بەجێ هێنا ئینجا پێغەمبەری خواش بەشوێنیدا ڕۆیشت....)[٢٦٥].

---

(٢٦٢) اخرجه: البخاري (٤١١٩)، ومسلم (٤٥٧٧) وعنده صلاة الظهر بدل صلاة العصر.

(٢٦٣) اخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧)، والطبراني (الكبير) (٧٩/١٩)، والحاكم (٣٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٧/٤)، وقال الحافظ في (الفتح) (٥١٩/٧): اسناده صحيح الى الزهري.

(٢٦٤) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٠/٣)، وابن سعد (الطبقات) (٧٤/٣).

(٢٦٥) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٤/٤) وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٣١٤/١): حسن لغيره.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەرچوو بەرەو بەنی قورەیظە بەسواری کەرێك ڕۆیشت وەك خۆ بەکەم زانینێکی بەرامبەر بە خوای گەورە هەروەك ئەبو ڕافیع دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی تەشریفی چوو بۆ غەزای بەنی قورەیظە بە سواری کەرێکی پشت ڕووت ڕۆیشت پێیان دەوت (یعفور))[٢٦٦].

## گەمارۆدانی بەنی قورەیظە

پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لای قەلاَکانی بەنی قورەیظە و بانگی کردن بۆ ئیسلام ئەوانیش ڕازی نەبوون و ڕەتیان کردەوە پاشان گەمارۆی دان وشەڕی لەگەڵ کردن.

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طالبی ﷺ بە ئاڵاکەیەوە کردە پێشڕەوی سوپاکە بۆ لای بەنی قورەیظە، خەڵکی دەست پێشخەریان کردبوو زووتر گەیشتبوونە نزیك قەڵاکانیان، عەلی کوڕی ئەبو طالب ڕۆیشت تا نزیك بووەوە لە قەڵاکانیان، گوێبیستی قسەو گوفتاری زۆر ناشرین بوو لە جولەکەکان دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ [وهاوسەرە بەڕێزەکانی عەلی ﷺ پێی ناخۆش بوو پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەم قسە نابەجێیانە ببیستێت]، بۆیە گەڕایەوە تا لە ڕێگادا بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ هیچ شتێکت لەسەر نی یە ولە سەریشت ناگەوێت تکام وایە لەو شتانەی پێیانە نزیك نەبیتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((لەبەر چی دوام لێ دەکەیت بەگەڕانەوە))؟ ئەویش ئەوەی لەوان بیستبوو حەزی نەدەکرد ئاشکرای بکات وبیڵێت لەبەر ناشرینی قسەکانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اظنك سمعت لي منهم أذىً فامض فان اعداء الله لو قد رأوني لم يقولوا شيئاً مما سمعتْ)) واتە: ((وای بۆ دەچم تۆ لەوانە قسەی ناڕێکت بەرامبەر بەمن بیستبێت برۆ ئەگەر دوژمنانی خوا من ببینن هیچ شتێك لەو قسانە ناکەن کە تۆ پێشتر گوێ بیستیان بوویت))[٢٦٧]، [هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆیان دابوون] کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بووەوە لە

---

[٢٦٦] أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٩١١٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١٦٦): رجاله ثقات.

[٢٦٧] أخرجه: سعيد بن منصور (٩٨٧)، والبيهقي في (الدلائل) (١٣/٤)، وابن عبدالبر في (الدرر) (ص: ٢٠٣) عن موسى بن عقبة.

قەڵاکانیان [ئەوان کەوتنە سەرووی پێغەمبەرەوە ﷺ] [بۆیە فەرمانی کرد بەهاوەڵانی کە لە دەوری کۆببنەوە بە قەڵغانەکانیان بیپارێزن وەك کەپرێك لەسەری تا بەردی بەر نەکەوێت کە لەسەرەوە هەڵیان دەدایە خوارەوە بۆ ئەوەی نزیکیش بێت تا گوێیان لە دەنگی بێت وتەکانی ببیستن، ئەوانیش بەو شێوەیان کرد] [پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگێکی بەرز بانگی چەند کەسانێکی کرد لە پیاو ماقوڵان وسەررکردەکانیان هەتا گوێیان لێبوو فەرمووی: (وەڵاممان بدەنەوە ئەی کۆمەڵی جولەکەکان) وەبانگی کردنەوە و فەرمووی: ئەی برایانی مەیمون و بەرازەکان [خوای گەورە سەرشۆڕو ڕسواو زەبوونی کردن] لەوەڵامدا وتیان: ئەی ئەبو قاسم تۆ قەت قسەی ناشرینت نەوتووە، ئەویش بانگی کردن بۆ ئەوەی موسوڵمان بن پێش ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بەرپا بکات ئەوان ڕەتیان کردەوە و ڕازی نەبوون وەڵام بدەنەوە و بەرەو ئیسلام بێن، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوانەی لە خزمەتیا بوون لە موسوڵمانان شەڕیان لەگەڵدا کردن][٢٦٨] (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە بەنی قورەیظە لە یەکێك لە بیرە ئاوەکانیان دابەزی بەناوی بیری (ئەنا) کە دەکەوێتە ناوچەی موڵك و زەوی و زاریانەوە)[٢٦٩]، هەر لەکاتی گەمارۆکەدا چەندین شەڕی دەستەو یەخە و تیرباران کردن لە نێوانیان دا ڕوویدا، زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ یەکیانی کوشت لەکاتی دابەزین و ڕووبەڕوو بوونەوەی یەکتردا، وەچەندین شەڕە قسە وهەڵبەست وهۆنراوەی داشۆرینیان بەیەکتر دەوت وەحەسان ﷺ بەهۆنراوەکانی لەو ڕۆژەدا بەرگری لە موسوڵمانان دەکرد و هانی دەدان و جۆش وخرۆشی بە بەردا دەکردن، لە عکریمەوە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەستە بۆی زوبەیر)، صەفیەی کچی عبد المطلب پوری پێغەمبەری خوا

[٢٦٨] اخرجه: الحاکم (٣٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابي نعيم (الدلائل) (٤٣٦)، وعبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧) عن سعيد بن المسيب، والبيهقي (الدلائل) (٨/٤)، وقال ابن كثير (البداية) (١١٨/٤): لهذا الحديث طرق جيدة، وقال الحافظ في (الفتح) (٥١٩/٧): اسناده صحيح الى الزهري، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٣٣٨): ضعيف.

[٢٦٩] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٠/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٨٢/٢)، وقال محمد بن طاهر البرزنجي في (ضعيف تأريخ الطبري) (رقم: ٢٢٥): اسناده ضعيف. واللفظ لابن اسحاق والزيادات لسعيد بن المسيب وموسى بن عقبة.

وداىکی زوبەیر فەرمووی: (بەتەنیا دەمێنمەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کامیان بەسەر ئەوی تریان سەرکەوێت ئەوی تریان دەکوژێت)) زوبەیر سەرکەوت و کوشتی، پێغەمبەری خوا ﷺ کەلوپەلی کابرای وەك دەسکەوتی جەنگ دا بەزوبێر)[٢٧٠].

لە عوتبەی کوڕی عەبد ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەغەزای بەنی قورەیظەدا فەرمووی: ((من ادخل هذا الحصن سهماً فقد وجبت له الجنة)) واتە: ((هەرکەسێك تیرێك بهاوێژێت و بکەوێتە ناو ئەو قەڵایەوە ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت)) واتە خوا دەیباتە بەهەشتەوە. عوتبە دەفەرموێت: منیش سێ تیرم هاویشت خستمە ناو قەڵاکەیانەوە)[٢٧١].

لە بەرائەوە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەغەزای بەنی قوڕەیظە بەحەسانی کوڕی ثابتی ئەنصاری ﷺ فەرموو: ((اهج المشركين فانّ جبريل معك)) واتە: ((هێرش بکە سەر موشریکەکان بە هۆنراوەی داشۆرین جبرائیل لەگەڵتدایە))][٢٧٢]. لەگێڕانەوەیەکی تردا لە جابرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرووی: ((من يحمي أعراض المسلمين))؟ واتە: ((کێ پارێزگاری لە ئابڕو کەرامەتی موسوڵمانان دەکات))؟ کەعبی کوڕی مالك و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە و حەسان هەستان، بەحەسانی فەرموو: "اهجهم انت فانه سيعينك عليهم روح القدس" واتە: "تۆ بەهۆنراوەکانت هێرشیان بکە سەر، بە هەڵبەستی داشۆرین دایان بشۆن گیانی پیرۆز پشتیوانتان دەبێت لە دژیان))[٢٧٣].

---

[٢٧٠] أخرجه: ابن ابي شية (المصنف) (٣٧٩٧٨)، وعبدالرزاق (المصنف) (٩٤٧٠)، وسعيد بن منصور (٢٦٩٤)، والبيهقي (الكبرى) (١٣٠٤٥) وفي (الدلائل) (٣٠٨/٦) والطحاوي (٢٢٦/٣) واللفظ للبيهقي وعبدالرزاق – وهو حديث مرسل.

[٢٧١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٩٧/١٧) وفي (مسند الشامين) (١٦٣١)، والفسوي (المعرفة) (٣٤٩/٢) واورده السيوطي عن ابن منده وابن عساكر وابو نعيم – كما في (كنز العمال) (٤٥٩٦٧).

[٢٧٢] أخرجه: احمد (٢٨٦/٤)، والبخاري (٤١٢٤)، وانظر (الصحيحة) (٨٠١).

[٢٧٣] أخرجه: ابن مردوية = كما في (فتح الباري) (٥٢٩/٧).

سێ کەس موسوڵمان بوون لە جولەکەکانی بەنی (هەدل) وهاتنە خوارەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و بەوەش خوێن و ماڵ وموڵك و کەسوکاری خۆیان و خێزان ومنداڵەکانیان پاراست لە تیاچوون.

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (لەو کاتەدا ئەعلەبەو ئوسەیدی کوڕی سەعیە و ئەسەدی کوڕی عوبەید کە کەسانێك بوون لە بەنی (هەدل) ولە بەنی قورەیظە نەبوون وە نەدەچونەوە سەر بەنی نەضیریش ڕشتەی باوکیان لەسەروی ئەوانەوە بوو ئەوان لەکوڕانی مامیان بوون هەر لەو شەودا موسوڵمان بوون...)[٢٧٤].

چیرۆکی موسوڵمان بوونیان بەدریژی لەگێڕانەوەیەکی تردا لە عاصمی کوڕی عەمرەوە ئەویش لە پیاوێکی پیری بەنی قورەیظیەوە دەگێڕێتەوە وەدەفەرموێت: (....پیاوێك لەجولەکەکانی خەلکی شام کەپێیان دەوت: (ئیبن هەیبان)، هاتە لامان پێش هاتنی ئیسلام بەچەند ساڵێك لەناوماڵدا مایەوە وەڵڵاهی هیچ کەسێکمان نەدەبینی پێنج فەرزەی نوێژ لەئەو ڕێکو پێکتر ئەنجام بدات، دوای ئەوەی جێگیر بوو لەلامان ئێمە دوچاری بێ بارانی و وشکە ساڵی بووین وتمان پێی: (ئیبن هەیبان هەستە نوێژی باران بارینمان بۆ بکە لەخودا ئەویش لەوەلامدا فەرمووی: (وەڵڵاهی کاری واناکەم هەتا زەکات لەماڵەکانتان دەرنەکەن وە لەبەردەستی مندا دابنێن وتیان؟ چەندە فەرمووی: (بۆ هەموو کەسێك یەك پێوانە خورما و مشتێك جۆ پیرەمێرد دەڵێت: (ئێمە زەکاتەکەمان لێ دەرکرد ئەویش ئێمەی بردە دەرەوە بۆ گەرمە سێرێکی خۆمان لەو دەشتە، نوێژە بارانەی بۆکردین، وەڵڵاهی ئەو هێشتا لەکۆڕو دانیشتنەکەمان هەڵنەستا بوو کەبۆ نوێژ خوێندمان وەستا بوون، لەو کاتەدا پەڵە هەوری پەرتەوازە کۆبوونەوە و بوو بەباران و بەهۆی ئەوەوە بارانمان بۆ باری و تێر ئاو بووین، ئەوەی چەندین جار دووپات دەکردەوە ئەجارێك و ئەدوان و ئەسیان هەتاکو گەیشتە سەرە مەرگ، کاتێك زانی دەمرێت فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی جولەکەکان بەبۆ چوونی ئێوە ئ

---

(٢٧٤) أخرجه: ابن اسحاق (السيرة) (١٩٤/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٨٥/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣/٤). وفي رواية ابن عمر ﷺ قال: (... الا ان بعضهم (اي: بني قريظة) لحقوا برسول الله ﷺ فآمنهم واسلموا) رواه مسلم (٤٥٦٧).

شتێك منی لەخاکێکی پڕ دارو درەخت و شینای وەدەرناوە بۆخاکێکی پڕلە برسێتی و نەهامەتی ؟

دەڵێن وتمان: خودا زاناترە. فەرمووی: من هاتووم بۆ ئەم وڵاتە لەچاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەرێکدا بووم کەسەردەمی هاتنی نزیك بۆتەوە، ئەم وڵاتەی ئێوەیە کەکۆچی بۆ دەکات، من تکام وابوو ڕەوانە بکرێت و شوێنی بکەوم، بەڵام کاتی هاتنی لەئێوە نزیکە، ئەی کۆمەڵی جولەکەکان باهیچ کەسێك پێش ئێوە نەکەوێت لەشوێن کەوتن و چوون بەدەم بانگەوازەکەیەوە، ئەو دەنێردرێت کوشتار و دەستکەوتی جەنگی بۆ حەڵاڵ دەبێت تەنانەت ژن و منداڵیش بۆ هەرکەسێك کەدژایەتی بکات و پێچەوانەی ئەو بجوڵێتەوە با ئەو شتانە نەبنە ڕێگر لەبەردەمتان لەوەی کەبگەن بەخزمەتی.

- کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەوانە کراو هات بۆ گەمارۆی بەنی قوڕەیظەی، ئەوانە گەنج بوون وەتازە پێدەگەیشتن. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [کاتێك ئەو شەوە هات کەبۆ بەیانیەکەی بەنی قوڕەیظە فەتح کرا و خۆیان دابەدەستەوە ئەو سێ کەسە (ثعلبەی کوڕی سوعنە وئوسەیدی برای و ئەسەدی کوڕی عوبەید بەجولەکەکانیان وت: ئەی کۆمەڵی یەهود] ئەی بەنی قوڕەیظە وەڵلاهی ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە ئیبن (هەیبان) ئێوەی لێ ئاگادار کرد بۆوە و ڕایسپارد بوون [کەشوێنی بکەون ئێوەش لەخودا بترسن شوێنی بکەون] بەڵام جولەکەکان گوێیان پێنەدان و سەرپێچیان کردن و وتیان: ئەوە ئەو کەسە نییە.

وتیان: وەڵلاهی ئەوە خۆیەتی بەنیشانەکانی دیارە کەئەوە، ئەوان دابەزین و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و سەرو ماڵ و موڵك و خێزان و منداڵی خۆیان پاراست. دەڵێت: ماڵ و سامانیان لەناو قەڵاکەدا مابوو لەگەڵ جولەکەکان کاتێك فەتح کرا هەموویان بۆ گەڕاندنەوە و دایانەوە پێیان[٢٧٥]

---

[٢٧٤] أخرجه: ابو نعيم (الدلائل) (٤٢)، وابن سعد (الطبقات) (١٦٠/١)، وابن هشام (٢١٣/١)، والبيهقي (الكبرى) (١١٣/٩) وفي (الدلائل) (٣١/٤، ٣٢)، وابن عبدالبر (الدرر) (ص: ٢٠٤- ٢٠٥)، وقال الحافظ في (الأصابة) (٣٣/١): اخرجه: ابن السكن باسناد قويٍّ، وقال الشيخ الالباني في (صحيح السيرة) (ص: ٦١): اسناده صحيح.

لەموسوڵمانەکانیش خەلادی کوڕی سوەیدی ئەنصاری شەهید بوو لەکاتی گەمارۆی بەنی قورەیظەدا ئافرەتێکی جولەکە دەستاڕێکی بەسەردا بەردایەوە هەروەك ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (لەغەزای بەنی قورەیظە دا لە موسوڵمانەکان یەك کەس شەهید بوو بە ناوی خەلادی کوڕی سوەیدی کوڕی ثعلبە لە بەنی حارثی کوڕی خەزرەج دەستاڕێکیان بەسەردا بەردایەوە سەریان شکاند بەشکاندنێکی سەخت.... وە ئەبوسینانی کوڕی موحسین کوڕی حەرثان لە بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە کۆچی دوای کرد، لەوکاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆی بەنی قورەیظەی دابوو لەقەبرستانی بەنی قورەیظە ناشتیان کە لەدوای موسوڵمان بوونیان مردوەکانیان تێدا دەناشت تا ئەمڕۆش مردوی تێدا دەنێژرێت)[٢٧٦].

گەمارۆکە تادەهات سەخت تردەبوو لەسەر بەنی قورەیظە وەخودای گەورەش ترس خستە دڵیانەوە وەدڵنیابوون کە لەناودەچن و لەوکاتەدا توانای جەنگ کردنیان نەما لەگەڵ موسوڵمانەکان بۆیە داوایان کرد لەهاوپەیمانەکانی خۆیان لە هۆزی ئەوس کە ئەبو لوبابە بێت بۆلایان تا گوفتوگۆی لەگەڵ بکەن لەسەر ئەو دۆخەی کەتێی کەوتوون. ڕوداوەکە بەکورتی و ڕاست و دروستی. لە گێڕانەوەیەکی خاتوو عایشەدا هاتووە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (... کاتێك گەمارۆکە لەسەریان توندکرا و دوچاری سەخت ترین ناڕەحەتی و دوژواری هاتن پێیان وترا: وەرنە دەرەوە ڕازیبن بەحوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەدا ڕاوێژیان بەهاوپەیمانیان لە سەردەمی نەفامی ئەبو لوبابەی کوڕی عبد المنزیری ئەوسی کرد ئەویش ئاماژەی کردە گەردنی واتە: سەریان دەبڕن...)[٢٧٧].

ئەم ڕوداوە لەچوارچێوەی فەرمودەیەکی (مورسەل) دا بەلاوازی هاتووە لەگێڕانەوەیەکی موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (...خودای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە گەمارۆکەش

---

[٢٧٦] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٠٩)، والطبري (التاريخ) (٢/٥٣٩)، واسناده ضعيف انظر (ضعيف تاريخ الطبري) (٢٢٩).

[٢٧٧] اخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه حسن، وابن ابي شيبة (المصنف) (١٨٦٤٣)، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن، وقال ابن كثير (البداية) (٤/١٢٣): اسناده جيد، وصححه الحافظ في (الاصابة) (١/٢٧٤).

زۆر لەسەریان سەخت بوو هاواریان لێ هەستاو بانگی ئەبو لوبابە کوڕی عبدوالمنزریان کرد چونکە ئەوان لەسەردەمی نەفامی دا هاوپەیمانی ئەوسیەکان بوون لە ئەنصار[ئەوەبوو ناردیان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەبو لوبابەمان بۆ بنێرە.... بۆ ئەوەی ڕاوێژی لەگەڵدا بکەین لەسەر ئەو بارو دۆخەی خۆمان تێی کەوتوین] ئەبو لوبابەش فەرمووی: ناڕۆم بۆ لایان هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخسەتم نەداتێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەوە من ڕوخسەتم دای) ئینجا [ناردی بۆ لایان] کاتێ ئەبو لوبابە گەیشتەلایان [وچاویان پێکوت پیاوەکانیان لەبەری هەستان و ژن ومندالیش بەدەم هاوار و هەنسک وگریانەوە بەرەو ڕووی ڕۆیشتن ئەویش بەزەی پێیان دا هاتەوە]، وتیان: ئەبولوبابە تۆ بارودۆخەکە چۆن دەبینی؟ بەچی فەرمانمان پێ دەکەیت [ئایا پێت باشە بێینە دەرەوە و ڕازی بین بە حوکمی موحەممەد ﷺ] چونکە ئێمە تواناو هێزی شەڕکردنی ئەومان نی یە؟ فەرمووی: [بەڵێ] ئینجا ئەبو لوبابە بەدەستیشی ئاماژەی بۆ گەردنی کرد [کە چارەنوستان سەربڕینە] پەنجەکانیشی دەهێناو دەبرد بە گەردنیاو ئەوانیش سەیریان دەکرد ئەوەی بڕیاری لە سەرە بۆ ئێوە تەنها کوشتنە، کاتێك ئەبو لوبابە گەڕایەوە و بەجێ هێشتن هەستی کرد تازە لەدەستی دەرچووە و قسەیەکی کردووە نەدەبوو بیکات وای بۆ چوو کە دوچاری تاقیکردنەوەیەکی گەورە دەبێت. [ئەبو لوبابە دەفەرموێت: وەڵڵاهی هەر لەشوێنی خۆیان قاچەکانم بەردەوام دەلەرزین بێ هیچ هۆیەك تا زانیم کە من ناپاکیم کردووە لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ] ئەبو لوبابە فەرمووی: سوێند بەخوا ناتوانم سەیری دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم هەتا خوای گەورە لەبارەی منەوە وەحی بۆ دەنێرێت و تۆبەیەکی نەصوحم لێ وەردەگرێت کە خوای گەورە خۆی ئاگاداری دەروونی منە و دەزانێ چی تێدایە ئەبو لوبابە گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە [و نەهاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ] دەستەکانی خۆی بەستەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە و [فەرمووی: ئەم شوێنە بەجێ ناهێڵم هەتا خوای گەورە تۆبەو پەشیمانیم لێ وەردەگرێت لەسەر ئەو کارەی کە کردومە پەیمان دەدەم بەخوای گەورە کە هەرگیز پێم ناخەمە خاکی بەنی قورەیظەوە وە من نابینن لەشوێنێك کە تێیدا ناپاکیم کردووە لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ جارێکی تر]، بۆیە پێیان وایە کە نزیکەی بیست ڕۆژ بە کۆڵەکەی مزگەوتەوە بوو، هەروەك

باس کراوە کاتێك ئەبو لوبابە ماوەیەکی زۆری پێچوو نەگەڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەبو لوبابە کارەکەی تەواو نەکرد لەگەڵ هاوپەیمانەکانی؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵڵاهی لە قەڵاکە هاتۆتە دەرەوە ڕۆیشتووە نازانین چ ڕێیەکی گرتۆتە بەرو بەرەو کوێ چووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەبو لوبابە کارێکی بەسەر هاتووە کە پێش تر بەسەری نەهاتووە)، لەوکاتەدا کەسێك لەمزگەوتەوە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەبو لوبابەم بینی بەسرابۆوە بەکۆڵەکەیەك لەکۆڵەکەکانی مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لقد اصابته بعدي فتنة ولو جاءني لاستغفرت له، فاذا فعل هذا فلن احرّكه من مكانه حتى يقضي الله فيه ما يشاء))[٢٧٨] واتە: ((لەدوای من دوچاری بەڵاو ناڕەحەتی بووە ئەگەر بهاتایە بۆلای من داوای لێخۆش بوونم بۆ دەکرد، کەوای کردووە لەجێگەی خۆی نای جوڵێنین وەلای نابەین هەتا خوای گەورە بەویستی خۆی دەرووی لێدەکاتەوە)).

پاشان خودای پاك و بێ هاوتا ئایەتی دابەزاند لەسەر تۆبەکەی ئەبو لوبابەخەڵکی بەهەڵە داوان چوون بۆ خزمەتی بۆ ئەوەی لە کۆڵەکەکەی بکەنەوە فەرمووی: وەڵڵاهی نابێت بمکەنەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی تەشریف دێنێت و بەدەستی موبارەکی خۆی دەمکاتەوە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ نوێژی بەیانی بەلایدا گوزەری کرد و کردیەوە.[٢٧٩]

کاتێك جولەکەکان دڵنیا بوون لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دەبێت لەگەماڕۆدانیان و دەوریان چۆڵ ناکات هەتا قەڵاکانیان فەتح دەکات لەو کاتەدا سەرۆکەکەیان کەعبی کوڕی ئەسەد وەك ئامۆژگاریکاریك بۆیان سێ پێشنیاری خستە بەردەمیان هەر وەك ئێین

---

[٢٧٨] اخرجه: الطبري (التفسير) (١٥٩٢٣) وفي (التاريخ) (٥٨٢/٢)، وعبدالرزاق (المصنف) (١٦٣٩٧)، وسعيد بن منصور (السنن) (٩٨٧) وصححه محقق (اسباب النزول) للسيوطي (ص: ١٧٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٢/٤)، وابن هشام (السيرة) (١٩٢/٣)، والواحدي (اسباب النزول) (ص: ١٧٥)، وضعفه محمد بن طاهر في (ضعيف تأريخ الطبري) (رقم: ٢٢٥)، واللفظ لموسى بن عقبة والزيادات لابن اسحاق.

[٢٧٩] اخرجه ابن هشام (السيرة) (١٩٣/٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٧/٤)، والطبري (التاريخ) (٥٨٥/٢)، وضعف اسناده صاحب (ضعيف تأريخ الطبري) (رقم: ٢٢٦).

ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (باوکم ئیسحاقی کوڕی یەسار لە مەعبدی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە: (کەپێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی بیست وپێنج ڕۆژ گەمارۆی دان هەتا گەمارۆکە شەکەتی کردن و توانای لێبڕین، خودای باڵادەستیش ترسی خستە ناو دڵیانەوە، حویەیی کوڕی ئەخطەبیش لەگەڵ بەنی قورەیظەدا چوو بووە ناو قەڵاکانیانەوە کاتێك قورەیش و غەطەفان پاشە کشەیان کرد وەك ئەمەك داریەك بەرامبەربە کەعبی کوڕی ئەسد کەپێشتر پەیمانی پێدا بوو کەبێت و لەگەڵیان لەقەڵاکەدا بمێنێتەوە، کاتێك جولەکەکان دڵنیا بوون پێغەمبەری خوا ﷺ پاشەکشە ناکات هەتا بارودۆخە کە بەلایەکادا ئەخات کەعبی کوڕی ئەسەد وتی: ئەی کۆمەڵی یەهود ئەو پیاوە گەمارۆی داون و دوچاری ئەو ئەهامەتیەی کردوون خۆشتان دۆخەکە بەباشی دەبینین من سێ پێشنیارتان بۆ دەخەمە ڕوو بەویستی خۆتان یەك لەو سێ پێشنیارە هەڵبژێرن، وتیان: چین؟ وتی: شوێنی ئەو پیاوە بکەون و باوەڕی پێبینن وەڵڵاهی چاك بۆتان ڕوون بۆتەوە کە پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خوایە و هەر ئەوکەسەیە کە لەتەورات دا چاوتان پێی کەوتووە و دەیخوێننەوە گەر واتان کرد ئەوە لەخۆتان و ماڵ ومنداڵ و موڵکتان دڵنیا دەبن، وتیان: هەرگیز لەدەستوری تەورات لانادەین و بەهیچ شتێکی تری ناگۆڕینەوە، پاشان وتی: ئەگەر لەوەش بەقسەم ناکەن وەرن با ژن و منداڵەکانمان بکوژین پاشان بچینە دەرەوە بۆ موحەممەد ﷺ بە خۆمان وشمشیرەکانمانەوە ئەوکات لەدوای خۆمان هیچ شتێك بەجێ ناهێڵین خەفەتی بۆ بخۆین هەتا خودا لە نێوان ئێمە و ئەوان دا خۆی حوکم دەکات و بەلایەکی دا دەخات ئەگەر لەناو چووین ئەو لەناودەچین و هیچ ئەوەو ژن ومنداڵ نەماوە کە جێگەی داخ و پەژارە بێت و لێی بترسین لە دوای خۆمان، وە ئەگەر سەریش کەوتین ئەوە سوێند بێت کە ئێمە ژن ومنداڵ دەست دەخەینەوە پەیدا دەبێتەوە، وتیان: ئەو هەژارو بەسەزمانانە بکوژین؟ ئینجا توخوا ژیان چ تامێکی دەبێت لەدوای ئەوان، وتی: باشە ئەگەر لەوەش بەقسەم ناکەن ئەمشەو شەوی شەممەیە لەوانەیە موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی دڵنیابن لێمان لەم شەوەدا ئێمە با بۆیان بچینە دەرەوە لەوانەیە بتوانین دەستێکیان لێ بوەشێنین؟ وتیان: ئەوە کارێکی خراپ و پڕمەترسیە و بەسەر خۆمان دا دەشکێتەوە دوچاری هەمان بەڵاو کارەساتی ئەوانەی پێش خۆمان دەبین خۆت باش دەزانیت کە خوای گەورە دوچاری بوون بە مەیمون و بەرازی کردن وە لەسەر وێنەی لایدابن. ئینجا

بەبێزاریەوە وتی: لەوەتەی لەدایك بوون ڕۆژێك نەبووە پیاوێکتان تێدا هەڵبکەوێت بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بدات)[٢٨٠].

## خۆ بەدەستەوە دانی بەنی قوڕەیظەو ڕازی بوونیان بە حوکمی سەعدی کوڕی موعاذ

لەدوای ئەوەی گەمارۆکە سەختر بوو وە نەهامەتیەکان زیاتر بووە بۆ سەر بەنی قوڕەیظە دواجار ناچاربوون خۆیان بەدەستەوە بدەن و بێنە دەرەوە بەمەرجێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ بکات بە حەکەم و بە قسەکانی ئەو حوکمیان بکات ئەوان وا گومانیان دەبرد کە بەزەیی پێیان دا بێتەوە بەهۆی ئەو هاوپەیمانیەی کە لەنێوان ئەوان و هۆزەکەی سەعد هەبوو واتە: (الأوس) لەپێش ئیسلامدا.

لەم بارەیەوە چەندین گێڕانەوەی جیاواز لەچەندین ڕووە لەسەر ئەم ڕووداوە هەیە لە دوای ڕێخستن و ڕیزبەندی لەنێوان گێڕانەوەکاندا ڕوداوەکە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

لەخاتوو عائیشەوە (رضي الله عنها) پێغەمبەری خودا ﷺ گەمارۆی دان پاشان ئەوان ڕازی بوون و هاتنە دەرەوە و خۆیان دابەدەستەوە وڕازی بوون بەبڕیاری پێغەمبەرﷺ)[٢٨١].

موسی کوڕی عوقبە (رحمه الله) دەفەرموێت: (داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد پیاوێك دەست نیشان بکات کە حوکم بکات وەبڕیار بدات لەسەریان، پێغەمبەری خواش فەرمووی ﷺ: ((خۆتان سەرپشکین لە ناو هاوەڵانم یەکێك هەڵبژێرن بەویستی خۆتان [و گوێگرن بۆ قسەکانی و بە قسەی بکەن]. [وتیان: ئێمە ڕازی دەبین لەسەر ئەوەی سەعدی کوڕی موعاذ حوکممان بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وەرنە دەرەوە لەسەر ئەوەی سەعدی کوڕی موعاذ حوکمتان بکات))[٢٨٢].

---

[٢٨٠] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٥/٤) واللفظ له، وابن هشام (السيرة) (١٩٢/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٨٣/٢).

[٢٨١] أخرجه: البخاري (٤١٢٢، ٤٥٧٣).

[٢٨٢] أخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حديث حسن، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن.

سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەفەرموێت: [ئەیان ویست کە پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمیان بکات و ئەهاتنە ژێر بڕیاری ئەو][٢٨٣]. دوای ئەوی سەعدیان دەست نیشان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەری [ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك بەیانی بوو وە هاتنە دەرەوە بۆ ژێر حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزی ئەوس هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و داوایان کرد و زۆر تکایان کرد بۆیان و فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە هاوپەیمانی ئێمە بوون هەروەك چۆن لەوەوپێش چاکەت لەگەڵ هاوپەیمانی براکانمان لە هۆزی خەزرەج کرد هەروەك خۆشت دەزانی ئەوانەش چاویان لە ئێمەیە... کاتێك ئەوسیەکان قسەیان تەواو کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی هۆزی ئەوس ئایا ڕازی دەبن کەسێك لە خۆتان حوکمیان بکات؟)) وتیان: بەڵێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە دامانە دەست سەعدی کوڕی موعاذ)) پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی ﷺ لە دەواری ئافرەتێکی هۆزی ئەسلەم دانابوو پێیان دەوت (رفیدة) لە ناو مزگەوتەکەی بۆ ئەوەی لەنزیکەوە چاودێری بکات، ئەو ئافرەتەش بریندارى تیمار و چارەسەر دەکرد بۆ ئەوکارەش خۆی تەرخان کردبوو کە خزمەتی هەموو موسوڵمانێك بکات کە یەکی کەوتبێت بەهۆی بریندارى غەزاوە][٢٨٤].

جولەکەکان خۆیان دا بەدەستەوە لەسەر ئەوەی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ حوکمیان بکات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەرکرد کەچەکەکانیان کۆبکرێتەوە و [بخرێتە خانویکەوە]، وەفەرمانیشی دەرکرد کەئەوانیش لەپشتەوە دەستیان ببەستنەوە و بیان بەنە ماڵی ئەوسامە و دایان نێن. [لەگێڕانەوەیەکی تردا لە محمدی کوڕی مەسلەمەوە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمیدا بەسەر بەنی قورەیظەدا هۆزی ئەوس ئەو کارەیان بەلاوە ناخۆش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەرماڵێك لەماڵی ئەوسیەکان دوو دیلی ناردبووە بۆ بەنی (حارثة)ش کە بەرەبابی من بوو ئەوانیش دوو دیلی نارد بوو][٢٨٥].

[٢٨٣] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٧).

[٢٨٤] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٤/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٨٥/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٠/٤).

[٢٨٥] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣١/١٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٦٠): فيه ضعيف.

پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێن سەعدی کوڕی موعاذ ﵁ [کەسوکارەکەی سەعد چوونە خزمەتی و وەهێنایان خستیانە سەر پشتی گوێ درێژێك و پاڵپشتەکانیان بۆ دانا کەلە چەرم دروست کرابوو لەبەر ئەوەی سەعد پیاوێکی بەشان و شەوکەت و جوان بوو]، [سەعد] تەشریفی هێنا لەسەر گوێدرێژێکی ئەعرابی بوو کە گوایە کورتانەکەی لە ڕیوشی خورما بووە، [خستیانە سەر پشتی گوێدرێژەکە و خزم و کەسوکارەکەشی بەدەوریەوە بوون، پێیان وت: ئەی ئەبو عەمرو خۆت باش دەزانی کە ئەوانە هاوپەیمانی خۆت بوون وە دۆست و پشتیوانی پێشترت بوون وەخەڵکی (کینانە)ن، سەعدیش بەهیچ جۆرێك لای نەدەکردەوە بەلایاندا هەتا ئاوڕیشی لێ نەدەدانەوە کاتێك لەناوچەکەیان نزیك بوونەوە ڕووی کردە کەسوکاری و فەرمووی: کاتی ئەوە هاتووە کەمن گوێ بەکەس نەدەم وەلەبەر خودا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسم](٢٨٦).

پیاوێك لە بەنی عەبدولئەشهل شوێنی کەوت بوو، لەخزمەتیا دەڕۆیشت وەمافی بەنی قورەیظە و گەورەیی و چاکەی ئەوانی بیر دەخستەوە وە هاوپەیمانێتیەکەی ئەوانی دەخستە بەر چاو، کەئەوان لەجەنگی (بوعاث)دا دوچاری چ بەڵایەك بوون لەسەر تۆ وەپێی فەرموو: ئەوان تۆیان هەڵبژاردوە لەناو هەموو خزم و کەس و کارەکانت تکات لێدەکەم بەزەی و سۆزو نەرم و نیانیت بخە کار بەرامبەریان پارێزگاری لەژیانیان بکە چونکە ئەوان جوانی و پشت وپەنا و ژمارەی زۆرن بۆ تۆ. دەفەرموێت: پیاوەکە هەر قسەی دەکردو زیاتر پێداگری دەکرد سەعدیش بەهیچ شێوەیك لای نەدەکردەوە بەلای دا، هەتاکو لێیان نزیك بوونەوە، پیاوەکە وتی: ئەرێ ئاوڕێکمان لێ نادەیتەوە لەسەر ئەو قسانەی لەگەڵم کردی لەیارەی بەنی قورەیظەوە؟ سەعد ﵁ فەرمووی: کاتی ئەوە هاتووە کە من لەبەر خوا لەلۆمەی لۆمەکاران نەترسم وەهیچ شتێك ڕێگر نەبێت لەوەی بۆ خودا دەیکەم، پیاوەکەش لێی جیابۆوە و بەجێی هێشت دوای ئەوەی [کەنا ئومێد بوو لەوەی کەبیان هێڵێتەوە وە

---

(٢٨٦) أخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حديث حسن، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حديث حسن؛ وقال ابن كثير (البداية) (١٢٣/٤): اسناده جيد، وحسّنه كل من الحافظ في (الفتح) (٤٣/١١)، والشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٧).

فەرمانی مانەویان بدات] ئەو پیاوە هاتەوە لای کەسوکاری و پێیان وت: دەنگ و باس چیە؟ ئەویش هەواڵی پێدان کە ئەو فەرمانی مانەوەیان نادات، وەهەروەها ئەوەشی پێ وتن کە چۆن قسەی لەگەڵ کردوە وە سەعدیش چۆن وەڵامی داوەتەوە. [کاتێك سەعد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوت و[لەمزگەوت نزیك بۆوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ئەنصاریەکان] ((هەستن برۆن بەدەم سەردارو [پیاو چاك] و خانە دانەکەتانەوە و دایگرن)) عومەر ﷺ فەرمووی: سەردار و گەورەمان هەر خودایە (عزوجل)، فەرمووی: ((دایگرنە خوارەوە)) ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: [((سەعد ئەوان بۆ حوکمی تۆ هاتونەتە دەرەوە)][٢٨٧] تۆش فەرمان بکە بەسەریاندا)). سەعد ﷺ فەرمووی: [خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ شایستەترن حوکم بکەن وە حوکمیان باشترە لە من؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خودای گەورە فەرمانت پێ دەکات کە ناوبژیوان بیت وەفەرمانیان بەسەر دا بدەیت))][٢٨٨].

[بەنی قوڕەیظە ئێەخەی سەعدیان گرت هاوپەیمانێتی نێوانیان خستەوە یادی بۆ ئەوەی کە ئاگای لێیان بێت، سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ خۆی ڕزگار کرد لەدەستیان و بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە تا فەرمانی پێبکات، چاوەڕێی دەکرد تابزانێت بەچ شتێك فەرمانی لەسەرە کە حوکم بکات، دەیویست بڵێت: ڕازیت بەوەی من دادوەرێتیان بکەم][٢٨٩] [ئەنصاریەکان هەستان و بەسەعدیان فەرموو: ئەی ئەبو عەمرو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دۆست و هاوپەیمانەکانتی داوەتە دەست خۆت کەفەرمان بکەی بەسەریاندا، سعد ﷺ فەرمووی: (کەواتە پابەندبن بەو بەڵێن و پەیمانەی کەبە خوداتان داوە ئایا حوکمی من بەسەریان دا جێبەجێ دەکرێت کاتێك فەرمانم دا بەسەریاندا ؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: بەسەر ئەو کەسەش کەلێرەیە؟ ئاماژەی کرد بۆ ئەو جێگەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بوو وەك ڕێزوو بەگەورە زانینێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خواش

---

[٢٨٧] أخرجه: البخاري (٤١٢١، ٤٥٧١).

[٢٨٨] أنظر: (فتح الباري) (٧/٥٢٤).

[٢٨٩] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٣٦).

ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ بەسەر ئێمەش دا جێبەجێ دەکرێت)) سەعد ﷺ فەرمووی: من
فەرمان بەوە دەکەم کەپیاوە کانیان بکوژرێن وە ژن و منداڵەکانیشیان بەدیل بگیرێت وە ماڵ
و سامانەکانیشیان دابەش بکرێت][٢٩٠]. [وەماڵ و موڵکیشیان بابۆ کۆچەریەکان بێت بەبێ
ئەوەی بدرێت بەئەنصار] باس دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((حوکم
کردنەکەت پێکای و لە جێگەی خۆی بوو)) وە بە سەعدیشی ﷺ فەرمووی: ((لقد حكمت
فيهم بحكم الله عزوجل [وحكم رسوله]))[٢٩١] واتە: ((بەڕاستی بەحوکمی خودای پەروەردگار[و
پێغەمبەرەکەی ﷺ] حوکمت کرد. [کەلەسەرووی حەوت ئاسمانەوە حوکمی بەسەری
کردن))][٢٩٢].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد کە بیان
بەنەوە و هەموویانی بەند کرد لەماڵی زەینەبی کچی حارث کە ئافرەتێکی ئەنصاری بوو
ﷺ پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی ڕۆیشت بۆ بازاڕی مەدینە و فەرمانی کرد چەندین
چاڵیان بۆ هەڵکەندن، ئینجا ناردی بەشوێنیاندا و هەموویان کوژران کە شەش سەت یان
حەوسەد کەس دەبوون ئەوەی بەزیاتر ئەژماری کردوون دەڵێت لەنێوان هەش سەد بۆ
نۆسەد کەس دەبوون. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە [کە چوار سەد کە بوون]][٢٩٣][٢٩٤].

حوکم کردنەکەی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ بەسەر بەنی قورەیظەدا جێ بەجێ کرا:

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (حویەیی کوڕی ئەخطەبی دوژمنی خودایان هێنا

---

(٢٩٠) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٩٤)، والطبري (التأريخ) (٢/٥٨٥).

(٢٩١) اخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حسن.

(٢٩٢) اخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢/٥٠٦)، وقال الحافظ في (الفتح) (٧/٥٢٦): سنده مرسل.

(٢٩٣) اخرجه: احمد (٣/٣٥٠)، والنسائي (٢/٤٨)، والترمذي (١٥٨٢) - والحاكم (٤/٤١٧) وصححه، وابن حبان (٤٧٨٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال الحافظ (٧/٥٢٧): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٢٨٧)، و (الارواء) ٥/ ٣٨).

(٢٩٤) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/١٩) عن موسى بن عقبة واللفظ له، والزيادات لابن هشام (٣/١٩٤)، واحمد (٢٥٠٩٧)، والطبراني (الكبير) (١٩/٢٣١)، وعبدالرزاق (٩٧٣٧).

پۆشاکێکی سورباوی لەبەردا بوو کە لەهەموو لایەکەوە شەقو شڕکرا بوو و زۆر بێ کەڵك بوو بۆ ئەوەی سودی لێنەبینرێت و کەس لەبەری نەکات دەستەکانی لەبن گەردنیەوە بەیەکەوە بەسترا بوو بەگوریسێك، [پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((خودا ڕسوا و سەر شۆڕی کردیت؟))][٢٩٥] وتی: وەڵڵاهی هەرگیز لەدژایەتی کردنت پەشیمان نیم لەوەش [کەسەرکەوتویت بەسەرمدا] [تەنها سەرزەنشتی خۆم دەکەم کە زیاتر بەربەرەکانیم نەکردی و بەسەختی لەگەڵت نەجەنگاوم][٢٩٦]

بەڵام هەر کەسێك خوا دوچاری شکستی بکات هەر زێر دەکەوێت، ئینجا ڕووی کردە خەلکەکەو پێی وتن: ئەی خەڵکینە کاری خودا دەبێت بەسەرماندا تێپەڕێت چونکە ئەوە فەرمان و قەدەری خودایە لەسەر بەنی ئیسرائیلی نوسیوە گوێی مەدەنێ ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ [فەرمانی کرد ببرێتە ناوچەی بەردەلانەکەی ئەو سەری مەدینەو..... لەوێ کوژرا][٢٩٧] لەگێڕانەوەیەکی تردا لە محمدی کوڕی سیرین ﷺ دەفەرموێت: (حویەیی کوڕی ئەخطەب پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ: هیچ کەسێکی لەدژی هان نەدات و پشتیوانی کەس نەکات لەدژی ئەو وە خودای گەورەی کردە وەکیل لەسەر ئەو پەیمانە کە جێبەجێی دەکات، کاتێك غەزای بەنی قورەیظە ڕووی دا خۆی و کوڕەکەیان بەدیل گیران و هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی فەرموو: ((بەئەمەکبە بەرامبەر ئەوەی کەکردووتە بەوەکیل)). پاشان فەرمانی کرد خۆی و کوڕەی کوژرا)[٢٩٨].

فەرمانەکەی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ جێ بەجێ کرا بەسەر ئەو کەسانەی کە بێگەیشتبون و نیشانەی کامڵ بوونیان تێدا دەرکەوت بوو وەك مووی ڕیش و دامێن، عطیەی قورەظی ﷺ دەفەرموێت: (من لەو کەسانەبووم کە لەبەر منداڵی وازیان لێ هێنام

---

[٢٩٥] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣٢٧)، عن عروة، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٥٦): مرسل وفيه ابن لهيعة وحديثه حسن.

[٢٩٦] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٤، ٢٢) عن موسى بن عقبة.

[٢٩٧] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣٢٧) عن عروة و (٦/٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٦/١٣٩): مرسل، وابن هشام (السيرة) (١٩٦/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٨٩/٢).

[٢٩٨] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٨٣) وقال محققه: مرسل واسناده صحيح.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: من لەناو دیلەکانی بەنی قورەیظەدا بووم سەیریان دەکردین هەر کەسێك ڕیش وسمێڵی هاتبووایە دەیان کوشت، وەهەرکەسێکیش ڕیش و سمێڵی نەهاتبووایە نەیان دەکوشت منیش لەوانە بووم کە هێشتا موم لێ نەهاتبوو لەبەر ئەوە نەیان کوشتم)[٢٩٩]. موسوڵمانان هیچ ئافرەتێکیان لە بەنی قورەیظە نەکوشت تەنها یەك ئافرەت نەبێت کە ناوی (بونانە) بوو هاوسەری حەسەنی قورەیظی بوو وەك تۆڵەکردنەوە کوشتیان چونکە دەستاڕێکی لە قەڵاکەوە بەردا بووە وە خوارەوە و بەر سەری خەلادی کوڕی سوەید کەوت بوو کوشت بووی، لە خاتوو عائیشەوە ﷺ دەفەرموێت: (هیچ ئافرەتێکیان نەکوژرا تەنها یەکێکیان نەبێت، وەڵلاهی ئەو لەلای من بوو قسەی لەگەڵدا دەکردم زۆر ڕووخۆش و دەم وچاو بەپێکەنین بوو هەموو کات پێ دەکەنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردبوو پیاوەکانیان بکوژرێن لە ناو بازاڕەکەیان دا، کاتێك بانگیان کردن و ناویان هێنا وتیان: فلان ئافرەت لەکوێ یە؟ وتی: وەڵلاهی ئەوە بانگی من دەکەن. وتم: هاوار بۆ تۆ بۆچی بانگت دەکەن؟ وتی: بۆ کوشتن، ، وتم: لەبەرچی؟ وتی: لەبەر ڕوداوێك بەدەستی من ڕووی داوە (کوشتنی خەلاد). ئینجا هاتن و بردیان و کوشتیان وەڵلاهی ئافرەتێکی ئەوندە سادە و دڵ خۆش و ڕوخۆش و دەم بە پێکەنین بوو هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە کە چەند دڵخۆش و دەم بەپێکەنین بوو لە کاتێك دا کەدەیزانی دەکوژرێت)[٣٠٠].

---

[٢٩٩] اخرجه: احمد (٣١/٤)، وعبدالرزاق (المصنف) (١٨٧٤٢)، وابوداود (٤٤٠٤)، والطبراني (الكبير) (١٥١/١٧)، والحميدي (٨٨٨)، والترمذي (١٥٨٤)، والنسائي (١٥٥/٦)، وابن ماجة (٢٥٤١)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٧٣٧٦): سنده حسن، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٢٨٨)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٠٥٩)، وحسن اسناده الارناؤط ايضاً في (الزاد) (١٠٠/٣).

[٣٠٠] أخرجه: احمد (٢٦٣٦٤) وقال محققه: اسناده حسن، وابو داود (٢٦٧١)، والبيهقي (الكبرى) (٨٢/٩)، والحاكم (٣٥/٣) وصححه على شرط مسلم، وابن هشام (السيرة) (١٩٧/٣) رقم (٧٤٠) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٢٥)، والشيخ مقبل الوادعي في (الصحيح المسند) (١٥٧٦).

ثابتی کوڕی قیسی ئەنصاری ﷺ کە خەطیبی پێغەمبەر ﷺ بوو داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کەیەکێك لە جولەکەکانی پی ببەخشێت کەناوی (زوبەیری کوڕی باطای قوڕەیظی بوو لەبەر ئەوەی چاکەیەکی بەسەریەوە بوو لەشەڕی (بوعاث) دەیویست پاداشتی بداتەوە بەهۆی ئەو بەخشینەوەیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەداواکەی ڕازی بوو ئەم ڕوداوەش بە گێڕانەوەیەکی لاواز (ضعیف) گێڕدراوەتەوە تەنها بۆ زانیاریتان باسی دەکەین:

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس ﷺ هەروەك ئیبن شیهاب زوهری بۆی باس کردم چووە لای زوبەیری کوڕی باطای قوڕەیظی.....زوبەیری چاکەیەکی سەردەمی نەفامی بەسەر ثابتی کوڕی قەیسەوە بوو..... لەجەنگی (بوعاث)دا بەدیل گیراو بەدەستی ئەو و چارەنووسی کەوتە مەترسیەوە پاشان ئازادی کرد، ثابت کەهاتە لای زوبەیر پیاوێکی [کوێری]پیرو پەکەوتە بوو فەرمووی... ئایا من دەناسیتەوە؟ وتی: [ئایا هیچ کەسێك برای خۆی لەبیر دەکات و خۆی لێ نەناس دەکات] [بەڵێ تۆ ثابتی کوڕی قەیسی]، ثابت وتی: [من ئەمڕۆ دەمەوێت پاداشتی ئەو ڕۆژەت بدەمەوە کەلە جەنگی (بوعاث)دا لەگەڵ مندا کردت]. وتی: پیاوی بەخشندە و خاوەن ڕێز هەر بەخشندەی لێ چاوەڕێ دەکرێت و پاداشتی چاکەش هەر چاکەیە. پاشان ثابتی کوڕی قەیس چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [زوبەیر چاکەیەکی بەسەرمەوە هەیە لەرۆژی (بوعاث)دا منی ئازاد کرد لەمەرگ پێم خۆشە پاداشتی ئەو چاکەیەی بدەمەوە] بۆیە لەبەرمن ئازادی بکەو بەمنی ببەخشە [بابیبێتە پاداشتی ئەو کارەی]؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بەخشیمان بەتۆ)) ثابت هاتەوە لای وە فەرمووی: کە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی بەخشوە بەمن منیش ئەوە ئازادم کردی نات کوژین. ئەویش وتی: پاوێکی پیری بەساڵا چوو هیچ [پەل کێش و سەرۆك کارێکی نەبێت] نەخێزان و منداڵ کەی پێویستی بەژیانە؟ دەفەرموێت: ثابت ڕۆیشتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەدایك و باوکمەوە بەقوربانتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرو منداڵەکانیشی پێببەخشەوە بابۆی بگێڕمەوە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوانیش بەخشران بە تۆ)) دەفەرموێت: ثابت هاتەوە لای و پێی فەرموو: پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و منداڵەکەشی

بەخشی بەمن ئەوانیش دەگەڕێنەوە خزمەتت؟ وتی: [باخچەیەکی تازە دارخورمای بچووکم هەیە خۆم و ماڵ ومنداڵم بژێوی ژیانمان تەنها لەسەر ئەوەیە بێ ئەو ژیانم نی یە]. ثابت گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکەشی پێ ببەخشەوە داوای [باخە خورماکەی زوبەیری کرد ئەویش پێی بەخشیوە]. فەرمووی: ((ئەویش دەیبەخشینە تۆ)) ثابت هاتەوە لای و پێی فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکەتی بەمن بەخشیەوە ئەوە منیش دەی دەمەوە دەست خۆت [خودای گەورە خێرو بێری زۆری بەسەردا ڕژاندی] [ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ خێزان و ماڵ و منداڵی گەڕاندەوە بۆت ئینجا موسوڵمان ببە لەهەموو شتێك بەتەواوی دەپارێزرێت و سەلامەت دەبی] وتی: ئەریٚ ثابت کەعبی کوڕی ئەسەد چی بەسەر هات ؟ فەرمووی: کوژرا وتی: ئەی گەورەی شار ودەشت و دەر حویەیی کوڕی ئەخطەب چی بەسەر هاتووە؟ فەرمووی: ئەویش کوژرا. وتی: ئەی پێشەوا و هێرش بەرمان لەکاتی بەهێزی دا و پارێزەر و قەڵغانی ڕۆژی پشت هەڵکردن و شکستمان عەزالی کوڕی سموئال چی بەسەر هاتووە ؟ فەرمووی: ئەویش کوژراوە. وتی: ئەی دەوروبەری کۆڕو کۆبونەوەمان [(ناوی چەندین کەسی لەکەس و کاری خۆی برد)] واتە بەنی کەعبی کوڕە قورەیظەو بەنی عمروی کوڕی قورەیظە. فەرمووی: هەموویان کوژران و نەماون لەژیاندا [لەوانەیە خودای گەورە تۆی هێشتبێتەوە بۆ خێرو بەرەکەتێك بیەوێت هیدایەتت بدات بەرەو ئیسلام] وتی: ثابت من داوات لێ دەکەم [لەبەر خوا] بەو دەستانەی خۆت بم گەیەنە بە کەسوکار و هۆزەکەم، سویند بەخوا ژیان لەدوای ئەوان هیچ خێر و خۆشیەکی تێدا نی یە من ناتوانم خۆم ڕابگرم بەخوا [ماوەی تێکردنی سەتڵێك ئاو لە حەوزێك دا هەتا ئەگەم بە خۆشەویستەکانم وەنێوان من وبەیەك گەیشتنی خۆشەوستەکانم تەنها بەقەد بەتاڵ کردنەوەی ئەو سەتڵەیە]، [ثابت ئەوەی لەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد ئەویش فەرمانی کرد بە زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ و کوشتی...] کاتێك ئەمە گەیشت بە ئەبو بەکری صدیق ﷺ کە وتویەتی هەتا بگەم

بەخۆشەویستەکانم فەرمووی: وەڵڵاهی خوای گەورە دەیان گەیەنێت بەیەك لە ئاگری دۆزەخ بە ئەمری و هەتا هەتای تێیدا دەمێننەوە][٢٠١].

کەسێکی تری بەنی قورەیظە کەناوی ڕیفاعی کوڕی سەموئال بوو پەنای بردە بەر سەلی کچی قەیس کەیەکێك بوو لە خاڵۆژنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تکای بۆ کرد و فەرمووی: (ئەی نێردراوی خوا بە دایك وباوکمەوە بەقوربانت بم ڕفاعە بە من ببەخشن بانگەشەی ئەوە دەکات کە نوێژ دەکات لەمەو دواو گۆشتی وشتریش دەخوات (پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانی پاراست و بەخشی بە ئەو)[٢٠٢].

## دابەش کردنی دەسکەوتەکان

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە دابەش کردنی موڵك وماڵی بەنی قورەیظە و خێزان و منداڵەکانیشیان بەسەر موسوڵمانەکان دابەش کردن، بۆ زانیاری لەو ڕۆژەدا بەشی ئەسپ سوارو پیادەی جیاکردۆتەوە و پێنج یەکی بۆ (بیت المال) لێ دەرهێناوە، بۆ هەر سوار چاکێك سێ بەشی داناوە، دووبەش بۆ ئەسپەکەی و بەشێکیش بۆ خاوەنەکەی، بۆ پیادەش بەشێکی دانا. لە غەزای بەنی قورەیظە دا موسوڵمانان سی و شەش ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو، ئەمەش یەکەم جاربوو کە دەسکەوت بەشکردن پێوانەی تێدا ئەنجامدرا بێت وپێنج یەکی لێ جیاکرایەوە بۆ (بیت المال) بەهەمان شێوەی پێشو هەروەك لەوەو پێش پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێ و شوێنی تایبەت دابەشی دەکرد ئەو ڕێ و شوێنەشمان لە غەزوەکاندا باس کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و منداڵەکانی بەنی قورەیظەی بەسەعدی کوڕی زەیدی ئەنصاری لەبەنی

---

[٢٠١] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٨/٣) (٧٤١) وقال محققه: اسناده ضعيف لانه مرسل، والطبراني (الأوسط) (٨٢٢٦) وقال محققه: اسناده ضعيف فيه موسى بن عبيدة ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٢٣/٤) عن موسى بن عقبة. واللفظ لابن اسحاق والزيادات للطبراني والبيهقي.

[٢٠٢] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٩/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٩١/٢).

عبدولئەشهلدا نارد بۆ خاکی نەجد تالەوێدا بیان فرۆشێت و پارەکەشیان چەك و ئەسپی جەنگی پێ بکڕێت)[٢٠٣].

ئیمامی شافعی (رحمه الله) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و منداڵی بەنی قورەیظەی کرد و بە موشریکەکانی فرۆشتن، جابری کوڕی عبدوڕەحمان ئەبو شەحمی یەهودی کە پیرەژنێك و منداڵەکانی بوو هەموویانی کڕی لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی مایەوە لەژن و مندڵەکانیان کردیە سێ بەشەوە بەشێکی نارد بۆ (توهامە) بەشێکی تریشی بۆ (نجد) وەبەشێکی تریش بۆ ڕێگای شام بوو فرۆشتنی بە ئەسپ و چەك و وشتر)[٢٠٤].

ماڵ و خانوەکانیشیان بووە موڵکی کۆچکردووەکان بەبڕیاری یەکلا کەرەوەی سەعدی کوڕی موعاذ (رضي الله عنه) لە حەمیدی کوڕی هیلال (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((سەعدی کوڕی موعاذ (رضي الله عنه) فەرمانی کرد کە ماڵ و موڵك وخانوەکانیان بۆ کۆچکەرەکان بێت بێ ئەوەی بدرێتە ئەنصاریەکان ئەوانیش (واتە: ئەنصاریەکان) سەر زەنشتیان کرد لەسەر ئەو بڕیارە ئەویش بە کۆچکەرەکانی فەرموو: (من پێم خۆش بوو ئێوە نەچنەوە جێگای ئەوان و پێویستان پێیان نەبێت)[٢٠٥]. ڕەیحانەی کچی عەمروی قورەیظی کەوتە بەشی پێغەمبەری خوا ﷺ وە موسوڵمان بوو[٢٠٦]. بار و گوزەرانی موسوڵمانەکان ڕووی لە باشی کرد بەهۆی فەتح کردنی قەڵاکانی بەنی قورەیظەوە هەروەك خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (هەرکەس قسەتان بۆ بکات لە بارەی ئێمەوە کە ئێمە تێرمان خواردوە لە خورما ئەوە درۆتان لەگەڵ دەکات، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی بنی نەضیر و قورەیظەی کرد ئەوسا هەندێك خورماو ڕۆنە کەرەمان دەست کەوت)[٢٠٧]. هەندێك لە کۆچکردووەکان ئەو باخچە دارخورما

---

(٢٠٣) نفس المصدر السابق.

(٢٠٤) أنظر: (السنن الكبرى) للبيهقي (١٢٨/٩).

(٢٠٥) أخرجه: ابن سعد (٥٠٦/٢)، وقال الحافظ في (الفتح) (٥٢٦/٧): مرسل.

(٢٠٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٠٠/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٩٢/٢).

(٢٠٧) أخرجه: ابن حبان (٦٨٤) وقال محققه: اسناده قوي.

وشتانەی خواستبوویان لە ئەنصاریەکان گەڕاندیانەوە بۆیان لەبەر باش بوونی گوزەرانیان هەروەك ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لە ئەنصاریەکان چەندین دارخورمای لە زەویەکەی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دانابوو هەتا بەنی قورەیظە و نەضیری فتح کرد و پاشان دەروی لێ کرایەوە ئەوەی کە کابرا پی بەخشیبوو بۆی گەڕاندەوە ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: من کەس و کارم فەرمانیان پێکردم کە بچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای ئەو شتانەی لێ بکەمەوە کە کەس وکارم داویانەتێ کە ئەگەر هەمووی نەکرا با هەندێکیمان بداتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی دابوویە ئوم ئەیمەن، من چومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی پێدامەوە، ئینجا دایکی ئەیمەن هاتەوە پۆشاکەکەی لە گەردنم ئالاند و فەرمووی: وەللاهی ئەوشتانەتان نادەمەوە دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە منی بەخشی، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: (ئەی دایکی ئەیمەن ئەوە وازلێ بهێنە ئەوەندە و ئەوەندە بۆ تۆ) وتی: نەخێر نایدەمەوە بەوزاتەی کە بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر نی یە، هەر بەو جۆرە بۆی زیاد دەکرد ئەویش هەروای دەفەرموو هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دە ئەوندەی پێ بەخشی ئینجا ڕازی بوو)[٢٠٨].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێنج یەك و بەشی تایبەتی خۆی لە بەنی قورەیظە بەشی هەموو ئەنصاریەکانی لێدا. ئەبو سەعدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (خەڵکانێك لە ئەنصاریەکان لەکاتی فەتح کردنی بەنی قورەیظەدا داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە پێیان ببەخشێت)[٢٠٩]. هەر کەسێك لەوان دوای لێدەکرد پێی دەبەخشی هەتا هەرچی لەلای هەبوو تەواو بوو هیچی نەما ئینجا فەرمووی پێیان لەو کاتەدا کە هەموو شتێکی بەدەستی خۆی بەخشی وەهیچی بەدەستەوە نەما: ((مایكون عندي من خير لا اذخره عنكم، وانه من يستعفف يعفّه الله، ومن يتصبّر يُصبره الله، ومن يستغن يغنيه الله، ولن تُعطوا عطاءً خيراً وأوسع من الصبر))[٢١٠] واتە: ((هەرچیەك لە چاکەو خێر لەلام بوو بێت لە ئێوەم نەشاردۆتەوە، وە هەرکەسێك خۆی بە پاکی ڕابگرێت وە دەست لە شتێك هەڵگرێت کە ماق ئەوی پێوە نی یە

---

[٢٠٨] أخرجه: البخاري (٤١٢٠، ٣١٢٨)، ومسلم (٤٥٧٩) واللفظ له.

[٢٠٩] أخرجه: البزار (٣٧٥٢) وانظر: فتح الباري (١١/٣٦٧).

[٢١٠] أخرجه: البخاري (٦٤٧٠).

خودا بە پاکی ڕایدەگرێت، و هەر کەسێك دان بەخۆی دا بگرێت و ئارام بگرێت خوا ئارامگرو ڕاوەستاوی دەکات، وە هەرکەسێك دەست هەڵگرێت لە داواکردنی خەڵك خوا دەوڵەمەندی دەکات، هیچ بەخشین و چاکەیەك نەبەخشراوە چاکتر بێت لە ئارامگرتن».

بەم جۆرەی باسکرا حوکمی سەعدی کوری موعاذ ﷺ جێ بەجێ کرا بەسەر جولەکەکانی بەنی قورەیظە، ئەوە سزایەکی دادپەروەرانەیە بۆ هەرکەسێك بیەوێت ناپاکی وستەم و پەیمان شکێنی بکات و خیانەت لە موسوڵمانان بکات و پاشقولیان لێ بگرێت گیانی خۆیان خستە بەرمەترسی کوشتن و ماڵ و سامانیشیان دەستی بەسەردا گیرا و ژن و منداڵەکانشیان کران بە کۆیلە لە پاداشتی کارەکانیان. پیاوانی بەنی قورەیظە تاوان باری جەنگ بوون چونکە پەیمانیان شکاند و هەڵیان وەشاندەوە و پاڵیان دایە لای دوژمنەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ وە کەوتنە هاوکاری و یارمەتی دانیان لە گۆڕەپانی ئەو جەنگەی کە هەڵگیرسابوو بە فیتی ئەوان لە نێوان موسوڵمانەکان و ئەحزابدا، ئەو پەیمان شکێنیەیان ناپاکیەکی گەورەبوو کەهیچ سزایەك هاوشان ودادپەروەرانەتر نەبوو لە کوشتن ئەوە هاوکات دەقاو دەقی شەریعەت و ڕێسای خۆشیان بوو؛ هەروەك لە (سفر التثنية) دا هاتووە: (کاتێك لە شارێك نزیك دەبیتەوە بۆ ئەوەی جەنگی تێدا بکەیت ئەو کات بانگیان بکە بۆ ئاشتی و دانوستان، ئەگەر وەڵامیان دایەوە بۆ سوڵح کردن ئەوە فەتح دەکرێت بۆئە هەموو ئەو خەڵکەی تێدایە دەبێتە ژێر دەستەی تۆ و هۆگرت دەبن و دەبنە کۆیلەی تۆ، وەئەگەر ئاشتەواییان لەگەڵ نەکردیت وەجەنگیان لەگەڵ کردیت ئەوە گەمارۆیان بدە ئەگەر پەروەردگارت دەسەڵاتی پێدای ئەوە هەموو نێرینەکانیان بە شمشێری سەربڕە بکوژە، ژن و منداڵ و مەڕو ماڵاتیشیان وە هەرچی لەناو شارەکەشیاندایە هەموو دەسکەوتی خۆتە، تۆش لە غەنیمەی دەسکەوتی دوژمنەکانت دەخۆیت کە پەروەردگارت بە هێز و دەستەڵاتی ئەوەی پێ بەخشیت)[٣١١].

---

(٣١١) أنظر: (السيرة) للندوي ص: ٢٦٣.

# کۆچی دوای سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ

ئەمەو پێش باسمان کرد کە سەعدی کوڕی مەعاذ ﷺ بە هۆی تیری یەکێك لە موشریکەکانەوە شانی پێکراو بریداربوو بەسەختی، پێغەمبەری خوا ﷺ داخی کرد و برینەکەی خوێنی لێ وەستا، وەسەعدیش لە خوا پاڕایەوە کە بیهێڵێتەوە و نەمرێت هەتا چاوی ڕۆشن دەبێت بە ڕسوابوونی بەنی قورەیظە، کاتێك کۆمەڵی موشریکەکان ڕۆیشتنەوە و مەیدانیان چۆلکرد، موسوڵمانان گەمارۆی قەڵای بەنی قورەیظەیان دا بۆ دواجار جولەکەکان ڕازی بوون کە بێنە خوارەوە لە سەر ئەوەی سەعد ﷺ حوکمیان بکات، چونکە سەعد هاوپەیمانیان بوو لەسەردەمی نەفامیدا ئەوان تکایان وابوو بەسۆز و بەزەیی بێت بەرامبەریان وچاکەیان لەگەڵدا بکات ئاوڕێکی پڕ بەزەیان لێبداتەوە ئەوان نەیان دەزانی لە هەموو دروست کراوەکانی خوای گەورە زیاتر ڕقی لێیانە و توڕەیە لەبەر ئەوەی باوەڕدارێکی ڕاستەقینە بوو، سەعدیان هێنا لەناو ئەو دەوارەی کە لەناو مزگەوتدا بەفەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هەڵدرابوو بۆ ئەوەی سەری لێ بدات و لە نزیکەوە ئاگای لێ بێت. هێنایان بۆلای بەنی قورەیظە و فەرمانی کرد بەکوشتنی پیاوە چەك هەڵگرەکانیان وە بە دیل گرتنی ژن ومنداڵەکانیان، بەمەش خوای گەورە چاوی ڕوون کردەوە و شیفای دڵ ودەروونی دا بە ئەو ڕسوایەی کە بەسەر بەنی قوریظەی هێنا وبەچاوی خۆی بینی، پاشان گەڕایەوە بۆ ناو ڕەشماڵەکەی لەناو مزگەوتی مەدینە و نزای کرد و پاڕایەوە لە خوا کەبرینەکەی دوچاری خوێن بەربوون بکات بۆ ئەوەی پلەی شەهیدی پێ ببەخشێت خوای گەورە نزاکەی گیراکرد و برینەکەی کولایەوە و خوێنی لەو شەودا نەوەستایەوە هەتا گیانی پاکی سپارد ﷺ)[٢٤٢].

ئەم ڕوداوەی کۆچی دوای سەعد ﷺ لە چەندین گێڕانەوەدا هاتووە هەریەکەیان لایەنێك لە لایەنەکانی ڕوداوەکەی باس کردووە دوای کۆکردنەوە و ڕێخستنی ڕوداوەکە تەواو ڕوون و ئاشکرا دەبێت بەم شێوەی خوارەوەیە:

---

(٢٤٢) انظر: (البداية) (لابن كثير (١٢٧/٤)).

لە خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ([سەعد ﷺ لەغەزای خەندەق دا شانی بە تیر پێکرا شادەماری شانی گرتبوو. پێغەمبەری خواش ﷺ دەوارێکی لەناو مزگەوتدا بۆ هەڵدا [کە پێی دەوترا خێمەی (رفیدة)] بۆ ئەوەی سەردانی بکات و لەنزیکەوە ئاگاداری بێت])[٣١٣]. [ڕوفەیدەی ئەسلەمی ئەو ئافرەتە بوو کەتیماری بریندارەکانی دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێك بەلای سەعدا تێ دەپەڕی ئەگەر ئێوارە بووایە دەیفەرموو: ئەمڕۆت چۆن بەسەر برد؟ ئەگەر بەیانی بووایە دەیفەرموو: ئەم شەوت چۆن بەسەر برد؟ ئەویش دەنگ و باسی خۆی پێ دەوت])[٣١٤]. لەگێڕانەوەیەکی تردا لە پیاوێکی ئەنصاریەوە دەڵێت: (کاتێك سەعدی کوڕی موعاذ لە بەنی قورەیظە پێکراو گەڕایەوە خوێنی دەستی بەربوو ئەمە گەیشتەوە بەپێغەمبەری خودا لەگەڵ چەند کەسێك چوون بۆ لای و سەری گردە سەر ڕانی فەرمووی: ((اللهم إنَّ سعداً قد جاهد في سبيلك وصدّق رُسلك وقضى الذي عليه فاقبل روحهُ بخيرٍ ما تقبلتْ به الأرواح))[٣١٥]. واتە: ((خوایە سەعد لە پێناوی ڕێگەی تۆدا جیهادی کردووە پێغەمبەرەکەتی بەڕاست زانی، وەئەو ئەرکەی لەسەری بوو ئەنجامیدا تۆش ڕوحەکەی وەرگرەبە باشترین شێوازی ڕۆح وەرگرتن)). دواتر برینەکەی هەرسانی کرد بۆیە گواستیەوە بۆ ناو کەس وکاری خۆی لە ناوماڵەکانی خۆیان لە عبدولئەشهەل][٣١٦].

[پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەردانی سەعدی دەکرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری بێت و پێی دەفەرموو: ((جزاك الله خيراً من سيّد قومٍ، فقد صدقت الله ما وعدته والله صادقك ما وعدك)). واتە: ((خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتت بداتەوە ئەی گەورە و سەرداری

---

[٣١٣] أخرجه: احمد (٥٦/٦)، والبخاري (٤٦٣)، ومسلم (١٧٦٩).

[٣١٤] أخرجه: احمد (الفضائل) (١٤٨٩)، والبخاري (الادب المفرد) (١١٥٨)، والحاكم (٢٠٥/٣)، وابن سعد (٤٢٧/٣) واللفظ له، وصحح اسناده الحافظ في (الاصابة) (٣٠٣/٤)، والشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٥٨) و (صحيح الادب المفرد) (٨٥٩).

[٣١٥] أخرجه: احمد (فضائل الصحابة) (١٤٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٣١٦] أخرجه: ابن سعد (٤٢٧/٣)، وصححه الشيخ في (الصحيحة) (١١٥٨).

خۆزگەت، بەڕاستی تۆ لەو بەڵێنەی کە داتبە خوا ڕاستت کرد و بەجێت هێنا، خوای گەورەش بەڕاستی بەڵێنی خۆی لەگەڵ تۆدا دەباتە سەر))[٤١٧].

کاتێك بڕیاردان لەسەر بەنی قورەیظە کۆتای پێهات سەعد ﷺ گەڕایەوە ناو خێمەکەی خۆی [برینەکەش چاك بووە وە هەتا وای لێهات تەنها قەتماغەی وەك ڕوبۆشێك پێوە مابوو لە گێڕانەوەیەکی تردا برینەکەی بە ئەندازەی دەنکە نۆکێك مابوو][٤١٨]. [پاشان سەعد ﷺ کەوتە نزاکردن و پاڕانەوە لە خوا و فەرمووی: (خوایە گیان تۆ دەزانی هیچ کەسێك نی یە لە من زیاتر پێی خۆش بێت لە پێناوی تۆدا جیهاد بکات لەگەڵ خەڵکانێك کە پێغەمبەرەکەتیان بەدرۆ خستۆتەوە لەشاری خۆی وەدەریان ناوە شەڕیان لەگەڵ بەرپاکردووە و ئەوەی بۆیان کرابێت بەرامبەری درێغیان نەکردووە، ئەی خوایە من وای بۆ دەچم کە جەنگ کردن لەنێوان [ئێمە و ئەواندا کۆتای پێهاتووە و نەماوە]. ئەگەر جەنگێك ماوە لەگەڵ قورەیش ئەوە بمهێڵەوە تاکو جیهاد بکەم لە دژیان، وەئەگەر جەنگ لەنێوانیشمان کۆتای پێهاتووە ئەوا برینەکەم بکولێنەوە و بیکەرە هۆی مردنم [ئەوە بوو هەر لەو شەوەدا][٤١٩] برینەکەی کولایەوە و خوێنی بەربوو][٤٢٠]. [ئەو لە شەودا ڕاکشابوو وە کەس پێی نەزانی بوو برینەکەشی خوێنی لێ نەوەستا هەتا کۆچی دوای کردبوو][٤٢١].

[خوێنی برینەکەی ڕۆیشتبوو تا چوو بووە ناو خێمەکەی تەنیشتیان کە ڕوفەیدەی تێدابوو ئەویش فەرمووی: ئەی خەڵکی ناو ئەو خێمەیە ئەی خەڵکی ناو ئەو خەێمەیە ئەوە چی

---

[٤١٧] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١٩٧٨٤) وقال محققه: اسناده حسن مرسل، وابن سعد (٤٢٩/٣)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٤٦٨): رجاله ثقات.

[٤١٨] أخرجه: احمد (١٤١/٦)، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حسن، وقال ابن كثير (البداية) (١٢٣/٤): اسناده جيد، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٧٤/١): اسناده صحيح، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٧).

[٤١٩] أخرجه: البخاري (٤١١٧، ٤١٢٢)، ومسلم (١٧٦٩)، وابو داود (٣٠٨٥)، والنسائي (٤٥/٢).

[٤٢٠] في رواية حميد بن هلال قال: انه مرّت عنزٌ وهو مضطجعٌ فاصاب ظلفها موضع الجرح فانفجر حتى مات. أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢٧/٣) وهي رواية مرسلة.

[٤٢١] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٣٢٧) عن عروة، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٥٦): مرسل وفيه ابن لهيعة.

یە لای ئێوە دێتە خوارەوە بۆ لامان؟ تەماشایان کرد ئەوە خوێنی برینەکەی سەعدە بەربووە دواجار گیانی سپارد ﷺ][٣٢٢]. کاتێك خۆر ئاوابوو پێغەمبەری خوا ﷺ [نوست جیرائیل ﷺ هاتە خزمەتی.... فەرمووی: ئەوە کێ بوو لە ئومەتەکەت ئەمشەو کۆچی دوای کرد دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرایە سەرپشت وە عەرشی خوای بۆ هاتە لەرزین][٣٢٣]. وە خەلکی ئاسمان بە مردنەکەی گەشانەوە؟ فەرمووی: ((بەدڵنیاییەوە ئەوە دەبێت سەعد بێت چونکە ئەو ئێوارە حاڵی پەریەشان بوو))][٣٢٤]. [پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا هەر وەك جیرائیل پرسیاری کردبوو] فەرمووی: ((سەعد چی بەسەر هاتووە؟)) فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو گیانی سپارد، [کەس و کارەکەی هاتن هەڵیان گرت وبردیانەوە] بۆ ناو ماڵ و حاڵی خۆیان، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی ئەنجامدا [ڕۆیشت و ئێمەش لە خزمەتیا دەرچووین زۆر بە گورجی و خێرای هەنگاوی دەنا هەتا هەموو لاکانی نەعلەکانی بچڕا، وە عەباکانمان لەشان کەوتە خوارەوە، هاوەڵان سکاڵای ئەوەیان بردە خزمەتی و فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماندوت کردین بە ڕۆیشتنە خێراکەت؟ لە وەڵام دا فەرمووی: ((اني أخاف ان تسبقنا الملائكة اليه فتغسله كما غسلت حنظلة)) واتە: ((لەوە دەترسم فریشتەکان زوتر لە ئێمە بگەنە لای و بیشۆن هەروەك حەنظەلەیان ﷺ شۆرد)). (حەنظەلەی کوڕی ئەبو عامیر ﷺ لە غەزای ئوحود شەهید کرا جەنابەتی لەسەر بوو بۆیە فریشتەکان شۆردیان).

که پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ماڵی سەعد ﷺ بینی شۆردرابوو دایکی بۆی دەگریا و دەیفەرموو: ئەی دایکت ئەزی سەعد ئەی خاوەن ئەبەردی و جوامێری وکۆڵنەدان

---

[٣٢٢] أخرجه: البخاري (٤١١٧، ٤١٢٢)، ومسلم (١٧٦٩)، وابوداود (٣٠٨٥)، والنسائي (٢/٤٥).

[٣٢٣] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٠٦) والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٩).

[٣٢٤] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٥٢) وقال محققه: اسناده حسن مرسل، وابن سعد (٣/٤٢٣)، واحمد (الفضائل) (١٤٨٩)، والحاكم (٣/٢٠٥).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((كل نائحة تكذب الاّ ام سعد))[٢٢٥] واتە: ((هەموو شیوەن و لاواندنەوەیەك بۆ مردو درۆیە تەنها لاواندنەوەی دایکی سەعد نەبێت))]. [لە چەندین گێڕانەوەدا ئەوە بەرچاو دەکەوێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ تەرمەکەی گەڕاوەتەوە مزگەوت وە خۆی و هاوەڵانی نوێژیان لەسەر کردووە]، [عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر تەرمەکەی ئامادەبوو سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە من گریانی ئەبو بەکر و عومەرم لێك جیادەکردەوە ئەوان هەروەك ئەوئایەتەی خودابوون کە دەفەرموێت: ﴿ رُكَّعًا...رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ... ﴾ (الفتح: ٢٩) پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك خەفەتێکی دەبوو ڕیشی خۆی دەگرت)[٢٢٦].

---

[٢٢٥] أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٤٢٧/٣)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٥٨). لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەسمائی کچی یەزید دەفەرموێت: [لما خرج بجنازة سعد صاحت امه فقال لها رسول الله ﷺ: ((الا يرقأ دمعك ويذهب حُزنك فان ابنك أول من ضحك الله له وأهتز له العرش))] واتە: (کاتێك تەرمی سەعدیان برد دایکی هاواری لێ هەڵسا بەکوڵ بۆی دەگریا پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((خەفەتی بۆ مەخۆ و فرمێسکت بسڕە کوڕەکەت یەکەم کەسە کە خودای گەورە بەڕوویەوە پێکەنیوە و عەرشی بۆی هاتۆتە لەرزین))...... وهو حديث ضعيف أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٩٨٤)، واحمد (٢٧٥٨) وقال محققه: اسناده ضعيف – واحمد (الفضائل) (١٥٠٠)، والطبراني (الكبير) (٥٣٤٤)، والحاكم (٢٠٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن خزيمة (التوحيد) (٥٠٨) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن ابي حاتم (السنة) (٥٩٩) وقال محققه الشيخ الالباني: اسناده ضعيف. لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەدایکی سەعد بڵێن: ((لاتزيدي على هذا كان والله ما علمت حازماً وفي امر الله قوياً)) ((لەوە زیاتر مەڵێ وەڵڵاهی لەو کۆڵنەدەرترو ڕاستتر لەجێبەجێ کردنی فەرمانی خودام نەبینیوە)) اخرجه: الطبراني (٢٠٨٧)، وقال الحافظ (الاصابة) (٣٨/٢): اسناده ضعيف.

[٢٢٦] أخرجه: احمد (٢٥٠٩٧) وقال محققه: حسن، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٧). لەگێڕانەوەیەکی تردا لە خاتوو عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (ان رسول الله ﷺ كان اذا اهمه شيءٌ اخذ بلحيته..) واتە: ((کە پێغەمبەریخودا ﷺ خەمێکی هەبووایە لەسەر شتێك ڕیشی موبارەکی دەگرت)). أخرجه: البخاري (٣٢٤٨)، ومسلم (٢٤٦٩)، وابن حبان (٦٤٣٩). لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە دەفەرموێت: (كان رسول الله ﷺ اذا اشتد وجده اكثر من مس

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا کە تەرمی سەعدیان ﷺ ھەڵ بوو فەرمووی: ((اهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ))[٣٢٧] واتە: ((عەرشی خوای بەخشندە ھاتە لەرزین بۆ مردنی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ))]. دووڕووەکان دەستیان گرتبوو بەتەرمەکەی سەعد ﷺ کاتێك ھەڵیان گرتبوو وتیان: سەعد لەبەر ئەو حوکمەی کە لەبارەی بەنی قوڕەیظەوە دابووی ئاوھایە وە وتیان: ئای چەند سوکە؟ ئەو وتانەیان گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: [((لا انما کانت تحمله الملائکة معهم))[٣٢٨] واتە: ((نا ئەوە لەبەر ئەوەیە کە فریشتەکان لەگەڵیاندا ھەڵیان گرتووە))]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: [((ولکن الملائکة تحمله)) واتە: ((بەڵام فریشتەکان ھەڵیان گرتبوو))[٣٢٩]]. [...خەڵکەکە فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ھیچ تەرمێکمان ھەڵنەگرتووە سوکتربێت بەلامانەوە لە تەرمی سەعد ﷺ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ما یمنعه ان یخفّ وقد ھبط من الملائکة کذا وکذا لم یھبطوا قبل یومھم قد حملوە معکم)) واتە: ((تەرمەکەی بۆ کێشی سوك نەبێت لەکاتێکدا ئەوەندە و ئەوەندە فریشتە دابەزیون کە پێشتر ئەوەندە دانەبەزیون ئەوان لەگەڵتان ھەڵیان گرتووە))][٣٣٠]. [جابر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد و ئێمەش دواتر خستمانە گۆڕەکەیەوە و خۆڵمان

---

لحیته الکریمة) واتە: ((پێغەمبەری خودا ﷺ کەخەفەتی لەسەر شتێك زیادی دەکرد زیاتر دەستی لەرِیشی موبارەکی دەدا)) اخرجه: ابو الشیخ (اخلاق النبي ﷺ) رقم (١٥٧) وقال محققه: حسن الاسناد وكذا قال الحافظ العراقي في (تخريج الاحياء) (٣٧٨/٢): اسناده حسن.

[٣٢٧] اخرجه: البخاري (٣٨٣).

[٣٢٨] اخرجه: احمد (٢٣٤/٣)، ومسلم (٢٤٦٧)، وابن ماجة (١٥/١)، والترمذي (٣٨٤٩)، والحاكم (٢٠٧/٣)، وابن حبان (٧٠٢٩-٧٠٣٠) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٣٠٢٤)، و (الصحيحة) (١٤٩/٣).

[٣٢٩] اخرجه: احمد (٢٣٤/٦)، وابن حبان (٧٠٢٨) وقال محققه: حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٦٧).

[٣٣٠] اخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٤٢٧/٣)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٥٨).

گردە سەر و ڕێکمان خست بۆ ماوەیەکی درێژ پێغەمبەری خوا ﷺ (سبحان الله)ی وت وخەڵکەکەش وتیانەوە پاشان (الله أكبر)ی فەرموو خەڵکەکەش وتیانەوە ئینجا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی لەو کاتە (سبحان الله)ت وت؟ فەرمووی: ((لقد تضايق على هذا العبد الصالح قبره حتى فرج الله عنه)) واتە: ((گۆڕەکە تەسک بووە وە لەسەر ئەو بەندە صالحە وگۆڕەو شاردرا هەتا خوای گەورە دەروی لێ کردەوە))][٣٣١].

لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((هذا (الرجل الصالح) الذي تحرك له العرش وفتحت له ابواب السماء وشهده سبعون الف ملك من الملائكة لقد ضم ضمّة ثم فُرّج عنه))[٣٣٢] واتە: ((ئەو بەندە چاکەی خوا کە عەرش بۆی هاتە لەرزین و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرایە سەرپشت و حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی بەڕێ کردنیی تەرمەکەی بوون گۆڕەو شارێك درا چۆن گۆڕەو شارێك پاشان دەروی لێکرایەوە و ڕزگاری بوو)).

لە گێرانەوەیەکی تردا فەرمووی: ((لقد نزل لموت سعد بن معاذ سبعون الف ملك ما وطئوا الارض قبلها – وقال حين دفن – سبحان الله لو انفلت احد من ضغطة القبر لا نفلت منها سعد ولقد ضم ضمة ثم اُفرج عنه))[٣٣٣] واتە: ((بۆ مردن وبەڕێ کردنی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ حەفتا هەزار فریشتە ئامادەبوون بەر لە ئەو پێیان لەسەر زەوی دانەنابوو)) وە لە کاتی شاردنەوەی تەرمەکەیدا فەرمووی: (سبحان الله) ئەگەر کەسێك لە گۆڕەوشاری گۆڕ ڕزگاری

---

[٣٣١] أخرجه: احمد (١٥٠٢٩) وقال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الكبير) (٥٣٤٦)، والحاكم (٢٠٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٩/٤) وفي (اثبات عذاب القبر) (١١٣).

[٣٣٢] أخرجه: احمد (٣٢٧/٣)، والنسائي (١٠٠/٤)، وابن حبان (٧٠٣٣): وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٢٠٦/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٨/٤)، وابن سعد (٤٣٠/٣)، والبزار (٢٦٩٨)، وقال ابن كثير (البداية) (١١٨/٤): رواه البزار واسناده جيد، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤٨)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٧٨): اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣٣٣] أخرجه: البزار (٢٦٩٨)، وقال ابن كثير (البداية) (١٢٨/٣): اسناده جيد، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٣٤٥): اسناده جيد.

ببوایە ئەوە سەعد ﷺ ڕزگاری دەبوو ئەو گوشین و گۆڕەوشارێك درا چۆن گۆڕەوشارێك پاشان ڕزگاری بوو)).

هەروەها لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((گۆڕ گوشین و گۆڕەوشارێك هەیە ئەگەر کەسێك لێی ڕزگاربووایە ئەوە سەعدی کوڕی موعاذ ڕزگاری دەبوو لێی))[٣٣٤]

محمدی کوڕی شەرحەبیل دەفەرموێت: "پیاوێك چنگێك خۆڵی لەسەر گۆڕی سەعد ﷺ هەڵگرت ئەو ڕۆژە دواتر کردیەوە و بینی بۆتە میسك"[٣٣٥].

بەو جۆرە سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ گیانی پاکی سپارد، لەدەست دانی ئەو کۆسپێکی گەورەبوو بۆ سەر موسوڵمانەکان، خاتوو عائیشە ﷺ دەفەرموێت: هیچ کەسێك لەدەست دان و کۆچی دواییەکەی لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دوو هاوەڵەکە یاخود یەکێکیان ئەوەندە کۆسپێکی گەورە نەبوو کە موسوڵمانان دوچاری کۆسپێکی دڵتەزین بکات بەتەنها سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ نەبێت)[٣٣٦]. وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوەتە موسوڵمانان بە هەندێك لەو شتانەی کە خوای گەورە بە سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ بەخشیوە لە بەهەشتی پڕنازو نیعمەتدا. بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەفەرموێت: [جلێکی ئاوریشمی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنابوو هاوەڵانیش دەستیان لێ دەداو سەریان لێ سوڕمابوو لەبەر نەرم ونیانیەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لمناديل سعد بن معاذ في الجنة الين من هذا

---

[٣٣٤] أخرجه: احمد (٦/٥٥)، والنسائي (٤/١٠٠)، وابن حبان (٣١١٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال ابن كثير (البداية) (٤/١٢٨): اسناده صحيح على شرطهما، وقال الحافظ العراقي (الاحياء) (٤/٤٨٧): رواه احمد واسناده جيد، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٦٩٤): اسناده صحيح.

[٣٣٥] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٠/٣٧٥)، وابو نعيم (المعرفة) (٦٩٧)، وابن سعد (٣/٤٣١)، واحمد (الفضائل) (١٤٩٤)، وقال السيوطي (كنز العمال) (٣٧٠٩٠): سنده صحيح.

[٣٣٦] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٠/٣٧٤) وقال محققه: اسناده حسن – اورده بنفس الاسناد كلٌ من: احمد (الفضائل) (١٤٩٣)، وابن سعد (الطبقات) (٣/٤٣٣).

ر خيرٌ من هذا)) واتە: ((دەستە سڕەکەی سەعدی کوڕی موعاذ لە بەهەشتدا لەوە باشتر و نەرمترە))[٣٣٧].

## پاشماوەی ڕوداوەکانی غەزای خەندەق

١- هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خاتوو زەینەبی کچی جەحش (رضي الله عنها):

خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوەبوو جیاوازی چینایەتی و خونەریتی بە کوڕکردن کە لە نەریتە باوەکانی سەردەمی نەفامی بوون وە لە دڵ ودەروونی خەڵکی دا جێگیربوون هەڵبووەشێنێتەوە ونەی هێڵێت. پەیوەندی ژن و مێردایەتی نێوان زەینەبی کچی جەحش و زەیدی کوڕی حاریثە ﷺ زۆر خراپ بوو بەتایبەتی زەینەب خۆی بەشایستەی زەید نەدەزانی، زەید هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای گوزەرانی خۆی لەگەڵ زەینەب لەلاباس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد کەدەست بەرداری هاوسەرەکەی نەبێت بشوو درێژ و ئارامگربێت وە لە خودا بترسێت لەسەر ئەو گرفتانەی دێنە ڕێگای، لەگەڵ ئەوەش دا تا دەهات پەیوەندی نێوانیان خراپتردەبوو هەتا گەیشتە ئەو ئەندازەیەی کەلێك جیابنەوە کاتێك زەید هاوسەرەکەی تەلاق دا ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژی بەسەر چوو خوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانەوە لە پێغەمبەری خوای ﷺ مارەگرد هەروەك دەفەرمویێت: ﴿...فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾ (الأحزاب: ٣٧) واتە: ﴿... کاتێك زەید بێ زار بوو لە زەینەب و پێویستی پێ نەما و جیابوونەوە ئێمە زەینەبمان لە تۆ مارەکرد بۆ ئەوەی هیچ شەرمەزارییەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێت لە هێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان هەمیشە فەرمانی خوا جێبەجێ کراوە﴾ پێشتر بەزەیدیان ﷺ دەوت زەیدی کوڕی محمد[٣٣٨] چونکە لە ماڵی ئەو دا گەورە ببوو هەتاکو ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە خودا دەفەرمویێت: ﴿ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ

---

[٣٣٧] أخرجه: البخاري (٣٢٤٨)، ومسلم (٢٤٦٩).

[٣٣٨] أخرجه: البخاري (٧٤٢٠).

فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٥) واتە: ﴿ئەو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بەرن و بانگیان بکەن، ئەوە پەسەندە لای خوا ئەگەر باوکیانتان نەدەناسی خۆ برای دینیتانن سەر بەئێوەن و لە ئێوەن (ئەگەر دوور لە سوکایەتی هەڵەیەکتان کرد ئەوە قەیناکە، بەڵام ئەگەر لەدڵتاندا نیەتێکی ناپاك هەبێت بۆ سوکایەتی پێکردنیان ئەوە لێپرسینەوەی دەبێت هەمیشە وبەردەوامیش خوا لێخۆش بوو و میهرەبانە﴾ ئەو هاوسەرگیریەی پێغەمبەری ﷺ لەگەڵ خاتوو زەینب لەدوای غەزای بەنی قورەیظە بوو لەساڵی پێنجەمی کۆچی بەڕای زۆرینەی زانایان[٣٣٩]، لەکاتی گواستنەوەکەی دا پێغەمبەری خودا ﷺ نان و چێشتێکی زۆری ئامادەکرد و میوانداریەکی گەورەی بۆ ئەوە سازکرد بەشێوەیەکی شایستە هەروەك ئەنەس دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودام ﷺ نەبینوە نان و چێشتی شایی بۆ هیچ کام لە هاوسەرەکانی ئامادەبکات وەك ئەوەی بۆ زەینەبی ئامادەکرد. وەلیمەی زەینەبی بە مەڕێك ساز کرد)[٣٤٠]. ئەو هاوسەرگیریە شانازی وستایشێکی جوان بوو بۆ خاتوو زەینەب (رضي الله عنها) ئەو هەموو کات شانازی بەسەر هاوسەرەکانی ترەوە دەکرد بەو هاوسەگیریە پیرۆزەی، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (خاتوو زەینەب (رضي الله عنها) شانازی دەکرد بەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەرەوە ﷺدەیفەرموو: (ئێوە کەس وکارتان مارەیان بڕیون من خودای گەورە مارەی بڕیوم لە پێغەمبەر ﷺ لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە)[٣٤١]. هەر بەو بۆنە پیرۆزەشەوە ئایەتەکانی حیجاب دابەزین هەروەك ئەنەس[٣٤٢] ﷺ دەفەرموێت: (من لەهەموو خەڵکی زاناترم و دەزانم کەی حیجاب دابەزی...

---

[٣٣٩] أخرجه: البخاري (٧٤٢١).

[٣٣٩] أخرجه: البخاري (٥٤٦٦)، ومسلم (١٤٢٨).

[٣٣٩] انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣٨/٤)، وابن سعد (الطبقات) (٩١/٢).

[٣٣٩] أخرجه: البخاري (٤٧٨٢).

[٣٤٠] انظر: (البداية والنهاية) (١٤٧/٤).

[٣٤١] أخرجه: البخاري (٥١٦٨)، ومسلم (١٤٢٨).

[٣٤٢] أخرجه: البخاري (٧٤٢٠).

پێغەمبەری خودا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە، ڕۆژی گواستنەوەکەی لە شاری مەدینە بوو، لەدوای ئەوەی خۆر بەرزبووە خەڵکی بانگ هێشتی خواردنی ژن گواستنەوە کرد، پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشتوو خەڵکەکەش لە خزمەتیا دانیشتن خەڵکەکە هەڵسان، هەتاکو پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵنەستا دواتر ڕۆیشت، منیش لەخزمەتیا ڕۆیشتم هەتاکو گەیشتە بەر دەرگای ژوورەکەی خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) پاشان گومانی وابرد کە خەڵکەکە ڕۆیشتوون، ئینجا گەڕایەوە منیش لە خزمەتیا گەڕامەوە، کە چی ئەوان لە شوێنی خۆیان دانیشتبوونەوە دووبارە تەشریفی گەڕایەوە هەتاکو گەیشتەوە ژوورەکەی خاتوو عائیشە منیش لە خزمەتیابووم، دواتر گەڕایەوە منیش گەڕامەوە لە خزمەتیا ئەمجارە بینم هەستابوون پێغەمبەر ﷺلەنێوان من و خۆیدا پەناگەیەکی دانا خودای گەورەش ئایەتەکانی حیجابی دابەزاندە سەری[٢٤٢].

# کوشتنی ئەبو ڕافیع سەلامی کوڕی ئەبولحەقیق

ئەبو ڕافیع سەللامی کوڕی ئەبو حەقیق یەکێك بوو لەسەرکردەی جولەکەکانی بەنی نەضیرکە پێغەمبەری خوا ﷺ دووری خستبوونەوە لەشاری مەدینە لە دوای ئەوەی پەیمانی خۆیان شکاند لەگەڵ موسوڵمانەکاندا، وە هەروەها لەدوای ئەوەی ئیبن ئەبیل حقیق لەگەڵ سەرکردە ناودارەکانی تری بەنی نەضیر ڕۆیشتن بەرەو شاری خەیبەر و لەوێ داڵدەیاندان و پشتیوانیان لێ کردن ئەو لەوێدا نیشتەجێی قەڵایەکی تایبەت بەخۆی بوو. سەرکردەکانی بەنو نەضیر بەردەوام چاوەڕێ دەرفەتێکی گونجاو بوون بۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسوڵمانەکان و ئاواتیان دووبارە گەڕانەوە بوو بۆ شاری مەدینە، بەڵام ئەوان بەتەنها نەیان دەتوانی بەو کارە هەڵستن بۆیە کەوتنە دروست کردنی پەیوەندی بەربڵاو و نوێنەری خۆیان بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوە تا بەرەیەکی گەورە و بەهێز پێك بهێنن لەگەڵ سەرجەم عەرەبەکاندا بە مەبەستی پەلاماردانی موسوڵمانەکان لە شاری مەدینەدا، ئەم تاوانبارەش (سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق) ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پێکهێنانی بەرەیەکی گەورە لەهۆزەکانی غەطەفان و هاوپەیمانەکانیان لەناوچەی نەجددا، وەك

[٢٤٢] أخرجه: البخاري (٥٤٦٦)، ومسلم (١٤٢٨).

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق پەیوەندی کرد بە غەطەفان و هۆزە عەرەبە موشریکەکانی چواردەوریان و بەڵێنی یارمەتی و دەسکەوتی گەورەی پێدان تا ئەوانیش خۆیان ساز و ئامادەبکەن بۆ جەنگ دژ بە موسوڵمانەکان ئەوانیش بەشداربوونی خۆیان ڕاگەیاند و هەموو غەطەفان کەوتنە خۆئامادەکردن لەلایەکی ترەوە حویەیی کوڕی ئەخطەبیش لەمەککە دانیشتوانەکەی هەڵخەڵەتاند بوو بۆ ئەو کارە پێی ڕاگەیاندبوون کە سەرجەم غەطەفان و هۆزەکانی تر لەگەڵ جولەکەکان لەناوچەکانی خۆیان ئامادە و چاوەڕێی کۆمەك و پارەدەکەن بۆ سازدانی ئەوبەرەیە دژ بە موسوڵمانەکان)[٢٤٤].

لە دواجاردا بەرەیەکیان پێك هێناو پەلاماری شاری مەدینەیاندا و توشی شکستێکی گەورە هاتن قوڕەیش و هۆزەکانی نەجد هەموو بەشکستەوە گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان وهۆزی بەنو قوڕەیظەی جولەکە نشینیش وەك پێشتر باسکرا تیاچوون و حویەیی کوڕی ئەخطەبیش کوژا، بەڵام (ابو رافع)ی تاوانبار دەربازبوو چونکە لە قەڵاکەی خۆیدابوو لە ناوچەی خەیبەر و لەگۆڕەپانی شەڕدا ئامادە نەبوو، بەڵام ئەم کارەشی وایکرد کە بە تاوانبارێکی ترسناك و ڕاکرد و بناسرێت لای موسوڵمانان و هەوڵ بدرێت بۆ لەناو بردنی تا لە دوارۆژ دا ئەم جموجوڵە شەڕخوازانەی نەخاتەوە گەڕ دژ بەموسوڵمانان و دووبارە توشی کێشە و مەترسیان نەکات ئەنصارییەکان پێشبڕکێیان دەکرد لەناو خۆیاندا بۆ ئەنجامدان و جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەوەی ئەوسیەکان کارێکی پاڵەوانانەیان ئەنجامدا و کەعبی کوڕی ئەشرەفی جولەکەی تاوانباریان لەناو برد، خەزرەجیەکانش لە چاوەڕوانی دابوون بۆ ئەنجامدانی کارێکی تری هاوشێوەی ئەوان لەدوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانانی هاندا بۆ لەناو بردنی تاوانبار (ابو رافع) سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق، خەزرەجیەکان هاتنە پێشەوە ئامادە بوونی خۆیان ڕاگەیاند بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە گران و پڕ مەترسیە چونکە ئەو تاوانبارە لە ناو هۆز و شاری جولەکەکان خەیبەردابوو دوور لە مەدینە، لەبەر گرانی ومەترسی داری ئەم کارە پیاوانێکی خەزرەجی هەڵبژارد کە مەرجی پێویستیان تێدابوو بۆ ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە گرانە و

(٢٤٤) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣٨/٤)، وابن سعد (الطبقات) (٩١/٢).

عەبدوڵای کوڕی عەتیکی کردە سەرکردەیان چونکە زمانی عیبری و جولەکەی بەباشی دەزانی وە پێشتریش پەیوەندی هەبوو بە ئەبوو رافیعەوە[٢٥٥].

بەسەرهاتەکانی ئەم سریەیەش (صحیح)ە وە لە(صحیح البخاری)دا هاتووە، بەڵام ئیسنادەکانی لای نوسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ضعیف)ە، بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی ئەم سریەیە بەباشی بزانین هەستام بە کۆکردنەوەی سەرجەم ڕووداوەکانی تایبەت بەم باسە لەسەرجەم سەرچاوەکانی فەرموودە و ژیاننامە نوسان وە دوای ڕێکخستنیان بەشێوەیەکی بابەتیانە کە هەموو ڕوودواکان بگرێتە خۆ باسەکە بەم شێوەی خوارەوە دەرچوو:

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (لە دوای تەواو بوونی جەنگی خەندەق و بەنی قورەیظە (ابو رافیع) سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق یەکێك بوو لەوانەی کە ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لەپێکهێنانی بەرەی (الاحزاب) دژ بە پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەوسیەکان لەپێش جەنگی ئوحودا کەعبی کوڕی ئەشرەفیان لەناو برد لەسەر ئەوەی دوژمنێکی سەرسەخت بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەردەوام خەڵکانی هاندەدا بۆ دوژمنایەتی و بەگژاچونەوەیدا. ئەنجا خەزرەجیەکانیش مۆڵەتیان وەرگرت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لە ناو بردنی سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق لە خەیبەر و پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێگەی دان.

زوهری بۆی گێڕاوەتەوە لە عەبدوڵای کوڕی مالیك کەفەرموویەتی: ئەو کارەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێك خستبوو ئەوەبوو هەردوو هۆزی ئەوس وخەزرەج وەك دوو ئەسپی تیژ ڕەو لە پێشبڕکێدا بوون لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، هۆزی ئەوس هەرکارێکی ئەنجام بدایە لە بەرژەوەندی پێغەمبەری خوا ﷺ، هۆزی خەزەجیش دەیان وت وەڵاهی نابێت بەم سەروەیەتان بۆ ئیسلام پێشمان بدەنەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانیش دەست بەردار نەدەبوون تا چالاکیەکی هاوشێوەی ئەوانیان ئەنجام نەدا وە بەم

---

[٢٥٥] انظر: (الطبقات) لابن سعد (٢/٣٩٥)، و (تاريخ خليفة بن خياط) (١٠٣)، و (المغازي) للواقدي (١/٣٩١)، و (المصنف) لعبدالرزاق (٥/٤٠٧)، و (السيرة) (لابن هشام (٣/٢٢٨)، و (السرايا والبعوث النبوية) للدكتور بريك محمد بريك (ص: ١٧٢).

شێوەیەش گەر خەزرەجیش ئەوکارەی ئەنجامبدایە ئەوایش دیسانەوە دەکەوتنەوە پێشبڕکێیان.

کاتێك ئەوس کەعبی کوڕی ئەلئەشرەفیان لەناو برد بە هۆی دژایتی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزی خەزرەجیش وتیان: وەللاهی هەرگیز ناهێڵین بەو کارەتان پێشمان بدەنەوە بۆیە لەناو خۆیاندا گفتوگۆیان کرد کێ هەیە لەدژایەتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك کەعبی کوڕی ئەلئەشرەف، دواجار باسی سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق یان کرد کەلە خەیبەر بوو لەڕیوایەتێکی تردا [لە قەڵایەکی خۆیدابوو لەناوچەی حیجاز][٣٤٦] هۆزی خەزرەج هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای مۆڵەتیان لێ کرد تا ڕێگەیان بدات سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق لەناوبەرن، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێگەی دان بەئەنجامدانی ئەوکارە، لە هۆزی خەزرەجدا لەبەنی سلمە: عەبدولای کوڕی عەتیك، وە مەسعودی کوڕی سینان، وعەبدولای کوڕی ئونەیس، وە ئەبو قەتادە ئەلحەرسی کوڕی ئەلرِبعی، وە خوزاعەی کوڕی ئەسوەد کە لە (اسلم) هاوپەیمانیان بوو، لەگەڵ [عەبدولای کوڕی عەتبە] ئەمانە خۆیان ئامادەکرد بەرەو ئەوێ و پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردن منداڵ و ئافرەت نەکوژن[٣٤٧].

ئەوان دەرچوون و ڕۆیشتن تا گەیشتنە خەیبەر بەشەو گەیشتنە نزیك قەڵاکەی سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق وە زیاتر لێی نزیك بوونەوە و [لەو کاتەدا خۆر بەتەواوی ئاوابوو وەخەڵکانی ئەوێ مەڕوماڵاتەکەیان دەهێنایەوە] عەبدولای کوڕی عەتیك بەهاوڕێکانی وت: [لەجێگەی خۆتان دانیشن] وە چاوڕێ بکەن هەتا من دەڕۆم وە تەماشای ئەو ناوە دەکەم [و بەنەرمی دەدوێم لەگەڵ دەرگاوانەکەدا بەلکو ڕێگەمبدا بچمە ژوورەوە، پاشان عەبدوللا ڕۆیشت تانزیك بووەوە لە دەرگاکەوە] عەبدوللا دەڵێت: لەهەوڵی چوونە ژوورەوە دا بووم، لەوکاتەدا کەرێکیان لێ ون بوو بوو هەندێکیان بە مەشخەڵێکی ئاگردەوە لە قەڵاکە

---

[٣٤٦] أخرجه: البخاري (٤٠٣٩).

[٣٤٧] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٥)، ومالك (٢٩٧/١)، وعبدالرزاق (المصنف) (٩٣٨٥)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٣٧٨٧)، والحميدي (٨٧٤)، وسعيد بن منصور (السنن) (٢٦٢)، والبيهقي (الكبرى) (٧٨/٩).

هاتنە دەرەوە بۆ دۆزینەوەی کە ئەوان هاتن بە ڕوومدا من سەرم داپۆشی و چوومە کەنارەوە وەك دەست بە ئاو بگەیەنم، دەرگاوانەکە هاواری کرد وتی: هەرکەسێك دەیەوێت بێتە ژوورەوە بێتە ژوورەوە پێش ئەوەی دەرگاکە دابخەم [پاشان دەرگاوانەکە بانگی لە من کرد و وتی: ئەی بەندەی خودا گەر دەتەوێت بێیتە ژوورەوە ئێستا وەرە ژوورەوە چونکە من دەمەوێت دەرگاکە دابخەم] عەبدوڵلا دەڵێت: چوومە ژوورەوە بۆ ناو قەڵاکە لە تەویلەیەکدا لای دەرگای قەڵاکە خۆم شاردەوە [دەرگاوانەکەش لەدوای هاتنە ژوورەوەی خەڵکەکان دەرگای قەڵاکەی داخست و کلیلەکانی دەرگاکەی هەڵواسی بەدارێکدا کە داکوترابوو بە دیوارەکەدا ئەبو ڕافیعیش (سەللامی کوڕی ئەبیل حەقیق) لە باڵخانەیەکی خۆیدا لەگەڵ چەند کەسانێکدا قسەیان دەکرد] منیش کەجێگای کلیلەکانم زانی [هەستام وکلیلەکانم] هێنا وچووم دەرگای قەڵاکەم پێ کردەوە وتم با بێدەنگ ولەسەرخۆبم نەوەك پێم بزانن، پاشان چووم دەرگای ماڵەکانی ناو قەڵاکەم لەدەرەوە لەسەر داخستن][٢١٨].

پاشان هاوڕێکانم هاتنە ژوورەوە و ئەبو ڕافعیش لە باڵاڵەخانەکەی خۆیدا بوو بەیزەیەکی پێوە بوو پێی دا سەردەکەوتیت ئینجا هەمووومان بە پەیژەکەدا سەرکەوتین تا چووینە بەردەرگای ژوورەکەی لە دەرگاکیمان دا ژنەکەی هاتە دەرەوە وپێی وتین: ئێوە کێن؟ ئێمەش ووتمان: ئێمە چەند کەسێکی عەرەبین هاتووین مامەڵە و کڕین وفرۆشتن بکەین. وتی: وەرنە ژوورەوە ئەوە ئەبورافیعە. ئێمەش چووینە ژوورەوە و ژوورەکەمان لەسەرخۆمان و ئەو داخست لەترسی ئەوەی نەوەك لەکاتی شەڕو هەراماندا ئەو بۆی دەربازبێت، ژنەکەی هاواری کرد ودەنگی لێ بەرز کردینەوە هەموو یەکێکیش لە ئێمە شمشێرەکەمان لێ بەرز کردەوە تا بیکوژین بەڵام ئەوەمان بیردەکەوتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردین کە ئافرەت نەکوژین، ئیتر ئێمەش نەمان کوشت [عەبدوڵاش زوور بە زوور بەدوای ئەبورافیعدا دەگەڕا کە دەچووە ناو هەر ژوورێکەوە دەرگاکەی لەناوەوە لە سەر خۆی دادەخست بۆ ئەوەی گەر ئاشکرابوون جولەکەکان نەتوانن بگەنە فریای تا ئەو دەکوژێت، تا چوونە ژوورەکەیەوە (عەبدوڵلا دەڵێت): تەماشام کرد ئەبورافیع لە ژوورێکی تاریکدا لەناو خێزانەکەیدا نووستوە و نەمدەزانی ئەو لە کوێدایە] منیش بانگم لێکرد و

[٢١٨] أخرجه: البخاري (٤٠٤٠).

ووتم: ئەبورافیع. ئەبوڕافیعیش وتی: ئەوە کێیە؟ منیش بەرەو جێگەی دەنگەکە چووم [شپرزەبووم و شمشێریکم لێدا بەلاّم بەری نەکەوت ئەویش هاواری کرد من چوومە دەرەوەی ژوورەکەو پاش ماوەیەك] هاتمەوە ژوورەوە وەك یەکێك ڕزگاری بکات و دەنگم گۆڕی وتم: ئەوە چیە ئەبورافیع؟ [ئەو دەنگە دەنگە چیە؟] وتی: دایکت لەناوچێ بەلاتەوە سەیرنیە پیاوێك هاتۆتە ژوورەوە و شمشێرێکی لێدام (بەرم نەکەوت). ئینجا منیش جێگەکەیم بەباشی زانی و بۆی چووم [شمشێرێکی ترم] لێداو [بریندارم کرد بەلاّم نەم کوشت] و زۆر سودی نەبوو، ئەویش هاواری کرد و ویستی لە جێگەی نووستنەکەی هەڵستێت منیش نوکی شمشێرەکەم کرد بەناو سکی دا خۆم دا بەسەر دەسکی شمشێرەکەدا تا گوێم لە قرچەی ئێسکی پشتی بوو [ئەو جار زانیم کە کوشتوومە[٣٤٩] پاشان هاتمە و دەرگا بەدەرگام کردەوە] و چوومە دەرەوە بە پەلە و شپرزەبووم هاتم بۆ لای پەیژەکە تا لەوێوە دابەزمە خوارە [ئینجا پیدا هاتمە خوارەوە و وامزانی گەیشتومەتە سەر زەوی بەلاّم چەند پلەیەکی مابوو لەوێدا کەوتمە خوارەوەو قاچێکم شکا و بە جامانەکەم بەستم و مانگە شەوبوو] پاشان بە هەنگە شەلە گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێکانم، ئەوانیش منیان هەلگرت هەموو بەیەکەوە خۆمان کردە ناو جۆگەی یەکێك لە کارێزەکانیانەوە. جولەکەکانیش بەئاگا هاتنەوە و ئاگریان کردەوە بۆ دۆزینەوەی ئێمە بە هەموو لایەکدا بلاّو بوونەوە و بەدوایماندا دەگەڕان، بەلاّم ئێمەیان نەدۆزیەوە و بێ نومێد بوون پاشان هەموو گەڕانەوە و لە ئەبورافیع کۆبوونەوە. ئێمەش لەناو خۆماندا وتمان: چۆن دڵنیابین کە ئەو دوژمنەی خوا لەناو چووە؟ پیاوێك لە ئێمە وتی: من دەگەڕێمەوە ناویان و تەماشا دەکەم [بەلاّم پێش بکەون و بڕۆن مژدە بگەیننە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاّم من ئەم ناوچەیە جێناهێڵم تا دەنگی شین وگریان دەبیستم [پاشان گەڕامەوە و چوومە ژوورەوە لە دەرگای قەلاّکە دانیشتم وتم: من ئێرە بەجێ ناهێڵم ئەمشەو تا دڵنیا دەبم لە کوژرانی] تا

---

[٣٤٩] في رواية ابن اسحاق (السيرة) (٣/٢٢٩): (فلما ضربناه باسيافنا، تحامل عليه عبدالله بن أنيس بسيفه في بطنه حتى انفذه وهو يقول: قطني قطني (اي حسبي حسبي) وخرجنا وكان عبدالله بن عتيك رجلاً سيء البصر، فوقع من الدرجة (اي: من السُّلم).

بەرە بەیان بۆوە و [کەڵەشێر قوقاندی] لەو کاتەدا یەکێکیان بەگریانەوە چووە [سەر دیواری قەڵاکەو] وتی: ئەبوڕافیع [تاجیرەکەی هەموو ناوچەی شام کوژراوە]) ئینجا خۆم کردە ناو قەرەباڵغی جولەکەکانی ئەوێدا و چووم بەرەو تەرمەکەی بینیم ژنەکەی لەگەڵ چەندەها پیاوی جولەکەکە لە چواردەووری بوون ژنەکەی بەچراکەی تەماشای دەم و چاوی ئەبوڕافیعی دەکرد و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕانەوە دەیوت: سوێند بە خودا من گوێم لە دەنگی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك بوو پاشان خۆمم بە درۆخستەوە و وتم: عەبدوڵای کوڕی عەتیك کەی دەتوانێت بگاتە ئێرە ئینجا تەماشای دەم وچاوی ئەبوڕافیعی کرد وتی: مرد و گیانی دەرچوو سوێند بە خوای جولەکە. ئیتر منیش هیچ وشەیەکم بەرگوێ نەکەوتووە شیرینتر بێت لام وەك ئەو وشەیە پاشان خۆمم دەرباز کرد لەو ناوچەیەو بەڕێگەدا دەڕۆیشتم وە هیچ نازارێکم نەبوو تا گەیشتمەوە هاوڕێکانم] [و پێم وتن: خودا ئەبورافعی لەناو برد ئێمەش باخۆمان ڕزگار بکەین] [لەگەڵ هاوڕێکانمدا گەڕاینەوە لە شەودا دەڕۆیشتین و لەڕۆژدا لە جێگەیەك دەحەواینەوە و یەکێکمان دەکرد بە پاسەوانمان بەو جۆرە بەردەوام بووین تا گەیشتینەوە ناو شاری مەدینە و چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [لەسەر منبەری مزگەوتەکەی وتاری بۆ خەڵکی دەدا] کەئێمەی بینی فەرمووی: ((ڕۆخسارتان ئازاد بێت لە ئاگر)) ئێمەش وتمان: ڕوخساری تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا کوشتان؟)) وتمان: بەڵێ، ئینجا داوای ئەو شمشێرەی کرد کە پێی کوژراوە. وە فەرمووی: ((شمشێرەکەم بدەنە دەست؟)) ئێمەش شمشێرەکانمان پێداو لەکێلان دەری کرد و بە شمشێرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکی فەرموو: ((أجل [هذه قتله] هذا طعامه في ذباب السيف)) واتە: ((بەڵێ [بەمەیان کوژراوە] ئەوەتا خواردنەکەی بەنوکی ئەم شمشێرەوەیە))](٢٥٠). [لە دوایدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبدوڵڵای فەرموو: ((فاچت

(٢٥٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٩/٤) مرسلاً، وعبدالرزاق (المصنف) (٥٣٨٢) مرسلاً، والبيهقي (الكبرى) (٢٥٦/٣) بسندٍ فيه مجهول، والطبري (التاريخ) (٤٩٧/٢)، وابو يعلى (٩٠٧) وقال محققه: اسناده ضعيف، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٣٣٤) فيه.. ضعيف، وقال البوصري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦١٠٦): اسناده ضعيف.

دریژکە)) ئەویش قاچی دریژ کرد و دەستی بە قاچی دا هێنا و شکاوی قاچی چاك بووە وە و وادیار بوو کە هەرگیز نەشکاوە و ئازاری نەبووە])[٢٥١].

# سریەکەی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە بۆ لای ئەلیە سیری کوڕی ڕوزام

لە دوای ئەو سەرکەوتنەی کە مەفرەزەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەتیك بەدەستیان هێنا و ئەبوڕافیعی گەورە جولوکەیان کوشت، جولەکەکان پیاوێکی ئازاو قارەمانیان کردە پێشەوایان کەناوی (ئەلیەسیری کوڕی ڕوزام) بوو، ئەم پیاوەش وەك ئەبوڕافیعی پێش خۆی کەوتە ئاژاوەگێڕی و دروست کردنی بەرەیەك لە جولەکەکانی ناوچەکانی سەروو وە هاوپەیمانی لەگەڵ غەطەفان بەمەبەستی هێرش بردنە سەر شاری مەدینە. ئەم هەواڵانەش گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و دەست بەجێ سێ کەس وەك هەواڵدار ناردە ناوچەی خەیبەر و بەنهێنی خۆیان گەیاندە ئەوێ و هەواڵەکانیان پشت ڕاست کردەوە پاشان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ[٢٥٢].

لەمانگی شەوالی ساڵی شەشی کۆچیدا سریەیەك پێکهێنرا کە ژمارەیان سی کەس بوو و پێشەوایان عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەبوو هەستان بە ئەنجامدانی نەخشەیەکی خستنە ناو داوەوە هاو شێوەی ئەو نەخشەیەی کە کەعبی کوڕی ئەلئەشرەفی پێ کوژرا، وردەکاریەکانی ئەم باسە هەرسێ پێشەوایانی (السیرة) موسی کوڕی عوقبە، عوروەی کوڕی کوڕی زوبەیر، وەمحمدی کوڕی ئیسحاق دەیگێڕنەوە وە دەفەرموون: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەی نارد لەگەڵ سی سواردا کە عبدولای کوڕی ئونەیسیان لەناودا بوو بۆ لەناوبردنی (اليسير بن رزام)ی سەرکردە و پێشەوای جولەکەکانی خەیبەر، دوای ئەوەی هەواڵی پیلانە شەڕخوازەکانی بە کۆکردنەوەی غەطەفان و دروست کردنی بەرەیەك دژبە موسوڵمانان ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە موسوڵمانەکان، سریەکە ڕۆیشتن تا گەیشتنە خەیبەر

---

[٢٥١] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٢٨-٢٣٠) عن ابن اسحاق مرسلاً واللفظ له، والزيادات: للبخاري (٤٠٣٩، ٤٠٤٠)، وابي يعلى (٩٠٧).

[٢٥٢] أخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٥٦٦)، وابن سعد (الطبقات) (٢/٩٢).

و چوونە لای ئەلیوسرو [گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و خۆیان لێ نزیک کردەوە و پێیان ڕاگەیاند ئەگەر تۆ بچیت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزت لێ دەگرێت] ئێمەشی ناردۆتە لای تۆ تا بتکاتە سەرکردەی خۆی لەسەر خەیبەر، بەم جۆرە بەردەوام بوون لە گوفتوگۆ لەگەڵیدا تا خەلەتاندیان وقایلیان کرد کە لەگەڵیاندا بێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەلیوسر خۆی لەگەڵ سی کەس لە پاسەوانەکانی لەسەر وشتری موسوڵمانەکان سواربوون لە پێشەوە و هەموو یەکێکیان موسوڵمانێکی لە پاشەوە سوار بوو و بەڕێگەدا هاتن بەرەو مەدینە تاگەیشتنە دەشتی [ثبار]کەلەخەیبەرەوە شەش میل دوورە، لەوێدا ئەلیوسری کوڕی ڕەوزامی جولەکە پەشیمان بووەوە [لەسەر هاتنی و ڕۆیشتنی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ] بۆیە دەستی برد بۆ شمشێرەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس و عەبدوڵلایش بەمەی زانی وشترەکەی تاودا بەو جۆرەش [وشتر سوارەکانی تریش وشترەکانیان تاودا] تا عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس دەستی لە ئەلیوسری کوڕی ڕوزام گیرکرد و [فڕێی دایە خوارەوە] و خۆیشی بازی دایە خوارەوە بەدوایدا، و [شمشێرێکی] لە قاچی ئەلیوسر داو قرتاندنی، ئەلیوسریش گۆچانێکی داری بەهێزی (شەوحەطی) بەدەستەوە بوو کێشای بە [دەم و چاوی] عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس دا بە سەختی دەم و چاوی بریندارکرد و عەبدوڵلا ئەوی کوشت] ئینجا هەموو یەکێك لەموسوڵمانەکان پەلاماری ئەو جولەکەیەی دەدا کە لەگەڵی دابوو، بەم جۆرە هەموو جولەکەکان کوژران تەنها یەك [پیاو] لە جولەکەکان [کەلە ڕاکردندا تیژ ڕەو بوو] لە دەستیان هەڵات و ڕای کرد وە بۆیان نەگیرا، وە هیچ یەکێکیش لە موسوڵمانەکان بریندار نەبوون تەنها عەبدوڵلا نەبێت، پاشان هەموو گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتفی بەرۆزی لەجێ برینەکەی عەبدوڵلا دانا و نەجەراعەتی کرد و نە ئازاری دا [هەتا مرد])[٢٥٣].

---

[٢٥٣] أخرجه: ابو نعيم (الدلائل) (٤٤٤)، والبيهقي (الدلائل) (٢٩٣/٤)، وابن هشام (السيرة) (٢٣١/٤)، والطبري (التاريخ) (١٥٥/٣)، وابن سعد (الطبقات) (٩٢/٢)، وباقشيش في (مرويات موسى بن عقبة) (٤٣١/٢) وقال: والحديث لا ينزل عن درجة الحسن لغيره.

# سریەیی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە بۆ هۆزی (بني القرطاء)

هۆزە نەجدیە بت پەرستەکان بوێربوون بەرامبەر بەموسوڵمانەکان و خاوەنی ژمارە و کەرەستەی جەنگیش بوون، بەردەوام قورەیش و جولەکەکان فریویان دەدان وەهان خستنە ڕیزی بەرەی خۆیانەوە دژبە موسوڵمانەکان وەك لەجەنگی خەندەقدا ڕوویدا لەبەر ئەوە کاتی تەمێ کردنیان نزیك بوو بووە وە لە شەش یان دەی مانگی موحەڕەمی ساڵی شەشی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی ئاراستەکردن کەپێك هاتبوو لە سی کەس وە بە پێشەوایەتی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە بۆ هێرش کردنە سەر هۆزی (بنی القرطاء) کە بەشێك بوون لەهۆزی (بنی بکر بن کلاب) ونیشتەجێی ناوچەی (ضریه) بوون لەسەر ڕێگەی (البصرة) و حەوت شەو دوور بوو لەشاری مەدینەوە، سریەکە غافڵ گیرانە پەلاماریان دان و دە کەسیان لێ کوشتن وئەوانی تریان هەڵاتن موسوڵمانەکان دەستیان گرت بەسەر وشترەکان و مەڕەکانیان و پاشان گەڕانەوە بەرەو مەدینە لەڕێگادا پیاوێکیان دەست بەسەر کرد کەناوی (ثمامة بن اثال) بوو بەرەو مەدینە هێنایان بەڵام نەیان دەزانی کە ئەمە سەرکردەی هۆزی (بني حنيفة)یە[٣٥٤].

## موسوڵمان بوونی ثومامەی کوڕی ئاثالی حەنەفی

ئەوە بوو مەفرەزەکەی مەحەمەدی کوڕی مەسلەمە ثومامەیان دەست بەسەرکرد هێنایانە ناو شاری مەدینە و بەستیانەوە بەیەکێك لەکۆڵەکەکانی ناو مزگەوتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بێ بەرامبەر ئازادی کرد و پاشان ثومامە موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند ئەم ڕووداوەش هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە وە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك ئەسپ سواری بەرەو ناوچەی نەجد نارد و لە گەڕانەوەیاندا پیاوێکیان دەست بەسەر کرد لە (بني حنيفة) کەناوی (ثمامة بن اثال) بوو

(٣٥٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤/٢٥٠)، والطبري (التاريخ) (٣/١٥٧)، والذهبي (تاريخ الإسلام) (ص: ٣٥١)، وابن سعد (الطبقات) (٢/٧٨).

وەسەرکردەی هۆزی (بني حنيفة) بوو لە ناوچەی (اليمامە) هێنایان و بەستیانەوە بەیەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای و پێی یفەرموو: ((چیت لەلایە ئەی ثومامە)) ئەویش وتی: کاری چاکە و شتی بەنرخم لاهەیە ئەی موحەمەد: گەر بیکوژیت پیاوێکی خاوەن خوێنی بە نرخ دەکوژیت، گەر چاکەشی لەگەڵدا بکەیت ئەوا چاکە لەگەڵ پیاوێکی بە ئەمەك و بێ زان و خاوەن پاداشت دەکەیت، گەر پارەشت دەوێت لە تۆڵەیدا چەندە داوادەکەیت [پێت دەبەخشرێت]. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و بەجێی هێشت [ئێمە کۆمەڵێك لە هەژارەکان لەناوخۆماندا دەمان وت: پێغەمبەری خوا ﷺ چ سودێکی دەست دەکەوێت لە کوشتنی ثومامە، سوێند بەخوا ئێمە لە برامبەر ئازادکردنیدا پارویەك گۆشتی وشترێکی قەڵەومان لاخۆشەویست ترە لە کوشتن و خوێن ڕشتنی ثومامە][٢٥٥]. بۆ ڕۆژی دووەم پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە لای ثومامە و پێی فەرموو: ((چیت لا هەیە ئەی ثومامە؟)) ئەویش وتی: هەرئەوەیە کە پێم وتی گەر بیکوژیت پیاوێکی خاوەن خوێنی بەنرخ دەکوژیت، گەر چاکەشی لەگەڵدا بکەیت چاکە لەگەڵ پیاوێکی بەئەمەك و بێ زان و خاوەن پاداشت دەکەیت، گەر پارەشت دەوێت لەتۆڵەیدا چەندە داوادەکەیت پێت دەبەخشرێت.

پێغەمبەری خواش ﷺ بەجێی هێشت بۆ بەیانی ڕۆژی سێهەم هاتەوە بۆلای و پێی فەرموو: ((چیت لا هەیە ئەی ثومامە؟)) وتی: هەر ئەوەیە کەپێم وتی [گەر بیکوژیت پیاوێکی خاوەن خوێنی بەنرخ دەکوژیت، گەر چاکەشی لەگەڵدا بکەیت چاکە لەگەڵ پیاوێکی بەئەمەك و بێ زان و خاوەن پاداشت دەکەیت، گەر پارەشت دەوێت لەتۆڵەیدا چەندە داوادەکەیت پێت دەبەخشرێت] [ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەچاکی زانی کە ئازادی بکات پاشان ئازادی کرد و خودا ئیسلامی خستە دڵی ثومامەوە][٢٥٦] [پێغەمبەری خوا ﷺ] فەرمووی: ((ثومامە ئازاد بکەن)) ثومامە ئازاد کرا و چوو بۆلای هەندێك دار خورمای

---

[٢٥٥] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٨٠).

[٢٥٦] أخرجه: احمد (٧٣٦١) وقال محققه: اسناده قويّ، وقال الشيخ الالباني في (الثمر المستطاب) (٢/٧٧١): اسناده حسن.

ئەنصاریەکان کە نزیك مزگەوت بوو وە [بیرێك ناوی لێ بوو] لەوێ خۆی شۆرد پاشان گەڕایەوە ناو مزگەوت [پێغەمبەری خوا ﷺ هێشتا لەگەڵ هاوەڵانیدا لە مزگەوت دانیشتبوون][٣٥٧]، ثومامە هات وتی: (اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمد رسول الله) ئەی موحەمەد سوێند بەخوا هیچ ڕوخسارێك نەبوو لە سەر زەویدا بوغزاوتر بێت لای من لە ڕوخساری تۆ بەڵام ئێستا ڕوخسارت خۆشەوسترین ڕوخسارە لەلای من، وە سوێند بە خوا هیچ ئاینێك نەبوو لەسەر زەویدا بوغزاوتر بێت لای من لە ئاینەکەی تۆ، بەڵام ئێستا ئاینەکەی تۆ خۆشەوسترین ئاینە لەلای من، وەسوێند بەخوا هیچ وڵاتێك نەبوو لەسەر زەویدا بوغزاوتر بێت لای من لە وڵاتەکەی تۆ بەڵام ئێستا وڵاتەکەی تۆ خۆشەویسترین وڵاتە لە لای من، ئەسپ سوارەکانی تۆ منیان قۆڵ بەست کرد [هێشتا من لەسەر ئاینی خۆرز خزمانم بووم] وە من دەمویست بچم عومرە ئەنجام بدەم تۆ ڕات چییە بەرامبەر عومرەکەی من وە فێرم بکە صڵاواتی خودات لەسەر بێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ مزدەی پێداو فێری کرد و کار ئاسانی بۆ کرد داوای لێ کرد عومرەکەی خۆی ئەنجام بدات. [ثومامە بەرەو مەککە ڕۆیشت بۆ ئەنجامدانی عومرە] کاتێك گەیشتە شاری مەککە [بەچەمکی (لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك) چووە ناو شارەوە][٣٥٨]، [و قوڕەیش بیستی ئیسلام بۆ خەڵك باس دەکات یەکێك لە قوڕەیشیەکان پێی وت: ئایا لە ئاینی خۆت هەڵ گەڕاویتەوە و بێ دین بوویت؟ لە وەڵام دا وتی: نەخێر [سوێند بەخوا من بێ دین نەبووم] بەڵکو من موحەمەدم بەڕاست زانیوە و بڕوام پێ هێناوە] وە لەگەڵ موحەمەد پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمان بووم، سوێند بەخوا لێرە بەدواوە هەرگیز تەنها دەنکە گەنمێکتان نادەمێ بێ بگات لە ناوچەی (اليمامه) وە تا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگە دەدات[٣٥٩]. [عومەری کوڕی

---

[٣٥٧] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٨٠).

[٣٥٨] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤/٢٥١).

[٣٥٩] أخرجه: البخاري (٤٦٢، ٤٦٩) ومسلم (١٧٦٤)، واحمد (٩٨٣٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابو داود (٢٦٧٩)، والنسائي (١/١٠٩) وابن خزيمة (٢٥٢)، وابو عوانة (٤/١٥٩)، وابن حبان (١٢٣٩) وقال محققه: اسناده صحيح، والبيهقي (الكبرى) (١/١٧١) وفي (الصغرى) (١١٢) وفي

خەتاب ﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خوا ثومامە لە پێش چاومدا بچوك تربوو لەبەراز، بەڵام ئێستا لە پێش چاومدا گەورەترە لە شاخ، ثومامە مەککەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە ناوچەی (الیمامە) و قەدەغەی کرد هیچ شتێك بگاتە قورەیش لە شاری مەککە، قورەیشییەکان دەنگ و هەرایان لێ بەرز بووە و بێزار بوون وە نامەیان نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: تۆ لە ئاینەکەت دا بانگەشە و فەرمان بە چاکە کاری دەکەیت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ لای ثومامە وە دوای لێکرد گەنمیان لێ قەدەغە نەکات][٣١٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ([ثومامە گەیشتە وڵاتی خۆی نەیهێشت هیچ بارێك بگاتە شاری مەککە، تا قورەیش تەواو پەرێشان بوون و نامەیان نوسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە لە خزمەتیا داوایان لێ کرد کە نامە بنوسێت بۆ ثومامە تا ڕێگە بدات بارە خواردن بگاتە شاری مەککە])[٣١١]. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ([قورەیش لە نامەکەیاندا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نوسیبوویان: تۆ فەرمان بە چاکە کردن دەکەیت لەگەڵ خزماندا، بەڵام تۆ خزمایەتی و چاکەی خۆت قەدەغە کردووە لە ئێمە، تۆ پەیوەندی و چاکەی خزمایەتیت بڕیوە لەگەڵ ئێمە [تۆ خزمەکانت باوکەکانیانت بە شمشێر کوشتووە و منداڵەکانیانیشت کوشتووە بە برسێتی] ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نوسی بۆ ثومامە وە داوای لێ کرد ڕێگەی بارە خواردنەکان بدات تا بگاتە شاری مەککە][٣١٢].

لە ڕیوایەتەکەی ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: ([ثومامەی کوڕی ئاثال بە دەست بەسەری هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە ئازادی کرد و چووە شاری مەککە پاشان گەڕایەوە وڵاتی خۆی ئاڵوگۆڕ ومامەڵەی نێوان (الیمامە) و شاری مەککەی بچڕاند، قورەیش

---

(الدلائل) (٧٨/٤) واللفظ لمسلم والزيادات لأحمد والبخاري وابن هشام والبيهقي. وانظر (الثمر المستطاب) (٧٦٩/٢) للشيخ الالباني رحمه الله تعالى.

[٣١٠] أخرجه: عبدالرزاق (٩٨٣٤)، وأحمد (٧٣٦١) وقال محققه: اسناده قوي، وقال الشيخ الالباني في (الثمر المستطاب) (٧٧١/٢): اسناده حسن.

[٣١١] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٨٠/٤).

[٣١٢] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٥١/٤).

توشی قاتوو قڕی بوون تا هەندێك لە قوڕەیشیەکان لە ناچاری دا پێستی وشتری وشکیان دەهێناو تێکەڵ بە خوێنیان دەکرد و پاشان بە ئاگر دەیان برژاند، ئا چارانە ئەبوسوفیان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا تۆ بانگەشەی ئەوە ناکەیت کە تۆ نێردراویت بە بەزەیت بۆ هەموو جیهانەکان؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتی: باوکانت بە شمشێر کوشت منداڵەکانیانیش بە برسیتی خودای گەورەش ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاند: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴾ (المؤمنون: ٧٦)[٢٦٣] واتە: ﴿بەڕاستی ئێمە تووشی سزا ئازاری (جۆراو جۆرمان) کرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەملکەچ بوون بۆ پەروەردگاریان ئەلێیی دەپاڕێنەوە﴾.

## غەزای بەنی لحیان

لەم غەزایەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی تۆڵە بسێنێت لە هۆزی بەنی لحیان و هوزەیل کە غەدریان لە خوبەیب و هاوڕێکانی کردبوو وە فرستیان لێ هێنابوون و شەهیدیان کردبوون لە ڕووداوی ڕۆژی (الرجیع) دا.

ئیبنو ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ شەش مانگ دوای ئازاد کردنی بەنی قورێظە بە هێزێکەوە بەرەو بەنی لحیان ڕۆیشت بۆ ئەوەی تۆڵەی خوبەیب و هاوڕێکانی (الرجیع) بسێنێت لە بەنی لحیان [وە فەرمانی کرد کە لە هەموو دوو پیاوێکدا لە موسوڵمانەکان یەکێکیان لەم غەزایە بەشداری بکات وە پاداشتەکەشی بۆ هەردووکیانە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هێزێکی ئامادەکرد بۆ ناردن بەرەو هۆزی بەنی لحیانی هوزەیل وفەرمووی: ((لینبعث من کل رجلین احدهما، والأجر بینهما)). واتە: ((لە هەموو دوو پیاوێك با یەکێکیان لەم غەزایە بەشداری بکات وە پاداشت بۆ هەردوولایانە دەبێت)) [پاشان بەوانەی فەرموو کەمابوونەوە: ((ایکم خلف الخارج في اهله وماله بخیر کان له مثل نصف أجر الخارج)). واتە: ((هەرکەسێك لە ئێوە جێگەی ئەوان

(٢٦٣) أخرجه: الطبري (التفسير) (١١١/٢٠)، والنسائي (الكبرى) (١١٣٥٢)، والحاكم (٣٥٤٠) وصححه، وقال الحافظ في (الاصابة) (٩٦١) اخرجه ابن منده واسناده حسن، وقال محقق (اسباب النزول) للسيوطي (ص: ٢٤٩): صحيح.

ڕێگە بە پێغەمبەر مال و سامان و خێزانەکانیان بە نیوەی پاداشتی ئەوان ببەخشێ بگرێتەوە بۆ وەربگرێت))[٣٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ بە هێزەکەیەوە وای نیشان دا کەبەرە و شام دەڕوات بۆ ئەوەی دوژمن پێی نەزانێت وە لەناکاو فرسەتیان لێ بهێنێت عەبدوڵلای کوڕی ئوم مکتومی کردە بەرگاری شاری مەدینە ولە شار دەچوو و بەسەر چیای (غراب) ئەو سەری شاری مەدینە بەرەو شام بەرێکەوت پاشان بەسەر چیای (محیص)دا خێرا ڕۆیشت تا گەیشتە شیوی (غران) کە ناوچەی نیشتەجێی (بنی لحیان)ە لەو شیوەدا کە لە نێوان هەردوو ناوچەی (أمج)و (عسفان) دایە لە جێگەیەك لای دا کە پێی دەوترا (سایە) بەڵام بۆی دەرکەوت کە بنی لحیان بە ئاگا بوون و لەسەری چیاکاندا خۆیان دامەزراندوە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیە ئەو ناوچەیە دوژمن غافڵ گیرانە دەس بەسەر نەکران فەرمووی: ((لو أنا هبطنا عُسفان لرأى اهل مكة انا قد جئنا مكة)). واتە: ((گەر ئێمە دابەزینە ناوچەی (عوسفان) دانیشتوانی شاری مەککە وادەزانن کە ئێمە دەمانەوێت بچینە ناو مەککەوە)) پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دووسەد سوار لە هاوەڵانی دابەزینە ناوچەی (عوسفان)، پاشان دوو سواری نارد تاگەیشتنە ناوچەی (کراع الغمیم))ی نزیك مەککە و پاشان گەڕانەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سەرجەم هاوەڵانی گەڕانەوە[٣٥] جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەو گەڕانەوەدا دەیفەرموو: ((آیبون تائبون ان شاءالله لربنا حامدون، واعوذ بالله من وعثاء السفر، وكآبة المنقلب وسوء المنظر في الأهل والمال)). واتە: گەڕاینەوە و تۆبەمان کرد گەر خودا ویستی لێ بێت وسوپاس کاری خودای خۆمان دەبین پەنا دەگرم بە خوا لە ناسۆری سەفەر و خەمۆکی گەڕانەوە و بینینی دیمەنی ناخۆش لە

---

(٣٤) أخرجه: مسلم (١٨٩٣، ١٨٩٦) واللفظ له، واحمد (٣٤/٣)، وابو داود (٢٢٠٤)، وابن حبان (٤٧٢٩).

(٣٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣٤/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٩٥/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٦٤/٣).

کەسوکارو ساماندا))[٣٦٦]. هەر لەم غەزایەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ (صلاە الخوف) واتە نوێژی ترسی لەگەڵ هاوەڵانی ئەنجامدا[٣٦٧].

## سریەی عوکاشە بۆ ناوچەی (الغمر)

ڕووداوەکانی ئەم سریەیە واقیدی دەیگێڕێتەوە و کە (ضعیف)ە و دەفەرموێت: لەمانگی (ربیع الأول)دا یان (ربیع الثاني) دا ساڵی شەشی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ عوکاشەی کوڕی موحصین ی ئەلئەسەدی لەگەڵ چل پیاودا ناردە ناوچەی (الغمر) کە سابتی کوڕی ئەلئەقرەم و سباعی کوڕی وەهەبیان تێدابوو. بەخێرایی بە ڕێکەوتن بەرەو ئەو ناوچەیە بەڵام دانیشتوانی ئەو ناوچەیە پێشتر پێیان زانیبوون ئەو ناوچەیەیان بەجێ هێشتبوو، عوکاشە خۆی و سریەکەی لایان دایە لای کانیاوەکەیان وە بە هەموو لایەکدا مەفرەزەیان بڵاو کردەوە وە کەسێکیان بە دەست کەوت کە جێگای وشترەکانی ئەو هۆزەی ئاشکرا کرد کە ژمارەیان دوو سەد وشتر بوو، عوکاشە هەموویانی پێش خۆی دا بەرەو شاری مەدینە.

واقیدی هەندێك سریەی تر باس دەکات لەوانە: سریەکەی موحەممەدی کوڕی سەلەمە وە سریەکەی زەیدی کوڕی حاریسە بۆ ناوچەکانی (الحموم، الطرق، وادي القرى) لەگەڵ سریەکەی عەلی کوڕی ئەبی طالب بۆ ناوچەی فدك....[٣٦٨].

---

(٣٦٦) وفي رواية: عن ابن عمر ﷺ قال: (ان رسول الله ﷺ كان اذا استوى على بعيره خارجاً الى سفرٍ كبّر ثلاثاً ثم قال ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾ (الزخرف: ١٣ - ١٤) اللهم انا نسألك في سفرنا هذا البرّ والتقوى ومن العمل ما ترضى، اللهم هوّن علينا سفرنا هذا، واطو عنا بُعدهُ، اللهم انت الصاحب في السفرِ والخليفة في الاهل، اللهم اني اعوذ بك من وعثاء السفر، وكآبة المنظر وسوء المنقلب في المال والاهل، واذا رجع قالهنّ وزاد فيهنّ: آيبون، تائبون عابدون لربنا حامدون)). اخرجه مسلم (١٣٤٢)، والترمذي (٣٤٤٤)، وابو داود (٢٥٩٩).

(٣٦٧) اخرجه: احمد (٥٩/٤)، وابو داود (١٢٣٦)، والنسائي (١٧٤/٣، ١٧٦)، والحاكم (٣٣٧/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والترمذي (٣٠٣٨)، وصححه الشيخ الالباني في: (صحيح ابي داود) (١٠٩٦).

(٣٦٨) اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٥٥٠-٥٥٣) وعنه البيهقي في (الدلائل) (٨٢/٤-٨٤).

# سریەیی زەیدی کوڕی ئەلحارسە بۆ ناوچەی (العیص)

لەمانگی (جمادی الاولی)ی ساڵی شەشی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی ئەلحاریسەی لەگەڵ سەد و حەفتا سوار نارده ناوچەی (العیص) بۆ ڕێگرتن بەکاروانێکی بازرگانی قورەیش کە پێشەواکەیان (ابو العاص ابن الربیع)ی مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ.

سریەکە چوونە ئەو ناوچەیە و دەستیان گرت بەسەر کاروانەکەدا و ئەوەی لەگەڵیان بوون جگە لە (ابو العاص ابن الربیع)کە خۆی دەرباز کرد و هەڵات، سریەکە دەسکەوتەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە شاری مەدینە، ئەبولعاصیش بەنهێنی لە شەودا خۆی گەیاندە شاری مەدینە وە چووە لای زەینەبی خێزانی ئەویش پەنادانی بۆ وەرگرت لە باوکی وە دەسکەوتی کاروانەکەی بۆ گێڕایەوە بردیەوە شاری مەککە و ئەمانەتەکانی دایە وە دەستی خاوەنەکانیان پاشان گەڕایەوە شاری مەدینە و موسوڵمان بوو وە بە چاکە ناو دەبراو جێی متمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەلمسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەفەرموێت: (گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زاوایەکی دەکرد لە تیرەی (بنی عبد الشمس) و زۆر ستایشی دەکرد وباسی بەچاکە دەکرد لە خزم و دۆستیدا و دەیفەرموو: ((انکحت ابا العاص بن الربیع فحدّثني وصدقني]ووعدني فوفی لي)) واتە: [ئەبو لعاصی کوڕی ئارڕەبیعم کردە هاوسەری کچەکەی خۆم (واتە: زەینەب) ئەو گوفتو گۆی لەگەڵ کردم و ڕاستی کرد] وە بەڵێنی پێدام وبردیە سەر بۆم))[٣٦٩].

بەسەر هاتی ئەم سریەیە ئیبن ئیسحاق لەدایکی بڕوادارانەوە عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (...ئەبو لعاص لەسەر هاوتا بڕیاردانەکەی خۆی مایەوە لە شاری [مەککە وە زەینەبی خێزانیشی لە مەدینە مایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام لە یەکی جیاکردنەوە] تا جارێکیان ئەبو لعاص بەکاروانێک دەرچوو بەرەو شام [پیاوێك بوو جێی متمانەبوو وە خاوەن سامان بوو پارەی هەندێك لە قورەیشەکانی لە لا بوو] کە بە قازانج بە شەراکەت بۆی دەخستنە گەڕ، چووە شام بازرگانی خۆی کرد بەکاروانەکەیەوە

---

(٣٦٩) أخرجه: البخاري (٣٧٢٩).

گەڕایەوە بەرەو مەککە، لەکاتی گەڕانەوەی دا سریەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست
بەسەری کردن، وە دەنگ وباسیش بڵاو بووەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئەو سریەی
ناردووە بۆ دەست بەسەر کردنی ئەو کاروانەی ئەبو لعاص کە لە شام دەگەڕانەوە
سریەکەش سەد و حەفتا سوار بوون و زەیدی کوڕی ئەلحاریسەش پێشەوایان بوو لەمانگی
(جمادی الاول)ی ساڵی شەشی کۆچی، سریەکە ڕۆیشتن و دەستیان گرت بە سەر هەموو
کاروانەکەدا وە ئەوانەی کە لەگەڵیان بوون جگە لە (ابو العاص) کە ڕایکرد وە ئەگەڕا
سریەکەش بەدەسکەوتەکانیەوە گەڕایەوە شاری مەدینە، ئینجا (ابو العاص) لە شەودا هاتە
شاری مەدینە بۆ داواکردنی سامانەکەی تا چوو پەنای بردە لای زەینەبی کچی پێغەمبەری
خوا ﷺ وە زەینەبیش پەنای دا وە ئەبو لعاصیش پێی وت: [پەنا دانێکم بۆ وەرگرە لای
باوکت] کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە بۆ نوێژی بەیانی وە پێش نوێژی بۆ
هاوەڵانی کرد و کە وتی: (الله اكبر) وە هاوەڵانیش هەموویان لە دوایەوە (الله اكبر)ی چوونە
ناو نوێژیان وت [ئینجا زەینب] [سەری دەرهێنا لە دەرگای ژوورەکەی لە کاتێك دا
پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بە جەماعەت بۆ دەخوێندن] و دەنگی بەرز کردەوە
وتی: خەڵکینە [من زەینەبی کچی پێغەمبەری خوام ﷺ] وە (ابوالعاص بن ربیع)م پەنادا‌وە
لە دوایدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: ((ایها
الناس هل سمعتم ما سمعتُ؟)) واتە: ((ئەی خەڵکینە ئایا ئەوەی من بیستم ئێوەش بیستان؟))
وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((أما والذي نفسُ محمدٍ بيده ما علمتُ بشيءٍ كان [من ذلك] حتى
سمعت منه ما سمعتم، انه يُجير على المسلمين ادناهم)) واتە: ((بەڵام سوێند بەوەی کە گیانی
موحەمەدی بەدەستە من ئاگام لەو کارە نەبووە و نەم زانیوە تا ئەوەی ئێوە بیستان منیش
بەرگوێم کەوت و بیستم وە بچوک ترین موسوڵمان مافی پەنادانی هەیە بەسەر
موسوڵمانانەوە)) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لای زەینەبی کچی و پێی
فەرموو: ((اي بُنَيّة اكرمي مثواه ولا يَخلصنّ اليكِ فانكِ لا تحلين له)) واتە: ((کچی خۆم
ئەوەندەی لێرە دەمێنێتەوە ڕێزی لێ بگرە و نەهێڵیت نزیکت بکەوێت چونکە تۆ حەڵاڵ
نیت بۆ ئەو)) ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەندامانی مەفرەزەکەی کە دەستیان بەسەر
سامان وکاروانەکەی (ابو العاص)دا گرتبوو وبەوانی فەرموو: ((ان هذا الرجل منا حيث له

علمتم وقد اصبتم له مالاً فان تحسنوا ترُدّوا عليه فانا نحب ذلك وان ابيتم ذلك فهو فيء الله الذي أفاءه عليكم فانتم أحق به)) واتە: ((ئەو پیاوە خۆتان دەزانن کە چ جۆرە خزمایەتیەکی هەیە لەگەڵ ئێمە، ئێوەش دەستان بەسەر سامانەکەی ئەودا گرتووە، گەر سامانەکەی بۆ بگێڕنەوە کارێکی چاکتان ئەنجام داوە وە ئێمەش ئەوەمان پێ خۆشە گەر سامانەکەشی بۆ نەگێڕنەوە ئەوە بەشی خودایە کە داویەتیە ئێوە وە خۆتان شایستە ترن بەو سامانە)) ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە هەمووی بۆ دەگێڕینەوە، بەو جۆرەش هەموو سامانی کاروانەکەیان بۆ گێڕایەوە هەتا پیاوانی وایان هەبوو پەتێکی بۆ دەهێنایەوە، وە پیاوی وایان هەبوو مەشکە کۆنەیەکی بۆ دەهێنایەوە یاخود قاپێك وە هیواشیان هەبوو ئەو چیلکەیەی بۆ دەهێنایەوە کە دەمی کونەی پێ دەبەسترێت، بەو جۆرە هەموو سامانەکەیان بۆ گێڕایەوە بێ ئەوی هیچی لێ بزر بووبێت ئینجا (ابو العاص) هەمووی لەگەڵ خۆی بردەوە شاری مەککە، وە هەموو یەکێك کە پارەی قازانج بە شەراکەتی پێ دابوو هەموو پارەکەی بۆ گێڕایەوە پاشان وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە ماوە پارەی لای من بێت وە من بۆم نەگێڕابێتەوە؟ هەموویان وتیان: نەخێر خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە وە بەڕاستی ئێمە بۆمان دەرکەوت کە تۆ پیاوێکی دەست پاك و بەڕێزیت، ئینجا پێی وتن: ئەوا منیش شاهیدی دەدەم کە هیچ خودایەك نیە تەنها هەر الله خودایە وە شایەتی دەدەم کە مەحەمەد بەندە و پێغەمبەری خوایە [سوێند بەخوا] ئەوەی ڕێگربوو لەبەردەم موسوڵمان بوونمدا ئەوە بوو کە من دەترسام ئێوە گومانتان وابێت کە من بە موسوڵمان بوونم دەمەوێت پارە و سامانی ئێوە [بخۆم] کاتێك کە خودا هەمووی بۆ گێڕانەوە و بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی من نەما ئینجا موسوڵمان بووم. پاشان (ابو العاص) لە مەککە دەرچوو تاگەیشتە مەدینە و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئیبن ئیسحاق (رحه الله) دەفەرموێت: داودی کوڕی ئەلحوصەین بۆی گێڕامەوە لە عەکریمەوە ئەویش لە ئیبن عەباس وە ﷺ کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی گێڕایەوە لەسەر مارەکردنی یەکەم جار بۆ (ابو العاص) لە دوای شەش ساڵ بێ ئەوەی هیچ بگۆڕێت، پاشان لەدوای وەفاتی زەینەب (ابو العاص) گەڕایەوە شاری مەککە و لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری جەنگەکانی تری نەکرد، پاشان دووبارە گەڕایەوە شاری

مەدینە و تێدا مایەوە تا لەمانگی (ذي الحجة) ی ساڵی دووانزەی کۆچیدا وەفاتی کرد لەماوەی خەلافەتی ئەبو بکری صدیقدا ﵁ وەسێتی کرد کە ماڵ و سامانەکەی لە دوای خۆی بدرێتە زوبەیری کوڕی عەوام ﵁)[٣٧٠].

## سریەی (الخبط)

پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دەدا بۆ گرتنی ڕێگە بازرگانیەکانی قوڕەیش بە مەبەستی لاواز کردنیان لە ڕووی دارایی و دەروونیەوە، ئەبو عوبەیدەی نارد لەگەڵ سێ سەد کەس لە پشتیوانان و کۆچکردوان بۆ ناوچەی (سیف البحر) لە ناو خاکی (جهینە) دا بۆ ڕێگرتن بە کاروانە بازرگانەکانیانی قوڕەیش کە بەو ناوچەدا تێدەپەڕین، ئەمەش پێش ڕێکەوتننامەی (الحدیبة) بوو وەك پەسەندە لای زۆرێك لە زانیان[٣٧١]. ئەم بەسەرهاتەش لە چەندەها ڕیوایەت و گێڕانەوەدا هاتووە لە دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنیان بەسەرهاتە کە بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت.

جابر ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ [ئێمەی نارد] کە سێ سەد سوار بووین بۆ [ناوچەی زەویەکانی جوهەینە][٣٧٢] وە ئەبو عوبەیدەی کوڕی ئەلجەڕاحیش پێشەوامان بوو، ڕۆیشتین تا چاودێری کاروانێکی قوڕەیش بکەین [وە تەنها توورەکە خورمایەکی دەست کەوت و هەر ئەوەی پێدابین] ئێمە ڕۆیشتین [وە خواردنەکانمان کرد بووە ملمان و هەڵمان

---

(٣٧٠) اخرجه: احمد (٦/٢٧٦)، وابو داود (٢٦٩٤)، واللفظ للحاكم (٣/٢٣٦) رقم (٥٠٨٨) وقال عقبه: حديث صحيح، وابن هشام (السيرة) (٢/٢٥١)، والبيهقي (الكبرى) (٩/٩٥) و (الدلائل) (٤/٨٥)، وقال الشيخ الالباني (فقه السيرة) (ص: ٢٦٦، ص: ٢٦٧): اخرجه: ابن هشام بسند جيد، ورواه الحاكم بسند جيد، واما خبر ابن عباس في رد زينب بالنكاح الاول فاخرجه: احمد (١٨٧٦)، وابوداود (٢٢٤٠)، والترمذي (١١٤٣)، وابن ماجة (٢٠٠٩)، والطبراني (الكبير) (١١٥٧٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٩٥٧)، و (صحيح الترمذي) (٩١٣)، و (صحيح ابن ماجة (١٦٣٥)، و (الصحيحة) (٢٨١٩)، و (الارواء) (١٩٢١).

(٣٧١) انظر: (فتح الباري) لابن حجر (٨/٩٨)، و (زاد المعاد) لابن القيم (٢/١٥٨).

(٣٧٢) اخرجه: مسلم (٤٩٨٠).

هێشتا لە نیوەی ڕێگادا بووین خواردنمان نەما ئەبو لەکەمیدا)](٣٤٣) [هێشتا لە نیوەی ڕێگادا بووین خواردنمان نەما ئەبو
گرتبوون (واتە: لەکەمیدا)] عوبەیدە فەرمانی دا خواردنی هەموو سوپاکە کۆبکرێتەوە، هەمووی کۆکرایەوە تەنها دوو
تورەکە خورما بوو، هەموو ڕۆژێك [مشتێکی] کەمی پێدەداین تا تەواو بوو [ئینجا ئەبو
عوبەیدە یەك یەك خورمای پێ دەداین](٣٤٤) [پیاوی وا هەبوو لە ئێمە لە ڕۆژێکدا تەنها یەك
خورمای دەخوارد] [و دەمان مژی وەك منداڵ ئینجا ئاومان بەسەردا دەخوارد بەشی
ڕۆژێك هەتا شەو] لە دوای تەوابوونی ئەو دەنکە خورمایانە نارەحەتی
بەکردین زانی، ئینجا پیاوێك لە سوپاکەدا (واتە: قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە)
نەبوونیمان زانی، ئینجا پیاوێك لە سوپاکەدا تەواو نارەحەتی کردین] سێ وشتری بۆ سەربڕین، پاشان سێ
[لە دوای ئەوە برسێتی تەواو نارەحەتی کردین] سێ وشتری بۆ سەربڕین، ئینجا ئەبو
وشتری تریشی بۆ سەر بڕین لە دوای ئەوەش سێ وشتری تری بۆ سەربڕین، ئینجا ئەبو
عوبەیدە ڕێگەی نەدا وشتری تر سەر بڕێت، لە دوای ئەوە برسێتیەکی توندمان توش هات
[ناچارنە گەڵای دارمان دەهێنا و بە دار لێمان دەداو پاشان بە ئاو تەرمان دەکرد و دەمان
خوارد] ئەو سوپایەشمان دواتر ناو نرا بە سوپای (الخبط) (واتە: گەڵا خۆرەکان) [ئینجا بە
فراغ دەریاکەدا ڕۆیشتین لە دوورەوە شتێکمان بەرچاو کەوت وەك تەپۆڵکە وابوو
گەیشتینە لای و تەماشامان کرد [نەهەنگێکی گەورەیە وەك تەپۆڵکە] ناوی نەهەنگی
(العنبر)ە.

ئەبو عوبێدە لەوێدا وتی: ئەوە مردار بۆتەوە [و بۆ ئێمە حەڵاڵ نیە، پاشان پێی
وتین:](٣٤٥) تا ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خوایان ﷺ لە پێناوی خوادا هاتووین وئێستاش
ناچارین لەبەر ئەوە بیخۆن [ئێمەش گۆشتەکەیمان هەندێ جاردەکوڵاند و هەندێ جاریش
دەمان برژاند تا تێر گۆشت وتێر ئاو بووین] [لەوێدا یەك مانگ کە سێ سەد کەس بووین
لە گۆشتەکەیمان خوارد تاقەڵەو بووین دەمت بینی بە گۆزەڵە لە چاوەکانی دا ڕۆنمان
بردەکرد پارچە گۆشتی گەوەمان لێ دەبڕی وەك گا] بەردەوام لە گوشت و ڕۆنەکەیمان

---

(٣٤٣) اخرجه: مسلم (٢٩٨٣).

(٣٤٤) اخرجه: مسلم (٤٩٧٤).

(٣٤٥) اخرجه: ابو داود (٣٨٤٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود (٣٢٥٣).

دەخوارد تا[قەڵە و نەرم بووین][٣٧٦] و [لاشەمان تێر وپڕ بووە وە]، ئەبو عوبەیدە پەراسویەك لە پەراسوەکانی نەهەنگەکەی هێنا و چەقاندی [لەسەر ڕێگاکەدا] ئینجا بالا بەرز ترین پیاو کە لەگەڵی دا بوو [لە سوپاکەدا سواری پشتی بەرزترین وشتری کرد بە ژێریدا ڕۆیشت] [پەراسوەکە بەر سەری سوارەکە نەکەوت] [ئەبو عوبەیدە سیانزە پیاوی لە ئێمە برد و هەموویانی دانیشاند لەناو یەکێك لە جێ چاوەکەیدا، ئینجا گەڕاینەوە هەندێك پارچە گۆشتی وشکراوی ئەو نەهەنگەمان لەگەڵ خۆمان هێنایەوە کاتێك گەیشتینە شاری مەدینە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وتین: ((چی ئێوەی وا دواخست؟)) وتمان: ئێمە بەدوای کاروانەکانی قورەیش دا دەگەڕاین، ئینجا باسی نەهەنگەکەمان بۆ گێڕایەوە][٣٧٧] [و پرسیارمان لێ کرد سەبارەت بەخواردنی گۆشتی ئەو نەهەنگە] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هو رزق اخرجه الله لكم فهل معكم من لحمه شيء فتطعمونا [منه] قال: فارسلنا الى رسول الله ﷺ [بعضو] منه فأكله])) واتە: ((ئەوە ڕۆزویەکە خودا بۆ ئێوەی دەرهێناوە (واتە: لەدەریادا) ئایا هەندێك لە گۆشتەکەیتان لاماوە تا لێی بخۆین)). ئێمەش پارچەیەك لە گۆشتەکەمان نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش خواردی])[٣٧٨].

## سریەکەی عەبدولڕحمانی کوڕی عەوف

لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ﷺ (عبد الرحمن بن عوف)ی نارد بۆ ناوچەکانی (بنی کلب) لە (دومة جندل) کە ماوەی پانزە ڕۆژ دوورە لە شاری مەدینە[٣٧٩]، ئەو ناوچەیە عەرەب بوون چوو بوونە ناو ئاینی گاورەوە، ئەرکەکانی ئەم

(٣٧٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٤٥/٤) واسناده صحيح كما قال صاحب (السرايا والبعوث النبوية) (ص: ١٢١).

(٣٧٧) أخرجه: النسائي (٢٠٧/٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٠٦١).

(٣٧٨) أخرجه: البخاري (٤٣٦٠) و (٤٣٦١) و (٤٣٦٢)، ومسلم (٤٩٧٤- ٤٩٨٠)، وابو داود (٣٨٤٠)، والنسائي (٢٠٧/٧- ٢٠٩)، واحمد (٣٠٩/٣)، ومالك (٩٣٠/٢)، وابن حبان (٥٢٣٥) واللفظ للبخاري والزيادات لمسلم وابي داود والنسائي وابن هشام.

(٣٧٩) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٥٦٠/٢)، وابن سعد (الطبقات) (٨٩/٢)، وابن القيم (الزاد) (١٥٥/٢).

سریەیەش ئەرکی سەربازی بوو بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی موسوڵمانان لەو ناوچەیەدا وە ئەرکی ئاینیشی هەبوو بۆ گەیاندنی ئاینی ئیسلام بەو ناوچەیە.

هەروەها ئەرکی هاتی ئەم سریەیە عەبدڵای کوڕی عومەر ﷛ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدولڕحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد وپێی فەرموو: ((تجهّز فاني باعثك في سرية من يومك هذا أو من الغد ان شاءالله)) واتە: ((خۆت ئامادە بکە ئەمڕۆ یان سبەینێ (إن شاءالله) لەگەڵ سریەیەکدا دەتنێرم)) منیش وتم بەیانی لەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ دەکەم ئامادە دەبم با ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەبدولڕحمان ببیستم، بەیانی چووم نوێژم کرد و دانیشتم تەماشام کرد ئەبو بکر و عومەر و کەسانێك لە کۆچکردوەکان کە عەبدوڕحمانی کوڕی عوفیان لەناو دابوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردبوو کە شەو خۆی ئامادە بکات بۆ دەرچوون بەرەو ناوچەی (دومة جندل) تا بانگیان بکات بۆ ئیسلام [عەبدورەحمان بەیانی هات و جەمەدانەیەکی ڕەشی بەسەرەوە بەستبوو نزیك بوو لە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ جەمەدانەکەی بۆ کردەوە و جەمەدانەیەکی سپی بۆ بەست و ماوەی چوار پەنجە لچکی جامانەکەی بەپشتی دا شۆڕ کردەوە و پێی فەرموو: ((هكذا يا ابن عوفٍ إعتمّ فانه اعرب واحسن)) واتە: ((ئاوەها جەمەدانەکەت بپێچەرەوە چونکە ئەوەها عەرەبیانە ترە و جوانترە)). پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە بیلال کرد ئاڵاکەی بدات بەدەستەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاسی خودای کرد و درودی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی نارد و فەرمووی: ((خذ يا ابن عوف فاغزوا جميعاً في سبيل الله فقاتلوا من كفر بالله لا تغلوا ولا تغدروا ولا تمثلوا ولاتقتلوا وليداً)) واتە: ((بگرە (ئاڵاکە) عەبدوڕەحمان هەمووتان بەیەکەوە لە پێناوی خودا دا بجەنگێن دژ بەوانەی کە باوەڕیان بە خوا نیە وە دزی مەکەن لەدەست کەوت و غەدرو نامەردی مەکەن وە هیچ کەسێك هەتك مەکەن و منداڵ مەکوژن))][٢٨٠]. عەبدوڕەحمان لەگەڵ هاوەڵانی

---

[٢٨٠] أخرجه: الخرائطي (مكارم الاخراق) (٣)، والحاكم (٥٤/٤) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٣٦٣/٦) وقال: فيه عثمان بن عطاء ليس بالقوي، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٢٠/٥) و (٣٠٩/١٠): رواه الطبراني (الصغير) باسناد حسن.

بەرێدا ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوچەی (دومة جندل) وە لەو ناو چەیەدا سێ ڕۆژ مانەوە بانگی خەلکەکەیان کرد بۆ ئیسلام، ئەوان لە سەرەتادا ڕازی نەبوون بچنە ناو ئیسلامەوە بەلکو بڕیاری شەڕ کردنیان دا، بەلام لەڕۆژی سێهەمدا ئیصبیغ ی کوڕی عەمروی ئەلکەلەبی) کە گاور بوو ئیسلامی قبوڵ کرد و موسولمان بوو وە ئەو سەرکردەیان بوو، هەواڵی موسولمان بوونی خۆی پێ ڕاگەیاند، هەلگری نامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد نامەکە پیاوێك بوو لە هۆزی جوهەینە کەناوی رافیع کوڕی مەکیث بوو وە نامەکی عەبدوڕەحمانیش گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ وە تێیدا نوسیبووی کە دەیەوێت ژنێکیان لێ بخوازێت، پێغەمبەری خوا ﷺ نامیەکی بوو نوسیەوە و داوای لێکرد کچەکەی ئەلئەصبەغ کەناوی (تماضر)بوو بخوازێت. عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیش ئەو کچەی مارەکرد و گوێزایەوە و پاشان لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ شاری مەدینە و بووە دایکی ئەبو سەلەی کوڕی عەبدڕحمانی کوڕی عەوف)[٢٨١].

## سریەکەی عەلی کوڕی ئەبو طالب

هەر لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبوطالبی ﷺ لەگەڵ سەد پیاو دا نارد بۆ ناوچەی فەدەك بۆ لای تیرەیەك لە هۆزی بنی سەعدی کوڕی بەنی بەکر، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەی پێ گەیشتبوو کە ئەوان کۆمەڵێ چەکداریان کۆ کردۆتەوە دەیانەوێت پشتیوانی جولەکەکانی خەیبەر بکەن سریەکە بە شەو دەڕۆیشتن و بە ڕۆژ لە کەمیندا بوون تا هەوالگرێکی ئەوانیان فۆڵ بەست کرد و دانی نا بەوەدا کە ئەوان ئەویان ناردووە بۆ خەیبەر کە پشتیوانی لەوان بکەن لەبەرامبەر هەندێ بەروبومی خەیبەردا. سریەکەش پەلاماری ئەو ناوچەیەیاندا و ئەو تیرەیەی بەنی سەعد هەموویان ڕایان کرد و پێنج سەد وشتر و دوو هەزار مەڕیان لە دوای خۆیان بەجێ هێشت سریەکەش هەموویانی پێش خۆی دا و بەسەلامەتی گەڕایەوە ناو شاری مەدینە[٢٨٢].

---

[٢٨١] اخرجه: الدارقطني (الافراد) كما في (الاصابة) (١/١٠٨)، و (كنز المال) (٣٠٢٧٥).

[٢٨٢] اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٥٦٢)، وابن سعد (الطبقات) (٢/٨٩)، والبيهقي (الدلائل) (٤/٨٥).

# سریەکەی ئەبو بکری صدیق

لەم فەرمانە ئافرەتێکی بەنی فەزارە بوو لەناوچەی (وادی القری) هەوڵی دەدا سوپایەک پێک بهێنێت و هێرش بباتە سەر موسوڵمانان. پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی بۆ ناوچەکەیان نارد بەسەرۆکایەتی ئەبوبەکری صدیق ﷺ و پەلاماریان دان هەندێکیان لێ کوشتن وە هەندێکیان لێ دەست گیرکردن پاشان گەڕانەوە شاری مەدینە[٢٨٣] بەسەرهاتەکەش سەلەمەی کوڕی ئەلئەکوەع ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکری صدیقی ﷺ کردە پێشەوامان و سریەکەمان بەڕێ کەوت تا گەیشتە ناوچەی بەنی فەزارە لە هەوازن، وەهێشتا ماوەیەکمان مابوو بۆ گەیشتنە سەر ئاوەکەیان، ئەبوبکر ﷺ داوای لێ کردین لەوێدا لا بدەین لەدوای ئەوەی نوێژی بەیانیمان ئەنجامدا دواتر فەرمانی پێ کردین و پەلامارمان دان کۆمەڵێکمان لێ کوشتن لەسەر ئاوەکەیاندا [نیشانەو چەمکمان: بکوژە بکوژە بوو هەر لەوێدا بە دەستی خۆم حەوت یان نۆ لە موشریکەکانم کوشت][٢٨٤] لەوێدا تەماشام کرد هەندێکیان ڕایان دەکرد کە ژن و منداڵیان لە نێوانیاندا بوو منیش بە ڕاکردن دوایان کەوتم ترسام لەوەی پێشم بکەون بۆ چوونە سەر شاخی ئەو ناوچەیە بۆیە تیرێکم تێگرتن کەوتە نێوان ئەوان و شاخەکەوە [ئەوان کەتیرکەیان بینی وەستان] منیش هەموویانم پێش خۆم دا و هێنامن بۆ لای ئاوەکەیان ئافرەتێکیان لەناودابوو کە فەرویەکی کۆنی لەبەردابوو کچێکی لەگەڵدا بوو لەجوانترین ئافرەتی عەرەب بوو ئەبوبەکر بەخشیە من و بەهیچ جۆرێك نزیکی نەکەوتم تا گەڕاینەوە شاری مەدینە شەومان بەسەر هات وبەیانیەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ پێ گەیشت [لە بازاڕدا] و فەرمووی: ((سەلەمە ئەو ئافرەتەی کە لاتە بیبەخشە بەمن؟)) منیش وتم: ئەی

---

(٢٨٣) أنظر: (تأريخ الطبري) (٦٤٣/٢).

(٢٨٤) أخرجه: احمد (٤٦٠/٤)، والدارمي (٢٤٥٥)، وابن ابي شيبة (٥٠٣/١٢)، وابي داود (٢٦٣٨)، وابن ماجة (٢٨٤٠)، والحاكم (١٠٧/٢) وصححه ووافقه، والبيهقي (٣٦١/٦)، والطبراني (٦٢٣٩)، وابن حبان (٤٧٤٤) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٩٧)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٢٩٢).

پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا بەدڵمدا چووە و نزیکی نەکەوتوم. پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو بەجێی هێشتم، بۆ ڕۆژی دواتر دیسان لە بازاڕ پێم گەیشت و فەرمووی: واتە: ((سەلەمە باوکت چاك ئەو ئافرەتەی لاتە ببەخشە بە من؟)).

منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [سوێند بەخوا] نزیکی نەکەوتوم و تائێستا جلێکم هەڵنەداوەتەوە من دەیبەخشم وپێشکەشی دەکەم بە تۆ. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتەی نارد بۆ مەککە و ئاڵو گۆڕی پێکرد لەگەڵ هەندێك دیلی موسوڵمانان لەوێ بەو ئافرەتە هەموویانی ئازاد کرد)[٣٨٥].

## سریەکەی کورزەی کوڕی جابری ئەلفهری

چەند کەسانێك لەهەردوو هۆزی (عوکل و عرینە) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە و موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد وە هەموویان نەخۆش و ناساغ بوون و گەرمای ناو شاری مەدینە نارەحەتی کردن وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی پێدان بچن بوو ناوچەی (الغابة) واتە: بێشەلانەکەی سەرو شاری مەدینە و لەگەڵ وشترەکانی زەکات لەوێ بمێننەوە، پاشان لە نەخۆشیەکەیان چاك بوونەوە و شوانەکەیان بە ئەشکەنجە و سزا کوشت وشترەکانیشیان فڕاند و ڕایان کرد. لەوێدا سریەیەك بە دوایاندا نێردرا هەموویانی گێڕانەوە و تۆڵەیان لێ کرایەوە. سەلەمەی کوڕی ئەلئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕێکی لابوو ناوی یەسار بوو تەماشای کرد نوێژەکانی بەجوانی ئەنجام ئەدات لە دوایدا ئازادی کرد و کردیە شوانی وشترەکان لەناوچەی (الحرة)وە لەوێ مایەوە لەناویاندا بوو)[٣٨٦].

---

[٣٨٥] أخرجه: احمد (٥١/٤)، ومسلم (١٧٥٥) (٤٥٤٨)، وابي داود (٢٦٩٧)، وابن ماجة (٢٨٤٦)، والبيهقي (١٢٩/٩)، والطبراني (١٤/٧)، وابن حبان (٤٨٦٠) وقال محققه: حسن، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٤١٦)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٢٩٧).

[٣٨٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦/٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٤٩/٦): فيه موسى بن محمد ضعيف، وقال ابن كثير (التفسير) (٢٩١/٢): غريب جداً، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٣٩/١): اسناده صالح.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: ([هەشت کەس] [لە دەشتەکیەکانی][٢٨٧] عوکل [وعورەنیە] هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ [هەموویان نەخۆش و ناساغ بوون] [و تەواو و بێ هێزبوو بوون ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو وە سکیان ئاوسابوو] [وەلاشەیان لەڕو لاواز بوو][٢٨٨] هاتن بەڵێنیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا وە موسوڵمان بوون [وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لای خۆت جێگەمان بکەرەوە وخواردنمان بدەرێ] [پێغەمبەری خوا ﷺ نیشتەجێی (الصفة)ی کردن لەناو مزگەوتەکەیدا])[٢٨٩]. ماوەیەك مانەوە و ئەوندەی تر دەردەکەیان گران تر بوو، سکاڵای بارودۆخی خۆیان لای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و [وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە دەوار نشینین وە خاوەن ئاژەڵ بووین وە هەرگیز شارنشین نەبووین][٢٩٠] [ئەم نەخۆشی گەڕ و گولیەش [وابلا وبۆتەوە][٢٩١] گەر ڕێگەمان بدەیت بچینە دەرەوەی شار تا لەگەڵ هەندێك وشتردا بژین] [وە هەروەها وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك ئاژەڵی شیردارمان بۆ پەیداکە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ماأجد لکم[٢٩٢] [ان شئتم ان تخرجوا الى ابل الصدقة][٢٩٣])). واتە: ((ئیستا هیچم لا نی یە))] [((گەر ویستان لێ یە بڕۆن دەر لەگەڵ ئەو وشترانەی کەلەزەکاتدا دراون))] [پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترانەی بۆ دیاری کردن] وپێی فەرموون: ((بڕۆنە دەر لەگەڵ شوانەکەمان بێ لەناو وشترەکاندا و میز و شیری وشترەکان بەکار بهێنن)) وتیان: باشە [بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی نارد لەگەڵ ئەو وشترانەی کە لەزەکاتدا درابوون][٢٩٤] [لەگەڵ

---

[٢٨٧] أخرجه: ابن حبان (١٣٨٦) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٢٨٨] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (١٨٥٤١).

[٢٨٩] أخرجه: البخاري (٦٨٠٤).

[٢٩٠] أخرجه: البخاري (٤١٨٢).

[٢٩١] أخرجه: مسلم (٤٣٣٤).

[٢٩٢] أخرجه: البخاري (٦٨٠٤).

[٢٩٣] أخرجه: مسلم (٤٣٢٩).

[٢٩٤] أخرجه: الترمذي (٧٢)، وصححه الشيخ الالباني (صحيح الترمذي) (٦٢).

یەساردا] پاشان هەموویان ڕۆیشتن وە میز و شیری وشترەکانیان بەکار هێناو چاك بوونەوە [کاتێك لەش ساغ بوون] [و قەڵە و بوون] [ڕەنگ و ڕووی ساغیان بۆ گەڕایەوە] [وە لەناوچەی (الحرة) بوون پاشان پاشگەز بوونەوە] وە بێ باوەڕ بوون لەدوای موسوڵمان بوونیان] وە [پەلاماری یەساریان دا] [کە شوانێکی بڕواداری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو][٣٩٥] دەست و قاچیان بڕی و دڕکیان کردە ناو هەردوو چاوی][٣٩٦].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: یەکێك لە دوو شوانەکەیان کوشت [ئەوتریان لەسەرەتای][بەرەبەیانێکی زوودا][٣٩٧] (بە شپرزەی) هات وتی: هاوڕێکەمیان کوشت وشترەکانیان برد [وشەڕ نگێزانە ڕایان کرد] [پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی بەدوایان نارد] [کە بیست کەس دەبوون لە گەنجە ئەنصاریەکان [پێشەوایان کورزەی کوڕی جابری ئەلفهری بوو] هەموویانی نارد بۆیان وشوێن پێناسێکی نارد لەگەڵیان تا ڕێگە وشوێنی پێیان بدۆزێتەوە][٣٩٨] [ودوعای لێ کردن و فەرمووی: ((اللهم عمِّي عليهم الطريق واجعل عليهم أضيق من مَسكِ جملٍ)) واتە: ((خودایە ڕێگەیان لێ ون بکەو لێیان تەسك بکەردوە وەك ئەڵقەی ملی وشتر))] خودای گەورە ڕێگەی لێ ون کردن و هەموویان دەست بەسەر کران [پێش نیوەڕۆ هەموویان هێنران] وە فەرمانی کرد هەموویان دەست وقاچیان [جیا بەجیا] ببڕدرێت و [بۆیان نەپێچرێت] وە چاویان هەڵکۆڵرێت، لەڕیوایەتێکدا: [فەرمانی کرد هەندێك بزمار سوربکرێتەوە و چاویان پێ ببرژێنرێت][٣٩٩] [پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە چاوانی والێ کردن چونکە بە هەموویان چاوی شوانەکەیان والێ کردبوو][٤٠٠] ئینجا فرێ

---

[٣٩٥] أخرجه: النسائي (٧/٩٤)، وصححه الشيخ الالباني (صحيح النسائي) (٣٧٦٤).

[٣٩٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٢٢٣) (٧/٦).

[٣٩٧] أخرجه: البخاري (٥٣٣) (٦٨٠٥).

[٣٩٨] أخرجه: مسلم (٤٣٣٤).

[٣٩٩] أخرجه: البخاري (٦٨٠٤).

[٤٠٠] أخرجه: مسلم (٤٣٣٦).

درانە بەر خۆر [لای بەردە ڕەشەکان] تامردن [لەسەر ئەو حاڵەیان][٤٠١] وە سەبارەت بەمانیش ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (المائدة: ٣٣)[٤٠٢]. واتە: ﴿بێگومان تۆڵەو جەزرەبەی کاری خراپی ئەوانەی دژایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئەو دەکەن و دژی ئەو دەجەنگن و دەکوژن و هێرش دەکەنە سەر شارو گوندەکان بەردەوامیش لە عەرزدا هەوڵی ئەسادوکاری گەندەڵی و خراپە کاری دەدەن،و ڕێ لەخەڵکیش دەگرن، تۆڵەیان ئەوەیە کە: ئەوانەیان خەڵکیان کوشتووە، دەبێ بەتوندیی و بێ بەزەییانە بکوژرێن ئەوانەشیان خەڵك دەکوژن و سامانیشیان دەبەن، دەبێ هەڵواسرێن و لەداربدرێن ئەوانەشیان تەنها سامانی خەڵك بە تاڵان دەبەن، دەبێ یان دەست و پێیان -ڕاست و چەپ- ببڕدرێ یان شار بەدەر بکرێن، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر، وەیان زیندانی بکرێن، ئەگەر تەنها خەڵکیان دەترسان، واتە: نەکەسیان دەکوشت و نەداراییشیان دەبرد لەدنیادا ئەوە ریسوایی و سەرشۆڕییە بۆیان و لەدوارۆژیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە.﴾.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (ئەوانە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام وە پاشگەز بوونەوە بە هەموویان شوانەکەیان کوشت و وشترەکانیان دزی و ڕێگربوون)[٤٠٣] [ئەبو قەلابەش دەفەرموێت: ئەوان کەسانێك بوون دزیان کرد وپیاوێکیان کوشت وە بوونە بێ باوەڕ لە دوای موسوڵمان بوونیان وە جەنگیان لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی کردﷺ][٤٠٤].

[موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: واباس دەکرێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەم ڕووداوەوە (المثلة) واتە: کوشتنی قێزەونانەی قەدەغەکرد][٤٠٥][٤٠٦].

---

[٤٠١] أخرجه: البخاري (٤١٩٢).

[٤٠٢] أخرجه: النسائي (٩٥/٧) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٣٧٧٢)، و (الارواء) (١٩٥/١).

[٤٠٣] أخرجه: الطبري (التفسير) (١١٨١٦) وقال محققه: حديث صحيح.

[٤٠٤] أخرجه: البخاري (٦٨٠٥).

[٤٠٦] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٨٨/٤).

ئەم ڕووداوەش لە ساڵی شەشی کۆچیدا ڕووی دا وە ئەمەش پەسەند کراوە لە ووتەی زانایان، بەڵام جیاوازیان لەو مانگە دا هەیە کە ئەمەی تێدا ڕوودراوە:

ئیبن ئیسحاق دەفەرموێت: لەمانگی (جمادي الاخرة) ڕوویداوە. وە ئیمامی بوخاری دەفەرموێت: لەمانگی (ذي القعدة) ڕووی داوە، بەڵام واقدی ئیبن سەعد و ئیبن حەببان خوایان لێ ڕازی بێت دەفەرموون: لەمانگی (شوال) ی ساڵی شەشی کۆچیدا ڕوویداوە.[407]

هەندێك لە زانایان دەفەرموون: ئەم فەرموودەیە کە لەم ڕووداوەی پێشوو دا هاتووە حوکمەکەی هەڵوەشێنراوەتەوە و کاری پێ ناکرێت لە دوای دابەزین (الحدود) واتە: سزا دیاری کراوەکان، وەبە قەدەغەکردنی: کوشتنی قێزەونانە قەدەغەکردنی داغ کردن و سزادان بە ئاگر. خوای گەورەش زاناترە بەمە.

---

[406] الحديث: أخرجه: البخاري (٦٨٠٢، ٤١٩٢، ٤٦١٠)، ومسلم (٤٣٣٠) واللفظ له، وابوداود (٤٣٦٤)، والنسائي (٩٣/٧.....١٠١)، والطيالسي (٢٠٠٢)، وابن خزيمة (١١٥)، وابن حبان (١٣٨٨، ٤٤٦٧، ٤٤٧٢)، والترمذي (٧٢)، وابن ماجة (٣٥٠٣) وانظر: (صحيح الترمذي) (٦٢)، (الارواء) (١٧٧)، و(الصحيحة) (٢١٧٠).

[407] انظر: (السرايا والبعوث النبوية) د. بريك محمد (ص: ٢٠٠).

# ڕێکەوتننامەی حودەیبیە

لە دوای شکستهێنانی قورەیش لە غەزای خەندەق ودەرکەوتنی لاوازی وبێ هێزی پلەو پایەیان لەلایەن تێکڕای عەرەب بەگشتی، غەزا یاخود سوڵحی حودەیبیە ڕوویداو هاتە پێش ئەمیش بۆ دەستەبەرکردنی سێ ئامانجی گرنگ بوو.

یەکەمیان: ئاگادارکردنەوەی خەڵك بەگشتی و هۆشیار کردنەوەیان لەوەی کەپەیوەندی موسوڵمانەکان لەگەڵ ناموسوسڵمان و موشریکەکاندا مەرج نی یە کە بەبەردەوامی لە دۆخێکی جێگیری جەنگ و کوشتارو توندوتیژیدا بمێنێتەوە بەڵکو دەگونجێت ئەو پەیوەندیانە لە هەموو بارودۆخەکاندا بە ئاشتی و پێکەوە ژیانی هاوبەش و دانوستان بڕێت بەڕێوەو بگوزەرێنرێت وە هێمنی باڵی بەسەردا بکێشێت لەگەڵ بوونی جیاوازی ئایینی وبیروڕاو بیرکردنەوە وە ئاراستەی جیا.

دووەمیان: هەڵپەساردنی ململانێ وبەربەرەکانێ لەگەڵ قورەیش و ڕووکردنە دوژمن و ئاراستەکانی تر بەمەبەستی چرکردنەوە و خۆیەکلایکردنەوە بۆ لایەك بەتایبەتیش ئەمە بەڕوونی دەبینرێت لەو هەڵکشانەی بەرەکانی ململانێ بەخۆیەوە بینی لە دژی جولەکەکان لەلایەکەوە و وەلە دژی ڕۆمەبیزەنطیەکان و هاوپەیمانەکانیان لە عەرەبە گاورەکان لەلایەکی ترەوە.

سێهەم: سەلماندنی ڕاستیەکی بەڵگەنەویست کە مەککە و پیرۆزیەکانی قورخ نەکراون بۆ بت پەرستان بەئارەزووی خۆیان و بەوپەڕی ئازادیەوە هەرچی بیانەوێت تێیدا بکەن ودروشم ودابونەریتی کوێرانەی خۆیانی تێدا جێبەجێ بکەن، وەدەست بگرن بەسەر هەموو توانا و پێداویستی یەکانی ئەم شارەوە بۆ خۆیانی پاوان بکەن. بەڵکو بەپێچەوانەوە موسوڵمانەکان شایستەتر وشایەنترن بەوەی کەبەئاسایش و ئارامیەوە بچنە ناو حەرەمی مەککەی پیرۆزەوە وموماڕەسەی دروشم وبەندایەتی خۆیان بکەن کەبنیات نراوە لەسەر خواناسی و یەك خودا پەرستی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە.[٤٠٨]

[٤٠٨] انظر: (دراسة في السيرة) (ص: ٢٢٣).

پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا بینی بووی کە چۆتە ناو شاری مەککە وە و تەوافی بەدەوری ماڵی خوادا کردووە قژی سەریان بۆ تاشیووە و عەمرەی کردووە، ئەم هەواڵەی دا بەهاوەڵانی لەناو شاری مەدینە، وە بەدەشتەکییەکانی نیشتەجێی دەوری مەدینەشیان ڕاگەیاند لەدەوارنیشینەکان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ دەرچوون بەرەو شاری مەککەلە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لەکاتێکدا ئەوە مەترسی هەبوو کە قورەیش هەرایەک بەرپا بکەن و دژیان بووەستنەوە چ بەجەنگ و هەرا بێت یاخود بەڕێگەگرتن لێیان کە نەهێڵن زیارەتی کەعبەی پیرۆز بکەن هەر لەبەر ئەوەش زۆربەی خێڵە عەرەبە دەوارنشینەکان سستیان نواند لەوەی لەگەڵیاندا بڕۆن [کەبریتی بوون لە خێڵەکانی جوهەینە و موزینە و غەفار و ئەسلەم و ئەشجەع و دەیل ئەوانە ئەو ئەعرابیانەبوون لە دەوروپشتی شاری مەدینە نیشتەجێ بوون][409].

ئەو خێڵەکیانە لە هێزو دەسەڵاتی قورەیش دەترسان و مەزندەی ئەوەشیان دەکرد لەم غەزایەدا کە موسوڵمانەکان تەفروتونابین و بەتەواوەتی بنبڕبکرێن هەروەکو خودای باڵا دەست دەفەرموێت: ﴿بل ظننتم أن لن ينقلب الرسول والمؤمنون إلى أهليهم أبدا وزين ذلك في قلوبكم وظننتم ظن السوء وكنتم قوما بورا﴾(الفتح: ١٢) واتە: ﴿نەخێر پاساو وبەهانەکەتان وانی یە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئێوە وا گومانتان دەبرد ئیتر هەرگیز پێغەمبەر و باوەڕداران ناگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکاریان وتیادەچن، ئەو گومان بردنە لەدڵ و دەروونتاندا ڕازاێنرابۆوە وچەسپ بوو، بەڕاستی گومانی ناقۆڵاتان بردبوو، ئێوە هەمیشە هۆز وتاقمێکی بێ کەڵك وبێ خێرن﴾.

پێغەمبەری خوادا ﷺ و موسوڵماکان لە کۆچەریەکان و پشتیوانەکان و ئەوانەش کە لەگەڵیان هاتبوون لە خێڵە عەرەبەکانی دەوروبەر بەڕێکەوتن لە مانگی (ذي القعدة)ساڵی(٦) کۆچی لەڕۆژی دووشەممەدا هاوسەری بەڕێزی خاتوو ئومسەلەمەش لە خزمەتیا بوو[410].

---

(409) أنظر: (التأريخ) للطبري (٦١٩/٢)، و (الدرر) لابن عبدالبر (ص: ٢٢)، و (الدلائل) للبيهقي (٩٠/٤)، و (التفسير) لابن كثير (٣٦٣/٢).

(410) أنظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٩١/٤) وهوالراجح.

دوو سەد ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو وە چوار ئافرەتیش بەژداریان کرد بەناوەکانی ئوم سەلە، ئوم مونەیع، ئوم عومار، ئوم عامیر (رضي الله عنهن) وە کەسێکیش لە دوو ڕووەکان بەناوی جەددی کوڕی قەیسی سەلەمی خەزرەجی[٤١١]. ژمارەی موسوڵمانەکان (١٤٠٠) کەس بوون کەمتەمەڕاسترین بۆ چوونە بەکۆڕای پێنج شایەد حاڵ کە لەو ڕووداوەدا بەژداریان کردووە[٤١٢].

ئومەیلەی کوڕی عەبدوڵڵای لەیثی بەسەرۆکاری مەدینەوە جێهێشت لە جێگای خۆی و وە (هدیە)کانی دیاریکرد وبەپێش خۆیاندا لێیان خوڕی کەحەفتا وشترەمێیەی گۆشتی بوون بۆ ئەوەی خەڵکی لێیان دڵنیابن کەنیازی، شەڕکرنیان نی یە، تاکۆ خەڵکیش بزانن کە ئەو تەشریفی هێناوە تەنها بۆ ئەوەی سەردانی ماڵی خودا بکات و ئەو کەعبەی پیرۆزە بەگەورە ڕابگرێت.

میسوەرەی کوڕی مەخرەمەی ئەسەدی ﷺ دەفەرموێت: دوای ئەوەی دەرچووین هەتاکو گەیشتینە (ذي الحليفة) کە (١٠) میل لەشاری مەدینە وە دوورە] لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری هەدیەی دیاریکرد وناجیەی کوڕی جوندوبی ﷺ کردە سەرپەرشتیاری ئەو وشترانە کە ئەوکاتە دوونیشانە هەبوو بۆ ناسینەوەی وشتری مەدینە کە لە (مونا) دەکرایە قوربانی یەکێکیان (تقليد) بوو کەپارچەیەك لەپێست یاخود هاوشێوەی پێست لەملی ئەو ئاژەڵە دەکرا بۆ ئەوەی بناسرێتەوە کە(هەدییە).

دووەمیان (إشعار)ە کە ئەویش لایەکی سەرکۆپاری وشترەکە یا مانگا کە دەبڕدرا هەتاکو خوێنی لێ دەهات بۆ ئەوەی بزانرێت (هەدییە) و بەرەو کەعبە دەڕوات هیچ کەسێکیش پێشی پێ نەدەگرت[٤١٣]. پاشان ئیحرامی عەمرەی بەست بۆ ئەوەی خەڵکی لەشەڕیان پشت ڕاست و دڵنیان بن کە ئەو دەرچووە بۆ ئەوەی زیارەتکار بێت و سەردانی کەعبەی پیرۆز

---

[٤١١] انظر: (زاد المعاد) لابن القيم (١٣٦/٢).

[٤١٢] انظر: (السيرة الصحيحة) للعمري (ص: ٤٣٥/٢).

[٤١٣] الهدي: هي الحيوان الذي يقدم في منى ويُجعل عليه علامتان وهما (التقليد) وهو ان يجعل في عنق الهدي قطعة جلدٍ او نحوها ليُعرف بها انه هديٌ، و (الأشعار) هو ان يُشق احدى جنبي سنام الدابة والبقرة حتى يسيل دمها ليُعلم أنها هديٌ يُساق الى الكعبة فلا يتعرض لها أحدٌ.

بكات و بەرزو پیرۆزی ڕابگرێت][٤١٤]. بەر لەوەی بگەن چاوەدێرێكی هەواڵگری نارد بوو لە هۆزی خوزاعە بەناوی بیشری كوڕی سوفیان، بۆ ئەوەی هەواڵی قوڕەیشی بۆ بێنێت][٤١٥]. بەوشێوە موسوڵمانەكان دەرچوون چەك و تفاقی تەواویان لە گەڵ خۆیان برد و بەتەوای خۆیان ئامادەكر بۆ جەنگ بەلەبەر چاوگرتنی ئەوەی كە مەزندە دەكرا دوچاری جەنگ و هەرابن لەگەڵ قوڕەیش و ئەو هۆزانەی كە دەكەوتنە سەر ڕێگایان بەرەو مەككە، ئەوەی ئەو بۆچوونە پشت ڕاست دەكات پێشنیازەكەی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ موسوڵمانانەكان كە داوادەكات هەستن بە هێرش بردنە سەر وپەلاماردانی هاوپەیمانەكانی قوڕەیش لە (ئەحابیشەكان) كە لە دەوروبەری مەكەدا نیشتەجێ بوون[٤١٦].

وەهەروەها گێڕانەوەیەكی لاوازیش (ضعیف) هەیە دەبێتە بەڵگەی ئەو ڕاستیە، لە ئیبن ئەبزیەوە ﷺ دەفەرمویت: (كاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچوو بەوشتری (هەدیە) كە بۆقوربانی پێی بوو لە ڕۆژی حودەیبیەدا، كە گەیشتە (ذو الحلیفة) عومەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەتەوێت بچیتە ناو خەڵكانێك كە جەنگت لەگەڵیاندا هەیە بەبێ چەك وتفاقی شەڕ؟ دەفەرموێت: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردیەوە بۆ شاری مەدینە، هەرچی چەك و پێداویستی جەنگ هەبوو بەجێیان نەهێشت وهەموویان لەگەڵ خۆیاندا هێنا....)[٤١٧]. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە (ڕەوحا) (كە (٧٣)كم لە مەدینەوە دووره) لەوێدا هەواڵیان پێدا كە مشریكەكان لە (وادي غیقة) كۆبوونەتەوە ئەویش مەترسی هەبوو ئەوەكو لەناكاو هەڵكوتنە سەر موسوڵمانانەكان هەر بۆیە كۆمەڵێكی لەهاوەڵان ئامادەكرد كە ژمارەیان بیست ئەسپ سواربوون ئەبوقوتادەی ئەنصاریشیان لەگەڵدا بوو

---

(٤١٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٦٢/٣)، والطبري (التاريخ) (٦١٩/٢)، وابن عبدالبر (الدرر) (ص: ٢٢٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٨٨/٤).

(٤١٥) أخرجه: احمد (٣٢٦/٤)، وعبدالرزاق (٩٧٢٠)، البخاري (٤١٧٨، ٤١٥٧، ٢٧٣١)، ابي داود (٢٧٤٩)، النسائي (١٦٩/٥).

(٤١٦) انظر: رواية البخاري (الصحيح) (٤١٧٩).

(٤١٧) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٦٢٢/٢)، وقال البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (٢٤٨): اسناده ضعيف.

بەرەو ئاراستەی ئەوانی ناردن بۆ ئەوەی لە شەڕو زیانیان پارێزراوبن)[٤١٨]. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((خذوا ساحل البحر حتى نلتقي)) واتە: ((ڕێگای کەناری دەریا بگرن هەتاوەکو پێیان دەگەین)) ئەوانیش کەناری دەریایان گرتەبەر، کاتێك گەڕانەوە هەموویان جل وبەرگی ئیحرامیان لەبەرکرد تەنها ئەبو قەتادە نەبێت)[٤١٩]. ئەبوقەتادە بۆمان دەگێڕێتەوە کە چ شتێك لە ڕێگادا ڕووبەڕووی بۆتەوە دەفەرموێت: (... ڕووەو موشریکەکان ڕۆیشتین هاوەڵەکانم چاویان کەوت بەکەرە کێویەك هەندێکیان بە پێکەنینەوە بۆ یەکتریان دەڕوانی، منیش سەیرم کرد ئەوەتام لەبەردەم کەرە کێویەکەدا هەر بۆ ئەو مەبەستە ئەسپەکەم زین کرد و ڕمەکەم گرت بە دەستمەوە وپاشان سواری ئەسپەکەم بووم وقامچیەکەم لەدەست کەوتە خوارەوە، بە هاوەڵەکانم فەرموو کەجلی ئیحرامیان لەبەردابوو قامچیەکەم بدەنەوە دەستم؟ فەرموویان: وەڵڵاهی بەهۆی ئیحرام بەستنەکەمانەوە ناتوانین بەهیچ جۆرێك هاوکاریت بکەین، من خۆم دابەزیم وهەڵمگرتەوە و پاشان سەرکەوتمەوە سەرپشتی ئەسپەکەم و توانیم بە کەرەکێویەکە بگەم لەپشت تەپۆڵکەیەك وبەڕمەکەم لە دواوە پێکام و هێنامەوە خزمەت هاوەڵەکانم، هەندێکیان فەرموویان: بابیخۆین، هەندێکی تریان فەرموویان مەیخۆن دواتر داوای یارمەتیم لێ کردن ڕازی نەبوون یارمەتیم بدەن ئێمەش هەندێکیمان خواردمان ئەوەی مایەوە هەڵمان گرت لە گۆشتەکەی، مەترسی ئەوەمان هەبوو دوژمن ڕێگری بکات وبچنە سەرەوە بۆمان بۆیە من ڕۆیشتم تاکو بەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بگەم لەڕێگا هەندێك جار بە ئەسپەکەم غارم دەکرد وە هەندێك جاریش بەهێواشی دەڕۆیشتم تا گەیشتم بەپیاوێکی هۆزی غیفار لە تاریکی شەودا پێم وت: لەکوێ بە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتی؟ فەرمووی من کەجێم هێشت لە ناوای (تعهن) بوو، دەفەرموێت منیش لە (سوقیا) دابەزیم لەخزمەتی لەکاتی خەوی (قەیلولە)دا (کە ١٨٠کم لە شاری مەدینەوە دوورە) ڕۆیشتم تاکو گەیشتمە خزمەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو هاوەڵانەت کە ناردبووتن سەلامت لێ دەکەن ئەوان مەترسی ئەوەیان هەیە دوژمن بۆسەیان بۆدانێت و ڕێیان لێ بگرن وە لە نێوەیان دابڕن ئەگەر

---

[٤١٨] أخرجه: الحافظ في (فتح الباري) (٤/٢٣).

[٤١٩] أخرجه: مسلم (الصحيح) (١١٩٣).

چاوەڕیان بکەن تادەگەنە خزمەتان ئەویش چاوەڕی کردن، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە کەرەکێویەکمان ڕاوکردوە هەندێکشمان لە گۆشتەکەی پێماوە پاشان هاوەڵان هاتنەوە خزمەتی و ڕوداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((امنکم أحد أمره أن یحمل علیها أو أشار الیها (أي: اعان علیها)))؟ واتە: (ئایا هیچ کەسێك لە خۆتان فەرمانی ئەوەی پێکردن کەراوی بکەن ویاخود ئاماژەی پێبکات ویان یارمەتیتان بدات)؟ فەرموویان نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((کلوا ما بقي من لحمها [هو حلال] [انما هي طُعمة أطعمکموها الله] [هل معکم من لحمه شيء]))؟ واتە: (ئەوەی ماوە لەگۆشتەکەی بیخۆن حلاڵە بۆتان ئەوە خواردنێکە خوای گەورە بۆی ناردون و دەرخواردی داون). (ئایە هیچ شتێکتان لە گۆشتەکەی لا نەماوە؟) فەرموویان: قاچەکەی دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ وەریگرت و خواردی) و بە خەڵکەکەی فەرموو: (بخۆن) لەکاتێکدا لەئیحرامدا بوون)[٤٢٠]. کاتێك قوڕەیش بەهاتنی پێغەمبەریان زانی بۆ عمرە بۆ شاری مککە کەوتنە کۆبونەوەو مشتومڕ لەسەری لە (دارالندوة) ئەوە بوو دەرچوونی گشتیان ڕاگەیاند بۆ جەنگ وە پارەو سامانی تایبەتیان بۆ تەرخان کرد وە کەوتنە داوای هاوکاری وپشتیوانی لە هاوپەیمانەکانیان لەوانە (ئەحابیش) وە توانیان هێزێکی بەهێز لەئەسپ سوارەکان پێك بهێنن بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلیدی مەخزومی وەناردیانن بۆ دەرەوەی شاری مەککە بۆ سەر ڕێگای سەرەکی لە ناوچەی (کەڕاع غەمیم).

لەولاشەوە چاوساغی پێغەمبەری خوا بوسری کوڕی سوفیانی خوزاعی ؓ ڕۆیشت تا چووە ناو شاری مککەو دەنگ وباسی قورەیشی بە تەواوی وەرگرت وچووە بنجو بناوانیان پاشان گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەو بارەیەوە میسورەی کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی کوڕی حەکەمەوە ؓ دەفەرموون: (..... پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشیت هەتا گەیشتە (غەدیری ئەشطاط)ی نزیك عوسفان کە شوێنێکە (٨٠)کم لەشاری مککەوە دوورە لەوێدا چاوساغە خوزاعیەکە بوسری کوڕی سوفیان ؓ هاتەوە خزمەتی و فەرمووی: (ئەی

[٤٢٠] أخرجه: مالك (٣٥٣/١)، واحمد (٣٧/٤)، والبخاري (١٨٢٣)، ومسلم (١١٩٣)، والترمذي (٨٤٩)، والنسائي (١٨٤/٥)، وابن ماجة (٣٠٩٠)، الدارمي (١٧٧٠)، بالبيهقي (١٩١/٥).

پێغەمبەری خوا ﷺ قورەیش بەهاتنی تۆیان زانیوە بەرەو مککە و هەموویان دەرچوون بۆتان بەهەرچی پیاو ژن ومندالیشیان لەگەڵدایە جلو بەرگی پڵنگیان پۆشیوە و بەتەواوی خۆیان بۆ جەنگ ئامادەکردوە، وەمنیش کە بەجێم هێشتن خزم وکەسەکانت لەبەرەی کەعبی کوڕی لوئەی وعامیری کوڕی لوئەی (واتە: قوڕەیش بە هەموو تیرەو بەرە بابەکانی) لەگەڵ ئەحابیشەکانیان بۆ کۆ کردبوویتەوە (واتە: هەموو هاوپەیمانەکان لەتیرەو هۆزەکانی دەوروبەری مەککە) وەلەشکرو سوپایەکی توکمەیان پێك هێناوە بۆت دەیانەوێت جەنگ وهەرات لەگەڵدا بەرپابکەن و ڕێگریت لێبکەن لەچوونە زیارەتی ماڵی خودا ئەوان لەناوچەی (ذي طوى) دابەزیون وپەیمانیان داوە بەشەڕو کوشتار نەبێت بەهیچ جۆرێك ڕێگەت پێ نەدەن بچیتە ناو مککەوە، لەو لاشەوە خالیدی کوڕی وەلیدیان پێشڕەوی پێ کردووە و ناردویانە لە پێش خۆیانەوە بۆ (کوراع غەمیم) دەفەرمویت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((يا ويح قريش لقد اكلتهم الحرب، ماذا عليهم لو خلّوا بيني وبين سائر العرب، فان هم أصابوني كان ذلك الذي أرادوا، وان أظهرني الله عليهم دخلوا في الاسلام وافرين، وان لم يفعلوا قاتلوا وبهم قوةٌ، فما تظن قريش فوالله لا أزال أجاهد على الذي بعثني الله به حتى يُظهره الله أو تنفرد هذه السالفة (اي: صفحة العنق))[٤٢١]. واتە: (هاوار بۆ قوڕەیش جەنگ و کوشتار لەبنی هێنان، چ دەبێت بۆسەر ئەوان گەر دەست هەڵگرن و وازم لێ بێنن لە نێوانی خۆم و سەرجەم عەرەبەکانی تر یەکلای بکەمەوە، گەر ئەوان بەسەر مندا زاڵبوون ئەوە ناواتیان ئێتەدی ئەوانیش ئەوەیان دەوێت، وە ئەگەر خودای گەورەش یارمەتی دام و منی سەرکەوتوو کرد بەسەریاندا ئەوکات خۆیان سەرپشکن و زۆریان لێ ناکرێت بۆ موسوڵمان بوون، وە ئەگەر کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون ئەوکات دەجەنگێن و توانا و هێزیان تیا دەبێت، ئەوە قوریش چۆن دەڕوانێتە بارودۆخەکە وەڵڵاهی بەردەوام دەبم لەتێکۆشان لەسەر ئەوەی خودا منی لەپێناویدا ناردوە سەرەنجام یانەوەتا خودا سەرم دەخات یالەو پێناوەدا سەرم دادەنێم (واتە سەرم لەلاشە جیادەکەنەوە).

---

[٤٢١] أخرجه: ابن هشام (٣/٢٦٤) رقم (٨١٣) وقال محققه: اسناده حسن، واحمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن.

پاشان پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((اشیروا عليّ أيها الناس اترون ان نميل الى ذراري هؤلاء الذين اعانوهم [يريدون ان يصدونا عن البيت] فنصيبهم فان قعدوا، قعدوا موتورين محروبين [وان نجوا نجوا محزونين] [وان يأتونا] يكونوا عنقاً [من المشركين] قطعها الله، أم ترون ان نؤم البيت، فمن صدّنا عنه قاتلناه))؟ واتە: ((ئەی خەڵکینە ڕاوێژم بۆ بکەن یا گونجاوتر بڕوانن بۆ چونەکانتان بم دەڵێن چی ئایە هەڵ کوتینە سەر ماڵو حاڵی ئەوانەی هاوکاری و پشتیوانیان دەکەن لەدوژمان و (ڕێگریمان دەکەن لەسەردانی کردنی ماڵی خودا) و پەلاماریان بدەین ئەوکات دەستە ئەژنۆ لێی دادەنیشن وەك سەربازی گەڕیدەی بێ ماڵ و حاڵ (وە گەر ڕزگاریشیان بێت ئەوە ژیانێکی کولە مەرگ و پڕ خەفەت دەبەنەسەر) (وە ئەگەر بێنە ڕێگەشمان بۆ شەڕکردن) ئەوە کۆمەڵە بێ بڕوایەك دەبن کەخودا لە ناوی بردون، وە یاخود دەتانەوێت بەرە و ماڵی خودا بکەوینە ڕێ و هەرکەسێك هاتە سەرڕێگەمان و ڕێگری کردین دەجەنگین لەگەڵیاندا؟)) ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە بۆ عەمرەکردن هاتووین نە هاتووین بۆ جەنگ کردن لەگەڵ هیچ کەسێك بەڵام هەر کەسێك (بووە بەربەست لە ڕێگەی چوونە کەعبەمان وە (کەوتە نێوان ئێمەو کەعبەوە) ئەوکات جەنگی لەگەڵ بەرپا دەکەین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کەواتە ئێستا شادمان و ئاسودەبین و پشتی لێ بکەینەوە)) لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((کەواتە بە ناوی خودا و لەسەر بەرەکەتی ئەو بڕۆن))[٤٢٢].

لەولاشەوە کاتێك قورەیش گوێ بیستی دەرچوون و هاتنی پێغەمبەر ﷺ بوون کۆبونەوەیەکی ڕاوێژکاریان بەست وتیایدا بڕیاریان دا بە هەموو جۆرێك ڕێگری بکەن لەهاتنە ناوەوەی موسوڵمانان بو زیارەتی کەعبە وماڵی خودا، لەدوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پاراست ودورەپەرێزی گرت لە ڕووبە ڕووبوونەوەی ئەحابیشەکان پیاوێکی بەنی کەعب هەواڵی هێنا کە قورەیش لەناوچەی (ذي طوى) بۆی دابەزیون دووسەد ئەسپ سواریان بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید لە ناوچەی (کەراع عەمیم) داناوە

---

[٤٢٢] أخرجه: احمد (١٨٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح، وعبدالرزاق (٩٧٢٠)، والبخاري (٢٧٣١، ٥٢٨٨، ٤١٧٩)، وابي داود (٤٦٢٩)، الطبراني (الكبير) (٩/٢٠).

ناوچەیەکە (٨میل) لە عوسفانەوە دوورە) لەسەر ڕێگای سەرەکی، موسوڵمانەکان نزیک بوونەوە لە (کەراع عەمیم) خالید هەوڵیدا بەگژ موسوڵمانەکاندا بچێت و لەناکاو لەکاتی نوێژدا بدا بەسەریاندا موسوڵمانەکانیش نوێژی ترسیان لەناوچەی عوسفان کرد.لە ابو عیاشی زوریقی ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بووین لە عوسفان موشریکەکانیش بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید بوو (ئەوان) کەوتبوونە نیوان ئێمە و ڕووگەوە، نوێژی نیوەڕۆمان کرد، موشریکەکان وتیان: بەڕاست باشترین دەرفەتمان لەکیس چوو بێ ئاگابوون ئەگەر بمان دایە بەسەریاندا لە کاتی نوێژکردنەکەیاندا وەدەستێکی باشمان لێ دەوەشاندن وپاشان وتیان: بۆ نوێژی عەسر ئیستا کاتی نوێژێک دێت کە خۆشەویست ترەلایان لە خۆیان ولە ماڵ و منداڵەکانیان، جیبریل ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکانی نوێژی ترسی دابەزاند ﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ (النساء: ١٠٢) واتە: ﴿ کاتێ لەناوهاوەڵانتدا بوویت ئەی پێغەمبەرﷺ واتە: لەسەفەردا، ئینجا ویستت نوێژی بەکۆمەڵیان بۆبکەیت و، کاتی ڕووبەڕووبوونەوەش بوو لەگەڵ کافراندا با دەستەیەکیان لەگەڵت هەڵسن ونوێژ دابەستن، ئەوانی تریشیان لەڕووی دوژمن ڕابوەستن، واتە: ئەگەر دوژمن لەنێوان ئێوەو قیبلەدابوو، هاوەڵەکانت بکە بەدوو دەستەوە ودەبێ هەموو -نوێژخوێن و پاسەوان- چەکەکانیان بەدەستەوە بگرن جا کاتێ ئەم دەستە کە لەگەڵ تۆ سوژدە دەبەن، بە پەلە بچن لەدوای ئێوەوە ڕابوەستن و پارێزگاریتان بکەن، واتە: دەستەی یەکەم ڕکاتێك لە نوێژەکەیان لەگەڵ تۆ دەکەن، ئەوسا بەپەلە جیا دەبنەوەو بۆخۆیان و ئەوی تری تەواودەکەن ودەبنە پاسەوان ودەبێ ئەو دەستەکەی تر کەهەمان نوێژیان نەکردووەو پاسەوانن بێنە پێش و لەگەڵ تۆدا نوێژ بەجەماعەت بکەن ودەبێ وریایی خۆیان وەرگرن و چەکەکانیشیان بەدەستەوە بگرن و بێ باوەڕەکان پێیان خۆشە کە ئێوە بەهۆی نوێژەکەتانەوە- لەچەك و کەلوپەلەکانتان غافڵ و بێ ئاگا بن ئەوسا ئەوانیش بەیەك دەست

پەلامارتان بدەن و هێرش بێننە سەرتان، کەوابوو نابێ هەموو بەیەکجار پێکەوە نوێژ بکەن، بەڵکو دەبێ دەستەیەک بەچەکەوە پاسەوانتان بن هەتا لێدەبنەوە وە ئەگەر نارەحەتیی و ئازارێکتان هەبوو وەکو باران، یان نەخۆش وبریندار بن، ئەوە لەوکاتانەدا هیچ گوناهتان لەسەر نییە چەکەکانتان دانێن لەکاتی نوێژەکاندا و هەردەبێ هۆشیاریی و وریایی خۆتان وەرگرن، واتە: تا ئەتوانن ئامادە باش بن بۆ دوژمن و خۆتان بپارێزن لێیان دیارە کەخوا بۆ بێ باوەڕەکان سزایەکی ئابڕووبەرەو ریسواکەری ئامادە کردووە. بەڵێ خوای گەورەو دلۆڤان لەبەر باران و هەرشتێکی تری دژوار مۆڵەتی موسوڵمانان دەدا چەکەکانیان لەشان داگرن، بەڵام لەوکاتەشدا هەردەبێ هوشیارو وریابن، کەوابوو ئەگەر موسوڵمانان هەمیشە ئامادەباش بن بۆجیهاد خوای بە دەسەڵات کافران دەشکێنێ و ریسوایان دەکات﴾. لەنێوان

**نیوەڕۆ و عەسردا، کاتی نوێژیان بۆ ڕەخسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن کە چەکەکانیان بگرن بەدەستەوە و لەئامادە باشیدابن ئینجا لەدوای خۆیەوە بە دوو ریز ڕێکیخستن پاشان چووە ڕکوعەوە هەموویان ڕکوعیان برد ئینجا سەری بەرز کردەوە لەڕکوع ئەوانیش تێکڕا سەریان بەرزکردەوە پاشان پێغەمبەر ﷺ کڕنوشی برد و تەنها ڕیزی یەکەم کڕنوشیان برد لەگەڵی کە ڕاستەوخۆ دەکەوتنە پشتی ئیمامەوە وە ئەوانی تریش بەپێوە وەستابوون پاسەوانیان دەکردن، کاتێ کڕنوشیان بردو هەستانەوە ئەوانی تر کە بەپێوە وەستابوون دانیشتن وکڕنوشیان برد لەشوێنی ئەوان، وە ئەوانی تریش هاتنە ڕیزەکەی ئەوان دواجار هەموویان تێکڕا ڕکوعیان برد پاشان پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوەو ئەوانیش بەهەمان شێوە پاشان پێغەمبەر ﷺ کڕنوشی برد لەگەڵ ئەو ڕیزەی دوای خۆیەوە کڕنوشی برد و ڕیزەکەی تریش بەپێوە وەستابوون وپاسەوانیان دەکردن، کاتێک ئەوان دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیات ئەوانی تریش دانیشتن وکڕنوشیان برد پاشان سەلامیان دایەوە و ئینجا بڵاوەیان لێکرد پێغەمبەری خوا ﷺ دووجار نوێژی ترسی ئەنجامداوە جارێکیان لەم شوێنە (عوسفان) جارێکی تریش لە خاکی (بەنی سلیم)[٤٢٣].**

---

(٤٢٣) اخرجه: احمد (٤/٦٠)، ابن ابي شيبة (المصنف) (٢/٤٦٥)، الطبراني (الكبير) (٥١٣٢)، ابي داود (١٢٣٦)، الترمذي (٣٠٣٥)، النسائي (٣/١٧٦)، والحاكم (٣/٣٠، ١/٣٣٧) وصححه ووافقه الذهبي، الطيالسي (١٣٤٧)، والدارقطني (٣/٦٠) وقال محققه: اسناده صحيح، البيهقي (٣/٢٥٦) وقال: اسناده صحيح، وقال الحافظ (الاصابة) (٨٢٥): سنده جيد، وابن حبان (٢٨٧٦) وقال محققه:

# گۆڕینی ڕێگا

خالید پاشەکشەی کرد بۆ ناوچەی (عەمیم) وە خۆی ونەسپ سوارەکانی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی موسوڵمانەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە هەوڵ و کۆشش بۆ ئەوەی دووچاری ڕوو بە ڕوو بونەوە وتێك هەڵچون نەبن لەگەڵ خالیدا وخوێن نەڕێژێت بۆ ئەو مەبەستە ڕێگاکەی گۆڕی و ڕێگایەکی لەلای ڕاستەوە گرتەبەر.

مەیسەرە و مەروان ﷺ دەفەرموون: (موسوڵمانەکان ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەروبەندی ڕێگا سەرەکیەکەی بەرەو مەککە دەڕوات لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەوە خالیدی کوڕی وەلید بەخۆی کۆمەڵێك سواری قورەیش پێشڕەویان کردوە بەرەو ناوچەی (عەمیم) بۆ ڕووبەڕوو بونەوەمان ئێوەش لای ڕاستی ئەم ڕێگایە بگرنە بەرو لەم ڕێگەیە لانەدەن)[٤٤٤].

بەو شێوەیە موسوڵمانەکان لەڕێ ڕۆیشتنیان بەردەوام بوون پێغەمبەر ﷺ ویستی ڕێگاکە بگۆڕێت وە خۆی لادات لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دەست ویەخەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەسپ سوارەکانی قورەیش و بەڕێگایەکی لاڕێ وبەردەڵان و سەختدا بچێتە ناو شاری مەککەوە، لە مەیسەرەو مەروانەوە ﷺ دەفەرموون: (... پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من رجلٌ يخرج بنا على طريق غير طريقهم التي هم بها)) [وقال: ((ان عيون المشركين الان على ضجنان فايكم يعرف ذات الحنظل))؟ واتە: (چ کەسێك دەتوانێت بەڕێگایەکی تریمان بات جیا لەو ڕێگایەی ئەوان هاتونەتە سەری) (وە فەرمووی: (ئێستا سیخورەکانی موشریکەکان لەسەر چیای (ضبحنا)ن چ کەسێك لە ئێوە ڕێگەی (ذات الحنضل) دەزانێت وشارەزایە؟) پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم کە ناوی (جوندبی کوڕی ناجیە) بوو فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەزانم ئینجا بەڕێگایەکی سەخت و بەردەڵانی ناو دۆڵو شیوانی بردن پێغەمبەری خودا ﷺ لەو ڕێ ڕۆیشتنەیدا ئێوارەی بەسەر هات و فەرمووی: ((هل من رجل ينزل فيسعى بين يدي

---

اسناده صحيح، وقال ابن كثير (التفسير) (٢/١٥٤): اسناده صحيح، صححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٣١)، (صحيح ابي داود) (١٠٩٦).

[٤٤٤] اخرجه: البخاري (٢٧٣٢) واحمد (١٨٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

الركاب؟)) واتە: ((ئایا پیاوێك هەیە خێرا لە پێشمانەوە گوزەر بكات؟)) پیاوێك وتی: من ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئینجا ئەو پیاوە ڕۆیشت لە پێشەوە و بەردەڵانی ئەو شوێنە بەم لاولایدا دەیخست و درەختە دڕکاویەکانیش لە جلە وبەرگەکەی دەگیرا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((سواربە)) ئینجا یەکێکی تر دابەزی ئەویش بەردەڵانەکە دەیخست بەم لاولادا و درەختە دڕکاویەکانی ئەو جێگەیەش لە جل وبەرگەکەی دەگیرا، پێغەمبەر ﷺ بەویشی فەرموو: ((سواربە)) ئینجا کەوتینە سەر ڕێگاکە، کاتێك ڕێگاکەیان بڕی و دەرچوون بێیدا موسوڵمانەکان زۆر ناڕەحەت بوون وماندوی کردن لە کۆتای دۆڵەکەدا گەیشتن بەخاکێکی خۆشڕەو بێگرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەڵکەکەی فەرموو: (بڵێن: نستغفر الله ونتوب الیە) واتە: داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەین و تەوبە و پەشیمانی دەردەبڕین لە تاوانەکانمان لەلای ئەو. ئەوانیش ئەوەیان فەرموو، ئینجا فەرمووی: ((والله انها للحِطة (اي: الفضیلة) التي عُرِضت على بني اسرائیل فلم یقولوها)). واتە: (وەڵلاهی ئەوە ئەو گەورەیی و بخششی خودایە بوو کە بە بەنی ئیسرائیل وتراو ئەوان نەیان وت). ئیبن شەهاب دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەخەڵکەکە کرد و فەرمووی: (لای ڕاستی ڕێگا کە بگرنە بەر) لە پشتی (حمص) وە (کە ناوی شوێنێکە) لە ڕێگای دەرچوونیان لەسەرووی (ثینة مرار) وە لەجێکەوتەی حودیبیە لە خوارووی مەککە (لەلای تەپۆلکەی مرارەوە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من یصعد الثنیة ثنیّة المرار فانه یحط عنه ما حط عن بني اسرائیل)) واتە: ((هەر کەسێك بەقەد پاڵی (ثنیة مرار) دا سەرکەوێت ئەو گوناهی لێ هەڵدەوەرێت هەروەك چۆن لەبەنی ئیسرائیل هەڵوەری وپاك بوونەوە)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((لایجوز احدٌ اللیلة هذه الثنیة الا غفر له)) واتە: (هەر کەسێك ئەمشەو بەو قەدپاڵەدا سەرکەوێت وببیڕێت خودا لێی خۆشدەبێت). یەکەمین کەسانێك کەبەوێدا سەرکەوتن ئەسپ سوارەکانی هۆزی خەزرەج بوون (خەڵکەکە کە فەرموودەکەیان بیست پەلەیان دەکرد بۆ تێپەڕبوون پێیدا دوایین کەس کەتێپەڕی قوتادەی کوڕی نوعمان بوو کە کەوتبووە دوای خەڵکەکەوە) پاشان کەخەڵکەکە تەواو بوون وهەموو تێپەڕبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کلکم مغفورٌ له الاّ صاحب الجمل الأحمر)) واتە: (هەمووتان خودا لێتان خۆشبوو تەنها خاوەنی وشترە سورەکە نەبێت). دەفەرموێت: دواتر ئەو کەسە

هاتەلامان (بینیمان دەشتەکیەکە هاتووە هاوار دەکات بۆ دۆزینەوەی شتێك کە لێی ونبووە) پێیان وت: (وەرە) بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باداوای لێخۆشبونت بۆ بکات؟ وتی وەڵاهی ئەگەر بزربووەکەم بدۆزمەوە چاکترە بەلامەوە لەوەی کە هاوەڵەکەتان داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات)[٤٢٥]. دەفەرموێت: (سوپای موسوڵمانەکان ئەو ڕێگایەیان گرتەبەر کاتێك ئەسپ سوارەکانی قورەیش تەپ و تۆزی سوپای موسوڵمانەکانیان بینی و زانیان لەڕێگای سەرەکی بەرەو مەککە لایانداوە و نایەنەوە سەر ڕێگای ئەوان هەر بەگورجی گەڕانەوە و کەوتنە غارغارین بۆلای قورەیش بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەن. لەولاشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت هەتا ناوچەی (ثینة مرار) و لەوێدا ڕێگای گرتەوەبەر)[٤٢٦]. (کە لەوێدا دەکەوتە خوارەوەی ئەوانەوە، کاتێك لەوێ تێپەڕبوون وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ غەزری وچۆکی دادا و نەڕۆیشت، خەڵکەکە فەرموویان: وشترەکەی پێغەمبەرﷺ چۆکی داداوەو ناڕوات: (واتە: وشترەکە یەخ بووە و غەزریەوە) فەرموویان: (قصواء) یەخ کەوتوە و غەزریوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ما خلأت القصواء وما ذلك لها بخلق ولكن حبسها حابس الفيل [عن مكة])) واتە: ((قصواء) نەغەزریوە و چۆکی دانەداوە بۆ ئەوەی نەڕوات ئەوەش خۆ سروشتی ئەو نی یە بەلآم هەمان بەند و باوی ڕوداوی فیل لە سەردەمی ئەبرەهەدا ئەوی بەند کردووە و لە ڕۆیشتنی خستووە (بەرەو مککە) پاشان فەرمووی: ((والذي نفسي بيده لا يسألوني (اي: قريش) الى خُطةٍ يُعظِّمون فيها حرمات الله الا أعطيتهم إياها)) واتە: ((بەوزاتەی گیانی منی بەدەستە قورەیشیەکان داوای هەر جۆرە ڕێکەوتنێکم لێبکەن کە حەرام کراوەکانی خودای تێدا بەرزو بیرۆز ڕابگیرێت بەدڵنیاییەوە پەسەندی دەکەم و بێیانی دەدەم))، پاشان تێی خوڕی وشترەکەی هەستایەوە و بەگورجی ڕۆیشت لە ڕێگاکەی ئەوان لایان داو ڕۆیشت هەتا لەوپەڕی حودیبیە دابەزین (کە (٢٤کم) دەکەوێتە

---

[٤٢٥] أخرجه: مسلم (كتاب المنافقين) برقم (٢٧٧٩)، والبزار (١٨١٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٧٧): رجاله ثقات. واللفظ للمسلم والزيادة للبزار.

[٤٢٦] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٦٥) برقم: (٨١٤) وقال محققاه: مرسل، والطبري (التأريخ) (٢/٦٢٣).والبزار (١٨١٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٧٧): رجاله ثقات واللفظ لابن هشام والزيادة للبزار.

خوارووی مککەوە) لەسەر ئاوێکی کەمی کۆبووەوەی زستان کە زۆر کەم بوو زۆری
پێنەچوو خەڵکەکە لەبەر شەکەت و ماندو بوون و هێز لەبەر بڕان ئاوەکەیان هەموو
هەڵهێنجا پاشان (سکالآیان بردە) خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەدەست تینوێتی و بێ ئاوی
(جابر ﷺ دەفەرموێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لە حودەیبیە هەزار
وچوار سەد کەس بوین لەوێدا بیرێك هەبوو ئاومان لێ هەڵدەهێنجا تا یەك دڵۆپی تیا نەما
ئینجا ئەو باسەیان گەیاند بە پێغەمبەری خوا ئەویش هات و لەسەر دۆخی بیرەکە دانیشت
پاشان داوای قاپێکی پڕلەئاوی کرد و دەست نوێژی تێداگرت و ئاوی لە دەمی وەرداو تێی
بەسەردا خوێند ودواتر ڕژاندیە ئاویەوە (پاشان تیرێکی لە هەگبەی تیرەکانی دەرهێنا و
فەرمانی پێکردن کە لەناویدا دایبنێن) تیرەکەی دا بە یەکێك لە هاوەڵان کە دابەزێتە ناو
بیرێك لەبیرەکان و لەناویدا بیچەقێنێت)[427]، (ئەوسا فەرمووی: بۆ ماوەیەك وازی
لێبێنن)[428]، ئێمەش ماوەیەکی کەم دەست بەرداری بووین (ئەوەبوو ئاوەکە هەڵقوڵا و
بیرەکەی پڕ کرد و لەسەری دەڕژا) پاشان بەویستی خومان ئاومان لێبەکاردەهێنا بۆ خۆمان
وئاژەڵەکانمان)[429]، (ئاوەکە هەر زیادی کرد) (بەجورێك کە ئاویان بە لەپی دەستیان لێ
دەخوارد ولەسەر ڕۆخی بیرەکە دانیشتبون)[430] بەردەوام (بیرەکە) ئاوی لێ هەڵدەقوڵا و
دەرۆیشت ئاومان لێ دەخوارد لە هەموو ئەو ماوەیەی کە لەوێدا بووین)[431].

---

(٤٢٧) أخرجه: احمد (المسند) (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(٤٢٨) اخراجه: البخاري (٤١٥١).

(٤٢٩) أخرجه: البخاري (٢٧٣١).

(٤٣٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١١٢/٤).

(٤٣١) أخرجه: احمد (٢٩٠/٤)، والبخاري (٤١٥٠)، ومسلم (١٧٢٩)، وابن حبان (٤٨٠١).

# خوزاعە هەڵدەستێت ناو بژیوانی نێوان موسوڵمانان و قورەیش دەکات

بەوشێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەحودەیبیەدا مایەوە و خۆی بەدوورگرت لە تێکرژان و بەگژیەکدا چوون لەگەڵ قورەیش، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ سوربوو لەسەر موسوڵمان بوونیان بەبێ خوێن ڕشتن بۆ ئەوەی بۆ بانگەوازی ئیسلام سودیان لێ ببینێت وپشتیوانی لێ بکەن چونکە ئەوان لە ڕەوان بێژترین خەڵك بوون و زۆر ترین شارزایی و لێهاتویی وتوانایان هەبوو زۆر زیرەك بوون وپایەو مەنزڵیان زۆر بەرز بوو لەچاو خەڵکانی تری عەرەب، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پلەو پایەو گەورەییان دەکات، ئوم هانی کچی ئەبو طالب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((فضّل الله قريشاً بسبع خصال: فضّلهم بانهم عبدوا الله عشر سنين لا يعبده الاّ قريشي، وفضّلهم بانه نصرهم يوم الفيل وهم مشركون، وفضلهم بانه نزلت فيهم سورة من القرآن لم يُدخِل فيهم غيرهم ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ٱلَّذِى..﴾ (قريش: ١)، وفضلهم بان فيهم النبوة، والخلافة، والحجابة، والسقاية)) [٤٣٢] واتە: (خوای گەورە پلە و پایەی قورەیشی بەحەوت تایبەت مەندی دیاری کراو بەرزکردۆتەوە: ڕێزو پایەی پێداون بەوەی بۆ ماوەی دەساڵ خوایان پەرستوە کە هیچ کەس خودای نەپەرستووە تەنها قورەیش نەبێت، مەقامی بەرز کردنەوە بەوەی کە لە ساڵی فیلدا سەری خستوون بەسەر لەشکری ئەبرەهەدا لەکاتێك دا موشریك بوون، وەفەزڵی پێداون بەوەی کە سورەتێکی لە قورئان لەبارەیانەوە ناردۆتە خواری بێجگە لەوان باسی کەسی تریناکات: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ٱلَّذِى..﴾ (قريش: ١) وەبەوە پلەی بەرزی پێداون کە پێغەمبەریەتی بەوان بەخشراوە لەگەڵ خەلافەت وە کلیلی دەرگای کەعبە، وئاوادانی حاجیانی ماڵی خوا هەر بەوان

[٤٣٢] اخرجه: البخاري (التاريخ) (الكبير) (١/٣٤١)، والطبراني (الكبير) (٣٦٨)، والبيهقي (مناقب الشافعي) (١/٣٤) وابن عدي (الكامل) (٥/١) وقال الحافظ العراقي (محجة القرب في محبة العرب) (١/٢٥): اخرجه الطبراني وهوحديث حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٤٢٠٨)، و (الصحيحة) (١٩٤٤).

سپێردراوە). هەر لەبەر ئەم تایبەت مەندیانە پێغەمبەر ﷺ نەرمی دەنواند بەرامبەریان و لێبوردەبوو لەگەڵیاندا. دوای ئەوەی قورەیش بەوەیان زانی کەپێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوەتە حودیبیە، هەموویان تێکرا دەرچوون و سەربازگەیەکیان دروست کرد و لە ئامادە باشی دا بوون لە ناوچەی (بلدح)[٤٣٣]. یەکەمین کەسانێك کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای دابەزینی بەرێزیان لە حودەیبیە شاندێکی نێردراو بوون لە هۆزی خوزاعە کە ئەمانە هاو پەیمان ودۆستی موسوڵمانەکان بوون.

لە مەیسەرەی کوڕی مەخرەمە و مەروانی کۆڕی حەکەمەوە ڕەزای خوایان لێبێت دەفەرموون: (لەکاتێکدا ئەوان هەر لەو بارودۆخەدا بوون کاتێك بەدیلی کوڕی وەرقای خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێك لە هۆزی خوزاعە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوزاعە نهێنی پارێزو دۆستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون لەناو خەڵکی (توهامە)دا وتی: کاتێك من هاتم بەرەی (کەعبی کوڕی لوئی وە عامری کوڕی لوئەی)م بینی (واتە: هەموو بەرەکانی قوڕەیش) لەسەر ئاوەکانی حودەیبیە دابەزیون ولە ئامادە باشی جەنگدان وهەرچی هەرچی و پەرچیش هەیە لەگەڵیاندایە دەیانەوێت شەڕت لەگەڵدا بکەن وە بەهیچ جورێك نەهێڵن بچیتە کەعبەی پیرۆز و ڕێگریت لێ بکەن وە (جل و بەرگی پڵنگیان پۆشیوە و... پەیمانیان بە خواداوە کەبەهیچ جۆرێك و هەرگیز نەهێڵن بەناویاندا بڕۆیتە ناو کەعبەی ماڵی خواوە)[٤٣٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((انا لم نجيء لقتال أحد، ولكنا جئنا معتمرين، فان قريشاً قد نهكتهم الحرب واضرّت بهم فان شاؤوا ماددتهم مُدّةً ويُخلّوا بيني وبين [سائر العرب][فان هم اصابوني كان الذي ارادوا] و ان اظهرنا الله وشاؤوا ان يدخلوا فيما دخل فيه الناس فعلوا [وان لم يفعلوا قاتلوا وبهم قوة] وقد جمّوا، وان هم أبوا فو الذي نفسي بيده لأقاتلنّهم على أمري هذا حتى تنفرد سالفتي أو لينفذنّ الله أمره)).واتە: ((ئێمە نەهاتوین بۆ جەنگ و کوشتارکردنی کەس، بەڵکو هاتووین بۆ ئەنجامدانی عەمرە، قوڕەیش جەنگ وهەرا لەبنی هێناون

---

[٤٣٣] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢/٢١٩)، وقال ابرهيم (العلي (السيرة الصحيحة) (٤٣٨): اسناده ضعيف.

[٤٣٤] أخرجه: احمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٨١٣): اسناده حسن.

ودوچاری زەرەرو زیانی زۆری کردون ئەگەر حەز بکەن وادەیەکیان بۆ دادەنێم کە تێیدا گفتوگۆ بکەن باواز بهێنین لە نێوان من و (سەرجەم خێلە عەرەبەکانی تر) تا من بەکلادەبمەوە ئەگەر ئەوان دەستیان لێ وەشاندین وزاڵ بوون بەسەرماندا ئەوا ئاواتیان دێتە دی و ئەوانیش ئەوەیان دەوێت) وەئەگەر خودای گەورە دەستی داین و سەریخستین بەسەریاندا ئەوکات ئەوان سەرپشکن و بە ویستی خۆیانە وەك ئەو خەلکە بێنە ناو ئیسلامەوە گەرواش ناکەن ئەو کات ئەوان بەپشوی خۆیان دەتوان بجەنگن لەگەلمان و هێز و وزەیەکیان دەمێنێت وە گەر ئەوان شەڕیان کرد وکۆلیان نەدا و ڕەتیان کردەوە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە شەڕیان لە گەلدا دەکەم لەسەر ئەم ئاینەی کە بۆم هاتووە هەتا خودا سەری دەخات یاخود لەپێناویدا سەری خۆم دادەنیم).

بودیلی کوڕی وەرقاء وتی: ئەم فەرمایشتەی بەڕێزت بەزووترین کات دەگەیەنم بە قورەیش، لەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای قورەیش و وتی: من لەلای ئەو پیاوە هاتوم بۆ لاتان (مەبەستی پێغەمبەر بوو ﷺ گوێم لێ گرتووە و چەند فەرمایشتێکی فەرمووە، ئەگەر حەز بکەن بۆتانی باس دەکەم، دەم ڕووت و نەفامەکانیان وتیان: پێوستمان بەدەنگوباس وقسەی ئەوان نیە بە هیچ شێوەیەك، دونیا دیدەو پیاو ماقولەکانیان وتیان: پێمان بلێ ئەوەی کە گوێ بیستی بووی، وتی: گوێم لێ بوو ئاوا و ئاوای دەفەرموو هەموو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموو بووی پێ ڕاگەیاندن [ وتی: ئەی گرۆی قورەیش، ئێوە پەلەپەل دەکەن و بێ پاساو یەخەی محمد دەگرن، بەدلنیایەوە محمد بۆ جەنگ و کوشتار نەهاتووە، بەلکو هاتووە زیارەت و سەردانی ئەو کەعبەیە بکات، لەوەلام دا قسەی ناڕێك و نەخوازراویان پێ وت: (واتە: بەجۆرێك وەلامیان دایەوە کە پێی ناخۆش بوو) وتیان: وە ئەگەر تەنها بۆ ئەوەش هاتبێت و نەیەوێت شەڕیش بکات، وەلاهی هەرگیز نابێت بەزۆرەملێ بچێتە ناو کەعبەوە بەجۆرێك خێلە عەرەبەکانی تر لەسەر ئەمە قسمان پێ بلێن و سەرکۆنەمان بکەن و بەلاوازی دەرکەوین][٤٣٥] بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ ئەو هەلوێستە ڕامیاریەی قۆستەوە و ناوبانگێکی بەرزو درەوشاوەی تۆمار کرد بۆ خۆی

[٤٣٥] أخرجه: البخاري (٢٧٣٢)،وأحمد (١٨٩٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن هشام (٨١٣) وقال محققه اسنادة حسن، واللفظ للبخاري والزيادة لأحمد.

و ڕێزو پایە پیرۆزەکانی پاراست ودەست پێشخەریەکی شایستەی کرد بۆ ئاشتی و نەمانی جەنگ و کوشتار لەنێوان قورەیش و موسوڵمانەکاندا.

## بارو دۆخی موسوڵمانەکان

قورەیش لەو ساتە وەختەدا هەستان بەبێزار کردن و وروژاندنی دۆخەکە لە موسوڵمانەکان لە ئەنجامدا چەندین گردەوەی سەربازی و هێرشی ڕاگەیاندن و شەرە قسەیان دژ بە موسوڵمانان ئەنجامدا، لەو لاشەوە موسوڵمانەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە حودیبیەدا دەمانەوە لەپۆشاکی ئیحرامدا بێ ئەوەی سەریان بتاشن ونینۆکیان بکەن و دەست بۆ بۆنی خۆش بەرن تا خۆیانی پێ بۆن خۆش بکەن وە قژی سەریان ئاڵۆسکا بوو جەستە و لاشەیان چڵکن ببوو وەهەندێکیان سەرو قژیان پڕبوو لە ئەسپێ. لە کەعبی کوڕی عەجرەوە ﷺ دەفەرموێت: [((ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودادا بووین ﷺ لە حودەیبیە لە ئیحرامدا بووین، وە موشریکەکانیش گەمارۆیان دابووین وەمنیش قژێکی زۆرم هەبوو کێچ و ئەسپێی تێدابوو بەسەر دەمو چاومدا بەردەبونەوە خوارێ پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی [بەلامدا] تێپەڕی فەرمووی: ((ڕشك و ئەسپێکانی سەرت ئازارت دەدەن؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەدا (ئەم ئایەتە دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ (البقرة: ١٩٦). واتە: ﴿هەربۆ خوا حەج وعومرە بەچاکی وبەتەواوی ئەنجام بدەن، واتە ئەگەر نیازی هەریەك لەوانەتان کرد، دەبێ زۆر بەرێك وپێکی جێبەجێیان بکەن وتەنها نیەتی خوایان لێ بێنن ئینجا ئەگەر هەر ڕێگەشیان نەدان بچنە حەج، یان عومرە، ئابڵوقەی دوژمن کران، وەیان نەخۆشیی ڕێی پێ نەدان و نەتانتوانی ئەرکەکانیان تەواو بکەن، ئەوسا چەندە دەتوانن ئاژەڵ بکەنە قوربانیی ولە ئیحرام بچنە دەرێ، وە نابێ سەرتان بتاشن، و ئیحرام بشکێنن هەتا ئاژەڵی قوربانی و هەدیەکانتان

نەگاتە جێگەی دیاریکراوی خۆی، واتە: لەو جێگایەدا کە ڕێتان لێگیراوە، ئەو جێگایە حەرەم بێت، یان دەرەوەی حەرەم دەبێ ئێوەیش هەر لەوێ قوربانیەکانتان سەر ببڕن ئینجا هەرکەسێکتان نەخۆش و لەش بەبار بوو وە یان برین و ئازارێکی لەسەردا بوو ناچار بوو سەری بتاشێ ئەبێ بەکێ لەم کەفارەت وبریتیانە بدات، واتە: ئەگەر کەسێ پێش ئەوە قوربانییەکەی بگاتە جێگەی خۆی، ویستی سەری بتاشێ، ئەبی سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، وە یان سەدەقەو خێرێك بکات (کە خۆراکی شەش هەژارە)، وەیان مەڕێك یان بزنێك بکاتەخێر هەر لەوێدا ئینجا هەرکاتێ ترستان لە دوژمن نەما، وەیان لە نەخۆشی ناسووودە دڵنیا بوونەوە، ئەوجا هەر کەسێك لە سەرەتاوە ئیحرامی بەعەمرە بەست و ئەرك وئەرکانەکانی بەجێ هێناو، پاشان ویستی بەهرە ببا لە عومرە و تەمەتوع بکا هەتا کاتی ئیحرام بە حەج بەستن، ئینجا ئیحرامی بە حەج بەستەوە چ حەیوانێکی لە دەست دێ دەبێ بیکاتە قوربانی ئەوجا هەر کەسێك بۆی نەکراو دەستی نەڕۆیشت دەبێ لەباتی ئەوە -بەرلەرۆژی عەرەفە-سێ ڕۆژان لە ڕۆژەکانی حەج، بەڕۆژوو بێت وحەوت ڕۆژیش هەرکە گەڕانە ماڵەوە بەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو، دەسا ئێوەش ئەمە بشتگوێ نەخەن ئەو تەمەتوع و ئیحرام بە عومرە بەستنە، ئینجا بە حەج، ئەو کەفارەتەش بۆکەسێکە کە خۆی و ماڵو منداڵی نیشتەجێی(مەککە)و مەسجیدولحەرام نەبن، واتە: خەڵکی دەرەوەی حەرەم بێت، ئەوسا موتعەی بۆهەیە، چونکە خەڵکانی مەککە زۆر بەئاسانی حەج وعومرە دەکەن، بۆیە ئەو ڕووخسەتەیان بۆ نییە. هەرکاتێکیش بەبۆنەی نەخۆشییەوە گەمارۆ دران ونەیانتوانی حەج، یا عومرە تەواو بکەن، هەمیسان بۆیان نییە قوربانی بکەن ولە ئیحرام بێنەدەرێ، بەڵکو هەردەبێ بەهەرجۆرێ بۆیان دەکرێ هەموو پایەکانی حەج وعومرە تەواوبکەن﴾.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((إحلق رأسك ثم اذبح شاة نُسكاً، أو صُم ثلاثة ايام، أو أطعم ثلاثة آصاعٍ من تمر على ستة مساكين)) واتە: ((سەرت بتاشە پاشان مەڕێك سەربڕە و بیکە بەقوربانی، یاخود سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یاسێ هۆقە (بەقد ڕبەیە) خورما ببەخشە

بەشەش هەژان))][٤٣٦][٤٣٧]. موسوڵمانەکان باران باری بەسەریاندا لە کاتێکدا لە حودەیبیە بوون، لە ئوسامەی کوڕی عومەیری هوزەیلیەوە ﵁ دەفەرموێت: [ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین ﷺ لە ساتەوەختی حودەیبیەدا، بارانێك باری بەسەرماندا بنی نەعلەکانمان بەتەواوی تەڕنەبوو، بانگەوازکارێك لەلایەن پێغەمبەری خوداوە ﷺ بانگەوازی کرد: ((هەر کەسێك لە کوێ کەل و پەلەکەی خستوە ولایداوە هەر لەوێ نوێژەکەی بکات))][٤٣٨]. لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو نیعمەتە دیارو بەر چاوەی خستەوە بیرو هۆشی موسوڵمانەکان لەو بارەوە زەیدی کوڕی خالیدی جەهەنی ﵁ دەفەرموێت: ((لەو ڕۆژەی حودەیبیەدا پێغەمبەری خودا ﷺ پێش نوێژی بۆ کردین لە شوێنەواری دوای باران بارینی ئەو شەوە کاتێك لە نوێژەکە بوینەوە فەرمووی: ((ألم تسمعوا ما قال ربكم الليلة؟ قال: ما انعمت على عبادي من نعمةٍ الا اصبح فريق بها كافرون، فاما من حمدني على سُقياي واثنى عليّ [وقال: مطرنا برحمة الله وبرزق الله وبفضل الله ][٤٣٩] فذلك آمن بي وكفر بالكواكب، وامّا من قال: [مُطرنا بنجم كذا] و بنوء كذا وكذا فذاك الذي آمن بالكوكب وكفر [بي]))[٤٤٠] واتە: ((دەتانەوێت بیبستن کە پەروەردگارتان چی فەرمووە

---

[٤٣٦] أخرجه: البخاري (٤١٥٩،١٨١٤) ومسلم (١٢٠١) وابوداود (١٨٥٦) ،والترمذي (٩٥٣) وابن ماجة (٣٠٨٠).

[٤٣٧] اخرجه: احمد (٢٤١/٤)، ومالك (٣٦٥/١)، والبخاري (٢٧٣٢)، ومسلم (١٢٠١)، والنسائي (١٩٤/٥)، والبيهقي (٥٥/٥)، والطيالسي (١٠٦٥)، وابن خزيمة (٢٦٧٨)، وابن حبان (٣٩٧٩).

[٤٣٨] اخرجه: احمد (٧٤/٥)، وعبدالرزاق (١٩٢٤)، والنسائي (١١١/٢)، وابوداود (١٠٥٩)، والحاكم (٢٩٣/١) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٠٧٩) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الحافظ في (الفتح) (٩٤/٢): صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٧٦٤)، (الارواء) (٣٤٢/٢).

[٤٣٩] أخرجه: البخاري (٤١٤٧).

[٤٤٠] أخرجه: احمد (١١٧/٤)، والبخاري (٨٤٦)، ومسلم (٧١)، وابوداود (٣٨٨٨)، والنسائي (١٦٤/٣)، وعبدالرزاق (٢١٠٠٣)، والبيهقي (١٨٨/٢).

لەبارەی بارانەکەی ئەمشەوەوە؟ فەرموویەتی: [هەرنازو نیعمەتێکم بە بەندەکانم بەخشیبێت کۆمەڵێك بەرامبەری هەر ناسوپاسگوزار و سپڵە بوون، ئەوانە کەسوپاس وستایشیان کردم لەسەر ئەو ئاوەی بەهۆی بارانەوە دامبارانده سەریان "وە وتیان: بارانمان بۆ باری بەبەزەیی و گەورەیی خودا و ڕزق و ڕۆزیەکە هەر لەخواوەیە"] ئەوانە باوەڕیان بە منە وە نیعمەتەکانیان لەبەر چاوە وباوەڕیان بە ئەستێرەکانی گەردوون نی یە لەبارانی باراندا، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن: "بارانمان بۆ باری بەهۆی فلانە ئەستێرەوە" وە یا بەهۆی فلانە هۆکاری کەشناسی و فیسارە گۆڕانی گەردوونەوە بەبێ گێڕانەوە بۆ هێز و دەسەلاتی خودا ئەوە ئەو کەسانەن باوەڕیان بە هەسارەو ئەستێرەکانە و سپڵە و ناسوپاسگوزارن (بەرامبەر بەمن)]. لەسەرەتادا کە لە حودەیبیە دابەزین پێغەمبەری خودا فەرمانی پێکردین کە لەشەودا ئاگر نەکەینەوە پاشان ڕێگای پێداین، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەفەرموێت: [لەکاتێکدا پێغەمبەر لە حودەیبیە بوو فەرمووی: ((لا توقدوا ناراً بليلٍ)) ((ئاگر مەکەنەوە لەشەودا)) بەڵام لەدوای ئەوەوە فەرمووی: ((أوقدوا واصطنعوا اما انه لا يدرِكُ قومٌ بعدكم صاعكم ولا مُدّكم))[٤٤٩] ((ئێستا ئاگر بکەنەوە و خواردن دروست بکەن بۆ خۆتان ئەوەش بزانن کە لەدوای ئێوە هیچ خەڵکانێك کردەوەکانیان ناگاتە مشت یاخود ڕبەیەکی ئێوە((واتە: هەرگیز پاداشتیان ناگاتە ئێوە))]. لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خواردنیان لەکەم بوونەوەدا بوو، و لەبەر گەرما و گەردەلول و تەپوتۆزی بیاباندا بوون، لەگەڵ ترسی بەردەوامدا بەشەو بەڕۆژ دوژمنەکانیان ژمارەیان یەکجار زۆر بوون وە لەوڵات و خاکی خۆیاندا بوون نزیك بەماڵ و حاڵیان بەڵام موسوڵمانان زیاد لە (٤١٠كم) دوور بوون لەخێزان و نیشتمان و ماڵ و حاڵیان.

---

[٤٤٩] أخرجه: احمد (٣/٢٦)، (١١٢٠٨) وقال محققه: اسناده حسن،وابن ابي شيبة (٣٨٠٠٨) والنسائي (الكبرى) (٨٨٥٤)، وابويعلى (٩٨٤) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٣/٣٦) وصححه ووافقه الذهبي،وحسن اسناده الحافظ في (الفتح) (٧/٥٦٢).

# ناردنی شاندێکی موسوڵمانەکان بۆلای قورەیش

پێغەمبەری خودا ﷺ وەك دەست پێشخەرییەك بۆ دەرخستنی نیازپاکی خۆی هەستا بەناردنی شاندێکی خۆی بۆلای قورەیشییەکان تا دڵنیایان بکاتەوە کە ئەو بۆ جەنگ نەهاتووە بەڵکو هاتوو بۆ زیارەت و عەمرەکردن و بەگەورە ڕاگرتنی پیرۆزیەکانی مەککە لەو بارەوە مەیسەرەی کوڕی مەخرەمەو مەڕوانی کوڕی حەکەم (رضي الله عنهما) دەفەرموون: ((پێغەمبەری خودا ﷺ خیراشی کوڕی ئومیەی خوزاعی نارد بۆ مەککە، لەسەر پشتی وشترەکەی خۆی کە ناوی (ثەعلب) بوو بۆ ئەوەی لەرپیش سپی و پیاو ماقوڵەکانیان بگەیەنێت کە مەبەست لە هاتنەکەی چی یە، کاتێك چووە ناو شاری مەککەوە وشترەکەی پێغەمبەریان سەر بڕی کە پێی هاتبوو ویستیان خۆشی بکوژن ئەحابیشەکان نەیان هێشت و ئازادیان کرد و ناردیانەوە ئەویش هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، دوای ئەو بانگی عومەری کرد ﷺ بۆ ئەوەی بینرێت بۆ مەککە پەیامی ئەو بگەیەنێت بەخانەدان و پیاو ماقولانی مەککە کە ئەو بۆ چی هاتوو، عومەر ﷺ فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من مەترسی ئەوەم هەیە لە قورەیش کە لەگەڵیان ڕێك نەکەوم وەهیچ کەسی واشك نابەم لە خزمەکانی خۆم لەبەنی عەدی کوڕی کەعب بمپارێزێت و بەرگریم لێ بکات لە ناویانا بەدڵنیایەوە قورەیش باش دەزانن دوژمنایەتی و توندتیژی ورق لێبوونەوەی من بەرامبەریان چۆنە، بەلام من کەسێکی ترت پیشان دەدەم کەخزم وکەسی زۆرترە لەناویانا و بەرگری لێ دەکەن ئەویش (عوثمانی کوڕی عەفان)ە.

ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی عوثمانی کردووە ناردی بۆ لای ئەبو سوفیان و پیاو ماقولانی تری قورەیش تا پێیان ڕاگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگی هیچ کەسێك نەهاتوو، بەڵکو ئەو هاتووە بۆ زیارەت و سەردانی کەعبە وبەرز ڕاگرتنی پیرۆزیەکانی ماڵی خوا [وەپێی فەموو: ((أخبرهم انا لم نات لقتال، وانما جئنا عُمّاراً وادعهم الى الاسلام)). واتە: ((پێیان ڕاگەیەنە ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕ و کوشتاری هیچ کەس، بەڵکو هاتووین بۆ عەمرەکردن وە بانگێشتیان بکە بۆ ئیسلام)) وەفەرمانی پێکرد کە لە ناو مەککەدا پیاو ژنی موسوڵمان هەن سەردانیان بکات و مزدەیان پێ بدات بە فەتح و سەرکەوتنی خودا ! وەپێیان ڕابگەیەنێت کە بەم نزیکانە خودای گەورە ئاینی خۆی سەردەخات لە مەککەدا

بەجۆرێك هیچ کەسێك باوەڕهێنانی خۆی ناشارێتەوە وداوای دامەزراوی و بشوو درێژیان لێ بکات تا خۆڕاگرتربن، عوثمان ﷺ ڕۆیشت لە ناوچەی (بەلدەح) بەلای قورەیشدا تێپەڕی قورەیشییەکان وتیان: بەرەو کوێ دەڕۆیت؟ فەرمووی: " پێغەمبەری خودا ﷺ ناردومی بۆلای ئێوە کەبانگتان بکەم بۆ گەڕانەوە بۆلای خودای خاوەن دەسەڵات وە بۆ ئەوەی موسوڵمان بن وەپێشتان ڕابگەیەنم کە ئێمەنەهاتووین بۆ شەڕ وکوشتاری هیچ کەسێك بەڵکو هاتووین بۆ عەمەرەکردن، عوثمان ﷺ هەروەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێ کردبوو بانگی کردن ئەوانیش، وتیان: تێگەیشتین لەقسەکانت وە لە نیازوڕازت بڕۆ بەرکەکەت جێبەجێ بکە، ئیبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بەدەمیەوە هات و لەبەری هەستا و زۆر خۆش حاڵبوو وەئەسپەکەی بۆ زین کردوو، عوثمانی سوارکرد لەگەڵ خۆی لەپشتی خۆیەوە داینا هەتاکو گەیشتە مەککە)[٤٤٢].

بەپێی نەریتی ئەو کاتەی خێلایەتی ئیبان بووە پەناگیرو عوثمانی ﷺ پەنادا هەتاکو پەیامەکەی پێغەمبەری خودای ﷺ بگەیەنێت، عوثمان ﷺ هەتاکو گەیشتە لای ئەبو سوفیان و سەرکردەکانی تری قورەیش ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو بوو بەگوێی دادان وپێی وتن، کاتێك لە پەیامەکەی پێغەمبەری خودا بووەوە کە پیایدا ناردبوو ئیبان موشریکەکان پێیان وت: ئەگەر حەز دەکەیت خۆت تەوافی کەعبە بکە ودروشمەکانت ئەنجام بدە. فەرمووی: "من بە تەنها تەواف ناکەم بەڵکو لەخزمەت پێغەمبەری خودادا وە بەهاوڕێیەتی ئەو تەواف دەکەم"[٤٤٣] عوثمان ﷺ ڕۆیشت بۆ پەیوەندی کردن بە ژن و پیاوە موسوڵمانە چەوساوەکانی ناو شاری مەککە بۆ ئەوەی بەسەریان بکاتەوە لە نزیکەوە بیان بینێت و پێی فەرموون: (کە پێغەمبەری خودا مژدەی فەتح و ڕزگارتیان پێ دەدات بەم نزیکانە) ئەوانیش لە خۆشحاڵیان بەو مزگێنی یە فرمێسك لە چاوەکانیان دەهاتە خوارەوە

[٤٤٢] أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٢٧٠٩) وقال محققه: فيه ضعيف، والطبراني (الكبير) (١٤٤/١)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٣/٤).

[٤٤٣] أخرجه: احمد (٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٢٦٩/٣)، والبيهقي (الكبرى) (٢٧/٩)، وابن سعد (٩٦/٢)، وحسن اسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (٤٣٩/٢)، وابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٣٠٨/٢).

و فەرموویان: (سڵاوی ئێمەش بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ بگەیەنە و پێی بڵێ ئەوەی کە بەناوچەی حودەیبیە گەیاند و دایبەزاند دەتوانیت کە بەشاری مەککەشی بگەیەنێت)[٤٤٤].

[لەو لاشەوە موسوڵمانەکان لە حودەیبیە بوون بەر لە گەڕانەوەی عوثمان ﷺ فەرموویان: عوسومان خۆی لە ناو ماندا دەرباز کرد و گەیشتە کەعبە و تەوافی خۆی کرد، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((ما أظنه طاف بالبيت ونحن محصورون)). واتە: ((من وای بۆ دەچم ئەو تەواف نا کات لە کاتێکدا ئێمە گەمارۆدراوین)) فەرموویان: چ شتێك لەو ڕێگری دەکات ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتێکدا ئەو دەرفەتی بۆ ڕەخساوە؟ فەرمووی: ((ذلك ظني به الا يطوف بالكعبة حتى يطوف معنا)) واتە: ((ئەوە گومانی باشی منە بەو کە تەوافی کەعبە ناکات مەگەر لەگەڵ ئێمەدا نەبێت))[٤٤٥].

لەو ماوەیەدا هەندێك لە کۆیلەکان قوڕەیشیان جێ هێشت و هاتنە ناو موسوڵمانەکان وەك پەناهندە، لەعەلیەوە ﷺ دەفەرموێت: [هەندێك لە کۆیلەکان مەککەیان جێ هێشت و هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەساتە وەختی حودیبیەدا بەر لە بەستنی دانوستانەکە، خاوەکانیان نامەیان نوسی بوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتبویان: ئەی محمد وەڵاهی ئەوانە نەهاتوون بۆ خزمەت بەڕێزت لەبەر حەزو خۆشەویستیان بۆ ئاینەکەت بەڵکو ڕایانکردووە بۆ ئەوەی ئازاد بکرێن و ڕزگاریان بێت لەدەست خاوەنەکانیان. خەڵکانێك فەرموویان: ڕاست دەکەن ئەی پێغەمبەری خودا بیان نێرەوە بۆلایان. وە پێغەمبەری خودا ﷺ توڕەبوو (واتە: لەوانەی کە هاتبوون بۆ ئەوەی بیان بە ئەوە): وە فەرمووی: ((ما أراكم تنتهون يا معشر قريش حتى يبعث الله عليكم من يضرب رقابكم على هذا)) واتە: (ئەی گرۆهی قوڕەیش وا دەبینم کەئێوە وازناهێنن و دەست هەڵناگرن لەم کارە هەتا خوای گەورە کەسێکتان دەنێرێتە سەر لەگەردنتان دەدات لەسەر ئەو کارە) پێغەمبەر

---

[٤٤٤] أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢/٦٠١) عن الواقدي وهو متروك وأوردناه للعلم فقط.

[٤٤٥] أخرجه: ابن ابي شية (المصنف) (٣٢٧٠٩) وقال محققه: فيه ضعيف، والطبراني (الكبير) (١/١٤٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤/١٣٣).

ﷺ ڕازی نەبوو کەبیان داتەوە و فەرمووی: ((هم عتقاء الله)). واتە: (ئەوانە ئازادکراوەکانی خودان))[٤٤٦].

# بەیعەتی (رضوان)

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: ((... دواتر موشریکەکان نوێنەریان نارد بۆلامان بۆ دانوستان وڕێکەوتن هەتاکو یەکترمان بەسەر دەکردەوە و دەڕۆیشتنین بۆلای یەکتر... وەتێکەڵاوی یەکتر دەبووین..))[٤٤٧]. عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (...کاتێك بارو دۆخەکە هێور بۆ وە هەندێکمان نەرمیمان نواند بەرامبەر بەیەکتری لە کاتێکدا هێشتا بارودۆخەکە سەقامگیر نەبوو وە داخوازیان نەهاتبووە دی لە سوڵح و ئاشتەوای وەلدان و دەست بەرداری شەڕو کوشتار بوون، وە هەر دوولا لەیەکتر دڵنیابوون، وە سەردانی یەکتریان دەکرد بەجۆرێك دۆخەکە هەر بەو شێوەیە بوو موسوڵمانەکان دەچوونە ناو موشریکەکانەوە وە دەهاتن و دەچوون لەیەکتر نەدەترسان هەمووان لە چاوەڕوانی ئاشتەوای و دانوستان بوون، ئەوە بوو کەسێك لە ناو یەکێك لەو دوو لایەنە بەتیر یەکێکی تری پێکا لەلایەکەی تر بەمەش وردەشەڕ دروست بوو هەر دوولا کەوتنە تیرباران و بەرد باران کردنی یەکتری و کەوتنە هاواری شەڕ، هەر یەکە لە دولایەنە کەوتنە بەبارمتە گرتنی ئەو کەسانەی کە چوو بوونە ناویان... موشریکەکان عوثمانی کوڕی عەففان ﷺ و ئەو کەسانەی تر لەهاوەڵانی پێغەمبەریان ﷺ بەبارمتەگرت کە چوو بوونە ناویانەوە)[٤٤٨]. مەیسەرەی کوڕی مەخرەمە ﷺ دەفەرموێت: (.... قورەیشیەکان عوثمانیان لەلای خۆیان دەست بەسەر کرد، ئەمەش وای گەیاندە پێغەمبەری خودا ﷺ

---

(٤٤٦) أخرجه: ابوداود (٢٧٠٠)، والحاكم (١٢٥/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي،والبيهقي (الكبرى) (٢٢٩/٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٤٩).

(٤٤٧) أخرجه: احمد (٤٩/٤)، ومسلم (١٨٠٧،١٨٣٠).

(٤٤٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٧٠٩) وقال محققه: فيه ضعيف، والطبراني (الكبير) (١٤٤/١)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٣/٤).

وموسوڵمانەکان کە عوثمان ﷺ کوژراوە)[٤٤٩]. عەبدولاّی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی پێگەیشت کە عوثمان کوژراوە فەرمووی: ((لانبرح حتى نناجز القوم)) واتە: ((ئێرە جێناهێڵین هەتا بەرنگاری قورەیش نەبینەوە واتە: (تۆڵەیان لێ دەسەنینەوە)) دواتر پێغەمبەر ﷺ خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ بەیعەت پێدان ئەوە بوو بەیعەتی (رضوان) یان دابە پێغەمبەری لەژێردرەختەکەدا)[٤٥٠].

لەگێڕانەوەیەکی مورسەلی (ضعیف)ی لاوازدا لە عورۆوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (لە کاتێکدا ئێمە لە ناوخۆماندا قسەمان دەکرد، لەبارەی ڕووداوەکەوەبانگەوازکارێك لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بانگی کرد: ئەی خەڵکینە بەیعەت دان بەیعەت دان وەرن بۆ بەیعەت بەستن ئەوە جبریل هاتووتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووە بە بەیعەت لێ هەستن و بڕۆن بەناوی خوداوە بەیعەت بدەن بە پێغەمبەر ﷺ، موسوڵمانەکان بەجارێك وروژان و بەگورجی چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش لە ژێر درختەکەدا بوو...)[٤٥١]. لەوکاتەداخەڵکەکەش [بڵاوەیان لێ کردبوو وە لە ژێر سێبەری درەختەکادا دەحەوانەوە][٤٥٢] یەکەمین کەس کەبەیعەتی بەپێغەمبەری خودادا ﷺ(سینانی کوڕی ئەبوسینانی ئەسەدی بوو. شەعبی ﷺ دەفەرموێت: (لەوساتەدا کە پێغەمبەری خودا ﷺ خەڵکەکەی بانگ هێشت کرد بۆ بەیعەت دان یەکەمین کەسێك کە گەیشتە خزمەتی (سینانی کوڕی ئەبو سینانی ئەسەدی بوو ﷺ فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەستت بێنە با بەیعەتت پێدەم؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەسەر چیَ بەیعەتم پێدەدەیت؟)) لەوەڵامدا فەرمووی: (لەسەر

(٤٤٩) أخرجه: احمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن.

(٤٥٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٧٠/٣) رقم (٨٢٣)، والطبري (التاريخ) (٦٣٢/٢) وقال البرزنجي في (ضعيف تأريخ الطبري) (٢٥٤): اسناده ضعيف، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) ص (٣٥٧): اسناده مرسل ضعيف.

(٤٥١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٤)، وفيه ضعيف كما قال الهيثمي (المجمع) (٨٤/٩)، والطبري (التاريخ) (٦٣٢/٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٤/٤)، وقال البرزنجي في (ضعيف تأريخ الطبري) (٢٥٥): ضعيف.

(٤٥٢) أخرجه: البخاري (٤١٨٧).

ئەوەی لە دڵ و دەرونت دایە). فەرمووی: ((چی لەدڵ و دەرونم دایە)). فەرمووی: (یا فەتح و سەرکەوتن یا شەهیدبوون) فەرمووی: ((بەڵێ)) بەیعەتی پێدا ئینجا خەڵکەکە کەوتنە بەیعەت دان و دەیان فەرموو: لەسەر بەیعەتەکەی سینانی کوڕی ئەبو سینان)[٥٥٣].

پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژێر درەختەکەدا وەستا بوو هاوەڵە بەڕێزەکانیش دەهاتنە خزمەتی و بەیعەتیان پێدەدا، مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ دەفەرمویت: (بەیعەتمان بەپێغەمەری خودا دا ﷺ لەڕۆژی حودیبیەدا لە ژێر درەختەکەدا منیش لق و پۆپی درەختەکەم بەرزکرد بۆوە بۆ ئەوەی بەر ڕووی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ نەکەوێت)[٥٥٤].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ سێ جار بەیعەتی دا بەپێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای خەڵکەکەدا و لەناوەڕاستدا و لەکۆتایشدا سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ خۆی دەفەرمویت: (... دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بانگی کردین بۆ بەیعەت پێدان لە ژێر درەختەکەدا لە سەرەتای خەڵکەکەدا بەیعەتم پێدا [پاشان خۆم خستە لایەکەوە] ئەوە بوو یەك یەك خەڵك بەیعەتیان دەدا، هەتاکو کەوتمە ناوڕاستی خەڵکەکەوە فەرمووی: (بەیعەتم پێ بدە سەلە) دەفەرمویت: وتم: بەیعەتم پێدای ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەرەتای خەڵکەکەدا. فەرمووی: (جارێکی تریش) (وەرە پێش وبەیعەت بدە)) منیش نزیك بوومەوە لەخزمەتی بەیعەتم پێدایەوە، پێغەمبەری خودا منی بینی هیچم پێ نەبوو (واتە: بێ چەك بووم) دەفەرمویت: قەڵغانێکی دامێ یا (لە پێستە) ئینجا بەیعەتم پێدا، هەتاکو کەوتمە کۆتایی خەڵکەکەوە. فەرمووی: ((سەلەمە ئەوە بەیعەتم پێنا دەیت؟)) وتم: بەیعەتم پێدای ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووجار لەسەرەتا و ناوەڕاستی خەڵکەکە، فەرمووی: ((ئەمجارەش)). دەفەرمویت: بۆ جاری سێهەم بەیعەتم پێدایەوە، ئینجا فەرمووی پێم: ((یا سلمة این حَجَفَتُك أو درَقَتُكَ التي أعطيتُك))؟ واتە: ((سەلەمە کوا قەڵغانە

---

[٥٥٣] أخرجه: ابن ابي شيبه (٣٦٩٥٨) وقال محققه: له متابعة قوية ومراسيل الشعبي صحيحة، والطبراني (الاوسط) (٢١١٩) وقال محققه: اسناده ضعيف جداً، والطبري (التاريخ) (٦٣٣/٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٧/٤)، وصحح اسناده السيوطي من طريق ابن عساكر كما في (منتخب كنز العمال) (٣٠٤/٥).

[٥٥٤] أخرجه: مسلم (٧٦، ١٨٥٨).

له پێست دروست كراوه كه‌ی‌پێم به‌خشی؟)) وتم: "ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ عامری مام بێ گه‌یشت ئه‌و بێ چه‌ك بوو منیش دامه ئه‌و". پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ پێكه‌نی و فه‌رمووی: ((انك كالذي قال الأول: اللهم أبغني حبيباً هو احبّ اليّ من نفسي)) واته: ((تۆ وه‌ك ئه‌و كه‌سه‌ی كه یه‌كه‌م جار ده‌ڵێت: (ئه‌ی خودایه خۆشه‌ویستێكم پێببه‌خشه كه خۆشه‌ویستر بێت به‌لامه‌وه له خۆم)) [ئینجا وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ: چه‌كه‌كه‌ی خۆتم پێ ببه‌خشه حه‌زی پێ ده‌كه‌م؟ فه‌رمووی: ((كوا چه‌كه‌كه‌ی خۆت؟)) وتم: دامه عامیری مامم.. ئینجا كه‌وانه‌كه‌ی خۆی و قه‌ڵغانێك وسێ تیری له هه‌گبه‌ی تیره‌كانی دامێ])[455]. عومه‌ر ﷺ بینی كه خه‌ڵكه‌كه چوارده‌وری پێغه‌مبه‌ریان ته‌نیوه زانیبووی كه ئه‌وه به‌یعه‌ت ده‌ده ئه‌ویش به‌گورجی هاته خزمه‌تی و به‌یعه‌تی پێدا، له‌وباره‌وه ئیبنو عومه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێت: (عومه‌ر فه‌رمووی: ئه‌ی عه‌بدولا سه‌یركه ئه‌وه خه‌ڵكی چیانه چوار ده‌وری پێغه‌مبه‌ریان ته‌نیوه؟ ڕۆیشتم (واته: ئیبن عومه‌ر) بینم به‌یعه‌ت ده‌ده‌ن منیش به‌یعه‌تم دا پاشان گه‌ڕامه‌وه خزمه‌ت عومه‌ری باوكم ئینجا ئه‌ویش ڕۆیشت وبه‌یعه‌تی دا)[456]. له‌گێڕانه‌وه‌یه‌كی تردا هه‌ر له‌ئیبن و عومه‌ره‌وه ﷺ ده‌فه‌رموێت: (عومه‌ر له‌ڕۆژی حوده‌یبیه‌دا عه‌بدوڵلای نارد بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌سپه‌كه‌ی بۆ بێنێته‌وه كه لای پیاوێكی ئه‌نصاری بوو (بۆ ئه‌وه‌ی جیهادی له‌سه‌ر بكات) ئه‌ویش پێغه‌مبه‌ری خودای ﷺ بینی به‌یعه‌ت وه‌رده‌گرێت له ژێر دره‌خته‌كه‌دا عومه‌ر به‌مه‌ی نه‌زانیبوو عه‌بدۆڵلای كوڕی عومه‌ر ﷺ به‌یعه‌تی پێداو پاشان ڕۆیشت ئه‌سپه‌كه‌ی هێنا بۆ خزمه‌ت عومه‌ری باوكی ﷺ، عومه‌ر خۆی سازو (ئاماده ده‌كرد) بۆ جیهادكردن عه‌بدوڵلا پێ ڕاگه‌یاند كه پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ به‌یعه‌ت وه‌رده‌گرێت له ژێر دره‌خته‌كه‌دا، عومه‌ریش ﷺ به‌په‌له ده‌رچوو عه‌بدوڵلاش له خزمه‌تیا بوو هه‌تاكو گه‌یشته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر ﷺ وه به‌یعه‌تی پێدا)[457].

---

(٤٥٥) أخرجه: البخاري (فتح) رقم (٢٩٦٠) (١٩٩/١٣)، ومسلم (١٨٠٧)، واحمد (١٦٥٤٤) وقال عققه: اسناده صحيح على شرطهما، والزيادات له.

(٤٥٦) أخرجه: البخاري (٤١٨٧).

(٤٥٧) أخرجه: البخاري (٤١٨٦).

پێغەمبەری خودا ﷺ لەجیاتی عوثمان بەیعەتی بەست لەو کاتەدا کەلای قورەیش یەکان دەست بەسەر بوو ئەوەش لە چەندین گێڕانەوە داهاتووە لەوانە:

۱. لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (... بەیعەتی (رضوان) لە کاتێکدا بوو عوثمان ڕۆیشت بوو بۆ مەککە لەدوای ئەوە بەیعەتەکە بەسترا، پێغەمبەری خودا ﷺ بەدەستی ڕاستی ئاماژەی کرد و فەرمووی: ((ئەوە دەستی عوثمانە)) ئینجا خستیە سەردەستەکەی تری و فەرمووی: ((ئەوەش بۆ عوثمان))[١٥٨].

۲. هەر لە ئیبن و عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: [... پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی خۆی خستە سەر دەستەکەی تری) و فەرمووی: ((ئەوەش لە جیاتی عوثمان))][١٥٩].

۳. لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (... پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((اللهم ان عثمان ‌في حاجتك وحاجة رسولك)) واتە: ((ئەی خودایە عوثمان ڕۆیشتووە بۆ جێ بەجێ کردنی کاری تۆ و پێغەمبەرکەت)) دەستی خۆی خستە سەر دەستەکەی تری، دەستی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ عوثمان باشتر بوو لە دەستی هاوەڵان کە بۆ خۆیان دەیان خستە ناو دەستی)[١٦٠].

٤. لەسەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ئەویش لە عوثمانەوە ﷺ دەفەرموێت: (...پێغەمبەری خودا ﷺ منی نارد بۆ لای کەسانێك لە موشریکەکان... کاتێك دەست بەسەر کرام و ئەگەڕامەوە دەستی ڕاستی خستبوە سەر دەستی چەپی و فەرموو بووی: ((..ئەوەش دەستی عوثمانی کوڕی عەففانە)) دەستی چەپی پێغەمبەری خودا ﷺ باشترە و چاکترە لە دەستی ڕاستی خۆم)[١٦١].

---

[١٥٨] أخرجه: البخاري (٤٠٦٦)، والترمذي (٣٧٠٦)، واحمد (٥٩/١).

[١٥٩] أخرجه: البخاري (٩٦٩٨)، النسائي (٢٣٦/٦)، والترمذي (٣٧٠٥)، واحمد (الفضائل) (٧٣٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

[١٦٠] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٢٦٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٨٤/٩) فيه ضعيف.

[١٦١] أخرجه: البزار (٢٥١١)، وقال الهيثمي (المجمع) (٨٥/٩): رواه البزار واسناده حسن.

هیچ کەسێك لەو بەیعەتە دوا نەکەوت تەنها پیاوێك نەبێت لە دووڕووەکان کە ناوی (جەددی کوڕی قەیسی ئەنصاری) بوو لە جابرەوە ﷺ دەفەرموێت: (لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خودا بانگی خەڵکەکەی کرد بۆ بەیعەت دان پیاوێکمان بینی لە خۆمان پێی دەگوترا (جەددی کوڕی قەیس) خۆی لە ژێر سکی و شترەکەی دەشاردەوە)[٤٦٢] لەگێڕانەوەیەکی تردا [وەڵاهی ئێستا لەبەر چاومە دەڵێی ئێستایە کە خۆی نوساندبوو بەبن باڵی وشترەکەیەوە خۆی دەشاردەوە و (خۆی پەنادەدا) پێی بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵکی بزر بێت][٤٦٣].

ئەو بەیعەتە لەسەر ئەوە بوو کە پشت هەڵنەکەن و ڕانەکەن لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا وەکۆمەڵێکیش بەیعەتیان پێدا لەسەر مردن و خۆڕاگرتن و دامەزراوی هەتا مردن. جابر ﷺ دەفەرموێت: (بەیعەتمان دا بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر ئەوەی کە ڕانەکەین و پشت هەڵنەکەین لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا)[٤٦٤].

لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ دەفەرموێت: (بەیعەتم بە پێغەمبەری خودا دا ﷺ لەژێر درەختەکەدا....لەسەر مردن)[٤٦٥]. ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ بەیعەتی لێ وەردەگرتن لەسەر دامەزراوی و خۆڕاگری)[٤٦٦].

ئەوەی ئەم فەرموودانە دەخوازن و ڕوونی دەکەنەوە ئەوەیە کە ئەو بەیعەتە لەسەر کۆڵنەدان و پشت هەڵنەکردن بوو لەمەیدانی شەڕ و ئارامگرتن هەتا سەرکەوتن یاخود شەهید بوون ئەوەش واتای بەیعەتە لەسەر مردن. بەژداربووانی ئەو بەیعەتە لەباشترینی

---

[٤٦٢] أخرجه: مسلم (١٨٥٦)، والحميدي (١٢٧٧).

[٤٦٣] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٧٠)، والطبري (التاريخ) (٢/٦٣٢)، وقال البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (١٩٢): حديث صحيح.

[٤٦٤] أخرجه: احمد (٣/٣٩٦)، والبخاري (٤١٥٤)، ومسلم (١٨٥٦)، والترمذي (١٥٩١)، والنسائي (٧/٤٠).

[٤٦٥] أخرجه: البخاري (٤١٦٩)، والنسائي (٧/١٤١)، والترمذي (١٥٩٢).

[٤٦٦] أخرجه: البخاري (٢٩٥٨).

موسوڵمانان و خەڵکی سەر زەوی بوون بەگشتی، جابر ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرمووین لە ڕۆژی حودەیبییەدا: ((انتم خیر اهل الارض)) واتە: ((ئێوە باشترین خەڵکی سەر ئەم زەمینەن))][467].

بەدڵنیایەوە خودا لەهەموویان ڕازیبوو هەروەك خوای گەورە ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾(الفتح: ١٨)

## شاندێکی نێردراوەکانی قورەیش

کاتێك قورەیشییەکان بەتەواوی دڵنیابوون لەسەرگەرمی و جۆش و خرۆشی موسوڵمانەکان و ئامادە باشیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بەبێ دوودڵی و وەبەیعەت دانیان بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر پشت هەڵنەکردن لەشەڕدا هەتا مردن، لێرەدا قورەیش ناچار بوون بەڕێکەوتن و هەستان بەناردنی چەندین شاند بۆلای موسوڵمانەکان هەروەك عوروە ﷺ بۆمان باس دەکات ودەفەرموێت: (... موسوڵمانەکان جۆشیان سەند ولێبڕانەوە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان پێدا کە هەرگیز پشت هەڵنەکەن لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا بەم ڕووداوەش خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە(واتە: دڵی قورەیش یەکان) هەرچی بەبارمتەگرتبوویان و دەست بەسەریان کردبوو لە موسوڵمانەکان ناردیانەوە و داوا و پێشنیازی دانوستان و ئاشتەواییان کرد...)[468]. بەو جۆرە هەردوولا ئەو بارمتانەی کەلەلای خۆیان دەست بەسەریان کردبوون یاخود بەندکراو و گیراو بوون گێڕاپانەوە بۆ یەکتر کە لەناویاندا عوثمانی کوڕی عەففان ﷺ تێدابوو.

عوروە ﷺ دەفەرموێت: (.....کاتێك عوثمان گەڕایەوە ناو موسوڵمانەکان پێیان فەرموو: ئاسودە بوویت لەتەوافی کەعبەدا ئەی باوکی عەبدوڵڵا؟ عوثمان فەرمووی: بەڕاستی گومانێکی خراپتان پێ بردووم سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر من

---

(467) أخرجه: البخاري (٤١٥٤).

(468) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١/١٤٤)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٧٠٩).

ماوەی یەك ساڵ لەمەکەدا نیشتەجێ بوومایە و پێغەمبەری خوداش ﷺ لەحودیبیەی بووایە هەرگیز تەوافم نەدەکرد هەتاکو لە خزمەتی پێغەمبەری خودادا ﷺ تەوافم دەکرد ئەوان ڕێگەیان پێدام کەتەوافی کەعبە بکەم بەڵام من ڕازی نبووم بەوکارە. ئینجا موسوڵمانەکان فەرموویان: پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگادارترە بەوەی لای خودایە وەگومانیشی لە ئێمە چاکترو باشترە)[٤٦٩].

لەدوای ئەوەی قوڕەیش دەستی کرد بەناردنی شاندەکانی لێرەدا ڕاوبۆ چوونی جیاواز هەیە لەسەر پێش خستن و دواکەوتنی هەندێك لەوشاندانە لەهەندێك لە گێڕانەوەکانی بەڵام لەدوای وردبونەوە و لێکۆڵینەوە و بەدوا گەڕان و ڕێکخستنی ڕووداوەکان هەموویان بەگوێرەی گشت گێڕانەوەکان بۆمان ڕوون بۆوە کەیەکەمین شاند کە هاتووە (حەلیس) بووە پاش ئەو عورووەی کوڕی مسعودی ئەقەفی بووە ئینجا موکەریزی کوڕی حەفصی عامیری و دواتریشیان سوهەیلی کوڕی عمروی عامیری کە بەدانوستان و ئاشتەوانی برانیەوە و کۆتای پێ هێنا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ.

لە مەیسەرەی کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی کوڕی حەکەمەوە (رضي الله عنهما) دەفەرموون: ((...قوڕەیش حولەیسی کوڕی عەلقەمەی کینانیان وەك شاندی یەکەم ناردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە ئەو لەو ڕۆژگارەدا سەرۆکی ئەحابیشەکان بوو یەکێك بوو لەبنی حاریثی کوڕی کینانە کاتێك بەدیارکەوت لە پێغەمبەری خودا ﷺ و (چاوی پێی کەوت) فەرمووی: ((ئەوە فلانە کەسە (ئەو) لە خێڵێکە (پەرستش ئەنجام دەدەن وشتری قوربانیان بەلاوە پیرۆزە و گەورەیە) وشترەکان بەرنەبەردەمی با چاوی پێیان بەکەوێت)). کاتێك وشترەکانی ئەبردنیان بۆ شوێنی دیاری کراوی قوربانی توکیان پێوە نەمابوو: (خەڵکەکەش بەدەم وتنی (لبيك اللهم لبيك) پێشوازیان لێکرد، کاتێك ئەمانە بەچاوی خۆی بینی وتی: (سبحان الله) ناگونجێت ئەمانە ڕێگەیان پێ نەدرێت بچنە کەعبەوە و بەربەستیان لەڕێ دابنرێت) یەکسەر گەڕایەوە بۆ لای قوڕەیش بەبێ ئەوەی چاوی بکەوێت بە پێغەمبەری خودا ﷺ لە

---

(٤٦٩) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٧٠٩)، والطبراني (الكبير) (١٤٤/١)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٤/٤).

بەر ڕێزوبایەی ئەوەی بەرچاوی کەوتبوو پێی وتن: "ئەی گرۆهی قورەیش ئەوەی من بینیم ڕەوانی یە کە ڕێگەیان پێنەدرێت بێنە بەیتەوە وشتری قوربانی ئامادەکراو لەبەر گیرخواردنیان لەو ناوە توکیان پێوە نەماوە (من وشتری قەڵەوی نیشانە داری قوربانیم چاو پێکەوت بەچ بیرو بۆچونێك ڕێگە لەمانە دەگرن بێنە ناو کەعبەوە) وتیان: دانیشە تۆ دەشتەکی لە هیچ شتێك نازانی [(حەلیس) ترساندنی لە ناکامی ئەو کارەیان و بەتوندی ئاگاداری کردنەوە، ئەوانیش قسەی ناشرین و ناڕێکیان پێ وت. وتیان: تۆ کابرایەکی دەشتەکی گەمژەی سەرمان لە تۆ نەسوڕماوە سەرمان لە خۆمان سوڕماوە کە تۆمان ناردووە بەشاندی خۆمان دانیشە][470] .... حەلیس توڕەبوو وتی: ئەی گرۆهی قورەیش وەڵاهی ئێمە لەسەر ئەوە پەیمانمان بە ئێوە نەداوە و ڕێکنەکەوتوین ئایە ڕێگری لەکەسێك دەکەن کە بێتە سەردانی کەعبە کە بەگەورە و پیرۆزی دەزانێت؟!، سوێند بەوەی گیانی حولەیسی بەدەستە یا ئەوەتا ڕێگەدەدەن بە محمد بۆ ئەوەی کە بۆی هاتووە تا جێبەجێی بکات یا ئەوەتا ئەحابیشتان هەموو لێ کۆدەکەمەوە و بەلێدانێکی دەست و برد هەڵدەکوتمە سەرتان. وتیان پێی: لەسەر خۆبە حولەیس دەستمان لێ مەکەوە ولێمان گەڕێ هەتاکو خۆمان چارەی دەردی خۆمان دەکەین لەو دەستکەوتانەی کە خۆمان پێی ڕازین و پێمان باشە. دوای ئەو عورووەی کوڕی مەسعودی ئەقەفیان نارده خزمەت پێغەمبەر وتی: ئەی گرۆهی قورەیش وای بۆ دەچم کاتێك من دەنێرن بۆ لای محمد ﷺ دواتر ئەوەی پێتان دەگەینم لە هاتنەوەم بۆلاتان قسەی ناڕێك و توندوتیژی بێت(واتە: هەروەك لەوە و پێش لەگەڵ حولەیس کردتان) (ئەی خزم و کەسەکانم: ئایە ئێوە وەکو باوك نین بۆ من؟ وتیان: بەڵێ وایە. وتی: منیش کوڕی خۆتان نیم؟ (لەبەر ئەوەی دایکی قورەیشی بوو لەبەرەی عەبدوشەمسی کوڕی عەبدولمەناف بوو) وتیان: بەڵێ ڕاست دەکەیت. وتی: ئایە ئێوە هیچ تۆمە تێکتان لەسەر من هەیە؟ وتیان: نەخێر) وتی: هەر کەبیستم دوچاری کارەساتێك بوون بە هۆی شەڕتان لەگەڵ ئەیارەکانتان ئەوە بوو هەرچی لە هۆزەکەم گوێڕایەڵی دەکردم کۆمکردنەوە بۆ پشتیوانیتان پاشان خۆشم بوومە ناو بژیوانتان (ئێوە باش دەزانن کە من باخی بووم لە خەڵکی عوکاض و ڕووبەڕوویان بوومەوە کاتێك کەوتنە دوژمنایەتیم نزیك

[470] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٩٤).

بوو زاڵ بن بەسەرمدا من هاتم بۆلاتان بەماڵ و منداڵ و ئەوانەی گوێ لە مستی من بوون) وتیان: ڕاست دەکەیت تۆ لای ئێمە سەرکۆنە ناکرێت و تۆمەت بارنیت. وتی: (ئەوەی بودەیل بۆی هێناون وە بۆی پێشنیار کردوون ئێوە پێی ڕازی بن)[٤٧١]. وە[دڵنیابن ئەو پیاوە پێشنیار و نەخشەیەکی ڕۆشنی خستۆتە بەردەستان(واتە: ئەو نەخشە و پێشنیازە کە بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ هێنا بووی بۆیان) پێی ڕازی بن و واز لە من بێنن با نەچم بۆ لای؟ وتیان نابڕۆ] [تۆ بچۆ بۆلای محمد بەڵێن بێت دواجار هیچ گلەی و گازندەمان نابێت بەرامبەرت].

عورِوە مەککەی جێهێشت وچووە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وەلە نزیک پێغەمبەر ﷺ دانیشت، پاشان کەوتە قسەکردن و وتی: ئەی محمد ئەوە چی یە کۆمەڵە خەڵکێکی هەرچی و پەرچی و[ناکەس بەچەت] هێناوەتە سەر خزم وکەس و [هۆزەکەت] دەتەوێت بن بڕیان بکەیت و بەوان[لەناویان ببەیت]، وریابە ئەوە قوڕەیشە بەهەرچی گەورە و بچوک و ژن و منداڵیانەوە هەموویان بۆت هاتوونە دەرێ و جل وبەرگی پڵنگیان پۆشیوە وپەیمانیان داوە بەخودا هەرگیز بەتۆ بزی و زۆرە ملی ڕێگەت پێ نەدەن بچیتە ناو مەککەوە: (پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمایشتێکی بە بودیلی کوڕی وەرقاء فەرموو بوو بە ئەویشی ڕاگەیاند) لە گێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خودا ﷺ بەویشی فەرمووی: ((انا لم نأت لقتالٍ ولكنا اردنا ان نقضي عمرتنا وننحر هدينا، فهل لك ان تأتي قومك فانهم اهل قتب، وان الحرب قد أخافتهم وانه لا خير لهم ان تأكل الحرب منهم الاّ ما قد اكلت فيخلّون بيني وبين البيت فنقضي عمرتنا وننحر هدينا ويجعلون بيني وبينهم مُدةً تزل (أي: تهدأ) فيها نساؤهم ويأمن فيها سربهم و يخلون بيني وبين الناس، فاني والله لأقاتلن على هذا الأمر الاحمر والأسود حتى يظهرني الله أو تنفرد سالفتي، فان اصابني الناس فذاك الذي يريدون، وان اظهرني الله عليهم اختاروا، امّا قاتلوا مُعدين واما دخلوا في السلم وافرين]))[٤٧٢]. واتە: ((ئێمە نە هاتووین بۆ شەڕ و کوشتار بەلام ئێمە دەمانەوێت عەمرەکەمان بەجێ بگەیەنین و

[٤٧١] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠١٠) وقال محققه: مرسل واسناده حسن.

[٤٧٢] أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٩٤).

قوربانیەکانمان سەربڕین، با ئەوەت پێ بڵێم کە چوویە وە لای خزم و کەسەکانت ئەوان تا کەی ماڵیان لەسەر پشتی ئەسپ و وشتر بێت وەك کۆچ و باری کۆچەریەکان، وە جەنگ و هەرا دوچاری ترس و دڵەڕاوکێ ی کردوون و هیچ خێرو بێری تێدا نی یە بۆیان لە کاتێکدا شەڕ و کوشتار لە بنی هێناون ئینجا هەتاکو بە تەواو ئەی بڕاندوتەوە با لەپەیوەندی نێوان من و خەڵکەکە بگەڕێن و خۆم یەکلای بکەمەوە، وەڵاهی من شەڕ دەکەم لەسەر ئەو پەیامە خواییە لەگەڵ تێکڕای ئەو خەڵکە بەبێ جیاوازی ڕەگەز و ڕەنگ و زمان هەتاکو خودا سەرم دەخات یا لەو پێناوەدا سەری خۆم دادەنێم، ئەگەر خەڵکی توانیان لەناومان بەرن ئەوا ئاواتیان هاتۆتە دی و ئەوانیش ئەوەیان دەوێت، وە ئەگەر خواش سەری خستم بەسەریاندا ئەوە ئەوان سەرپشکن، یاخۆیان بۆ شەڕ و کوشتار ئامادەکەن یا خود بەویستی خۆیان بچنە پەیمانی هەر کەسێکەوە]. عوروەی کوڕی مەسعود لەو کاتەدا وتی: ئایا کەسێك بەر لە تۆ لەناو عەرەب ویستویەتی بنەچە و خزم وکەسی خۆی لە بن بێنێ بەڕاستی ئەوە کارێکی نەشیاو و نەگونجاوە، وەڵاهی من وا دەبینم ئەو خەڵکە هەرچی و پەرچی و دەم ڕوتە لە دەم وچاویاندا ئەوە دەخوێنمەوە) کەسبەی هەرشتێك ڕووبدات ئەوان ڕادەکەن و پشتت بەردەدەن، لەو کاتەدا ئەبوبەکری صدیق ﷺ کە لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ دانیشتبوو فەرمووی: "ئەی دەستت بەلاقیتەی لات [ئێمە ڕادەکەین و پێغەمبەر ﷺ جێ دەهێڵین] و پشتی تێ دەکەین [ئێمە دوچاری شکستی دەکەین و بەدەست دوژمنیەوەی دەدەین". عوروەوە وتی: ئەوە کێ یە ئەی محمد؟ فەرمووی: ((ئەبو بەکر کوڕی ئەبو قوحافەیە)). وتی: وەڵاهی لەبەر ئەوە ئەبوایە کە چاکەیەت بەسەرمەوەیە (هێشتا فەرمبووم نەکردۆتەوە بۆت ئەوجا وەڵامم دەدایتەوە) [بەڵام با ئەوە لەبری ئەوە بێت] (واتە: عوروە هەستا بوو بەلە ئەستۆگرتنی خوێنی کوژراوێکی خزمی ئەبو بەکریش یارمەتی و هاوکاری باشی کردبوو بۆ ئاشتەوایەکە) [عورەوە پێغەمبەری خودای دەدوان هەر کاتێك قسەیەکی دەکرد دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر ﷺ (ئەوەش نەرێتێکی باوی ناو خێڵە عەرەبەکان بوو لە کاتی گفتوگۆدا بەتایبەتی لە کاتی ڕازی کردنی بەرامبەر و نەرمی نواند بەمەبەستی لێك نزیك بوونەوە)] لەو کاتەشدا موغیرەی کوڕی شوعبە وەك پاسەوان بەدیار سەری پێغەمبەری خوداوە ﷺ وەستابوو خۆی دەمامك دابوو بەخودەی

ئاسنین و شمشێرەکەشی بەدەستەوە بوو هەر کاتێك عورِوە دەیویست دەستی ببات بۆ ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بەدەسکی شمشێرەکەی دەی کێشا بەدەستیدا و دەیفەرموو: دەستت بکێشەوە لە ڕیشی پێغەمبەر (بەر لەوەی نەگەڕێتەوە بۆلات!!.

لەگێڕانەوەیەکی تردا[دڵنیابە یا ئەوەیە دەست دەکێشیەوە یا دەستت ناگەڕێتەوە بۆلات!][٤٧٣]. عورِوە سەری بەرزکردەوە و وتی: ئەی بێ بەلا بی، چەند توند وتیژو زبریت پێغەمبەری خودا ﷺ بزەیەکی کرد عورِوە پێی وت: ئەوە کێ یە محمد ﷺ؟ فەرمووی: ((ئەوە برازاکەتە موغەیرەی کوڕی شوعبەیە) واتە: ئەی چەندە سپڵەی ئەی ستەمکاری پیاو کوژ تۆ هێشتا لە تاوانەکەی دوێنێت پاك نەبویتەوە (کەلەبازاڕی عوکاض) ئەنجامت داوە [هەوڵ وکۆششی من نەبووایە تاوانەکەت نەدەبڕایەوە وسوڵحت بۆ نەدەکرا].

ئیبن هیشام (رحمه الله) دەفەرموێت: [مەبەستی عورِوە لەو قسەیە ئەوە بوو: کە موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ بەر لەموسوڵمان بوونی سیانزە کەسی لە بەنی مالیکی ثەقیف کوشتبوو، ئەمەش ئاشوبی بەر پاکردبوو هەردوو بەرە بابی هۆزی بەگژیەکدا بەنی مالیکی خێڵی کوژراوەکان، وە ئەحلاف خێڵی موغەیرە، عورِەوە خوێنی هەر سیانزە کوژراوەکەی خستە ئەستۆی خۆیی و خوێنەکەی پێدان بەمەش کێشەکەی چارەسەرکرد و ئاشتەوایی خستەوە نێوانیان][٤٧٤].

حافظی ئیبن حەجری عەسقەلانی (رحمه الله) دەفەرموێت: (پوختەی ڕووداوەکەی موغەیرە بەم شێوەیە بوو. موغەیرە [ لەگەڵ کومەڵێك بۆ گەشت دەرچوون] بەمەبەستی سەردانی کردنی موقەوقیسی میسر ئەویش میوانداریەکی باشی کردن و ڕێزێکی شایستەی لێ گرتن و بەخششێکی باشی وەك دیاری پێدان ئەوانیش بەشی موغەیرەیان کەم دانا و پشت گوێیان خست ئەویش ئەمەی لەدڵی خۆی گرت و لێیان بەرِق داچوو کاتێك لە ڕێگادا گەڕانەوە ئارەقیان خواردەوە کاتێك سەرخۆش بوون و خەویان لێکەوت موغەیرەش ئەم

---

(٤٧٣) اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٩/٢٠٠)، وصحح اسناده كل من الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٨٩)، والبوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٨٠).

(٤٧٤) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٦٨).

هەڵەی قۆستەوە و هەڵی کوتایەسەریان و هەموویانی کوشت)[٤٧٥]. [هەموو ماڵ و کەلوپەل سامانەکەشی هێنان و لەدوایدا هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و موسوڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((أما الإسلام فاقبلُ وأما المال فلستُ منه في شيء] [فانه مال غدر لا حاجة لنا فيه]))[٤٧٦] واتە: ((موسوڵمان بوونە کەتمان لەدڵەوە پێی ڕازین بەڵام ماڵ و سامانەکەت پەیوەندی بە ئێمەوە نی یە و هیچ شتێکی لێ وەرناگرین] [ئەوە ماڵی بەستەم زەوت کراوە ئێمە هیچ پێویستی یەکمان پێ نی یە] [بەو جۆرە پێغەمبەری خودا ڕازی نەبوو وەری بگرێت][٤٧٧].

پاشان عورۆەوە مایەوە بە سەرنج و تێڕامانێکی وردەوە سەیری هاوەڵانی پێغەمبەری خودای کرد و چاوی دەگێڕا بەناویاندا، سوێند بەخوا تف نەبوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ فڕێی بدات مەگەر دەکەوتە دەستی کەسێك لە هاوەڵانی دەم و چاو جەستەی خۆیانیان پێ چەوردەکرد، کاتێك فەرمانی بەشتێك بکردایە ملکەچی و گوێڕایەڵی دەبوون، وە ئەگەر دەست نوێژیشی بگرتایە زۆری نەدەما بکەونە شەڕ لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی، وە کاتێك فەرمانی بە شتێك بفەرموایە یەکسەر جێبەجێیان دەکرد هەر کات وتەیەکی بفەرموایە هەموو بێ دەنگ دەبوون و زۆر بەگەورەیان دەزانی و چاویان تێ نەدەبڕی [هەر تفێکی ڕۆبکردایە دەست پێشخەریان دەکرد لەوەی بکەوێتە سەر لەپی دەستیان وە هیچ مویەك لەقژی سەری نەدەکەوتە خوارەوە مەگەر هەڵیان دەگرتەوە] دواتر عورۆەی کوڕی مەسعود گەڕایەوە بۆلای [قوڕەیش، وتی: ئەی گرۆهی قوڕەیش] وەڵاهی وەك شاندی نێردراو چوومەتە لای زۆر لە پادشاکان چوومەتە لای کیسرا (لەوڵاتی خۆیی) وە قەیسەر و نەجاشی

---

[٤٧٥] أخرجه: انظر: (فتح الباري) (٥/٣٤٠).

[٤٧٦] أخرجه: ابي داود (٢٧٦٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٤٠٣)، والطبري (التاريخ) (٢/٦٢٣)، وقال البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (١٨٤): اسناده صحيح.

[٤٧٧] أخرجه: احمد (١٨١٥٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، والطبراني (الكبير) (٢٠/٣٦٥) وقال محققه: حديث صحيح، النسائي (الكبرى) (٨٧٣٣)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١١٥٠): حديث صحيح.

(لەولاتی خۆیان) وەڵاهی هیچ پادشایەکەم [لەناو گەلەکەی] نەبینیوە هەرگیز کەدەست و پەیوەندەکانی ئەوەندە ڕێزی لێ بگرن و بەگەورە سەیری بکەن وەك ئەوەی هاوەڵانی محمد، محمدیان لەلا گەورە و بەڕێزە، سوێند بەخودا هەر تفێك فڕێ بدات، هەموو ناو لەپێ دەستیان بۆ دەگرنەوە تا دەکەوێتە سەر دەستی کەسێکیان، ئەوجا جەستەو دەم وچاوە و ڕووی خۆیانی پێ چەور دەکەن، هەر فەرمانێك بکات بەگورج و گۆڵیەوە جێبەجێ دەکەن، وە ئەگەر دەست نوێژ دەگرێت دەبێتە تێك هەڵچوون لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی کاتێك قسەش دەکات بەبێ دەنگیەوە لەخزمەتیا دەوەستن [بەلای هیچ شتێکی بەهیچ جۆرێك ئاوڕنادەنەوە] و چاوی تێ نابڕن [وبەهیچ جۆرێك نایدەن بە دەستەوە] و بەو پەڕی تا مەزرۆیەوە گوێی بۆ دەگرن ئەو پەیام و ئەخشەیەکی ڕۆشن وشایستەی خستۆتەبەر دەمتان ئێوەش پێی ڕازی بن و وەری بگرن](٤٧٨).

# دانوستان و ڕێکەوتن

لەدوای ناردنی عورەوە قورەیش هەستان بەناردنی شاندێکی تر ئەویش موکریزی کوڕی حەفصی عامیری بوو لەکاتێکدا ئەو کەوتبووە گفتوگۆ لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ کەشاندی سێ یەمی قورەیش گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش سوهەیلی کوڕی عەمر بوو بەمەبەستی دانوستان لە بارەی ڕێکەوتنەوە.

هەروەك لە مەیسەرەی کوڕی مەخرەمە و مروانەوە (رضي الله عنهما) دەفەرموون: [دوای عورەوە پیاوێك هەستا لە ناویاندا (واتە: ناو قورەیش) کەناوی موکریزی کوڕی حەفصی عامیری بوو وتی: ڕێگەم پێبدەن من بچە لایان. وتیان: بفەرموو] ئەوسا موکریزی کوڕی حەفصی کوڕی ئوخیەفی عامیریان نارده خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کەلەبەنی عامری کوڕی لوئەی بوو، کاتێك (دەرکەوت لە موسوڵمانەکان) و پێغەمبەری خودا ﷺچاوی

(٤٧٨) أخرجه: احمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن، والبخاري (٢٧٣٢)، وابن هشام (٣/٢٦٨) قال محققه: اسناده حسن، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٣٥٢): حديث صحيح. واللفظ لاحمد وابن هشام والزيادة للبخاري.

پێی کەوت فەرمووی: ((هذا رجل غادر [فاجر] [ینظر بعینٍ]))[٤٧٩] واتە: (ئەو پیاوێکی پەیمان شکێن و(خراپەکارە) [بەچاوێکی پیسەوە سەیر دەکات].

کاتێك گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و کەوتە گفتوگۆکردن، پێغەمبەری خودا ﷺ هەمان فەرمایشتی خۆی پێ فەرموو کە پێشتر بەبودیل و هاوڕێکانی تری فەرموو بوو [لەکاتێکدا موکریز لە قسەکانی نەبیبۆوە و قسەی دەکرد لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ، هەر لەو کاتەدا سوهەیلی کوڕی عەمر گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ][٤٨٠].

بەم جۆرە شاندی نێردراوی سێهەمی قورەیش کە ناردبوویان بۆ خزمەت پێغەمبەر گەیشت کە قورەیش مەرجی لەسەردانا بوو کە دانوستان و ئاشتەوایی بکات لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەو مەرجەی کە ئەم ساڵ بگەڕێتەوە و عەمرە نەکات، هەروەك مەیسەرەی کوڕی مەخرمە و مەروان (رضي الله عنهما) دەفەرموو: [...قورەیش یەکان سوهەیلی کوڕی عەمریان بەشاندی دانوستانکار نارد کەیەکێك بوو لەبەنی عامیری کوڕی لوئەی (پێیان وت: برۆ خزمەت محمد ﷺ و سوڵحی لەگەڵدا بکە بەمەرجێك یەك لە خاڵەکانی ڕێکەوتنی ئەو دانوستانە ئەوە بێت کە ئەم ساڵ بگەڕێتەوە و نەیەتەناومان بۆ مەککە، وەڵاهی هەرگیز ناهێڵین خێڵە عەرەبیەکان لەبارەمانەوە بدوێن وبڵێن بە توند وتیژی خۆی کرد بەناوماندا و عەمرەیان کرد، هەر کەسوهەیلی کوڕی عەمر گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك بینی بەرەو ڕووی دێت فەرمووی: ((ئەوە سوهەیلە خوای گەورە ئەم دۆخەتان بەئاسانی بۆ چارەسەر دەکات])). دیارە قورەیشی یەکان ڕێکەوتن و ئاشتەوایان دەوێت کاتێك ئەو پیاوەیان ناردوە] هەر کەسوهەیلی کوڕی عەمر گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گفتوگۆی دەست پێکرد و قسەکردن لە بارەی دانوستانەکەوە درێژەی کێشا، پێداچوونەوە تەواویان کرد و دەستیان پێ دەکردەوە هەتاکو بەڕێکەوتن و ئاشتەوایی لە نێوانیاندا کۆتایی پێ هات، کاتێك بەتەواوی کارەکە برایەوە و هیچ شتێك لە گۆڕ نەما

---

[٤٧٩] اخرجه: ابن ابي شیبة (المصنف) (٣٨٠١٠)، وقال محققه: اسناده حسن مرسل، وكان هذا الرجل معروفاً بالغدر وقد قتل رجلاً بريئاً انتقاماً لقتل اخيه.

[٤٨٠] اخرجه: البخاري (٢٧٣١، ٢٧٣٢)، واحمد (١٨٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن هشام (٢٦٨/٣) وقال محققه: اسناده حسن.

تەنها خستنە سەر کاغەز نەبێت عومەر کوڕی خەطاب ﷺ بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ئەبو بەکر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر ئایە ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ نی یە؟ وە ئێمەش موسوڵمان نین؟ ئەوانیش موشریك و بێ باوەڕنین؟ فەرمووی: بەڵی فەرمووی: باشە لەسەر چی ئێمە بەسەر شۆڕی و زەلیلی لەسەر ئاینەکەمان ڕازی بین؟ ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی عومەر پابەند بە وە دڵنیابە پێغەمبەر ﷺ بێ مەبەست ئەم کارەی نەکردووە من شایەتی دەدەم کە ئەو نێردراوی خودایە؟ عومەریش فەرمووی: وەمنیش شایەتی دەدەم کە ئەو پێغەمبەری خودا.

[ئینجا سوهەیل وتی: نوسراوێکم بۆ بنوسە و لە نێوان ئێمە و خۆتاندا با بەنوسراوێکی فەرمی هەبێت لە نێوانماندا] [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی بەعەلی ﷺ[481]: ((اکتب الشرط بيننا، اكتب: بسم الله الرحمن الرحيم))[482] واتە: [بنوسە ئەو خاڵ و مەرجانەی لەسەریان ڕێکەوتین، سەرەتا بنوسە: بسم الله الرحمن الرحمن الرحيم] [سوهەیل وتی: وەڵاهی من (الرحمن الرحيم) نا ناسم و نازام کێ یە بەڵکو ئەوە بنوسە [کە ناسراوە لەلامان باسمك اللهم) (کەپێشتر دەت نوسی موسوڵمانەکان فەرموویان: وەڵاهی ئێمە هیچ شتێك نانوسین تەنها (بسم الله الرحمن الرحيم)][483] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی ((اكتب باسمك اللهم، هذا ما صالح عليه محمد رسول الله سهيل بن عمرو)) واتە: ((بنوسە: باسمك اللهم، ئەوە ئەو ڕێکەوتنەیە کە محمد پێغەمبەری خودا ﷺ و سوهەیلی کوڕی عەمر لەسەری ڕێکەوتن)) سوهەیلی کوڕی عەمر وتی: [وەڵاهی ئێمە دان نانێن بەوەدا] (سوێند بەخودا ئەگەر بمانزانیایە تۆ نێردراوی خودای ڕێگریمان لێ نەدەکردیت لەوەی سەردانی کەعبە بکەیت و شەڕمان لەگەڵ نەدەکردیت] [وەباوەڕمان پێ دەکردیت] [و بەدرۆمان نەدەخستیەوە] [و بەیعەتمان پێ دەدایت لەسەر ئەو پەیامە] بەڵکو ناوی خۆت و باوکت بنوسە: ئەمە ئەو ڕێکەوتنە یە کە محمد کوڕی عەبدوڵلا وسوهەیلی کوڕی عەمر لەسەری

---

[481] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩٧٢١)، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٤١/٢): اسناده صحيح.

[482] أخرجه: البخاري (١٣١٨٤)، ومسلم (١٧٨٣).

[483] أخرجه: البخاري (٢٧٣١)، عبدالرزاق (٩٧٢٦).

پێك هاتوون [پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەڵلاهی من نێردرا و فرستادەی خودام ئەگەر ئێوەش بەدرۆم بخەنەوە] [عەلی بیسڕەوە، خودایە تۆ دەزانێ کەمن پێغەمبەری تۆم، ئەو ڕەش بکەوە ئەی عەلی و بنوسە: ئەمە ئەو ڕێکەوتنەیە کە محمد کوڕی عەبدوڵلا موری کردووە][٤٨٤])).

عەلی ﷺ فەرمووی: [وەلاهی نایسڕمەوە]، پێغەمبەری خودا ﷺ نوسراوەکەی وەرگرت کە خۆی نوسین و خوێندنی باش نەبوو] سڕیەوە وە [پێغەمبەری خودا ﷺ بەدەستی خۆیی و لەشوێنی پێغەمبەری خودا ﷺ نوسی محمد کوڕی عەبدوڵلا دواتر نوسی: ئەوە ئەو ڕێکەوتنەیە کە محمد کوڕی عەبدڵلا و سوهەیلی کوڕی عەمر مۆریان کردووە: [ ((لەسەر ئەوەی دەست نەهێننە ڕێگەمان و نەکەونە نێوان ئێمە و کەعبەوە تا بتوانین تەواف بکەین] سوهەیل وتی: وەلاهی نابێت خێڵە عەرەبەکان بڵێن بە زۆرە ملێ چوونە مەککەوە بەلام] [ ئەگەر ساڵی ئایندە هاتن ئێمە شارەکەتان بۆ چۆڵ دەکەین، خۆت و هاوەلانت وەرنە ناو مەککە وە و سێ ڕۆژ تیایدا بمێنەوە و تەنها چەکی ڕێبوارتان پێبێت دەبێت بێنە ناو شارەوە تەنها شمشێرتان پێ بێت لەکێلاندا]، [وەڕێکەوتن] کە بۆماوەی دەساڵ شەڕ و کوشتار لەنێوانیاندا بوەستێت و خەڵکی بەتەواوی بکەونە ئاسایش و دڵنیایەوە، و هەر دوولایان دەست لە خوێن ڕشتنی یەکتر هەڵگرن و لەکاتی بەیەك گەیشتندا دەست لەیەك نەگەنەوە.

وەهەروەها لەسەر ئەوە پێکهاتن کە هەر کەسێك لە (قورەیشی یەکان) هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ تا موسوڵمان بێت پێویستە ڕێگە پێدان و ڕوخسەتی خاوەن وکەس و کاری لەسەر بێت گەروا نەبێت پێویستە بینێرنەوە بۆ مەککە لە دوای ئەم ڕێکەوتنە [موسوڵمانەکان فەرموویان: (سبحا الله) چۆن بنێردرێتەوە بۆ لای موشریکەکان لەکاتێکدا هاتووە و موسوڵمان بووە؟] [پێغەمبەری خودا فەرمووی: ((اکتب: فکتب: من يأتي منكم رددناه عليكم ومن أتى منا تركناه عليكم)). واتە: [بنوسە: نوسی: هەر کەسێك لەلای ئێوەوە هات دەینێرینەوە بۆلاتان وە هەر کەسێکیش لەلای ئێمەوە هاتە ناوتان بۆ مەککە ئەوە

---

[٤٨٤] أخرجه: احمد (١١٨٧) وقال محققه: اسناده حسن.

دەستبەر داری دەبین بۆتان] فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا (بینووسین) و ئەوەیان بۆ بدەین؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((نعم انه من ذهب منّا اليهم فابعده الله، ومن جاءنا منهم [فرددناه] سيجعلُ الله له فرجاً ومخرجاً)). واتە: [بەڵێ هەر کەسێك لە ناو ئێمەوە بڕواتەوە ناویان ئەو خودا ڕزگاری کردووین لەدەستی و لەکۆڵمان بووەتەوە، وە هەر کەسێکیش لەلای ئەوانە بێتەلامان [کە دەیگێڕینەوە بۆلایان خودای گەورە بەزووترین کات دەروی خێری لێ دەکاتەوە و ڕزگاری دەکات][٤٨٥].

وە یەکێکی تر لەبەندەکانی ڕێکەوتنەکە کاتێك کە نوسراوە کەیان نوسی ئەوە بوو: [کە دڵنیابین و هیچ پەیمان شکێنی و فرسەت قۆستنەوە وهەڵوەشاندنەوە لە نێوانماندا نەمێنێت] وە خەڵکیش پشت ڕاست و دڵنیابن لەوەی هەر کەسێك پێی خۆشە پەیمان لەگەڵ محمددا ببەستێت و ببێتە هاوپەیمانی بێ گرفت دەتوانێت ئەو کارە بکات، وە هەر کەسێکیش پێی خۆشە پەیمان ببەستێت لەگەڵ قورەیشدا و ببێتە هاوپەیمانی بێ گرفت دەتوانێت ئەو کارەبکات، لەوێدا هۆزی خوزاعە ڕاست بوونەوە وتیان: ئێمە بگرێبەستی هاوپەیمانیەتی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ مۆردەکەین ودەچینە پەیمانی ئەوە وە، بەنی بەکریش هەستا و وتیان: کەواتەئێمەش گرێبەستی هاوپەیمانیەتیمان لەگەڵ قورەیشە و دەچینە هاوپەیمانێتی ئەوانەوە.... هێشتا پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام بوو لە نوسینی بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە ئەبو جەندل کوڕی سوهەیل کوڕی عەمر ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە بەناسن بەسترابۆوە و [کۆت و زنجیرکرابوو ومڕایکردبوو لە خوارووی مەککەوە هاتبوو هەتاکو خۆی کرد بەناو ڕیزی موسوڵمانەکاندا][٤٨٦]. و خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ).

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەرچوون بەرەو مەککە هیچ گومان و دوودڵیەکیان لە فتح و ڕزگارکردنی مەککەدا نەبوو لەبەر ئەو خەوبینینەی کە پێغەمبەر ﷺ لە خەودا

---

(٤٨٥) أخرجه: مسلم (١٧٨٤).

(٤٨٦) أخرجه: البخاري (٢٧٣٢، ٣١٨٢)، ومسلم (٢٧٨٤)، وفي رواية عروة ﷺ قال: (... خرج ابي جندل من السجن وتنكب الطريق وركب الجبال حتى هبط على المسلمين، ففرح به المسلمون وتلقوه) انظر: (فتح الباري) (٥/٤٣٢).

بینیبووی، کاتێك چاویان کەوت بەوەی کە دەهاتە پێش لەڕێکەوتن وناشتەوایی وە قوڕەیش بەندو باریان لەسەر دانان بۆ گەڕانەوەیان و نەچوونە ناو شاری مەککە و کاتێك ڕازی بوون و چوونە ژێرباری ئەو مەرجە قورسانەی دانوستان ئەمانەیان بینی لەلایەن پێغەمبەردوە ﷺ مقۆمقۆیەك کەوتە ناو خەڵکەکە و ئەمەیان بەکارێکی قورس و گەورە بۆسەرخۆیان دادەنا هەتاکو نزیك بوو دوچاری لەناوچوون و بێ فەرمانی خودا و پێغەمبەریان ﷺ بکات هەر کە سوهەیل چاوی کەوت بە ئەبو جەندل کوڕی هەستا بۆیی و کەوتە پێداکێشانی بەزلله وبەعەباکەی ڕای دەکێشا و ئینجا وتی: [ئەی محمد ئەمە یەکەم کەسە کە دەکەوێتە گەردنت لە ڕێکەوتنەکە کەبیگێڕیتەوە بۆ من] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((انا لم نقض الکتاب بعد)) واتە: [ئێمە هێشتا نوسراوەکەمان تەواو نەکردووە و مۆرنەرکراوە] وتی: وەڵاهی ئەگەر وابێت بەهیچ جۆرێك لەسەر هیچ شتێك ڕێکەوتنت لەگەڵ ناکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو بەمن ببەخشە)) وتی: نایبەخشم بە تۆ فەرمووی: ((بەڵکو ئەو کارە بکەیت)) وتی: من ناتوانم ئەو کارە بکەم. موکریز وتی: ئەو بەخشیمان بە تۆ سوهەیل وتی: محمد کۆتایمان بە هەموو شتێك هێنا و هەمووی برایەوە لەنێوان من و تۆدا بەر لە هاتنی ئەمە، فەرمووی: ڕاست دەکەیت [ئەبو جەندل ڕووی کردە موسوڵمانەکان و فەرمووی: ئەی گرۆهی موسوڵمانان ڕادەستی موشریکەکانم دەکەنەوە لەکاتێکدا بەموسوڵمانی هاتوومە ناوتان ئایا نازانن کە دوچاری چی دەبمەوە؟ دوچاری سزا و ئازارێکی سەخت دەبمەوە لەپێناوی خودا].

عومەر ﷺ فەرمووی: "وەڵاهی لەو ڕۆژە وە کە موسوڵمان بوم دوچاری هیچ گومان و دوودڵیەك نەبووم تەنها ئەو ڕۆژەنەبێت" چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺوتم: تۆ پێغەمبەری خودا نیت؟ فەرمووی (بەڵێ) دەفەرموێت: وتم: کەواتە بابەزەلیلی و سەرشۆڕی ڕازی نەبین لەسەر ئاینەکەمان و [بانەگەڕێینەوە هەتاکو خوا نێوانی ئێمە و ئەوان بەکلایی دەکاتەوە] فەرمووی: ((اني رسول الله، ولست اعصيه وهو ناصري [(و) لن أخالف امره ولن يُضيعني])) واتە: ((من پێغەمبەری خودام من سەرپێچی ناکەم لە کاتێکدا ئەو پشتیوان و فریادڕەسمە [وە پێچەوانەی فەرمانەکانی ناجوڵێمەوە و ئەویش هەرگیز پشتم تێ ناکات و دەست بەردارم نابێت)) وتم: ئەی تۆ نەت فەموو پێمان کە ئێمە دەچینە

کەعبەوە و تەوافی بەدەوردا دەکەین؟ فەرموویی: ((بەڵێ)) فەرمووی: ((أفأخبرتك انك تأتي العام؟)) واتە: ((من پێم وتی کە تۆ ئەم ساڵ دەچیت؟)) وتم نەخێر. فەرمووی: ((انك آتيه ومتطوّفٌ به)) واتە: ((تۆ دەچیە مەککە و تەوافی ماڵی خوداش دەکەیت)) دەفەرموێت: دوای ئەو چوومە خزمەت ئەبوبەکر پێم وتم: ئەبو بەکر ئایا هەر بەڕاستی ئەو پێغەمبەری خودانیە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: وەئێمە لەسەر حەقنین و دوژمنەکانمان لەسەر ناحەق و پوچنین؟ فەرمووی: بەڵێ [وتم: ئایا کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدا نین و کوژراوەکانی ئەوانیش لە ئاگردانین؟ فەرمووی بەڵێ] وتم ئەی بۆچی ڕازی ببین بەسەر شۆڕی و زەلیلی لەسەر ئاینەکەمان و بەو جۆرە [بگەڕێینەوە کە هێشتا خودای گەورە نێوانی ئێمە و ئەوانی یەکلایی نەکردۆتەوە]

ئەبو بەکر فەرمووی: [واز بێنە عومەر لەبۆ چوون وبیرو ڕای ئەو][٤٨٧] پیاوەکە ئەو پێغەمبەری خودایە هەرگیز سەرپێچی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتی خۆی ناکات و خواش پشتیوان و سەرخەریەتی [هەرگیز خودا دەست بەرداری نابێت] پابەندی ڕێ و شوێنی بە هەتاکو دەمرێ وەڵاهی ئەو لەسەر حەق وڕاستی یە، وتم: ئەی ئەو نەیفەرموو پێمان کە دەچینە کەعبە و تەوافی دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ بەس فەرمووی کە ئەم ساڵ دەچین؟ وتم: نەخێر. فەرمووی: کەواتە دەچیت و تەوافیش دەکەیت.

عومەر ﷺ دەفەرموێت: بەردەوام خێرو صەدەقە و ڕۆژوو و نوێژی زیاترم ئەنجام دەدا و بەندەم ئازاد دەکرد لەترسی ئەوەی ئەو ڕۆژەکردم وە لەبەر ئەو قسانەی کردم هەتاکو ئەو خێرو چاکانە قەرەبووی بکاتەوە، سوهەیل [بەتوند و تیژی بەرامبەر ئەبو جەندەل وەستایەوە] عەباکەی گرت و بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشا [بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆ لای قورەیش]، ئەبوجەندەلیش بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد: ئەی گرۆهی موسوڵمانان ئایا

---

(٤٨٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠١٠) وقال محققه: اسناده حسن مرسل، ولهذا كان عمر ﷺ ينصح الناس ان لا يعتمدوا على الراي فقط كما قال: (ايها الناس اتهموا الرأي على الدين، فلقد رأيتني ارد امر رسول الله ﷺ برأيي اجتهاداً فوالله ما آلوعن الحق وذلك يوم ابي جندل). رواه: البزار (١٨١٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٣): رواه البزار رجاله رجال الصحيح.

دەمگێڕنەوە بۆ ناو موشریکەکان کە لەسەر ئاینەکەم پاشگەزم بکەنەوە بۆ شەڕیك و هاوبەشی دانان دەفەرموێت: خەلکەکە زیاتر ڕقیان هەلدەسا لەوەی کەبەسەریان دەهات بەهۆی ئەو سولحەوە پێغەمبەر ﷺ فەمووی: ((یا ابا جندل اصبر واحتسب فان الله عزوجل جاعل لك ولمن معك من المستضعفین فرجاً ومخرجاً، انا قد عقدنا بیننا وبین القوم صلحاً، واعطیناهم علی ذلك واعطونا علیه عهداً وانا لن نغدر بهم)). واتە: ((ئەبوجەندەل خۆڕاگربە و پشت بە خودا ببەستە دلنیابە خوای گەورەی بەدەسەلات بۆ تۆ و ئەوانەی لەگەل تۆدان لە چەوساوەکانی مەککە دەروی خێر وخۆشی ڕزگاریتان لێ دەکاتەوە، ئێمە ڕێکەوتنێکمان لە نێوان خۆمان و هۆزەکەت براندۆتەوە، لەسەر ئەوەش پەیمانمان بەیەکتر داوە و وە ئێمەش هەرگیز ستەم کارو پەیمان شکێن نابین لەگەلیاندا]. دەفەرموێت عومەر ﷺ بەهەلە داوان خۆی گەیاندە لای ئەبو جەندەل و لەتەکیەوە دەڕۆیشت و دەی فەرموو: دان بەخۆدابگرە ئەبو جەندەل ئەوانە موشرکن، خوێنی هەر کەسێکیان وەك خوێنی سەگ وایە [عومەر ﷺ خۆی لێ نزیك کردبۆوە وباوکیشی دەستی گرت بوو پەل کێشی دەکرد بە دوای خۆیدا عومەریش دەیفەرموو: "ئەوە تەنها کەسێکە شمشێرت لە خزمەتایە"][١٨٨] [ئەبو جەندەل! ئەوە شمشێرە و بیگرە یەك بەیەك دەوەستنەوە. سوهەیل وتی ئەی عومەر ئەو یارمەتی دەدەیت لە دژی من][١٨٩] دەفەرموێت: [عومەر ﷺ دەسکی شمێشرەکەی لێ نزیك دەخستەوە بۆی دەبر دە پێش. عومەر ﷺ دەیفەرموو [دەمویست شمشێرەکە وەرگرێت و باوکی بکوژێت، ئەویش هەر لە پاڵ باوکیدامایەوە وبەمەش بڕیارەکە جێبەجێ کراو نوسراوەکەش تەواو بڕایەوە] [کاتێك نوسراوەکە کۆتایی پێ هات وەۆرکرا بە ئامادەبوونی کەسانێك لە موسولمانەکان و موشریکەکان [لە وانەی ئامادەیی ڕێکەوتنەکە بوون لە موسولمانەکان: ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف و عەبدوللای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و محمودی کوڕی

---

[١٨٨] نفس المصدر.

[١٨٩] اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٩٩٤).

مەسلەمە و موکریزی کوڕی حەفص کە ئەوکاتە موشریك بوو وە عەلی کوڕی ئەبو طالیبیش کە نوسەری ڕێکەوتننامەکە بوو][٤٩٠].

## دەست درێژی تاقمێك لە موشریکەکان

کاتێك ڕێکەوتنی ئاشتەوایی سەریگرت و کۆتایی پێ هات تاقمێك لە موشریکەکان بەمە ڕازی نەبوون کە گرێبەستی ئاشتی سەربگرێت لەگەڵ موسوڵمانەکاندا بۆیە هەستان بۆ شێواندنی بارودۆخەکە دزەیان کردە ناو سەربازگەی موسوڵمانەکانەوە بۆ ئەوەی لەپڕ هەڵکوتنە سەریان لەکاتی بێ ئاگاییاندا تا ئەو کردەیەش هۆکارێك بێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست و پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ موسوڵمانەکان.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: [(لەبەرزایی تەنعیمەوە) هەشتا کەس لە خەڵکی مەککە بەچەکەوە هاتنە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی مەبەستیان بوو لە ناکاو هەڵکوتنە سەریان پێغەمبەر ﷺ بەبێ شەڕ دەستگیری کردن و ئازادی کردن بەبێ بەرامبەر][٤٩١].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە عەبدوڵلای کوڕی موغەفل ﷺ دەفەرموێت: [...ئێمە بەو شێوەمابووینەوە کاتێك سی گەنج بەچەکەوە لێمان دەرکەوتن و بەگوڕوتین و بەهەڵەداوان بەرەو ڕوومان دەهاتن، پێغەمبەر ﷺ دوعای لێکردن خودای گەورە توانای بینینی ئەوانی لە دەستدان و ئێمەش هەستاین چووینە سەریان و دەستگیرمان کردن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان:((هل جئتم في عهد أحدٍ أو هل جعل لكم احدٌ اماناً)) قالوا:لا، قال: فخلّى سبيلهم][٤٩٢].

---

(٤٩٠) اخرجه: البخاري (٢٧٣٦، ٢٧٣٢)، ومسلم (١٧٨٤)، واحمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن، وابوداود (٢٧٦٦، ٢٧٦٧)، وابن هشام (السيرة) (٢٦٨/٣)، وقال محققه: اسناده حسن، وعبدالرزاق (٩٧٢٠)، الطبراني (الكبير) (٢٠/٩)، واللفظ لاحمد وابن هشام والزيادات لمسلم والبخاري.

(٤٩١) اخرجه: احمد (١٢٢/٣)،ومسلم (١٨٠٨، ١٨٠٨، ١٨٧٤)،وابوداود (٢٦٨٨)، والترمذي (٣٢٦٤).

(٤٩٢) اخرجه: احمد (١٦٨٠٠) وقال محققه: حديث صحيح، والنسائي (الكبرى) (١١٥١١) وفي (التفسير) (٥٣١) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (٣٩١/٦)، والحاكم (٤٦١/٢) صححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٥٦/٥): اسناده صحيح، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٣٥٥): اسناده صحيح.

واتە: ((ئایە لەسەر پەیمانی چ کەسێك هاتوون یاخود کەسێك هەیە پەناگیرتن بێت)) وتیان نەخێر. فەرمووی: ((لێیان گەڕێن بابڕۆن بەرەڵایان بکەن]. 
لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە ژمارەیان حەفتا کەس بوو. سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك ئێمە و خەڵکی مەککە ڕێکەوتنمان مۆرکرد، بەجۆرێك تێکەڵاوی یەکتر دەبووین ئەوەندە لەیەکتر دڵنیابوون، من چوومە ژێر درەختێکەوە دڕکەکانیم لێکردەوە و بڕیم و لەژێر سێبەرەکەیدا ڕاکشام، چوار کەس هاتنە لام لە موشریکەکانی خەڵکی مەککە و دەستیان کرد بەقسەی ناشرین وتن دژ بەپێغەمبەر ﷺ منیش خۆم لێ گرژکردن چوومە ژێر درختێکی تر ئەوان چەکەکانیان بەسەریانەوە هەڵواسیو لێی پاڵکەوتن [قەتادە (رحمه الله) دەفەرموێت: کە کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ناوی (زونەیم) دەبێت، سەردەکەوێتە سەر قەدپاڵێك لە حودەیبیەدا، موشریکەکان بەتیر دەیپێکن و دەیکوژن]. سەلەمە دەفەرموێت ئێمە هەر بەو شێوە لە ژێر درەختەکاندا بووین لە ناکاودا بانگەوازکارێك لە ناو دۆڵەوەکەوە هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی کۆچەرەکان کوڕی زونەیم کوژرا دەفەرموێت: شمشێرەکەم هەڵکێشاو بەتوندی هەڵمکوتایە سەر ئەو چوار کەسی نزیکم ئەوان پاڵکەوتبوون منیش چەکەکانیانم کۆکردەوە و بەستمن بەیەکەوە و بەدەستەوە مگرتن پاشان پێم وتن: سوێند بەوەی ڕێزی لە محمد ﷺ ناوە هەرکەسێکتان سەری بەرز کاتەوە بەو شمشێرە لە کەللەی سەری دەدەم، ئینجا ئەوانم پێش خۆمدان و بەپاڵ پێوەنان بردمنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا عامیری مامیشم کەسێکی لە عەبلات هێنا [کەبەشێك بوون لە قورەیشی یەکان لە بەنی عەبدولداربوون] ناوی موکریز بوو بەسەر ئەسپێکەوە جڵەوی توند کردبوو ڕای دەکێشا بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ ئەسپەکەشی ئەسپێکی ئامادەکراو بوو (بەجۆرێك بەناسن داپۆشراو بوو کەچەك و شمشێر کاری تێ نەدەکرد) ئەویان هێنا لەگەڵ حەفتا کەس لە موشریکەکان پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێکردن و فەرمووی پێیان ((دعوهم، یکون لهم بدء الفجور وثناه)) واتە: ((بەرەڵایان کەن بابڕۆن، با دەست پێشخەری پەیمان شکێنی و خراپە کاریەکانی هەر بۆ ئەوانە بێت)) بەو جۆرە پێغەمبەری خودا ﷺ بەخشینی بەبێ بەرامبەر و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بەهۆی ئەو ڕووداوەوە ناردەخوارەوە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ

مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ (فتح: ٢٤)][(٤٩٣)]. واتە: ﴿هەر ئەو خوایە دەستی بێ باوەڕانی لە ئێوە بەستەوە (نەیهێشت بەگژتندا بێت) دەستی ئێوەشی گرتەوە دژیان و(نەیهێشت جەنگ ببێت) دوای ئەوەی ئێوەی زاڵکرد بەسەریاندا لەناو جەرگەی مەککەدا، خوا هەمیشەو بەردەوام بینایە بەوەی کەدەیکەن﴾.

## لابردنی ئیحرام و کۆتایی پێ هێنانی عومرە

موسوڵمانەکان دوچاری خەم و خەفەتێکی زۆر بوون لە دوای دانوستانی حودەیبیە و گەڕاندنەوەی ئەبو جەندەل بۆ مەککە و پەیمان شکێنی و ناپاکی موشریکەکان و نەگەیشتنیان بۆ کەعبەی پیرۆز و ڕێگە نەدانیان بەتەواف وبەجێهێنانی عومرە، لەوبارەوە مەیسەرەی کوڕی مەخرەمە ومەڕوان (رضي الله عنهما) دەفەرموون: (...کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێکەوتننامەکە بۆوە و کۆتایی پێ هات، فەرمانی کرد بە هاوەڵانی و فەرمووی: ((قوربانیەکانتان سەربڕن و سەرتان بتاشن)) وەڵاهی ئەوان یەک کەسیان هەڵنەستا بە ئومێدی ئەوەی خودای گەورە ڕێگا چارەیەکیان لەو بارەوە بۆ بدۆزێتەوە)[(٤٩٤)] [لەبەر ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەرچوون بۆ ئەم سەفەرە هیچ گومان و دوودڵیان نەبوو لە فەتح و سەرکەوتن، لەبەر ئەو خەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بینیبووی بەڵام کاتێک ئەوان ئەم کارەیان بینی بەپێچەوانەوە بەئاشتەوایی و ڕێکەوتن گۆڕا ودەبێت بگەڕێنەوە و ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ئەستۆی گرت و پێی ڕازی بوو بەلای خەڵکەوە ئەوە زۆر قورس و گران بوو کەخۆیان لەبەر ڕاگرن هەتاکو زۆری نەمابوو تیابچن][(٤٩٥)] و [هەتاکو سێ جار پێغەمبەر ﷺ ئەمەی دووپات کردەوە][(٤٩٦)] کاتێک هیچ کەسێک لە جێگای خۆی هەڵنەستاو

---

(٤٩٣) أخرجه: مسلم (١٨٣٠، ١٨٠٧)، واحمد (١٦٥١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني (الكبير) (٦٢٥٦).

(٤٩٤) أخرجه: احمد (٣٢٨/٤)، والبخاري (٢٧٣٢)، ابي داود (٢٧٦٥).

(٤٩٥) أخرجه: احمد (١٨٩١٠) وقال محققه: اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٢٦٨/٣) وقال محققه: اسناده حسن.

(٤٩٦) أخرجه: البخاري (٢٧٣١).

چێبەجێی نەکرد پێغەمبەر ﷺ هەستاو ڕۆیشتە لای ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) فەرمووی: ((یا أم سلمة الا ترین الی الناس، اني امرهم بالامر لا یفعلونه)). واتە: ((ئوم وسەلەمە نایا تەماشای ئەو خەڵکە ناکەیت چی بەسەر هاتووە، من فەرمانیان پێ دەکەم بەکارێك ئەوان پێی هەڵناستن)). ئومو سەلەمە وتی: "ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سەرزەنشتیان مەکە چونکە ئەو خەڵکە دوچاری کارساتێکی گەورەبوون و حەپەساون لەوەی کە تۆ پێ ڕازی بوویت و لەئەستۆت گرتووە لە ڕێکەوتنەکەدا، وە دەگەڕێیتەوە بەبێ ئەوەی هیچ فەتح و سەرکەوتنێك دەستکەوت بێت، برۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسە لەگەڵ کەسیان مەکە"[٢٩٧] هەتاکو قوربانیەکەی خۆت سەردەبڕی و ئینجا بانگی سەرتاشەکەت بکە با [سەرت بتاشێ، کاتێك خەڵکەکە تۆیان بینی ئەو کارانەت کرد ئەوانیش هەمان کاری تۆ دەکەن] پێغەمبەر ﷺ هەستا بەقسەی ئوموسەلەمە (رضي الله عنها) [لەلای ئەو چووە دەرەوە] کە هاتە دەرەوە قسەی لەگەڵ کەسیان نەکرد هەتاکو قوربانیەکەی خۆی سەر بڕی و پاشان بانگی سەرتاشەکەی خۆی کرد کە ناوی (خیراشی کوڕی ئومیەی) بوو ئەو هاتوو سەری تاشی، کاتێك خەڵکەکە بەو شێوە پێغەمبەریان بینی ﷺ ئەویش کەوتنە سەرتاشینی یەکتری بەجۆرێك خەریك بوو سەری یەکتری بریندار بکەن [لەبەر خەم و خەفەتی دڵیان] ئینجا وشترەکانیان سەربڕی و هەندێکیان سەریان بەتەواوی تاشی و هەندێکیشیان کورتیان کردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللهم اغفر للمحلقین ثلاثاً)) واتە: ((خوایە لەوانە خۆش بێ کەسەریان تاشیوە سێ جار ئەمەی دووبارەکردەوە)) وترا: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە؟ فەرمووی: ((ئەوانەش کە کورتیان کردۆتەوە))[٢٩٨]. [وترا: ئەی پێغەمبەری خودا: بۆچی سێ جار بۆ ئەوانەی سەریان تاشیوە داوای لێخۆش بونت کرد

---

[٢٩٧] اخرجه: البیهقي (الدلائل) (٤/١٥٠).

[٢٩٨] اخرجه: احمد (٤/١٦٥)، وابن ماجة (٣٠٤٤)، والترمذي (٩١٣)، وابي داود (٢٧٦٥)، والطبراني (الكبير) (٤/١٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٧٢٧)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٤٩٩)، و (صحيح ابي داود) (٢٣٠٣)، و (الارواء) (١٠٨٤) عن ابن عباس ﷺ.

بەڵام بۆ ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە تەنها یەك جار؟ فەرمووی: ((لەبەر ئەوەی ئەوان هیچ دوچاری گومان نەبوون))](٤٩٩).

[پێغەمبەری خودا ﷺ لەناو وشترەکانی (هدیه) دا وشترێکی ئەبو جەهلی کردە قوربانی کە ئەڵقەیەکی زیوی لە لوتیدا بوو بۆ ئەوەی موشریکەکانی پێ دوچاری ڕق و قین هەستان بکات](٥٠٠). موسوڵمانەکان حەفتا وشتریان کردە قوربانی هەروەك جابر ﷺ دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە حودەیبیەدا [حەفتا وشترمان کردە قوربانی کە هەر مانگایەك لەبری حەوت کەس بوو وە هەر وشترێك لەبەری حەوت کەس بوو](٥٠١) لەگێڕانەوەیەکی تردا [هەر وشترێك لەبری دە کەس بوو](٥٠٢) [ناجیەی کوڕی جوندب ﷺ هەندێك لە هەدیەکانی قوربانی بردە ناوچەی حەرەمی مەککە و لەوێدا سەری بڕین و کردینە قوربانی](٥٠٣) لە دوای هەموو ئەو ماوەیە موسوڵمانەکان دواجار ئیحرامیان داناو کەوتنە خواردنی قوربانیەکان و خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە بەرەو شاری مەدینە لە دوای ئەوەی بیست ڕۆژ لە حودەیبیە مانەوە ئەم گەشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حودەیبیە بە ڕویشتن و

---

(٤٩٩) أخرجه: البخاري (١٧٢٧)، ومسلم (١٣٠١)، وابي داود (١٩٧٩)، والترمذي (٩١٦)، وابن ماجة (٣٠٤٥)، وابن ابي شبة (٣٨١٠٦)، وابن هشام (٣/٢٠٤).

(٥٠٠) أخرجه: احمد (٢٣٦٢) وقال محققه: حديث حسن، ومالك (١/٣٤١)، وابوداود (١٧٣٢)، والترمذي (٨١٥)، وابن ماجة (٣١٠٠)، الحاكم (١/٤٦٧)، وصححه على شرط مسلم ووفقه اللذهبي، وابن هشام (٨٢٨)؛ وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (٥/٢٣٠) وقال: اسناده صحيح، صححه الشيخ الالباني (صحيح الترمذي) (٦٥٢)، و (صحيح ابي داود) (١٥٣٨) و (صحيح ابن ماجة) (٢٥١٦)، وصححه الشيخ المقبل ايضاً في (الصحيح المسند) (٦٨١).

(٥٠١) أخرجه: مالك (٢/٤٨٦)، والدارمي (٢/٧٨)، ومسلم (١٣١٨)، وابي داود (٢٨٠٩)، والترمذي (٩٠٤)، وابن ماجة (٣١٣٢).

(٥٠٢) أخرجه: الترمذي (٩٠٣)، وابن ماجة (٣١٣٣)، وابن حبان (٤٠٠٧)، وقال محققه: اسناده قوي على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني (صحيح الترمذي) (١٢١٣)، و (صحيح ابن ماجة) (٢٥٣٦).

(٥٠٣) أخرجه: الطحاوي (شرح معاني الآثار) (٢/٢٤٢)، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٢/٤٤٧): اسناده صحيح.

گەڕانەوە ومەانگ ونیوێکی خایاند هەروەك لە گێڕانەوەکەی ابن عائزدا هاتووە لەلای زەرقانی (شرح المواهب) (٢١٠/٢) خوداش باشتر دەزانێت.

## گەڕانەوە بەرەو مەدینە

پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بەرەو شاری مەدینە وە موسوڵمانەکانیش لە خزمەتی بوون و دووچاری خەم وخەفەتێکی زۆربوون هەروەك ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (سەرەتا سورەتی فتح هاتە خوارەوە (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا) واتە: ﴿بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست لەڕێکەوتنەکەی حودەیبیەیە)﴾ کە هاوەڵانی پێغەمبەر خەم وخەفەت دایگرتبوون (بەهۆی گۆڕینی بارودۆخەکە و کۆسپ هاتنە بەردەمیان بۆ جێبەجێ کردنی دروشمە ئاینیەکەیان ومناڕازیبوونیان بەسەر بڕینی قوربانیەکانیان لە حودیبیە لەجیاتی مەککە)[٥٠٤]. عوروە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبیە گەڕایەوە بەرەو مەدینە، کەسانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویان بەڕاستی ئەمە فەتح نەبوو قوڕەیش نەیهێشت بچینە کەعبەوە ومنەیان هێشت قوربانیەکانیشمان بگاتە ئەوێ و پێغەمبەری خوایان ﷺ ناچارکرد لە حودەیبیەدا بمێنێتەوە، وە دوو پیاوی موسوڵمانیش بگێڕنەوە گەڕایانکرد بووە ناومان، پێغەمبەر ﷺ وتەی هەندێك لە هاوەڵانی بەرگوێ کەوتەوە کەوتبویان: ئەم جارەمان نەسەرکەوتن بوو ومنەفەتح بوو. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بئس الكلام، هذا اعظم الفتح!، لقد رضي المشركون ان يدفعوكم بالراح عن بلادهم، ويسألونكم القضية، ويرغبون اليكم في الأمان وقد رأوا منكم ما كرهوا، وقد اظفركم الله عزوجل عليهم، وردكم سالمين غانمين مأجورين، فهذا اعظم الفتوح، انسيتم يوم الاحزاب ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾ (الأحزاب: ١٠))) واتە: ((خراپترین قسەیان کردووە، ئەوە گەورەترین فتح وسەرکەوتنە، کە موشریکەکان ڕازی بوون بەوەی ئێوە بە لەپێ دەستیان لەناو شارو وڵاتی خۆیان، وە داوای دانوستان وچارەسەری دۆخەکەتان بخەنە بەردەست، وە ئومێدو

---

[٥٠٤] اخرجه: البخاري (٤١٧٢،٤٨٣٣)، ومسلم (١٧٨٦).

هیوایان بە ئێوە بێت تا ئاسایشیان بەرقەرار بکەن وە ئەوەی حەزیان پێ نەدەکرد لە ئێوە چاویان پێ کەوت، خوای گەورەش ئێوەی بالآدەست کرد بەسەریاندا، وە ئێوەشی بەبێوەش و دەسکەوت و پاداشتەوە گەڕانە، ئەوە گەورەترین سەرکەوتنە، ئایا غەزای ئەحزابتان بیرچۆوە ﴿کاتێك دوژمنان لەسەرو خواروتنەوە هاتنە سەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبڵەق بوون دڵەکان گەیشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی ئیمانداران)﴾. موسوڵمانەکان فەرموویان خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە ئەوە گەورەترین فەتح وسەرکەوتنە وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە بیرمان لەوە نەکردۆتەوەکە کە بەبیری تۆ دا هاتبوو، وە تۆ لە ئێمە زاناو شارەزاتریت بەرامبەر بە خواو کاروبارەکانی، خوای گەورەش لەوێدا سورەتی (الفتح)ی دابەزاند))[٥٠٥].

زەیدی کوڕی ئەسلەم ﵁ دەگێڕێتەوە لەباوکیەوە دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ (لەگەڕانەوەی حودەیبیەدا) دەڕۆیشت لە شەودا....عومەری کوڕی خەطابیش لەخزمەتیا بوو، عومەر پرسیارێکی لێ کرد وەڵامی نەدایەوە پاشان دووپاتی کردەوە هەر وەڵامی نەدایەوە، بۆجاری سێیەم پرسیارەکەی کرد هەر وەڵامی نەبوو، عومەر بەخۆی فەرموو: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆبکات (ئەی عومەر لە بەردەم پێغەمبەری خودا ﷺ دا پێداگری دەکەیت و سێ جار پرسیار دووبارە دەکەیتەوە) بێ ئەوەی هیچ وەڵامێکت بدرێتەوە، عومەر ﵁ دەفەرموێت: لە وشترەکەم خوڕی هەتاکو چومە پێش خەڵکەکەوە، ترسی ئەوەم هەبوو قورئان لە بارەمەوە دابەزیت))[٥٠٦].

لەو کاتەدا سورەتی فەتح دابەزی و وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ باری قورس و گران بوو بە هۆی وەحیەکەوە هەروەك ابن مەسعود ﵁ دەفەرموێت: لەوبارەیەوە: (کاتێك پێغەمبەری

---

[٥٠٥] أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٤/١٦٠).

[٥٠٦] أخرجه: البخاري (٤١٧٧،٤١٧٨)، وابوداود (٢٧٣٦).

خوا ﷺ لە حودەیبیە دەگەڕایەوە، وشترەکەی باری قورس وگران بوو نەدەڕۆیشت ئێمە پێش کەوتین ئەوە بوو سورەتی (إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا) بۆهاتەخوارەوە)(٥٠٧).

عومەر ﷺ فەرمووی: [لەشوێنی خۆم چەقیم وجوڵەم لێ بڕا کە گویم لێبوو هاوارکارێك هاواری دەکرد وترسی ئەوەم هەبوو قورئان لەبارەی منەوە بێتە خوارەوە] خەڵکەکەم بینی لە وشترەکانیان دەخوڕی هەندێکیان بەهەندێکیان دەوت: ئەوە خەڵکان بۆ خڕبوونەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا ئێمەش بە خێرایی و هەڵەداوان ڕۆیشتین لەگەڵ خەڵکەکە تا پێغەمبەری خوامان بینی بەپێوە وەستابوو لەناوچەی (کوراع غەمیم) [بینیمان ڕویکەش بوو و ڕوخۆشیەك ڕووی تێکردووە هەر مەپرسە](٥٠٨). عومەر ﷺ دەفەرموێت: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامم لێ کرد و لەخزمەتیدا بووم فەرمووی: ((لقد انزلت عليّ الليلة سورةٌ لهي احب اليّ مما طلعت عليه الشمس)). واتە: ((ئەم شەو خودا سورەتێکی بۆ ناردم لە لام خوشەویسترە لە هەموو ئەوانەی کە ڕۆژی بەسەردا هەڵدێت) پاشان سورەتی فەتحی خوێندەوە ﴿ إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١ لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ (الفتح: ١ -٢))(٥٠٩). کەسێك لە هاوەڵان فەرمووی ئەوە فەتح بوو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اي والذي نفسي بيده انه لفتحٌ)) واتە: [سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەوە فەتح و سەرکەوتن بوو](٥١٠)، فەرموویان: [پیرۆزت بێت و شایستەی خۆتە](٥١١)، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خودا بۆی ڕونکردویتەوە کەچی بەتۆ بەخشیوە ئەی ئەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێت؟ ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دوای ئەو

---

(٥٠٧) أخرجه: البخاري (٤٨٣٣)، والبيهقي (الدلائل) (١٥٥/٤)، وابوداود (٤٤٣)، والنسائي (الكبرى) (١١٩).

(٥٠٨) أخرجه: البخاري (٤٨٣٣).

(٥٠٩) أخرجه: البخاري (٤١٧٧).

(٥١٠) أخرجه: احمد (٢١٥/٣)، وابي داود (٢٧٣٦)، والحاكم (١٣١/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

(٥١١) أخرجه: البخاري (٤١٧٢).

ناردە خوارەوە﴿ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ (فتح: ٥))[٥١٢]، واتە: ﴿ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەی تا ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان بخاتە ناو بەهەشتێکەوە کە چەندەها رووبار بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشك و تەلارەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەمریدا، هەروەها بۆ ئەوەی کە چاوپۆشی لە هەڵە و گوناهەکانیان بکات و ئەم بەڵێنە لەلایەن خواوە دەسکەوت و سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بێ سنوورە بۆ ئیمانداران﴾.

لەڕێگادا پێغەمبەرو موسوڵمانەکان بە کێوێکدا تێپەڕین کەوتبووە نیشینگەی بەنی لەحیان ئەو خێڵەی پەیمان شکێنی وستەم کاریان کرد بەرامبەر بە هاوەڵانی (رەجیع) وشەهیدیان کردن لەو ناوچەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خودا پاڕایەوە و نزای خێری بۆ ئەوانە کرد کە سەردەکەون بۆ سەرکێوەکە وەك پێشڕەوی سوپای موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی ترس بخەنە دڵی دوژمنەوە تا نەتوانن ڕووبەڕووی موسوڵمانان ببنەوە، لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ دەفەرموێت: (.... پاشان دەستمان کرد بە ڕۆیشتن بەرەو مەدینە لە نیشتگەیەك دابەزین لەوێدا کێوێك دەکەوتە نیوان ئێمەو بەنی لەحیان (بێی دووترا: هەواری وشترەکە) کەبت پەرست بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەو کەسانە کرد (کەلەو شەوەدا) بەگورجی بەسەر ئەو کێوە کەوتن وەك دەستەی پێشڕەوی پێغەمبەرو هاوەڵانی، من لەو شەوەدا دوو جاریان سێ جار بەسەر ئەو کێوەدا سەرکەوتم)[٥١٣].

موسوڵمانەکان لە شوێنێکی نەرم وفشەڵ دابەزین بۆ نوێژی بەیانی بەڵام خەبەریان نەبووەوە، و هەڵنەستان هەتا ڕۆژ لە خەو بێداری کردنەوە پاشان دوای ئەوە نوێژی بەیانیان کرد، لە ئیبنو مەسعوودەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد

---

(٥١٢) أخرجه: احمد (٣/٢١٥)، ومسلم (١٧٨٦)، والبخاري (٤١٧٢)، والترمذي (٣٢٦٣)، وابن حبان (٣٧٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطها.

(٥١٣) أخرجه: احمد (١٦٥١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، واخرجه: مسلم (١٨٠٧،١٨٣٠).

بەگەڕانەوە لە حودەیبیە بەشەو دەڕۆیشتین لە خزمەتیا، لەخاکێکی نەرم و فشەڵ دابەزین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (کێ ئەم شەو دەبێتە ئێشکگرمان؟) دەفەرموێت: بیلال وتی من (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: (کەواتە دەخەویت) وتی: نەخێر، ئەوە بوو لەخەو خەبەریان نەبۆوە تا خۆر هەڵات وە فلان وفیسار هەڵسان عومەریشیان لەگەڵدابوو، پێغەمبەر ﷺ هەر خەبەری نەبووەوە (عومەر) ﷺ فەرمووی: (بیکەن بە دەنگە دەنگ و نە بەڵکو خەبەری بێتەوە) ئەوە بوو پێغەمبەریش ﷺ بەخەبەر هات و فەرمووی: ((افعلوا کما کنتم تفعلون [ان الله لو شاء ان لا تناموا عنها لم تناموا ولکن اراد ان یکون ذلك لمن بعدکم])) واتە: ((هەروەك چۆن لەوە و پێش نوێژتان کردوە هەر بەو شێوەیە وەك کاتی خۆی نوێژ بکەن (ئەگەر خودا ویستی لێ بووایە خەوتان لێ نەدەکەوت لەکاتی نوێژەکەدا بەڵام خودا ویستی وابوو وەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ ئەوانەی لە دوای ئێوە دێن ئەگەر هەمان شتی ئێوەیان بەسەر هات وەك ئێوە بکەن) (پاشان هەستا هەروەك کاتی خۆی نوێژی کرد) ئینجا فەرمووی: ((هکذا لمن نام منکم أو نسي)) واتە: ((بەوشێوەیە نوێژ بکەن کاتێ یەکێك لە ئێوە بەخەبەر نەهات یاخود لە بیری چوو))[٥١٤].

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (ئەوە بو وشترەکەی پێغەمبەرﷺ و وشترەکانی خەڵکەکە لەوێدا بڵاوەیان لێ کردبووخەڵکەکەش ڕۆیشتن بە شوێنیاندا، وشترەکانیان هێنایەوە تەنها وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێت (ئیبنو مەسعود ﷺ)دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: (ئادەی لێرەوە بڕۆ بەدوایدا) ئاماژەی بۆ لایەك بۆ کردم منیش بەو ئاراستەیەی ئەو ئاماژەی بۆکرد گرتمە بەر) تا دۆزیمەوە کە جڵەوی لە درەختێك ئاڵابوو وەڵڵاهی جڵەوەکەی بەدەست نەبووایە نەدەکرایەوە، ئینجا کردمەوە و بردمەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای درەختێك

[٥١٤] أخرجه: احمد (٣٦٥٧) وقال محققه: اسناده حسن، وابوداود (٤٤٣)، والطیالسي (٣٧٧)، وابن ابی شیبة (٣٨٠١٧)، وصححه الشیخ الالباني في (صحیح ابي داود) (٤٢٧) و (الارواء) (٢٩٣/١).

دیمەوە جلەوەکەی بە درەختێکەوە لولی خوارد بوو تەنها بەدەست نەبووایە نەدەکرایەوە)[٥١٥].

لە کاتی گەڕانەوەدا موسوڵمانەکان دوچاری برسیتی و تونێتیەکی سەخت بوون، هەروەك لە جابرو ئیبن وعەباسەوە ﷺ دەفەرموون: (لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕایەوە لەحودەیبیە)[٥١٦] (خەڵکەکە تینویەتی زۆری بۆ هێنان)[٥١٧]. کاتی نوێژی عصر هات هیچ ئاومان پێ نەما تەنها تۆزێك لەناو دەفرێکدا بەبێت هەموویان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ)[٥١٨]، ((کردیانە) بەردەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو تەشتێك دایان نا ئەویش دەست نوێژی تێداگرت وپاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: (ئەوە چیتانە؟ فەرموویان: ئەی پێغەمەری خوا ﷺ هیچمان ئاو بەدەستەوە نەما وە نەئاوی خواردنومو نە ئاوی دست نوێژ تەنها ئەوە نەبێت کە لەناو (ئەو تەشتەی) بەردەستدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کردە ناو تەشتەکەوە)[٥١٩]. ئەنجا پەنجەکانی دەستی تیا بڵاوکردەوە و ئاو لەنێوان پەنجەکانیەوە دەرچوو فەرمووی: ((حي على اهل الوضوء والبركة من الله)) واتە: (وەرن دەست نوێژ بگرن فەرو زیاد و پیرۆزیش هەر لە خواوەیە) منیش ئاوم دەبینی بە چاوی خۆم لەنێوان پەنجەکانیەوە هەر هەڵدەقوڵا وەکو چۆن لەکانی هەڵدەقوڵێت خەڵکەکەش دەست نوێژیان گرت و لێشیان خواردەوە (جابرﷺ دەفەرموێت) هەرچی لەو ئاوە دەچووە ناو سکمەوە دڵنیابووم بەرەکەت و فەڕی زۆری پێوەیە)[٥٢٠].

---

[٥١٥] أخرجه: احمد (٣٧١٠) وقال محققه: والقصة اخرجها الطبري (جامع البيان) (٦٩/٢٦) باسناد حسن؛ وابويعلى (٥٢٨٥)، والطبراني (الكبير) (٢٢٥/١٠).

[٥١٦] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١١٩/٤).

[٥١٧] أخرجه: البخاري (٤١٥٢)، (٣٥٧٦).

[٥١٨] أخرجه: البخاري (٥٦٣٩).

[٥١٩] أخرجه: البخاري (٤١٥٢)، (٣٥٧٦).

[٥٢٠] أخرجه: البخاري (٥٦٣٩).

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: (هەموو دوچاری ماندویەتی و ناڕەحەتیەکی لە ئەندازە بەدەر هاتین هەتا هەندێکمان بۆچونمان وابوو کە وشترەکانمان کە کۆڵ و باریان هەڵگرتبوو سەریان بڕین] هەندێك لە هاوەڵان لەو بارەوە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وفەرموویان: ئەو ڕێگایە زۆر ماندو شەکەتی کردوین هەندێك لە خەڵکەکەش وشتری زیادیان پێیە بۆ بار فەرمان بکە با سەری بڕن بۆمان ولەگۆشتەکەی دەخۆین وە لەڕۆن وچەوریەکەی کەڵك وەردەگرین وە لە پێستەکەشی پێڵاوی لی دروست دەکەین؟ عومەر ﷺ فەرموی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارە مەکە ئەگەر خەڵکەکە شتێکی کەمیان لە خۆراك پێمابێت ئەوە باشترە دابەش بکرێت بەسەریاندا)[٥٢١]، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد تا سفرەیەکی بۆ دابخەین پاشان سفرەکەی بۆ داخرا ئەوە بوو هەرچی قووت وخۆراکی خەڵکەکە هەبوو لەسەر سفرەکە دانرا (سەلەمە ﷺ دەفەرموێت): لێکمان کردەوە بۆ ئەوەی کۆیان کەینەوە لەسەری ئەکەوێتە خواردوە؟ درێژیەکەی تەنها بە ئەندازەی جێگای نوستنی بزنێك بوو ئێمە ژمارەمان هەزارو چوارسەد کەس بوو هەموومان لێمان خوارد هەتا تێربووین پاشان خستمانە ناو هەمبانەکانمانەوە و هەڵمان گرت)[٥٢٢].

پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی کرد لە کاتێکدا هێشتا لەگەڕانەوەدا بووین، جابر ﷺ دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاینەوە لە حودیبیەدا هەتا لە (سوقیا) دابەزین (کە ناوێکە (٩٦ میل) لە مەدینەوە دوورە) موعاذ ﷺ دەفەرموێت: کێ دێت با بچین ئاو هەڵێەنجین لە ئاوەکانی خۆمان؟ دەفەرموێت: من ڕۆیشتم لەگەڵ چەند گەنجێکی (ئەنصاری) هەتا گەیشتینە سەر (ئاوەکەی) کە لە ناوچەی (ئەثایە) بوو (کە (١٢٠)کم لە مەدینەوە دوورە) ئاومان لێ هەڵێنجا و خواردمانەوە، لە دوای ئەوەی شەو تاریك بوو پیاوێکمان بینی لە وشترەکەی دەخوڕیت بۆ سەر حەوزی ئاوەکە (دەفەرموێت: بێینە پێش تا ئاو بخۆین)؟ ئێمە سەیرمان کرد (ئەو کەسە) پێغەمبەری خوا ﷺ بوو (وشترەکەی ئاو دەدا) و (جڵەوی) دەگرت و پاشان یەخی کردو ئەویش چۆکی دادا، پاشان پێش کەوت و

---

[٥٢١] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/١١٩).

[٥٢٢] أخرجه: احمد (٤/٥٢)، ومسلم (١٨٠٧)، وابن ابي شيبة (المصنف) (١٤/٥٣٣)، وابوداود (٢٧٥٢).

نوێژی عیشای بەجەماعەت بۆ کردین، ومنیش لە لای راستیەوە وەستابووم، پاشان [لە دوای نوێژی عیشاوە] سیانزە ڕکاتی کرد [دووڕکات دووڕکات، کۆتایەکەش یەك ڕکاتی وتر بوو، و پاشان دوو ڕکاتی سونەتی بەیانی کردو پاشان پێش نوێژی بەیانی بۆ ئێمە کرد[٥٢٣].

## ڕاکردنی ئەبو بەصیر

یەکێك لە پاڵەوانەکان ڕایکردە ناو موسوڵمانەکان موسوڵمانەکانیش بەپێی ڕێکەوتنامەی حودەیبیە گێڕایانەوە بۆ قورەیش، ئەو پاڵەوانەش ڕایکرد و جەنگی پارتیزانی هەڵگیرساند لە دژی قورەیش تا دواجار دووچاری ڕیسوای وسەر شۆڕی کردن لە ئەنجامدا بووە هۆی پاشەکشەی قورەیش وپاشگەز بوونەوەیان لەیەکێك لە بەندە سەرەکیەکانی ڕێکەوتن نامەکە ئەویش گێڕانەوەی موسوڵمانە نوێ وسەرەتاکان بوو بۆ ناو قورەیش تا لەئەنجامدا قورەیش تکایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە وەریان بگرێت و جێگەو ڕێگەیان لای خۆی بۆ دابین بکات.

ئەم ڕوداوەش هەریەکە لە ئیبن ئیسحاق و موسا کوڕی عوقبە وعوروەی کوڕی زوبیر ﷺ دەیگێڕنەوە لەگەڵ گێڕانەوەکەی مەیسەرە و مەروان لای بخاری و ئەحمەد وئەبو داود لە دوای کۆکردنەوەی هەموویان و ڕێکخستنیان ڕووداوەکە بەم شێوەیەی خوارەوەی لێهات: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە مەدینە، پیاوێك لە موسوڵمانەکان هەڵگەڕایەوە و لە هۆزی ئەقیف.

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (لە قورەیش بوو) پێیان دەوت: ئەبو بەصیر ناوی خۆی ئوسەیدی کوڕی جاریەی ئەقەفی بوو (لەوانەبوو کە پێشتر لەبەر موسوڵمان بوون بەندیان کردبوون لە مەککە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسوڵمانێتی وکۆچکردوی (کاتێك گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەزهەری کوڕی عەمری کوڕی وەهبی ئەقەفی

---

(٥٢٣) أخرجه: أحمد (١٥٠٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح، وفي (فضائل الصحابة) (٩٧٧)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٨٥٧٥)، والبزار (٧٢٩)، وابي يعلى (٢٢١٦)، وابن خزيمة (١٠٧٥، ١٥٣٦)، وابن حبان (٢٦٢٨)، وحسّن اسناده كلّ من الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٩١)، والبوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٨١).

نوسراوێکی نوسی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئەبو بەصیرەوە بەپیاوێکی بەنی عامیری کوڕی بۆی ناردی) لە خۆیان کەناوی جەحشی کوڕی جابر بوو کە خاوەنی خزم و کەس وکار بووە ڕاوبۆچوونی وەردەگیرا لە ناو موشریکەکان (وەخزمەت کارێکی خۆشیان نارد لە گەڵیدا) ڕەنەخەنەسی کوڕی شورەیقی ئەقەفیش نامەیەکی پێدان بۆ داوا کردنەوەی ئەبو بصیر ئەوان ڕۆیشتن تا (گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ونامەکانی ئەزهەر و ئەخنەسیان پێدا) (وتیان: بەپێی ئەو پەیمانەی کە نیوانماندا هەیە پێمان بدەوە) (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یاابا بصیر انا قد اعطینا هؤلاء القوم ماقد علمت، ولایصلح لنا في دیننا الغدر، وان الله جاعل لك ولمن معك من المستضعفین فرجا ومخرجا، فانطلق الى قومك)). واتە: ((ئەبو بەصیر خۆت دەزانی ئێمە چیمان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا مۆر کردوە ورێکەوتوین، بۆ ئێمە ناگونجێت کە پەیمان شکێنی بکەین لە ئاینەکەمان، وە خوای گەورە پاڵپشتی تۆ و ئەوانە دەکات کە لەگەڵ تۆدان لە چەوساوەکان و دەروی خێرتان لێ دەکاتەوە و ڕزگارتان دەکات، ئێستاش بڕۆرەوە بۆ ناو خزمو کەسەکارەکانت)).ئەویش وتی: پێغەمبەری خودا ئایا دەمگێڕیتەوە ناو موشریکەکان تا سزام بدەن لەسەر ئاینەکەم؟ پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((یاابا بصیر انطلق فان الله تعالى سیجعل لك ولمن معك من المستضعفین فرجاً ومخرجاً)). واتە: ئەبو بەصیر لەگەڵیاندا بگەڕێرەوە و دڵنیابە خودای گەورە دەروی خێر و ڕزگار بوون لەتۆ و چەساوەکانی تر دەکاتەوە.

[پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەستی دوو کەسە نێردراوەکەی کردەوە] ئەویش لەگەڵیان کەوتە ڕێ (ئەوانیش بردیان) هەتا گەیشتنە ناوچەی (ذي الحلیفة) لەوێدا دابەزین وەلایان دا وکەوتنە خواردنی ئەو خورمایەی کەپێیان بوو) (ئەبو بەصیر) پاڵیدا بوو بە دیوارێکەوە دوو هاوەڵەکەشی لەگەڵیدا دانیشتبوون) ئەبو بەصیر فەرمووی: ئایا شمشێرەکەت بڕندەو تیژە ئەی برای خێلی عامر (وەڵاهی من شمشێرەکەتم زۆر پێ باشە)؟ ئینجا جەحش شمشێرەکەی هەڵکێشاو پاشان ڕایوەشاند و وتی) (بەڵێ وەڵڵاهی شمشێرێکی باشەبە دڵنیاییەوە تاقیمکردۆتەوەجار لەدوای جار).

ئەبو بەصیر فەرمووی: ئادەی بیدەرە دەستم تا سەیرێکی بکەم (وتی ئەگەر حەز دەکەیت سەیری کە) ئەویش لێ وەرگرت (ئەبو بەصیر گرتی بە دەستیەوە) هەرکە گرتیی و

دەستی لێ توند کرد ئینجا کەوتە لێدانی بەو شمشێرە هەتا (کوشتی) وە گوتراوە ئەبو بەصیر شمشێرەکەی بۆ ڕزگار کردنی خۆی بەدەمی دەست خستوە لەکابرای نێردراو کاتێک ئەو نوستووە و کۆت و بەندەکەی دەستی پێ بچڕاندوە، پاشان کەوتۆتە سەری هەتا کوشتویەتی پاشان کەوتوەتە دوای ئەوەکەی تریان (ئەو بەندیەش بە پەلە) وشلەژان و ترسەوە بە دزیەوە کەوتوەتەڕاکردن بەرەو مەدینە (کاتێک گەیشتە مەدینە بە هەڵە داوان خۆی کرد بەناو مزگەوتدا) و بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت کە لەناو مزگەوت دانیشتبوو، کاتێک دەرکەوت وە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێکەوت فەرمووی: ((ان هذا الرجل قد رأى فزعاً)) واتە: (ئەو پیاوە پێ دەچێت ترسابێت و شتێکی لێ بەسەر هات بێت) هات بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ و داوای یارمەتی پەنادانی لێ کرد (پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (هاوار بەماڵت ئەوە چیتە؟) وتی: (وڵڵاهی هاوەڵکەت (هاوەڵەکەمی کوشت ومنیش دەکوژرێم) (وڵڵاهی هێشتا کابرا ئەو جێگەیەی خۆی جێ نەهێششتبوو کە ئەبو بەصیر دەرکەوت و شمشێری بە قەدیا کردبوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا وسڵاوێکی لێکرد و (فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) (خوای گەورە ئێمەی لەسەر ئەستۆی تۆ لابرد) (تۆ بەئەمەك بووی بەرامبەر بەخوا لەسەر ئەوەی لە توانای تۆدا بوو) (تۆ منت گێڕایەوە بۆ لایان) منیش لێم ڕوون وئاشکرابوو کە ئەوانە دوجاری سزاو ئازارم دەکەن و لە ئاینەکەم پاشگەزم دەکەنەوە (ئاینەکەم ڕێگەی نەدام کە دووجاری پاشگەز بوونەوەم بکەن یاخود ببمە گاڵتە جاڕی ئەوان) (ئەوە بوو خوا ڕزگاری کردم لە دەستیان منیش ئەوەی لەگەڵی نێردرابووم کوشتم و ئەوەش لەدەستم ڕایکرد ئەبو بەصیر کەلوپەلی کوژراوەکەشی هێنابووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: وەك پێنج یەك دیاری بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اني اذا خمسته لم أوف لهم بالذي عاهدتهم عليه، ولكن شأنك بسلب صاحبك [وقال: ((ويل امه] مسعر حرب لو كان معه أحدٌ)) واتە: (من ئەگەر پێنج یەکی لێ دەرکەم ئەوە بە ئەمەك نەبووم بەرامبەریان لەسەر ئەوەی لەگەڵیان ڕێکەوتوم بۆیە کەلوپەلی هاوەڵەکەت پەیوەندی بەخۆت ومیە![ وە دەفەرموێت ((دایکی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات)) ئەمە ئەگەر کەسێکی تری لەگەڵدا بووایە جەنگ و هەرای هەڵدەگیرساند) (کاتێک ئەمەی لە پێغەمبەر ﷺ بیست بۆی دەرکەوت کە ئەو جارێکی تر

ڕادەستی موشریکەکانی مەککەی دەکاتەوە) ئەبوبەصیر ڕۆیشت و پێنج کەسیشی لەموسوڵمانەکانی مەککە لەگەڵ کەوت کە لەگەڵ خۆی هاتبوون لەمەککەوە بەڵام کەس داوای نەکردنەوە وقوڕەیشی یەکان شاندیان نەناردبوو بە دوایاندا وەك ئەبو بەصیر، هەموو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە نێوان (عیص) و (ذي المروة) لە خاکی جوهەینە لەسەر ڕێگای کاروانی بازرگانی قوڕەیشی یەکان کەلەدوایانەوە ڕاستەوخۆ (سەیف البحر) بوو لەوێ گیرسانەوە و هیچ کاروان و کۆڵ و بارێکی قوڕەیش تێ نەدەپەڕی مەگەر هەڵیان دەکوتایە سەری و کاروان چیەکانیان دەکوشت وماڵەکانیشیان دەست بەسەردا دەگرت ئەبو بەصیر زۆر ئەم دەستەواژەیەی دوپات دەکردەوە: خودا هەرەبەرز و گەورەیە هەر کەسێك ئاینەکەی سەرخات خودا پشتیوانی دەکات و سەری دەخات هەموو ڕووداوێکیش بەپێی ئەو ئەندازەیە کە بۆی دانراوە. [فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە بەئەبوبەصیری فەرموو: ((دایکی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات ئەمە جەنگ (هەڵدەگیرسێنێت) ئەگەر کەسانی تری لەگەڵ بێ)] ئەو فەرمایشتە گەیشت بەموسوڵمانەکانی مەککە کە بەنداکرابوون و دەست بەسەر بوون ئەوانیش بەهەر جۆرێك بوو خۆیان گەیاندە لای ئەبوبەصیر و پەیوەندیان پێوەکرد لەناوچەی (عیص)دا] وە ئەبوجەندەل کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمری عامیریش بە(شەست کەسەوە) ڕایکرد بەرەو لای ئەبوبەصیر][524]. [یاخود نزیکەی حەفتا کەس کە موسوڵمان ببوون هەموو کۆچیان کرد و پەیوەندیان کرد بەئەبوبەصیرە وەپێیان خۆش ئەبوو بچنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کە هێشتا لەڕێکەوتن و ئاشتەوایدایە لەگەڵ قوڕەیش وەحەزیشیان نەدەکرد بەژێر دەستەیی لە ناو خزم و کەسی خۆیان بمێننەوە، هەموو ئەوانە چوونە خزمەت ئەبوبەصیر لەجێگە یەکدا لەسەر ڕێگا بازرگانی قوڕەیش دابەزیین.

[ ئەوان گوێ بیستی دەرچوونی هەر کاروانێکی قوڕەیش ببونایە بەرەو شام هەڵیان دەکوتایە سەریان و ڕێیان پێ دەگرتن و خەڵکەکەیان دەکوشت و ماڵەکانیشیان دەست بەسەردا دەگرت] و بەو جۆرە ڕێگای بازرگانی قوڕەیشیان بەرەو شام بەتەواوەتی دەست بەسەردا گرت و قوڕەیش توانای هاتوچۆیان نەما، ئەبو بەصیر سەرکردایەتی دەکردن وپێش نوێژی بۆ دەکردن، تا ئەبوجەندەل گەیشتە لایان ئینجا ئەو پێش نوێژی بۆ دەکردن،

(524) أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٩/٢٢٧)، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٢/٤٥١): حديث حسن.

کاتێك دەنگ وباسی هاتنی ئەبوجەندەل بەر گوێی خەڵکی کەوت ئەوکات خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبونەوە لەهۆزەکانی غیفارو ئەسلەم و جوهەینەو خەڵکانی تریش، هەتاکو ژمارەیان گەیشتە سێ سەد موسوڵمان [کاتێك بێ باوەڕەکانی مەککە ئەم دۆخەیان چاو پێکەوت] قورەیشی یەکان [شاندێکیان کەچەند سوارێك دەبوون] بەرەو خزمەتی پێغەمبەر ﷺ چوون [لەناویاندا] ئەبو سوفیانی کوڕی حەرەب هەبوو ئەوان تکایان لێکرد وە [داوایان لێی کرد لەبەر خودا و پاشان لەبەر پەیوەندی خزمایەتیان] باپێغەمبەرﷺ بنێرێت بۆ لای ئەبو بەصیر و ئەبو جەندەل کوڕی سوهەیل و هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیاندان با دەست لە کاروانەکانیان هەڵگرن وبگەڕێنەوە ناو شاری مەدینە، (شاندەکەی قورەیش) ئەوەشیان خستە بەردەم پێغەمبەر ﷺ وتیان: هەر کەسێك لە ناو ئێمە حەزی کرد بێتەلاتان ئێوە گلی بدەنەوە لای خۆتان هیچ گرفتێکی تێدا نیە چونکە ئەو تاقمە دەرگایەکی تریان کردوتەوە [کەئێمە پێمان خۆش نی یە ئەمە ببێتە ڕێ و شوێنێکی تازەی چەتەگەری دواتر بێتە نەریت و ڕێگاوبانمان لێ بگرن][٥٢٥] [ئەو بەندەی کە لە ڕێکەوتنامەکەدا هەیە ئێمە هیچ سود و کەڵکێکمان لێ نەدیووە بەڵکو بەهۆیەوە ئێمە دوچاری کوشتن و تاڵان کردنی ماڵ و سامانمان بووین بەدەستیان لەبەر ئەوە ئێمە داوات لێ دەکەین ئەوانەی کە موسوڵمان بوون لە ئێمە ڕێگەیان بدە بابێنە ناو ئێوە و تۆش بیانگرەخۆ و و ڕێگەیان مەدە شەڕمان لەگەڵ بکەن][٥٢٦]. [ئێمە وادەبینین کە تۆ پەیوەندی خزمایەتی پتەو دەکەیت هەر لەبەر ئەوە داوات لێ دەکەین بیان گێڕەوە و لای خۆت کۆیان بکەرەوە][٥٢٧].

[کاتێك قورەیش ئەو کارەیان کرد.... ئەو کات ئەو کەسانەی داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردبوو کە ئەبوجەندەل لەبن دەستی قورەیش دەربێنێت لە دوای ڕێکەوتنەکە بۆیان دەرکەوت کە: گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا ﷺ باشترەبۆیان لەوشتانەی ئەوان پێیان خۆشە یان پێیان ناخۆشە چونکە بیروڕا هەندێك جار گومان و دوودڵی تێدا دەبێت بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ هێزو توانای زیاتریان پێ دەبەخشێت چونکە خودای گەورە

---

(٥٢٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٧٦/٤)، من رواية عروة بن الزبير.

(٥٢٦) أخرجه: احمد (١٨٩٢٩) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٥٢٧) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨٠١٠) وقال محققه: اسناده حسن مرسل.

هەندێك تایبەتمەندی تری بەخشیوەتە بە پێغەمبەر ﷺ وەك هاوکاری و یارمەتی و ڕێزو پایەی تایبەت، پاشان پێغەمبەر ﷺ (نامەیەکی) نوسی و ناردی بۆ لای ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل]. و ئەبو بەصیر و ئەو کەسانەی لە موسوڵمانان کە لەگەڵیاندا بوون و شوێنیان کەوت بوون هەموو بێنەوە ناو مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ.... نوسراوەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەروەك باسکراوە گەیشتوەتە دەست ئەبو جەندەل و ئەبو بەصیر، ئەبو بەصیر لەوکاتەدا لەسەرەمەرگدا بووە، هەر لەوێدا ئەبو بەصیر وەفات دەکات وئەبو جەندەل بەخاکی دەسپێرێت.... پاشان ئەبو جەندەلیش بەخۆیی و هاوەڵانی هەموو هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ.

[پێغەمبەری خودا ﷺ لەمەدینەدا بوو جێگاو ڕێگای بۆ دابین کردن]....بەو جۆرەش ئارامی و ئاسایش گەڕایەوە بۆ کاروانەکانی قوڕەیش][٥٢٨]. [پاشان چەند ئافرەتێکی باوەڕدار هاتن بەرەو لای (پێغەمبەری خودا ﷺ)][٥٢٩] وە [کۆچیان کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ناویاندا ئوم کەلثومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبو موعیطی تێدا بوو لەکاتی ئاگر بەست و ڕێکەوتنەکەدا بوو (ئوم کەلثوم ئافرەتێکی ئازاد بوو) براکانی عومارەو وەلیدی کوڕانی عوقبە بەدوایدا هاتن هەتا گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و کەوتنە گفتوگۆ لەبارەی ئوم کەلثومی خوشکیان بۆ ئەوەی بیاگێڕنەوە بۆیان بەپێی ڕێکەوتننامەی حودەیبیە کەلەنێوان خۆیی و قوڕەیشدا مۆریان کردبوو، خوای گەورەش ڕازی نەبوو بەناردنەوەی ئەو ئافرەتانە پێغەمبەری خواش بەمەڕازی نەبوو ڕەتی کردەوە] خوای گەورە ئەوەی هەڵوەشاندەوە لەنێوان پێغەمبەر و موشریکەکان بەتایبەت لەبارەی ئافرەتانەوە

---

(٥٢٨) أخرجه: البخاري (٢٧٣٢)، واحمد (١٨٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابي داود (٢٧٥٦)، وابن هشام (السيرة) (٢٧٧/٣) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (١٧٢/٤) عن موسى بن عقبة واللفظ له والزيادة للبخاري وابن هشام واحمد وابن ابي شيبة.

(٥٢٩) أخرجه: احمد (١٨٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط الشيخين، والبخاري (٢٧٣١، ٢٧٣٢)، وعبدالرزاق (٩٧٢٠)، وابوداود (٢٧٦٥)، والنسائي (١٦٩/٥).

لەبەر ئەوەش دەقی ئەو بەندی ڕێگەی نەدان کە ڕادەستی موشریکەکانیان بکەنەوە].[٥٣٠] (کە هەر پیاوێک لە ئێمە بێتە لای تۆ...) واتە: باسی ئافرەتی تێدا نەبوو خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ ﴾ (الممتحنة: ١٠). واتە: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوەی کاتێک ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن، و دێن بۆلاتان تاقیان بکەنەوە و بەوردیی پرسیاریان لێ بکەن سەبارەت بەکۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بەئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە بێ باوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتانە حەلاڵی ئەو بێ باوەڕانەن، نە ئەو بێ باوەڕانەش حەلاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، ئەو مارەییەی مێردە کافرەکانیان خەرجیان کردووە بۆیان بگێڕنەوە، ئیتر هیچ ڕەخنەیەکتان لەسەر نی یە ئەو ئافرەتانە مارەبکەن کاتێک مارەییان بدەنێ، ئافرەتی کافر مەهێڵنەوە لای خۆتان واتە: مارەیان مەکەن ئێوەش ئەی ئیمانداران ئەگەر مەسروفێکتان کردووەلە ئافرەتی کافراندا داوای بکەنەوە، ئەوانیش ئەگەر مەسروفیان کردووە لە ئافرەتی ئیمانداردا با داوای بکەنەوە، ئا ئەوە حوکم وفەرمانی خوایە کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات کاتێک لە نێوانتاندا خۆی گەورە هەمیشە زانا و دانایە.﴾ [**خاتوو عائیشە** (رضي الله عنها) **دەفەرموێت: " کاتێک ئافرەتە باوەڕدارەکان کۆچیان کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ (تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و پەیمانی لێ وەرگرتن بەپێی ئەم ئایەتە بیروزە"** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ ۙ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (الممتحنة: ١٢)، واتە: ﴿ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پەیمانیان پێدایت کە: هیچ جۆرە هاوەڵێک بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، زیان نەکەن، ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن، هیچ

---

[٥٣٠] اخرجه: الطبري (التاريخ) (٦٤٠/٢)، ابن هشام (السيرة) (٢٧٩/٣)، والحاكم (٦٦/٤)، وقال السيوطي (اسباب النزول) (ص٢١١): اخرجه الطبراني عن عبدالله بن احمد بسندٍ صحيح.

جۆرە بۆختانێك نەکەن لەنێوان دەست و پێی خۆیاندا(واتە: دوورە پەرێزبن لە هەموو جۆرە خیانەتێك) و فەرمانبەردارت بن لە هەموو چاکەیەکدا و یاخی نەبن لێت، جا ئەوە تۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەستە و لەخوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە﴾ هەر کامێکیان دانی بەو مەرجە دیاریکراوانەی ئایەتەکە دا نا (لەو ئافرەتانە ئەوە لە باوەڕدارانە) پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی دەفەرموو: ((بەیعەتم پێ بدە)) بەقسەکردن بەیعەتی لێ وەردەگرتن وەڵلاهی هەرگیز (دەستی پێغەمەری خودا) بەردەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە لەکاتی بەیعەت وەرگرتندا بەیعەت وەرگرتنی لە ئافرەتان تەنها بەقسەبووە][(٥٣١)].

[دیسان خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرمویت: "...کاتێك خوای گەورە ئەو فەرمانەی دابەزاند لە قورئاندا کەمارەیی ئەو ئافرەتانە بگێڕنەوە بۆ هاوسەرەکانیان کە کۆچیان کردووە و موسوڵمان بوون هێشتا هاوسەرەکانیان موشریك و بێ باوەڕن، وەحوکمیشی بۆ موسوڵمانەکان ناردە خوارەوە کە نابێت ئافرەتی موشریك بخوازن ئەوانیش کە هاوسەری موشریك و بێباوەڕیان هەیە دەست بەرداریان بن و عومەری کوڕی خەطاب ﷺ ئەو ڕۆژە دوو ئافرەتی تەڵاقدا و دەست بەرداریان بوو یەکیان ناوی (قوریبەی کچی ئەبو ئومەیەی کوڕی موغەیرەی مەخزومی بوو) دوای ئەو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان مارەی کرد کەهەر دووکیان موشریك بوون ئەو کاتە، دووەمیان (ئوم کەلثومی کچی جەندولی خوزاعی بوو دایکی عوبەیدولای کوڕی عومەر ﷺ دوای ئەو ئەبوجەهەمی کوڕی حوذیفەی کوڕی غەنمی خوزاعی کە خزمی خۆیی بوو موشریك بوو وەك خۆیی مارەی کردوە]. کاتێك بێ باوەڕەکان ڕازای نەبوون کە دان بەو مارەیەدا بنێن و بیدەن بەموسوڵمانەکان لەجیاتی هاوسەرەکانیان خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ (الممتحنة: ١١) واتە: ﴿خۆ ئەگەر یەکێك یان هەندێك لە هاوسەرانتان گەڕانەوە بۆ ناو کافران، لەوەودوا جەنگ لە نێوان ئێوە و کافراندا بەرپابوو وسەرکەوتن بەسەریاندا، ئێوە لە

---

(٥٣١) أخرجه: البخاري (٢٧١١، ٢٧١٢، ٢٧١٣).

دەسکەوتی ئەو جەنگە زەوەری ئەو ئیماندارانە بژمێرن کە خێزانەکانیان ڕۆشتوون، لە خودا بترسن کە ئێوە هەمیشە بڕوادارن پێی﴾ (العقب) ئەو مارەییە کە موسوڵمانەکان دەیدەن بەبێ باوەڕەکان لەبری هاوسەرەکانیان کە موسوڵمان بوون و کۆچیان کردووە و ناگەڕێندرێنەوە بۆیان، ئەو موسوڵمانەش کە هاوسەرەکەی پاشگەزبووە و چووتە ناو کافرەکان بێ باوەڕەکان مارەیەکەیان بۆ نەدەگەڕاندنەوە لەبەر ئەوە فەرمان کراوە لە دەسکەوتی ئافرەتی بێ باوەڕەکان کە کۆچیان کردووە پێ بدرێتەوە، نەزانراوە وباس نەکراوە کەهیچ ئافرەتێکی کۆچکەر و موسوڵمان لەدوای باوەڕهێنانی پاشگەز بوو بێتەوە...][٥٣٢].

## نامەگۆڕینەوە

بارودۆخەکە بەشێوەیەکی ڕێزەیی ئاسایی بۆوە لەنێوان موسوڵمانەکان و قوڕەیش نامەگۆڕینەوە و پۆستەو گەیاندنی نامە لەنێوانیاندا دەستی پێکرد ئەبورافیع ﷺ دەفەرموێت: ((من لەقوڕەیشەوە نامەیەکم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر خودا ﷺ کاتێك چاوم بە پێغەمبەری خودا ﷺ کەوت ئیسلام چووە دڵمەوە. وتم ئەی پێغەمبەری خودا، وەڵاهی من هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ ناو قوڕەیشی یەکان. پێغەمبەر خودا ﷺ فەرمووی: ((اني لا أخيس بالعهد ولا احبس البُرد (اي: الرسل)، ولكن ارجع اليهم فان كان في قلبك الذي في قلبك الآن فارجع)). واتە: ((من پەیمان و بەڵێن بەسوك و بێ بایەخ سەیر ناکەم و نێردراویش گلنادەمەوە، بەڵام ئێستا بگەڕێوە بۆ لایان ئەوەی ئێستا لەدڵتدایە گەر هەر لەدڵتدا ماوەیە ئەوکات وەرەوە بۆ لامان)). دەفەرموێت: دوای ئەوە گەڕامەوە ناو قوڕەیش پاشان دووبارە گەڕامەوە بەرە و لای پێغەمبەری خودا و موسوڵمان بووم][٥٣٣]. پێغەمبەر

---

[٥٣٢] أخرجه: البخاري (٢٧٣٣)، وابن هشام (السيرة) (٣/٢٨١)، وعبدالرزاق (التفسير) (٣٢٠٥)، والطبري (التفسير) (٢٨/٤٢).

[٥٣٣] أخرجه: احمد (٢٣٨٥٧) وقال محققه: حديث صحيح، وابوداود (٢٧٥٨)، والحاكم (٣/٥٩٨)، والبيهقي (٩/١٤٥)، والطبراني (الكبير) (٩٦٣) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (الكبرى) (٨٦٧٤)، وابن حبان (٤٨٧٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٧٠٢)، و (صحيح ابي داود) (٢٣٦٩).

خودا ﷺ نامەیەکی نارد بۆ سوهەیلی کوڕی عەمر تێدا داوای لێکردبوو کە ئاوی زەمزەمی بۆ بنێرێت بەدیاری، لە جابرەوە دەفەرموێت: ((...بەر لە فەتحی مەککە پێغەمبەری خودا ﷺ نامەیەکی نارد بۆ سوهەیلی کوڕی عەمر لە مەدینەوە: ((ان اهد لنا من ماء زمزم ولا یُترك)) قال: فبعث الیه بمزادتین)) تیایدا فەرمووبووی: [ئاوی زمزممان بەدیاری بۆ بنێرە و پشت گوێی نەخەیت] دەفەرموێت: ئەویش دوو کوندەی بۆ نارد))[٥٣٤]. لەگێڕانەوەیەکی تردا لە ئەبوحوسەیفەوە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ نامەی نوسی بۆ سوهەیلی کوڕی عەمر: [ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێگەیشت شەو بوو مەهێڵە ڕۆژ ببێتەوە، وە ئەگەر ڕۆژ بوو با ئێوارە دانەیەت هەتا دوو کوندە ئاوی زمزمم بۆ دەنرێت] دەفەرموێت: هاوسەرەکەی کەنافرەتێکی خوزاعی بوو یارمەتی دا و ئینجا هەڵیان دەهێنجا بەهاوکاری کەنیزەکەکانیان دەیان کردە کوندەکانەوە ئەوەبوو ئێوارە دانەهات تا پڕیان کردن و لەدوو قوماشی ئەستوریان پێچان و پڕیان کردن لەئاوی زەمزەم و هەر بەوشەوە بەوشترێك ناردیان (بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ].[٥٣٥] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە لە دایکی مەعبەدەوە ﷺ دەفەرموێت: [(ئوزەیهر) بەلای دەوارەکەمدا تێپەڕی کە کۆیلەی سوهەیل بوو دوو کوندەی ئاو پێ بوو، لێم پرسی: ئەوە چی یە؟ فەرمووی: پێغەمبەر نامەی نوسیووە بۆ سەردارەکەم سوهەیل کە ئاوی زەمزمی بۆ بنێرێت بۆیە بەپەلە دەڕۆم هەتاکو کوندەکان ئاوەکەی تێدا بمێنێت و وشك نەکەن][٥٣٦]. لە دوای ڕێکەوتننامەی حودیبیەوە موسوڵمانەکان و موشریکەکان لەیەکتر دڵنیابوون و کەوتنە ئاسایشەوە و سەردانی یەکتریان دەکرد. ئەسمای کچی ئەبو بەکر (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [دایکم (کەناوی قوتەیلەی کچی

---

[٥٣٤] أخرجه: والبیهقي (الكبرى) (٥/٢٠٢)، وقال السخاوي (المقاصد الحسنة) (٣٦٠): حدیث حسن بشواهده، وقال الشیخ الالباني (الصحیحة) (٢/٥٧٢): اسناده جید، وصححه الشیخ المقبل ایضاً (الصحیح المسند) (١٢٣٥).

[٥٣٥] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٩١٢٧)، والطبراني (الكبیر) (١١٤٩١) وفي الاوسط (١٤٩ مجمع)، والفاكهي (اخبار مكة) (٢/٣٣، ٤٠)، وانظر (الاصابة) (١٠٧٨٠) وهو مرسل.

[٥٣٦] أخرجه: الفاكهي (اخبار مكة) (٢/٣٥)، وانظر (الاصابة) (١/٣٠).

عەبدوعوزا بوو) بەسەردانێ هاتە لام لە مەککە وە بۆ مەدینە کە هێشتا موشریك و بێ باوەڕبوو ئەوەش لە دوای دانوستانەکەی حودەیبیە بوو [لەوماوەیەدا کە پێغەمبەر ﷺ ڕێکەوتنی لەگەڵداکردبوون] دایکم لەگەڵ باوکیدا هەر دوکیان سەردانیان کردم منیش پرسم بە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد کەمیوانداری بکەم یاخود نا. وتم: "ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دایکم بەسەردان هاتۆتە میواندارییم ئایا پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەجێبهێنم؟" پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا فەمووی: ((باشترین پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بگەیەنە لەگەڵ دایکتدا)) خوای گەورەش لەو بارەیەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (الممتحنة: ٨)][٥٣٧]. واتە: ﴿دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لی ناکات چاك ڕەفتار ودادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینیان نەکردوون ولە شوێنەوارتان دەریان نەکردوون، چونکە بەڕاستی خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت﴾ بەو شێوەیە هاتینە کۆتای ڕیز بەندی ڕووداوەکانی ئەو غەزا پڕ خێرو بەرەکەتە بۆ موسوڵمانان کە تێدا خودای بالأدەست بەڵێنی بەهاوەڵانی بەژداربووی ئەو غەزایە دا بەڕەزامەندی خۆیی و فەتح و سەرکەوتنێکی زۆر نزیك و غەنیمە و دەسکەوتێکی ئێجگار زۆر وەستایش کردنیان لەسەر ئەو بیروبڕوا چەسپاوەی کە لە ناودڵیاندا ڕەگی داکوتاوە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَـٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ (الفتح: ١٨-١٩). واتە: ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بوو لەو باوەڕدارانەی کاتێك بەیانیان لەگەڵدا بەستیت لە ژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لەنیاز پاکی و دڵسۆزی) هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بەمژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە. ﴿١٨﴾ هەروەها بەڵێنی چەندین دەسکەوتی زۆری پێدان کە لەئاییندەدا

---

[٥٣٧] أخرجه: البخاري (٣١٨٣، ٥٩٧٩)، ومسلم (١٠٠٣)، وابي داود (١٦٦٨)، واحمد (٦/ ٣٤٧)، والطبراني (٢٥/ ٦١).

دەستان دەکەوێت و وەری دەگرن، خوا هەمیشە وبەردەوام بالا دەستە بەسەر خواناساندا و دانایە و دەزانێت چ کاتێك ئیمانداران سەر دەخات﴾ وە پێغەمبەری خواش ﷺ لە لایەن خوداوە مژدەی پێدان کەباشترین خەلکی سەر زەوین و هەرگیز ناچنە ناو ئاگرەوە و ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیان کەلێرەدا نواندیان هاوتای بەژداری کردنیانە لەغەزای بەدر لەرووی پاداشتەوە:

لەوبارەوە ئیبن عومەر دەیگرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((انتم خیر اهل الارض))[٥٣٨] واتە: ((ئێوە باشترین خەلکی سەر زەوین)). هەروەها جابریش ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەگێرێتەوە کە فەرموویەتی: ((لایدخل النار ان شاء الله احدٌ من اصحاب الشجرة الذین بایعوا تحتها))[٥٣٩] واتە: ((بەویستی خودا هیچ کەسێك لەوانەی ئامادەی بەیعەتەکە بوون لە ژێر درەختەکەدا هەرگیز ناچنە ناو ئاگرەوە)). وە خاتوو حەفصە (رضي الله عنها) دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لن یدخل النار رجلٌ شهد بدراً و الحدیبیة))[٥٤٠] واتە: ((کەسێك بەژداری بەدر و حودەیبیەی کرد بێت هەرگیز ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە)).

---

[٥٣٨] اخرجه: البخاري (٤١٥٤)، ومسلم (١٨٥٦).

[٥٣٩] اخرجه: مسلم (٢٤٩٦)، وابي داود (٣٦٥٣)، والترمذي (٣٨٥٩).

[٥٤٠] اخرجه: احمد (٣٩٦/٦)، والترمذي (٣٨٦٤)، وابن ماجة (٤٢٨١)، وابن حبان (٤٨٠٠) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط مسلم، وکذلك صحح اسناده علی شرط مسلم کل من ابن کثیر (البدایة (٣٢٩/٣)، والحافظ (الفتح) (٣٠٥/٧).

# سودەکانی ڕێکەوتننامەی حودەیبیە

بەدڵنیایەوە ڕێکەوتننامەی حودەیبیە دەر ئەنجامی بەر چاو وگرنگ و گەورەی هەبوو بۆ موسوڵمانەکان سەرەتا لەو بارەوەبە لێدوانی هەندێك لە هاوەڵان دەست پێ دەکەین (رضي الله عنهم). ئەبوبەکری صدیق ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ((هیچ فەتح و سەرکەوتنێك نەبووە لەئیسلامدا گەورەتربوو بێت لەو فەتح و سەرکەوتنەی کەبەهۆی حودیبیەوە بەدەست هات بەڵام لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی کورت بینانە دەیان ڕوانیە ئەوەی کە لەنێوان محمد ﷺ و پەروەردگایدا هەبوو، بەندەکانی خوا پەلە دەکەن لەکارەکانیاندا و خودای گەورە کارەکان لەشوێنی خۆیدا دەکات و وەکو بەندەکانی پەلە پەل ناکات هەتاکو کارەکان بەئەنجامیان دەگەیەنێت بەو شێوەی کە خۆی دەیەوێت...))[٥٤١].

ئیبن مەسعودیش ﷺ دەفەرموێت: ((ئێوە ڕزگارکردنی مەککە بەفەتح و سەرکەوتن دادەنێن بەڵام ئێمە سەرکەوتن و فەتح تەنها بە حودیبیەی دادەنێین و هەر ئەوەش بەفەتح هەژمار دەکەین))[٥٤٢]. هەر لەوبارەشەوە ئیبن شیهابی زوهری (رحمه الله) دەفەرموێت: ((...هیچ سەرکەوتنێك نەبوو لەئیسلامەتیدا لە پێش حودەیبیەدا لە ئەو فەتح و سەرکەوتنە گەورەتر بوو بێت کە بەهۆی حودەیبیەوە هاتە دی، خەڵکی هەموو ڕێکەوتنەوە و دەست بەرداری جەنگ وەەرابوون و خەڵکی بەدڵنیایەوە دەگەیشتن بەیەك و ترسیان لەیەکتر نەبوو هەموو لەئاسایشدا دەژیان و بەجۆرێك هەتا ئەو ڕێکەوتنە لەگفتوگۆ قسەکردنیشیان لەگەڵ یەکتردا ناکۆکی و کێبەرکێ لەناودا نەهێشتن (دەفەرموێت): ((بەجۆرێك بوار بۆ بانگەوازی ئیسلامەتی ڕەخسا کە قسە بۆ هەر کەسێك دەکرا لەو بارەوە بە ئەندازەیەکی کەم عەقڵ وژیری بخستایە کار ئەو کەسە موسوڵمان دەبوو تا وای لێهات لەماوەی ئەو دووساڵەدا ژمارەی موسوڵمانان بەقەد ژمارەی پێشویان زیادی کرد بەڵکو زیاتریش بۆوە چەند قات، ئیبن هیشام: بۆپشت ڕاست کردنەوەی فەرمایشتەکەی زوهەیری دەفەرموێت: " پێغەمبەری خودا که تەشریفی دەرچوو بۆ

---

[٥٤١] اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٦٠٩)، وانظر (كنز العمال) (٣٠١٢٢).

[٥٤٢] اخرجه: ابن كثير (فصول في سيرة الرسول) ص (٧٥).

حودەیبیە لەسەر قسەی عەبدوڵای کوڕی جابر ﷺ ژمارەیان (هەزارو چوار سەد) کەس بوو، پاش ئەوە بەدوو ساڵ کە دەرچوون بۆ فەتحی مەککە ژمارەیان گەیشتە (دە هەزار) کەس"[٥٤٢].

ڕێکەوتننامەی حودەیبیە بارێکی جێگیری بۆ موسوڵمانەکان دەستە بەرکرد و بەجوانترین و چاکترین شێوە ئەوانی ناساند لەبەرچاوی خەڵکیدا و پلەوپایەی خۆیانی بۆ گێڕنەوە لە هاوکێشە سیاسیەکاندا ولەبواری سەربازیشدا هێزو توانایان چەند جارە بۆوە لەبەرامبەریشدا قوڕەیشەکان ئەو مەقام وشوێنە ئاینی بە پیرۆزەی هەیان بوو لەناو دڵی خێڵە عەرەبەکان لەدەستیان دا وموسوڵمانەکان بوونە جێگری گونجاو بۆ ئەو شوێنە و شایستەی ئەو پلەوپایە بوون، هەر لەدوای ئەو سوڵحە ئاگری ئاژاوەی دووڕووەکان کوژایەوە کە یارمەتی و هاوکاری ماددی و مەعنەویی و سەربازیان لە قوڕەیشەوە پێ دەگەیشت وەلەدوای ڕێکەوتنە کە قوڕەیش دەستی هەڵگرت لەسیاسەتی جەنگ و کوشتار و خۆی یەک لاکردەوە بەلای بازرگانی و کۆکردنەوەی ماڵ وسامان لەلایەکی ترەوە پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە نوێ یە مەیدانی چۆڵ کرد بۆ موسوڵمانەکان کەیەک لایە ئەخۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ چالاکی بانگەواز کردن بۆ ئیسلامەتی لە هەموو لایەکەوە بەتایبەتی ناوچەی یەمەن و ناوچەکانی تری چواردەوری مەککە وە هەروەها بەستنی هاوپەیمانیەتی خوزاعە لەگەڵ موسوڵمانەکان و خۆخستنە پاڵ هێزی موسوڵمانەکان گورزێکی کوشندە بوو لە هاوپەیمانیەتی قوڕەیش بەتایبەتی ئەحابیشەکان کەپێك هاتەی سەرەکیان لە خوزاعە بوو، ئەوەش وای کرد قوڕەیش چوار دەوری بتەنرێت بەموسوڵمانە تازەکان لە هەموو لایەکەوە بەمەش دیاریکردنی چارەنوسی قوڕەیش بەیەکجاری کەوتە دەستی ئەو موسوڵمانانەی کەهەرکاتێك بیانەوێت بەو پەڕێ هێزو تواناوە گوزرێکی جەرگ بڕو کوشندە دەگەیەنە قوڕەیش و لەڕیشەوە دەری دێنن، لەلایەکی ترەوە موسوڵمانەکان بەگشت لایەکداو بڵاوبوونەوە وتوانیان کونترۆڵی گشت ناوچە جیاوازەکان بکەن لەگەڵ شکاندن و چۆك پێدادانی هێزو توانای هەندێك لەخێڵە عەرەبیە دەوار نشینەکان کەدوژمنایەتی سەرختی موسوڵمانەکانیان دەکرد وە هەروەها توانرا شکستی گەورە بەهێزی کۆکراوەی جولەکەکان

---

[٥٤٢] أخرجه: الطبري (التفسير) (٢٦/٦٨)، وابن هشام (السيرة) (٣/٢٧٧).

لە دوورگەی عەرەبی وە لەخیبەر وە ناوەچکانی دەوروبەری بەگەیەنن وە گورزی جەرگ بڕ بگەیەننە ئەو عەرەبیە خێڵەکیانەی کە هاوپەیمانی ڕۆمە بێزەنتیەکان بوون.

هەر لە دوای ئەو ئاشتەوایەوە قورەیش دانی نا بەموسوڵمانەکان و دەوڵەتی ئیسلامیدا و موسوڵمانەکان بەو دیپلۆماسیەتە کە هەیان بوو چەندین دۆستایەتی و هاوپەیمانیەتی بۆ دەستە بەرکردبوون، ئەو دانوستانە ئەوەی بۆ قورەیش دەستەبەرکرد کە تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستی هەبێت لە حەقیقەتی ئیسلام کەلەوە و پێش لەئەنجامی ناکۆکی و کێبەرکێ لەگەڵ موسوڵمانەکان ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخسا بوو ئەو تێگەیشتنەش ئیسلامەتی وەك خۆی بخاتە بەرچاویان دوور لە هەموو چەواشەکاری و درۆ و دەلەسەیەك، ئەو هەڵسوکەوتە ناوازەی کەموسوڵمانەکان کردیان لە حودیبیەدا و ئازادکردنی دیلی موشریکەکان بەبێ بەرانبەر بەر ئەنجامی گەورەی لێکەوتەوە کە توانیان ڕێزو پایەی سەرکردە و ناودارەکانی وەك عوروە و حولەیس بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن ئەمەش وای کرد کاریگەری هەبێت لەدرز وکەلێن خستنە ناو سەربازگەی موشریکەکان تا دواتر موسوڵمان بوونی هەندێك لەسەرکردەکانی ئەو سەربازگەیەی لێکەوتەوە نمونەی (خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و ئیتریش).

هەروەها ئەو دانوستان و ڕێکەوتننامەیە ئەوەشی بۆ موسوڵمانەکان دەستەبەرکرد کە بتوانن گفتوگۆ لەگەڵ وڵاتانی چواردەوریان بکەن و بانگەوازیان بکەن بۆ ئیسلامەتی و ئەو دەوڵەتانەی دەوروبەریش دان بنێن بەو ئاینە تازەیە و بەو دەوڵەتە تازەیەکە سەری هەڵداوە و گەشەیکردووە، دواتر لە هاوکێشەی سیاسیدا حیسابی تایبەتی بۆ بکەن و شوێنی شایستەی خۆی بۆ دابنێن کەشایەن بەموسوڵمانەکان بێت، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ڕێکەوتننامەی حودەیبیە دواتر دەستپێك و ڕێگە خۆشکەری فەتح و ڕزگارکردنی شاری مەککەش بوو.

# غەزای ذی قرد

ئەم غەزایە لە دوای ڕێکەوتننامەی حودیبە و بەر لە ڕوودانی غەزای خەیبەر ڕوویداوە وە بەپێی ڕاسترین بۆچوونی زانایانی سیرە و مێژووی ئیسلامی[٥١١]. هۆکاری ڕوودانی ئەم غەزایەش ئەوەبوو کە تاقمێك لە هۆزی غەطفان و فوزارە هەڵیان کوتایە سەر مەڕومالأتەکانی شاری مەدینە و مێگەلێك وشتری ناوس و شیردەر کە هی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون دایانە پێش خۆیان و بەتالأن بردیان کەلە ناوچەی غابە بوو، شوانەکەشیان کوشت و ژنەکەشیان بەدیل گرت و لەگەڵ مالأتەکە بردیان، سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ پێی زانین و خەڵکی لێ ئاگادار کردنەوە و خۆشی شوێنیان کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ پێنج سەد کەس لە هاوەڵانی کەوتنە دوایان و شوێن پێیان هەڵگرتن هەتا مالأتەکەیان هەموو ڕزگار کرد کە لەناویاندا وشترە تایبەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدابوو کە بە (عضباء) ناسرابوو.

لەوبارەیەوە عەمرانی کوڕی حوصەینی ﷺ دەفەرموێت: (هۆزی (ثقیف) کە لە طائف نیشتە جێ بوون هاوپەیمانی خێڵی عوقەیل بوون، دوو کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەریان ﷺ بە دیل گرتبوو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆڵەی ئەوەدا کەسێکیان لە خێڵی عوقەیل بە وشترەکەیەوە دەستگیر کرد بە ناوی (عضباء) [کە پێشڕەوی ئەو وشترانەی دەکرد کە بۆ کاتی حەج دیاری دەکران وەك هەدیە]، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای ئەو دەست بەسەرە لە کاتی بەندکرانەکەی دا ئەو وتی: موحەممەد ﷺ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ لێی نزیك بووە و فەرمووی: ((چیت دەوێت؟)) وتی: لەبەر چی منتان گرتووە؟ ئەوە منیش لێگەڕێن ئەی لەبەر چی ئەو وشترەی پێشڕەوی وشترەکانی هەدیەی حەجتان دەست گیرکردوە (واتە: تاوانێکی گەورە بوو ئەوسا)؟ عیمران ﷺ دەفەرموێت: ئەو وشترە پێشڕەوی وشترەکانی دیاری کراوەی حەجی دەکرد لە سەردەمی ئەفامی دا، هەر وشترێکی لەو جۆرەش لەوسەردەمەدا ڕێگری لێ نەدەکرا لە هەر حەوز و ئەستێلێك ئاوی بخواردایەتەوە لە هەر

---

[٥١١] أنظر: (فتح الباري) (٥/٥٨٥)، و(زاد المعاد) (٣/٢٧٩)، و(الدلائل) للبيهقي (٣/٢٧٩).

پاوان و لەوەڕگایەکیش بلەوەڕایە][٥٤٥]، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اخذتك بجريرة حلفاءك ثقيف)) واتە: [((تۆ لەبەر هاوپەیمانە ئەقەفیەکانت دەست بەسەر کراویت)) ئینجا تەشریفی ڕۆیشت لە لای وبانگی کردەوە [واتە: پیاوەکە وە ئینجا وتی: ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ کەسایەتیەکی نەرم ونیان و بەبەزەیی هەبوو، ڕوی کردەوە بەلای دا و فەرمووی: ((ئینجا چیت دەوێت؟)) وتی من موسوڵمانم. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((لو قلتها وانت تملك امرك افلحت كل الفلاح)). واتە: ((گەر بەر لە دەست بەسەریەکەت ئەمەت بگوتایە کاری خۆت دەگەوتەوە دەست سەرفرازی تەواوت بۆ خۆت بەدەست دەهێنا)) (واتە: ئازاد بوونت ئیسلامت دەبردەوە) پاشان تەشریفی ڕۆیشت لەلای ئەوە بوو دیسان بانگی کردەوە و وتی: ئەی مەحەممەد ئەی موحەممەد ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە لای و فەرمووی: ((چیترت دەوێت؟)) وتی: من برسیمە پێخۆرم بدەنێ بیخۆم وە زۆرم تینوە ئاوم بدەنێ، فەرمووی: ((ئەوە پێداویستی ڕۆژانەتە ئامادەیە))، دواتر ئاڵوگۆڕیان پێکرا بە دوو کەسە موسوڵمانەکە [کە هۆزی ئەقیف بە دیل گرتبوونی] پێغەمبەری خوا ﷺ (عضباء) لای خۆی گلدایەوە بۆ گەشت و سەفەری خۆی)[٥٤٦]. ئەوە بوو (عضباء) لەگەڵ مێگەلە وشترەکەی تر نێردرا بۆ لەوەڕگا کە هی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تا لە لەوەڕگاکانی مەدینە بلەوەڕێن، پاشان موشریکەکان دایان بەسەر مێگەل ومالآتی شاری مەدینەدا بەتاڵان بردنیان (عضباء)یش لەناو ئەو ماڵاتانەدا بوو.

سەلەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێت: (لە حودەیبیە گەڕاینەوە پاشان گەیشتینەوە شاری مەدینە ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ مێگەلێك وشتری خۆی لەگەڵ خزمەتکارێکی خۆی نارده دەرەوە کەناوی (رەباح) بوو بۆ لەوەڕگا، منیش لەگەڵی دابووم، ڕۆیشتم ئەسپی طەلحەی کوڕی عەبیدڵلام پێبوو [ئاوم داو پاشان

---

[٥٤٥] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٥٩/١٨).

[٥٤٦] أخرجه: احمد (١٦٥١٣) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما، والحميدي (٨٢٩)، ومسلم (١٨٠٧، ١٦٤١)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٥٧)، والنسائي (١٩/٧)، و ابوداود (٢٧٥٢، ٣٢٩٢) و الترمذي (١٦١٥).

مێگەلەکەمان نارد بە وشترەکەی پێغەمبەری خواشەوە ﷺ بۆ لەوەڕگا][٥١٧] [کاتێک ڕۆیشتین
بانگی بەکەمی بەیانی نەدابوو) ڕانە و وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوچەی ذی قرد
دەلەوەڕان (کە کێوێکی ڕەشبوو لە دووری (٣٥کم) لە باکوری ڕۆژهەلاتی شاری مەدینەوە
بەلای ناوچەی غابە وە)، دواتر خزمەتکارێکی عەبدڕحمانی کوڕی عەوفم پێگەیشت] [پێم
وت: بۆ قەزابیت ئەوە چی بووە؟] وتی مێگەلە وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەتالان
براوە. وتم: کێ بەتالانی بردوون؟ وتی: تاقمێك لە هۆزی غەطفان و فوزارە][٥١٨] سەلەمەی
پاڵەوانی ئەم داستانە دەفەرموێت: کاتێك بەیانیمان کردەوە دەبینین عەبدڕەحمانی کوڕی
عەیینەی کوڕی حوصینی فوزاری، داویەتی بەسەر ماڵاتی پێغەمبەری خوا ﷺ (کە ژمارەیان
بیست وشتری مێینە بوو) هەموویانی داوەتە پێش خۆیی و شوانەکەشی کوشتووە (کە:
ذەری کوڕی ئەبوذەڕی غفاری بوو) [ئەوە بوو بە پەلە و هەڵەداوان خۆیی و ئەوانی لەگەڵی
دابوون لە ئەسپ سوارەکان بە ڕاوەدونان مێگەلەکەیان لەشار دوورخستبووە وە.

لەو بارەیەوە ئیبن هیشام ﷺ دەفەرموێت: ئەو ماڵاتە پیاوێکی هۆزی غفار شوانی دەکرد
لەگەڵ هاوسەرەکەی، پیاوەکەیان کوشت (کە ذەری کوڕی ئەبوذەڕ بوو) ژنەکەشیان برد
لەگەڵ مێگەلەکە (کە ناوی لەیلا بوو)][٥١٩]. سەلە ﷺ دەفەرموێت: وتم رباح وەرە سواری
ئەم ئەسپەبە و بیگەیەنەوە دەستی طەلحەی کوڕی عوبیدللا ﷺ، وە بە پێغەمبەری خوا ﷺ
ڕابگەیەنە کە موشریکەکان داویانە بەسەر مەڕوماڵاتەکەیدا. [پاشان خۆشم (بەشوێنیدا
ڕۆیشتم)] [بۆ سەر تەپۆلکەیەك وە سەرکەوتم] [هەتا گەیشتمە قەد پاڵی غابەوە] لە
ناوچەی (ثنية الوداع)، سەیرم کردن ئەوان مێگەلەکەیان ڕاوناوە و بە شپرزەیی داویانەتە

---

[٥١٧] اخرجه: احمد (١٦٤٥٩)) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما، ومسلم (١٨٠٧)، وابي داود (٢٧٥٢) وانظر: (صحيح ابي داود) (٢٣٩١).

[٥١٨] اخرجه: البخاري (٤١٩٤)، ومسلم (١٨٠٦).

[٥١٩] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٣٥)، و الطبري (التاريخ) (٢/٥٩٥). و ورد ذلك في رواية مسلم (١٦٤٧) (و أُسرتْ امرأه من المسلمين).

پێش خۆیان تابۆی دەرچن منیش سەر کەوتمە سەر کێوی (سەلع) و[(٥٥٠)] ڕووم کردە شاری مەدینە و سێ جار بەدەنگی بەرز هاوارم کرد: (یاصبحاه، یاصبحاه، یاصبحاه) (ئەمە بانگ کردنێك بوو بۆ هەر ڕووداوێك پێش بهاتایە لە وسەردەمەدا) (بە جۆرێك هەموو دانیشتوانی مەدینە گوێیان لێبوو ئەوە بوو ڕووەو لای من هاتن منیش بەگورجی شوێنیان کەوتم) (چونکە من پێش تر دەرچوو بووم بۆ ڕاوەشکار بە شمشێر و تیروکەوانەوە خۆم بۆ چەك کردبوو) (دەنگی هاوار و بانگەوازەکەم گەیشتبووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی مەدینەش هاوار و بانگی دەرچوونیان لێدابوو فەرموویان: قەوماوە، قەوماوە سەرەنجام هەشت سوار چاك لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە کە ئەمانە بوو: میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندی، عوبادەی کوڕی بەشیری ئەنصاری، ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر ئەنصاری، عوکاشەی کوڕی میحصەنی ئەسەدی، موحەریزی کوڕی نەضلەی ئەسەدی (کە بە ئەخرەم ناسرابوو)، وە ئەبوقوتادە حارثی کوڕی روبعی، ئەبوعەیاش عبیدەی کوڕی زەید، کاتێك لە خزمەتیا کۆبوونەوە سەعدی کوڕی زەیدی ئەنصاری ؓ کردە ئەمیریان و پێی فەرموون: ((اخرج في طلب القوم حتى الحقك في الناس)) واتە: ((بەگورجی بڕۆن بە شوین ئەو چەتەو ڕێگرانە هەتا لەگەڵ خەڵکەکە پێتان دەگەین)).

ئیبن ئیسحاق ؓ دەفەرموێت: لەولاشەوە سەلەمە بەگورجی کەوتبووە دوایان (کە ژمارەیان چل کەس بوون) وەك شێر هەڵمەتی دەبرد هەتا گەیشت پێیان ئنجا کەوتە تیرباران کردنیان... کاتێك بە ئەسپەکانیانەوە بۆی دەگەڕانەوە بەپەلە ڕای دەکرد پاشان بەرەنگاریان دەبووە، وە ئەگەر دەرفەتیشی بۆ دەرەخسا تیریان تێبگرێت دەکەوتە تیر هاویشتن][(٥٥١)]، سەلە ؓ خۆی لەو بارەوە دەفەرموێت: [ئەوەبوو لەبەر چاوم ون بوون هەتا گەیشتمەوە پێیان لەسەر ئاویك لایان دابوو ئاویان دەخواردەوە و هەڵیان دەهێنجا، من تیر هاوێژێکی لێهاتوو بووم کەوتمە تیر باران کردنیان [وکوشتنی ئەسپەکانیان] لەوکاتەدا بە شیوازی هۆنراوە دەم وت:

أنــا ابــن الأكــوع        الــيوم يــوم الــرضــع

(٥٥٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٧٦)، والطبراني (الكبير) (٦٢٧٨).

(٥٥١) نفس المصدر

وتە: من کوڕی ئەکوەعم، ئەمڕۆ ڕۆژی لەناو چونی ناکەس بەچە و ناپیاوانە، [ئەوە لەوکاتەدا بوو کە درەخت و دەوەن زۆر سەوز بوون] لە ناویاندا خۆم گەیاندە کەسێکیان [لەسەر وشترەکەی بوو تیرێکم تێگرت] ئەوەبوو بەر قاچی کەوت و خزی سەری تیرەکە لەشانی چەقی و پێم وت: بگرە من ئەوی ئەکوەعم، ئەمڕۆ کە ڕۆژی ڕیسوابوونی سوك و چروکانە، سوێند بە خوا بەو جۆرە تیرم تێگرتن و دەمپێکان بە بەردەوامی وبێ وچان، هەر کاتێك ئەسپ سوارەکانیان بۆم دەگەڕانەوە من دەڕۆیشتمە ژێر درەختێکەوە بۆی دادەنیشتم وتیرم تێ دەگرتن و دەمخستنە خوارەوە، هەتا گەیشتینە ناو تەنگە بەرانی شاخەکەوە بە ناو هەڵات و دۆڵەکەدا ڕۆیشتن، چونە شوێنی سەخت و تەنگەوە منیش سەرکەوتمە سەر بەرزای شاخەکەوە بەردم بەسەردا گلدەدانە خوارەوە، بەو شێوە کۆڵم نەدا و بەردەوام بووم [ئەوە حاڵی من و ئەوان بوو] بەردەوام بووم لە شوێن کەوتنیان و لە دوایان نەبوومەوە هەتا هەرچی خوا دروستی کرد بوو لە وشترەکانی ماڵاتی پێغەمبەری خوا ﷺ لیم دەسندنەوە و دەمخستە دوای خۆمەوە ڕزگارم دەکرد لە دەستیان و جیم دەهێشتن و دوای ئەوان دەکەوتم و تیرم تێ دەگرتن هەتا زیاتر لەسێ عەبای خەت خەت و ڕمیان کەوتە دەستم منیش دەمشاردنەوە و کۆمەڵە بەردێکم کەڵکە دەکرد لەسەری و هەر ناوا فڕیم نەدەداو [لەسەر ڕێگاکە دام دەنا] بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بیناسنەوە (هەتا گەرما تینی سەند ئینجا بۆ عویەینەی کوڕی حوصەینی کوڕی بەدری فوزاری هات بەهاواریانەوە و بۆ ئەوەی پشتیوانیان بکات، ئەوانیش لە قەدپاڵێکی تەنگە بەردابوون [دانیشتبوون بۆ ئەوەی نانی بەیانی بخۆن] منیش سەرکەوتم بۆ قەدپاڵی شاخەکە و [چومە سەر لوتکەی شاخەکە دانیشتم] بەسەریاندا دەمڕوانی و ئەوان کەوتبوونە لای خوارەوە عویینە وتی: ئەوە کێیە؟ من دەیبینم؟ وتیان ئەوە دوچاری ناڕەحەتیەکی سەختی کردوین [وەڵڵاهی] لە تاریکی بەرەبەیانەوە هەتا ئێستا بە دوامانەوەیە لە کۆڵمان نابێتەوە و [تیرمان تێ دەگرێت هەرچی بەردەستمان کەوتبوو لێی وەرگرتینەوە و لە دوای خۆی دایناوە بە جێی هێشتوە، عویینە وتی: ئەگەر ئەو دڵنیا نەبوایە لەوەی کە پشتیوانی هەیە و بە دوایدا دێن گەرما نەبووایە دەستی لێ هەڵدەگرتن، ئادەی با چوارکەستان بۆی هەستن و سەرکەونە سەر شاخەکە بۆی، [سەلەمە دەفەرموێت: ]

کاتێك گوێم لە دەنگیان بوو [ئەوەندە نزیك بووین دەمان توانی لەیەك تێ بگەین] پێم وتن: دەزانن کەمن کێم؟ وتیان نەخێر تۆ کێی؟ وتم: من سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعم، سوێند بەوەی ڕێزی لە موحەممەد ﷺ گرتووە بمەوێت بەهەرکەسێکتان بگەم ڕزگاری نابێت لە دەستم، وەهیچ کەسێکیش لە ئێوە ناتوانێت دەست بگەیەنێتە من و لەپەینم ببات، یەکێکیان وتی: من واگومان دەبەم ڕاست دەکات [سەلەمە بەمە ترساندنی] ئەوانیش گەڕانەوە بێ ئەوەی هیچ بکەن منیش شوێنی خۆم جۆڵ نەکرد و نەڕۆیشتم هەتا (هەشت سوارچاك)م لە سوار چاکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بینی لەناو درەختەکانەوە دەهاتن، یەکەمین کەسیان ئەخرەمی ئەسەدی بوو، (کە ناوی موحەڕیزەی کوڕی نەضلەیە) بە دوای ئەودا [سوارچاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوقەتادەی کیندی ؓ] موشریکەکان کە ئەمیان بینی پشتیان هەڵکرد و کەوتنە ڕاکردن، [منیش لە شاخەکە هاتمە خوارەوە چاوم کەوت بە] ئەخرەم، پێم وت: ئەخرەم [ئێمە کەمین وریای خۆتبە] دەورت نەگرن [لەسەر خۆبە] هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی پێمان دەگەن. فەرمووی: ئەی سەلەمە ئەگەر تۆ باوەڕت بە خوا و ڕۆژی دوای هەیە دەزانی کە بەهەشت و دۆزەخ ڕاستەقینەیە تۆ مەبە ڕێگر لە نیوان من و دەست خستنی شەهادەتدا.

سەلە ؓ دەفەرموێت: ئینجا وازم لێ هێنا ئەوەبوو بەرەنگاری عەبدڕەحمانی کوڕی عوینە بووە وە کەوتنە وەشاندنی شمشێر لەیەکتر ئەوە بوو ئەخرەم ئەسپەکەی عەبدڕەحمانی سەر بڕی و ئەویش شمشێرێکی وەشاندە ئەخرەم وە شەهیدی کرد، وە سواری ئەسپەکەی بوو، ئەبو قوتادەی سوار چاکی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە سەری و [کەوتنە شمشێر وەشاندن لەیەکتر عەبدڕحمان ئەسپەکەی ئەبو قوتادەی پێکاو کوشتی ئەبو قەتادەش توانی شمشێرێکی پێدا بکێشێت و بیکوژێت پاشان سواری ئەسپەکەی بێت (کە ئەسپەکەی ئەخرەم بوو پێشتر) ئەوانی تریش بە هەڵەداوان ڕایان کرد [(ئەبو قەتادە) عەباکەی سەر شانی داناو پێی داپۆشی (واتە: لاشەی عبدڕەحمانی پێ داپۆشی)[٥٥٢]. سەلەمە ؓ دەفەرموێت: بەوەی ڕێزی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوە لەسەر پێیە کانی خۆم دەڕۆیشتم

(٥٥٢) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١٤/٥٣٣)، واحمد (٥٢/٤)، وابن حبان (٧١٧٣) وقال محققه: اسناده حسن.

شوێنیان کەوتم لە کاتێکدا هیچ کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای خۆمەوە و تۆزو خۆڵیشیان دیار نەبوو، هەتا بەر لە خۆر ئاوابوون شۆڕبوونەوە و بۆ ناو ئەدەی و تۆزو خۆڵیشیان دیار نەبوو، هەتا بەر لە خۆر ئاوابوون شۆڕبوونەوە و بۆ ناو دۆڵێک کە ئاوی تێدابوو پیان دەوت (ذی قرد) زۆریان تینو بوو بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخۆنەوە، بەهەری منیان دەکرد کە شوێنیان کەوتبووم منیش لای سەرەوەم لێ گرتبوون و ڕێگەم نەدان بەیەک دڵۆپ ئاو بخۆنەوە [ئەوەبوو هەستان ئاوەکەیان بەجێهێشت خۆیان دوچاری ناڕەحەتی کرد لە قەد پاڵێکی سەخت و دژواردا لەوێدا خۆر ئاوابوو] (منیش دوایان کەوتبووم گەیشتم بە کەسێکیان تیرێکم تێگرت) و لە ناوەڕاستی شانیم دا وەپێم وت: من ئەوەی ئەکوەعەم، ئەمڕۆ ڕۆژی ڕسوابوونی سوک و ناکەس بەچانە وتی: دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆبکات ئەمە ئەکوەعەکەی بەرەبەیانە؟ وتم: بەڵێ ئەی دوژمنی نەفسی خۆت ئەکوەعەکەی بەرەبەیانە؟ (ئەو پیاوەش) (ئەو) کەسە بوو کە لە سەرەتای بەیانیدا تیرێکم تێگرت بوو پێکابووم ئێستا تیرێکی تریشم تێگرت و پێکام دوو تیری پێوە بوو لەویشدا دوو ئەسپم پێ بەجێ هێشتن لەسەر قەد پاڵەکە [پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێنج سەد کەس لە موسوڵمانە کانەوە تەشریفی هێناو عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومی بەسەر کاری مەدینە دانا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی تێپەڕبوونی بە ناوچەکەدا خەڵکەکەی بینی شڵە ژابوون و دەیان فەرموو کە: ئەبوقەتادە کوژراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لیس بأبي قتادةَ، ولكنه قتيل ابي قتادة وضع عليه بُردَةً لتعرفوا أنّه صاحبه، خلّوا عنه وعن سلبه)) ثم قال: ((اسعوا في أثر القوم)) فامعنوا واستنقذوا (بعض) اللقاح)) واتە: ((ئەوە ئەبو قەتادە نیە، بەڵکو کوژراوی دەستی ئەبوقەتادەیە بەعەباکەی خۆی دایپۆشیوە بۆئەوەی بزانن کە خۆی کوشتویەتی دەست لە کەلوپەلی سەربازیەکەی نەدەن ولێی گەڕێن))، پاشان فەرمووی: ((بەردەوام بن با بڕۆین بەشوێن پێیاندا تا دەگەینەوە پێیان)) هاوەڵان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن ئەوەبوو (هەندێک) لە ماڵاتاکانیان ڕزگار کرد، لە دەستیان][٥٥٣]. سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: [بە دوو ئەسپەکە]ی دەستم کەوتبوو پێش خۆمم دابوون و بەرەو خزمەتی

---

(٥٥٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٣٥)، والطبراني (الكبير) (٦٢٧٨)، والبيهقي (الدلائل) (٤/١٩٠). والعدد (حسمائة) ورد عند احمد (١٦٥٣٩) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتم مامیشم عامر پێشم کەوتبوو [دوای ئەوەی کە شەو تاریك بوو] دوو قاپی پێبوو یەکێکیان تۆزێ شیری تێدابوو ئەوی تریشیان ئاوی تێدا بوو هەندێکم لێ خواردەوە ئەوەشی مایەوە دەست نوێژم پێ شۆرد [نوێژم کرد] پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو تەشریفی هێنابووە سەر ئەوە ئاوەی کە [موشریکەکانم] لێ دوور خستنەوە و ئەمهێشت دەمیانی لێ تەڕکەن، کە پێیان دەوت (ذی قەرد)، کاتێك گەیشتم بینی دەبینم ئەو وشترانەو هەموو ئەو شتانەی لە دەستی موشریکەکانم ڕزگار کرد بوو لەگەڵ هەموو ڕمەگان وە (هەموو) عەباکانیشیان پێیەو و دەستیان کەوتووە لە ڕێگای [پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە دابەش کردنی بەسەر هاوەڵاندا بۆ هەر سەد کەسێکیان وشترێکی بۆ سەربڕین و دابەش کرا بەسەریاندا] وە لەولاوە بیلال ﷺ وشترێکی منیش سەر بڕی کە من لە دەستی چەتەو ڕێگرەکان ڕزگارم کردبوو ئەوە بوو کۆپاڵ و جەرگەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەبرژاند عەرزم کرد وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم بدە لە ناو هاوەڵانت سەد کەس دەست نیشان بکەم و هەڵیان بژێرم، پاشان بیان بەم بۆ ئەوەی [لە کاتی عیشادا] بدەن بەسەر ئەوە بێباوەڕانەداو هەموویان بکوژین و یەك کەسیان نەمێنێتەوە کە هەواڵی دوای خۆیان بباتەوە؟ فەرمووی: ((یا سلمة اتراك كنت فاعلاً [ذلك]))؟ واتە: ((سەلەمە تۆ وادەزانی دەتوانی بەو کارە هەستی و ئەنجامی بدەی؟)) وتم: بەڵێ سوێند بەوەی کە ڕێزی لە تۆ ناوە بە پێغەمبەرایەتی [پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە پێکەنی هەتا لەبەر ڕوناکی ئاگرەکە خرێکانم بینی] وتم: بە دایك وباوکەوە بە قوربانت بم [من ڕێگەم نەدا] ئەو بێ باوەڕانە لە ئاوەکە بخۆنەوە لە کاتێکدا زۆریان تینو بوو، با بۆ ساتێك بگەڕێمەوە سەریان؟ فەرمووی: (((یا ابن الاكوع ملكت فاسجع (اي: قدرتَ فاعفُ) انهم الآن بغطفان يُقرون (اي: يُضافون) [في قومهم])) واتە: ((ئەی کوڕی ئەکوەع توانا دار بوویت بەسەریاندا بەڵام دەست هەڵگرە ئێستا ئەوان لە ناو هۆزی غەطفان میوان داریان بۆ دەکرێت))[٥٥٤].

---

[٥٥٤] أخرجه: احمد (٤/١٤٨)، والبخاري (٤١٩٤).

سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: [کەسێك هات لە هۆزی غەطفان وتی: میوانی فلانەکەسی غەطفانی بون، ئەویش چەندین حەیوانی بۆسەر برین کاتێك کەوڵیان کردن تەپوتۆزیان لە دوورەوە بە دی دەکرد، وتیان: موسوڵمانەکان هاتن، بە پەلە بۆی دەرچوون و ڕایان کرد کاتێك بەیانیمان کردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خیرُ فرساننا الیوم ابو قتادة وخیرُ رجالنا سلمة)) واتە: ((ئەمڕۆ باشترین سوار چاکمان ئەبوقەتادەبوو وە باشترین پیادەشمان سەلەمە بوو)) پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەشی لە دەست کەوت پێدام بەشی ئەسپ سوار و بەشی پیادەش هەردووکیانی بۆ کۆکردمەوە وپێی بەخشیم) [پێغەمبەری خوا ﷺ دواتر ئەو و ڕۆژێك لەسەر ئاوی (ذي قرد) مایەوە [موسی کوڕی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ دەفەرموێت: طەلحە ﷺ لەو ڕۆژەدا چەندین وشتری سەربڕی.... (واتە: لەغەزای (ذي قرد)دا) خواردن و خواردنەوەی بۆ هاوەڵان ئامادە دەکرد و دەرخواردی دەدان پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر ئەم هەڵوێستە پڕ لەجوامێریەی پێی فەرموو: ((یا طلحة الفیّاض)) واتە: ((ئەی طەلحەی زۆر بەخشندە و سەخاوەت)) هەر لەبەر ئەوە ناونرا بە طەلحەی فیاض][٥٥٥].

سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ منی لە دوای خۆیەوە سوار کرد [لەسەر وشترەکەی] لە کاتی گەڕانەوەماندا بەرەو مەدینە [کاتێك نێوانی ئێمە و شاری مەدینە نزیك بۆوە و لەسەرەتای دەروازەی شارەکەدا بووین، لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێکی ئەنصاری هەبوو کەس لە پێشبڕکێدا پێشی نەدەکەوت [پاڵەوانی ئەو مەیدانەبوو] ئەوە بوو کەوتە هاوار و بانگ کردن و [دەیفەرموو]: ئایا هیچ کەس هەیە پێشبڕکێ بکات، ئایا کەسێك هەیە پێشبڕکێ بکات بەرەو مەدینە ئەوەی چەندین جار [دووپات کردەوە منش لەپشتەوەی

[٥٥٥] اخرجه: الحاكم (٣/٣٧٤) وصححه ووافقه الذهبي، والحديث من اوله الى هنا من رواية: مسلم (١٨٠٦، ١٨٧٢، ١٦٤١)، واحمد (١٦٥٣٩)، و (١٦٤٩٥)، وبعضه عند البخاري (٤١٩٤)، وابي داود (٢٣٩١)، (٣٢٩٢)، والترمذي (١٦١٥)، و الطبراني (الكبير) (٦٢٧٨)، وابن حبان (٧١٧٣)، و البيهقي (الدلائل) (٤/١٩٠) واللفظ لمسلم والزيادة لاحمد والبخاري وابن حبان والطبراني وابن هشام (السيرة) (٣/٢٣٥).

پێغەمبەری خواوە ﷺ سواری وشتر ببووم] کاتێك گوێم لەقسەکانی بوو وتم: ئایا ڕێز لە ڕێزدار ناگریت وەلە خاوەن پایەش سڵ ناکەیتەوە؟ وتی: نەخێر، مەگەر ئەو کەسە پێغەمبەری خودا ﷺ بێت. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەدایك وباوکەوە فیدات بم [ڕێگەم بدە] با پێشبڕکێ لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکەم. فەرمووی: (ئەگەر خۆت حەز دەکەیت برۆ)) [منیش بە پیاوەکەم] وت: دێم بۆلات [ئامادەم بۆ پێشبڕکێکە] [ئەوەبوو خۆی بازدا لەسەر وشترەکەیەوە] منیش قاچەکانم چەماندەوە و خۆم گورج کرد و دوای ئەوە [لە وشترەکە] دابەزیم ئینجا دەستمان کرد بەڕاکردن من لەیەك دوو قوناغ دواکەوتم (خۆم لەڕاکردنی توند دەپاراست لەیەك دوو شوێنا] پاشان کەوتمەوە ڕاکردن بەشوێنیدا [هەتاکو پێی گەیشتمەوە] و بەدەستەکانم نێوان شانەکانیم گرت لە دواوە و پێم وت: وەڵاهی پێشت کەوتم وە، ئەو پێکەنی وتی: منیش وای بۆ دەچم (تۆ بردوتەوە لێم) ئیتر پێشی کەوتمەوە هەتا دەروازەی شاری مەدینە [ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای خۆیەوە سواری کردم... هەتاکو چووینەوە شاری مەدینە] (ئەم غەزایە پێنج ڕۆژی خایاند لە دەرچوونیانەوە لەمەدینە هەتا گەڕانەوەیان).

عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەفەرموێت: (موشریکەکان وشترە ناسراوەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ یان برد کە ناوی (عضباء) وە ژنی شوانەکە و ماڵاتەکەیان دەستگیر کرد بردیان لەگەڵ خۆیان. (دەفەرموێت: (ئافرەتەکەیان بەستبۆوە دەستەکانیان شەکەت کردبوو خۆشیان سەرقاڵی لەوەڕاندنی ماڵاتەکانیان بوون لەبەردەم ماڵەکانیاندا، شەوێکیان (ژنەکە) خۆی کردەوە لەکاتێکدا ئەوان نوستبوون و خۆی گەیاندە لای وشترەکان کاتێك نزیك دەبۆوە [ لەهەر کامێکیان بۆ ئەوەی سواری بێت] چۆکی دانەدەدا سەرکەشی دەکرد وەدەیکردە گرمەگرم ئەویش دەستی لێ هەڵدەگرت هەتاکو (گەیشتە) لای (وشترەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە بە(عضباء) ناسرابوو وشترێکی ڕامکراو ملکەچ بوو هیچ سەرکەشی و لاملی نیشان نەدا و دەنگی لێوە نەهات هەتاکو سەرکەوتە سەر پشتی] ئینجا تێی خوڕی و بۆی دەرچوو و بەڕاکردن بەر لەوەی بگاتەوە مەدینە (پێیان زانی) و کەوتنە دوای بەڵام دەستەوەستان بوون و نەیان توانی دەستگیری بکەنەوە، ئافرەتەکەش نەزری کرد ئەگەر خودا ڕزگاری بکات بەهۆی ئەو وشترەوە ئەوە بیکاتە قوربانی و سەری ببڕێت [ئەوە بوو

ڕزگاری بووا] کاتێك گەیشتەوە شاری مەدینە و خەڵکی بینیان وتیان: ئەوە عضباء وشترەکەی پێغەمبەری خودایە ﷺ ئافرەتەکەش وتی: من نەزرم کردووە لەسەر خۆم ئەگەر خودا ڕزگارم بکات لەسەری بیکەمە قوربانی و سەری ببڕم [ئافرەتەکە بردی بۆ سەربڕینی، خەڵکەکەش نەیان هێشت و ڕێگریان لێی کرد] وچوونە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و دەنگ وباسەکەیان بۆ باس کرد [زەردە خەنەیەکی کرد و فەرمووی]: ((سبحان الله بئسما جزتها ونذرت ان ان نجاها الله عليها لتنحرنها لا وفاء لنذر في معصية الله ولا [وفاء لنذر] فيما لايملك العبد)) واتە: ((پاك و بێ گەردی بۆ خوا خراپترین پاداشتی دەداتەوە نەزری کردووە ئەگەر خودا ڕزگاری کرد بەهۆیەوە بیکاتە قوربانی نەزرێك بەجێ ناهێنرێت سەرپێچی خودای تێدا بێت [وە ئەو نەزرەش بەجێ ناهێنرێت لە شتێکدا کە موڵکی خۆی نەبێت)) [ئافرەتەکە) هاتە خزمەتی و ئەوەیان پێ ڕاگەیاند. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((انما هي ناقة من ابلي فارجعي الى اهلك على بركة الله)). واتە: ((ئەو وشترە لەوشترەکانی منە و تۆش لە ژێر فەڕو بەرکەتی خودا بگەڕێوە بۆ ناو کەس و کارت]))[٥٥٦].

---

[٥٥٦] أخرجه: احمد (٣/٤٣٠)، ومسلم (١٦٤١)، وابي داود (٣٢٩٢، ٣٣١٦)، والترمذي (١٥٦٢)، وابن ماجة (٢١٢٤)، والنسائي (١٩/٧)، وابن حبان (٤٣٩٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن هشام (٢٤٠/٣)، واللفظ لمسلم والزيادات لاحمد وابن حبان وابن هشام.

# غەزای خەیبەر

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك گەڕایەوە لە حودەیبیە مانگی (ذي الحجة) و هەندێکیش لە (محرم) لەمەدینە مایەوە، دواتر هەر لە مانگی (محرم)دا بڕیاری دەرچوونیدا بۆ خەیبەر لەساڵی حەوتەمی کۆچی، خۆئامادەکردن و ڕۆیشتنیان دوای گەڕانەوەیان بوو لەغەزای غابە)[٥٥٧]. سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: (وەڵلاهی سێ ڕۆژ لەمەدینە ماینەوە لە دوای گەڕانەوەمان لە غەزای (غابە) ئینجا ڕۆیشتین بۆ (خەیبەر) لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ)[٥٥٨]. لەگێڕانەوەیەکی تردا موسی کوڕی عوقبە دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ هاتەوە بۆ مەدینە لەدوای ئاشتەوای (حودەیبیە) بیست (٢٠) ڕۆژ یان کەمتر لە (٢٠) بیست ڕۆژ لەمەدینە مایەوە دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ غەزای خەیبەر خوای گەورە هەر لە حودەیبیە بەڵێنی فەتح کردنی پێدابوو وەك دەفەرموێت: ﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ (الفتح: ٢٠))[٥٥٩]. واتە: ﴿خوا بەڵێنی بە چەند دەسکەوتێکی زۆر دانێ جگە لەخەیبەر، جا بەزوویی ئەمەیانی دەستخستن، واتە: غەنیمەتەکەی خەیبەر. ڕێی لە خەڵکانی دەست درێژکەرانیشی لێگرتن، نەیهێشت جولەکەو هاوپەیمانەکانیان - لە بەنی ئەسەدو غەطەفان- زاڵ بین بەسەرتاندا وەبۆ ئەوەی دەستکەوتەکە بێ بەنیشانەیەك لە ڕاستی بەدیهێنانی بەڵێنی خوا بۆ بڕوادارەکان هەروەها ڕێنمایشتان بکات بۆ ڕێگەیەکی ڕاست و بتانگەیەنێتە بەهەشت﴾.

لەوکاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ بەنیازی دەرچوون بوو بەرەو خەیبەر ئەو خێڵەکیانە هاتنە خزمەتی کە لە (حودەیبیە) دواکەوتبوون تا لەگەڵیدا بڕۆن بەمەبەستی دەستخستنی دەسکەوت و تالانی جەنگ خوای پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد کە

---

[٥٥٧] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢١١/٣)، وابن عبد البر (الدرر) (ص: ٢٢٨)، وابن كثير (البداية) (٢٠٦/٤)، والصالحي (سبل الهدى) (١١٥/٥).

[٥٥٨] اخرجه: مسلم (١٨٠٧)، وابوداود (٢٧٥٢)، والبيهقي (الدلائل) (١٨٢/٤).

[٥٥٩] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٩٤/٤)، وانظر: (زاد المعاد) لابن القيم (١٤٧/٢).

ڕێگەیان پێنەدات و بیان گێڕێتەوە هەروەك دەفەرموێت: ﴿ سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (الفتح: ١٥). واتە: ﴿ئەوانەی کە لەپێغەمبەر ﷺ دواکەوتن ودەرنەچوون لەگەڵی بۆ حودەیبیە، کاتێ ئێوە بەرێکەوتن بۆ دەستکەوتەکان لە خەیبەر دەڵێن: وازمان لێ بێنن، ئێمەیش لەگەڵتان بێین بۆ خەیبەر دەیانەوێت کە فەرمایشتی خوا بگۆڕن ، واتە: بە بەشدار بوونیان لە غەنیمەت ودەسکەوتەکانی خەیبەر، چونکە خوا- جل جلالە- بەڵێنی دابوو بە ئەهلی حودەیبیە کەدەسکەوتەکانی خەیبەر هەر بۆ ئەهلی حودەیبیە دەبێ نەك کەسانی تر. پێیان بڵێ: نابێ هەرگیز لە شوێنمان بێن، خوا پێش گەڕانەوە لەحودەیبیە وایفەرمووە کەنابێ هیچ کەستان بەشدار بێت لەو دەستکەوتانەدا حودەیبیەدا، کەچی ئەوانە دەڵێن: ئەمەبەڵێنی خوا نییە، بەڵکو ئێوە هەر بەخیلیی و حەسوودیمان پێ دەبەن، نەخێر، وانیە، بەڵکو ئەوانە کەم تێدەگەن.﴾ هەر لەبەر ئەوەش بوو پێغەمبەری خودا ﷺ بەنیازی دەرچوون بوایە بۆ غەزا ڕایدەگەیاند و دەیفەرموو: (ئەو کەسەی مەبەستی جیهادکردن نیە لە پێناوی خودا با لەگەڵماندا نەیەت)[٥٦٠].

پێغەمبەری خودا ﷺ وەك کاری هەمیشەی خۆی ویستی پلانێکی ورد دابڕێژێت سەرەتا هەوڵیدا عەرەبە خێڵەکیەکانی (نجد وغەطاف) سەرقاڵ بکات تاکو هاوکاری و پشتگیری جولەکەکانی خەیبەر نەکەن ئەوە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی تێڕوانینی خەڵکی لەمەبەستی سەرەکی خۆیان بگۆڕن کە بەجەنگ هاتنە لەگەڵ جولەکەکانی خەیبەر، لەئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ سریەیەکی دە(١٠) کەسی بەسەرکرایەتی (ئیبانی کوڕی سەعدی کوڕی عاص)ی نارد لەمەدینەوە ڕووە و ناوچەی (نەجد) ئەوە بوو ئیبان و هاوەڵەکانی گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەخەیبەر دوای ئازادکردنی)[٥٦١].

---

[٥٦٠] اخرجە: ابن سعد (الطبقات) (١٠٦/٢)، وابن كثير (السيرة) (٣٤٤/٣)، لابن حجر (فتح الباري) (٤٦٥/٧).

[٥٦١] اخرجە: البخاري (٤٢٣٨) تعليقاً، ابوداود (٢٧٢٣)، وإبن حبان (٤٨١٤) وقال محققه إسناده صحيح على شرط مسلم، البيهقي (السنن الكبرى) (٣٣٤/٦) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن أبي داود) (٢٣٦٤).

پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچوو بۆ خەیبەر هەروەك ئیبن قەیم دەڵێت: (بە هەزارو چوارسەد (١٤٠٠) کەس لەهاوەڵانی (٢٠٠) دووسەدیان ئەسپ سواربوون هەندێك لە ئافرەتانی بەنی غیفاریان لەگەڵدا ڕۆیشت. لە ئافرەتێکی بەنی غیفارەوە دەگێڕنەوە کەناوی ئومیەی کچی قەیس بوو دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئافرەتانی بەنی غیفار وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەمانەوێت لە خزمەتتدا بەشداری بکەین بەرەو ئەو جێگایەی بۆی دەچیت کەبەرەو خەیبەر دەڕۆیشت لەوێدا بریندارەکانی موسوڵمانەکان تیمار دەکەین و هاوکارییان دەکەین بەپێی توانامان پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: لەسەر بەرەکەتی خودا بەشداری بکەن)[٥٦٢].

لە فەرمودەیەکی لاوازدا ژمارەیان هاتووە کە لە دایکی زیادەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: (کەلە غەزای خەیبەردا شازدە (١٦) ئافرەت بەنیازی بەشداری کردن بوون لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو هەواڵەش گەیشتەوە پێغەمبەری خودا ﷺ و بەدوایدا ناردن فەرمووی: ((بِإذْنِ مَن خَرَجْتُنَّ ومع مَن خرجتنَّ)) ورأينَ فيهِ الغضَبَ، فقلن يا رسول الله خرجنا وَمعَنا دواءٌ نُداوي بِهِ الجرحى ونناول السهام ونسقي السويق ونغزلُ الشعر، ونعين في سبيل الله. فقال لَهنَّ ((أقمن))[٥٦٣]. واتە: (کێ ڕێگەی پێداون دەربچن لەگەڵماندا وە لەگەڵ کێدا هاتوون؟ ئەوان تووڕەییەکیان لە پێغەمبەری خودا ﷺ بەدی کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە دەرچووین چارەسەرو دەرمانمان پێیە بۆ تیمارکردنی برینداران و

---

(٥٦٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٢١) رقم (٨٦٧) وقال محققه: اسناده حسن، عن ابن اسحاق، وأبوداود (٣١٣)، البيهقي (الكبرى) (٢/٤٠٧) وقد أورد قطعة منها. الترمذي (١٦١٥) وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٦٢٠) صحيح الأسناد مقطوع، وذكره ابن سعد (الطبقات)(٨/٢١٤)، ابن كثير (السيرة) (٢/٣٨٧)، وابن القيم (زاد المعاد) (٢/١٥٣).

(٥٦٣) أخرجه: أحمد (٥/٢٧١)، رقم (٢٢٣٣٢) وقال محققه اسناده ضعيف، وابن أبي شيبة (١٢/٥٢٥)، وابوداود (٢٧٢٩)، والنسائي (الكبرى) (٨٨٧٩)، الطبراني (الكبير)(٢٥/١١٠)، أبوداود (٢٧١٢)، البيهقي (الكبرى) (٦/٣٣٣) وقال: منقطع لاتقوم به حجة، والخطابي (معالم السنن) (٤/٤٩) وقال محققه: إسناده ضعيف، وقال الشيخ الألباني (فقه السيرة) (ص: ٣٧٦)، وفي (الارواء) (١٢٣٣٨) حديث ضعيف، وأوردة صديق حسن خان في (الروضة) (٢/٧٤١) وقال محققه (صبحي حلاق)حديث ضعيف.

تورکۆدەکەینەوەو خواردنی قاوت دەگێڕین و موو و پەتیش دەڕێسین و هاوکاری دەکەین لە پێناوی خوادا. پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: بەشداری مەکەن و بمێننەوە).

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە ژمارەیەك لە جولەکەکان بەشدارییان کردووە لە ڕیزی موسوڵمانانلدا لە غەزای خەیبەردا، ئەوەش گێڕانەوەیەکی لاوازە لە ئیبن عباسەوە ﷺ دەڵێت: (کە پێغەمبەری خودا ﷺ داوای بەشداری کردنی کردووە لە خەڵکانێکی جولەکە ژمارەیان (١٠) کەس بوو لە جولەکەکانی مەدینە) لە ڕۆژی خەیبەردا)[564].

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە ابوطلحەی ئەنصاری کرد کە مێرد منداڵێکی بۆ دەستە بەربکات تا خزمەتی بکات لەو سەفەرەیدا کە بۆ خەیبەر دەچێت هەتاکو دەگەڕێتەوە. لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ابوطلحەی ئەنصاری (مێرد منداڵێکمان بۆ دەستەبەربکە لەمنداڵەکانی خۆت بۆ ئەوەی خزمەتمان کات هەتا لە خەیبەر دەگەڕێینەوە پاشان ابوطلحەی منی لە دوای خۆیەوە سوارکرد و ڕۆیشتین منیش خزمەتی پێغەمبەری خودام دەکرد لەهەر شوێن و جێگایەك دابەزیایە. . . .)[565].

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی دەرچوون بەرە و خەیبەر (حوسەیلی کوڕی خارجەی ئەشجەعی ڕێبەری دەکرد وەك چاو ساغی ڕێگا)[566]. خەیبەر شارێکی خاوەن کشتوکاڵ و کێڵگەی پڕاوپڕ لەسەوزایی و دارخورما بوو لە دوری (٧٠) میل کەدەکاتە (١١٢)کم)[567] لەمەدینەوە دوور بوو پێغەمبەری خودا ﷺ (سیباعی کوڕی عورفطەی غیفاری) لە جێگای خۆی کردە سەرکاری مەدینە، لەو کاتەدا ئەبوهورەیرە ﷺ موسوڵمان بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە. لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (من هاتم بۆ مەدینە لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمەکانم و پیاوانی هۆزەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر بوو

---

[563] أخرجه: سعيد بن المنصور (٢/٢٨٤) (١٢٧٩٠)، وعبدالرزاق (٩٣٢٩)، وابن أبي شيبة (١٥٠١٢)، والترمذي (٤/١٢٨) مرسلاً، ابوداود (المراسيل) (٢٨١)، البيهقي (الكبرى) (٩/٥٣) وقال: منقطع واسناده ضعيف فيه الواقدي ولم يُبلغنا في هذا حديث صحيح، وقال محقق (الروضة الندية) (٢/٧٢١): رجاله ثقات.

[564] أخرجه: أحمد (٣/١٥٩)، والبخاري (٦٣٦٣)، ومسلم (١٣٩٥)، والنسائي (٨/٢٧٤).

[565] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٥٦٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٦/١٤٨) فيه ضعيف.

[566] انظر: (السيرة) لابي الحسن الندوى (ص: ٣١٢).

سیباعی کوڕی عورفطەی لە جێگای خۆی بەجێ هێشت بوو بەسەرکاری مەدینە دوای چووین بۆ لای ئەو لەنوێژی بەیانیدابوو لە ڕکاعەتی یەکەم (سورەتی مەریەم)ی خوێند لە ڕکاعەتی دووەم (ویل للمطففین) من لەدڵی خۆمدا وتم: هاوار بۆ فلان کەس گەر شتی بکڕیایە بۆ خۆی بەتەواوی دەیکێشێت وەری دەگرت وە ئەگەر بەخەڵکی بفرۆشتایە بەکەمی و سوکی دەیکێشێت و دەیدانێ. دەڵێت: کاتێك لەنوێژبۆوە شتێکی لەخواردن دایێ هەتا پێی گەیشتینە خەیبەر)[٥٦٨]. پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی سوننەتی دەکرد و لەسەر پشتی گوێدرێژەکەیەوە کە سواری ببوو ڕوو بەڕووی خەیبەر لە ئیبن عمرەوە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودام ﷺ بینی نوێژی دەکرد لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی سواربووبوو بەرەو خەیبەر دەڕۆیشت (ڕووگەش کەوتبووە پشتەوە)[٥٦٩]. پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر پەنای دەگرت بە خوا لە خەم و خەفەتباری لە کاتی نزاو پاڕانەوەکانیدا کەلە ڕێگابەرەو خەیبەر دەڕۆیشتن لەئەنەسەوە ﷺ سەبارەت بە خزمەت کردنی بۆ پێغەمبەرو ڕۆیشتنیان بەرەو خەیبەر دەفەرموێت: [من خزمەتی پێغەمبەری خوام دەکرد هەر کاتێك دابەزیایە لە شوێنێك خۆم گوێم لێبوو زۆر دەیفەرموو: ((اللهم إني أعوذ بكَ مِن الهَم والحزن والعجز والكسل والبخل والجبن وضلعِ الدَّين وغلبة الرجال))][٥٧٠]. واتە: (خوایە پەنات پێدەگرم لەدڵ تەنگی و خەفەت ولەبێ دەسەلاتی و دەستەوسانی وە لەتەمەڵی وله

---

[٥٦٨] أخرجه: أحمد (المسند) (٣٤٥/٢) وقال الارناؤوط في تحقيقه لـ(صحيح ابن حبان) (٤٢٥/٥): اسناده صحيح وصححه ابن خزيمة، والحاكم (٣٦/٣) صححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧١٥٦) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، والبيهقي (الدلائل) (١٩٨/٤)، والبزار(٢٢٨١)، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد) (١٣٥/٧): رواه البزار ورجاله رجال الصحيح الا شيخ البزار وهوثقة، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٩٦٥).

[٥٦٩] أخرجه: عبد الرزاق (٤٥١٩)، وأحمد (٥٥٥٧)، ومسلم (٧٠٠)، ومالك (٢٥٧/١، ١٦٥)، وأبي داود (١٢٢٦)، والنسائي (٦٠/٢)، وابن حبان (٢٥١٥) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما، والحاكم (٤٦٦/٢) صححه ووافقه الذهبي، وقال الحافظ (فتح الباري) (٥٧٦/٢) رواه السراج واسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٠٨٥)، و(صحيح النسائي) (٧١٥).

[٥٧٠] أخرجه: أحمد (١٥٩/٣)، والبخاري (٦٣٦٣)، ومسلم (١٣٦٥)، والنسائي (٢٧٤/٨).

چروکی وترسنۆکی وەلەپشت چەمانەوە بەهۆی قەرزداری و لەزاڵ بوونی ناپیاو بەسەرماندا).

هەندێك لە هاوەڵانی بەسەر بەرزاییەکدا سەرکەوتن (الله اکبر) یان دەوت بەدەنگی بەرز پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی نەدان بەو شێوەیە یادو نزای خوا بکەن لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەڵێت: لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای خەیبەری دەکرد خەڵکەکە بەرەو دۆڵێك شۆڕدەبوونەوە. لە گێڕانەوەیەکی تردا [خەڵکەکە هەر نشێو و دۆڵێکیان دەگرتە بەر پاشان سەردەکەوتن پیاوێکیان سەردەکەوت][571] و بەدەنگی بەرز هەموو هاواریان دەکردو دەیان وت: (الله اکبر الله اکبر لااله الا الله) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أيها الناس إربعوا على أنفسكم انكم لاتدعون اصمٌ ولاغائباً انكم تدعون سميعاً قريباً وهو معكم)) وفي رواية [والذي تدعونه أقرب الى احدكم من عُنق راحلة أحدكم][572] [قال أبو موسى] وأنا خلف دابة رسول الله ﷺ فَسَمِعَني وَأنا أقول: لاحول ولاقوة إلاّ بالله، فقال لي: يا عبد الله بن قيس قلتُ لبيكَ يا رسولَ الله، قال: ((ألا أدلُكَ على كنز من كنوز الجنة ؟ قُلْتُ: بلى يا رسول الله فداك أبي وَأمي قال: ((لاحول ولا قوة إلاّ بالله))[573]. واتە: (ئەی خەڵکینە خۆتان هێورو ئاسودە بکەن ئێوە بانگی یەکێك ناکەن نەبیستێت یاخود لاتان نەبێت بەڵکو بانگ و هاوار لەیەکێك دەکەن بیسەرو نزیکە لێتان ئەو لەگەڵتانە لە هەر شوێنێ بن.

لەگێڕانەوەیەی تردا ئەوەی ئێوە بانگی لێدەکەن نزیکترە لەهەریەکێکتان لەگەردنی وشترەکانتان). ئەبو موسی دەڵێت: من لەپشتی وڵاخەکەی پێغەمبەرەوە بووم ﷺ کەسواری بشتی ببوو گوێی لێبوو من ئەم زیکرەم دەخوێند (لاحول ولاقوة الا بالله) پێی فەرمووم ئەی عبدوڵای کوڕی قەیس وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی: هەواڵت بدەمێ

---

(571) في رواية ابن حبان (٨٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(572) أخرجه: مسلم (٢٧٠٩).

(573) أخرجه: أحمد (٤/٤٣)، والبخاري (٤٢٠٢، ٧٣٨٦)، مسلم (٢٧٠٤)، والترمذي (٣٣٧٤)، وابي داود (١٥٢٨) وابن ماجة (٣٨٢٤)، وابن حبان (٨٠٤)، وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٠٨٢).

دەربارەی گەنجینەیەك لەگەنجینەکانی بەهەشت؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدایك و باوکەوە بەقوربانت بم فەرمووی: (لاحول ولاقوة الا بالله).

لەکاتی ڕێ ڕۆیشتنی سوپاکە بەرەو خەیبەر لەوکاتەدا پیاوێك لە موسوڵمانەکان لە ڕێگەدا چووە ناو کەلاوەیەك بەمەبەستی دەست بەناو گەیاندن کەرتە خشتێکی بەردەست کەوتبوو خۆی بێ پاك بکاتەوە هەر کە خشتەکەی دەرهێنابوو زێڕدەرکەوت و هەڵیگرت لەگەڵ خۆی و هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکێشە کێشای بای دووسەد درهەم بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هذا رکاز وفيه الخمس))[٥٧٤]. واتە: (ئەوە لەوکانزا شاراوانەی زەوییە بەدەرکەوتووە وەیەك لەسەر پێنجی ببەخشە و ئەوەشی مایەوە هی خۆتە)، ئەمە فەرمودەیەکی لاوازە تەنها بۆ مەبەستی شارەزابوون هێناومانە.

لەڕێگادا لە کاتێکدا سوپاکە بەشەو دەڕۆیشت یەکێك لەهاوەڵان داوای لە عامری کوڕی ئەکوەع کرد کە شاعیرێکی ناسراوبوو تا خەڵکەکە گەرم و گوڕبکات وشترەکانیان چالاکتربکات بە هۆرە و دەنگی لەو شەوڕەوییەدا. ئەویش هەندێك لەهۆرەو شیعرەکانی بۆ وتن بەوئاوازەی کە وشتر سوارەکان دەیانوت بۆ ئەوەی وشترەکانیان گورج تر بڕۆن. لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەڕۆیشتین بۆ خەیبەر بەشەو دەڕۆیشتین پیاوێ لەخەڵکەکە وتی: ئەی عامر ئادەی با گوێ بیستی هۆنراوەکانت بین؟ عامر کەڵە شاعیربوو بەدەنگ و ئاوازەکەیەوە کەوتە شیعر خوێندنەوە دەیوت:

اللهم لولا أنت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

فاغفر فداءً لك ما اتقينا وثبت الأقدام ان لاقينا

والقين سكينة علينا انا اذاصيح بنا اينا

وبالصياح عوّلوا علينا

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من هذا السائق؟)) ئەوە کێ بوو وشترەکانی بردە ڕێوە؟ وتیان: ئەوە عامری کوڕی ئەکوەع بوو فەرمووی: ((يرحَمُهُ الله)) خودا ڕەحمی پێبکات

[٥٧٤] أخرجه: أحمد (١٢٨/٣) رقم (١٢٢٩٨) وقال محققه الارناؤوط اسناده ضعيف، والبيهقي (١٥٥/٤) وقال فيه عبدالرحمن بن يزيد ضعيف.

پیاوێك لەناو خەڵکەکەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ نزاکەت بۆی گیرادەبێت و شەهید دەبێت خۆزگە زیاتر لەناوماندا دەبوو[٥٧٥]. لەگێڕانەوەیەکی تردا سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: (چونکە عامر مامی سەعدبوو) پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (پەروەردگارت لێت خۆش بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ بەتایبەتی داوای لێخۆش بوونی بۆ هەرکەسێك بکردایە ئەو کەسە شەهید دەبوو دەڵێت: عومەری کوڕی خطاب لەسەر پشتی وشترەکەیەوە بەدەنگی بەرز وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆزگە زیاتر هاوەڵایەتیمان لەگەڵ عامر بکردایە. . . .)[٥٧٦]. لەگێڕانەوەیەکی تردا لە سەلەمەوە ﷺ دەڵێت: (ئەوە بوو عامر لە غەزای خەیبەر شەهیدکرا)[٥٧٧].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەمەدینەوە دەرچوو بەرەو خەیبەر ڕێگەی شاخی (عصر)ی گرتەبەر پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بەسوپاکەیەوە ڕۆیشت هەتاکو گەیشتە دۆڵێك بەناوی (ڕەجیع) لەوێدا لایاندا کە دەکەوێتە نێوان خەیبەرو غەطفان لەو نێوەدا مابوونەوە تاکو غەطفان لە جێگای خۆیان بمێننەوە نەچن هاوکاری جولەکەکانی خەیبەر بکەن چونکە لەوەپێش بەڵێنیان دابوو پشتگیری یەکتر بکەن و هاوپەیمانی یەکتربن گەر پێغەمبەری خودا ﷺ هێرشی کردە سەریان. بۆیە کاتێك بیستیان کە پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووە بەرەو خەیبەر خۆیان کۆکردەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسوڵمانەکان دەرچوون بەرە و خەیبەر بۆ پشتیوانی کردنی جولەکەکان بەڕێکەوتن هەتا قۆناغێك ڕۆیشتن پاشان گوێیان لەدەنگ و هەرایەك بوو لەدوایانەوە ترسان لەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ بدات بەسەرماڵ و خێزانیاندا لەبەر ئەوە بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە و چوونە سەرموڵك و ماڵی خۆیان و بەمەش پێغەمبەری خودا ﷺ دەست واڵابوو بۆ پەلاماردانی خەیبەر)[٥٧٨].

---

[٥٧٥] أخرجه: أحمد (٤/٤٧)، والبخاري (٤١٩٦)، ومسلم (١٨٠٢).
[٥٧٦] أخرجه: أحمد (٤/٥٢)، ومسلم (١٨٠٧)، ابوداود (٢٧٥٢)، والبيهقي (الدلائل) (٤/١٨٢).
[٥٧٧] أخرجه: احمد (٣/٤٣١)، وابن هشام (٣/٤٥٥) (٨٤١) وقال محققاه: اسناده ضعيف، وقال الهيثمي في (المجمع) (٦/١٤٨) رواه احمد والطبراني ورجالهما ثقات.
[٥٧٨] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٣٨٠)، و(الدرر) (ص: ٢٣٠)، والطبري (تاريخ الطبري) (٣/٩)، وابن كثير (البداية) (٤/٢١٢).

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتە شوراکانی خەیبەر داوای کرد خواردنیان بۆ بهێنن ئەوەی پێیانە کۆی بکەنەوە بۆ ئەوەی سوپاکە نان بخوات تاوەکو ئامادەباشییەك بێت بۆیان بۆ هێرش کردن. لەسویدی کوڕی نوعمانەوە ﷺ دەفەرموێت: (کەلەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بووە لە خەیبەر هەتاکو چوونە (صەهباء) کە دەکەوێتە خواروی خەیبەرەوە نوێژی عەسری لەوێدا کرد و پاشان داوای کرد خواردنەکەیان بهێنن هیچیان پێنەبوو تەنها قاوت نەبێت فەرمانی کرد بیکەن بە تریت و دای بنێن ئەو خواردی و ئێمەش خواردمان پاشان هەستا بۆ نوێژی شێوان ئاوی لەدەم وەردا و ئێمەش بەهەمان شێوە پاشان نوێژی کرد و دەست نوێژی تازە نەکردەوە)[٥٧٩].

لە گێڕانەوەیەکی تردا [بەنی (فزارە) لەوانە بوون کە هاتبوون بۆ پشتیوانی کردن لە جولەکەکانی خەیبەر پێغەمبەری خودا ﷺ بەهۆی نێردراوێکەوە ئاگاداری کردنەوە کە هاوکارییان مەکەن وە داوای لێکردن گەر ئەوان جێیان بهێڵن ئەوا لە خەیبەردا ئەوێ و ئەوێ بۆ ئەوان دەبێت بەڵام ئەوان پشتیان هەڵکرد و گوێیان بەم داوا کارییەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەدا][٥٨٠]. پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی بەشەو گەیشتنە خەیبەر. ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتە خەیبەر لەشەودا کاتێك گەیشتنە دەوروبەری خەیبەر شەو بوو خەڵکەکە پێیان نەزانی پێغەمبەریش ﷺ گەر هێرشی بکردایە سەر هەر جێگەیەك نزیك نەدەبۆوە هەتاکو بەرەبەیان ئەگەر گوێ بیستی دەنگی بانگ بووایە دەوەستا ئەگەر نا بەرەو پێش دەچوو، لە دەوروبەری خەیبەر سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ بارگەیان خست ئەو شەوە پێغەمبەری خودا ﷺ لەوێدا هەتا بەیانی مایەوە هیچ کەس نەیزانی بە هاتنەکەیان وە لەوێشدا دەنگی بانگیان نەبیست)[٥٨١].

---

(٥٧٩) أخرجه: البخاري (٤١٩٥، ٥٣٩٠)، والحميدي (٤٣٧)، وعبد الرزاق (٦٩١)، وابن ابي شيبة (٤٨/١)، واحمد (٤٦٢/٣)، ومالك (٣٧/١)، والنسائي (١١٨/١)، وابن ماجة (٢٤٩٣)، والطبراني (الكبير) (٦٤٥٥)، وابن حبان (١١٥٢) وقال محققه اسناده صحيح.

(٥٨٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٤٨/٤) عن موسى بن عقبة عن ابن شهاب.

(٥٨١) أخرجه: البخاري (٦١٠) (٤١٩٧)، ومسلم (١٣٦٥)، ومالك (٤٦٨/٢)، والترمذي (١٥٥٠) وقال حسن صحيح، والنسائي (٢٧٢/١)، واحمد (١٠٢/٣)، (صحيح سنن الترمذي) (١٢٥٣).

هەر کە بەیانی بۆوە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی بەیانی بە هاوەڵانی کرد لەئەنەسەوە دەفەرموێت: (کە پێغەمبەری خودا ﷺ غەزای خەیبەری کرد نوێژی بەیانیمان بە تاریکی کرد لەدەرەوەی خەیبەر ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ بەسواری ڕۆیشت دوای ئەبو طلحە و منیش لەدوای ئەبوطلحە سواربووم پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشت تا نزیک بۆوە لەدەروازەی شاری خەیبەر، بە جۆرێك لە پێغەمبەری خودا ﷺ نزیك بووم کەچۆکم بەر ڕانی پیرۆزی کەوت و لەچکی ئیزارەکەی لەسەر ڕانی لاچوو بە جۆرێك سپیایی ڕانی پێغەمبەری خودام ﷺ دەبینی)[٥٨٢]. [کاتێك بەیانی بۆوە جولەکەکان بە بێڵ و پاچ و خاکەنازەکانیان هاتنە دەرەوە بۆ سەر کارەکانیان][٥٨٣] [هەرکە پێغەمبەری خوایان بینی ﷺ بە سوپاکەیەوە بە گورجی گەڕانەوە بەرەو قەڵاکانیان] وتیان: وەڵڵاهی ئەوە (محمد) و سوپاکەیەتی واهات [هەرکە چوونە ناو خەیبەر][٥٨٤]. فەرمووی: (([الله اکبر]، الله اکبر خربت خیبر انّا اذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرین))[٥٨٥]. واتە: (خەیبەر وێران بوو (کاول) بوو ئێمە بۆ هەرخەڵکێك بچینە مەیدانەوە خوا خراپیان بەسەر دێنێت و سزایەکی ترسێنەریان بەسەردێنێت). سێ جار ئەمەی دووپات کردەوە. کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ شارەکەی لێ دیارکەوت و بەسەر شارەکەدا دەیڕوانی پاڕایەوە لە خودای گەورە، ئەبو مروان ئەسلەمی ئەویش لە باوکیەوە ئەویش لە باپیرییەوە دەڵێت: دەرچووین لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەو خەیبەر هەتاکو نزیك بووینەوە و لێمان دەرکەوتن پێغەمبەری خودا ﷺ بە خەڵکەکەی فەرموو: ((قفوا) فوقف الناس فقال: (اللهم ربَّ السموات السبع وما اظْلَلنَ، وربَّ الأرضين السبع وما اقلَلْن، وربَّ الشیاطین وما أظللن، فانا نسألكَ خیر هذه القریة وخیر أهلها وخیر ما فیها، ونعوذ بك من شر هذه القریة وشر أهلها وشر ما فیها، أقدموا بسم الله الرحمن

---

(٥٨٢) أخرجه: مسلم (١٨٠٢).

(٥٨٣) أخرجه: البخاري (٤١٩٧)، ومسلم (١٨٠٢).

(٥٨٤) أخرجه: أحمد (١٩/٥) وقال ابن كثير في (البداية) (١٨٤/٤)، اسناده على شرط الصحيحين.

(٥٨٥) أخرجه: البخاري (٤١٩٧)، وانظر: (صحيح النسائي) (٤٠٤٨).

الـرحيم))[٥٨٦]. واتـە: (ڕاوەسـتن خەلکەکە وەستا پاشان فـەرمووی: خودایـە پەروەردگاری حـەوت ئاسمانـەکان و ئـەوەی سێبـەری بۆ دەکات پـەروەردگاری حـەوت چینەکەی زەوی و ئەوەی هەڵیگرتووە پەروەردگاری شـەیتانەکان و ئەوانـەی گومڕایـان کـردوون، داوای خێرو چاکەی ئەم ئاوەدانیەت لێ دەکەم چاکەی خەلکەکەی وە ئەو چاکەیەی کە تێیدایە و پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئـەم شـارە و خراپـەی خەلکەکـەی و خراپـەی ئـەوەی تێیدایە بەناوی خوای گەورەو میهرەبان بەڕێکەون).

جولەکـەکان چـوونە نـاو قـەڵاکانیان و سـەنگەریان دامەزرانـد و خۆیـان قـایم کـرد لە ناویاندا. لە بوریدە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خـودا ﷺ دوچـاری سـەر ئێشـەیەکی تونـد هات یەك دوو ڕۆژ بەم شێوەیە مایەوە نەچووە دەرەوە کاتێك گەیشتینە خەیبـەر دوچاری سەر ئێشە بوو نەدەچووە دەرەوە بۆلای خـەلکی. لـە گێڕانـەوەیـەکی تـردا [پێغەمبـەری خودا ﷺ ئەبوبکری نارد بۆ چەند قەڵایەکی خەیبەر] ئەبوبکری صدیق ئاڵای پێغەمبەری خودای ﷺ وەرگرت و پاشان هەستا ڕۆیشت شەڕێکی پاڵەوانانەو سەختی کرد پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر نەیتوانی قەڵاکانیان بگرێت)[٥٨٧].

پاشـان لـەدوای ئـەو پێغەمبـەری خـودا ﷺ عومـەری کوڕی خـەطابی کـردە فەرماندە بوریدە ﷺ دەڵێت: (ئابڵوقەی خەیبەرمان دابوو ئەبوبەکر بوو بەفەرماندە ئاڵاکەی وەرگرت بۆی فەتح نەکراو گەڕایەوە پاشان بۆ ڕۆژی دواتر عومەر بەرەو شار و قەڵا و کۆشکەکانیان ڕۆیشت ڕووبەڕووی شەڕێکی سەخت بۆوە کە زۆر بەهێزتربوو لەشەڕی یەکەم جار لەگەڵ ئەبوبەکر زۆری نەبرد عومەر و هاوەڵەکانی دوچاری شکست بوونـەوە و گەڕایەوەو بۆیان فەتح نەکرا خەلکەکە ئەو ڕۆژە دوچاری برسیەتی و ماندویەتیەکی زۆر بوون)[٥٨٨].

---

(٥٨٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٢/٢٩٧)، النسـائي (عمـل اليـوم) (٥٤٦)، والحـاكم (١٠١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (٥/٢٥٢) وفي (الدلائل) (٤/٢٠٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠/١٣٤): رواه الطبراني واسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في تحقيق: (فقه السنة) (ص: ٣٩٦) حديث حسن.

(٥٨٧) أخرجه: الحاكم (٣/٣٧) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٠٩).

(٥٨٨) أخرجه: أحمد (٥/٣٥٣)، والطبراني (الكبير) (٦٣٠٣)، والنسائي (٨٤٠٣)، والحاكم (٣/٣٧) وصححه ووافقه الذهبي والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٠٩)، وأحمد (فضائل) رقم (١٠٠٩) وقال محققه: اسناده صحيح وقال الشيخ مقبل في (صحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (١٦٥) صحيح.

پاشان سەرکردەیەکی جولەکەکان هاتە دەرەوەو داوای شەڕی مەیدانی یەک بەیەکی لە موسوڵمانەکان کرد لە سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: کاتێک گەیشتینە خەیبەر سەرکردەیەکی جولەکەکان هاتە دەرەوەوکە ناوی (مرحب) بوو شمشێرەکەی بە فیزەوە ڕاوەشاند و ئەم چەند دێڕە هۆنراوەیەی دەوتەوە:

قد علمت خیبراً انيّ مرحب    شاكي السلاح بطلٌ مجربٌ

اذ الحروب اقبلت تلهب

دەڵێت: مامم بۆی چووە دەرەوە کەناوی (عامر) بوو شمشێرەکەی کورت بوو شاعیریش بوو بە هۆنراوە وەڵامی دلایەوە وتی:

قد علمت خیبراً انيّ عامرٌ    شاكي السلاح بطلٌ معامرٌ

پاشان هەر دووکیان لێکیاندا و شمشێرەکەی مرحب بەر قەڵغانەکەی عامر کەوت وە عامر ویستی لە ژێرەوە شمشێرێک لە قاچی مرحب بدات بەڵام شمشێرەکەی کورت بوو نوکەکەی هەڵگەڕایەوە و بەر خۆی کەوت و کڵاوەی ئەژنۆی گرت و پێی مرد سەلە دەڵێت: ڕۆیشتم گەیشتم بە چەند کەسێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ دەیان وت: کارەکەی عامر بەتاڵ بۆوە و خۆی کوشت دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەگریانەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کردەوەکانی عامر پوچ بۆتەوە خوا وەریناگرێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من قال ذلك)) واتە: کێ ئەوەی وت؟ منیش وتم: کەسانێک لە هاوەڵانی بەڕێزت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كذب من قال ذلك بل له أجره مرتين [وجمع بين اصبعيه انه لجاهد مجاهدٌ قلّ عربي مشى بها مثله))(٥٨٩). واتە: (ڕاست ناکات ئەوەی وابڵێت بەڵکو ئەو دوو پاداشت وەردەگرێت (پاشان دوو پەنجەی دەستی بردە لای یەک و فەرمووی: ئەو تێکۆشانێک بۆ ئیسلام تێکۆشا کەم کەس هەیە لە ناو عەرەبدا بەڕێگای ئەودا بڕوات و هاوشێوەی ئەو بێت لە پاداشتدا).

خەڵکی ئەو ڕۆژە دوچاری هەوڵ و تەقەلا وماندوبوون و برسیەتییەکی زۆر بوون و لێ براوانە شەڕیان دەکرد لە سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ دەڵێت: ((كان علي بن ابي طالب تخلف عن رسول الله ﷺ في خيبر وكان رمداً، فقال: انا اتخلف عن رسول الله ﷺ

---

(٥٨٩) اخرجه: البخاري (٤١٩٦)، مسلم (١٨٠٧).

فلحق به فلما بتنا الليلة التي فُتحت خيبر قال رسول الله ﷺ ((لأعطين [هذه] الراية غداً رجلاً [يحب الله و رسوله و يحبهُ الله و رسوله [ليس بفرارٍ] ولن يرجع حتى] يفتح الله على يديه، [في رواية أخرى قال بريدة...وفينا طيبة أنفسنا ان الفتح غدٌ"[قال عمر: فما احببت الأمارة الاَّ يومئذٍ] قال سلمة: فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يُعطاها، فلما اصبح الناسُ وغدوا الى النبي ﷺ كلهم يرجوا ان يعطاها. . . في رواية {فلما اصبح رسول الله ﷺ الغداة ثم قام قائماً فدعا باللواء والناس على مصافهم. . .](٥٩٠)))(٥٩١). واتە: (علی کوڕی ئەبو طالب لەو ڕۆژەی خەیبەر دواکەوت لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: من چۆن دوا دەکەم لە پێغەمبەر ﷺ پاشان پێی گەیشتمەوە کاتێك ئەو شەوە هات کە بەیانی خەیبەرمان فەتح کرد لەوێدا مایەوە بۆ حەسانەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەیانی ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست کەسێك خوداو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت و خوداو پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت (پشت هەڵناکات) و ناگەڕێتە دواوە هەتاوەکو خودای گەورە لەسەر دەستی ئەو خەیبەر ئازاد دەکات (لەگێڕانەوەیەکی تردا بوریدە ﷺ دەڵێت: . . . ئەو شەوە بەدڵنیاییەوە نوستین بێ گومان بووین لەوەی کە بەیانی خەیبەر ئازاد دەکرێت [عومەری کوڕی خطاب ﷺ دەڵێت: هیچ کاتێك حەزم لە بەرپرسیارێتی نەکردووە تەنها ئەو ڕۆژە نەبێت] (لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر) سەلەمە ﷺ دەڵێت: خەڵکەکە ئەو شەوە نوستن لەبیری ئەوە دابوون کە ئاڵاکە دەبێت بدرێت بە کێیان هەرکە بەیانی بۆوە خەڵکەکە بەرەو لای پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشتن هەریەکەیان بەهیوای ئەوە بوو ئاڵاکەی بۆ بدرێت بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئەو شکۆمەندیە.

---

(٥٩٠) أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٠٠٩) وقال محققه اسناده صحيح.

(٥٩١) أخرجه: البخاري (٣٧٠١) (٤٢١٠)، ومسلم (٢٤٠٤-٢٤٠٦)، وأحمد (٥/٣٣٣)، وابو داود (٣٦٦١)، والطبراني (الكبير) (٥٨٧٧)، والحاكم (٣/٣٨) وصححه البيهقي (٩/١٠٦)، وابن حبان (٦٩٣٢) وقال محققه: صحيح على شرطهما، والبغوي (٣٩٠٦)، و(الحلية) (١/٦٢)وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣١٠٩) و(صحيح الجامع) (١٥١١)، و(فقه السيرة) (ص: ٣٧١) عن سهل بن سعد.

لە گێڕانەوەیەکی تردا (کاتێك بەیانی داهات پێغەمبەری خودا ﷺ هەستایە سەرپێ و دوای ئاڵاکەی کرد خەڵکەکەش بەڕیز وەستابوون). لە گێڕانەوەیەکی تردا (پێغەمبەری خودا ﷺ ئاڵاکەی گرتبوو بەدەستەوە ڕای دەشەکاند پاشان فەرمووی: کێ ئەم ئاڵایە وەردەگرێت و حەقی دەدات؟ زوبیری کوڕی عەوام ﷺ هات وتی: من، فەرمووی: بکشێوە، ئینجا پیاوێکی تر هات هەستا پێی فەرموو: بکشێوە، دوای ئەو کەسێکی تر هەستا وتی: من، فەرمووی: بکشێوە، ئینجا فەرمووی: ((والذي كرّم وجه محمد لأعطينها رجلاً لايَفر بها))[٥٩٢]. واتە: (سوێند بەو زاتەی کە ڕێزی لەمحمد گرتووە بە پێغەمبەرایەتی ئەو ئاڵایە دەدەمە دەست کەسێك ڕاناکات و دوچاری شکستی ناکات). (دوای ماوەیەك بەوشێوەیە فەرمووی)[٥٩٣]: (کوا علی کوڕی ئەبو طالب؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چاوی دێەشێت، فەرمووی: بانگی بکەن بۆم پاشان بە ئێمەی وت: بڕۆن بیهێنن بۆلام)[٥٩٤].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە سەلەمەوە ﷺ دەڵێت: (پاشان منی نارد بۆلای علی چاوی دێەشا و ئازاری هەبوو چوومە خزمەتی و هێنام من چاوساغی بووم چونکە ئەو چاوی بەئازاربوو هەتاکو بردمە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ)[٥٩٥]. [لە گێڕانەوەیەکدا لە علیەوە ﷺ دەڵێت: کاتێك گەیشتمە خزمەتی)[٥٩٦]. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چاوم ئازاری هەیە، و داهاتەوە و [چاوەکانی بۆ کردمەوە و تفی پیرۆزی تێکرد][٥٩٧] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە [بۆی پاڕایەوە و چاك بۆوە بەشێوەیەك دەتوت هەرگیز ئازاری

---

[٥٩٢] اخرجه: أحمد (الفضائل) (٩٨٧) وقال محققه: اسناده حسن، وأبويعلى (٤٩٩/٢) وقال الهيثمي (المجمع) (١٤٤/٩) رواه أبويعلى ورجاله رجال الصحيح غير عبدالله وهوثقة، قال ابن كثير (البداية) (١٨٥/٤) أسناده لابأس به، وقال الشيخ مقبل في (صحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٣٩٦) حديث صحيح.

[٥٩٣] اخرجه: البزار (١٨١٥)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٣٨٠٤٩)، والحاكم (٣٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه السيوطي في (كنز العمال) (١٢٧/٤) رقم (٣٠١١٩).

[٥٩٤] في رواية: البزار (١٨١٥)، وابن ابي شيبة (٣٨٠٤٩).

[٥٩٥] في رواية: مسلم (١٨٠٧).

[٥٩٦] في رواية: البزار (١٨١٥)، وابن ابي شيبة (٣٨٠٤٩).

[٥٩٧] نفس المصدر.

نەبووە][٥٩٨] پاشان فەرمووی: ((اللـهم اذهب عنه الحرّ والبرد)). واتە: (ئەی خودای پەروەردگار سەرماو گەرمای لەسەر لادەیت) دەڵێت: (لە دوای ئەو ڕۆژە نەسەرمام بوو نەگەرما. . .) [پێغەمبەر ﷺ ئالاکەی دایە دەستی][٥٩٩] و پێی فەرموو: ((اذهب فقاتل حتى يفتح الله عليك ولا تلتفت)). واتە: (بڕۆ پشت هەڵنەکەیت تا خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ فەتحی دەکات و ئاوڕنەدەیتەوە). لەگێڕانەوەیەکدا [علی ڕۆیشت زۆر بە خۆشحاڵییەوە پاشان بۆ ساتێکیش پشتی هەڵنەکرد علی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر چ شتێك شەڕ لەگەڵ ئەو خەڵکە بکەم (واتە: مەبەستی جولەکەکان بوو)][٦٠٠]. شەڕیان لەگەڵ بکەم هەتاکو وەك ئێمەیان لێدێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم ثم ادعهم الى الأسلام، وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه [وفي رواية: قاتِلهُمْ حتى يشهدوا ان لااله الاّ الله وان محمداً عبده ورسوله، فاذا فعلوا ذلك فقد منعوا منّا دمائهم وأموالهم الاّ بحقها وحسابُهُمْ على الله] فو الله لان يهدي الله بك رجلاً واحداً خيرلك من أن يكون لك حمر النعم))[٦٠١] واتە: (لەسەرخۆ بڕۆ هەتا بۆیان دەچیتە مەیدان پاشان بانگیان بکە بۆ موسوڵمان بوون و پێیان ڕابگەیەنە بەوەی لەسەریان پێویستە لە مافی خودا بەسەریانەوە.

لەگێڕانەوەیەکی تردا [شەڕیان لەگەڵ بکە هەتاکو شایەتمان دەهێنن ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوە خوێن و ماڵیان لە ئێمە حەرام دەبێت تەنها ئەوە نەبێت کەبە حەقی خودا دەکەوێتە سەریان لێپرسینەوەشیان لەسەر خودایە] سوێندبە خودا ئەگەر لەسەردەستی تۆ یەك کەسیان خودا هیدایەتی بدات باشترە بۆ تۆ لە مێگەلە وشترە سورەکان). (واتە: پاداشتی موسوڵمان کردنی یەك لەئەوان وەك پاداشتی بەخشینی مێگەلە وشترێکە لە

---

(٥٩٨) أخرجه: البخاري (٤٢١٠)، أحمد (١/٩٩)، وابن ماجة (١١٧)، وابويعلى (١/٣٧٤)، والطبراني (الأوسط) (٢٢٨٦) وقال محققه: اسناده حسن، والبزار (٢٥٤٦) (كشف الأستار) وقال الهيثمي (المجمع ١٢٢/٩)، ورواه الطبراني (الأوسط) واسناده حسن، وحسنه الشيخ أحمد شاكر في تعليقه على المسند (١٢٠/٢) وحسنه أيضاً الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (٩٥).

(٥٩٩) أخرجه: مسلم (١٨٧).

(٦٠٠) أخرجه: مسلم (١٨٠٧).

(٦٠١) أخرجه: البخاري (٤٢١٠).

پێناوی خودا). لە گێڕانەوەیەکی تردا علی ﷺ دەفەرموێت: [منیش بەگورجی ڕۆیشتم ترسام لەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگە وچارە و نەخشەیەکی تریان بۆ بدۆزێتەوە] [٦٠٢]. (...ڕۆیشتم هەتاکو گەیشتمە خەیبەر شەڕم لەگەڵ کردن) [٦٠٣]. قەڵاو قوڵەکانی خەیبەر دابەش ببوون بۆ دوو بەش بەشێکیان لە پێنج قەڵا پێك هاتبوو بە ناوەکانی (الناعم، الصعب بن المعاذ، الزبیر) ئەمانە کەوتبوونە ناوچەی (النطاة) وە قەڵای (ئوبەیی، نزار) کەوتبوونە ناوچەی [الشق] وە بەشی دووەمیان پێیان دەوت: [الکتیبة] کە سێ قەڵای لە خۆ دەگرت بەناوەکانی (قموص، کە گەورەترین قەڵای خەیبەر بوو، قەڵای کوڕانی ئەبو حەقیق، بوو هەروەها قەڵای (الوطیح و السلالم) بەشی یەکەمیان بە شەڕ گیراو فەتح کرا، بەشی دووەمیان بە پێکهاتن و ئاشتی فەتح کرا پلانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە هێرش بردنە سەر قەڵاکانی خەیبەر بریتی بوو لە سەرقاڵکردنی هەندێکیان بە هێزی بچوك بچوك و چڕکردنەوەی هێرشیش بۆ سەر قەڵاکانیان بە هێزی سەرەکی هەتاکو بەتەواوەتی دەستی بەسەر ئەو قەڵایەدا دەگرت پاشان هێرشە چڕوپڕەکەی دەگواستەوە بەرەو قەڵایەکتر [٦٠٤].

ئیبن هیشام (رحمه الله) دەڵێت: یەکەم قەڵا موسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەری قەڵای (ناعم) بوو بەسەرکردایەتی ئیمامی علی ﷺ لە سەلەمەوە فەرموویەتی: (علی ئاڵاکەی وەرگرت ئینجا دەرچوو بەگورجی هەڵیکوتایە سەریان من لەدواوەی بووم بە شوێنی ئەودا دەڕۆیشتم هەتاکو ئاڵاکەی بردە قەڵاکەوە لەسەر کەڵەکە بەردێکی کۆکراوە چەقاندی جولەکەیەك سەری دەرهێنا و سەیری کرد لەسەر قەڵاکەوە وتی: تۆ کێیت؟ وتی: من علی کوڕی ئەبو طالبم، جولەکەکە وتی: سەردەکەون سوێند بەوەی دابەزیووە بۆ سەر موسی ﷺ) [٦٠٥]. پاشان مەرحبی سەرکردەی سەربازی جولەکەکان داوای دابەزینی یەك بەیەکی

---

[٦٠٢] أخرجه: البزار (١٨١٥)، وابن ابي شيبة (٣٨٠٤٩).

[٦٠٣] في رواية ابن حبان (٦٩٣٤)وقال محققه اسناده صحيح.

[٦٠٤] أنظر: (الرسول القائد) لشيث خطاب (ص ٢٠٨).

[٦٠٥] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٣٠٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٩/٤)، وابن هشام (السيرة) (رقم: ٨٥٥) وقال محققا: اسناده ضعيف.

کرد بۆ مەیدان بۆ جاری دووەم لە موسوڵمانەکان، لە سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: (مەرحب هاتە دەرەوە بەلوت بەرزییەکەوە ئەم هۆنراوەیەی وت:

قد علمت خيبرا اني مرحب — شاكي السلاح بطلٌ مجربُ

اذ الحروب اقبلت تلهب

علی لە وەڵامیدا وتی:

أنا الذي سمتني أمي حيدرة — كليث غابات كرية المنظرة

أو فيهم بالصاع كيل السندرة. . . . . . . . .)[٦٠٦]

لە گێڕانەوەیەکدا [بوریدە دەڵێت: مەرحب لەگەڵ علی کەوتنە شمشێربازی ئەوە بوو عەلی شمشێرێکی کێشا بەسەریدا و چووە ناو ددانەکانی هەموو سەربازگەکە گوێ بیستی هاواری بوو وە سەری لەلاشەی جیاکردەوە و کوشتی][٦٠٧]. لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕێتەوە. کە بەشداری غەزای خەیبەری کردووە دەڵێت: [گوێم لە گیربوونی شمشێرەکە بوو لەددانەکانی مەرحب][٦٠٨]. ئینجا فەتح کردنەکە لەسەر دەستی ئەو بوو.

لەگێڕانەوەیەکی تردا عەلی ﷺ دەڵێت: خودا مەرحەبی کوشت بەدەستی من وە سوپاکەشی تێکشکاو شپرزە بوون و ڕایان کردەوە ناو قەڵاکەیان وە دەرگاکەیان داخست و خۆیان تێدا مەڵاس دا و گەیشتینە دەرگاکە زۆری پێنەچوو خۆیان پێنەگیرا شکستیان خوارد و هەتا خوای گەورە فەتحی کرد)[٦٠٩]. لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە لە ئەبوڕافع

---

[٦٠٦] أخرجه: البخاري (٤٢١٠)، ومسلم (١٨٠٧) (٢٤٠٦)، وأحمد (٣٣٣/٥)، وأبوداود (٢٥٣٨)، والنسائي (٣٠/٦)، والطبراني (الكبير) (٦٢٢٥)، وابن أبي شيبة (٤٥٨/١٤)، وابن حبان (٦٩٣٥) وقال محققه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٢١٣)، واخرجه: احمد (فضائل) (١٠٣٦) وقال محققه: أسناده صحيح.

[٦٠٧] أخرجه: أحمد (٣٥٣/٥) رقم (٢٣٠٣١) وقال محققه: حديث صحيح، وفي (فضائل الصحابة) (١٠٣٤)، والحاكم (٣٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٨١٤).

[٦٠٨] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٥١/٢٣)، وقال الهيثمي (مجمع زوائد) (١٥٢/٦): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

[٦٠٩] أخرجه: البزار (١٨١٥)، وابن ابي شيبة (٣٨٠٤٩). واسناده حسن كما قال السيوطي (كنزل العمال) (١٢٧/٤).

ﷺ دەڵێت: (هەرکە عەلی لە قەڵاکە نزیك بۆوە خەڵکی قەڵاکە بۆی هاتنە دەرەوە ئەویش شەڕی لەگەڵ کردن شمشێرێکی وەشاند پیاوێك لە جولەکەکان قەڵغانەکەی لەدەستی فڕێدا دواتر عەلی دەرگایەکی دەستکەوت کردی بە قەڵغان و خۆی پێ پاراست بەردەوام بە دەستیەوە بوو شەڕی پێدەکرد هەتاکو خوای گەورە فەتحی کرد لەسەردەستی پاشان کەتەواو بوو فڕێیدا، پاشان من لەگەڵ حەوت کەسی تر کە من هەشتەمیان بووم هەوڵماندا کە دەرگاکە وەربگێڕین نەمانتوانی سەرا وبنی بکەین)[٦١٠].

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە جابرەوە ﷺ: [عەلی دەرگایەکی هەڵگرت لە ڕۆژی خەیبەر بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان بەسەریدا سەربکەون بەرەو قەڵاکە، دواتر فەتحیان کرد لەدوای ئەوە تاقیان کرد چل کەس نەیانتوانی هەڵیبگرن][٦١١]. ئەم فەرموودەیە لاوازە (ضعیف). بەریەو شێوە لەو گێڕانەوەدا ئەمەش هاتووە چیرۆکی دەرهێنانی دەرگای خەیبەر لە لایەن ئیمامی عەلیەوە کردوویەتی بە پرد و ئەو دەرگایە بە بیست کەس دایان خستبوو)(ئەم فەرموودەیەش هەڵبەستراوە(موضوعة)[٦١٢].

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەبەرە نزیك دەبۆوە لەسەروەت و سامانەکانیان ماڵ بەماڵ و قەڵابەقەڵا دەستی بەسەردا دەگرت یەکەم قەڵاکە فەتحیان کرد قەڵای (ناعم) بوو هەر لەلای ئەم قەڵایەش بوو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خودا ﷺ

---

[٦١٠] أخرجه: أحمد (٢٣٨٥٨) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن هشام (٣/٣٨٧) (رقم: ٨٥٦) وقال محققاه: اسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٤/٢١٢)، قال الحافظ ابن كثير (البداية) (٤/١٨٩): فيه جهالة، انقطاع، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني في (الدرر الكامنة) (ص: ١١٨) طرقه كلها واهية، قال الهيثمي (مجمع الزوائد) (٦/١٥٢) فيه رجل لم يسم، وقال السخاوي في (المقاصد الحسنة) (رقم: ٤١٨) طرقه كلها واهية.

[٦١١] أخرجه: الحاكم (٣/٦٥)، والبيهقي(الدلائل) (٤/٢١٢)، وقال ابن كثير (البداية) (٤/١٩٠) فيه ضعيف، وقال السخاوي في (المقاصد الحسنة) (٤١٨) فيه (ليث) ضعيف والرواي عنه شيعي وكذا من دونه، وقال العجلوني (كشف الخفاء) (١/٣٦٦) (١١٦٨): سنده ضعيف والراوي عنه شيعي، وقال ابن طاهر (التذكرة) (٩٦) طرقه كلها واهيه.

[٦١٢] قال شيخ الأسلام ابن تيمية (المنتقى من منهج الاعتدال) (ص: ٤٣٩) لااصل له.

(محمودی کوڕی مەسلەمە) شەهید کرا کە برای (محمدی کوڕی مەسلەمە) بوو داستاڕێکی بەردی بەردرایەوە بەری کەوت و پێی کوژرا.

پاشان قەڵای (قموص) ئازاد کرا کە قەڵای کوڕانی ئەبو حەقیق بوو پێغەمبەری خودا ﷺ دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوت بەتایبەتی جاریە لەوانەش صەفیەی کچی حویی کوڕی ئەخطبیان لەگەڵدا بوو کە دواتر بووە هاوسەری پێغەمبەری خودا ﷺ، جاریەکانی لە خەیبەر گیران بەناو موسوڵمانەکانیان بڵاوکردنەوە دروشمی هاوەڵانی پێغەمبەر لە خەیبەر ئەم دروشمە بوو (ئەی سەرکەوتوو بکوژە بکوژە)[٦١٣]. لەدوای فەتح کردنی قەڵای (ناعم) و (قموص) جولەکەکان خۆیان خزاندە قەڵای (الصعبی کوڕی معاذ) موسوڵمانەکانیش هێرشیان کردە سەرئەو قەڵایە و گەمارۆیان خستە سەری خەڵکەکە، خۆشیان دوچاری برسێتیەکی بەهێزبوونەوە لەبەر ئەو برسێتیە موسوڵمانەکان ئەمانەی خوارەوەیان دەخوارد: -

١- **خواردنی گژوگیا و بەروبومی میوەی کاڵی پێ نەگەیشتوو: -**

لە باوکی قەلابەوە ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتە خەیبەر بەروبوم سەوز بوو خەڵکی بە پەلە بەرەو لایان دەڕۆیشتن، دوچاری لەرزو تاگرتن بوون وە سکاڵایان بردە لای پێغەمبەری خودا ﷺ ئەویش فەرمانی پێکردن ئاو بکەنە کوندەوە بۆ ئەوەی سارد ببێت پاشان لە نێوان هەر دوو بانگی بەیانی بەخۆتانی دابکەن لە گێڕانەوەیەکی تردا (لە نێوان نوێژی شێوان و خەوتناندا) ناوی خوداشی لەسەر بهێنن دەڵێت: ئەوەمان کرد کە فەرمانی پێکردین بە شێوەیەك چاڵاك بووین دەتوت لە کۆت و بەندی کردوینەوە[٦١٤].

٢- **خواردنی سیرو پیاز: -**

أ. ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: (ئێمە وامان دانەنابوو کەخەیبەر بەو ماوەیە فەتح بکرێت ئەو کارە درێژەی خایاند خەڵکەکەش دوچاری برسیەتی بوونەوە کەوتینە

---

(٦١٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٨١/٣) وابن كثير (البداية) (٢٢١/٤).

(٦١٤) أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٢٤٢/٤) بسندٍ موصول.

خواردنی سیر زۆرمان لێ خوارد پاشان چووین بۆ مزگەوت لەو جێگەیەدا پێغەمبەری خودا ﷺ بۆنی کرد فەرمووی: ((مَنْ أكل من هذه الشجرة الخبيثة شيئاً فلا يقربنا في المسجد)) فقال الناس: حُرِّمَتْ حرّمت فبلغ ذلك النبي ﷺ فقال: ((أيها الناسُ انه ليس بي تحريم ما أحلّ الله لي ولكنها شجرة أكره ريحها))[٦٦٥] واتە: (ئەوەی لەو بەرە بۆن ناخۆشەی خواردووە (سیروپیاز) با نزیک مزگەوتەکانمان نەکەوێت (دیارە لەبەر ناخۆشی بۆنەکەی بووە (والله أعلم) خەلکەکە بووە مقۆمقۆیان وتیان: حەرام بووە حەرام بووە ئەو وتەیە بە پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتەوە ئەویش فەرمووی: خەلکینە بۆم نیە ئەوەی خوا حەلالی کردووە من لێتانی حەرام بکەم بەلام من بۆنەکەیم لاناخۆشە).

ب. ئەبو ئەعلەبەی خشني ﷺ (کە لەگەل پێغەمبەری خودا ﷺ بەشداری غەزای خەیبەری کرد دەفەرموێت: لە ناو باخچە و باخەکانی خەیبەر سیرو پیازمان بینی خەلکەکە لێیان خوارد چونکە زۆر برسی بوون کاتێک ڕۆیشتن بەرەو مزگەوت بۆنی مزگەوت بە تەنها سیرو پیاز بوو پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من أكل من هذه الشجرة الخبيثة فلا يُقَرِّبَنا))[٦٦٦]. واتە: (ئەوەی ئەو سەوزە بۆن ناخۆشەی خواردووە (سیروپیاز) بانزیکی مزگەوتەکانمان نەبێتەوە).

٢. **خواردنی کەری مالی: –**

عبدوللای کوڕی ئەوق ﷺ دەلێت: (دوچاری برسێتیەکی توند بووین لە خەیبەردا ئێمە لەگەل پێغەمبەری خودا ﷺ بووین لە دەوری خەیبەر چەند کەرێکمان بەردەست کەوت خەلکەکە چونکە پێویستیان پێ بوو لەبەر برسییەتی سەرمان بڕی و خستمانە سەر ئاگر مەنجەلەکان قولپە قولپی دەهات لەوکاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی کرد بانگ بێژی کرد کەدەست لەو مەنجەلانە هەلگرین و هیچ شتێک لەگۆشتی ئەو کەرانە نەخۆین)[٦٦٧].

---

[٦٦٥] أخرجه: أحمد (١٢/٣)، والبخاري (٨٥٣–٨٥٦)، ومسلم (٥٦٥).

[٦٦٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٧٤/٢٢)، وقال المنذري في الترغيب (تلخيب الترغيب) (٣٠٩) رواه الطبراني باسناد حسن، قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١١٨/٢) رواه الطبراني واسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (٣٣٥) صحيح.

[٦٦٧] أخرجه: أحمد (٢٩١/٤)، والبخاري (٤٢٢١)، ومسلم (١٩٣٨) واللفظ له.

هەر لەبەر ئەو برسییەتیە بوو هەندێك لە هاوەڵان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ داوای خواردنیان کرد ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (بەنی سەهم لە هۆزی ئەسلەم هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتیان: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر ماندو بووین هیچمان بەدەستەوە نەما لەو کاتەشدا هیچ شتێك لەلای پێغەمبەری خودا ﷺ دەست نەدەکەوت کە پێیان ببەخشێت ئینجا بۆیان پاڕایەوەو فەرمووی: ((اللهم انك عرفت حالَهُمْ وان ليست بهم قوةٌ وان ليس بيديْ شيءٌ اعطيهم اِيّاهُ فافتح عليهم اعظم حصونها عنهم غناءً وأكثرها طعاما وَوَدكا))[٦١٨]. واتە: (ئەی خودایە خۆت دەزانیت حاڵیان چۆنە هیچ هێزیان تێدانەماوە منیش ئێستا هیچم لەبەردەست نیە بیاندەمێ خودایە گەورەترین قەڵایان دەست بخەیت کە زۆر ترین خواردەمەنی و چەوری تێدایە بۆیان). پاشان خەڵکەکە هێرشیان بردە سەر قەڵای (الصعب بن معاذ) خوای گەورە پشتیوانی کردن و فەتح کرا لە خەیبەردا هیچ قەڵایەك بە ئەندازەی ئەو قەڵایە خواردن و گۆشت و چەوری تێدانەبوو پاشان جولەکەکان بەرەو قەڵای (نوبەیی)چوون خۆیان تێدا قایم و مەڵاس کرد پیاوێك لەناویاندا هاتە دەرەوە داوای هاتنە مەیدانی یەك بەیەکی دەکرد.

محمدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی سوپاکەی کردە ناوچەی (الشق) لە غەزایی خەیبەردا پیاوێکیان لەناو قەڵاکە هاتە دەرەوە هاواری دەکرد کێ بۆم دێتە مەیدان ئەوەبوو ئەبودوجانەی ئەنصاری بۆی چووە مەیدان پەڕۆیەکی سوری لە ناوچەوانی بەستبوو بەلەخۆباییەوە بۆی دەڕۆیشت شمشێرێکی وەشاندە قاچەکانی و پەڕاندی، ئینجا کەوتە سەری و کوشتی و کەل و پەل و شمشێر و قەڵغانەکەی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وەك دەستکەوتی شەڕ)[٦١٩]. لەناو قەڵاکەدا شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا لە نێوان جولەکەکان و موسوڵمانەکان، ئەوە بوو جولەکەکان شکستیان هێنا و بەرەو قەڵای (النزار) ڕایان کرد موسوڵمانەکان زۆر بە نارەحەتی و شەڕی سەخت فەتحیان کرد ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: (هەرکە پێغەمبەری خودا ﷺ قەڵاکانی فەتح کردن یەك لەدوای یەك هەرچی سامانێکیان بۆ

---

(٦١٨) أخرجه: ابن هشام (سيرة) (٣٨٣/٣)، والطبري (التاريخ) (١٠/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٣/٤).

(٦١٩) أخرجه: البيهقي السنن (الكبرى) (٣٠٩/٦). وقال هذا منقطع.

کرایەوە بردیان بەرەو قەڵاکانی (الوطيح و السلالم) پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك گەمارۆی دان)[٦٢٠]. لەو شەڕەدا سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع رضي الله عنه: (قاچی دوچاری پێکانێك بوو برینداری کرد لە سەلەمەوە(کە لێدانێك بەرقاچی کەوت دەڵێت: خەڵکەکە وتیان سەلەمە پێکراو بریندار بوو چوونە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ سێ جار فوی پێداکرد لەوکاتەوە دوچاری هیچ ئازارێك نەبۆوە)[٦٢١].

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر لەخودا دەپاڕایەوە بە کزۆڵییەوە نزای دەکرد لەدوای نوێژی بەیانی لەو غەزایەدا ئەوەش لەبەر ئەوە بوو تاکو دووربکەوێتەوە لە خۆبایی بوون و سەرسام بوون بەخۆ و شانازی کردن بە زۆری هێزی موسوڵمانان و لەبیرکردنی پشتیوانی خوای پەروەردگار، سوهەیبی ڕۆمی رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ لەڕۆژانی خەیبەردا لەدوای نوێژی بەیانی لێوەکانی دەجوولاند بەبێ ئەوەی بزانن چی دەڵێ، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لێوەکانت بە جۆرێك دەجوڵێنیت کە پێشتر لێت نەبینراوە ئەوە لەو کاتەدا چی دەفەرمویت (فەرمووی: ((اني ذكرت نبيا من الانبياء [اعجب بامته] (وكان) اعطي جنودا من قومه فقال: من يقوم لهؤلاء ؟ فاوحى الله اليه ان اخير لقومك احدى الثلاث إما ان اسلط عليهم عدواً من غيرهم او الجوع او الموت فاستشار قومه في ذلك فقالوا: انت نبي الله كل ذلك اليك خر لنا فقام الى صلاته وكانوا اذا فزعوا فزعوا إلى الصلاة فصلى ماشاء الله، فقال اي رب اما عدوهم من غيرهم والجوع فلا ولكن الموت فسلط عليهم الموت ثلاثة أيام فمات منهم سبعون الفا فهمسي الذي ترون اني اقول: ((اللهم بك اقاتل وبك اصاول وبك احاول ولا حول ولا قوة الا بالله]))[٦٢٢]. واتە: (بەزیرەکی خۆتان هەستتان پێکردم؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: من یادی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خودام کردەوە کە سەرسام بوو بەزۆری ژمارەی شوێنکەوتووەکانی و زۆری ژمارەی سەربازەکانی لە گەلەکەی خۆی لەو کاتەدا وتی: کێ

---

(٦٢٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٣٨٣).

(٦٢١) أخرجه: احمد (٤/٤٨)، والبخاري (٤٢٠٦)، وابوداود(٣٨٩٤).

(٦٢٢) أخرجه: احمد (٤/٣٣٢) (٢٣٩٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والدارمي (٢/٢١٦)، والطبراني (٧٣١٨)، وابن حبان (٢٠٢٧) واللفظ له ورقم (١٩٧٥)، وقال محققه اسناده صحيح، واورد الترمذي (٣٣٤٠) قطعة منه وقال حديث حسن، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٦٠).

دەتوانێت بەرەنگاری ئەمان ببێتەوە (بەسەرسامیەوە)؟ لەبەرئەوە خوای گەورە لێپێچینەوەی لەگەڵ کردن و وەحی بۆنارد کەبۆ قەومەکەت یەك لەم شتانە هەڵبژێرە یان دوژمنێکی دەرەکی زاڵ دەکەم بەسەریاندا یان بە برسێتی و گرانی دەیانکوژم یاخود دەیانمرێنم، ئەو پێغەمبەرەش ڕاوێژی بەگەلەکەی کرد لەو بارەوە ئەوانیش وتیان تۆ پێغەمبەری خودایت هەموو ئەوانە مایەی زیانن بۆ ئێمە دەیگێڕنەوە بۆلای تۆ خۆت سەرپشك بە ئەویش هەستا دەستی بەنوێژ کردن کرد هەر شتێك رووی تێدەکرن پەنایان دەبردە بەر نزا و نوێژکردن ئەوەندەی خوا ویستی نوێژی کرد ئینجا فەرمووی، ئەی پەروەردگار دوژمنی دەرەکی و گرانی برسێیەتیەکەیان لەسەر لادە بەڵام ملکەچین بۆ مردنەکە خوای گەورەش بۆماوەی سێ ڕۆژ مردنی نارد سەریان حەفتا هەزاریان مردن ئەو چرپە چرپەی لە منیشتان دیووە ئەوە بوو دەڵێم: ئەی خوایە بەپشتیوانی تۆ دەجەنگم وە بەپشتیوانی تۆ هەڵمەت دەبەم وە بە پشتیوانی تۆوە هەوڵ و تەقەلا دەدەم وە هیچ گۆڕان و هەوڵدانێك و هێزو توانایەك بەحەق نیە تەنها توانا و هێزی تۆنەبێت). لەوێدا پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی نەدا کەژن و منداڵ بکوژرێت و قەدەغەی کرد هەروەك لە کەعبی کوڕی مالکەوە ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ پەیمانی لێ وەرگرتین و ڕایسپاردین کەلە غەزای خەیبەر بووین هیچ ژن و منداڵێك نەکوژین)[٦٢٣]. لەکاتی شەڕەکەدا لە لای قەڵاکانی خەیبەردا چەند ڕوداوێك ڕوویاندا لەوانە:

**١-شەڕکەرێکی دووڕوو(منافق): -**

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (بەشداری خەیبەرمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو کە لەگەڵ خۆیدابوو بەناو موسوڵمانیش بوو ئاماژەی بۆ کردو فەرمووی: ((هذا من اهل النار) فلما حضر القتال قاتل الرجل قتالا شديدا)[٦٢٤]. واتە: (ئەوە لە خەڵکی دۆزەخە، کاتێك شەڕ دەستی پێکرد پیاوەکە شەڕێکی مەردانەی دەکرد). لە

---

(٦٢٣) أخرجه: اسحاق بن راهوية، وقال الحافظ في (المطالب العالية) (١٩٦٩): وهذا اسناد صحيح.

(٦٢٤) أخرجه: عبدالرزاق (٩٥٧٣)، واحمد (٣٠٩/٢)، والبخاري (٢٨٩٧) (٤٢٠٣، ٣٠٦٢، ٤٢٠٧)، ومسلم (١١١)، والبغوي (٢٥٢٦)، والبيهقي (الكبرى) (١٩٨/٨)، وابن حبان (٤٥١٩) وقال عقبه حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (١٦٤٩).

گێڕانەوەیەکی تر لە ئەکثمی کوڕی ئەبوجون دەڵێت: (. . . وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فلان کەس زۆر چاونەترسە بەجەرگە لەشەڕدا فەرمووی: ئەو لە ئاگردایە. دەڵێت: وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر ئەو کەسە بەو هەموو عیبادەت و ڕوخۆشی و نەرم ونیانیەوە لە دۆزەخدا بێت دەبێت ئێمە لەکوێ بین؟

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە وتیان گەر ئەو دۆزەخی بێت دەبێت کێ لە ئێمە لەبەهەشتدا بێت فەرمووی: ((انما ذلك اخبات النفاق وهو النار)). واتە: (ئەو کارانەی بۆ شاردنەوەی نیفاق و دووڕوویەتی و ئەو لەناو ئاگرە) دەڵێت: لەدوای ئەوە چاودێریمان دەکرد لەکاتی شەڕکردن هیچ ئەسپ سوارێك و پیادەڕەوێك بەلایدا نەدەڕۆیشتن ئەو هەڵیدەکوتایە سەریان تا دواتر برینی زۆر بوو لەجەستەی وترا: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو پیاوەی تۆ فەرمووت (ئەوە لەخەڵکی دۆزەخە) ئەمڕۆ زۆر بەجەرگانەو بوێرانە دەجەنگا هەتاکو مرد فەرمووی: چوو بۆ ئاگر، نزیك بوو هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ دوچاری گومان بن هەر لەو سەروبەندەدابوو کە وترا: ئەمردووە برینەکانی زۆر سەختن هەرکە شەو داهات خۆی ڕانەگرت لەبەر سەختی برینەکانی خۆی کوشت ئینجا هەواڵیان دابە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((الله اکبر، اشهد اني عبد الله ورسوله))[٢٢٥]. (الله اکبر شایەتی دەدەم کەمن بەندەی خودام وە پێغەمبەری خودام).

لە گێڕانەوەیەکی طەبرانی دا هاتووە (ئەو کەسە کاتێك ئازاری برینەکانی زۆریان بۆ هێنا شمشێرەکەی لەبەینی هەردوو مەمکی دانا ئینجا خۆی بەسەردادا هەتاکو لەپشتی دەرچوو).

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [لەسەرخۆ دەستی برد بۆ کیفی تیرەکانی و تیرێکی دەرهێناو خۆی پێ کوشت، بەگورجی کەسانێك لە موسوڵمانەکان چوونە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خودای گەورە فەرموودەکەتی بەڕاست گەیاند فلانە کەس هەستاو و خۆی کوشت ئینجا فەرمووی: (قم یا فلان فاذن انه

---

[٢٢٥] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٧٢)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٦١/١) (٢٤٠) رواه الطبراني، وابن منده باسناد حسن، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد) (٢١٤/٧): اسناده حسن.

لایدخل الجنة الا مؤمنٌ ان الله یؤید الدین بالرجل الفاجر)[٦٢٦]. واتە: (فلان کەس بانگەوازبکە بەناو خەڵکەکەدا کە تەنها باوەڕدار نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە خوای گەورەش پشتیوانی ئەم ئاینە دەکات بە پیاوی خراپەکار ولەڕێ دەرچوو)].

لەگێڕانەوەیەکی تر لەسەعدی کوڕی سەهلی ئەنصارییەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوبەش پەیداکەرەکان ڕووبەڕوو بۆوە و بوو بەشەڕیان تا کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە بۆ ناو سەربازەکانی خۆی ئەوانیش گەڕانەوە بۆ سەربازگەی خۆیان، لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا پیاوێك هەبوو لەچاونەترسیدا کەسی پشتگوێ نەدەخست تاك و تەرایانی دەگرتەبەر و شوێنیان دەکەوت و شمشێری پێدا دەکێشان وترا: ئەوی ئەمڕۆ دەستمان کەوتبێت بەهۆی فلان کەسەوە بووە بەشدارە لەپاداشتی یەك بەیەکمان. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((اما انهُ من اهل النار)) واتە: (بەڵام ئەو لەخەڵکی دۆزەخە) پیاوێك لەناو خەڵکەکە وتی: من هەموو کات هاودەمی دەبم و چاودێری دەکەم دەڵێت: لەگەڵیدا دەرچووم هەرکاتێك هەڵوێستەی بکردایە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەم دەکرد وە ئەگەر پەلەی بکردایە وەك ئەوم دەکرد چاودێرییەکی باشم دەکرد ئەوە بوو بریندابوو بریندابوونێکی سەخت خۆی ڕانەگرت لەبەر ئازارەکەی و بەدەسیکی شمشێرەکەی لە زەوی چەقاند و نوکەکەشی خستە بەینی هەدوو مەمکییەوە ئینجا خۆی بەسەر شمشێرەکەدا داوە خۆی کوشت پیاوەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خودایت فەرمووی: ئەوە چی بووە؟ وتی ئەو پیاوەی ماوەیەك بەرلە ئێستا بۆت باس کردین کەلە خەڵکی دۆزەخە خۆی کوشت! ئەو هەواڵە لەسەر دڵی خەڵکەکە زۆرگران بوو وتم: من لە جیاتی ئێوە بە شوێنی دا دەچم ڕۆیشتم بەدوایدا گەڕام دۆزیمەوە برینێکی زۆر سەختی هەبوو خۆی ڕانەگرت و پەلەی کرد لە مردن بەدەستێکی شمشێرەکەی لە زەوی چەقاند و نوکەکەشی خستە بەینی هەدوو مەمکییەوە ئینجا خۆی بەسەر شمشێرەکەداداوە خۆی کوشت. پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتی ئەم ڕووداوەدا ئەم فەرموودەیەی فەرموو: ((انَّ الرجل لیعمل عمل اهل الجنة فیما یبدو للناس

[٦٢٦] أخرجه: البخاري (٤٢٠٣).

وهو من اهل النار، وإن الرجل ليعمل عمل اهل النار فيما يبدو للناس وهو من اهل الجنة))[٦٢٧].
واتە: (پیاوی واهەیە کردەوەی خەڵکی بەهەشتەی دەکات لەوەی کەلە پێش چاوی خەڵکیدا دیارە و ئاشکرایە، لەگەڵ ئەوەشدا لەخەڵکی دۆزەخە، وە پیاوی واش هەیە کردەوەی خەڵکی دۆزەخە دەکات لەوەی کەلە پێش چاوی خەڵکیدا دیارە وە ئاشکرایە، لەگەڵ ئەوەشدا دەچێتە بەهەشتەوە).

لەگێڕانەوەیەك تر [تدركه الشقوة او السعادة عند خروج نفسه فيختمُ له بها) واتە: (لەکاتی گیانەڵادا بەدبەختی دوچاری دەبێت یاخود بەختەوەری و کۆتای ژیانیش هەربەوە دەبێت کەلەسەری دەمرێت). پاشان فەرمانی کرد بە (بیلال) بەناو خەڵکیدا بانگەواز بکات ((لايدخل الجنة الا نفس مسلمة وان الله يؤيد [هذا] الدين بالرجل الفاجر))][٦٢٨]. واتە: (ناچێتە بەهەشتەوە تەنها موسوڵمان نەبێت خودای پەروەردگاریش ئەم ئاینەی سەردەخات بە پیاوی تاوانکار ولەرێدەرچوو). لەگێڕانەوەیەکی تردا [أن الله يريد هذا الدين باقوام لاخلاق لهم][٦٢٩])). واتە: (خوای گەورە ئەم ئاینە سەردەخات بەخەڵکانێك کە هیچ پاداشتێکیان نیە لەدوارۆژدا).

### ٢-کۆچکەرە دەشتەکیەکە: -

لەشەدادی کوڕی هادەوە ﷺ دەفەرموێت: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بڕوای هێناو شوێن پێغەمبەرکەوت وتی: لەگەڵیدا کۆچ دەکەم پێغەمبەری خودا ﷺ بەچەند هاوەڵێکی خۆی سپارد کە ئامۆژگاری بکەن و فێری ئیسلامەتی بکەن، کاتێك غەزای خەیبەر ڕوویدا پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێك غنیمە و دەستکەوتی دابەش کرد بەشی ئەویشی دانا و دایە دەست هاوەڵەکانی، ئەو لەپشت سوپاکەوە مەڕی دەلەوەڕاند

---

[٦٢٧] أخرجه: البخاري (٤٢٠٣)، ومسلم (١١٢).

[٦٢٨] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٧٢) واصل الحديث عند البخاري (٤٢٠٢)، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد) (٢١٤/٧): اسناده حسن.

[٦٢٩] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٨٩٦٣)، واحمد (٤٥/٥)، وابونعيم (الحلية) (٢٦٢/٦)، وابوعوانه (٤٦/١)، وابن حبان (٤٥١٧) وقال محققه حديث صحيح، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد) (٣٠٢/٥) رواه احمد والطبراني ورجالها ثقات، وقال شيخه الحافظ العراقي في (تخريج الاحياء) (٤٨/١) اسناده صحيح.

کاتێك هات بۆلایان بەشەکەیان دایە وتی: ئەوە چیە؟ وتیان: ئەوە بەشی خۆتە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆی داناویت ئەویش وەریگرت و بردیە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەمە چیە؟ فەرمووی: ئەوە بەشی خۆتە بۆم داناویت وتی: لەسەر ئەوشتانە شوێنت نەکەوتووم بەڵکو بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم کە ئێرەم بەتیر بپێکرێت لەپێناو خودادا (ئامازەی کرد بۆگەردنی) ئینجا بمرم و بچمە بەهەشت فەرمووی: ((ان تصـدق الله يصـدقك)) واتە: (گەر لەگەڵ خودا ڕاست بکەیت بەدڵی خۆت لەگەڵ دەکات) (کەمێك مایەوە ئینجا هەستا بەرەو شەڕکردن لەگەڵ دوژمـن دواتـر هێنایانـە خزمـەت پێغەمبـەری خـودا ﷺ تیرێك بەر ئەو شوێنەی کەوتبوو کەئامازەی بۆ کرد بوو پێغەمبەری خودا ﷺ فـەرمووی: خۆیـەتی؟ وتیان بـەڵێ، فـەرمووی: ((صـدق الله فصـدقه)) واتـە: (لەگـەڵ خـودا ڕاسـتی کـرد خـوداش ئەوەی دەیویست بۆی جێبەجێکرد).

پێغەمبەری خودا ﷺ لەناو عەباکەی خۆی کفنی کرد پاشان هێنایانـە بـەردەمی نوێژی لەسەرکرد، ئەوەی لە نوێژەکەیدا ئاشکرابوو ئـەوە بـوو کـە فـەرمووی: ((اللـهم هـذا عبدك خرج مهاجراً في سبيلك فقتل شهيداً [وانا شهيد] على ذلك))[٦٣٠]. واتـە: (ئـەی خودایە ئەمە بەندەی خۆتە لەپێناوی تۆدا کۆچی کردووە و بەشـەهیدیش کوژراوە وە منـیش شایەتی بۆ دەدەم لەسەر ئەو شتانە).

**٢-شوانە ڕەشەکە: -**

جـابری کـوڕی عبـدوللا ﷺ دەڵێـت: (لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودا ﷺ بـووین لەغەزای خەیبـەردا (سـریە)یـەك دەرچـوو کەسـێکیان گرتبـوو مـەڕی پـێ بـوو دەیلەوەڕانـد هێنایان خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبـەری خـودا ﷺ ئەوەنـدەی خـودا ویستی لەسەر بوو قسەی لەگەڵدا کرد.

---

[٦٣٠] اخرجه: النسائي (٤/٦٠)، وعبدالرزاق (٦٦٥١)، والطحاوي (شرح معاني الاثار) (١/٢٩١)، والطبراني (الكبير) (٧/٢٧١)، والحاكم (٣/٥٩٥)، والبيهقي (الكبرى) (٤/١٥) و(الدلائل) (٤/٢٢٢) واللفظ له، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن النسائي) (١٨٤٥)، و(صحيح الجامع) (١٤١٥)، و(احكام الجنائز) (٦١) وصححه ايضا الشيخ الارناؤوط في تحقيقه لـ(زاد المعاد) (٣/٢١٤) والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (رقم: ٤٧٤).

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: [قال: ادعوا إلى الاسلام وان تشهد ان لا إله الاّ الله وان محمد رسول الله وأن لاتعبد الاّ الله قال العبد (الأسود): فماذا لي إن انا شهدتُ وآمنتُ بالله ؟ قال لك الجنة ان متَّ على ذلك][631]. واتە: (بانگی کرد بۆ ئیسلامەتی بۆ ئەوەی شایەتمان بهێنێت وەیە تەنها خودا بپەرستێت کۆیلە ڕەش پێستەکەش وتی: چ شتێک بۆ من دەبێت گەر شایەتمان بهێنم و باوەڕ بەخودای بکەم؟ فەرمووی: بەهەشتت بۆ هەیە ئەگەر لەسەر ئەو باوەڕە بمریت). پیاوەکە پێی وت من باوەڕم هێنا بەتۆ وبەوەی کە تۆی پێ نێردراویت لە پەیامەکەت، ئەی چی لەم مەڕانە بکەم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ڕانە ئەمانەتە هەر مەڕێک و دوان هی ماڵێکە فەرمووی: (چنگێک چەو بەدەمو ڕوویاندا بکە دەگەڕێنەوە بۆلای خاوەنەکانیان ئەویش مشتێک لەوردە زیخ و بەردی یاخود خۆڵی هەڵگرت و بەدەم وڕوویاندا هەڵیدا و زۆر بەتوندی بۆی دەرچوون تاکو هەریەکەیان چونەوە ماڵی خۆیان. پاشان ئەویش هاتە ڕیزی جەنگاوەرەکانەوە و تیرێکی بەرکەوتو کوژرا هیچ سوجدەیەکی بۆ خودای گەورەش نەبرد بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ادخلوه الخباء)) واتە: (بیبەنە ناو خێمەکە) بردیانە خێمەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ، هەتاکو پێغەمبەری خودا ﷺ لەکارەکانی بۆوە هاتە لای بۆ ژوورەوە پاشان هاتە دەرەوە فەرمووی: ((لقد حسن اسلام صاحبكم لقد دخلت عليه وان عنده لزوجتين له من الحور العين))[632]. واتە: (هاوەڵەکەتان بەباشترین شێوە موسوڵمان بوو من ئێستا چوومە ژوورەوە هەردوو هاوسەر(حور عین)ی لە لابوون). ئەم فەرموودەیە (ضعیف)ە بەلاّم ئەم فەرموودانەی دواتر بەهێزتری دەکەن.

لەفەرموودەیەکی تردا ئەنەس ﷺ دەڵێت: (پیاوێکی ڕەش پێست هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من پیاوێکی ڕەشی بۆن ناخۆش و دەمو چاو ناشیرینم هیچ ماڵ و سامانم نیە ئەگەر شەڕبکەم لەگەڵ ئەواندا هەتاکو

---

[631] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٢٢٠) عن موسى بن عقبة بن الزبير (رضي الله عنهما).

[632] أخرجه: ابن هشام (٣/٣٩٥)، والحاكم (٢/١٣٦) وصححه على شرط مسلم وقال الذهبي فيه شرحبيل متهم واللفظ له، والبيهقي (الكبرى) (٩/١٤٣) وقال اسناده مرسل، وقال الحافظ في (الاصابة) (١١٥٦): اسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٢٠) عن عروة وموسى بن عقبة مرسلاً وضعفه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٣٧٥).

دەکوژرێم ئەوکات کوێ بۆمن دەبێت؟ فەرمووی: تۆلەناو بەهەشت دەبێت ئەویش شەڕی کرد هەتاکو کوژرا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((قد بیض الله وجهك وطیب ریحك واکثر مالك... لقد رأیت زوجته من الحور العین نازعته جبه له من صوف تدخل بینه وبین جبته))[٦٣٣]. واتە: (بەدڵنیاییەوە خودا ڕووی سپی کردی و بۆنی خۆش کردیت ماڵ و سامانی زۆرکردیت، من بینیم هاوسەرەکەی لە (حور العین) پەلەی بوو بۆ گەیشتنە ناو جلەخوریەکەی).

ئیبن عومەریش ﷺ دەڵێت: ئەو پیاوە ڕووبەڕووی دوژمن بۆوە و شەهیدبوو ئەم هەواڵەش درابە پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە لای سەرییەوە دانیشت و پێکەنی و پاشان ڕووی خۆی وەرگێڕا، ئێمە وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆمان بینی ڕوخۆش و دەم بە پێکەنین پاشان ڕووت لێ وەرگێڕا؟ فەرمووی: کەمنتان بینی بەڕوخۆشی و پێکەنینەوە لەوکاتەدا بوو کەپلەو پایەو ڕێزی گیانی ئەوم دەبینی لەلای خودای پەروەردگار بەڵام ڕوو وەرگێڕانەکەم لەبەر ئەوە بوو هاوسەرەکانی لە (حور العین) ئێستا لای سەریەوەن)[٦٣٤].

### ٤-ڕانە مەڕەکەی (ئەبوالیسر کعب بن عمرو ﷺ الانصاری): -

ئەو هاوەڵە بوو کەبەشداری بەدری کرد و ئاڵا هەڵگری قوڕەیشی بەدیل گرت لەگەڵ (ئەبولعزیزی کوڕی عومەیر) برای (موصعەبی کوڕی عومەیر).

ئەبوالیسر کعب بن عمرو الانصاری ﷺ دەڵێت: (من لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بووم لەغەزای خەیبەردا ئێوارەیەکیان ڕانەمەڕێکی پیاوێکی جولەکە بەرەو ڕوومان دەهات و دەیانویست بەرەو شوێنی خۆیانی ببەنەوە بۆناو قەڵاکان ئێمەش گەمارۆمان دابوون پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: چ کەسێك خواردنمان دەس دەخات لەو ڕانە مەڕە ئەبولیسر دەڵێت: وتم: من ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ. فەرمووی: دەی فەرموو دەستی پێبکە و

---

[٦٣٣] اخرجه: الحاكم (٩٣/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال محقق (المستدرك) (٢٥٠٨) سنده صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٢٢١/٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (١٣٨١).

[٦٣٤] اخرجه: البيهقي (الشعب) (٤٣١٧) باسناد حسن كما قال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٢٠٥٩)، وحسن اسناده ايضا الامام السيوطي في (شرح الصدور) (ص: ٢٠١) وحسنه الشيخ الألباني (صحيح الترغيب)(١٣٨٢).

دەستی بەسەردا بگرە) دەڵێت: بەخێرایی بۆی دەرچووم وەك نەعامە (نێرە) کاتێك سەیرێکی پێغەمبەری خودام ﷺ کرد بە تامەزرۆییەوە بۆبەهاری دەی فەرموو: ئەی خودایە بێزمان بکە لێی بەخۆشی) دەڵێت: گەیشتم بەڕانە مەڕەکە سەرەتاکەی چوو بووە ناو قەڵاکە، دوو مەڕم لەکۆتاییەکەی گرت و خستمە ژێر دەستەکانم و بەخۆمەوە نوساندم ئینجا هێنام و توندترم دەگرتن بە خۆمەوە هەتاکو هەردووکیانم هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ دەتوت هیچ شتێکم پێ نیە ئینجا سەرمانبڕین و خواردمانن. ئەبولیسر دواین هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو کە کۆچی دوای کردووە، کاتێك باسی ئەو بەسەرهاتەی دەکرد دەگریا، پاشان دەیوت: بەهۆی ئەوەوە خودا ئەو تەمەنی پێ بەخشیوم کە ببمە دواین کەسیان).[٦٢٥] ئەم فەرموودەیەش (ضعیف)ە و بۆزانیاریت هێناومە.

### د-ئەو پیاوەی کە دزی لە غەنیمەت کرد: -

یەزیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە هۆزی ئەشجع بوو لەڕۆژی خەیبەردا کوژرا، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ باس کردوو فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن) دەمو چاوی خەڵکەکە بەو قسەیە گۆڕا فەرمووی: هاوەڵەکەتان دزی لە غەنیمەت کردووە بەرلە دابەش کردنی ئینجا کەل و پەلەکەیان کردەوە پشکنیان ملوانکە و موورویەکی جولەکەکانی شاردبۆوە کە دوو درهەمی نەدەکرد)[٦٢٦].

---

[٦٢٥] اخرجه: ابن هشام (السیرة)(٣٨٧/٣) رقم (٨٥٧) وقال محققاه: اسناده ضعیف، واحمد (٤٢٧/٣) (رقم ١٥٥٢٥) وقال محققه: اسناده ضعیف، وقال الهیثمي (المجمع)(١٤٩/٦) رواه احمد عن بعض رجال بني سلمة وبقیة رجاله ثقات، وهوضعیف وانْ قال الدمیري في (حیاة الحیوان) (١٨٩/٢) رواه احمد اسناده صحیح.

[٦٢٦] اخرجه: ابن هشام (السیرة) (٣٨٩/٣)، وابن حبان (٥١٩٩) وقال محققه اسناده صحیح، والبیهقي(الکبری) (١١٤/٦)، و(الدلائل) (٢٣٣/٤) عن موسی بن عقبة واورد قطعة منه: ابوداود (٣٠٠٦)، وقال الحافظ (الفتح) (٤٧٩/٧) رواه البیهقي ورجاله رجال ثقات، وقال الارناؤوط في تحقیقه

# دانوستان

ئیبن هیشام (رحمه الله) دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ جولەکەکانی خەیبەری گەمارۆدا لە هەردوو قەڵای (الوطیح والسلالم) هەتاکو بەتەواوی دڵنیابوو کەلەناو دەچن بۆیە داوایان کرد کە دانوستان بکەن بە جۆرێك ڕێگەیان پێبدرێت بڕۆن و ڕەوبکەن و پارێزگاری لە خوێنیان بکرێت و کەس دەست نەخاتە ڕێیان پێغەمبەری خودا ﷺ بەمە ڕازی بوو وە دەستی گرت بەسەر هەموو ماڵ و سامانیان لە قەڵای (الشق و النطاة، الکتیبة) و سەرجەم قەڵاکانی تریان تەنها ئەوە نەبێت کەلەم دوو قەڵایەدا مابۆوە)[٦٣٧]. کاتێك جولەکەکان دڵنیابوون کە تیادەچن چیتر لەوە زیاتر لەتوانایاندا نەمابوو ڕووبەڕووی موسوڵمانەکان ببنەوە. لەوکاتەدا داوای ڕێکەوتنی ئاشتیان کرد و ملکەچی داخوازییەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ بوون، لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ شەڕی لەگەڵ خەڵکی خەیبەر کرد هەتاکو پەنایان بردە بەر قەڵاو قوڵە وکۆشکە بەرزەکانیان پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی گرت بەسەر زەوی و زارو شینایی وباخە خورماکانیان دواتر دانوستانیان کرد لەسەر ئەوەی کە شارەکەیان چۆڵ بکەن و بەقەدەر سەرپشتی وشترێك کەل و پەل لەگەڵ خۆیاندا ببەن هەرچی هەیانە زەرد وسپییە واتە: (دینارو درهەم)یان لەگەڵ زێڕوزیو یان تەنانەت شتومەکی لەبەرکردنیش تەنها ئەوەندەی کە خۆیانی پێدادەپۆشن جگە لەوانە هەموو شتانی تر بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ جێبهێڵن بەو مەرجەی دەربچن هیچ شتێك نەشارنەوە ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوە پەنا نادرێن و پەیمان و بەڵێن بۆیان نامێنێت و دوچاری لێپرسینەوە دەبن.

بێستەیکی پڕ ئاڵتون بزربوو. لەگێڕانەوەیەکی تردا [کوڕای ئەبوحقیق قاپ و قاچاغی ئاڵتون و زیو و ماڵێکی زۆریان حەشاردابوو لەناو مەشکەیەکی دروستکراو لە پێستی وشتر لەوێدا دایان نابوو لای کنانەی کوڕی ڕەبیعی کوڕی ئەبو حقیق] هەروەها ماڵ و زێڕ

---

لـزاد المعاد) (١١٠/٢) اخرجه: ابن سعد (١١٠/٢) باسناد صحیح، وصححه الشیخ الالباني في (صحیح أبي داود) (٢٥٩٧)

[٦٣٧] اخرجه: ابن هشام (السیرة) (٣٨٩/٣)، والطبري (التاریخ) (١٣/٣).

زەوێکی زۆری حویەیی کوڕی ئەخطبی باوکی صەفیەشیان لابوو ئەویشی هێنا بوو لەگەڵ خۆی بۆ خەیبەر (لەڕۆژی فەتح کردنی بنونضیردا) خشڵ و زێڕەکانیشی تیابوو، پێغەمبەری خودا ﷺ بە مامی حویەیی فەرموو: کە ناوی (سەعنە) بوو ((ما فعل مسك حُيِّ الذي جاء به من النضير؟)) واتە: (چیتان بە گەنجینەکەی حویەیی کرد کەلەبەنی نضیرەوە هێنابووی بۆ ئێرە؟).

لەگێڕانەوەیەکی تردا: [کوا قاپ و قاچاغ و ماڵەکەتان کە لەگەڵ خۆتان لەمەدینەوە هێناتان بۆ ئێرە کاتێك دەرمان کردن، وتی: تەنها بەشە خواردنی خۆمان و تێچونی شەڕەکانی کرد و هیچیان نەماوە (سوێندی لەسەر ئەوە خوارد)].

ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((العهد قريب والمال اكثر من ذلك)). واتە: (ماوەی ئەو ڕۆژانە ئەوەندە درێژنیە ئەو ماڵەش زۆر لەوە زیاترە لەکوێیە؟ پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ سەعنەی دایە دەست زوبەیر)[٦٢٨] لە ڕیوایەتێکی تردا. (زوبەیر ئەوقێکی کردە ملی و چووە سەرسنگی تاکو هەناسەی تەنگ ببێت بۆ ئەوەی شوێنەکە ئاشکرا بکات)[٦٢٩]. کنانە پێشتر دەچووە ناو کەلاوەیەکەوە سەعنە وتی: من کنانەم دیووە بەدەوری ئەم کەلاوەدا دەهات و دەچوو لێرەدا هەستم بە شتێك کردبوو، ڕۆیشتن گەڕان گەنجینەکەیان لەناو کاولگەکەدا دۆزییەوە. . .

لەگێڕانەوەکەی ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ دانوستانی کرد لەگەڵ خەڵکی خەیبەر لەسەر ئەوەی زێڕو زیو پارەو سامان هەموو شتێکیان جێ بهێڵن تەنها خۆیان و ماڵی دەستەبەرو منداڵەکانیان لەگەڵ خۆدا بەرن. دەڵێت ڕەبیع و کنانەی کوڕانی ئەبوحقیقیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کنانە دەستگیرانی صەفیەی کچی

[٦٢٨] أخرجه: عبد الرزاق (٦٥٠١)، ومالك (١٤/٢)، والحميدي (٨١٥)، وأحمد (١٩٢/٥)، وابوداود (٣٠٠٦)، والحاكم (١٢٧/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١٠١/٩) وفي (الدلائل) (٢٥٥/٤)، والطبراني (الكبرى) (٥١٧٤ -٥١٨١)، وابن حبان (٤٨٥٣)، وقال محققه: حديث صحيح واللفظ له، وقال الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز) (ص: ٧٩): اسناده صحيح، وصحح اسناده ايضاً الشيخين الأرناؤطين في (زاد المعاد) (١٠٨/٣).

[٦٢٩] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٩٥/٣)، والطبري (التاريخ) (١٣/٣).

حوییەی بوو پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: واتە: ((این آنیتکما التي کانت تستعار لي اعراس المدینة ؟)) (کوا گەنجینەکانتان؟ کە دەخوازرا لە شایەکانی ناو شاری مەدینە؟) وتی نێوە دەربەدەرتان کردین و هەموویمان لە بژێوی ژیانمان سەرف کرد پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: سەرنج بدە چی دەڵێت، ئەگەر شاردبووتانەوە بیدۆزینەوە ئەو خوێن و ماڵ و منداڵتان حەڵاڵ دەبێت بۆمان پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی پیاوێکی ئەنصاری کرد پێی فەرموو: ((اذهب الی مکان کذا وکذا فانظر نخلة في رأسها رقعة فانزع تلك الرقعة واستخرج تلك الانیة وأئتني بها)) [فانطلق حتی جاء بها] فقتل رسول الله ﷺ ابني ابا الحقیق (أي الربیع وکنانة)، واحدهما زوج صفیة بنت حي، وسبی رسول الله ﷺ نسائهم وذراریهم))[٦٤٠] واتە: (برۆ فلانە شوێن تەماشابکە دارخورمایەکی لێیە لەسەرەوەی پارچەیەکی پێنە کراوی لێیە ئەو پارچەیە بدڕێنەو ئەو گەنجینەیەی تێدایە دەریبهێنە و بیهێنە بۆ ئێرە ئەو پیاوە ڕۆیشت و هێنای ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ هەر دوو کوڕەکەی ئەبوحقیقی (ڕەبیع و کنانە) کوشت کە یەکێکیان دەسگیرانی صەفیەی کچی حوییەی بوو و ژن و منداڵەکانی کردنە کۆیلە وەك دەستکەوتی شەڕ).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دەرکرد بەکوشتنی ڕەبیع و کنانەی و دواترکوژران وەناردی بەشوێن ژن و منداڵەکانیان، صەفییەی کچی حوییەیان هێنا نافرەتێکی گەنج و تازە پێگەیشتو بوو خۆی نەهات فەرمانی کرد بە بیلال ئەویش چوو هێنای بۆ ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ بەلای هاوسەرو شوبرا کوژراوەکەی دا هێنای پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمەی پێناخۆش بوو کاتێك بیلال گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((سبحان الله ما اردت یا بلال الی جاریة بکر تمرُّبها علی قتیلین تریها اياهما [أذهبت منك رحمة]))[٦٤١]. واتە: (پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەی بیلال من ئەمە

---

[٦٤٠] أخرجه: الطبراني (الکبیر) (١٢٠٦٨)، والبیهقي (الدلائل) (٤/٢٣٠) وقال الهیثمي (ومجمع الزوائد) (٦/١٥٣) فیه محمد بن ابي لیلی سيء الحفظ وبقیة رجاله ثقات.

[٦٤١] أخرجه: ابن هشام (السیرة) (٣/٢٩٥) رقم (٨٥٨)، والطبري (التاریخ) (٣/١٣)، والطبراني (الکبیر) (١٢٠٦٨).

پێویست کە بڕوێت ئافرەتێکی تازە پێگەیشتوو بەسەر لاشەی دوو کوژراودا بهێنێت تاکو بەو شێوەیە بیان بینێت ئایە بەزەیی و سۆزت لەلانەمابوو؟)].

پێغەمبەر ﷺ سامان و ماڵەکانیانی دابەش کرد لەبەر پەیمان شکێنیەکەیان ویستیشی دەریان بکات وتیان: ئەی محمد لێمان گەڕێن با لەسەر ئەم زەوییانە کاربکەین وە چاکیان بکەین بۆ کشتوکاڵ و سەروکاریان بکەین.

لەگێڕانەوەیەکی تردا [وتیان: ئێمە شارەزاترین بەم زەویانە لەئێوە پێمان بدەن کاریان تێدابکەین نیوەبە نیوە بەرهەمیان دەهێنین بۆ هەردوولامان] پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی ئەوەندەیان منداڵ لە بەردەستا نەبوو کەبتوانن سەرۆکاری ئەو زەویانەیان بکەن و خۆیان تەرخان بکەن بۆ وەرزێری ئەو زەویانە لەبەر ئەوە زەویەکانی خەیبەری دایەوە بەو مەرجەی نیوەی بەروبووم بۆ ئەوان بێت لەهەموو بەرهەمی شینایی و باخەکانی دارخورما ونیوەشی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ)[٦٤٢]. بەو شێوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵیان ڕێکەوت لە عومەری کوڕی خەطابەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((أقركم فيها على ذلك ماشئنا))[٦٤٣]. واتە: (تێیدا بمێننەوە و نیشتەجێ ببن بۆسەرکارییەی ئێستا لەسەری ڕێکەوتوین هەتاکو خۆمان دەمانەوێت).

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەویش لە عومەرەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ جولەکەکانی خەیبەری خستە سەرکاری)[٦٤٤] زەوی و زارەکانی خەیبەر لەسەر ئەوەی بمێننەوە تا هەرکاتێك کە خۆمان دەمانەوێت پاشان دەریان بکەین).

---

[٦٤٢] أخرجه: الطبراني (١٢٠٦٨) وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٠٨) (فيه محمد بن أبي ليلى سيء الحفظ وبقية رجاله ثقات).

[٦٤٣] أخرجه: ابوداود (٣٠٠٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٥٩٩).

[٦٤٤] أخرجه: ابوداود(٣٠٠٧)، ابن هشام (٣٩٩/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٥٩٨).

# دابەش کردنی دەسکەوتەکان (غەنیمەت)

لەبەر ئەوەی خەیبەر بەشێکی بەشەڕ فەتح کراو بەشەکەی تریش بە دانوستان پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتی دابەش کردنەکەدا کردی بە دوو بەشەوە لە بەشیری کوڕی یەسارەوە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك خودا خەیبەری پێبەخشی دەسکەوتەکانی کردە سی و شەش بەش بەگشتی، هەژدە بەشی بۆ موسوڵمانەکان جیا کردەوە هەربەشێك سەدبەشی لە خۆدەگرت واتە: دابەش ببوو بۆ(٣٦٠٠) بەش پێغەمبەری خودا ﷺ وەك ئەوان بەشی بۆ دیاریکرا وەك بەشی یەکێك لەخۆیان دواتر نیوەکەی تریشی کردە هەژدەبەشی تر بۆ هەژارو لانەوازەکانی موسوڵمانان و هەروەها بۆ ڕێکخستنی کاروباری موسوڵمانەکان بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیان)[٦٤٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە سەهلی کوڕی ﷺ هەیسەمیەوە ﷺ دەڵێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ دەسکەوتەکەی خەیبەری دابەش کردبۆ دوو بەشی سەرەکیەوە نیوەی دابین کرد بۆ خاوەن پێداویستیەکان هەژارو بێ نەواکان][٦٤٦]. لەگێڕانەوەیەکی تردا [جیایی کردەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری نوێنەری هۆزەکان و کاروباری موسوڵمانەکان لەگەڵ خەڵکی بێ کەس و کار و لانەوازان][٦٤٧] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە [ئەوە قەڵاکانی (الوطیح و الکتیبة و السلالم) و پاشکۆکانیان بوون کە بەو جۆرەیان لێ کرا ][٦٤٨] وەئەو نیوەیەی تری بەر موسوڵمانەکان کەوتبوو لە قەڵاکانی [الشق والنطاة][٦٤٩] و دابەشی کرد بەسەریانداو کردی بەهەژدە بەشەوە.

---

(٦٤٥) أخرجه: ابوداود (٣٠١٤)، الطبراني (الكبير)(١٠٢/٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن أبي داود) (٢٦٠٥)، وصححه ايضاً الشيخين الارنؤطين في تحقيقهما لـ(زاد المعاد) (١١٩/٣). وصححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٤٦٠).

(٦٤٦) أخرجه: ابوداود (٣٠١٠)، والطبراني (الكبير)(١٠٢/٦) وقال الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٠١) حسن صحيح، وصححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٤٦٠).

(٦٤٧) أخرجه: ابي داود (٣٠١٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٠٣).

(٦٤٨) أخرجه: ابي داود (٣٠١٤) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٦٠٥).

(٦٤٩) أخرجه: ابي داود (٣٠١٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٠٤٠).

پێغەمبەری خودا ﷺ بەشی پیادە یەك بەشی دانا بەڵام بۆ ئەسپ سوار سێ بەشی بۆدانا بۆ خۆی و ئەسپەکەی لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەفەرمویێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ بۆهەر ئەسپ سوارێك سێ بەشی دانا بۆ ئەسپەکەی دووبەش و بەشێك بۆ خاوەنەکەی))[١٥٠].

ابن اسحاق (رحمه الله) دەڵێت: ((خەیبەر دابەشکرا بەسەر ئەوانەی بەشداری حودەیبیە و خەیبەریان کردبوو لەدوایدا یاخود ئامادەی بوون بەهۆی هۆکارێکەوە کەسیش دوانەکەوتبوو تەنها جابری کوڕی عبدوللای ئەنصاری نەبێت، پێغەمبەری خودا ﷺ بەشێکی بۆ دانا وەك بەشی بەشداربووەکان. . . . . .

ژمارەی ئەو کەسانەی دەسکەوتەکانی خەیبەریان بەسەر دابەشکرا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ هەزارو هەشت سەد بەش بوو بە ئەسپەکانیشەوە پیاوەکان هەزارو چوارسەدکەس بوون لەگەڵ دووسەد ئەسپ بۆ هەر ئەسپێکیش دوو بەش دانرابوو خاوەنەکەشی یەك بەش، وەهەموو پیادەیەکیش بەشێکی هەبوو هەموو بەشێکیش بە شێوەیەکی سەرەکی کۆی سەدکەسی لەخۆ دەگرت هەژدەبەش کۆی گشتی بەشەکان بوو))[١٥١]. پێغەمبەری خودا ﷺ لەو پێنج یەکە تایبەتیەی خۆی بەشی بەنی مطلب و بەنی هاشم دا لەبەرخزمایەتی نزیکیان لە پێغەمبەرەوە بەڵام هیچ بەشێکی نەدایە بەنی نوفل و بەنی عبدالشمس لەگەڵ ئەوەشدا هەرچواریان کوڕی عبدالمناف بوون لە جوبەیری کوڕی مطعم ﷺ دەڵێت: کاتێك غەزای خەیبەر ڕوویدا پێغەمبەری خودا ﷺ بەشی خزمەنزیکەکانی دانا لە بەنی هاشم و مطلب بەڵام بەنی نوفل و بنی عبدالشمسی پشت گوێ خست من و عوسمانی کوڕی عەففان ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ پێمان وت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە بەنی هاشم لێگەڕێ نکوڵی لە گەورەیی

---

[١٥٠] أخرجه: احمد (٢/٦٢)، والبخاري (٢٨٦٣، ٤٢٢٨)، ومسلم (١٧٦٢)، وابوداود(٢٧٣٣)، وابن ماجة (٢٨٥٤)، والبيهقي (٦/٣٢٥)، وابن حبان (٤٨١٠) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٤٤٣)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٨٥٤)، و(الارواء) (١٢٢٦).

[١٥١] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٤٠٤).

و شکۆمەندیان ناکرێت بەهۆی پایەی تۆوە کە لەناویاندا بوویت بەڵام بۆچی براکانمان لە بنی (المطلب) و (بنی الشمس)ت بێ بەش کرد [چونکە جوبەیر لەبنی نوفل بوو عوسمانیش لە بەنی ئومیەی کوڕی عبدالشمس بوو] لە کاتێکدا نزیکی ئێمەو ئەوان بۆتۆ وەك یەکە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((انهم لم يفارقوني في جاهلية ولا اسلام انما [نحن] بنو هاشم وبنو مطلب شيء واحد))[٦٥٢]. واتە: (ئەوان هیچ کاتێك لێم جیانەبوونەوە و پشتیبووانیان کردووم لەسەردەمی نەفامی و ئیسلامەتیش دا ئێمە بەنی هاشم و بنی مطلب یەك ماڵین (وەك پەنجەکانی دەست بەیەکەوەین)[٦٥٣].

لەگێڕانەوەیەکی تردا ((کاتێك خوای پەروەردگار خەیبەری فەتح کرد هەرچی لەو ناوچانەبوون لە بەنی خزارە) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتیان: بەشمان دەوێت، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: (ذوالرقیبة) بۆ ئێوە بێت کە شاخێك بووە لەشاخەکانی خەیبەر، وتیان: کەواتە: شەڕت لەگەڵ دەکەین پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: شوێنی شەڕمان (جنف) بێت کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان فدك) و خەیبەر هەرکە ئەوەیان لە پێغەمبەری خودا ﷺ بیست بەڕاکردن هەڵهاتن))[٦٥٤].

---

(٦٥٢) أخرجه: البخاري (٤٢٢٩)، والنسائي (٧/١٣٠).

(٦٥٣) أخرجه: البخاري (٤٢٢٩)، واحمد (٤/٨١)، النسائي (٧/١٣٠)، وابوداود (٢٩٧٨، ٢٩٨٠) واللفظ له، وابن ماجة (٢٨٨١)، والبيهقي (الكبرى)(٦/٣٤١) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٥٨٢)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٣٢٩)، و(صحيح النسائي) (٣٨٥٦)، و(الارواء) (١٢٤٢).

(٦٥٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٢٤٨) عن موسى بن عقبة عن ابن شهاب.

# بەخشینی غەنیمەت بەسەر کۆیلەو ژنەکاندا

١- لە عومەیری کۆیلەگراوی ئەبو اللحم دەڵێت:

((بەشداری خەیبەرم کرد لەگەڵ گەورەکانمدا لەبارەی منەوە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ کردبوو وە پێیان وتبوو کەمن کۆیلەم)). [ هیچ بەشی لە دەسکەوتەکان بۆ دانەنام][٦٥٥] بەڵام فرمانی کرد شمشێرێکیان بۆ هێنام و کردیانە ملم و منیش بەدوای خۆمدا ڕامدەکێشا و بۆم هەڵنەدەگیرا دواتر فەرمانی کرد هەندێك شتومەکم بدرێتێ][٦٥٦].

٢- ئیمامی ئەوزاعی (رحمه الله) دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ لەغەزای خەیبەردا بەشی بۆ ئافرەتەکان دانا))[٦٥٧].

٣- لە ثابتی کوڕی حارثي ئەنصارییەوە ﷺ دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزای خەیبەردا بەشە دەسکەوتی بۆ سەهلەی کچی عاصمی کوڕی عەدی و کچەکەی دانا کەلەوێ لەدایك بوو))[٦٥٨].

٤- لە زەینەبی هاوسەری عبدوڵڵای کوڕی ثقیفیەوە دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لەرۆژی خەیبەردا پەنجا بار خورما ولەمەدینەش بیست بار جۆی پێبەخشیم))[٦٥٩].

---

[٦٥٥] أخرجه: ابن ماجة (٢٨٥٥) صححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٣٠٤).

[٦٥٦] أخرجه: احمد (٢٢٣/٥)، والطبراني (الكبير) (١٣١/١٧)، ابوداود (٢٧٣٠)، والترمذي (١٥٥٧) وقال حسن صحيح، والدارمي (٢٤٧٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٤٤٠)، و(صحيح الترمذي) (١٢٦١).

[٦٥٧] أخرجه: الترمذي (١٦١٥) وقال الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٢٦٠) صحيح الاسناد مقطوع.

[٦٥٨] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٣٦٩)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٩٠/١) (رقم: ٨٧٤)، واخرجه ابن سعد والطبراني واسناده قوي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٧/٦) فيه ابن الهيعة وفيه ضعف وحديثه حسن.

[٦٥٩] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٣٢/٢٤)، وقال الهيثمي في (ومجمع الزوائد) (٧/٦) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

٥. لە ئومییەی کچی ئەبو صەلت کە: ئافرەتێکی هۆزی غیفارە دەڵێت: ((...کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ خەیبەری فەتح کرد بەشی ئێمەشی دیاریکرد لە دەسکەوتەکان ئەم ملوانکەیەی کە دەبینن لە ملمدایە لەوێ وەرمگرت خۆی پێیبەخشیم خۆشی بەدەستی موبارەکی لەملی کردم سوێندبە خودا هەرگیز دایناننیمەوە))[٦٦٠].

# چاکتربوونی بارودۆخی موسوڵمانان

خوای گەورە بەڵێنەکانی هێنایە دی بۆ مسوڵمانان وەك خودای بەدەسەڵات و خاوەن شکۆ دەفەرموێت: ﴿ ...مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا ... ﴾ (الفتح: ٢٠) واتە: غەنیمەو دەسکەوتێکی ئێجگار زۆرتان دەکەوێتە دەستان و دەبێتە هی خۆتان، خودای گەورە ئازو نیعمەتی خۆی بەسەر پێغەمبەرەکەی دا ڕژاند بەو غەنیمەت و دەسکەوتە زۆر وبەلێشاوە لە وشترو مانگاو باخ و بێستانە وەك ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێت: (خەیبەرمان فەتح کرد زێرو زیومان بە غەنیمەت نەگرت، بەڵکو ئاژەڵ ومانگا و وشتر وباخ وبێستان وپێداویستی ژیانی زۆرمان دەسکەوت. . . . .))[٦٦١].

موسوڵمانەکان هەندێك خواردنی ڕۆژانەیان دەست کەوت وەك غەنیمەت دابەش دەکرا نەدەگەیشتە ئەندازەی پێویست وەك لە عبدوڵلای کوڕی ئەوفا ﷺ دەڵێت: ((خواردنی وەمان دەسکەوت لە خەیبەر هەموو پیاوێك دەهات بەئەندازەی پێویستی خۆی لێی دەبردو دەڕۆیشت ئەخرایە چوارچێوەی دەسکەوتەکانەوە))[٦٦٢].

هاوەڵانی پێغەمبەر نانی گەرم و نەرمیان خوارد کە پێشتر نەیان خواردبوو لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە ﷺ دەڵێت: ((عەرەب دەیانوت: هەرکەسێك نانی گەنم بخوات قەڵەو دەبێت کاتێك خەیبەرمان فەتح کرد کۆمەڵێك لەو نانەمان بەدەست کەوت و منیش بۆ

[٦٦٠] أخرجه: احمد (٦/٣٨٠) (٢٧١٣٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابوداود (٣١٣)، والبيهقي (الكبرى) (٤٠٧/٢)، وابن هشام (٣٩٥/٣) رقم (٨٦٧) وقال محققاه: اسناده حسن، وابن سعد (٢١٤/٨).

[٦٦١] أخرجه: البخاري (٤٢٣٤).

[٦٦٢] أخرجه: ابوداود (٢٧٠٤)، والحاكم (١٢٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢٤١/٤) وقال الحافظ ابن كثير في (البداية) (١٩٥/٤) رواه ابوداود وهوحسن، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٥٣) وقال محقق (زاد المعاد) (١١٥/٣) اسناده قوي.

دانیشتم تا تێرم لێی خوارد پاشان تەماشای هەردوو لاتەنیشتی خۆمم دەکرد تابیبینم ئایە قەڵەو نەبووم؟))[٦٦٣].

پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێك مەڕی دابەش کرد بەسەر موسوڵمانەکاندا لە معاذەوە ﷺ دەڵێت: ((ئامادەی غەزای خەیبەربووم لە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ مەڕێکی زۆرمان دەسکەوت، پێغەمبەری خودا ﷺ بەشێکی بەسەرماندا دابەش کرد ئەوەی تریشی کردە ناو تەویلەو کۆزەکانیان بۆ نیوەی دەسکەوت))[٦٦٤].

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ مەڕەکانی دابەش کرد بەسەریاندا هەر دە کەسە و مەڕێکی دایە، لە ئەبو لیلی ﷺ دەڵێت: ((بەشداری فەتحی خەیبەرم کرد لە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك جولەکەکان تێکشکان ئێمەش کەوتینە ناو موڵك و ماڵیان وکەلوپەل وپێداویستی ناو ماڵ وهەموو ئەوشتانەمان دەست خست زۆری نەبرد بە گورجی مەنجەڵەکانیان پڕکرد و لەسەر ئاگریان دانان و بەکوڵ هاتن پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کردپیان کەبیڕێژن ئینجا مەڕی دابەش کرد بەسەرماندا هەر (١٠دە) کەس مەڕێك تاکو لێینێین))[٦٦٥].

خەڵکی لەوڕۆژەدا ژمارەیەك مەڕوماڵاتیان بردبوو بەرلەدابەش کردنی غەنیمەت و سەریان بڕی بوو کوڵاندبوویان لەناو مەنجەڵەکان پێغەمبەری خودا ﷺ هات فەرمانی دەرکرد کە دەست لەو مەنجڵانە هەڵبگرن لە ئەعلبەی کوڕی حەکم ﷺ دەڵێت: ((لە غەزای خەیبەردا مەڕوماڵاتی دوژمنمان دەسکەوت [خەڵکەکە دوچاری برسیەتی و ماندوبوونێکی زۆربوون][٦٦٦].

خەڵکەکە بردیان بەر لەدابەش کردنی دەسکەوتەکان سەریان بڕین و لە سەرئاگریان نا دواتر پێغەمبەری خودا ﷺ هات مەنجەڵەکان قوڵپیان دەدا و دەکوڵان فەرمووی:

---

(٦٦٣) أخرجه: الحاكم (٢/١٣٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(٦٦٤) أخرجه: ابوداود (٢٧٠٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٥٥).

(٦٦٥) أخرجه: احمد (٤/٣٤٨) (١٩٠٥٨) وقال محققه: حديث صحيح، والدارمي (٢٤٧٠)، والحاكم (٢/١٣٤)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٢٦٢)حديث صحيح.

(٦٦٦) في رواية ابي داود (٢٧٠٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٥٣).

[ئەوەچیە؟] فەرموویان: ئەوە مەڕی تالانیەیە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ [بەکەوانەکەی مەنجەڵەکانی ڕژاندو سەروژێری کردن پاشان گۆشتەکەی تێکەڵ بە خۆڵەکە کرد][٦٦٧]. وە فەرمووی: : ((اكفئوها فان النهبة لاتحل [انَّ النهبة ليست باحل من الميته] فاكفئوا وما بقى منها))[٦٦٨]. واتە: (ئەو مەنجەڵانە بڕێژن چونکە ماڵی تالانی و ڕاوڕوت حەڵاڵ نی یە ماڵی تالانی و ڕاوڕوت لە مردارەوە بوو حەڵاڵ ترنی یە هەرچی تێداماوە بیڕژن و قلپی بکەنەوە).

هەرلەو ڕۆژەدا عبدوڵڵای کوڕی مەغفل یەك مەشکە ڕۆنەکەرەی لەهەمان خواردن دەستکەوت هەڵیگرتەوە و بەدەستیەوە گرت عبدوڵڵای کوڕی مغفل دەڵێت: ((جەواڵێکم لەگۆشت و ڕۆنەکەرە دەستکەوت لەڕۆژی خەیبەردا هەڵمگرتەوە وتم: [ئەوە هی منە ئەمڕۆ هیچ شتێك نالەمە نادەمە هیچ کەسێك دەڵێت: ئاوڕم دایەوە پێغەمبەری خودا ﷺم بینی [بەزەردەخەنەوە بۆی دەڕوانیم][٦٦٩].

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (هیزەیەکیان فڕێدا بۆلامان خواردن و گۆشتی تێدابوو لەغەزای خەیبەردا خۆم بۆ هەڵداو هەڵمگرتەوە ئاوڕم دایەوە سەیری ئەملاولام کرد پێغەمبەری خودام بینی شەرمم لێکرد))[٦٧٠] لەکۆی ئەو کەل و پەلانەی موسوڵمانان دەستیان بەسەرداگرت لە قەڵای صەعبی کوڕی معاذ) جل و بەرگ و ئارەق بوو.

واقیدی (رحمه الله) دەڵێت: (لە قەڵای صەعبی کوڕی موعاذ جل و بەرگ و کوندەی ئارەقیان دەستکەوت ئارەقەکانیان ڕژاند لەو ڕۆژەدا پیاوێك بەناوی عبدوڵای حمار ئارەقەکەی خواردەوە)[٦٧١]. وە ناوی هاتووە لە فەرموودەیەکدا کە عومەری کوڕی خطاب ﷺ

---

(٦٦٧) نفس المصدر.

(٦٦٨) أخرجه: عبدالرزاق (١٨٨٤١)، واحمد(١٩٤/٤)، وابن ماجة (٣٩٣٨)، وابوداود (٢٧٠٥)، والطبراني (الكبير) (٨٢/٢) واللفظ له، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٥٤)، و(صحيح ابن ماجة) (٣١١٨)، و(السلسلة الصحيحة) (٢٣٧/٤) وقال محققا (زادالمعاد) (١٠٧/٣)صحيح.

(٦٦٩) واللفظ المسلم.

(٦٧٠) أخرجه: البخاري (٣١٥٣، ٤٢١٤)، ومسلم (١٧٧٢)، وابوداود (٢٧٠٢).

(٦٧١) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٦٦٠)، وانظر (فتح الباري) لابن حجر العسقلاني (٩٠/١٢).

دەگێڕێتەوە دەڵێت: [پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی عبدوللا بوو نازناوی (حمار) بوو پێغەمبەری خودای ﷺ دەهێنایە پێکەنین][٧٧٢].

لەگێڕانەوەیەکی تردا (...عەبدوللا هێزەیەك ڕۆن و هێزەیەك هەنگوینی بەقەرز دەهێنا وەك دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد ئینجا هەرکات خاوەنەکەی بۆ پارەکەی بهاتایە دەی وت: بابچین بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ لەوێدا دەی وت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ نرخی شتەکان بدەرەوە بە ئەو پیاوە، پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر پێدەکەنی وفەرمانی دەکرد کە نرخەکەی بدرێتێ][٧٧٣].

پێغەمبەری خودا ﷺ جەڵدی ئارەق خواردنەوەکەی ئەو ڕۆژەی لێدا [ئەوەش لەڕۆژی خەیبەردا ڕوویدا هەروەك لە گێڕانەوەکەی الوقیدی دا هاتووە] فەرمانی دەرکرد جەڵدیان لێدا، پیاوێك لەناو خەڵکەکە وتی: بەر ئەفرەتی خودا بکەوێت ئەوە چیە ئەوەندە دەخواتەوە و دەهێنرێت داری حەدی لێدەدرێت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لا تلعنوه)) (ئەفرەتی لێمەکەن) لە ڕیوایەتێکی تردا [مەبنە یارمەتیدەری شەیتان بۆسەر براکەتان سوێند بەخوا ئەوەی من دەزانم ئەو خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێت][٧٧٤].

---

[٧٧٢] اخرجه: البخاري (٦٧٨٠).

[٧٧٣] اخرجه: ابويعلى (١/١٦٧) (رقم: ١٧٧) وقال محققه: اسناده حسن، قال الحافظ في (الفتح) (١٢/٩١) اسناده صحيح، وصحح اسناده البوصري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٤/٣٥٥) (رقم: ٣٩٩٩).

[٧٧٤] في رواية: البخاري (٦٧٨١).

# ڕونکردنەوەی هەندێك لە حوکمە شەرعیەکان

لەڕۆژی غەزای خەیبەردا پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێك ئەحكامە شەرعیەکانی بۆ موسوڵمانان ڕۆشن کردەوە و فەرمانەکانی خودای لەبارەوە ڕاگەیاند لەکاتێکدابوو موسوڵمانان لەناو خۆیاندا کڕین و فرۆشتنی دەستبە دەست و شتومەك بە شتومەکیان بەکەل و پەلی غەنیمەت و دەسکەوتەکانی غەزاوە دەکرد پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی هەندێك لەو شتانەی کرد لەوانە: -

١- حەرامی کرد کە زێڕبەزێڕ بفرۆشرێت تەنها کێش بەکێش نەبێت واتە: هەر دووکیان وەك یەك بن لەکێشدا ئەوەش لەچەندین گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە:

آ- فوضالەی کوڕی عوبیدەوە ﷺ دەڵێت: لە غەزای خەیبەردا ملوانکەیەکم کڕی بە دوانزە دینار کە زێڕو مرروواری سوری تێدابوو لێم جیاکردنەوە سەیرم کرد زیاتر لەدوانزە دینار دەکات ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ باس کرد فەرمووی: ((لاتباع حتى تُفصَّلَ))[٦٧٥]. واتە: (نافرۆشرێت هەتا لەیەك جیا نەدەکەیتەوە)).

ب- وەهەرلەوە وە دەگێڕنەوەو دەڵێت: چومە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزای خەیبەردا بە ملوانکەیەکەوە کە مرواری سورو زێڕبوو لەدەسکەوتەکانی خەیبەر دەستم کەتبوو دەمفرۆشت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد ئەو زێڕەی لە ملوانکەکەدایە لێی بکەمەوە بە تەنها بیفرۆشم پاشان فەرمووی: ((الذهب بالذهب وزناً بوزن))[٦٧٦]. واتە: ((زێڕبە زێڕ کێشیان بێت وە یەك بێت و هەردوو هاوتا بن)).

ج- وە هەروەها لە فوضالەی کوڕی عوبیدەوە ﷺ دەگێڕنەوەو دەڵێت: ((ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دابووین لە غەزای خەیبەر یەك ئوقیەمان (٤٥٢غم) زێڕبە

---

[٦٧٥] أخرجه: احمد (٦/٢١)، ومسلم (١٩٥٢)، وابوداود (٣٣٥٢).

[٦٧٦] أخرجه: مسلم (١٩٥١، ٣٣٥١) واللفظ له، والحاكم (٢/٣٨)، والدارالقطني (٢/٢٣٧)، والبيهقي (٥/٢٩٢).

دوو دینار یاخود سێ دینای زێڕ بە جولەکەکان دەفرۆشت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: زێڕ بە زێڕ مەفرۆشنەوە مەگەر بەکێشی خۆی نەبێت))[٦٧٧].

٢. وە قەدەغەی کرد لەگەڵ جارییەکاندا جووت بوون بکرێت و کەل و پەل غەنیمەت بەکاربهێنرێت یان بفرۆشرێت بەرلەدابەش کردنی:

عبدوللای کوڕی عەباس ؓ دەفەرموێت: لەغەزای خەیبەردا پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی کرد کەکەل و پەلی غەنیمەت بفرۆشرێت بەرلەدابەش کردنی وە هەروەها جووت بوون لەگەڵ کەنیزەکە سکپڕەکانی قەدەغەکرد هەتا منداڵیان دەبێت فەرمووی: ئایە کێڵگەو کاڵ و شیناى خەڵکی تر ئاودەدەیت؟)[٦٧٨]. ئەو باسە بەدرێژی هاتووە لە فەرموودەیەک کە ڕافیعی کوڕی ثابت ؓ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا ﷺ کەفەرموویەتی: [من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يسقين ماءه ولد غيره ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلايأخذن دابـة من المغانم فيركبها حتى اذا أعجفها رّدها في المغانم، ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يلبس ثوباً من المغانم حتى اذا اخلقه رده في المغانم))[٦٧٩]. واتە: ((لە ساڵی خەیبەردا فەموویەتی: هەر کەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە باناوی خۆی تێکەڵ بەمنداڵی کەسی تر نەکات واتە: نەچێتە لای ئافرەتی دووگیان کە کراونەتە جاریە). وە هەرکەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با سوارێ هیچ وڵاخێك نەبێت لە غەنیمەت و سواری سەرپشتی بێت هەتاکو لەڕو لاوازی دەکات ئینجا بیگێڕێتەوە بۆ ناو دەسکەوتەکان وە هەرکەسێك باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با هیچ پۆشاکێك لەدەسکەوتەکان لەبەرنەکات تاکو کۆن و بێکەڵکی دەکات ئینجا بیگێڕێتەوە بۆ ناو دەسکەوتەکان)).

---

(٦٧٧) أخرجه: احمد (٢٢/٦)، ومسلم (١٩٥١، ٣٣٥١)

(٦٧٨) أخرجه: الحاكم (١٣٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والدارقطني (٦٩/٣) (٣٠٣٢) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الشيخ الالباني في (إرواء الغليل) (١٤١/٥) صحيح الاسناد.

(٦٧٩) أخرجه: احمد (١٠٨/٤)، والطبراني (الكبير) (٤٤٨٨)، والدارمي (٢٣٠/٢)، وابوداود (٢١٥٨)، وابن حبان (٤٨٥٠) وقال محققه: اسناده حسن واللفظ له، وحسنه الشيخ الالباني في (الارواء) (٢١٣٧)، و(صحيح ابي داود) (١٨٧٤).

٢- پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمانەی حەرام کرد (هەموو خاوەن کەڵبەیەك لەگیانلەبەرەکان وە هەموو تەیرو باڵندەیەکی چڕنوکدار لەگەڵ هێسترو کەرو ژنهێنانی کاتی (واتە: ژن هێنان بۆ ماوەیەك) و ئەو ئاژەڵەی بەبەرد یاخود بەتیری نیشانە لێدەدرێت هەتا دەمرێت وەباڵندەو ئاژەڵی پیس خۆر و هەروەها ئەو ئاژەڵەی دڕندە دەیگرێت و چەقۆی پێ ڕاناگات و مرداردەبێتەوە) ئەوانە لە چەندین فەرموودەدا هاتوون لەوانە:

أ- لە عرباضی کوڕی ساریەوە ﷺ دەڵێت: ((ان رسول الله ﷺ حرَّم يوم خيبر كل ذي مخلب من الطير ولحوم الحمر الاهلية والخليسة، [وهي ما يستخلص من السبع فيموت قبل ان يذكى] والمجثمة [وهي التي تُصبّر بالنبل]. . .))[٦٨٠]. واتە: (پێغەمبەری خودا ﷺ لەغەزای خەیبەر هەموو باڵندەیەکی چڕنوکدارو کەری ماڵی و ئەو ئاژەڵ و باڵندەیەی کە دڕندە دەیبات و مرۆڤ لێ دەسەنێتەوە وبەچەقۆدا ڕاناگات و دەمرێت قەدەغەیکرد، وەهەروەها ئەو ئاژەڵ و باڵندانەشی قەدەغەکرد کە دەبەسرێنەوە و نیشانەیان لێ دەگیرێتەوە و مردار دەبێتەوە یان نا...).

ب- لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەڵێت: ((نهى رسول الله ﷺ يوم خيبر عن اكل كل ذى ناب من السباع وعن كل ذي مخلب من الطير [ولحوم البغال]))[٦٨١]. واتە: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزای خەیبەردا قەدەغەی کرد کە گۆشتی ئاژەڵی کەڵبەدارو دڕندە بخورێت لەگەڵ هەموو باڵندەیەکی چڕنوکدار و گۆشتی هێستر)).

---

[٦٨٠] أخرجه: احمد (٤/١٢٧)، والترمذي (١٨٧٢)، والحاكم (٢/١٣٥) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٤٦٦)، و(السلسلة الصحيحة) (٤/٢٣٩)، و(٢٣٩١، ٣٥٩)، و(الارواء) (٢٤٨٨).

[٦٨١] أخرجه: احمد (١/٢٨٩)، والبخاري (٥٥٣٠)، ومسلم (١٩٣٤)، وابوداود (٣٨٠٥)، والنسائي (٧/٢٠٦)، وابن ماجة (٣٢٣٤)، وابن حبان (٥٢٨٠) وقال محققه اسناده صحيح، والطبراني (الكبير ١٢٩٩٤)، والبيهقي (٩/٣١٥)، والطيالسي (٢٧٤٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي ١١٩٥)، و(صحيح ابي داود) (٣٢٣٠)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٦١٨)، و(الارواء) (٨/١٣٨)، و(صحيح النسائي) (٤٠٣٤).

ج. لە عمری کوڕی شوعەیب ئەویش لەباوکیەوە باوکیشی لە باپیریەوە (رضي الله عنهم) دەگێڕێتەوە: ((نهى رسول الله ﷺ يوم خيبر عن الجلالة عن ركوبها وعن اكل لحومها))[٦٨٢].

واتە: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا قەدەغەی کرد کە گۆشتی باڵندە و ئاژەڵی گەندە و پیس خۆر بخورێت وە سواری پشتی ببن).

د. لە علی کوڕی ئەبو طالبەوە ﷺ دەڵێت: ((نهى رسول الله ﷺ عن متعة النساء يوم خيبر...))[٦٨٣] پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی کرد کە ژن بهێنین بۆ ماوەیەك (واتە: ژنهێنانی متعه) و کاتی. بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی دا بە خواردنی گۆشتی ئەسپ و گەری کێوی بەڵەك) لە غەزای خەیبەردا.

أ) لەجابرەوە ﷺ دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لە خەیبەردا قەدەغەی کردلێمان کە گۆشتی کەری ماڵی بخۆین بەڵام ڕێگەی پێداین کە گۆشتی ئەسپ بخۆین))[٦٨٤].

ب) وەهەروەها لە جابرەوە ﷺ دەڵێت: ((لە غەزای خەیبەردا ئەسپ و هێسترو کەری ماڵیمان سەربڕی بوو پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی کردین لە خواردنی هێسترو کەری ماڵی بەڵام قەدەغەی نەکردین لەخواردنی گۆشتی ئەسپ))[٦٨٥].

---

[٦٨٢] أخرجه: احمد (٢/٢١٩)، وابوداود (٣٨١١)النسائي (٦/٢٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٣٢٣٢) (صحيح النسائي) (٤١٤٢)، و(الارواء) (٨/١٥٠)، وقال الحافظ في (الفتح) (٩/٦٤٨): سنده حسن.

[٦٨٣] أخرجه: البخاري (٤٢١٦)، ومسلم (١٤٠٧)، ومالك (٢/٧٤)، والنسائي (٦/١٢٦)واللفظ له، وابن ماجة (١٩٦١)، والدارمي (١٩٢٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٨٩٥)، و(صحيح الجامع) (١١٢١)، و(صحيح ابن ماجة) (١٥٩٦)، و(صحيح النسائي) (٤٠٤٣).

[٦٨٤] أخرجه: عبدالرزاق (٨٧٣)، والبخاري (٤٢١٩)، ومسلم (١٩٤١)، وابن ابي شيبة (٨/٢٥٦)، وابوداود (٣٧٨٨)، والترمذي (٣٣١)، والنسائي (٧/٢٠١)، وابن ماجة (٣١٩١)، والدارمي (٢/٨٧)، وابن حبان (٥٢٧٠-٥٢٧٣) وقال: محققه اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٣٢١٨)، و(الارواء) (٣٥٩)، (السلسلة الصحيحة) (٢٥٨٤)، و(صحيح النسائي) (٤٠٣٧)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٤٨٤).

وەهەر لە جابرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((لەکاتی غەزای خەیبەر گۆشتی ئەسپ و کەری وەحشی کێویمان دەخوارد))[٦٨٦] خەڵکەکە لەو ڕۆژەدا هەندێك جاریەیان دەسکەوت و دەیانویست ڕزگاریان بکەن و ئینجا مارەیان بکەن و لەکاتی جوتبوونیاندا ئاویان لەدەرەوە بڕێژن.

لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ دەفەموێت: لەغەزای خەیبەر هەندێك جاریەمان دەستکەوت ویستمان ڕزگاریان بکەین و مارەیان بکەین وە لەکاتی جوتبووندا ئاومان لەدەرەوە بێنینەوە پرسیاری ئەمەمان لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد فەرمووی: ((لا عليكم الا تفعلوا، فانما هو القدر))[٦٨٧]. واتە: ((هیچ گوناهتان بۆ نانوسرێت بەڵام ئەگەر ئەم کارەتان کرد بووە هۆی منداڵبوون ئەوە قەدری خودایە). لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری کرد بۆ مسوڵمانان ئاگرێکی زۆر کرابۆوە مەنجەڵەکان پڕکرابوون لە گۆشتی کەری ماڵی و لەسەر ئاگرەکە دانرابوون. لەسەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ دەڵێت: ((لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دابووین چووین بۆ خەیبەر پاشان خوای گەورە بۆی فەتح کردین ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە خەیبەر فەتح کرا هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگرێکی زۆریان کردەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((ما هذه النيران، على اي شيء توقدون ؟)). واتە: ((ئەو ئاگرانە چیە و بۆ چ شتێك کراونەتەوە؟)) وتیان: بۆ گۆشت کوڵاندن. فەرمووی: ((على أي لحم ؟)). ((بۆ چ گۆشتێك؟)) وتیان: بۆ گۆشتی کەری ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((اهرقوها واكسروها)). واتە: ((بیڕێژن

---

(٦٨٥) اخرجه: احمد (٣/٣٥٦)، وابوداود (٣٧٨٩)، والحاكم (٤/٢٣٥) صححه ووافقه اللهبي، والبيهقي (٩/٣٢٧)، وابن حبان (٥٢٧٢)، وقال محققه حديث صحيح، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٨/١٣٨)صحيح على شرط مسلم.

(٦٨٦) اخرجه: مسلم (١٩٤٢)، والنسائي (٧/٢٠٥)، واحمد(٣/٣٥٦)، وابن ماجة (٢٥٨٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٠٥١)، و(صحيح ابن ماجة) (٣١٩١)، و(الارواء) (٨/١٣٨).

(٦٨٧) اخرجه: احمد (٣/٤٩)، والطيالسي (٢١٥٧)، وابن حبان (٤١٩١) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم واللفظ له.

و مەنجەڵەکان بشکێنن)). پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا دەبێت بیڕژێن و پاکی بکەینەوە و بیشۆین، فەرمووی: ئاوها بکەن))[٦٨٨].

لە گێڕانەوەکەی ئەنەسدا ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك خەیبەرمان فەتح کرد کەری زۆرمان دەسکەوت هەندێك کەرمان سەر بڕی بوون لەسەر ئاگر دەمان کوڵاندن بانگەواز کارێك لەلایەن پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی کرد وتی: ((الا ان الله ورسوله ينهاكم [عن لحوم الحمر] فانها رجس من عمل الشيطان[فاكفئت القدور و انها لتفور باللحم))[٦٨٩]. واتە: ((ئایا ئاگادارن خوداو پێغەمبەری خودا قەدەغەتان دەکەن لە خواردنی گۆشتی کەریماڵی چونکە پیسە و لەکردەوەی شەیتانە ئێمەش مەنجەڵەکانمان قڵپ کردەوە و ڕژاندمان کە بەکوڵ هاتبوون بەگۆشتی کەری ماڵی)).

وە ئەبو ثەعلەبەی خشنی ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد بە عبدالرحمن کوڕی عەوف کەبەناو خەڵکیدا بانگەواز بکات بڵێت: ((الا ان لحوم حُمرَ الانس لا تحل لمَنْ شهد اني رسول الله))[٦٩٠]. واتە: (ئاگاداربن گۆشتی کەری ماڵیتان بۆ حەڵاڵ نی یە بۆ هەر کەسێك شایەتمان دێنێت کە من پێغەمبەری خودام)). هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ واتێگەیشتبوون کە پێغەمبەری خودا ﷺ حەرامی کردووە کە گۆشتی کەری ماڵی بخورێت چونکە لە پێنج یەکی دەسکەوتەکانی دانەنا، هەروەك عبدوڵلای کوڕی ئەوفا ﷺ دەڵێت: (لەناو خۆماندا قسەمان لەسەر دەکرد دەمان وت: بێ گومان حەرامە بۆجی حەرامە چونکە لە پێنج یەکی غەنیمەتدا نیە)[٦٩١]. یاخود لەبەر ئەوەی باربەری خەڵکی یە و پێغەمبەری خودا ﷺ پێی خۆش بوو هەندێك لەبارهەڵگری ڕۆژانەیان بیات

[٦٨٨] أخرجه: احمد (٣/١١١)، والحميدي (١٢٠٠)، والدارمي (٢/٨٦)، والبخاري (٢٩٩١)، ومسلم (١٩٤٠) واللفظ له، والنسائي (٧/٢٠٤)، وابن ماجة (٣١٩٥).

[٦٨٩] أخرجه: البخاري (٤١٩٨) (٤١٩٩)، مسلم (١٩٣٩)، والنسائي (٧/٢٠٤)، و(صحيح النسائي) (٤٠٤٨).

[٦٩٠] أخرجه: النسائي (٧/٢٠٤)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن النسائي) (٤٠٤٩).

[٦٩١] أخرجه: مسلم (١٩٣٣).

لەبەر ئەوە جولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و سکاڵایان هێنایە خزمەتی سەبارەت بەو کارەش پێغەمبەری خودا ﷺ ئامۆژگاری موسوڵمانەکانی کرد.

لە عرباضی کوڕی ساریەوە ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ لەخەیبەر دابەزین و هەندێك لە هاوەڵانی لە خزمەتی دابوون خاوەنی خەیبەر پیاوێکی کەتەی زل ناشیرین بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگاداری کردەوە و پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یا ابن عوف ارکب فرسك ثم ناد: الا أن الجنة لاتحل الا لمؤمن وان اجتمعوا الصلاة)). واتە: ((ئەی کوڕی عەوف سواری ئەسپەکەت بەو پاشان بانگ بکە ئاگاداربن بەهەشت بۆ باوەڕدا نەبێت بۆ کەسی تر حەڵاڵ نی یە وە کۆببنەوە بۆ نوێژ کردن)). وتی: کۆبووینەوە و ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ پێش نوێژی بۆکردن پاشان هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ((ایحسب احدکم متکئاً علی أریکته قد یظنُّ ان الله لم یحرم شیئاً الا مافي هذا القرآن، الا واني والله قد وعظت وامرت ونهیت عن اشیاء، انها لمثل القرآن او اکثر وان الله عزوجل لم یحل لکم ان تدخلوا بیوت اهل الکتاب الا باذنٍ، ولا ضرب نسائهم ولا اکل ثمارهم اذا اعطوکم الذي علیهم))[٦٩٢]. واتە: ((یەکێك لە ئێوە پاڵدەداتەوە لەسەر شوێنی حەسانەوی وادەزانێ و گومان دەبات خودای گەورە هیچ شتێکی حەرام نەکردووە تەنها ئەوە نەبێت کەلەناو قورئاندا هاتووە ئاگاداربن سوێند بەخوا ئامۆژگاریتان دەکەم فەرمانتان پێدەکەم شتانێکتان لێ قەدەغە دەکەم ئەوانە وەك قەدەغە کراوەکانی قورئانە و یاخود زیاتریش لەو، خوای بەدەسەڵات و خاوەن شکۆ حەڵاڵی نەکردووە بۆ ئێوە کەبچنە ماڵی خاوەن پەیامە ئاسمانیەکان مەگەر خۆیان ڕێگەتان بدەن وە نابێت لە ئافرەتەکانیان بدرێت وە نابێت بەروبومەکانیشیان بخورێت کاتێك ئەوەی لەسەریان پێویستە بیدەن)).

لە گێڕانەوەیەکی تر لە میقدادی کوڕی مەعدی کوڕی کرب دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئاگاداربن من قورئانم بۆ هێناون وە هاوشێوەی قورئانیش کە سوننەتە [پێدەچێت پیاوی واهەبێت کە فەرموودەیەکی منی پێ بگات] لەکاتێکدا بە

[٦٩٢] اخرجه: الطبراني (الکبیر) (٨/٦٤٥)، وابوداود (٣٠٥٠) واللفظ له، والحاکم (١/١٠٩)، والبیهقي (٩/٢٠٤)، وابن عبدالبر (التمهید) (١/١٤٩)، وقال الشیخ الالباني في (السلسلة الصحیحة) رقم (٨٨٢)اسناده حسن.

نێروبڕی] پاڵیدا بێتەوە لەسەر شوێنی حەسانەوەی خۆی و بڵێت لەنێوانی ئێمەو ئێوەدا تەنها کتابی خوای هەیە))[٦٩٣] دەست بە قورئانەوە بگرن و پابەندبن پێوەی هەرچی بەرچاوتان کەوت لەحەڵاڵ بەحەڵاڵی بزانن هەرچیتان تێدا بینی بە حەرام ئێوەش لەسەرخۆتانی حەرام بکەن و بەحەرامی بزانن ئاگاداربن ئەوە ئاوها نی یە ئاگاداربن ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لێتان حەرام دەکات وەك ئەوەیە کە خودای گەورە حەرامی کردووە ئاگاداربن گۆشتی کەری ماڵی حەڵاڵ نی یە وە هەموو کەڵبەدارێکی دڕندەش لە لێتان ئاگادارن وەهیچ شتێکی دۆزراوەی (ئەهلی الذمة)، مەگەر ئەوەی خاوەنەکەی پێویستی پێ نەبێت وەهەرکەسێك ببێتە میوانی خەڵکانێك لەسەریان پێویستە ڕێزی بگرن و میوانداری بکەن ئەگەر میوانداریان نەکردوو ڕێزیان وەك پێویست نەگرت ئەویش بۆی هەیە بەئەندازەی پێویستی خۆی لەئەوان ببات))[٦٩٤].

پێغەمبەری خودا ﷺ هاوەڵانی ئاگادارکردۆتەوە و ئامۆژگاری کردوون کە گومانیان بۆ دروست نەبێت بەرامبەر هیچ حوکم و فەرمانێك لە ئەحکامە شەرعیەکانی کەلە سوننەتی پێغەمبەری خودا ﷺ داهاتوون، ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی قورئانن لەگەڵ ڕوونکردنەوە ئەو حوکمانەی بەدرێژی باسەکەی لە قورئاندا نەهاتووە، میقداد کوڕی معید کرب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((لەوانەیە پیاوێك))[٦٩٥] یاخود ((کەسێك لەئێوە من بەدرۆ بخاتەوە و پاڵ بداتەوە لەسەر شوێنی حەسانەوەی خۆیدا و فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی من بگێڕێتەوە بڵێت لە نێوان ئێمەو ئێوەدا تەنها قورئانی بەرز هەیە هەرچیەکتان بینی لە قورئاندا حەڵاڵ بوو هەموو بەحەڵاڵی بزانن وەهەر چیەکتان بینی لە قورئاندا حەرام کرابوو هەمووتان بە حەرامی بزانن ئاگادار بن حەرام

---

[٦٩٣] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٠/٦٤٩، ٦٧٠)، وأحمد (١٣٢/٤)، والدارمي (٥٩٢)، وابوداود (٤٦٠٤)، والترمذي (٢٦٦٤) وقال حسن غريب، وابن ماجة (١٢) وصحح اسناده الألباني في (المشكاة) (١٦٢-١٦٣)، و(صحيح الجامع) (٢٦٤٣) (صحيح الترمذي) (٢١٤٦) (صحيح ابن ماجة) (١٢).

[٦٩٤] أخرجه: الترمذي (٤٦٠٤)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٢٨٧٠).

[٦٩٥] أخرجه: ابن ماجة (١٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٢)، و(المشكاة) (١٦٣) واللفظ لابن ماجة.

کراوەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ وەك حەرامکراوەکانی خودایە))[٦٩٦]. لە گێڕانەوەی ئەبو ڕافع دا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((لا الفين احدكم مُتكئاً على اريكته يأتيه الامر [من أمرى]مما امرت به او نهيتُ عنه فيقولُ: لا أدري ماوجدنا في كتاب الله اتبعناهُ))[٦٩٧]. واتە: ((هیچ کەسێك لە ئێوە وانەکات پاڵ بداتەوە لەسەر شوێنی حەسانەوەی خۆی فەرمانێك لە فەرمانەکانی منی پێبگات یاخود لەوانەی کە لێم قەدەغەکردون ئینجا بڵێت من ئەمە نازانم هەرشتێك لە قورئاندا باس کرابوو هەرشوێنی ئەوە دەکەوین))[٦٩٨].

## هاتنی ئەبوهورەیرە ﷺ و سریەکەی ئیبان وهاوەڵانی

ئەبوهورەیرە ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لە خەیبەر لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ خەیبەری فەتح کردبوو لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (. . . گەیشتینە خەیبەر پێغەمبەری خودا ﷺ خەیبەری فەتح کردبوو لەکاتی دابەش کردنی دەسکەوتەکاندا پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی لەبارەی ئێمەوە لەگەڵ موسوڵمانەکان کرد ولەدەسکەوتەکان ئێمەشی بەشدارکرد و بەشی بۆ داناین وەك بەشداربووەکان)[٦٩٩].

---

(٦٩٦) أخرجه: احمد (٦/٨)، والحميدي (٥٥١)، وابوداود (٤٦٠٥)، وابن ماجة (١٣) واللفظ له الترمذي (٢٦٦٣) وقال حديث حسن صحيح، والطبراني (الكبير) (٩٣٤)، والحاكم (١٠٨/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢١٤٥)، و(صحيح ابن ماجة) (١٣)، و(المشكاة) (١٦٢).

(٦٩٧) في رواية احمد(١٣٢/٤).

(٦٩٨) أخرجه: احمد (٣٤٥/٢) واللفظ له، وقال الشيخ شعيب الارناؤوط في تحقيقه لصحيح ابن حبان (٤٢٥/٥) اسناده صحيح، واخرجه الطيالسي (٢٣٦٣)، وابن حبان (٧١٥٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (٣٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (١٩٨/٤)، والبزار (٢٢٨١) وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٣٥/٧)، ورواه البزار ورجاله رجال الصحيح الا شيخ البزار وهو ثقة، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٩٦٥).

(٦٩٨) رواية: البخاري (٤٢٣٨).

(٦٩٩) في رواية: البخاري (٤٢٣٨).

وەسوپاکەی ئیبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیش گەڕایەوە لە نەجد کەبەرلە غەزاکە بە فەرمانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشتبوو دوای گەڕانەوەیان خەیبەر فەتح کرابوو لەلایەن موسوڵمانەکانەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ ئیبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص و هاوەڵەکانی بە سریە کەوە نارد ڕووە و خاکی نەجد ئیبان بە سریەیەکەوە بە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتەوە لەخەیبەر دوای ئەوەی فەتح کرابوو وە قەڕاسە و پەتکی ڕیشمەی ئەسپەکانیان ڕیشاڵی دارخورمابوو [ئەبوداود (رحمه الله) دەڵێت: (دە) کەسێك دەبوون شەشیان کوژران و ئەوانی تریش گەڕانەوە] ئیبان هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ سەلامی لێکرد وتی: بەشی دەسکەوت و غەنیمەتیشت بۆ ئێمە دانێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ ئەبوهورەیرە ﷺ وتی: بەشیان مەدە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ [ئیبان توڕەبوو سەرزەنشتی کرد دەڵێت: بەڕمەکەی هەڵیکوتایە سەری][٢٠٠] ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێت: وتم: ئەوە بکوژەکەی کوڕی قوقلە (هاوەڵێکی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو لەغەزای ئوحود شەهیدکرا ناوی تەواوی نوعمانی کوڕی قوقلە ئیبانی کوڕی سەعید ئەو کات موسوڵمان نەبوو شەهیدی کردبوو) ئیبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەخوا سەیرە لەو بەلایە ئەو لەڕو لاوازە هاتووە شایەتی دەدات لەدژمان.

لەگێڕانەوەیەکی تردا [ئەم لەڕو لاوازە تانەم لێدەدات لەسەر کوشتنی پیاوێکی موسوڵمان کە خوای گەورە بەدەستی من ڕێزی لەو گرت و پلەی شەهیدی پێ بەخشی بەڵام بەدەستی ئەو منی ڕیسوانەکرد کە بەکافری بکوژرێم بچمە دۆزەخەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لەسەرخۆبە و دانیشە ئیبان دەڵێت: دواجا پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ شتێکی نەدامێ))[٢٠١].

---

[٢٠٠] في رواية: ابن حبان (٧١٥٦).

[٢٠١] أخرجه: البخاري (٤٢٣٨-٤٢٣٩)، وابوداود (٢٧٢٣-٢٧٢٤) واللفظ له، والطيالسي (٢٥٩)، والبيهقي (٦/٣٣٤)، وابن حبان (٤٨١٤) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٦٤-٢٣٦٥).

# ڕووداوی مەڕە ژەهراوییەکە

دوای ئەوەی خوای گەورە جولەکەکانی تێکشکاند بە خراپترین شێوە ئینجا موسوڵمانەکان سەرۆکاری زەویەکانی خەیبەریان کەوتەدەست، سەرکردەی خەیبەر زۆر بەوردی کەوتە بیرکردنەوە بۆ دانانی پلانێك بۆ تیرۆر کردنی پێغەمبەری خودا ﷺ.

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: ((کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ دڵنیابوو لەو ناوچەیەو سەقامگیربوو زەینەبی کچی حارثی خێزانی سەلامی کوڕی مشکم مەڕێکی برژاوی بەدیاری هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری کردبوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ حەزی لە چ بەشێکیەتی پێی وترابوو باڵەکەی ئەویش زیاتر باڵەکەی ژەهراوی کرد و بەشەکانی تریشی بەگشتی ئینجا هێنایە خزمەتی هەرکە لەبەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ دانا))[٧٠٢]. [فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتی: دیارییە ترسا لەوەی بڵێت صدقەیەو لێی نەخوات][٧٠٣]. لە گێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی کردبە خواردنی و خەڵکەکەش لەدوای ئەو خواردیان][٧٠٤]. لەگێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: [کاتێك بۆی دانیشتن دەستیان کرد بە خواردنی پێغەمبەری خودا ﷺ پارچەیەکی هەڵگرت و داینا ئینجا پێی فەرموون]: (ارفعو أيديكم) دەست هەڵگرن [شانی ئەو مەڕە] هەواڵی پێدام کەئەو مەڕە ژەهراویە ((... ئینجا ناردی بەشوێن ئەو ئافرەتە جولەکەدا و ["پێی فەرموو": ((ويلك لاي شيء سمتني)) واتە: (هاوار بۆ تۆ لەبەر چی ژەهرت بۆ پێوەکردم)] چ شتێك وای لێکردیت ئەو کارە بکەیت؟ [وتی: لەخزمەکانمەوە پێمگەیشتبوو کە هیچ شتێك لەتۆ ناشاردرێتەوە و پێی دەزانێت دەمەوێت] [بزانم کە تۆ پێغەمبەریت]))[٧٠٥]. [ئەگەر وابێت خودا ئاگادارت دەکاتەوە] و ئەو

---

[٧٠٢] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٨٩/٣)، والطبراني (الكبير) (١٢٠٤) (١٢٠٦٨)، وقال الهيثمي (مجمع) (١٥٣/٦) مرسل وفيه ابن لهيعة.

[٧٠٣] أخرجه: عبدالرزاق (١٩٨١٤).

[٧٠٤] أخرجه: ابي داود (٤٥١٢)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود)(٣٧٨٤).

[٧٠٥] أخرجه: الحاكم (٢١٩/٣) وصححه على شرط مسلم، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٣٧٧): سنده حسن.

کارەی من کردومە هیچ زیانت پێناگەیەنێت وەئەگەر تۆش پادشا ودەسەلات داربیت ئەوە خەلکی لەدەستت ڕزگاریان دەبێت)[٧٠٦].

لەگێڕانەوەیەکی تردا [وتی: ویستم بتکوژم، پێغەمبەری خودا ﷺ پێ فەرموو: ((ما کان اللهُ لِیُسَلِّطَكَ علي ذلك او عليَّ)). واتە: (خودای گەورەی ئەو کارەت بۆ ناهێنێتە دی و زاڵت ناکات بەسەرمدا). هاوەڵان وتیان: ئایە دەیکوژیت؟ فەرمووی: ((نەخێر))] [پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی)[٧٠٧]: ((اجمعوا لي من هاهنا من اليهود)) ئالێرە هەموو جولەکەکانم بۆ کۆبکەنەوە پاشان کۆیانکردنەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: [((أني سائلكم عن شيء، فهل أنتم صادقوني عنه؟)). واتە: (من پرسیارتان لێدەکەم لە شتێك ئایە ئێوە بەڕاستی وەلامم دەدەنەوە ؟). وتیان: بەڵێ ئەی ئەبوقاسم، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ["من ابوكم؟"]. واتە: (باوکتان کێیە؟) وتیان: باوکما فلان کەسە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((كذبتم بل ابوكم فلان)). واتە: (درۆتان کرد بەڵکو باوکتان فلان کەسە). وتیان: ڕاست دەڵێیت و پێکات. فەرمووی: ((هل انتم صادقوني عن شيء ان انا سألتكم عنه)). واتە: (ئایە ڕاستگۆ دەبن لەگەڵم لەشتێکدا من پرسیارتان لێبکەم دەربارەی). وتیان: بەڵێ ئەی ئەبوقاسم وەئەگەر درۆت لەگەڵدا بکەین بۆت ڕون دەبێتەوە هەروەك لە باوکمندا بۆت ڕوون بۆوە، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: خەڵکی دۆزەخ کێن؟ وتیان: ماوەیەکی کەم تیایدا دەمێننەوە پاشان بەجێیدەهێڵن ئێوە شوێنی ئێمە دەگرنەوە لەدۆزەخدا پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((اخسئوا فيها والله لانخلفكم فيا ابداً)). واتە: (سوك و ڕیسوا دەکرێن تیایدا وەڵڵاهی هەرگیز ئێمە نایەینە جێگەتان). پاشان پێی فەرموون: ((هل انتم صادقوني عن شيء ان سألتكم عنه؟)). واتە: (ئایە بەڕاستی وەلامم دەدەنەوە لەسەر شتێك پرسیارتان لێبکەم دەربارەی). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((هل جعلتم في هذه الشاة سماً)). واتە: (ئایە ژەهرتان بەو مەڕەوە کردبوو). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ماحملكم على ذلك)). واتە: (چ شتێك وای لێکردن ئەوکارە بکەن) وتیان: ویستمان ئەگەر

[٧٠٦] أخرجه: احمد (٢٧٨٥)، وقال ابن كثير في (البداية) (٢٠٩/٤) اسناده حسن، وقال الشيخ الالباني في تخريج (فقه السيرة) (ص: ٣٧٧): سنده حسن.

[٧٠٧] أخرجه: البخاري (٢٦١٧)، ومسلم (٢١٩٠)، وابوداود (٤٥٠٨).

تۆ درۆزن بیت ڕزگارمان بێت لەدەستت وە ئەگەر پێغەمبەریش بیت هیچ زیانت پێناگەیەنێت)[٧٠٨].

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: ([هەندێك لە هاوەڵان پێی مردن کەلە گۆشتەکەیان خوارد پێغەمبەری خودا ﷺ کەڵەشاخی لەناوشانی گرت لەبەرئەوەی کە خواردی لەسەرە ژەهراوییەکە][٧٠٩]. وەفەرمانیشی کرد بەهاوەڵانی ئەوانیش کەڵە شاخیان گرت)[٧١٠]. لەگێڕانەوەیەکدا لە لەلبیدەوە دەڵێت: [کاتێك بیشری کوڕی بەرائی ئەنصاری پێی مرد پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی بەشوێن جولەکەکان کەئەو ئافرەتە بهێنن هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ][٧١١] [فەرمانی دەرکرد کە بکوژرێتەوە لە بەری بیشری کوڕی بەڕاء][٧١٢] ئەنەس ﷺ دەڵێت: (شوێنەواری ئەو ژەهرە بەردەوام هەستم پێدەکرد هەرلە پێغەمبەردا مابوو ﷺ)[٧١٣].

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر هەستی بەشتێك بکردایە ئەنجامی گۆشتە ژەهراوەیەکە ئەو کەڵە شاخی دەگرت جارێکیان سەفری کرد هەرکە بەرێکەوت لەئاوەدانی دوورکەوتەوە هەستی بەشتێك کردو کەڵە شاخی گرت)[٧١٤].

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بەسەختی هەستی بەئازاری ئەو ژەهرە دەکرد وە کاری تێکردبوو لەدایکمان عائیشەوە ﷺ دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتی نەخۆشیەکەیدا کەوتە جێگاو کۆچی دوای پێکرد لەوکاتەدا دەیوت [ئەی عائیشە بەردەوام هەست بەئازاری

---

(٧٠٨) أخرجه: البخاري (٣١٦٩) (٥٧٧٧)، واحمد (٢/٤٥١)، وابوداود (٤٥١٢) عن ابي هريرة ﷺ مرفوعاً.

(٧٠٩) أخرجه: ابوداود (٤٥١٠).

(٧١٠) أخرجه: عبدالرزاق (١٩٨١٤).

(٧١١) أخرجه: الدار القطني (٣/١٢٠).

(٧١٢) أخرجه: ابوداود (٤٥١١) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٧٨٤).

(٧١٣) البخاري (٢٦١٧)، ومسلم (٢١٩٠).

(٧١٤) أخرجه: احمد (٢٧٨٤) وقال محققه اسناده صحيح، وقال الحافظ في (البداية) (٤/٢٠٩) تفرّد به احمد واسناده حسن، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٣٧٧)اسناده حسن.

بۆ ئەو گۆشتە دەکەم کەلە خەیبەرخواردم] پاشان بەشەهیدی ماڵئاوایی لەدونیا کرد))[٧١٥]. بۆ ئەو فەرموودەیە بەڵگەمان ئەم فەرموودەیەیە کە(لەدایکی بیشری کوڕی براڵی ئەنصارییەوە)دایکی ئەو هاوەڵەی کە بەگۆشتەکە مرد) دەڵێت: وتم (بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتی ئەو نەخۆشییەی کۆچی دوای پێکرد چ شتێك ئازارت دەدات و دوچاری ئەم ناڕەحەتیەی کردویت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ من کوڕەکەم هیچ شتێکی نەبوو کەمرد تەنها ئەو گۆشتە ژەهراوییە نەبێت کەلە خزمەت تۆدا خواردی لە خەیبەر)، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((وانا لااتهم بنفسي الا ذلك فهذا اوان قطعت أبهري))[٧١٦]. واتە: (منیش هیچ شتێك دوچاری ئەم ناڕەحەتیەی نەکردووم وە هەستم پێ نەکردووە تەنها ئەوە نەبێت ئەوە ئێستا لە من دیاری داوە دەمارەکانی ناو هەناوی بڕیوە برینداری کردوون). ئەمەش لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ ڕوویدا.

## فەدەك

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: ((کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەتح کردنی خەیبەر بۆوە ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی فەدەك کە خودای گەورە چی بەسەرجولەکەکانی خەیبەر هێناوە خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە شاندێکیان نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کەڕێکەوتنێك مۆربکەن بۆ ئاشتی لەسەر نیوەی فەدەك وەك چۆن پێشتر لەگەڵ خەیبەر ئەنجامی دا))[٧١٧]. (پێغەمبەری خودا ﷺ محیصەی کوڕی مەسعودی نارد بۆلایان بۆ ئەوەی ڕێکەوتنەکە بەئەنجام بگەیەنێت، ئەو مەرجانانەیان لەسەر پێویست دەکات کەخەڵکی خەیبەر لەسەریان پێویست بووە، فەدەك بۆ پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بەتایبەت، چونکە بەجەنگ ولەشکرکێشی موسوڵمانەکان نەگیرا بەڵکو بەبێ شەڕگیرا وصولحیان لەگەڵ کردن)[٧١٨].

---

(٧١٥) أخرجه: البخاري (٤٤٢٨)، واحمد (١٨/٦)، والدارمي (٣٢/١)، والحاكم (٢١٩/٣)، وصححه على شرط مسلم، وابن هيشام (السيرة) (٢٩٧/٣) (٨٦٠).

(٧١٦) أخرجه: ابوداود (٤٥١٣)، والحاكم (١٩/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني في (صحيح سنن أبي داود) (٣٧٨٥): صحيح الاسناد.

(٧١٧) انظر: (السيرة) لابن هشام (٤٠٨/٣)، و(التاريخ) للطبري (١٤/٣).

(٧١٨) أخرجه: ابي داود (٣٠١٦)، وابن هشام (السيرة) (٤٠٨/٣).

## دۆڵی قورا

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەڵێت: ((لەدوای خەیبەر وفەدەك ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی کردە دۆڵی قورا گەمارۆی خەڵکەکەی دا بۆ ماوەی چەند شەوێك))[٧١٩]. لەئەنجامی ئەو تیربارانەی جولەکەکان دەیانکرد، کۆیلەیەکی پێغەمبەری خودا ﷺ بەناوی (مدعم) بەتیرێکی وێڵ پێکرا و بووە هۆی کوشتنی، لەئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێت: ((خەیبەرمان فەتح کرد. . . . . . و پاشان لەخزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووەو دۆڵی قورا ڕۆیشتین کۆیلەیەکی [ڕەشی] لەخزمەت دابوو بەناوی مدعم کە [پیاوێك پێشکەشی کردبوو لەهۆزی (جوزام) بەناوی ریفاعەی کوڕی زیدی جوزامی لەبەنی زبیب کاتێ شۆڕبوینەوە بۆناو دۆڵێك بەمەبەستی مانەوەو دابەزین، ئەو کۆیلە هەستا بۆ ئەوەی جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ بگرێت وبیبات بیبەستێتەوە لەگەڵ ڕۆژئاوابوون تیرێکی وێڵ هات بەر ئەو عەبدە کەوت وشوێنی کاریگەری گرتبوو پێی مرد، وتمان مژدەی شەهیدی لێبێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((کلا والذي نفس محمد بيده ان الشملة [التي اصابها يوم خيبر من المغانم لم تصيبها المقاسم لتشتعل عليه ناراً])) واتە: (نەخێر سوێند بەو خوایەی گیانی محمدی بەدەستە ئەو عەبایەی کەلە خەیبەر شاردبوویەوە لەغەنیمەت و لەدابەشکردنەکە بەری نەکەوتبوو ئێستا گڕی ئاگری تێبەردەدات) لە گێڕانەوەیەکی تردا: [ان شملته لتحترق عليه الان في النار غلها من فيء المسلمين يوم خيبر][٧٢٠] واتە: (ئەو عەبایە دەیسوتێنێت لەئاگردا کە دزی بووی لەدەسکەوتەکانی موسوڵمانان لەغەزای خەیبەردا). دەڵێت: خەڵکەکە ڕاچڵەکین وترسیان لێ نیشت پیاوێك کاتێك گوێی لەم قسانە بوو لەپێغەمبەری خواوە هاتە خزمەتی تاکێك یاخوود جوتێك نەعلی هێنا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم لەخەیبەر دەسکەوت وبردم پێغەمبەری خودا ﷺ

---

[٧١٩] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٣٩١).

[٧٢٠] أخرجه: البخاري (٤٢٣٤)، ومسلم (١١٥)، ومالك (٢/١٦)، وابوداود (٢٧١١)، والنسائي (٧/٢٤)، وابن حبان واحمد (٢/١٦٠)، والحاكم (٣/٤٠)، وصححه ووافقه على شرط مسلم، والبيهقي (٩/١٠٠)، (٤٨٥١) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما.

فەرمووی: ((شراك او شراكان من نار))[٧٢١]. واتە: (نەعلێك یاخوود دونەعل لە ئاگر). ((یقدلك مثلهما في نار جهنم)). واتە: (ئەوە وهاوشێوەی بۆ ئامادە دەکرێت ئەو پەل کێشت بکەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ).

لەگێڕانەوەیەکی عومەری کوڕی خەطابدا ﷺ دەڵێت: ((کاتێك لەغەزای خەیبەر بووین هەندێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتن وتیان فلانە کەس شەهیدبوو، فلان کەسیش شەهید بوو هەتاکو ناوی پیاوێکیان بردو وتیان فلان کەسیش شەهید بوو پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((کلا اني رأيته في النار في بردة غلها او عباءة)). واتە: (نەخێر من بینیم لەناو ئاگردا بەهۆی ئەو کراسە خەت خەتەی لە غەنیمەت دزی بووی یاخود بەهۆی عەبایەکەوە). ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: [((ئەی کوڕی خەطاب برۆ بەناو خەڵکیدا بانگەواز بکەو بڵێ کەس ناچێتە بەهەشت مەگەر باوەڕدار نەبێت)) دەڵێت: ڕۆشتم وهاوارم کرد ناچێتە بەهەشت هیچ کەسێك تەنها باوەڕداران نەبێت][٧٢٢].

هێشتا پێغەمبەری خودا ﷺ لە دۆڵی قورا بوو پیاوێك هاتە خزمەتی لەهۆزی (بلقین) کەهۆزێکن لەسنورەکانی شام نیشتەجێ بوون)، لەعەبدوڵای کوڕی شەقیق ئەویش لەپیاوێك لەهۆزی بلقینەوە دەڵێت: ((اتيت النبي ﷺ وهو بوادي القرى وهو يعرض فرساً قلت يا رسول الله بما امرت؟ قال: في رواية ["امرت ان تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئاً وان تقيموا الصلاة وتؤتوا الزكاة]امرت ان اقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله واني رسول لله فاذا قالوها عصموا مني دمائهم واموالهم وحسابهم على الله. قلت يا رسول الله فمن هؤلاء الذين تقاتل؟ قال: ((هؤلاء اليهود المغضوب عليهم وهؤلاء النصاري الضالون)) قلت: (فلمن المغنم يا رسول الله ؟) قال: ((لله عزوجل سهم ولهؤلاء "الجيش"اربعة اسهم "قلت: فهل احد احق بشيء]من الغنم من احد؟ قال: [لا حتى السهم] ياخذه احدكم من جنبه فليس بأحق به من اخيه

---

(٧٢١) أخرجه: الحاكم (٣/٤٠)، وابن حبان (٤٨٥٢) وقال محققه اسناده حسن، وابن هشام (السيرة) (٣/٢٩٨) رقم (٨٦٢) وقال محققه: اسناده حسن.

(٧٢٢) أخرجه: احمد (١/٣٠)، ومسلم (١١٤).

"المسلم")) [٧٢٣]. ((هاتمە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لە دۆڵی قورا لەو کاتەدا ئەمانای ئەسپێکی دەکرد وتم ئەی پێغەمبەری خوا بەچی فەرمانت پێ کراوە ؟فەرمووی: ((فەرمانم پێکراوە تا فەرمان بەخەڵکی بکەم کەخودا بەتەنها بپەرستن وهیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن ونوێژەکانیان بەجێ بهێنن وزەکات لەماڵەکانیان دەربکەن)) فەرمانم پێکراوە شەڕبکەم لەگەڵ خەڵکیدا هەتاکو دەڵێن (لاالە الاالله) ومنیش نێراوی خوام ئەگەر ئەوەیان وت ئەوە خوێن وماڵیان پارێزراو دەبێت لەمنیمە وەلێپرسینەوەشیان لەسەر خودایە. وتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێن ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ دەکەیت؟ فەرمووی: ((ئەو جولەکانەن کەخودا لێیان توڕبوو وەئەو گاورانەی کە گومڕابوون لەڕاستە ڕێگا)). وتم: ئەو غەنیمەوت و دەسکەوتانە بۆ کێیە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟ فەرمووی: ((بۆخودای باڵادەستە چواربەشەکەی تریش بۆ ئەو سوپایە)) وتم: هیچ کەسێك هەیە لەناو غەنیمەتدا شایەن تربێت لەکەسێکی تر؟ فەرمووی: ((نەخێر گەر بەئەندازەی تیرێکیش بێت کەیەکێکتان وەری بگرێت وە شایستە ترنییە پێی لەبرا موسوڵمانەکەی)).

لەوێدا شەڕێکی سەخت لەنێوان موسوڵمانەکان و جولەکەکانی (دۆڵی قورا)دا ڕوویدا هەروەك لەگێڕانەوەکەی واقیدی دا هاتووە لە ئەبوهوڕەیرەوە ﷺ دەڵێت: هێرشمان بردە سەر (دۆڵی قورا) جولەکەکان ڕووبەڕوومان بوونەوە بەتیرباران کردن کاتێك گەیشتینە نزیك (دۆڵی قورا) پێغەمبەری خودا ﷺ موسوڵمانەکانی ڕێکخست و ئامادەی کردن بۆ جەنگ کردن پاشان شەڕ لەگەڵیان ڕوویدا هەتاکو [یازدە کەسیان لێ کوژرا شەڕ درێژەی کێشا شەوی بەسەردا هات بۆ بەیانی بەردەوام بوون زۆری نەبرد هێشتا ڕۆژ بەئەندازەی ڕمێك بەرز نەبۆوە خۆیان دابەدەستەوە و ڕازی بوون بەڕێکەوتن ئەوە بوو بەشەڕ کردن فەتح کرا خودای گەورە ماڵەکانیانی کردە دەسکەوتی موسوڵمانان ماڵ و سامانێکی زۆریان دەسکەوتبوو پێغەمبەری خودا ﷺ چوار ڕۆژ لە دۆڵی قورا)مایەوە غەنیمەتەکانی کەدەستی کەوتبوو بەسەر هاوەڵاندا دابەشی کرد، خاك و زەوی و باخەدارخورماکانیش بەجێهێشت

[٧٢٣] أخرجه: البيهقي (الكبرى)(٦/٣٣٦)، واللفظ له، الطحاوي (٢/١٧٧)، وابويعلى (٧١٧٩) وقال عقبه: اسناده صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (١/٤٩) (رقم: ١٤٣)، رواه ابويعلى واسناده صحيح، وقال الشيخ الالباني في (الارواء) (٥/٦٠)اسناده صحيح.

پێیان خۆیان کە سەرۆکاری بکەن وەك ئەوەی لە خەیبەر ئەنجامی
دا جولەکەکان خستیە دەستی خۆیان کە سەرۆکاری بکەن وەك ئەوەی لە خەیبەر ئەنجامی
بۆ جولەکەکانی (تیماء) هەواڵی صوڵح و ڕێکەوتنی جولەکەکانی خەیبەرو فەدەك
دا کاتێك جولەکەکانی (تیماء) هەواڵی صوڵح و ڕێکەوتنی جولەکەکانی خەیبەرو فەدەك
ڕیان پێگەیشت وە هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خودا ﷺ بینی لەگەڵ پێغەمبەری
وەڵی قورا)یان پێگەیشت وە هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خودا ﷺ بینی لەگەڵ پێغەمبەری
خودا ﷺ ڕێکەوتن لەسەرئەوەی (جزیە) بدەن]. . . . ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەو
مەدینە گەڕایەوە)) [٧٢٤].

# هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو (صەفیە)

لەناو کەنیزەکانی خەیبەردا ئافرەتێك هەبوو بەناوی (صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب)کە پێشتر هاوسەری کنانەی کوڕی ئەبوحقیق بوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ کردیە کەنیزەك بەهۆی ناپاکی هاوسەرەکەیەوە، چۆنیەتی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ باسەکەی هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: [..خەیبەرمان بەشەڕو سەختی فەتح کرد وکەنیزەکەکانمان کۆکردەوە دوحیەی کوڕی خەلیفەی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ((ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەنیزەکم بدەیە لەناو ئەو کەنیزەکانەدا پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((بڕۆ کەنیزەیەك ببە)) ئەویش صەفیەی کچی حویەیی برد دواتر پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ صەفییەی کچی حویەیی سەرداری ئافرەتانی بەنی قوریظەت بەخشیوەبە دوحیە) وەك دڵنیاییەك بۆی باشترە بۆ جەنابت بێت زۆر باسیان کرد وستایشیان کرد لەلای پێغەمبەری خودا ﷺ دەیانوت: لەناو کەنیزەکەکاندا هاوشێوەی نی یە فەرمووی: پێی بڵێن با بیهێنێتەوە کاتێك هێنایەوە پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری کرد فەرمووی: ((کەنیزەیەکی ترببە لەجیاتی ئەو] [٧٢٥]

---

[٧٢٤] أخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٧٠٩)، وأورده البيهقي (الدلائل) (٤/٢٧٠)، وابن كثير (البداية) (٤/٢١٨).

[٧٢٥] أخرجه: البخاري (٣٧١)، ومسلم (١٣٦٥).

لەگێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خوا ﷺ کڕییەوە بە حەوتی تر][٧٢٦] لەگێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خودا ﷺ سەرپشکی کرد لە نێوان دوو شتدا ئەوەی کە ئازادی بکات و بیکات بە هاوسەری خۆی یاخود بەڕێزەوە بینێرێتەوە ناو خێزانەکەی ئەویش ئازادی و هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵبژارد][٧٢٧])).

ئیبن القیم (رحمه الله) دەڵێت: "پێغەمبەری خودا ﷺ باسی ئیسلامی بۆ کرد ئەویش موسوڵمان بوو" [٧٢٨]. ئەنەس ﷺ دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ مارەی کرد (مارەییەکەشی ئازادکردنەکەی بوو)[٧٢٩]. لەگێڕانەوەویەکی تردا [بردیانە لای ئوم سولەمی ئەنصاری تاکو بیڕازێنێتەوە ئامادەی بکات]. [هەتاکو گەیشتینە بەستی (الصهباء) لەوێدا بۆی حەڵاڵ بوو ئوم سولەیم کەل و پەلی بوکێنی بۆ ئامادەکرد و بۆی ڕازاندەوە وخواردنیان ئامادەکرد ونەو شەوە بۆیان گواستەوە و بووە هاوسەری پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ لەنێوان خەیبەر ومەدینە سێ شەو لای صەفیە مایەوە]))[٧٣٠].

لە گێڕانەوەی ئیبن عومەردا ﷺ دەڵێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ سەوزاییەکی لەدەوری چاوی صەفیەدا بەدی کرد پێی فەرموو: ((ما هذه الخضرة [بعینك]))؟ ((ئەوە چاوت بۆچی سەوز هەڵگەڕاوە؟)) وتی: بەر لە تەشریف هێنانی بەڕێزتان هاوسەری کنانەی کوڕی ئەبو حقیق بووم لە ژوورەکەمدا نوستبووم [لەخەودا بینیم] مانگ کەوتوەتە ژوورەکەم من لەشوێنی خۆی نەماوم، ئەمەم بۆ هاوسەرەکەم گێڕایەوە زلەیەکی لێدام، وتی: تۆ خەو بەو پادشایەوە دەبینی کە لە (یثرب)ە پێشتر لەهەموو کەس زیاتر ڕقم لە پێغەمبەری خودابوو کە باوکم و هاوسەرەکەی کوشتبووم پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام دڵی دەدامەوە دەیفەرموو: : (([یا صفیّة]ان اباك البّ علی العرب وفعَلَ وفَعَلَ "حتی ذهب ذلك من نفسي)

---

(٧٢٦) اخرجه: مسلم (١٣٦٨).

(٧٢٧) اخرجه: الطبراني(الكبير) (٣١٩٦)، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد)(٦/١٥٥) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، وابن حبان (٤٥٣٠) وقال محققه اسناده صحيح.

(٧٢٨) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٢٣٢) عن عروة بن الزبير.

(٧٢٩) اخرجه: مسلم (١٣٦٨)، وابوداود (٢٩٩٧).

(٧٣٠) اخرجه: البخاري (٤٢٠٠-٤٢١٣).

زیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) [ئەی صەفیە] باوکت هەموو عەرەبەکانی دژ بەمن کۆکردەوە وکاری ئاو و هاو
وتە: ((ئەی صەفیە] باوکت هەموو عەرەبەکانی دژ بەمن کۆکردەوە وکاری ئاو و هاو ... هەتاکو هیچ شتێکم لەدڵدا نەما بەرانبەر بە
تاوەهای دەکرد هاوەشێوەی نەبوو هەتاکو هیچ شتێکم لەدڵدا نەما بەرانبەر بە
پێغەمبەر))[(٧٣١)].

# پاسەوانی کردنی هاوەڵی بەڕێز ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بۆ پێغەمبەر ﷺ

لە ئەبوهورەیرە وئیبن عەباسەوە ﷺ دەفەرموون: ((کاتێک صەفیە بووە هاوسەری پێغەمبەری خودا ﷺ شەو لەلای مایەوە، ئەبوئەیوبی ئەنصاری شمشێرەکەی بەدەستەوە گرت و هات لە لایەکی ڕەشماڵەکەی [پێغەمبەری خودا ﷺ دانیشت لە لای دەرگاکەوە] ئەبو ئەیوب دەفەرموێت: هەستم بەمەترسی و دڵەڕاوکێ دەکرد دەتوت گوێم لەشتێك بووە وە لەدڵی خۆمدا دەم وت: لە پێغەمبەری خودا ﷺ وە بانزیك بم ئەوەك ئەوئافرەتە جولەکەیە زیانێکی پێبگەیەنێت پێغەمبەری خودا ﷺ بەیانی هاتە دەرەوە بۆ ئەوەی بیلال هەستێنێت بۆ بانگی بەیانی [لەگێڕانەوەیەکی تردا: کاتێك بەیانی بووەوە ئەبوئەیوب پێغەمبەری ﷺ بینی لەخۆشیدا وتی: (الله اكبر)، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەبوئەیوبی بینی پێی سەیربوو کە شمشێری بەدەستەوەیە] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من هذا؟)) ئەوە کێیە؟ وتی: منم، ئەبوئەیوب، [فەرمووی: ((ما شأنك هذه الساعة ههنا ؟)) ئەوەچی دەکەیت لێرە لەوکاتە ناوەختەدا؟ ئەبو ئەیوب ﷺ وتی: ئەمشەو خەو نەچۆتە چاوم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: لەبەرچی ئەبو ئەیوب] وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ لەگەڵ ئەو ئافرەتە تازە پێگەیشتووە [تازە بوکە زەماوەندت کردووە] هاوسەر و باوك و براکیمان کوشتووە بە فەرمانی بەڕێزت من لێت [دڵنیانەبووم] خەمی تۆم بوو ترسام کە تیرۆرت بکات] وتم با نزیك بم لە پێغەمبەری خودا ﷺ پێغەمبەری خودا ﷺ پێکەنی و پێی فەرموو: ((یرحمك الله ابا ایوب ثلاث مرات)). واتە: خوارەحم بەئەبو ئەیوب

---

(٧٣١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧٧/٢٤)، وابن حبان (٥١٩٩) وقال محققه اسناده صحيح واللفظ له، والبيهقي (الكبرى) (١١٤/٦)، و(الدلائل) (٢٣٣/٤) وقال الهيثمي (المجمع)(٢٥١/٩) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٧٩٣)اسناده صحيح.

بکات سێ جار دووبارەی کردەوە))[٧٣٢]. ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ بوو بە هاوسەری ئەو شەوە [کاتێك بەیانی بووە وە فەرمووی: ((من كان عنده فضل زاد فليئتنا به)). واتە: هەرکەسێك خواردنی زیادەی لایە بابیهێنێت. پیاوێك هەستا خورمای زیادو فاوتی هێنا][٧٣٣]. پیاوێکی تر لەخزمەتیدا هەندێك (ڕۆنی کەرە وپەنیری) هێنا هەموو ئەو بەش بەشانەی سەر ئەرزەکە تێکەڵ کران بە تێگوشە یەکی تریت لەسەر سفرەیەکی دروستکراوی بچوك ئینجا پێی فەرموون: ((اذن من حولك)) ((فەرموو لەخەڵك بکەن بۆ ئەم خواردنە)) ئەوەش ولیمەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو [خەڵکەکەش لەسەر ئەو سفرەیە دەیان خوارد وە لە ئەستێلێکی تەنیشت خۆیان ئاویان دەخواردەوە کە لەئاوی باران دروستیان کردبوو] [خەڵکەکە تێریان خوارد] وتیان: نازانین بووە بە هاوسەری یان تەنها وەك کەنیزە دەیەوێت ببێتە دایکی کوڕێك بۆی، وتیان: ئەگەر عەبای بەسەردا دابوو بالأپۆشی بوو [ئەوە بۆتە خێزانی] ئەگەر نا ئەوە تەنها کەنیزەکە کاتێك ویستیان بڕۆن پێغەمبەری خودا ﷺ عەبای بەسەردادا).

لەگێڕانەوەیەکی تردا [پێغەمبەری خودا ﷺ لەپەنای خۆیدا عەبایەکی بەسەردادا پاشان لای وشترەکەی دانیشت چۆکی موبارەکی بۆ داناو ئەویش قاچی خستە سەری و سەرکەوت][٧٣٤]. لەگێڕانەوەیەکی تردا [ئەژنۆی دانا فەرمووی: قاچەکانت دانێ و سەربکەوە ئەو ڕێزی لە پێغەمبەری خودا ﷺ گرت و پێیخۆش نەبوو قاچەکانی لەسەر ئەژنۆی پێغەمبەری خودا ﷺ دابنێ بەڵکو ئەژنۆی خستە سەر ڕانی و لەدواوەی وشترەکەوە سواربوو کاتێك بەرێکەوت خستیە دواى خۆی][٧٣٥] [پاشان خۆی سواربوو][٧٣٦] وە صەفیەش عەباکەی بەسەرەوە بوو))[٧٣٧].

---

[٧٣٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٦٨)والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٣٢) عن عروة، وقال الهيثمي (مجمع الزوائد) (٦/١٥٣) فيه محمد بن ابي ليلى شيءوالحفظ بقيه رجاله ثقات، واخرجه الحاكم (٤/٢٩) وصححه ووافقه الذهبي واللفظ للطبراني.

[٧٣٣] أخرجه: مسلم (١٣٦٥).

[٧٣٤] أخرجه: البخاري (٤٢٠١، ٤٢١٣).

[٧٣٥] أخرجه: البخاري (٤٢١٣).

# حجاجی کوڕی علاط ﷺ و خەڵکی مەککەی

موسی کوڕی عەقبە (رحمه الله) دەڵێت: ((کاتێك قورەیشیەکان بیستیان پێغەمبەری خودا ﷺ بەنیازی دەرچوونە بەرەو خەیبەر سەریان سوڕما لەو کاتەدا هاوپەیمانیش بوون بەهۆی ناکۆکی جودەییەوە ئەوان لەنێوان خۆیان بوون بە دوو دەستەوە هەندێکیان دەیانوت: محەمەدو هاوەڵەکانی سەردەکەون هەندێکیشیان دەیانوت: جولەکەکانی خەیبەرو هاوپەیمانەکانیان سەردەکەون، حجاجی کوڕی علاطی سولەیمی بەدزی موسوڵمان بوو لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بەشداری فەتحی خەیبەری کرد کە هاوسەرەکەی ناوی دایکی شەیبە بوو کەلەبەنی عبدالداری کوڕی قوصی بوو کە بەرەبابێکی قورەیشیە، حجاج ﷺ سەروەت و سامانێکی زۆری هەبوو دەوڵەمەندێکی ناسراوبوو سەرچاوەی کانزاکانی خاکی بەنی سولەیم هەموو هی ئەوە بوو دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ سەرکەوت بەسەر جولەکەکانی خەیبەر حجاج لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ داوای ڕوخسەتی سەفەرکردنی کرد بۆشاری مەککە) بۆ کۆکردنەوەو وەرگرتنەوەی پارەو سامانەکەی))[٦٢٨].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ فەتحی خەیبەری کرد حجاجی کوڕی علاط ﷺ وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ من لەشاری مەککەدا ماڵێکی زۆرم [بەشێوەیەکی پەرش و بڵاو لەلای بازرگانەکانی خەڵکی مەککەدا هەیە]، وە هاوسەرەکەشم خەڵکی مەککەیە بەهۆیەوە من خزم و کەسم هەیە من دەمەوێت بچم بۆ لایان ڕێگایەك بدۆزمەوە وەبەڕێزتان من بە جۆرێك ڕێگەم پێبدەن کەبەرامبەر جەنابتان ﷺ ڕێگەی پێدا بەویستی خۆی هەرچی ویستی بیڵێت [لە ڕیوایەتەکەی ئیبن ئیسحاقدا (رحمه الله)]: حەجاج ﷺ دەڵێت: ڕۆیشتم هەتاکو گەیشتمە نزیك مەککە لە (ثنیة البیضاء)

---

أخرجه: ابن حبان (٧٢١٢) وقال محققه اسناده صحیح علی شرط مسلم.

أخرجه: الطبراني (الکبیر) (١٢٠٦٨)، وقال الهیثمي: (مجمع الزوائد) (١٥٣/٦) فیه محمد بن ابي لیلی سیء الحفظ وبقیة رجاله ثقات.

أخرجه: البیهقي (دلائل النبوة) (٢٦٥/٤).

چەند پیاوێکی قورەیشم بینی گوێیان قوڵاخ کردبوو بۆ دەنگوباسی خەیبەر پرسیاریان لەبارەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد تاکو شتێك ببیستن زانیبوویان کەبەرەو خەیبەر ڕۆیشتووە، وەدەشیانزانی کە خەیبەر باشترین ئاوەدانی ناوچەی حیجازە لەڕووی کشتوکاڵ و شینایی قەڵاو سەنگەرو پیاوی شەڕکەرەوە، بۆیە عەودالی هەواڵیان دەکرد و بە سۆراغیەوە پرسیاریان لەهەموو سوارێك دەکرد لە ڕێگادا بێت کاتێك منیان بینی وتیان ئەوە حجاجی کوڕی علاطە، حجاج ﷺ دەڵێت: (ئەوان بەموسوڵمان بوونی منیان نەزانی بوو) وەڵڵاهی هەواڵی پێیە دەی پێمان بڵێ ئەی باوکی محمد ئێمە پێمان گەیشتووە کە محمد بەسوپاکەیەوە بەرەو خەیبەر ڕۆیشتوون کە شاری جولەکەکان و ناوچەی کشتوکاڵی حیجازە دەڵێت: وتم: ئەوە منیش دەیزانم بەس من هەواڵی ترم لایە کە جێگەی دڵخۆشییە بۆ ئێوە ئەوان خۆیان لە تەنیشت وشترەکەم دەداو نزیك دەبوونەوەو دەیان وت: ئێ ئەو هەواڵە چیە ئەی حجاج؟ وتم: تێکشکانێك شکاوە هەرگیز لەو شێوەیەتان لەپێشتر نەبیستووە ئەوەندە لە هاوەڵەکانی کوژراوە بە هیچ شێوەیەك کوشتنی ئاوا نەبووە محمدیش بەدیل گیراو چۆن گیرانێك نایکوژین هەتا دەیدەینەوە دەست خەڵکی مەککە تالە ناو خۆیان دا بیکوژن لە تۆڵەی کەڵە پیاوەکانیان کەبەدەستی محمد و هاوەڵەکانی کوژراون بەم زوانە محمدتان بۆ دێنن بەدەستی خۆتان بیکوژن دەڵێت: وتم یارمەتیم بدەن بۆ کۆکردنەوەی پارەو ماڵەکەم لە مەککە بۆ ئەوەی لە قەرزدارەکانی وەربگرمەوە دەمەوێت بگەمە خەیبەر تاکو دەسکەوتێکی باش دەسخەم لەوەی لە محمدو هاوەڵانی جێماوە بەرلەوەی بازرگانەکان پێشم بکەون بۆ خەیبەر، هەستان زۆر بەگورجی پارەو سامانەکەیان بۆ کۆکردمەوە دەڵێت: خێزانەکەم ئەمەی بیست هات ماڵ و پارەیەکی باشم لادانابوو پێم وت: ئەوەی لەلاتە بۆم بهێنە دەمەوێت کەهەندێك لەمەڕەکانی محمد و هاوەڵەکانی بکڕم ئەوان شکستیان خواردوە سەروەت و ماڵیان بووە بە دەسکەوت ئەو هەواڵە بڵاوبۆوە بە مەککە)دا موسوڵمانەکان دوچاری ئازارو نارەحەتی کرد بێ باوەڕەکانیش خۆشی و شادیان دەردەبڕی ئەمە گەیشت بە عەباسی کوڕی عبدالمطلب ﷺ لە مەجلیس و کۆڕی دانیشتن دوچاری حەپەساوی کرد بوو بەجۆرێك نەیدەتوانی لەشوێنی خۆی هەستێت لە مقسم)ەوە.

دەگێڕنەوە دەڵێت: عەباس ﵁ کوڕێکی هەبوو ناوی (قثم) بوو زۆر لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەچوو لە شێوەدا عەباس دەیهێنایە لای خۆی و لەسەرپشتی پاڵدەکەوت و لەسەر سنگی خۆی دایدەنا ئینجا ئەم دوودێڕە هۆنراوەیەی دەوتەوە:

حبي قثم ، حبي قثم — شبهُ ذي الانف الاشم

نبيُّ ربِّ ذي النعيم — برغم انف من رَغِيم

لە ئەنەسەوە ﵁ دەڵێت: پاشان منداڵێکی کۆیلەی نارد بۆلای حەجاجی کوڕی علاط ﵁ تاکو لەڕاستی هەواڵەکە دڵنیا بێت پێی وت: هاوار بۆ تۆ ئەوەچ هەواڵێکت هێناوە چ دەبێت؟ خوای گەورە بەڵێنی باشتر لە هەواڵەکەی تۆی داوە، حەجاج ﵁ بە کۆیلەکەی وت: سڵاوی من بە ئەبو الفضل بگەیەنە و پێی بڵێ بازوریکم لە ماڵەکەی بۆ چۆڵ بکات کەسی تێنەبێت من دێم بۆلای بادڵنیا بێت دەنگوباسەکە بەجۆرێکە دڵی خۆش دەکات منداڵەکە گەڕایەوە کاتێک گەیشتە سەردەرگا وتی: مزدەبێت ئەی ئەبو الفضل عەباس لەخۆشیدا بردیەو ناوچەوانی ماچ کرد ئەویش ئەوەی حەجاج وتبووی بۆی گێڕایەوە ئینجا ئازادی کرد پاشان حەجاج ﵁ هات هەواڵی دایە کە پێغەمبەری خودا ﷺ خەیبەری فەتح کردووە ماڵ و موڵکی بە غەنیمەت گرتوون و بەشی خودای جیاکردۆتەوە وە بەپێی پێنج یەک لەدەسکەوتەکان وە صەفیەی کچی حوییەی وەک هاوسەر دەستنیشان کردووە بەجۆرێک سەرپشکی کردووە لە نێوان ئەوەی ئازادی بکات و ببێتە هاوسەری یاخود بڕواتەوە بۆناو کەس وکاری ئەویش هاوسەریەتی پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵبژاردوە، منیش موسوڵمان بووم بەڵام هاتبووم بۆ ئێرە پارەو پوولم لەملاو لەولا لای خەڵك هەیە لێرە دەمەوێت کۆی بکەمەوە بیبەمەوە لەگەڵ خۆم داوای ڕوخسەتم کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەویش ڕێگای دام هەرچی بڵێم بەویستی خۆم، ئەوەی من بۆم باس کردیت تاسێ ڕۆژ لای کەس ئاشکرای مەکە پاشان باسیبکە، دەڵێت: خێزانەکەی هەرچییەکی لەلابوو لەزێرو پارەو کەل و پەل بۆی کۆکردەوە دایە دەستی و پاشان بەگورجی و خێرای بە پارەوە بۆی دەرچوو دوای سێ ڕۆژەکە عەباس ﵁ هاتە لای ژنەکەی حەجاج و پرسیاری لێکرد وتی: هاوسەرەکەت چی کرد؟ ئەویش پێی ڕاگەیاند کە لە فلانە ڕۆژو کاتەوە ڕۆیشتووە وتی: خودا خەمت نەداتێت ئەی ئەبوالفضل بەڕاستی بەشداری خەمتانین لەبەرئەو هەواڵەی پێتگەیشتووە زۆر نارەحەتی کردین وتی: بەڵام خودای گەورە خەمبارمان ناکات سوپاس بۆ خودا هیچ شتێک

ڕوینەداوە مەگەر ئەوەی کە خۆمان پێمان خۆشە حجاج هەواڵی پێدام کە خودای گەورە خەیبەری فەتح کردووە بۆ پێغەمبەرەکەی وبەشی خودای لەدەسکەوتەکان جیاکردۆتەوە بۆ موسولمانان وە پێغەمبەری خودا ﷺ صەفیەی کچی حوییەی مارەکردووە تۆش ئەگەر پێویستت بەهاوسەرەکەتە برۆ پێی بگەو لەگەڵی برۆ وتی: واگومان دەبەم وەللاهی ڕاست دەکەیت عەباس ﷺ وتی: منیش ڕاستگۆم دڵنیابە بەوشێوەیەی پێمڕاگەیاندی، پاشان عەباس ﷺ جلێکی جوانی لەبەرکرد و خۆی ڕێکخست و گۆچانەکەی گرتە دەست ئینجا هاتە دەرەوە ڕۆیشت هەتاکو گەیشتە کەعبەو (طواف)ی کرد کاتێک بینیان وتیان: ئەی باوکی فضل لەبەرکردنی ئەو پۆشاکە نیشانەی خۆگرییە بەرانبەر کارەساتێکی دڵتەزێن پاشان ڕۆیشت هەتاگەیشتە ناوکۆڕی قورەیشیەکان کاتێك بەلایاندا دەڕۆیشت دەیانوت: ئەی باوکی فضل هیوادارین خێرو چاکە نەبێت دوچاری هیچ شتێکی تر نەبووبیت ئەویش وتی: دوچاری هیچ بەلایەك نەبووم تەنها خێرو خۆشی نەبێت سوپاس بۆخودا حجاجی کوڕی علاط ﷺ هەواڵی پێداوم کە خوای گەورە خەیبەری فەتح کردووە بۆ پێغەمبەرەکەی و غەنیمەتێکی زۆری دەسکەوتووە وبەپێی یاسای خودا دابەشی کردووە لە پێنج یەك و بووە بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو صەفییەی کچی حوییەی زەماوەندی کردووە و بووە بە هاوسەری داوای لێکردم کە تاسێ ڕۆژ هیچ نەلێم چونکە ئەو بە موسولمانی هاتەوە ناوتان تەنها بۆ ئەوەی ماڵ و سامانەکەی و هەرچیەکی لێرە هەیەتی بیبات و ئینجا بڕواتەوە بۆ ماڵەوەو بۆی دەربچێت تا بگاتەوە خزمەت محمد وهاوەڵەکانی ئێستا والەخزمەتیدایە وتیان: ئای خەڵکینە دوژمنی خودا لەدەستمان دەرچوو وەللاهی ئەگەر دەمانزانی خۆمان دەمانزانی چیمان پێدەکرد ئەوەندەی پێنەچوو کە هەواڵەکەیان بەوشێوەیە پێگەیشت ئەو خەمبارییەی موسولمانەکانی مەککە دوچاری ببوون بەهۆی هەواڵەکە ئەو هەموو خەفەت ڕووی کردەوە بێ باوەڕەکان ئەو موسولمانانەی لەماڵەوە خەم و خەفەت دایگرتبوون دەهاتنە خزمەت عەباس ﷺ ئەویش هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێڕادەگەیاندن موسولمانەکانیش گەشاوە ودلخۆش بوون و شادی ڕووی تێکردن هەموو ئەو خەم و خەفەت و ڕق و کینەش دوچاری هاوبەش پەیداکەران بۆوە))[٣٣٩].

---

(٣٣٩) اخرجە: احمد (٣/١٣٨)واللفظ له و(الزیادات) لابن هشام، وعبدالرزاق (١٩٧٧١)، والطبرانی (الکبیر)

# هۆنراوەی سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ

لە سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە لە خەیبەر لە خزمەتیدا وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوخسەتم دەدەیت کە هۆنراوەت بۆ بڵێم: پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی پێدام عومەری کوڕی خطاب ﷺ وتی: باش وریابە چی دەڵێیت، دەڵێت منیش وتم: -

واللە لولا اللە مااهتدینا　　ولاتصدقنا ولاصلینا

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەیت:

وانزلـن سکینـة علینـا　　وثبت الاقدام ان لاقینا

والمشرکون قد بغوا علینا

کاتێک لە هۆنراوەکەم بوومەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من قال هذا؟)) کێ ئەمەی وتووە؟ پێم وت: براکەم پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (یرحمه اللە) خودا ڕەحمی پێبکات وتم. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خەڵکانێک دوعای بۆ ناکەن و بە چاکە باسی ناکەن دەڵێن بەچەکی خۆی کوژراوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموو: ((کذبوا مات جاهداً مجاهداً فله اجره مرّتین و أشار باصبعیه))[٧٤٠]. واتە: (ڕاست ناکەن ئەو مردووە تێکۆشەربووە لەکاتی تێکۆشان و جیهاد دا بەرکەوتووە دوو پاداشتی بۆ هەیە ئاماژەی بەدوو پەنجەی کرد). لەگێڕانەوەیەکی تردا سەلەمە ﷺ دەڵێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ]. بەمات و بێدەنگی منی بینی [دەستی گرتم] و فەرمووی: ئەوە چیتە؟ پێم وت: بەدایک و باوکەوە بە قوربانت بم خەڵکی دەڵێن کە عامر) کردەوەکانی بەتاڵ بۆتەوە فەرمووی: ((کذّب من قاله ان له

---

(٣١٩٦)، وابویعلى (٣٤٧٩) وقال محققه: اسناده صحیح، ابن هشام (السیرة) (٣/٣٠٥) رقم (٨٧٢)، والبزار (١٨١٦)، والبیهقي (الکبرى) (٩/١٥٠)، وابن حبان (٤٥٣٠) وقال محققه اسناده صحیح، وقال ابن عبدالبر في (الاستیعاب) (١/٣٤٥) حدیث صحیح وقال الحافظ ابن کثیر (البدایة) (٤/٢١٧) رواه احمد واسناده على شرط الشیخین، وقال الحافظ الهیثمي في (مجمع الزوائد) (٦/١٥٥) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحیح، وقال محققا (زاد المعاد) (٣/٣٣٩)سنده صحیح.

(٧٤٠) اخرجه: مسلم (١٨٠٢).

لاجرین وجمع بین اصبعیه انه لجاهد مجاهد قل عربيٌ مشی بها مثله))[٧٤١]. واته: (کێ ئەو قسانە دەکات؟ وتم: فلان و فیسارو ئوسەیدی کوڕی حوضیر فەرمووی: ڕاست ناکەن هەرکەسێك ئەو قسانە بکات بەڵکو ئەو دوو پاداشتی بۆ هەیەو ئاماژەی بە پەنجەکانی کرد وفەرمووی: تێکۆشەربووە وتێکۆشانێکی ئەنجام داوە کەم کەس هەیەی لەناو عەرەبدا وەك ئەوی پێکرابێت و بەو پلەیە گەیشتبێت).

## نوستن لەکاتی نوێژی بەیانیدا

پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە بەرەو مەدینە لەڕێگادا زۆر ماندوبوو لایاندان و وخەو زۆری بۆ هێنان و نوستن بەخەبەر نەهاتن بۆ نوێژی بەیانی، لەئەبوهورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك گەڕایەوە لە غەزای خەیبەر بەشەو دەڕۆیشتن هەتاکو زۆر ماندوبوون نزیك بوون خەو بیان باتەوە))[٧٤٢].

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: هەندێك لە خەڵکەکە وتیان: ئەگەر ڕێگەمان بدەیت لەشوێنێکدا دابەزین بۆحەسانەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟ فەرمووی: ((اني اخاف ان تناموا عن الصلاة)). واته: (دەترسم بۆ نوێژی بەیانی بەخەبەرنەیەن). پاشان فەرمووی: [من یکلؤنا اللیلة لا نرقد عن صلاة الصبح)). واته: (کێ دەبێتە ئێشکگر وپاسەوانمان تاکو بۆ نوێژی بەیانی بەخەبەرمان بهێنێت). بیلالﷺ وتی: من بەخەبەرتان دەهێنم ئەوانیش پاڵیان دایەوە بۆی نوستن]. بەبیلالی فەرموو: [ئەمشەو تۆ پاسەوان بە] بیلالیش نوێژی کرد ئەوەندەی لەتوانایدابوو وە پێغەمبەری خودا ﷺ هاوەڵەکانی خەویان لێکەوت کاتێك نزیك نوێژی بەیانی بوو بیلال پاڵی دابوو بەسەرکۆڵ و بارەکەی خۆیدا ڕووە وشوێنی شەبەقی بەرەبەیان تا خەو زۆری بۆ هێنا و خەوی لێکەوت][٧٤٣]. لەگێڕانەوەیەکی تردا

---

[٧٤١] أخرجه: مسلم (١٧٩٩)، والبخاري (٢٤٧٧).

[٧٤٢] أخرجه: مسلم (٦٨٠)، وابوداود (٤٣٥)، وابن ماجة (٦٩٧)، والترمذي (٦١٣)، وابن خزيمة (١٠٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود)(٤٢٠)، و(صحيح ابن ماجة) (٥٧١).

[٧٤٣] أخرجه: البخاري (٥٩٥)، والنسائي (٢٩٨/١) عن ابي قتادة.

[خەو زاڵ بوو بەسەریاندا] کەسیان خەبەریان نەبۆوە نەپێغەمبەری خودا ﷺ و نەبیلال و نەصیح کام لە هاوەڵانیش [هەتاکو گەرمایی خۆر بەخەبەری هێنان] پێغەمبەری خودا ﷺ یەکەم کەس بوو خەبەری بۆوە ڕاپەڕی وتی: ((اي بلال "این ماقلت"؟)). ئەی کوا بیلال تۆ چیت بە ئێمە وت؟ بیلال ﷺ وتی: بەدایك و باوکەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی زۆری بۆ تۆ هێنا هەرئەوەش بەسەرمندا زاڵ بوو.

لەگێڕانەوەیەکی تردا [هەرگیز خەوی بەو شێوەیەم لێنەکەوتووە فەرمووی: هەستن بابڕۆین][٧٤٤]. لە گێڕانەوە یەکی تردا: [لیأخذ کل رجل برأس راحلته فان هذا منزل حضرنا فیه الشیطان]. واتە: [با هەموو یەکێك لە ئێوە ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت چونکە لەم جێگەیەدا شەیتانمان لەگەڵ بووە ئینجا هەریەکەیان بارگەو بنەیان پێچایەوە خستیانە سەر وشترەکەیان و ڕۆیشتن]. جڵەوی وشترەکانیان گرت تۆزێك ڕۆیشتن ئینجا [داوای ئاوی کرد وەدەست نوێژی پێ هەڵگرت] پاشان ئەوانیش هەستان و پێی فەرموون: ((توضؤا)) دەست نوێژ [بشۆن خوای گەورە گیانتان دەکێشێت گەر بیەوێت وە دەیگێڕێتەوە بۆتان هەرکاتێك خۆی بیەوێت] ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ ئینجا بیلال ﷺ بانگی دا [هەتاکو ڕۆژبەرز بۆوە ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا] دوو ڕکاعەت نوێژی کرد هاوەڵانیش [هەستان دەست نوێژیان هەڵگرت][٧٤٥]. دوو ڕکاعەتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانیان کرد ئینجا داوای لە بیلال کرد کە قامەت بکات بۆ نوێژ پاشان پێش نوێژی بۆکردن وەبە کۆمەڵ نوێژی بەیانیان ئەنجامدا))[٧٤٦]. [وەك ئەو نوێژەی کەلەکاتی خۆیدا ئەنجامیان دەدا]. کاتێك نوێژیان تەواو کرد فەرمووی: ...... [ئێوە کاتێك خەوتبوون مردبوون بەڵام خوای گەورە زیندووی کردنەوە هەر کەسێك لە ئێوە خەوت و نوێژەکەی چوو هەر کات بە خەبەر هاتەوە با نوێژەکەی بکات وەهەرکەسێکیش لەبیری چۆوە نوێژ

[٧٤٤] إخرجه: النسائي (١/٢٩٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٦٠٧).
[٧٤٥] إخرجه: ابوداود (٤٣٩).
[٧٤٦] إخرجه: مسلم (٦٨١)، واحمد (٢/٤٢٨)، والنسائي (١/٢٩٨)، وابن حبان (٢٦٥٧) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، (صحيح النسائي)(٦٠٧).

بکات لە کاتی خۆیدا بەهەمان شێوە هەرکاتێك بیری کەوتەوە با نوێژەکەی بکات]))[٧٤٧]. خودای گەورە دەفەرموێت: ((اقم الصلاة لذكرى))[٧٤٨]. لەگێڕانەوەیەکی تردا [لە ئەبوسریم ﷺ دەفەرموێت: پاشان قسەی بۆ کردین لەسەر هەموو شتێك هەتاکو ڕۆژی قیامەت و هەستانی قیامەت][٧٤٩]. [ئەوەی لەبەری کرد لەبەری کرد وە ئەوەیشی بیریچۆوە بیریچۆوە][٧٥٠].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لەزەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ دەڵێ: ((پێغەمبەری خودا ﷺ لەشوێنێك لایدا بەشەو بۆ حەسانەوە... بیلالی ڕاسپارد کە خەبەریان بکاتەوە بۆ نوێژ بیلال خەوی لێکەوت ئەوانیش نوستبوون بەخەبەرنەهاتن گەرمی خۆرەی بەیانی خەبەری کردنەوە و ڕاپەڕین، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد کەبارگەوبنەکەیان هەڵگرن و سواری وشترەکانیان ببنەوە هەتاکو لەو دۆڵە دەردەچن وە فەرمووی: ((ان هذا وادٍ به الشيطان)) واتە: (ئەمەدۆڵ و شیوە شەیتانی تێدایە) ئینجا سواربوونەوە و ڕۆیشتن هەتاکو لەو ناوچەیە دەرچوون پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کرد دابەزن و دەست نوێژیان شۆردووە فەرمانیشی کرد بەبیلال ﷺ کە بانگ بدات بۆ نوێژ یاخود تەنها قامەت بکات پێغەمبەری خودا ﷺ پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد دوای تەواوبوونی ترسی تێدا بەدی کردن، بۆیە فەرمووی: ((يا ايهاالناس ان الله قبض ارواحنا ولو شاء لرّدها الينا في حين غير هذا فاذا رقد احدكم عن الصلاة او نسيها ثم فزعَ اليها، فليصلها كما كان يصليها في وقتها، ثم التفت النبي ﷺ الى ابي بكر الصديق ﷺ فقال: ((ان الشيطان اتى بلالاً وهو قائم يصلي فاضجعه، ثم لم يزل يُهديه كما يُهدأ الصبيُ حتى نام)). ثم دعا النبي ﷺ بلالاً فاخبر بلال رسول

---

[٧٤٧] أخرجه: ابويعلى (٥٨/١) (رقم: ٨٩٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٣٩٦).

[٧٤٨] أخرجه: الترمذي (٣١٦٣)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٣٠)، و(صحيح أبي داود) (٤٦١-٤٦٢)، و(الارواء)(٤٦٣).

[٧٤٩] أخرجه: النسائي (٢٩٧/١)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٦٠٥).

[٧٥٠] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٦٠١/١٩).

پێی پێغەمبەری الذي اخبر رسول الله ﷺ ابا بكر، فقال ابو بكر: اشهد انك رسول الله))(٧٥١). واتە:
لە ﷺ مثل خودای گەورە گیانتان دەکێشێت لەکاتی نوستن ئەگەر بیەوێت دەیگرێتەوە
ڕەنی خەلکینە بۆیە هەرکەسێك لە ئێوە خەوی لێکەوت لەکاتی نوێژدا یاخود لەبیری
پاشان لەکاتێکی تردا هاتەوە یا بەخەبەرهات با نوێژەکەی بکات وەك ئەو نوێژەیە کە
بووە هەر کاتێك بیری پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی کردە ئەبوبەکری صدیق
لەکاتی خۆیدا دەیکات، لای بیلال لەکاتێکدا نوێژی کردووە هەتاکو خستویەتیە ناو جێگا
فەرمووی شەیتان هاتۆتە لایەی بۆ کردووە وەك لایلایەی دایك بۆ منداڵ هەتاکو خەوی لێکەوتووە
هەر بەردەوام لای بیلالی بانگ کرد. بیلال ﷺ ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە پێغەمبەری
پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: شایەتی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری خودا
خودا ﷺ بە ئەبوبەکری وتبوو ئەبوبەکر ﷺ
ﷺ)).

## کەوتنی وشترەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ

لەڕێگەی گەڕانەوەیان بەرەو مەدینە کێوی ئوحود لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەرکەوت
ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: ((. . . . . ئینجا پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەو مەدینە گەڕایەوە
هەتا کێوی ئوحودی لێ دەرکەوت فەرمووی: ((هـذا جبـل يُحبنـا و نُحبـه))(٧٥٢). واتە: (ئەوە
کێوێکە خۆشی دەوێین و ئێمەش خۆشمان دەوێت). ئینجا وشترەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ
لەچاری دەست بەیەکدا هاتن هات و کەوت پێغەمبەری خودای ﷺ خستە خوارەوە.
ئەنەسەوە ﷺ دەڵێت: ((ڕۆیشتین هەتا دیوارەکانی مەدینەمان لێ دەر کەوت ڕوومان
کەش بۆیە زۆر کەیف خۆش بووین هەنگاوەکانمان خێراتر ودرێژتر دەکرد تا زوو نزیك
بکەوینەوە لە مەدینە، پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو صەفیەی هاوسەری لەپشتەوە
سواربوو لەو کاتەدا وشترەکەی ساتمیەکی (سڵەمینەوەیەك)ی کرد وهەر دووکیانی خستە
خوارەوە ئەبو طلحە گەیشتە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، خودا
مکت بە فیدات خۆ هیچت بەسەر نەهاتووە فەرمووی: ([لا] علیـك بـالمرأة). نەخێر بگە

(٧٥١) أخرجه: مالك (١٤/٨)، والطبراني (الكبير) (٦٠١/١٩)، والبيهقي (الدلائل) (٢٧٤/٤) وقال مرسل، وقال الشيخ الالباني في (المشكاة) (٦٨٧) مرسل صحيح الاسناد.
(٧٥٢) أخرجه: البخاري (٦٣٦٣)، واحمد (١٥٩/٣).

هاوسەرەکەم ئەبو طلحە فەرمانەکەی بەجێگەیاند پۆشاکێکی دا بەدەم و چاوی خۆیدا و کاتێك گەیشتە لای پۆشاکەکەی بەسەر خاتوو صەفیەدا داو هەستایەوە هیچ کەسێك لە خەڵکەکە لە شەرما سەیری پێغەمبەری خودا ﷺ و خاتوو صەفیەیان نەدەکرد، هەتاکو پێغەمبەری خودا ﷺ هەستاو داپۆشی، ئینجا ئێمە هاتینە خزمەتی و فەرمووی: (هیچ زیانێکمان پێنەگەیشتووە)، [ئەبو طلحەش ولاخی سواری بۆ ئامادەکردن و سواربوون ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دەڕۆیشتین هەرکە گەیشتینە مەدینە فەرمووی:][٧٥٣] [اللهم اني احَرّم مابين جبليها كما حرّم ابراهيم مكة اللهم بارك لهم في مُدّهم وصاعهم][٧٥٤])). واتە: [ئەی خودای پەروەردگار من نێوانی ئەو دووکێوەم حەرام کردووە هەروەك ئیبراهیم عليه السلام مەککەی حەرام کرد خودایە بەرەکەت بخەیتە کێشانە و پێوانەیان لە کڕین و فرۆشتندا] (ایبون، تائبون، عابدون، لربنا، حامدون) بەردەوام ئەمەی دەوت هەتا چووینە وشاری مەدینە هیچی تری نەوت کاتێك چووینە ناوشار هاوسەرەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتنە پێشوازی و دەیانوت: خودا ئەو ئافرەتە جولەکەمان لە کۆڵ بکاتەوە، لەگێڕانەوەیەکی تردا: [کەوتنە قسە پێ وتنی و کە جارییەی ئافرەتەکانیش چاویان پێکەوت قسەیان پێدەوت و گاڵتەیان بە بەربونەوەکەی دەکرد]))[٧٥٥].

---

(٧٥٣) أخرجه: البخاري (٣٠٨٥)، ومسلم (١٣٦٤، ١٣٦٥).
(٧٥٤) أخرجه: البخاري (٦٣٦٣).
(٧٥٥) أخرجه: ابن حبان (٧٢١٢) وقال محققه اسناده صحيح.

# چوونە ناو شاری مەدینە

کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ وەك كاری هەمیشەیی كەلە سەفەرێك دەگەڕایەوە بەرلە هەموو شتێك ڕووی دەكردە مزگەوت و دووی ڕکاعەت نوێژی دەکرد ئینجا دادەنیشت بۆ هەواڵ و كاروباری خەڵكی و پێشوازی لێكردنی))[٧٥٦] پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ چووە ژوورەكەی عائیشە.

لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ كە گەڕایەوە لە غەزای تەبوك و خەیبەر لە ناوژوورەكەی من تاقێكی لێبوو پەردەی پێدا درابوو با هەڵیكرد پەردەكەی تۆزێك لایدا بووكەڵە شوشەكانم دەركەوتن لەوێدا دانرابوون یاریم پێدەكردن پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە ئەوە چیە؟ وتی: ئەوە كچەكانمن [ئەوانە یاریەكانمن ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ] لەناویاندا ئەسپێك لەپەڕۆ دروستكرا بوو بینی دوو باڵی هەبوو و فەرمووی: ((ماهذا الذي ارى وسطهن)) ئەی ئەوە چیە لەناو ڕاستیاندا؟. وتم: ئەسپە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((وما هذا الذي عليه))؟ ئەی ئەوە چیە لەسەری؟ وتی: باڵەكانیەتی فەرمووی: ((فرس [من رقاع] له جناحان))؟ ئەسپێك لەپەڕۆ دروستكراو دوو باڵی هەیە، وتی: ئەی نەتزانیوە كە سولەیمانی كوڕی داود ئەسپێكی باڵداری هەبووە؟ دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە پێكەنی تا هەموو ددانەكانی دەركەوت))[٧٥٧].

خاتوو صەفیەی (رضي الله عنها) هاوسەری پێغەمبەری خودا ﷺ گوارەیەكی ئاڵتونی لە گوێدابوو بە فاطمەی بەخشی وەك دیارییەك، سەعیدی كوڕی موسەیب ﷺ دەڵێت: [كە خاتوو صەفیە هاتە مەدینە گوارەیەكی زێڕی لەگوێدابوو وەك دیارییەك بەخشی بە فاطمە

---

(٧٥٦) أخرجه: البخاري (٤٤١٨)، مسلم(٢٧٦٩).

(٧٥٧) أخرجه: ابوداود (٤٩٣٢) واللفظ له، والبيهقي (١٠/٢١٩)، وابن حبان (٥٨٦٤) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الشيخ الالباني في (اداب الزفاف) (ص: ١٧٠) اسناده صحيح، واللفظ لأبي داود والزيادات لابن حبان.

پێغەمبەری خودا ﷺ ئاشتەوای دەخستە نێوان صەفیەو و ئەو ژنانەی لەگەڵیدابوون][758] پێغەمبەری خودا ﷺ ئاشتەوای دەخستە نێوان صەفیەو هاوسەرەکانی تری و پشتیوانی دەکرد وڕێزی تایبەتی لێدەنا، لەمنەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: ((خاتوو صەفیە پێی گەیشت کە خاتوو (حفصە)پێی وتووە کچی جولەکە ئەویش دەستی بەگریان کرد وبە پێغەمبەری خودا ﷺ بەسەردا هات فەرمووی: ((ئەوە بۆ چی دەگری؟)) وتی: ئەوە پێم دەڵێت: ئەی کچی جولەکە. پێغەمبەری خودا فەرمووی: ((تۆ کچی پێغەمبەریت و مامیشت پێغەمبەرە [مەبەستی موسی و هارون])) ە وە هاوسەری پێغەمبەرێکیشی بەچی شتێك شانازی بەسەرتۆدا دەکات [پاشان بە حفصەی فەرموو: لەخودا بترسە ئەی حفصە])) [759].

لەگێڕانەوەیەکەی خاتوو صەفیەدا (رضي الله عنها) دەڵێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە ژوورەکەم دەگریام فەرمووی: ((ما يبكيك يا ابنة حُيَي))؟ ئەوە بۆچی دەگری ج شتێك وای کردووە کە بگریت ئەی کچی حویەیی؟ وتم: پێمگەیشتووە کە عائیشە وحەفصە قسەیان لەبارەی منەوە کردووە وتویانە: ئێمە لەمنەو باشترین لەکچانی بنەماڵەو مامی پێغەمبەرین و هاوسەری ئەوین، فەرمووی: ((افلا قلت كيف تكونان خيراً مني ابي هارون وعمي موسى وزوجي محمد ﷺ)) [760]. واتە: (تۆ پێت نەوتن ئێوە بەچی و چۆن لەمن باشترن لەکاتێکا من باوکم هارونە و مام موسایە هاوسەریشم محمدە ﷺ). خاتوو صەفیە بەژن و باڵای کورت بوو خاتوو عائیشە جارێکیان ویستی بەوە لای پێغەمبەری خودا ﷺ لەکەداری بکات عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خودا صەفیە ئافرەتێکی ئاوهاو ئاوهایە بەدەستی ئامازەی کرد کە کورتە باڵایە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((لقد

---

(758) اخرجه: ابن سعد (١٥/٣) بسند صحيح من مرسل ابن المسيب كما قال الحافظ في (الاصابة) (٣٤٧/٤) (٦٥٠).

(759) اخرجه: عبدالرزاق (٢٠٩٢١)، واحمد (١٣٥/٣) رقم (١٢٣٩٢) وقال الأرناؤوط اسناده صحيح على شرطهما، وابويعلي (٣٤٣٧)، والطبراني (الكبير)(١٨٦/٢٤)، والنسائي (الكبرى) (٨٩١٩)، والترمذي (٣٨٩٤) وقال حسن صحيح غريب واللفظ له، وصححه ابن حبان (٧٢١١) وقال محققه اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٣٠٥٥) و(المشكاة) (٦١٨٣).

(760) اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٩٦/٢٤)، والحاكم (٢٩/٤)

مزجت بكلمة لو مزج بها ماء البحر لمزج.))[٧٦١]. واتە: (بەوشەیەك قسەت کرد ئەگەر تێکەڵ بەئاوی دەریا بووایە تێکی دەدا).

## گەڕانەوەی جەعفەرو ئەشعریەکان

جیاوازی هەیە لەکاتی گەڕانەوەی کۆچکردووەکان و ئەشعریەکان بۆ مەدینە یاخود بۆ خەیبەر لەگێڕانەوەیەکی ئەبو موسای ئەشعەری دا ﷺ دەفەرموێت: ((هاتینەوە بۆ مەدینە) لەوکاتەدابوو پێغەمبەری خودا ﷺ خەیبەری فەتح کردبوو))[٧٦٢] لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای فەتح کردنی خەیبەر بەسێ ڕۆژ][٧٦٣].

لەگێڕانەوەکەی جابر ﷺ دەفەرموێت: [کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفییان هێنایە مەدینە لەدوای غەزای خەیبەر جەعفەرو هاوەڵانی گەڕانەوە لە حەبەشە][٧٦٤]. لەگێڕانەوەی ئەنەس ﷺ: [. . . . ئەشعەریەکان گەڕانەوە کاتێك لەمەدینە نزیك بوونەوە ئەم هۆنراوەیان بە ئاوازەوە دەوتەوە: سبەی دەگەین بە خۆشەویستمان محمدو هاوەڵانی][٧٦٥]. لەگێڕانەوەیەکی ئەبو موسای ئەشعەری دا ﷺ [لەکاتێکدا گەڕینەوە پێغەمبەری خودا ﷺ غەزای خەیبەری دەکرد یاخود ڕووە و خەیبەر بەڕێکەوتبوو][٧٦٦] لەگێڕانەوەیەکی تردا هەرلە ئەوەوە دەفەرموێت: [گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ دوای سێ ڕۆژ لە فەتحی خەیبەر لەگەڵ کەسانێك لە خزمەکانی خۆم. . .][٧٦٧].

---

[٧٦١] أخرجه: الترمذي (٢٥٠٢) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٠٣٤)، و(غاية المرام) (٤٢٧).

[٧٦٢] أخرجه: البخاري (٤٢٣٠)، ومسلم (٢٥٠٢).

[٧٦٣] أخرجه: ابن حبان (٤٨١٣) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٧٦٤] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٢٤٦) باسناد موصول وانظر: (البداية) (٤/٢٠٦).

[٧٦٥] أخرجه: احمد (٣/١٥٥)، وابن حبان (٧١٩٣) وقال محققه اسناده صحيح، وقال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢/٥٠) (٥٢٧) اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٧٦٦] أخرجه: البخاري (٤٢٠٥)، ومسلم (٧٠٤).

[٧٦٧] أخرجه: احمد (٤/٤٠٦).

لەو بۆچوونە جیاوازانەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەبو موسای ئەشعەری و ئەشعەریەکانی تر هاتوونەتە مەدینەو دواتر خۆیان گەیاندۆتە خەیبەر دوای فەتح کردنی بەسێ ڕۆژ ئەوانی تر کە جەعفەرو هاوەڵانی بوون دواکەوتوون گەیشتوونەتە مەدینە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی لە خەیبەر لە گێڕانەوەی جابردا ﷺ بە ئاشکرا ئەمە بەرچاو دەکەوێت، ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەفەرموێت: ((هەواڵمان زانی کە پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچی کردووە بەرەو مەدینە ئێمەش لەیەمەن بووین کۆچمان کرد بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ من و دوو براکەم، من لە هەردووکیان بچوکتربووم کە یەکێکیان ئەبوبوردە بوو ئەوی تریشیان ئەبو روهم بوو لەگەڵ ئەوەندە یاخود پەنجاو سێ پیاو لە هۆزەکەمان بووین. . . . [لەگێڕانەوەیەکی تردا. . . . پەنجا کەس لە ئەشعەریەکان و شەش کەس لە هۆزی (عك) بوون][٧٦٨]. دەڵێت: سواری کەشتی بووین ئێمەی گەیاندە لای نەجاشی لە حەبەشە لەوێش گەیشتین بە جەعفەری کوڕی ئەبوطالب و هاوەڵانی کە لەلای نەجاشی بوون، جەعفەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمەی ناردووە بۆ ئێرە و فەرمانی پێکردووین کەلێرە بمێنینەوە ئێوەش لەگەڵمان بمێننەوە ئێمەش لەگەڵیان ماینەوە هەتاکو هەموومان بەیەکەوە هاتینە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتێکدا خەیبەری فەتح کردبوو وە بەشی بۆ ئێمەش دانابوو لەو دەسکەوتانە کە هیچ بەشێکی بۆ هیچ کەسێکی تری دانەنابوو کە بەشداری غەزاکەی نەکردبێت بەهیچ شتێك تەنها خەڵکی ناو کەشتیە گەڕاوەکەی حەبەشە نەبێت لەگەڵ هاوەڵانی بەشی بۆ دانابوون. . . .))[٧٦٩].

کاتێك ئەشعەریەکان لەمەدینە نزیك بوونەوە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی هاتنیانی بە موسوڵمانان ڕاگەیاند ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((یقدم علیکم غداً اقوام هم ارق قلوباً منکم)) واتە: ((سبەی خەڵکانێکتان پێدەگەن و دێن بۆ لاتان لە ئێوە دڵ نەرمترن بۆ ئەم ئاینە))، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ئەشعەریەکان هاتن ئەبو موسایان لەناودابوو کاتێك لە مەدینە نزیك بوونەوە هۆنراوەی بە ئاوازیان دەوت سبەی

---

[٧٦٨] أخرجه: ابن حبان (٧١٩٤) وقال محققه اسناده صحیح علی شرط مسلم.

[٧٦٩] أخرجه: البخاري (٤٢٣٠)، ومسلم (٢٥٠٢).

دەگەین بە خۆشەویستمان محمد وکۆمەڵەکەی لەو کاتەدا گەیشتنە ناومان تەوقەیان کرد ئەوان یەکەم کەس بوون تەوقەیان داهێنا))[٧٣٠].

کاتێک جەعفەری ﷺ ئامۆزای پێغەمبەری خودا ﷺ گەڕایەوە پێغەمبەری خودا ﷺ باوەشی پێداکرد و زۆر خۆشحاڵ بوو بەگەڕانەوەی، جابر ﷺ دەفەرموێت: (([کاتێک جەعفەر گەڕایەوە لە حەبەشە پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی لە ملی کردوو باوەشی پێداکرد][٧٣١] فەرمووی: ((ما ادري بأيهما افرح بفتح خيبر ام بقدوم جعفر))[٧٣٢]. واتە: (نازانم بەکامتان دڵخۆش بم بەگرتنی خەیبەر یاخود بەهاتنەوەی جەعفەر).

لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە [کاتێک جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ﷺ گەڕایەوە پێغەمبەری خودا ﷺ پێشوازی کردوو هەرکە چاوی پێکەوت ناوچەوانی ماچ کرد][٧٣٣].

---

[٧٣٠] أخرجه: احمد (٣/١٥٥) في (فضائل الصحابة) (١٦٥٥) وقال محققه اسنادهما صحيح، والبخاري (الادب المفرد) (٩٦٧)، وابن حبان (٧١٩٢-٧١٩٣) وقال محققه اسناده صحيح وصحح اسناده النووي في (الأذكار) (٨٨٦) (ص: ٢٣٦)، وصححه ايضاً الحافظ في (الفتح) (١١/٦٤)، وقال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢/٥٠) (٥٢٧) اسناده صحيح على شرط مسلم، انظر: (صحيح الأدب المفرد) (٧٤٤)، صححه ايضاً محققا (زاد المعاد) (٣/٦١٩) واللفظ لاحمد.

[٧٣١] أخرجه: ابويعلى (٣/٣٩٨) (رقم: ١٨٧٦)، قال الهيثمي في (المجمع) (٩/٢٧٢) فيه مجالد بن سعيد وهوضعيف وقد وثق، وبقية رجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٦٥٧).

[٧٣٢] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢/١٠٨)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩/٢٧٢)، رواه الطبراني مرسلاً ورجاله رجال الصحيح، والحاكم (٢/٦٢٤) وصححه ووافقه الذهبي واللفظ له، قال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٣٧٩): حديث حسن.

[٧٣٣] أخرجه: ابوداود (٥٢٢٠)، والحاكم (٣/٢١١) وصححه وقال الذهبي: الصواب انه مرسل، والبيهقي (الدلائل) (٤/٢٤٦) وقال اسناده مرسل، الطبراني (الكبير) (٢٢/٨٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩/٢٧٢) رواه الطبراني في الثلاثة وفي رجال (الكبير) انس بن مسلم ولم اعرفه وبقية رجاله ثقات وقال الحافظ في (الفتح) (١١/٧٠)، في سنده ضعيف، وقال ابن الملقن في (خلاصة وبدر المنير) (٢٥٠٦)رواه ابوداود والدار القطني باسانيد ضعيفة، وقال الشيخ الالباني في (دفاع عن السيرة والحديث النبوي) (ص: ٨٦) رواه ابوداود بسند ضعيف والحاكم بسند مرسل وقال في (المشكاة) (٤٦٨٧) اسناده ضعيف، وضعفه ايضاً محققا (زاد المعاد) (٣/٣٣٣)، وضعفه الشيخ الأرناؤوط ايضاً في شرح (السنة) (١٢/٢٩٢).

لەگێڕانەوەکەی ئیبن عومەردا ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ پێشوازی جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ﷺ ڕۆیشت کاتێك گەیشتە لای باوەشی پێداکرد. . . . . . پاشان پێی فەرموو: ((الا اهبُ لك الا امنحك الا احفك؟)). شتێکت پێ ببەخشم دیاری و خەلاتێکت پێم بدەم؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: چوار ڕکاعەت نوێژبکە پێغەمبەری خودا ﷺ فێری نوێژی ستایشی کرد (صلاة التسبیح)][٧٧٤].

دایکی خالید لە کۆچکەرانی حەبەشەدابوو پێغەمبەری خودا ﷺ پۆشاکێکی ڕەش و سوری دایە کە وێنەی تێدابوو لەدایکی خالیدی کچی کوڕی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کەلە حەبەشە خالیدی بووە دەڵێت: [گەڕامەوە لە خاکی حەبەشە][٧٧٥] من کچۆڵەیەکی بچوك بووم پێغەمبەری خودا ﷺ پۆشاکی پێدام خەتی ڕەش و سوری تێدابوو وەوێنەشی لەسەرکرابوو پێغەمبەری خودا ﷺ وێنەکانی بەدەستی خۆی ڕەش دەکردەوە وە دەیفەرموو: ئێستا زۆر جوانە زۆر جوانە).

پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری لێکردن دەربارەی گرنگترین شت کەبینیویانە وکەبەلایانەوە جێگەی سەرسوڕمان بووە لە خاکی حەبەشە، لەجابیرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێك کۆچکەرانی حەبەشە گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((ئایە بۆم ناگێڕنەوە سەرسوڕماوترین شت کەلەسەر خاکی حەبەشە بینیوتانە چیە؟)) گەنجێك لەناویاندا وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ڕۆژێکیان دانیشتبووین پیرێژنێکی بەساڵاچوو لەبەساڵاچووە ڕاهیبەکان بەلاماندا تێپەڕی گۆزەیەکی گەورەی پڕلە ئاوی لەسەر سەری دانابوو بەلای گەنجێکی خۆیاندا تێپەڕی گەنجەکەش دەستێکی خستە ناو شانی پاڵێکی پێوەنا ئافرەتەکە بەسەرچۆکیدا کەوت و گۆزەکەی شکا کە هەستایەوە ئاوڕێکی لێدایەوە وتی: غەدرکەر لەمەودوا دەزانیت ئەنجامی ئەم کارەت چۆن دەبێت کاتێك خوای گەورە کورسی و عەرشی خۆیدانا و سەرەتا وکۆتاییەکانی مرۆڤی کۆکردەوە بۆ لێپرسینەوە و دەست و قاچەکانی هێنایە قسەکردن لەسەر ئەو کارانەی ئەنجامیانداوە ئەو کات تێدەگەیت کە کاری من و تۆ چۆنە لەلای ئەو، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ڕاست

[٧٧٤] اخرجه: الحاكم (٣١٩/١) وقال اسناده صحيح ووافقه الذهبي.
[٧٧٥] اخرجه: البخاري (٣٨٧٤).

دەکات ڕاست دەکات چۆن خودا ئومەتێك شکۆمەند دەکات تیایاندا ماق بێ هێزەکان لە بەهێزەکان وەرنەگیرێت))[٣٣٦].

## پلەو پایەی کۆچکەرانی حەبەشە

لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەفەرموێت: ((کەسانێك لەناو خەڵکیدا بەشانازیەوە بە ئێمەیان دەوت واتە: سەرنشینانی کەشتیەکەی حەبەشە ئێمە پێشتان کەوتین لە کۆچکردندا دەڵێت: ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها) خێزای جەعفەر ﷺ یەکێك بوو لە کەرامەکانی حەبەشە لەگەڵماندابوو بەسەردان چووبووە لای خاتوو حەفصەی (رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەری خودا ﷺ عومەریش ﷺ هات بۆ سەردانی خاتوو حەفصەی کچی لەوکاتەدا ئەسما لەوێ بوو کاتێك چاوی پێکەوت وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: ئەوە ئەسمائی کچی عومەیسە عومەر وتی: ئەوە تۆیت حەبەشیەکە؟ ئەوە تۆیت دەریایەکە؟ ئەسما (رضي الله عنها) وتی: بەڵێ. عومەر وتی: پێشتان کەوتین لە کۆچکردن لەبەر ئەوە ئێمە لەپێشترین بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ. ئەسما توڕەبوو وتی: ئەی عومەر ڕاست ناکەیت وانی یە وەڵاهی ئێوە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بوون برسیەکانتانی تێر خواردن دەکرد نەشارەزا و نەزانەکانیشتان ئامۆژگاری دەکرد وزانستی فێردەکردن بەڵام ئێمە لە خاکێك گیرسابینەوە خاکی غەریب و بێکەسی و دوور و ناخۆشبوو لەحەبەشە ئەوە هەموو لە پێناوی خواو پێغەمبەرەکەیدا بوو ﷺ سوێند بەخودا خواردن و خواردنەوە ناخۆم هەتاکو ئەوەی وتت بۆ پێغەمبەری خودای ﷺ باسنەکەم ئێمەش ئازارمان چێشتووە ترسمان لەسەربووە ئەوەش هەموو بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ باس دەکەم وە پرسیاریشی لێدەکەم سوێندبە خودا درۆناکەم و هیچ شتێکی لێ زیاد ناکەم دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ هات وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ عومەر ئاوهاو ئاوها دەڵێت دەربارەی کۆچکەرانی حەبەشە. فەرمووی: تۆ چیت بەئەو وت؟ وتم: منیش ئاوهاو ئاوها وەڵامم دایەوە. پێغەمبەری خودا

---

(٣٣٦) أخرجه: ابن ماجة (٤٠١٠) واللفظ له، وابويعلى (٢٠٠٣)، والبزار (١٥٩٦)، والبيهقي (الكبرى) (٩٥/٦)، وابن حبان (٥٠٥٨) وقال محققه حديث قوي بشواهده، والطبراني (الكبير) (١١٢٣٠)، قال الذهبي في (العلو العلي الغفار) (ص: ٦٨)اسناده صالح، قال الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٢٣٩) حسن، وقال في مختصر العلورقم(٥٩)اسناده صحيح لولا ان عطاء بن السائب اختلط.. . والحديث صالح.

ﷺ فەرمووی: ((لیس باحق بي منكم، وله ولأصحابه هجرة واحدة)) ولكم انتم اهل السفينة [في رواية هاجرتم الى حبشة وهاجرتم الي][٧٧٧]. واتە: (ئەوان لەپێشتر نین لەئێوە هجرتان. . . بەمن، عومەریش و هاوەڵانی یەك كۆچكردنیان بۆ هەیە وەك پاداشت بەڵام ئێوە سەرنشینانی کەشتیەکە دوو کۆچکردنتان بۆ هەیە [لە ڕیوایەتێکی تردا: کۆچکردنتان بۆ حەبشەو کۆچکردنتان بۆ لای من لەمەدینە]... دەڵێت: دواتر ئەبوموسا ﷺ وسەرنشینانی کەشتیەکەم بینی دەهاتن بۆ لام پرسیاری ئەو فەرموودەیەیان لێدەکردم هیچ شتێك لەدونیا ئەوەندە دڵخۆشی نەکردبوون و لەدڵو دەرونیاندا گەورە نەبووە بەئەندازەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە لەبارەی ئێمەوە فەرمووی))[٧٧٨].

## گێڕانەوە زەویو زارە خوازراوەکان

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێك کۆچکردوەکان لە شاری مەککە)ەوە هاتن بۆ مەدینە هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێنابوو بۆیان دەرنەوچووبوو وەهیچیشیان بەدەستەوە نەبوو ئەنصاریەکانیش خاوەن زەوی و زارو باخ و باخات بوون ئەنصاریەکان بەرووبومی ماڵەکانیان لەگەڵ دابەش دەکردن نیوە بەنیوە تەنها دەستەبەری کارو ئازوقەی ماڵو منداڵیان نەبێت، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك کە ناوی (ام سليم) بوو باخە خورمایەکی هەبوو دایە پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ بەخشیە (دایکی ئەیمەن)ی دایکی ئوسامە- ئیبن شیهاب دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ پێی ڕاگەیاندم دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە غەزای خەیبەر بۆوە گەڕایەوە بۆ مەدینە کۆچکردوەکان هەموو زەوی و زارو بەرووبوم و کەل و پەلێکی ئەنصاریەکانیان گەڕاندەوە بۆیان کەپێشتر وەریانگرتبوو لێیان دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ باخەکەی بۆ دایکم گەڕاندەوە لەبەرامبەریشدا باخێکی خورمای بەخشیە (دایکی ایمەن) لە جیاتی باخەکەی خۆی))[٧٧٩].

---

[٧٧٧] أخرجه: البخاري (٣٨٧٦)، (٤٢٣٠).

[٧٧٨] أخرجه: البخاري (٤٢٣٠)، ومسلم (٢٥٠٢) واللفظ له.

[٧٧٩] أخرجه: البخاري (٢٦٣٠)، ومسلم (١٧٧٠) واللفظ له.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ بەشێکی زۆری لەدەسکەوتەکانی خەیبەر و خورمای خەیبەری بەخشیە ئەنصاریەکان. ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (ئوسەیدی کوڕی حوضیر ئەشهەلی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەدا خواردنی دابەش دەکرد ئەویش باسی ماڵێکی هۆزی ئەوسی بۆ کرد لە (بني ظفر) کە پێداویستیان هەیە و ئەوان زۆربەشیان ئافرەتن، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((وازت لێ هێنایین تا هەرچی لەدەستمان بوو تەواو بوو لەمەودوا گوێبیستی شتێك بووی پێمان گەیشتە هەواڵی ئەو ماڵەم بیربخەرەوە)) دەڵێت: لەدوای ئەوەوە خواردن هات لە خەیبەرەوە خورما وجۆبوو، پێغەمبەری خودا ﷺ دابەشی کرد بەسەر خەڵکی دا بەشێکی زۆری تایبەتی بۆ ماڵە ئەنصاریەکە دانا ئوسیدی کوڕی حوضیر بەسوپاسەوە وتی: خودای گەورەی باشترین پاداشتت بداتەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەی ئێمەوە بە جوانترین و چاکترین شێوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((وانتم یا معشر الانصار فجزاکم الله اطیب الجزاء [او قال: خیراً]فانکم ما علمت أعِفةٌ صبرٌ، وستَرون بعدی أثرة في الامر والقَسَم فاصبِرُوا حتی تلقَوني علی الحوض))[٧٨٠] واتە: (ئێوەش ئەی کۆمەڵی ئەنصار خودای گەورە باشترین پاداشتتان بداتەوە، ئەوەندەی ئێوەم ناسیوە کەسانێکی زۆر دونیا نەویست و خۆڕاگر بوون لەشەڕدا لەدوای من بێبەش دەکرێن لەسامان و بێشەوایدا ئێوە ئارامگرین هەتا بەیەکتری شاد دەبینەوە لە سەر حەوزی (کوثر)).

پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو ساڵێك بەشی بۆ هاوسەرەکانی دادەنا لە خورمای خەیبەر ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ هەریەك لە هاوسەرەکانی هەشتا بار خورماو بیست بار جۆی دادەنا بۆ هەموو ساڵێك)[٧٨١]. لەگێڕانەوەیەکی تردا هەر لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: [خورمای خەیبەری دابەش کرد بۆ دوو بەشەوە لە نیوەکەی خەیبەردا پێغەمبەری خودا ﷺ پێنج یەکی وەردەگرت بۆ (بیت المال) و پێغەمبەری خودا ﷺ خواردنی هاوسەرەکانی لە پێنج یەکی دابین دەکرد بۆ ساڵێك بۆ هەریەکێکیان سەدبار

---

[٧٨٠] أخرجه: النسائي (الکبری) (رقم: ٨٣٤٥)، والحاکم (٧٩/٤) وصححه ووافقه.

[٧٨١] أخرجه: البخاري (٤٢١٣)، وابوداود(٣٠٠٦)، والدارمي (٢٧٠/٢)، والطحاوي (٢٦٠/٢)، واحمد (١٧/٢)، والبيهقي (١١٣/٦)، وابن حبان (٥١٩٩) وقال محققه اسناده صحيح. وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٥٩٧).

خورماو بیست بار جۆ[٧٨٢]. بەو شێوەیە بارودۆخی موسوڵمانان لەڕووی ئابوورییەوە بوژایەوە بۆیەکەم جار لە خورما تێریان خوارد.لە خاتوو عائیشە دایکی باوەڕدارانەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کاتێك خەیبەر فەتح کرا وتمان: (لەمێستا بەدواوە تێر بەشی خۆمان خورما دەخۆین)[٧٨٣].

پێغەمبەری خودا ﷺ خزمەتکارێکی بەعەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ بەخشی کاتێك لە غەزای خەیبەر گەڕایەوە ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ کەگەڕایەوە لە خەیبەر دووکۆیلەی مێرد منداڵی لەگەڵدا بوو عەلی ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خزمەتکارمان دەوێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((خذ أيهما شئت"قال: خيّرةُ لي قال: ((خذ هذا ولا تضربه فاني قد رأيته يُصلّي مقبُلنا من خيبر واني قد نهيت عن ضرب[أهل الصلاة])) واعطى اباذر الغلام الاخر فقال: (استوصى به خيراً) ثم قال: ((يا اباذر مافعل الغلام الذي اعطيتك؟"قال امرتني ان استوصي به خيراً فاعتقته"))[٧٨٤]. واتە: (کامیانت دەوێت ببیە وتی: بۆم دەست نیشان بکە؟ فەرمووی: ئەوەیان ببەو بەهیچ جۆرێك لێ نەدەیت چونکە من لە خەیبەر بینیم وەك ئێمە نوێژی دەکرد و منیش ڕێگە نادەم لە نوێژ خوێنان بدرێت ئەوەی تریشی دایە ئەبو زەڕی غەفاری ﷺ و پێی فەرموو: بەچاکترین شێوە ڕەفتاری لەگەڵ بکە پاشان پێی فەرموو ئەبو زەر چیت لەو کۆیلەیە کرد کە پێمان بەخشیت؟ وتی: فەرمانت پێکرم کەباش ڕەفتاری لەگەڵ بکەم منیش چووم ئازادم کرد)).

خەڵکی کەوتنە کڕین و فرۆشتنی خورمای خەیبەر دەچوون خورمای باشیان دەکڕی بە خورمای خراپ پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی کردن لەو کارە و بۆی ڕونکردنەوە کە ئەوە سەرچاوەی ڕیبایە. ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ پیاوێکی وەك سەرکار بەسەر خەیبەرەوە دانابوو هاتەوە خزمەتی خورمای (جنيب)ی هێنابوو لەگەڵ

---

(٧٨٢) أخرجه: ابي داود (٣٠٠٨) وقال الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٥٩٩) صحيح الاسناد.
(٧٨٣) أخرجه: البخاري (٤٢٤٢).
(٧٨٤) أخرجه: احمد (٥/٢٥٠-٢٥٧)، والبخاري (الأدب المفرد) (١٦٣)، حسنه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (١٤٢٨) (صحيح الأدب المفرد) (١٢١)، و(المشكاة)(٣٣٦٥)، وحسنه الشيخ المقبل في (الصحيح المسند) (٤٩٥)

خۆی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ((اکل تمر خیبر هکذا؟)). واتە: (ئایە هەموو خورمای خەیبەر ئەو شێوەییە؟) وتی: نا وەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە یەك ڕبە لەم خورمایە دەست دەخەین بەدوو یان سێ ڕبە لەخورمای تر فەرمووی: ((لاتفعل، بع الجمع بالدارهم ثم إتبع بالدارهم جنیباً)). ئەو کارە مەکەن هەموو بەپارە بفرۆشن پاشان بە پارەکەی خورمای (جنیب) بکڕن))[٧٨٥].

موسوڵمانەکان کەوتنە کڕین و فرۆشتنی بەشە کانیان لەنێوان خۆیاندا کەلە خەیبەر بەریان کەوتبوو هەتاکو عاصمی کوڕی عەدی و براکەی کە ئەنصاری و ئەوس بوون سەد بەشیان کڕی، عاصمی کوڕی عەدی ﷺ دەڵێت: ((من و براکەم سەد بەشمان لەبەشەکانی خەیبەر کڕییەوە ئەمە گەیشت بە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: واتە: ((یا عاصم ماذئبان [جائعان] عادیان، اصابا غنماً (في روایة) [با تا في زریبة غنم] أضاعها ربها بأفسد لها من حب [طلب]المرء [المسلم علی] المال والشرف، لدینه))[٧٨٦]. واتە: (ئەی عاصم گەر دوو گورگی برس دڕ وسنورشکێن، لەڕانەمەڕێکیان دا بێت لەناو گەوڕەکەیاندا کە خاوەنەکانیان بێ ئاگان لێیان دوو گورگەکە سەرتاسەری شەوکەوتونەتە خواردن و کوشتنی مەڕەکان ئەو دوو گورگە چۆن زیان بەو مەڕانە دەگەیەنن ئاوهاش سوربوونی موسوڵمان لەسەر بەدەست هێنانی پلەو سامان زیانی تەواو بە ئاینەکەی دەگەیەنێت).

عومەری کوڕی خەطاب ﷺ زەوییەکی کشتوکاڵی دەستکەوتبوو لە خەیبەر داوای لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد کە فەرمانی لەسەربدات ئەویش داوای لێکرد بیکات بە وقف) لە پێناوی خوادا ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: ((عومەری کوڕی خەطاب ﷺ زەوییەکی دەسکەوت لە خەیبەر هات بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ داوای لێکرد کە فەرمانێکی لە بارەوە بێنێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من زەویەکەم لە خەیبەر دەسکەوتووە هیچ

---

[٧٨٥] أخرجه: البخاري (٤٢٤٥).

[٧٨٦] أخرجه: احمد (٣/٤٦٠)، الدارمي (٢٧٣٣)، والترمذي (٢٣٧٦)، الطبراني (الكبير) (١٨٩/١٩)، في (الأوسط) (٧٧٢)، (الصغير) (٩٥)، البزار (٣٦٠٨)، أبويعلى (٦٤٤٩)، البغوي (شرح السنة) (٢٥٨/١٤)، ابن حبان (٣٢٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٣٥).

فەرمووی: بەچی فەرمانم پێدەکەیت لەبارەیەوە؟ فەرمووی:
ماڵێکم ئەوەندە بەلاوە شیرین نەبووە، قال فتصدق بها عمر انه لايباع ولا يوهب ولا يورث،
((ان شئت حبست اصلها وتصدّقت بها)) والضيف ولا جناح
وتصدق بها في الفقراء وفي القربى وفي الرقاب وفي سبيل الله وابن السبيل، واتە: (گەر حەزدەکەیت
علی من وليها ان يأكل منها بالمعروف ويطعم غير متمول [مالاً]))[٧٨٧] عومەر کردیە صدقە
باهەرهی خۆت بێت لە بنەڕەتدا و بەروبوومەکەشی بکە بە صدقە) بەکەس وەهەموو
بە جۆرێك نەلێی بفرۆشرێت وە نەبیەخشرێت و نەبەمیراتیش بدرێت و جیهاد کردن
بکرێت بە صدقە بۆ هەژاران و خزمە نزیکەکانی خۆی بۆ ئازادکردنی بەندە لێی بخوات
لە پێناوی خواو وەبۆ ڕێبواران وە میوان و بۆ ئەو کەسەش بەڕێوەی دەبات
بەگوێرەی پێویست بەجۆرێك نەیفرۆشێت و بیکات بە ماڵ).

پیاوێك بە تەنها دەرچوو بۆ خەیبەر بەشەو جنۆکە شوێنی کەوتن پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:
ﷺ قەدەغەی کرد کەلەو کاتەدا مرۆڤ بە تەنها بڕوات لە ئیبن عەباسەوە دەرۆیشت و وتی:
پیاوێك گەڕایەوە لە خەیبەر دوو پیاو شوێنی کەوتن پیاوێك بەدوایاندا بوون من
بگەڕێنەوە هەتاکو گەیشت پێیان و گەڕاندنیەوە پاشان وتی: ئەوە دوو شەیتان بە پێغەمبەری
بەردەوام بووم لەگەڵیان هەتا گێڕاندمنەوە ولەتۆم دوورخستنەوە ئەگەر دان ئەگەر
خودا ﷺ گەیشتی سەلامی لێبکە پێی بڵێ ئێمە لەکۆکردنەوەی زەکات و صدقە
پێی باش بوو، ئەوە بۆی ڕەوان دەکەین، پیاوەکە کاتێك گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری
خودا ﷺ ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە لەو کاتەوە پێغەمبەر ﷺ تەنهایی قەدەغە کرد لە مانەوە
و ڕۆیشتندا)[٧٨٨].

پێغەمبەری خودا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی نارد بۆ خەملاند و حساباتی خورمای
خەیبەر لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ عبدوڵڵای کوڕی

---

[٧٨٧] اخرجه: البخاري (٢٧٣٧)، ومسلم (١٦٣٢)، وابوداود (٢٨٧٨)، والترمذي (١٣٧٥) وقال حديث حسن صحيح، والنسائي (٦/٢٣٠) (٣٥٩٩)، وابن ماجة (٢٣٩٦)، والبيهقي (٦/١٥٨)

[٧٨٨] اخرجه: احمد (١/٢٧٨) رقم (٢٧١٩) وقال محققه اسناده صحيح، وابويعلى (٤/٤٦٠)، والحاكم (٢/١٠٢) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي واللفظ له، وقال الحافظ والعراقي في (تخريج الاحياء) (٢/٢٥١) رواه احمد بسند صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٦٥٨)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦٨٥)حديث صحيح.

ڕەواحەی نارد بۆ خەمڵاندنو حساباتی دارخورماکان بەرلەوەی لێی بکرێتەوە ولێی بخورێت پێشان جولەکەکانی سەرپشك کردن لەوەی کە بەو خەمڵاندنە لێیان وەردەگرن یاخود بۆی بگێڕنەوە بەو حساباتە تاکو زەکاتی لێ هەژماربکرێت بەرلەوەی لێبکرێتەوە لێی بخورێت وەبڵاوەی پێبکرێت)[٧٨٩]. پێغەمبەر ﷺ فرمانی کرد بە عەبدوللای کوڕی ڕەواحە کە خورمای خاپەڕۆك و خراپ نە خەمڵێنێت لە جابرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دەرکرد زەکاتی سەرفترە صاعێك خورما بێت، پیاوێك خورمای خراپی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بە عەبدوللای کوڕی ڕەواحەی فەرموو: ئەو جۆرە خورمایە مەخەمڵێنەو حسابی مەکە ئینجا قورئانی پیرۆز دابەزی لەسەر ئەمە و خودای گەورە فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾(البقرة: ٢٦٧) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! لەو ماڵە چاك وپاکە کە لەڕێگەیەکی پەسەندوو حەڵاڵەوە بەدەستتان هێناوە، لەوەش کە لەزەوی دەرمان خستووە بۆتان ببەخشن وە هەروەها لەو بەروو بووانەش لەزەویدا بۆمان ڕواندوون بەدوای بەخشینی شتێکی ناپوخت و بێ کەلکی وادا مەگەڕێن، واتە: مەچن خراپەکەی لێ جیا بکەنەوەو بیدەن لەڕێگەی خوادا لەکاتێکدا -خۆخۆشتان بن- لەباتی ئەوهەژارە گەر چاوپۆشی نەکەن وەری ناگرن، باشە! ئەی خوای گەورە- کە لەهەموو شتێك بێنیازە - چۆن وەری دەگرێ؟ چاك بشزانن کە بەڕاستیی خوا لەگشت بەخشینێکی ئێوە دەوڵەمەندو بێ نیازەو، کەڵکەکەیشی بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە، سوپاس کراویشە، تەنها هەر ئەویش شایەنی سوپاسە﴾))[٧٩٠].

---

[٧٨٩] أخرجه: ابي داود (٣٤١٣).

[٧٩٠] أخرجه: الحاكم (٢/٢٨٣) صححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

# ناپاکی جوولەکە و دەرکردنیان لە خەیبەر

ئیبن سعد (رحه الله) بەسەنەدێکی (مرسل) هێناویەتی و دەفەرموێت: (مانگی محرم ساڵی (٧) کۆچی هات سەرکردە و پیاو ماقوڵانی جولەکە هاتنە لای لبیدی کوڕی ئەعصم کەجولەکەیەکی دووڕووبوو لەمەدینەدا دادەنیشت، پێیان وت: ئەی ئەبو ئەعصم تۆلە هەمووان شارەزاتریت بە سیحر) سیحرمان لە محمد بۆ بکە ئێمە سیحرمان لێکرد وهیچ شتێکمان بۆ لەگەڵ نەکرا ئێمە شتێك دەدەین بەتۆ گەر سیحرێکمان بۆ بکەیت لەئەو و نوزەی لێبڕی و بڕی سێ دیناری زێڕپاندایە)[٧٩١]. ئەو جولەکە دووڕووە هەستا بەکردنی ئەو سیحرە لە پێغەمبەری خودا ﷺ چۆنیەتی ئەو سیحرکردنە بەدرێژی هاتووە لە فەرموودەکەی عائیشە دایکی باوەڕدارانذا (رضي الله عنها) وەبۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((سیحرلە پێغەمبەری خودا ﷺ کرا لەلایەن جولەکەیەکی بەنی زوریق بە ناوی لبیدی کوڕی ئەعصەم))[٧٩٢]. [ئەو جولەکەیە زۆر زۆر سەردانی پێغەمبەری خودای ﷺ دەکرد چەندین گرێی سیحری لێ گرێدابوو پاشان کردیە بیرێکی پیاوێکی ئەنصارییەوە هەتاکو پێغەمبەری خودا ﷺ][٧٩٣]. [وای لێهات کە نەیدەتوانی بچێتە لای هاوسەرەکانی. سوفیان دەڵێت: ئەوە توندترین جۆری سیحرە][٧٩٤]. عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ شەش مانگ بەو شێوەیە مایەوە وایدەزانی دەتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات بەڵام نەیدەتوانی][٧٩٥].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ دوچاری ناڕەحەتی و نازاربوو چەندین ڕۆژ]. عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [هەتا

---

[٧٩١] أورده الحافظ في (الفتح) (٢٢٦/١٠).

[٧٩٢] أخرجه: احمد (٩٧/٦)، ومسلم (٢١٨٩) واللفظ له، وابن ماجة (٣٥٤٥)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (٢٨٥٦).

[٧٩٣] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٠١١)، وصحح اسناده الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٧٦١).

[٧٩٤] أخرجه: البخاري (٥٧٦٥) (٦٠٦٣).

[٧٩٥] أخرجه: احمد (٦٣/٦) وقال الحافظ في (الفتح) (٢٢٦/١٠)اسناده صحيح.

نەوەبوو ڕۆژێکیان] یاخود شەوێك لەلای من بوو پێغەمبەری خودا ﷺ دوو جار بانگی کردم پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە واهەست دەکەم خودا چاکیکردمەوە لە سیحرەکە و ڕزگارم بوو لێی دوو پیاو هاتن بۆلام یەکێکیان لە لای سەرمەوە دانیشت ئەوی تریشیان لەلای قاچمەوە ئەوەی لای سەرمەوە بوو بەوەی تری دەوت: یاخود بە پێچەوانەوە! ئازاری ئەو پیاوە چییە؟ وتی: سیحری لێکراوە وتی: کێ سیحری لێکردوە وتی: لبیدی کوڕی ئەعصم][٣٩٦]. [پیاوێك بوو لە لە بەنی زریقی خزرەجی جولەکەبوو وەك دووڕوو خۆی دەردەخست لە ژێرەوە هاوپەیمانی جولەکەکان بوو][٣٩٧]. [هاتۆتە خزمەتی و چەندین گرێی لە داوێن داوە و فڕێی داوەتە ناو بیری فلان کەسیەوە گەر پیاوێك بنێریت پەتکەکە بێنێت دەبینین کە ئاوەکەی زەرد کردووە وتی: لەچ شتێکدا دایە بەچی کراوە؟ وتی: لەپرچ و داو لە شانەیەك ئالێنراوە بە لقی خورمایەکی نێرەوە]، [لە ژێر بەردێك دایە][٣٩٨] دەڵێت: لە کوێیە دەڵێت: لەناو بیرێکی ناو بۆگەندایە کەبۆ خواردنەوە دەست نادات [پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ] [لەخەو هەستا بەیانی لەگەڵ هاوەڵانی][٣٩٩] چووە لای بیرەکە سەیری کرد دارخورمایەکی لەسەرە][٤٠٠]. [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دەرکرد جادوەکەیان هێنا][٤٠١]. [گرێکانیان کردەوە][٤٠٢] هەرکاتێك [گرێیەکیان دەکردەوە پێغەمبەری خودا ﷺ لەشی سوکتر و چالاکتر دەبۆوە]، لە کۆتایدا پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا وەك ئەوەی کە لە دوای گرتن و بەستنەوە ڕزگاری بوو بێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((هذه البئر التي

---

[٣٩٦] أخرجه: احمد(٣٦٧/٤) وقال الحافظ العراقي في تخريج (الاحياء) (٣٧٨/٢) اسناده صحيح وقال الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٣٨٠٢) صحيح الاسناد.

[٣٩٧] أخرجه: البخاري (٧٥٦٥).

[٣٩٨] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٠١١) وقال الهيثمي (المجمع) (٢٨١/٦)، ورواه الطبراني باسانيد ورجال احدهما رجال الصحيح، قال الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٧٦١) اسناده صحيح.

[٣٩٩] أخرجه: البخاري (٥٧٦٥).

[٤٠٠] أخرجه: البخاري (٥٧٦٦).

[٤٠١] أخرجه: احمد (٦٣/٦)، والبخاري (٥٧٦٥).

[٤٠٢] أخرجه: احمد (٣٦٧/٤)، والنسائي (١١٢/٧)، وقال الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٣٨٠٢): صحيح الاسناد.

ارئُيها والله كان ماءها نُقاعة الحناء وكانَّ رؤوس نخلها رؤوس الشياطين)[٨٠٣]. واتە: (ئەم بیرەوو کەمن لە خەودا بینیم وەڵلاهی ئاوەکەی دەڵێی تێکەڵ بەخەنەگراوە سەری لق و پۆپ و دارخورماکەی دەڵێی سەری شەیتانەکانە). [پاشان گەڕایەوە بۆلای خاتوو عائیشەو فەرمووی]: (ئەی عائیشە وەڵلاهی ئاوەکەی دەتوت تێکەڵی خەنە کراوە سەرپۆپی دارخورماکانیش دەتوت سەری شەیتانەکانە)[٨٠٤]. عائیشە (رضي الله عنها) وتی: (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ نایسوتێنیت و جادوەکەی بۆ [خەڵکی] ئاشکرا بکەیت فەرمووی: ((نەخێر من خوای پەروەردگار [چاکی کردمەوە شیفای بۆ ناردم] پێم ناخۆشە خراپەم بۆ [هیچ کەسێك هەبێت] فەرمانی کرد ئەو جادوە لە شوێنێکدا لە ژێر خاکدا بشارنەوە)[٨٠٥]. [ئەو پیاوە جولەکەیەش لەدوای ئەم ڕووداوە دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، وە پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ قسەیەکی پێنە دەوت سەرزەنشتیشی نەکرد لەوبارەیەوە][٨٠٦]. [وەدەموچاویشی لێ گرژ نەکردوون بەجۆرێك هەست پێ بکات) هەتا کۆچی دوایی کرد][٨٠٧].

ناپاکی جولەکەکانی خەیبەر لەوەوە دەرکەوت کە سکاڵای توندو تیژی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەیان ﷺ لە حسابات و خەملاندنی کەڵ و پەلەکان و بەرووبومەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وە هەوڵیشیاندا کەبە بەرتیل عەبدوڵلا ڕازی بکەن بۆ ئەوەی بەشی زیاتریان پێبدات ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە هەموو ساڵێك دەچوو بۆ حسابات و خەملاندنی بەرهەمەکانیان وە سەرۆکاری دەکردن)[٨٠٨].

---

[٨٠٣] أخرجه: الطبراني (٥٠١٦)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٧٦١) اسناده صحيح.

[٨٠٤] أخرجه: البخاري (٥٧٦٦).

[٨٠٥] أخرجه: احمد (٩٦/٦)، البخاري (٥٧٦٥)، ابن حبان (٦٥٨٣) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما.

[٨٠٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٠١١).

[٨٠٧] أخرجه: احمد (٣٦٧/٤)، والنسائي (١١٢/٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٣٨٠٢).

[٨٠٨] أخرجه: ابن حبان (٥١٩٩)، وقال محققه: اسناده صحيح واللفظ له، والبيهقي (الكبرى) (١١٤/٦)، و(الدلائل) (٢٢٩/٤).

[کاتێك خورما پێدەگەیشت بەرلەوەی لێی بخۆن][٨٠٩]. ئەو جارە هات و نیوەی بۆ دیاریکردن و پێی دان بەبێ کەموکوڕی جولەکەکان هاتنە مەدینەو سکالایان لەدەست وردی خەملاندو هەژمارکردنەکەی کرد لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە بەلایەکی تردەوە ویستیان بەبەرتیل ڕازی بکەن). [تاکو چاوپۆشیان لێبکات هەندێك لە زێرو خشڵی ئافرەتەکانیان بۆ هێنا بوو] وتبوویان ئەمە گشتی بۆ تۆ بەس چاوپۆشی بکە لەبەشەکەمان واتە: بەزیادە بماندەیە عەبدوڵلا ﷺ وتی: ئەی دوژمنانی خوا بەرتیلم بەرخوارد دەدەن وەڵلاهی من هاتووم لەلایەن خۆشەویسترین کەس لەناو خەڵکی بەلامەوە وە ئێوەش لەهەموو خەڵك زیاتر ڕقم لێتانە وەك بەرازو مەیمونن][٨١٠]. [پێغەمبەری خودا دەکوژن و درۆ بەدەم خوداوە دەکەن] بەڵام دڵنیا بن لە ڕق لێبوونەوەم لەئێوە وخۆشەویستیشم بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ وام لێ ناکات نادادگەریتان بەسەردابکەم)[٨١١].

[کردوومە بە بیست هەزار بار خورما ئەگەر دەتانەوێت بەو جۆرە ئەوە بۆ خۆتان وەئەگەر ناتانەوێت بۆمن؟ وتیان: هەربەو دادپەروەریە ئاسمانەکان و زەوی ڕاوەستاون...][٨١٢].

[...ئینجا وتیان ئێمە ڕازی بووین ئەوبەشە وەرگرین کە تۆ دیاریت کردووە بۆمان][٨١٣].

عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ﷺ یەك ساڵ سەرۆکاری هەژمارکردنی بەروبومەکانی کردن پاشان لە ساڵی(٨)ی کۆچی لە جەنگی موئتە)دا شەهیدکرا، لە عبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی حزم دەڵێت: ((عبدوڵلای کوڕی ڕواحە سەرۆکاری هەژمارکردن و خەملاندنی بەروبومەکانی خەڵکی خەیبەری کرد ئەوەبوو لە جەنگ موئتە)دا شەهیدکرا پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ لەجیاتی ئەو جابری کوڕی صەخری کوڕی خەنسائی نارد بۆ حسابات و خەملاندنەکە))[٨١٤].

---

[٨٠٩] أخرجه: ابوداود (٣٤١٣).

[٨١٠] أخرجه: الواقدي (المغازي) (٦٩١/٢).

[٨١١] أخرجه: احمد (٣٦٧/٣)، وقال الشيخ الالباني في (غاية المرام) (٤٥٩)اسناده صحيح.

[٨١٢] أخرجه: احمد (٣٦٧/٣).

[٨١٣] أخرجه: ابوداود (٣٤١٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٩١٠).

[٨١٤] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢١٣٦)، وقال الهيثمي (المجمع) (٧٦/٣) مرسل اسناده صحيح.

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە ئەبوهورەیرەوە ؓ دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی بنی عەدیی ئەنصاری نارد بۆ خەیبەر تاکو سەرۆکاریان بکات][٨١٥]. بەو جۆرە ناپاکی جولەکەکانی خەیبەر بەردەوام بوو هەتاکو کارگەیشتە ئەوەی هاوەڵێکی پێغەمبەری خودایان ﷺ شەهیدکرد بەناوی عەبدوللای کوڕی سەهل ؓ و فڕێیاندایە ناو بیرێک لە بیرەکانی خەیبەر بەشاری کوڕی یەسار دەفەرموێت: (عەبدوللای کوڕی سەهلی کوڕی زەید و محیصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەیدی ئەنصاری ڕۆیشتن. . . [بۆ خەیبەر][٨١٦]. . . (بەهۆی ئەو ماندویەتیەی لە ڕێگا دوچاری بوون)[٨١٧]. [هەندێک خورمایان لێکردبۆوە بۆ خواردن][٨١٨]. لەوکاتەشدا دانیشتوانی خەیبەر، جولەکە بوون ڕێکەوتنی ئاشتی و دانوستانیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ هەبوو جولەکەکان [لەناوباخەکانیان] هەریەکە لەلایەک کاریان دەکرد بۆ خۆیان [هێرشیان کردە سەر عەبدوللای کوڕی سەهل سەریان بڕی پاشان فڕێیاندایە ناو ڕووبارێکەوە یاخود بیرێک یان چاڵێکی گەورە لەو جۆگە و ئاو کانیاوانەی خەیبەر بەم جۆرە لە هاوەڵەکانی بزربوو ئەوانیش کەوتنە گەڕان بەدوایدا هەتا دۆزییانەوە][٨١٩]. [لە چاڵێک لە چاڵەکانی خەیبەر][٨٢٠]. [موحیصە هاتە سەر عەبدوللا و بینی خەڵتانی خوێن بووە کوژراوە][٨٢١]. هاوەڵەکانی لەگۆڕێکدا شاردیانەوە ئینجا [هاتنە لای جولەکەکان محیصە وتی: وەللاهی ئێوە کوشتوتانە وتیان: وەللاهی ئێمە نەمان کوشتووە] [ناشزانین کێ کوشتوویەتی] پاشان بەرەو مەدینە گەڕاینەوە، برای کوژراوە کە عەبدول ڕەحمان کوڕی سەهل [لەگەڵ دوو ئامۆزاکەی] حویصەو محیصە [ڕۆیشتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ عەبدول ڕەحمان [کە لە هەر دووکیان بچوکتر بوو] ویستی

---

(٨١٥) أخرجه: البخاري (٤٢٤٦).

(٨١٦) أخرجه: احمد (٤/٥).

(٨١٧) أخرجه: مسلم (١٦٦٩) و(١٦٧٠-١٦٧١).

(٨١٨) أخرجه: احمد (٤/٥)، ابن ماجة (٢٦٧٧)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢١٦٨).

(٨١٩) أخرجه: احمد (٤/٣) (١٦٠٩٦)، وقال محققه الشيخ الارناؤوط حديث صحيح.

(٨٢٠) أخرجه: النسائي (٨/١٠)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٤٠٠).

(٨٢١) أخرجه: النسائي (٨/٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٣٩٦).

پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((گەورەترین کەستان باقسە بکات پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: ((گەورەترین کەستان باقسە پێش ئەوان قسە بکات پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون

بکات یاخود فەرمووی: بەتەمەنترین کەس لەنێوە بادەست پێ بکات))][٨٢٢]. لەگێڕانەوەیەکی تردا [عەبدول ڕەحمان لە کۆتایدا قسەی کرد سەرەتا حویصە پاشان محیصە ئینجا عەبدول ڕەحمان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هێرشیان بردۆتە سەر هاوەڵەکەمان و کوشتویانە وەلە خەیبەریش دوژمنمان نی یە تەنها جولەکەکان نەبێت][٨٢٣]. [پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: کێ بەتاوانبار دەزانن وتیان: ئێمە جولەکەکان بەتاوانباری ئەم تاوانە دەزانین][٨٢٤]. [پێی وتن: بەلگەیەك بهێنن لەسەر ئەو کەسەی کوشتەیەتەی وتیان: هیچ بەلگەیەکمان نی یە][٨٢٥].

[پێغەمبەری خودا ﷺ نامەیەکی بۆ جولەکەکان نارد بەم شێوەیە یا ئەوتا خوێنی هاوەڵەکەمان دەوێت یاخود شەڕتان لەگەڵ بەرپا دەکەین ئەوانیش نوسیانەوە وەڵاهی ئێمە ئەمان کوشتووە، پێغەمبەری خودا ﷺ بە حویصەو محیصەو عەبدول ڕەحمانی فەرموو: [ئایە پەنجا جار سوێند دەخۆن بۆ ئەوەی] [خوێنی هاوەڵەکەتان] وەرگرنەوە وتیان: [ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ] [چۆن سوێند بخۆین نەبینیومانە نە لەوێش بووین][٨٢٦]. ([وتیان: ئێمە ڕازی فەرمووی: کەواتە جولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن وتیان: ....)

[٨٢٢] أخرجه: النسائي (١١/٨)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٤٠١).

[٨٢٣] أخرجه: احمد (٣/٤) (رقم: ١٦٠٩٦) وقال محققه: حديث صحيح.

[٨٢٤] أخرجه: النسائي (١٠/٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٣٩٩).

[٨٢٥] أخرجه: النسائي (١١/٨)، والطبراني (الكبير) (٥٦٢٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٤٠١).

[٨٢٦] أخرجه: ابي داود (٤٥٢٠-٤٥٢١)، والترمذي (١٤٢٢) وقال حسن صحيح، وابن ماجة (٢٦٧٧)، والنسائي (٧/٨)، ابن حبان (٦٠٠٩)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٧٩٣)، و(صحيح الترمذي) (١١٤٩)، و(صحيح النسائي) (٤٣٩٢)، و(صحيح ابن ماجة) (٢١٦٨)، و(الارواء) (١٦٤٦).

نابێن بە سوێند خواردنی جولەکەکان] [چونکە ئەوان موسوڵمان نین][٨٢٧]. [ئەوان ئێستاش لەسەر بێ باوەڕی سورن کەگەورەترە لەوەی کە سوێند بخۆن لەسەر تاوان][٨٢٨].

[پێغەمبەری خودا ﷺ زۆری پێناخۆش بوو کە ئەم کارەی بەم شێوەیە بینی خوێنی ئەو هاوەڵە بەڕێزەش بە فیڕۆ بڕوات ناچار پێغەمبەری خودا ﷺ سەد وشتری [وەك فیدیە بۆناردن کە لە لای بوو لەماڵی صدقە] هەتاکو چوونە ناو ماڵەکەی سەهل دەڵێت: هەتاکو ئەو ڕۆژەدا وشترێکی سوریان لەقەیەکی لێدام][٨٢٩]. بەو شێوەیە هەروەك یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان دەڵێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ بڕیاری دا بەسوێند دان و خوێن وەرگرتنەی کەلەسەردەمی نەفامیدا هەبووە][٨٣٠].

جولەکەکانی خەیبەر هەربەوەشەوە نەوەستان لەسەر ئەو تاوانانە بەردەوام بوون بەڵکو هێرشیان کردە سەر عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەست و قاچەکانیان لە جێیان لەناو زەوی خۆی لەخەیبەر لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەطابدا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: ((من و زوبێری کوڕی عەوام و میقدادی کوڕی ئەسوەد ڕۆیشتین بۆ خەیبەر بۆ سەر زەوی و زارو موڵکەکانمان لەسەر وەختی بەرهەمیان بوو کاتێك گەیشتینە ئەوێ بڵاوەمان لێکرد بەسەر موڵك و زەویەکانماندا لەشەودا هێرشیان کردە سەرم من نوستبووم لەسەر جێگەکەم دەستەکانمیان لە ئانیشکمەوە شکاند کاتێك بەیانی بۆوە هاوەڵەکانم بانگیان کردم و هاتنە لام پرسیاریان کرد ئەوە کێ وای بەسەرهێناویت؟ وتم: نازانم دەستەکانمیان هەڵبەستەوە و پاشان بردیانمە خزمەت خەلیفە عومەرﷺ))[٨٣١].

---

[٨٢٧] أخرجه: البخاري (٦٨٩٨)، ومسلم (١٦٦٩).
[٨٢٨] أخرجه: احمد (٣/٤) رقم (١٦٠٩٦) وقال محققه: حديث صحيح.
[٨٢٩] أخرجه: النسائي (١١/٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٤٠٢).
[٨٣٠] أخرجه: مسلم (١٦٧٠) النسائي (٥/٨) وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٤٣٨٩).
[٨٣١] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤١٢/٣) رقم (٨٨١) وقال محققاه: اسناده حسن، واخرجه احمد (٩٠) وقال محققه: اسناده حسن.

لەگێڕانەوەیـەکی تـردا [کاتێـك سـەردەمی عومـەر ؓ هـات فـرت و فێڵیـان لـە موسوڵمانەکان دەکـرد عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەریان لەسـەربانەوە فڕێدایـە خـوارەوە][٨٣٢] بەهۆی ئەو تاوانە قێزەونانەی ئەنجامیانـدا عومـەری کوڕی خـەطاب ؓ دەریکردن. ئیبن عومەر ؓ دەفەرموێت: ((ئـەو کاتـەی خـەڵکی خەیبـەرمنیان فڕێدایە خـوارەوەو دەستیان شکاندم عومـەری کـوڕی خـەطاب ؓ هەسـتا وتـارێکی خوێنـدەوە وتـی: ئـەی خەڵکینـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کرێکارەکـانی جولەکـەکانی خەیبـەری دانـابوو بەسـەر ماڵەکانیانـەوە وپێی فـەرموو بـوون: ((بمێننـەوە تیایـدا ئەوەنـدەی مـاوەی مانـەوەتان پـێ بـدەین)) [وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کردینـە سـەرکاری خەیبـەر بـەو مەرجـەی هـەرکاتێك ئێمە ویستمان دەریان بکـەین بـەو جۆرەیـان لەگـەڵ بکـەین] وە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر ؓ چووە سـەر موڵکەکانی و لەوێ بەشەو هەڵیان کوتایە سەری وە دەست و قاچیان شاکاندووە لەگـەڵ ئـەو دوژمن کاریەی [لەگەڵ هاوەڵە ئەنصاریەکان ئەنجامیاندا لەوە پێش] وە ئێمە لـەو ناوچەدا جگە لەئەوان هیچ دوژمنێکی ترمـان نیـە وە ئـەوانیش تۆمـەتبار دەکـەین من وای بـەباش دەزانم دەریان بکەین لەناوچەکە)[٨٣٣]. [لەبەرئـەوە هەرکەسێك بەشێکی هەیە لـە خـەیبەر بـاڕای بگرێـت هـەتا دابەشـی دەکـەین مـن جولەکـەکان دەردەکـەم، پاشـان دەریکـردن لـە خەیبەر] کاتێك عومەر ؓ ڕای گشتی وەرگرت لەسەر ئەوە یەکێك لەکوڕانی بـەنو حـەقیق فالە خزمەتی [کەسەرۆکیان] بوو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەرمـان دەکـەیت لەکاتێکـدا محمد ﷺ دوای ئـەویش ئەبوبـەکر ئێمـەیان لێـرە نیشتەجێ کـردووە کەلەسـەرماڵو موڵکی خۆمان کاربکەین بەو مەرجانەی لەنێوانمانـدا هـەبووە عومـەر ؓ وتـی: وا گومـان دەبـەیت من فەرموودەیـەکی پێغەمبـەرم لـەبیر چـۆتەوە کـە فـەرمووی: ((چـۆن دەبێـت کاتێـك لەخەیبەر دەردەکرێت خۆت وشترەکان بەرەو [شام دەکەوتنە] ڕێ شەو لەدوای شەو)). وتی: ئەوە سوبعەت و گاڵتەیەکی ئەبوقاسم بووە عومەر ؓ وتـی: درۆت کـرد ئـەی دوژمنـی خـوا پاشان هـەموویانی دەرکـرد)[٨٣٤]. (بـەرەو تیمـاء واریحا) ئـرخ و بەشـی خۆیـانی پێدان لـەو

---

[٨٣٢] أخرجه: البيهقي (الكبرى) (٦/١١٤)، وابن حبان (٥١٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٨٣٣] أخرجه: البخاري (٢٧٣٠).

[٨٣٤] أخرجه: ابن حبان (٥١٩٩) وقال محققه: اسناده صحيح.

شتانەی بەریان کەوت لە ماڵەکانی خۆیان وەلەبەروبوم و پارەو پول وشترو ماڵات و هەروەها کەل و پەل و پێویستی ماڵ و ئەوەندەی بە بارو کۆچ بگوازرێتەوە [ئینجا عومەری کوڕی خەطاب هەمووی دابەش کرد لەنێوان ئەوانەی بەشداری غەزای خەیبەریان کردبوو لە پەیمانی حودەیبیەش لەگەڵ پێغەمبەری خودا بوون][٨٣٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا [ئیمامی عومەر ﷺ خەیبەری دابەش کرد بەسەر هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا ﷺ وە سەرپشکی کردن لەوەی کە بەشیان بۆ دیاری بکرێت لە زەوی و زار وکانی و ئاو یاخود بەبڕی دیاریکراو لە بەروبومیان بە پێوانە وبار پێ بدرێت هەندێکیان زەوی و زاریان هەڵبژارد و هەشیان بەبوو بەرهەمی دیاریکراو بەبارو پێوانەی هەڵبژارد خاتوو عائیشە زەوی و زاری هەڵبژارد][٨٣٦]. بەو شێوەیە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ جولەکەکانی وەدەرنا لە ناوچەکانی خەیبەر وەرێگەی دابەئەوانەی بۆ بازرگانی هاتبوونە ناوچەکە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بمێننەوە)[٨٣٧].

دوای ماوەیەکی زۆر لەدەرکردنی جولەکەکان پڕوپاگەندەیەکیان بڵاوکردەوە کە گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ نوسیون لەسەر ئەوەی (جزیە) و سەرانەیان لەسەر لاچووە ئەو نوسراوەیان بەدەرخست و کەوتنە بانگەشە بۆکردنی لەسەردەمی ئیبن جریر(٢٢٤ -٣١٠ك) وەلەسەردەمی (خطیبي بغدادي)(٣٩٢ - ٤٦٣ك) خطیب دەریخست کەئەونوسراوە درۆیەوە بەساختە نوسراوە لەچەندین ڕووە وە دووبارە دەریانخستەوە لەسەردەمی ئیبن تیمییە (٦٦١- ٧٢٨هـ) وئیبن قەیم دەڵێت: لە کتابی (المنار المنیف)دا (ص: ١٠٥) ئەو کیتابەیان خستە بەردەم شێخی ئیسلام ئیبن تیمییە جولەکەکان دەیانویست ساختەکاری تێدابکەن و بەگەورە بیخەنە بەرچاو بە ئاوریشم ڕوکارەکەیان — پۆشی بوو کاتێک کردیەوە لێی وردبۆوە تفێکی لێکردو وتی: ئەوە کیتابێکی پوچ و هەڵبەسراوە لەچەندین ڕووەوە و هەمووشی بۆ باس کردن ئینجا بەرپسوای و سەرشۆڕیەوە لەخزمەتیدا هەستان و ڕۆیشتن، ئیبن قەیم پوچیەتی و بێ ناوەڕۆکی ئەو نوسراوە لە چەندەها ڕووە وە باس دەکات لە کتابی (المنار المنیف) (ژ١٩٢، لا١٠٢) ، وە (الحافظ ابن کثیر

---

[٨٣٥] أخرجه: البخاري (٢٣٣٨).

[٨٣٦] أخرجه: البخاري (٢٣٢٦).

[٨٣٧] انظر: (التلخیص الحبیر) (٢/٤٦)، و(مختصر البدر المنیر) (٢٦١٣) عن مالك.

لە البدایة ٢٢٠/٤) دەفەرموێت: دوای حەوت سەد ساڵ جولەکەکان ئەو نوسراوەیان دەرخست وەك نوسراوەکەی کە (ابن الصباغ، ابو حامد، ابو یعلي) لەنوسینەکانیاندا هەڵوەستەیان لەسەر کردبوو وەمنیش تەماشام کرد درۆ و هەڵبەستراوبوو چونکە ئاماژە دەکات بە شایەتی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ لەکاتێکدا ئەو لە پێشدا لە غەزای (بەنی قورەیظە)دا شەهید بووە بەهۆی خوێن بەربوونی برینێکی کەلە (غەزای خەندق) بەتیر لەشادەماری قۆلی درابوو لەساڵی (٥) کۆچی بەرلە غەزای خەیبەر، هەروەها تێیدا هاتووە ئاماژە بە شایەتی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەکات کەلەو کاتەدا موسوڵمان نەببوو وە لە کۆتایشدا علی کوڕی ئەبو طالب ﷺ نوسیویەتی وە هەڵەی ڕێزمانی و ناڕێکی زۆری تێدایە لەگەڵ دانانی (حزیە) واتە: سەرانە کەلەو کاتەدا یاسایەکی ئیسلامی نەبووە لە شەریعەتدا وەباسی ئەوەش دەکات لەدەوروبەری ساڵی (٩)ی کۆچی وەك وەفد چوونە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

# نامە ناردن بۆ سەرۆك و پادشاکان

لەدوای رێکەوتننامەی حودەیبیە و خەیبەر و مل پێ کەچ کردنی جولەکەکانی باکوری حیجاز، پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی بانگەوازی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام بگەیەنێتە دەرەوەی دوورگەی عەرەبی، ئەم هەنگاوە تازەشی بۆ بەگخستنی دوورگەی عەرەبی و ئەرکی هەڵگرتنی ئەم ئیسلامە بۆ سەر شانی گەلانی تری جیهان بوو تاوەکو لەوە دڵنیایان بکاتەوە و بیسەلمێنێت کە ئەم پەیامە بۆ گشت جیهانە، نامە ناردن و ئاڵوگۆری نامەکان بۆ سەرۆك و پادشاکان ئاشکراکردنی ئیسلام بوو لەلایان، بۆ ئەوەش موسوڵمانەکان لەو رێگایەوە شارەزایی هەڵوێست و پەرچەکرداری سەرۆك و پادشاکانی سەر رووی زەوی بن و بیروڕای ئەوان و نەخشە و پلانەکانی داهاتووی ئەوانیان بۆ روون بێتەوە لەمەڕ ئیسلام و موسوڵمانەکان وە لەرێگای ئەم نامە گۆڕینەوە پردێکی پەیوەندی نوێ کرایەوە و وایکرد موسوڵمانەکان بتوانن خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ پەیڕەوکردنی نامەیەکی سیاسی و سەربازی بۆ قوناغی داهاتوو جیا لە قوناغەکانی پێشوو تر بەجۆرێك جێبەجێ کردنی ئەم رێسایە ئیسلام بێت کە پێویستە لەسەرەتادا شەڕو کوشتاری هیچ کەس نەکەن هەتاکو بانگەوازی و ئیسلامی پاك و دوور لەشیرکیان پێ بگەیەنن.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نامەی نوسیوە بۆ کیسرای پادشای فارس و قەیسەری رۆم و نەجاشی حەبەشی و بۆ هەموو خاوەن دەسەڵاتێك تێیدا بانگەوازی کردوون بۆ باوەڕهێنان بەخودای گەورە وبالادەست)[٨٢٨].

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی ئەمر وفەرمان بکات بەنوسینی نامەکان بۆ سەرۆك و پادشاکان هاوەڵانی ئاگادارەیان کرد بەدروست کردنی مۆرێکی تایبەت بەخۆی لەبەر ئەوەی سەرۆك و پادشاکان نامەی بێ مۆر وەرناگرن و نایخوێننەوە و بایەخی پێ نادەن.

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی نامە بنوسێت بۆلای رۆمەکان و [خەڵکانی نەتەوەکانی غەیری عەرەب] لەخزمەتیا عەرزیان کرد [کە ئەوانە هیچ نامەیەك وەرناگرن گەر مۆری لەسەر نەبێت] وە نامەکەشت ناخوێنەوە ئەگەر

---

[٨٢٨] أخرجه: مسلم (١٧٧٤)، والترمذي (٢٧١٦)، والبيهقي (١٠٧/٩).

پێغەمبەری خودا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی دەست خست مۆر نەکرابێت [ئەوە بوو [بەدروست کردنی داو نوسراوێکی لەسەر نووسی] [بەسێ دێڕ: (محمد) [حەبەشییەک] بوو دێڕێک، (رسول) دێڕێک، (الله) دێڕێک]. [فەرمووی: ((اني اتخذت خاتماً من ورق ونقشتُ فيه: محمد رسول الله فلا ينقشنّ احدٌ على نقشه)) واتە: ((من ئەنگوستیلەیەکی زیو دەکەمە مۆر و ئەم دەستەواژەیەی تێدا هەڵدەکەنم: (محمد رسول الله) باهیچ کەس لە ئێوە لەسەر ئەو شێوازە نەخشە سازیە هەڵنەکەنێت)). ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (من بریسکەی ئەنگوستیلەکەم دەبینی لە پەنجە توتەی پێغەمبەردا) [ئەو ئەنگوستیلەیە مۆری پێغەمبەری خودا ﷺ بوو وە لە دەستیدا بوو، لە دوای پێغەمبەر ﷺ لە دەستی ئەبوبەکردا بوو ﷺ، لەدوای ئەبوبەکر ﷺ لەدەستی عومەردا بوو ﷺ، بەڵام لەسەردەمی عوثمان ﷺ دانیشتبوو لەسەر بیری (ئەریس) لە دەستی کرد بۆوە و دەیهێنا و دەیبرد ئەوە بوو لەدەستی کەوتە خوارەوە سێ ڕۆژ لەگەڵ عوثمان ﷺ گەڕان بەدوایدا و ئاوی بیرەکەشیان ئەودا نەیان دۆزیەوە))[839].

هەر لەو بارەوە ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ئەنگوستیلەی لە دەستی ڕاستی دەکرد نەخشە هەڵکەنراوەکەی کەوتبووە سەر دەستی)[840]. لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: [پێغەمبەری خودا ﷺ ئەنگوستیلەکەی لەپەنجە توتەی دەستی چەپیدا بوو][841].

ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خودا ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی زیوی لەدەستدا بوو بەجۆرێک نەخشی هەڵکەنراوەکە کەوتبووە سەر دەستی، ئەم دەستەواژەی لەسەر هەڵکەنرا بوو (محمد رسول الله) بەردەوام لە دەستیدا بوو هەتا کۆچی دوای کرد)[842].

---

[839] أخرجه: البخاري (٥٨٧٢، ٥٨٧٤-٥٨٧٩)، ومسلم (٢٠٩٤).

[840] أخرجه: احمد (٤٩٠٧) وقال محققه: اسناده قوي، وابوالشيخ في (اخلاق النبي ﷺ) (برقم: ٣٤٣) وقال محققه: صحيح، وقال محقق (شرح السنة) (٣١٤٥): اسناده حسن.

[841] أخرجه: ابوداود (٤٢٢٨)، وابوالشيخ في (اخلاق النبي ﷺ) برقم (٣٥٧) قال محققه: اسناده صحيح، وقال محقق (شرح السنة) لبغوي (٣١٤٧): اسناده صحيح

[842] أخرجه: البخاري (٥٨٦٥، ٥٨٧٣)، ومسلم (٢٠٩١)، وابوداود (٤٢١٨)، وابن حبان (٥٤٩٤).

عومەری کوڕی خەطاب ﵁ لەبەر خواناسی خۆی ڕێگری دەکرد لەوەی خەڵك نەخشی سەر ئەنگوستیلەکانیان و نوسینی عەرەبی لەسەریان بەشێوازی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەبێت لەسەر ئەوەی کە لەفەرموودەکەی پێشوودا هاتبوو کە دەفەرموێت: ((.... باهیچ کەس لە ئێوە لەو شێوازە نەخش و هەڵکەنندنە لەسەر ئەنگوستیلەکەی نەکات کە لەوەی من بچێت))[843].

هەر لە ئەنەسەوە ﵁ دەفەرموێت: (ئیمامی عومەر ﵁ قەدەغەی کرد کە بە عەرەبی نوسین لەسەر ئەنگوستیلەکان هەڵبەکەنرێت)[844]. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە فەرموویەتی: (کە عومەر ﵁ دەفەرموێت: (لەسەر ئەنگوستیلەکانت بەزمانی عەرەبی مەنوسن و نەخش و هەڵکۆڵینی تێدا مەکەن)[845].

پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم کارە گرنگە کەسانێکی دەست نیشان کرد و ناردنی کە گەنج شۆخ و شەنگ و دەم وچاو جوان و خاوەنی ناوی خۆش بوون وە هەموو تایبەتمەندیەکی شاندی سەرکەوتویان تێدا بەدی دەکرا لە ئازایەتی وبوێری و بلیمەتی و دانایی و کەسایەتی سەنگین و بەهەیبەت و بەحەوسەڵەو لەسەرخۆ و زمان پاراو شارەزاو لێزان لە هونەرەکانی دانوستان و قسەکردن و چۆنیەتی دواندنی پادشاو سەرۆکەکان لەگەڵ ئەمانەشدا جوانی و پۆختی جلوبەرگ و ڕۆخساری دەرەوەیان خاوەنی لاشەو هەیکەلێکی شایستە وڕێك وپێك بەویقاربوون، وەپێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دەکرد بەهاوەڵانی، لەوبارەوە هەروەك دەفەرموێت: ((ئەگەر نامەیەکی ئێمەتان برد ویستان کەسێك وەك نامەبەر وسەفیر بنێرن ئەوە کەسێکی ڕووخۆش ودەم چاوجوان، ناوخۆش بنێرن))[846].

---

(٨٤٣) أخرجه: البخاري (٥٨٧٧).

(٨٤٤) أخرجه: البخاري (التاريخ الكبير) (١/٤٥٥) وقال الارناؤط: اسناده حسن (مسند احمد تحت الحديث رقم (١١٩٥٤).

(٨٤٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٥٦٢٥) وقال الارناؤط: اسناده صحيح (انظر: تحقيق مسند احمد تحت الحديث (رقم: ١١٩٥٤).

(٨٤٦) أخرجه: البزار (١٩٨٥) واسناده صحيح كما قال محقق (اخلاق النبي) لابي الشيخ رقم (٨٠١)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١١٨٦) و(صحيح الجامع) (٤٠٣).

ئیبن سەعد (رحمه الله) دەفەرموێت: (شەش کەس ڕۆیشتن لەیەك ڕۆژدا بۆ ئەم مەبەستە پێوش لەمانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو هەریەکەیان شارەزای زمانی ئەو گەلەبوو کە دەنێردرا بۆ ناویان)[817]. لێرەدا هەندێك لەنامەکانی پێغەمبەر ﷺ دەخەینە ڕوو باسیان دەکەین.

## ١-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە

پێغەمبەری خودا ﷺ عەمری کوڕی ئومەیەی ضەمری ﷺ بەنامەیەکی خۆیەوە نارد بۆلای نەجاشی پادشای حەبەشە (ئێستا وڵاتی ئەثیوبیایە و پایتەختی ئەدیس ئەبابایە زۆربەی دانیشتوانی گاورن) (کاتێك عەمر گەیشتە لای نەجاشی ئەوانەی لەلای نەجاشی بوو دەچوونە خزمەتی بەچەمانەوە و ملکەچیەوە لەدەرگای بچووکەکەوە دەچوونە ژوورەوە، عەمر کاتێك ئەو دەرگا بچووکەی بینی کەبەناچاری ئەو خەڵکە بە زۆر دەچەمێنەوە بەشێوەی ڕکوع و دەچنە ژوورەوە بۆلای پادشا، پشتی تێکردن ئینجا پشتاو پشت چووە ژوورەوە بۆ ئەوەی نەچەمێتەوە کاتێك لە دەرگاکە چووە ژوورەوە وخۆی ڕاست کردەوە بەڕێکی بەرەولای ڕۆیشت، ئەم هەڵوێستە حەبەشیەکانی دوچاری ڕاچڵەکین کرد کەوتنە بیری کوشتنی. وتیان بەنەجاشی: "ئەوە بۆچی بەوشێوەی ئێمە نەهاتە ژوورەوە؟ نەجاشی پرسیاری لێ کرد و وتی: چ شتێك ڕێگرت بوو وەك ئەوان بێیتەوە ژوورەوە؟ عەمر ﷺ وتی: "ئێمە ئەو شێوازە بۆ پێغەمبەرکەمان ناکەین گەر بۆ هەرکەسێکمان بکردایە بۆ پێغەمبەرەکەمان شایستە تر بۆ ئەنجام بدەین؟". نەجاشی وتی: "وازی لێ بێنن ڕاست دەکات")[818].

بەڵام دەقی نامەکە لە ئیبن ئیسحاقەوە (رحمه الله) هاتووە بەلاوازی (ضعیف) لەدوو ڕێگاوە یەکەم حاکم گێڕاویەتیەوە و هێناویەتی و(ذهبی)یش بێ دەنگ بووە لێی وە ئەمەش

(٨١٧) انظر: (الطبقات الكبرى) لابن سعد (٢٣/٢).

(٨١٨) اخرجه: الطبراني (الاوسط) (٤٨٩) قال محققه: اسناده ضعيف فيه عبدالله بن موسى صدوق كثير الخطا، وابن ابي شيبة (٣٧٧٨٣) وقال محققه: مرسل اسناده حسن، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٩/٨): رجاله ثقات.

دەقەکەیەتی: (ئیبن ئیسحاق (رحمه الله): (ئەم نامەیە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ محمد بۆنەجاشییە: ((بسم الله الرحمن الرحيم: هذا كتابُ محمد رسول الله الى النجاشي الأصحم عظيم الحبشي: سلامٌ على من اتبع الهدى وآمن بالله ورسوله وشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له لم يتخذ صاحبةً ولا ولداً، وان محمداً عبده ورسوله، ادعوك بدعاء الله، فاني أنا رسول الله فاسلم تسلم ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ ..﴾ (آل عمران: ٦٤) فان ابيت فعليك اثم النصارى))[٨٤٩] واتە: ((بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان ئەم نامەیە لە محمد نێردراوی خوداوە ﷺ بۆ نەجاشی ئەصحەم گەورەو خاوەنی شکۆی حەبەشە: سڵاو لەئەو کەسەی شوێن ڕێگای هیدایەت دەکەوێت، باوەڕ بەخودا و پێغەمبەرەکەی بهێنە و شایەتی بدە کەهیچ پەرستراوێك نیە بەحەق تەنها (الله) نەبێت وتاك و تەنهایە و هیچ هاوبەشی نییە هاوسەرو منداڵیشی نییە، و شایەتی بدە کە محمد بەندەو پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خودایە، بانگەوازت دەکەم بۆ لای خودا، من نێردرا و پەیامبەری خودام موسوڵمان بە سەلامەت دەبیت: وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەخاوەن نامەکان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر وشەو بەرنامەیەك سووربین کە بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانە، و پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری، و واز لەو تەفرەقەیە بێنن وەرن باجگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین، و هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك وهاوبەشی هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو پەرستراوین، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەکدی نەبین، جولەکە عوزەیریان بەخوا دادەنا، گاورەکانیش عیسا!...﴾ وە ئەگەر پشت هەڵکەیت و موسوڵمان نەبیت ئەوە تاوانی نەصاراکانی ژێر دەسەڵاتت لە ئەستۆدا دەبێت)).

ڕێگای دووەم طەبری (رحمه الله) هێناویەتی لە ئیبن ئیسحاقەوە (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ عەمری کوڕی ضەمری ﷺ نارد بۆ لای نەجاشی ئەصحەم پادشای حەبەشە کە لەنامەکەیدا بۆی نوسیبوو: ((سلّم انت فاني احمد اليك الله الملك القدوس السلام

---

[٨٤٩] اخرجه: الحاكم (٦٢٣/٢) برقم (٤٣٠٣) وسكت عنه الحاكم والذهبي لكن قال محقق الكتاب: سنده لابن اسحاق صحيح.

المؤمن المهيمن، واشهد ان عيسى ابن مريم روح الله وكلمته القاها الى مريم البتول الطيبة الحصينة فحملت بعيسى، فخلقه الله من روحه ونفخه كما خلق آدم بيده ونفخه، واني ادعوك الى الله وحده لا شريك له، والمولاة على طاعته وان تتبعن و تؤمن بالذي جائني، فاني رسول الله... ودع التجبّر فاني ادعوك وجنودك الى الله، فقد بلّغتُ ونصحتُ فاقبلوا نُصحي، والسلام على من اتبع الهدى)) واتە: ((سلاو لە تۆ و موسوڵمان ببە من سوپاس و ستایشی خودای گەورە دەکەم کە خاوەنی ئەم ناو وسیفەتانەیە (الملك، القدوس، السلام، المؤمن المهيمن) وشایەتی دەدەم کە عیسى کوڕی مەریەم ﷺ (روح) و (کلمە) ی خودایە بەخشیوەیەتی بەمەریەمی داوێن پاك و ڕەوشت بەرز خۆ پارێزی کردە دووگیان بەعیسى ﷺ، خودای گەورە دروستی کرد لە (روح)ی خۆی بەهۆی فو پێداکردنی فریشتەوە بە فەرمانی خۆی هەروەك ئادەمی دروست کرد بەدەستی خۆی و فوی پێدا کرد، من بانگەوازت دەکەم بۆ لای خودایەکی تاك و تەنها و بێ شەریك و هاوبەش، وەبۆ سوربوون لەسەر خۆشەویستی و پشتیوانی کردن لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی داوات لێ دەکەم کەشوێن ئەم بانگەوازە بکەویت و باوەڕت بەو پەیامە هەبێت کە من هێناومە دڵنیابە من نێردراوی خودام... دەست هەڵگرن لەخۆبەگەورەزانین و ستەم کردن تۆش و سەربازەکانیشت بانگ دەکەم بۆ لای خودا، ئەوە من پەیامی خۆمم پێ ڕاگەیاندن و ڕێگای هیدایەتم بۆ ڕۆشن کردنەوە ئێوەش ئامۆژگاری و ڕێنمایە خوایەکان وەرگرن وڕەتی مەکەنەوە، سلاو لەو کەسەی شوێن ڕێگای هیدایەت دەکەوێت). ئەجاشی لەوەڵامدا ئەم نامەی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ نوسی: (بەناوی خودای گەورەو میهرەبان، بۆ محمد پێغەمبەری خودا ﷺ، لەئەجاشی ئەصحەمی کوڕی ئەبجەر، سلاوی خودا ی خاوەن بەزەیی و فەڕو بەرەکەت لە تۆ بێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە خودایەکەوە کەبێجگە لە خۆی هیچ پەرستراوێك بەحەق بوونی نی یە، ئەو خودایەی کە منی ڕێنمونی کرد بۆ ئیسلام وهیدایەتی دام پاشان: نامەکەت گەیشتە لام ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەوێدا تێدا باست کردبوو عیسى ئەوەندەی ئەو توێکڵە تەنکەی خورما و دەنکەکەی زیاتری باس نەکردووە لەوەی کە تۆ فەرمووتە، لەوە تێگەیشتین کە ناردوتە بۆلامان ئێمەش ئامۆژاکەت و هاوەڵانیمان لە نزیك خۆمان داناوە و نیشتەجێمان کردوون شایەتی دەدەم بەو پەڕی ڕاستگۆیانەوە و لەناخی دڵەوە کە تۆ پێغەمبەری خودایت وبەیعەتت پێ دەدەم کوڕە مامە کەشت دەکەمە وەکیل بۆ بەیعەت دان و لەسەر دەستی

ئەو موسوڵمان دەبم و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگاری جیهانیان دەبم، والسلام علیك ئەی پێغەمبەری خودا)[٨٥٠]. (خالید سەیید عەلی) لە کیتابەکەی دا (رسائل النبی) (ص: ٨١) دەفەرموێت: وێنەی دەقی ئەو نامەیەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نەجاشی لە (اسکوتلاند) هەیە لەلای ڕۆژهەڵات ناس (د.م. دنلوب). پاشان نەجاشی دوو خوفی ڕەشی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ نارد لەگەڵ نامەکە (خوف: وەك گۆرەوی وایە لەپێ دەکرێت لە چەرم دروست دەکرێت) لەو بارەوە بورەیدە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (نەجاشی دوو خوفی ڕەشی سادەی بەدیاری نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئەویش لەپێی کردن و دەست نوێژی گرت و مەسحی لەسەر کردن بێ ئەوەی دایانێ و ڤاچی بشوات)[٨٥١].

لەگێڕانەوەیەکەدا لە خاتوو عائیشەوە (رضي الله عنها): دەفەرموێت: (نەجاشی [خشڵی ڕازاندنەوەی] بەدیاری بۆ پێغەمبەری ﷺ نارد [کەمەنگوستیلەیەکی زێڕی تێدا بوو] کەمەقش و هەلکەندی حەبەشی تێدابوو، (پێغەمبەری خودا هەڵیگرت ولێی جوان بوو خۆی حەزی پێ نەدەکرد یا خود لە پەنجەکانی دەکرد پاشان بانگی ئومامەی کچی ئەبو العاصی کرد کە کچی زەینەبی کچی بوو فەرمووی: ((تَحلَّی بهذا یا بُنَیّة)) واتە: ((کچم بەمەمە خۆت براڕازێنەوە))[٨٥٢]. (بەم شێوەیە ئەو نەجاشیە موسوڵمان بوو (نەجاشی نازناوی پادشاکانی حەبەشە بوو هەروەك چۆن سەرۆك کۆمار، سەرۆك وەزیران، پادشا هەیە) پێغەمبەری خودا ﷺ لەکاتی هاوسەگیری لەگەڵ خاتوو ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان کردی بەوەکیلی خۆی بۆ مارەبڕینەکەی (چونکە ئوم حەبیبە هاوسەرەکەی کە کوڕە پوری

---

[٨٥٠] أخرجه: ابن اسحاق (المغازي) (٢١٠)، وعنه الطبري (التاريخ) (٢/٦٥٢) وقال البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) برقم (٢٦٩): اسناده الى ابن اسحاق ضعيف وقد ذكره ابن اسحاق بلاغاً. هذا وان كان الحديث ضعيفاً ولكنه ثبت الكتابة الى النجاشي في حديث انس: (ان نبي الله ﷺ كتب الى كسرى والى قيصر والى النجاشي) اخرجه: مسلم (١٧٧٤).

[٨٥١] اخرجه: ابوداود (١٥٥)، والترمذي (٢٨٢٠) وفي (الشمائل) (٦٩)، وابن ماجة (٣٦٢٠)، ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٥٦٨٦)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٤٤)، و(مختصر الشمائل) (٥٨)، وحسنه الأرناؤط في تحقيق (شرح السنة) (٣١٥٠).

[٨٥٢] أخرجه: ابوداود (٤٢٣٥)، وابن ماجة (٣٦٤٤)، صححه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٢٩٣٩)، و(صحيح ابي داود) (٣٥٦٤).

پێغەمبەری خودا بوو عبید الله کوڕی جەحش دایکی ئومەیمەی کچی عبدالمطلب ببووە گاور لەسەر نەصرانیەت مرد). لە خاتوو عائیشەوە ﷺ دەفەرموێت: (عوبەیدوڵای کوڕی جەحش لەگەڵ هاوسەرەکەی ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان کۆچیان کرد بۆ وڵاتی حەبەشە، کاتێك گەیشتنە خاکی حەبەشە نەخۆش کەوت کاتێك گەیشتە گیانەڵا وەسیەتی کرد کە شو بەپێغەمبەر بکاتەوە دوای خۆی [ئەوە بوو گیانی سپارد پێغەمبەری خوداش دوای بەسەرچوونی تازیە و(عدە) داخوازی ئوم حەبیبەی کرد ﷺ کەلە وڵاتی حەبەشە بوو نەجاشی داخوازی لێکرد و بووە وەکیلی پێغەمبەری خودا و وەمارەیەکەی چوار هەزار درهەم بوو [کە دەکاتە چوار سەد دینار] ئەوەش جیهازی بوکێنی بوو نەجاشی بۆی کرد لەلای خۆیان، لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێز شەرحەبیلی کوڕی حەسنە ﷺ ناردیەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو پێداویستیەکانی ئەم هاوسەرگیریە لەلایەن نەجاشیەوە دابین کرابوو، پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ شتێکی بۆ ئەو زەمانەندە دابین نەکرد بەشێوەیەکی گشتی مارەیی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ چوار هەزار درهەم بوو])[٨٥٣].

ڕووداوی ئەم هاوسەرگیریە پیرۆزە لە گێڕانەوەیەکی ئیمانی بەیهەقیدا (رحمه الله) بەڕێزی باس کراوە و هاتووە لە ئوم حەبیبەوە ﷺ کە خۆی لەو بارەوە دەفەرموێت: (دوای کۆچی دوای هاوسەرەکەم هەستێکی ناخۆشم لە وڵاتی حەبەشە بۆ دروست ببوو هەستم بەغەریبی دەکرد هەتا دوای هاتنی نێردراوەکەی نەجاشی، کە خزمەتکارێکی ئافرەتی بەناوی ئەبرهە کە تایبەت بوو بەجل و بەرگ و ڕازاندنەوەی نەجاشی، هاتە لام و دوای ڕوخسەتی هاتنە ژوورەوەی کرد منیش فەرمووم لێ کرد، فەرمووی: پاشا منی ناردوە بە تۆ بڵێم: کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێگاری نامەیەکەوە کە ناردویەتی بۆ خزمەت

---

[٨٥٣] أخرجه: احمد (٢٧٤٠٨)، وقال محققه: رجاله ثقات، وابوداود (٢١٠٧)، والنسائي (٦/١٩) وفي (الكبرى) (٥٥١٢)، والحاكم (٢/١٨١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، الطبراني (الكبير) (٢٣/٤٠٢)، والدارقطني (السنن) (٣٠٦٦) وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (٧/١٣٩) وفي (الدلائل) (٣/٤٦٠)، وابن هشام (السيرة) (٤/٢٥٨)، وابن حبان (٦٠٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٨٥٣)، وصححه ايضاً الشيخ مقبل (الصحيح المسند) (١٥٥٢)، واللفظ لابن حبان واحمد.

پادشام داخوازی لەتۆ کردووە وەك هاوسەری ژیانی خۆی دیاریت بکات پادشا بۆ ئەوەی ئەم داخوازیەی بۆ بکات منیشی ناردۆتەوە خزمەتت؟ منیش لە خۆشیان وتم: خودا مزدەی خۆشت بداتی، وە وتیشی: پادشا فەرمووی پێت بڵێم، کەسێکێك بە وەکیل بۆ خۆت دەست نیشان بکە وەك سەرپەرشتیار بەشوت بدات وەك کەسی خۆت کارەکە بەجێ بگەیەنێت؛ منیش ناردم بۆ خزمەت خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ﷺ (کەخزمێکی نزیکم بوو (باپیرم برای باپیری بوو) کردم بەوەکیلی خۆم وە لە خۆشیان دوو بازن و دوو خرخاڵ و ئەنگوستیلەکە کە هەموو زیو بوون بەدیاری پێشکەشی ئەبرەهەم کرد، لە خۆشی ئەو مژدەیە شادی کەوتە گشت گیانم وە گەشامەوە، کاتێك وەختی عیشا هات، نەجاشی میواندارییەکی بەوبۆنەوە سازکرد و بانگی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ﷺ و ئەو موسوڵمانانەی کرد کە لە لای حەبەشە بوون، نەجاشی وتارێکی بۆ دان و فەرمووی: سوپاس بۆ خودای خاوەنی ئەم ناو سیفەتانە (الملك، القدوس، السلام، المؤمن، المهيمن، العزيز، الجبار) شایەتی دەدەم کە جگە لە خودای گەورە هیچ پەرستراوێکی تر بەحەق بوونی نی یە وەمحمدیش بەندە و نێردراوی خودایە، ئەو هەر ئەو کەسەیە کەعیسی کوڕی مەریم ﷺ مژدەی هاتنی داوە پاشان: پێغەمبەری خودا ﷺ نامەیەکی بۆ نوسیوم کە تێیدا داوای کردووە داخوازی ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیانی بۆ بکەین منیش وەڵامی داواکاری پێغەمبەرم ﷺ دامەوە و بەدەم داخوازیەکەشیەوە چووم و ئەوە چوارسەد دیناریشم کردە مارەی ئوم حەبیبە، پاشان پارەکەی خستە بەردەم خەڵکەکە، دوای ئەو خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ﷺ فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە کەشایستە پێدا هەڵگوتنە وە داوای لێخۆ شبونیش هەر لە ئەو دەکەین وە شایەتمان بەیەکتاپەرستی خودا و پێغەمبەرایەتی و بەندایەتی محمد ﷺ دێنین کەخودا ئەوی بەهیدات دەرو ئاینێکی ڕاست و دروست ناردوە بۆ ئەوەی سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکانی تردا گەر چی موشریکەکانیش پێیان ناخۆش بێت پاشان: ئەوە وەڵامی داخوازی پێغەمبەری خودام دایەوە و بەدەم داواکەشیەوە دەچین و هەرچیەك پێغەمبەر ﷺ بیەوێت بۆی جێبەجێ دەکەین وە ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانیشی لێ مارە دەکەین و پێشە کەشی بێت خودای گەورە ئەم هاوسەرگیریە لە پێغەمبەرەکەی پیرۆز بکات (ﷺ) نەجاشی پارەی مارەیەکەی دایە خالیدی کوڕی سەعید ﷺ ئەویش قەبوڵی کرد، ئەوە بوو پاش ئەمە

خەڵکەکە ویستیان هەستن و بڕۆن (نەجاشی) فەرمووی: فەرموو دانیشن لە سونەتی پێغەمبەران و نەریتیان ئەوەیە ئەگەر ژنیان مارەکرد دەبێت نانی هاوسەرگیریەکە بخورێت ئەوە بوو نانیان خوارد پاشان بڵاوەیان لێ کرد)[٨٥٤]. ئەو نەجاشیە کە ناوی (ئەصحمە) بوو موسوڵمان بوو بەموسوڵمانیەتی مرد و پێغەمبەری خودا ﷺ کە هەواڵی مردنەکەی پێ گەیشت بەهاوەڵانی ڕاگەیاند بەکۆمەڵ نوێژی مردویان بەغائیب لەسەر کرد لەدوای ئەو نەجاشیە نەجاشییەکی تر هاتە سەر تەخت پێغەمبەریی خودا ﷺ نامەی بۆ ئەویشیان نوسیو ناردی هەروەك ئەنەس ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێت: (... ئەوە ئەونەجاشیە نەبوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی مردووی بە غائیب لەسەرکرد)[٨٥٥]. هیچ گێڕانەوەیەکی ڕاست و دروست نەهاتووە لەبارەی ئەو نامەوە یاخود لەسەر وەڵامی نەجاشی دووەم بۆ ئەو نامەیە بەڵام لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا (ضعیف) هاتووە کە نەجاشی دووەم وەڵامی بانگەوازەکەی پێغەمبەری نەداوەتەوە و موسوڵمان نەبوو بەڵکو نامەکەی پێغەمبەریشی ﷺ پارچەپارچەکردووە و پێغەمبەری خوداش ﷺ دوعای لێکردووە، ئێمەش لێرەدا تەنها بۆ زانیاریتان باسی دەکەین، لە سەعیدی کوڕی ئەبو ڕاشدە ئەویش لە تەنوخی نێردراوی قەیسەرەوە ئەویش بە مەرفوعی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ فەرموویەتی: (ئەی برای تەنوخ... نامەیەکم نوسیی بۆ نەجاشی بەڵام ئەو دڕاندی و پارچە پارچەی کرد خوداشی لە ناوی بەرێت و موڵك و دەسەڵاتیش لەناوبەرێت...)).

عەبادی موهەلەبی لەوانەیە کە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە دەفەرموێت: بەهێثەم (رحمه الله) وت: ئەی نەجاشی موسوڵمان نەبوو وە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی مردنەکەی دا بەهاوەڵانی لە شاری مەدینە و هەموو نوێژیان لەسەرکرد بە غائیب؟ فەرمووی: بەڵێ بەڵام ئەویان فلانی کوڕی فلان بوو. ئیبن هەیثەم هەر دووکیانی ناو هێنان و باسکردن من لەبیرم چۆتەوە)[٨٥٦].

---

[٨٥٤] أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٤٦٢) بسنده، والحاكم (٤/٢٠)، وقال الذهبي (السيرة) (٢/٢٢١) قصة منكرة.

[٨٥٥] أخرجه: مسلم (١٧٧٤).

[٨٥٦] أخرجه: ابوعبيد (الاموال) (٦٢٥)، وابن زنجويه (الاموال) (٩٦١، ١٠٤)، وابويعلى (١٥٩٧) وقال محققه: رجاله ثقات، واحمد (١٥٦٥٥، ١٦٦٩٣، ١٦٦٩٤) وقال محققه: حديث غريب واسناده ضعيف،

## ٢-نامە ناردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ (موقەوقس) پادشای میسر و ئەسکەندەریە

عەبدول ڕەحمانی کوڕی عەبدول قادر دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ حاطبی کوڕی ئەبو بەلتەعەی نارد بۆ لای (موقەوقس) کە ناوی (جوریجی کوڕی مینی) بوو پادشای ئەسکەندریە بوو لەوڵاتی میسر (گەورەی (قبطی) یەکان بوو)، (حاطب) هەڵگری نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕێکەوت بۆ لای (موقەوقس) کە گەیشتە لای ڕێزی لە حاطب گرت و میوانداریەکی شایستەی کردو نامەکەی پێغەمبەری خودای بەڕێزەوە وەرگرت [سەرەڕای ئەوەی کە موسوڵمان بوو بەڵام قسەی زۆر جوانی کرد و بانگەوازەکەی بەدڵ بوو]..)[٨٥٧]

ئەم نامەیە و وەڵامەکەی ئیبن قەیم لە (زاد المعاد) هێناویەتی ئەمەش دەقەکەیەتی:

((بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبد الله ورسوله الى المقوقس عظيم القبط سلام على من اتبع الهدي اما بعد: فاني ادعوك بدعاية الاسلام ، اسلم تسلم واسلم يؤتك الله اجرك مرتين فان توليت فان عليك اثم القبط ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ (آل عمران: ٦٤) واتە: ((بەناوی خوای بەخشەندە ومیهرەبان لە محمد بەندە وپەیامبەری خوداوە بۆ (موقەوقیس) گەورە و خاوەن شکۆی قیبطی یەکان سڵاو لەوکەسەی شوێن ڕێگای هیدایەت دەکەوێت پاشان: من بانگەوازیت دەکەم بەبانگەوازی ئیسلام، موسوڵمان ببەسەلامەت دەبیت، موسوڵمان ببەخودای گەورە دووجار پاداشت دەداتەوە وە ئەگەر پشت هەڵکەیت و وەڵامی بانگەوازە خوایەکە نەدەویتەوە تۆباڵی تاوانی قیبطیەکانت لە ئەستۆیە وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەخاوەن

---

وقال الهيثمي (المجمع) (٨/٢٣٤) رواه احمد وابويعلى رجالهم ثقات، وقال ابن كثير (البداية) (٥/١٥): هذا حديث غريب واسناده لابأس به.

[٨٥٧] اخرجه: ابن سعد (١/٢٦٠)، وابن هشام (٤/٢٠٦)، والبيهقي (الدلائل) (٤/٣٩٥)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٦١٢): مرسل سند رجاله ثقات.

نامەکان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر وشەو بەرنامەیەك سووربین کە بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانە، و پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری، و واز لەو تەفرەقەیە بێنن وەرن باجگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین، و هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك وهاوبەشی هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو بپەرستین، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەکدی نەبین، جولەکە عوزەیریان بەخوا دادەناو، گاورەکانیش عیسا!...﴾(٨٥٨). **حاطبی کوڕی ئەبو بەلتەعە ﷺ دەفەرموێت لەوبارەوە: (پێغەمبەری خودا ﷺ منی نارد بۆ لای (موقەوقس) پادشای ئەسکەندریە بەنامەی پێغەمبەری خودا ﷺ وە چومە لای میوانداریەکی شایستەی کردم لە نزیك خۆیانەوە مامەوە، پاشان ناردی بەشوێنمدا و هەرچی پیاوی ئاینی (بطاریق)ەکان هەبوو کۆیکردنەوە و ئینجا فەرمووی: من دەمەوێت چەند قسەیەکت لەگەڵدا بکەم وە زۆریشم پێ خۆشە کە تێم بگەی و گوێم لێ بگری؟ دەفەرموێت: وتم: ئامادەم بۆ گوێ گرتن، فەرمووی: دەی دەنگ و باسی هاوەڵەکەتم بۆ باس بکە ئایە ئەو هەر بەڕاستی پێغەمبەرە؟ وتم بەڵێ: بەدڵنیایەوە ئەو نێردراوی خودایە، فەرمووی: ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە و چۆن بەوشێوە دەبێت لەکاتێکدا خزم وکەسەکانی خۆی وەدریان ناوە لەوڵاتی خۆی بۆ شوێنێکی تر هیچ نزایەکی خراپی لێ نەکردن بۆ ئەوەی لە ناو بچن؟ وتم ئایە تۆ شایەتی نادەیت کەعیسی کوڕی مەریەم ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەی چۆن دەبێت لەکاتێکدا کە گەلەکەی خۆی گرتیان و ویستیان لە خاچی بدەن ئایە پاڕایەوە لەخودا کەلەناویان ببات هەتا ئەو کاتەی خوای بالآدەست لەناویاندا بەرزی کردەوە بۆلای خۆی؟ فەرموو: تۆ دانا ولێهاتووی لەلای کەسێکی داناو ژیرەوە هاتووی...)**(٨٥٩).

**لەگێڕانەوەیەکی تردا (موقەوقیس) دەفەرموێت: لە پەیامی ئەو پێغەمبەرە وردبومەتەوە و سەرنجم داوە وبینیومە فەرمان ناکات بەکاری خراپ وڕێگریش ناکات لەکاری چاکە، وەساحیرێکی گومڕاکار و فاڵچیەکی درۆزن نی یە، وەمن نیشانەی پێغەمبەرایەتی تێدا بەدی دەکەم بەتایبەتی لە ئاشکراکردنی شتە شاراوە و پەنهانەکان و**

(٨٥٨) انظر: (زاد المعاد) لابن القيم (٣/٦١)، و(رسائل النبي ﷺ) ص (٤٧).

(٨٥٩) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٣٩٦)، وابن سعد (الطبقات) (١/٢٦٠)، وفي اسناده ضعف، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٦١٢): الحديث يرتقي الى درجة الحسن.

هەواڵدان لە بارەی شتە نادیار وغەیبی یەکانەوە من بەووردتر سەنج دەدەم و بیردەکەمەوە لەبارەیەوە.

حاطەب ﷺ دەفەرموێت: پاشان نامەکەی پێغەمبەری ﷺ لێ وەرگرتم و خستیە دەفرێکی عاجەوە و مۆری کرد ودایە کەنیزەیەکی ئافرەتی خۆی ئینجا بانگی نوسەرێکی تایبەتی کرد نامەیەکی بەزمانی عەرەبی نوسی بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی: (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان بۆ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا لە موقەوقیس خاوەن شکۆی قیبطی‌یەکان، سڵاوت لێ بێت. پاشان من نامەکەتم خوێندەوە و تێگەیشتم لەوەی کەتیایدا باست کردووە وبانگەوازی بۆ دەکەیت دەشزانم کە پێغەمبەرێك ماوە و بەڕێوەیە، وە من وای بۆ دەچووم کە لەشام دەرکەوێت من ڕێزم لەنێردراوەکەت گرت و دووکەنیزەشم بەدیاری بۆ ناردووی کە لەناو قیبطی‌یەکان پلەوپایەی تایبەتیان هەیە و لەگەڵ جل وبەرگ و هێسترێکیشم بەدیاری بۆ ناردووی بۆ ئەوەی سواری ببیت وە سڵاوت لێ بێت) ئەوە بوو مقوقیس موسوڵمان نەبوو وە لەمەزیاتریش هەڵوێستی تری نەبوو[٨٦٠].

عیمەری دەفەرموێت: "دەقەکانی ئەو نامانەی کە بۆ موقەوقیس فەرمان ڕەوای میسر نوسراون دوانن هەروەها وەڵامەکانی موقەوقیسش دوانن بەڵام لە ڕێگەیەکی ڕاست و دروستەوە پشت ڕاست نەکراونەتەوە"[٨٦١].

وەباسکراوە کە دەقی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مۆزەخانەی (توب قابی) لە شاری ئەستەمبوڵ لە تورکیا پارێزراوە لە سەرەتای سەدەی (١٩) لەنزیك ئەخمیم لەشاری سەعیدی میسر دۆزراوەتەوە.[٨٦٢]

موقەوقیس هەندێك دیاری و کۆیلەیەکی لەگەڵ دووکەنیزەکە ناردووە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەمەش لە چەندین گێڕانەوەدا هاتووە لەوانە:

---

(٨٦٠) انظر: (زاد المعاد) لابن القيم (٦١/٣)، وانظر كيفية كتابه الرسائل اليهم في (احكام اهل الذمة) لابن القيم (١٣٢٤/٣ – ١٣٢٧).

(٨٦١) انظر: (السيرة النبوية الصحيحة) لاكرام ضياء العمري (٤٥٨/٢).

(٨٦٢) انظر: (رسائل النبي ﷺ) لخالد سعيد علي (ص: ٤٥).

خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ((موقەوقیس فەرمانڕەوای ئەسکەندەریە کلدانێك و بوخوردانێکی بۆنخۆشی شامی و ئاوێنە و شانەیەکی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ))[٨٦٣].

ومیوردیدەمش ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: (موقەوقیس قیبطی دوو کەنیزەی [خوشکی یەکتر ونێسترێکی] وەك دیاری پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ کرد [پێغەمبەریش ﷺ قبوڵی کردن] ئێسترەکە پێغەمبەر ﷺ کردیە وڵاخی سواری خۆی، یەکێك لە کەنیزەکەکانیشی مارەکرد و بوو بەهاوسەری و ئیبراهیمی] کوڕی پێغەمبەری خودا لەو بوو، ئەوی تریشیانی بەخشیە حەسانی کوڕی ثابت ﷺ و بووە دایکی عەبدولڕەحمانی کوڕی حەسان)[٨٦٤].

ئێسترەکە بەڵەك بوو ناوی (دڵدڵ) بو لە ناوعەرەبدا هاوشێوەی نەبوو هەر لەبەر ئەوەش بوو عەلی ﷺ فەرموویەتی: (ئێسترێکیان بەدیاری بەخشیە پێغەمبەری خودا ﷺ سواری بوو [سەرنج ڕاکێش بوو فەرموویان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ] بۆچی ئێمەش کەر سواری ماین نەکەین تاهێستری ئاوهامان دەسکەوێت پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا فەرمووی: ((ئەوە کەسانێکی نەشارەزاو بێ ئاگا ئەو کارە دەکەن))[٨٦٥]. ئیبن عەباس ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ [فەرمانی پێکردن] دەست بەرداری ئەسپەکان نەبین و لەبەر گوێدرێژەکان بەشیاوتریان نەزانین لە ئەسپەکان)[٨٦٦]. قەدەغەی کردین لەو کارە لەبەر ئەوەی ئەسپ گۆشتەکەی دەخورێت و سودەکانی ئێجگار زۆرن وە لەڕاگرتن و

---

(٨٦٣) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٧٣٠٥) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الهيثمي (المجمع) (١٥٢/٤) رجاله ثقات.

(٨٦٤) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٣٥٤٩) قال محققه: اسناده صحيح، والبزار (١٩٣٥)، وابن ابي عاصم (الآحاد والمثاني) (٣١٢٣)، وقال الحافظ (الأصابة) (٤٠٥/٤): رواه البزار وسنده حسن، وقال البوصري (اتحاف الخيرة المهرة) (٣٩٩٥): اسناده صحيح.

(٨٦٥) أخرجه: احمد (٧٨٥) وقال محققه: اسناده صحيح، والنسائي (٣٥٨٠)، وابوداود (٢٥٦٥)، والبزار (٨٨٩)، وابن حبان (٤٦٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٣٦)، و(صحيح النسائي) (٣٣٤٧).

(٨٦٦) أخرجه: النسائي (٣٥٨١)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح النسائي) (٣٣٤٨).

ڕاهێنانیاندا پاداشت هەیە و هۆکارێکی سەرەکی ئەو کاتی جیهاد و تێکۆشان بوو وە فەرو بەرەکەتی پێوەیە هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ((فەڕوبەرەکەت بەنێوچەوانێی ئەسپەوەیە)) [٨٦٧]

وەهەر لەو بارەیەوە ئەبو صەعصەع ﷺ دەفەرموێت: (موقەوقیس فەرمانڕەوایی ئەسکەندەریە لەساڵی حەوتەمی کۆچی ماریە و خوشکەکەی سیرین و هەزار مسقاڵ زێرو بیست پارچە جل وبەرگ و ئێسترێك و گوێدرێژێك بەناوی (عەفیر) یاخود (یەعفور) وەخزمەتکارێك بەناوی (مەئبور) نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ.

لەگێرانەوەیەکی تردا هاتووە: بیست پارچە جل و بەرگی قیبطی و پەرداخێکی شوشەکەی [ڕۆنی پرچی تێدابوو] وە دکتۆرێك دواتر پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: (بگەڕێوە بۆ ناو کەس و کاری خۆت ئێمە خەڵکانێکین نان ناخۆین هەتا برسیمان نەبێت وە ئەگەر خواردیشمان تێر ناخۆین)) [٨٦٨]. لەموصعەبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ماریەی کچی شەمعونی مارەکرد و وەك هاوسەری خۆی دەست نیشانی کرد کە موقەوقیس فەرمانڕەوایی ئەسکەندەریە وەك دیاری لەگەڵ خوشکەکەی سیرین و پیاوێکی نیرەموك بەناوی (مەئبور) پێشکەشی پێغەمبەری ﷺ کردبوون، پێغەمبەری خودا ﷺ سیرینی پێشکەش بە حەسانی کوڕی ثابت ﷺ کرد... ماریەش لەمانگی (ذي الحجة)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی لە پێغەمبەری خودا ئیبراهیمی بوو هەر لەمەدینە کۆچی دوای کرد لەتەمەنی ساڵێك وشەش مانگی دا) [٨٦٩].

هەندێك لە دووڕووەکان هەوڵیاندا تانەبدەن لەئیبراهیم کە کوڕی پێغەمبەر بێت ﷺ کەوتنە دروست کردنی گومان و دوو دڵی لەوبارەیەوە ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (کەسێك تۆمەتبار دەکرا بەوەی کە باوکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خودا ﷺ بێت کە گوایە لە دایکی ئیبراهیم نزیکە، پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو: ((اذهب فاضرب عنقه)) واتە: ((برۆ

---

[٨٦٧] أخرجه: احمد (٣/١١٤)، والبخاري (٢٨٥١)، ومسلم (١٨٧٤)، والنسائي (٦/٢٢١).

[٨٦٨] أخرجه: البزار (١٩٣٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٤/١٥٢) فيه ضعيف، وابن سعد (١/٢٦٠) واللفظ له، وانظر (اعلام السائلين) لابن طولون (ص: ٢١).

[٨٦٩] أخرجه: الحاكم (٤/٣٨) برقم (٦٩٠٨) وقال محققه: اسناده صحيح.

لەگەردنی بدە و بیکوژە)). عەلی ﷺ گەیشتە لای لە ناو حەوزێك مەلەی دەکرد و خۆی فێنك دەکردەوە، عەلی پێی فەرموو وەرە دەرەوە، دەستی گرت و دەریهێنا و سەیری کرد پیاو نی یە و نێرەموکە، عەلی ﷺ وازی لێهێناو پاشان گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو نێرەموکە و ئەندامی نێرینەی نیە)[٨٧٠].

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ماریە وسیرین بەدیاری پێشکەشی پێغەمبەری خودا ﷺ کران (مەنبور) لەخزمە نزیکەکانی ماریە بوو. لەوبارەیەوە عەبدوڵلای کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (... (ئەو) لە خزمەت خاتوو ماریە بوو لەگەڵیدا هاتبوو لە وڵاتی میسرەوە موسوڵمان ببوو... ئەو ئەندامی نێرینەی خۆی بڕیبوو زۆروکەم ئارەزووی بۆ ئافرەت نەمابوو خۆی خەساندبوو...)[٨٧١].

## ٣-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ کیسرا پادشای وڵاتی فارس

لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نامەیەکی نوسی بۆ کیسرا بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە عەبدوڵلای کوڕی حوزافەی سەهەمی هەڵبژارد وپێی فەرموو کە بیگەیەنێتە فەرمانڕەوای (بەحرێن)، ئینجا ئەویش ڕەوانەی بکات بۆ لای کیسرا کاتێك خوێندیەوە دڕاندی وپارچە پارچەی کرد. ئیبن موسەیەب (رحمه الله) دەفەرموێت: "پێغەمبەری خودا ﷺ نزای خراپی لێ کردن بەوەی کە خودا موڵك و دەسەڵاتیان پارچە پارچە بکات")[٨٧٢].

لە گێڕانەوەیەکی تردا لەسەعیدی کوڕی موسەیبەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ کیسرا و قەیسەرو نەجاشی یەك جۆر نامەی نوسیوە: (بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان لە محمد پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆ کیسرا.... پاشان ﴿ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا

---

[٨٧٠] أخرجه: مسلم (٢٧٧١)، وأحمد (٨٣/١)، والحاكم (٤٠/٤).

[٨٧١] أخرجه: ابن عساكر والطبراني وسنده حسن كما قال السيوطي: انظر (كنز العمال) (٣٥٥٤٣).

[٨٧٢] أخرجه: أحمد (٢٤٣/١)، والبخاري (٤٤٢٤)، (٧٢٦٤).

﴿مِن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ (آل عمران: ٦٤) بەلام کیسرا بەر لەسەیر کردنی نامەکەی دڕاند و پارچە پارچەی کرد پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (خودا خۆیی ونەتەوەکی پارچە پارچە بکات)(٨٧٣).

طەبەری (رحمه الله) دەقی نامەکەی باسکردووە وهێناویەتی لە ئیبن ئیسحاقەوە (رحمه الله) ئەویش لە یەزیدی کوڕی حەبیبەوە (رحمه الله) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ عەبدوڵلای حوزافەی نارد... بۆلای کیسرای کوڕی حورمز پادشای ولاتی فاس ئەم نامەیەی بۆ نوسیبوو: ((بسم الله الرحمن الرحیم، من محمد رسول الله الی کسری عظیم فارس.. سلامٌ علی من اتبع الهدی، وآمن بالله ورسوله، وادعوك بدعاء الله فاني انا رسول الله الی الناس کافة لانذر من کان حیاً ویحق القول علی الکافرین، فاسلم تسلمْ فان ابیت فانّ اثم المجوس علیك)) واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان لە محمد پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ کیسرا خاوەن شکۆی ولاتی فارس...سلاو لەوکەسی کە شوێن ڕێگای هیدایەت دەکەوێت، وەباوەڕ بەخودا و پێغەمبەرەکەی دەهێنێت بۆ بانگەوازی خودای گەورە بانگت دەکەم کە من پێغەمبەری خودام ﷺ بۆ گشت خەلکی جیهان بۆ ئەوەی خەلکی زیندو خاوەن هۆش بێدار بکەمەوە وە بەلێنی خوداش بۆ بی باوەڕان دێتەدی، موسولمان بە سەلامەت دەبیت وە ئەگەر پشت هەلکەیت وبەدەم بانگەوازەکەوە نەیەیت ئەوە ئۆبالی تاوانی ئاگر پەرستەکانی ژێر دەسەلاتی خۆت لە ئەستۆی تۆ دەبێت). کاتێك کیسرا خوێندیەوە دڕاندی و پارچە پارچەی کرد و وتی: بەو شێوەیە نامەم بۆ دەنوسی لە کاتێکدا ئەو ژێر دەستەی منە) پاشان کیسرا نامەیەکی نوسی بۆ (بازان) کە فەرمانڕەوای فارسەکان بوو لەسەر ولاتی یەمەن: [من هەوالت پێ دەدەم کە کەسێك پەیدابوو شتێك دەلێت هیچی لە بارەوە نازانم [بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات] بەدوایدا بنێرە وپێی ڕابگەیەنە یا لەمالی خۆی دانیشێ و بەهیچ جۆرێك نەچێتە ناو خەلکەوە وئەو بانگەوازەش بلاونەکاتەوە] و بادەست هەلگرێت لە و کارە ئەگەر نا کەسانی وای بۆ دەنێرم خۆی و کەس و کاری و هۆزی لەبەین بەرن] ئینجا

---

(٨٧٣) اخرجه: ابن ابي شیبة (المصنف) (٣٧٧٨٢)، وسعید بن منصور (السنن) (٢٤٨٠)، وابوعبید (الاموال) رقم (٥٩)، وقال ابراهیم العلي في (صحیح السیرة) رقم (٦٠٩): حدیث حسن.

دوو کەسی جەربەزەو بەجەرگ لەلای خۆت بنێرە بۆ لای ئەو پیاوەی کە لە حیجازدا سەری هەڵداوە یا بیهێنن بۆ لام پاشان بازان پاڵەوانێکی خۆی کە ناسراوو بوو بە (بابویە) نارد (کە نوسەرێکی لێهاتووی کارنامەی فارسی بوو) لەگەڵیدا کەسێکی فارسی تری نارد پێیان دەوت (خورخەسرو) نامەیەکی نوسراوی پێدان کە بیگەیەنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە فەرمانی پێکردن کە لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن بۆ لای کیسرا، بە (بابویە) وت: برۆ بۆ ئەو شارەی ئەو پیاوەی لێ یە، قسەی لەگەڵدا بکە و دەنگ وباسەکەم بۆ بهێنەوە، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری طائف چاویان کەوت بەکەسانێکی قورەیش کە لەدەروازەی طائف نیشتەجێ بوون پرسیاریان لێکردن لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ وتیان: ئەو لەشاری مەدینەیە. لەوێدا قورەیشیەکان شادو دڵخۆش بوون بەو دەنگوباس و هەواڵ پرسینە هەندێکیان بە ئەوانەی تریان دەوت: مژدەتان لێبێت ئەمجارەیان کەوتۆتە داوی کیسراوە پادشای پادشایان، ئەو پیاوەتان لەکۆڵ دەکاتەوە ئەوە بوو ڕۆیشتن هەتاکو گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ (بابویە) کەوتە قسەکردن لە خزمەتیا وتی: شاهی شاهان پادشای پادشاکان کیسرا نامەیەکی نوسیوە بۆ خزمەت پادشا و خاوەن شکۆمان بازان فەرمانی پێکردووە کە بەدوای تۆدا بنێرێت و لەگەڵ خۆیدا بتبات، ئەویش منی ناردووە بۆ ئەوەی لەگەڵمبیت بۆ لایان، ئەگەر بەقسەمان بکەیت ئەوە خاوەن شکۆ بازان شتێك دەنوسێت لە بارەی تۆوە بۆ پادشای پادشاکان کە بەقازانجی تۆ بێت و دەستت بۆ درێژنەکات بەمەبەستی ئازاردانت، وە ئەگەر بەگوێیان نەکەیت و پشت هەڵکەیت ئەو دڵنیابە و بزانە ئەوکات خۆت و گەلەکەت لەناو دەبات و وڵاتەکەتان کاول دەکات، کاتێك چوونە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕیشی تاشراو سمێڵی زلەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ حەزی نەدەکرد سەیریان بکات، پاشان ڕووی تێکردن و پێی فەرمووون: ((ویلکما مَن امرکم بهذا؟)) واتە: ((خاك بەسەرتان و ماڵ وێران بن کێ ئەو فەرمانەی پێکردوون؟)) وتیان: پەروەردگارمان گەورەمان (واتە: کیسرا) فەرمانی پێکردووین بەوکارە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان: ((لكنَّ ربي قد امرني باعفاء لحيتي وقصّ شاربي))[٨٧٤] واتە: ((بەڵام پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم بە هێشتنەوەی ڕیشم

[٨٧٤] لە ئیبن عومەرەوە ﷺ کەلەوبارەیەوە دەفەرموێت: (ذكر لرسول الله ﷺ المجوس فقال: ((انهم يوفون سبالهم ويحلقون لِحاهم فخالفوهم)) واتە: (باسی ئاگر پەرستەکان بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ کرابوونەویش

و کورت کردنەوەی سمێڵم)). ئینجا فەرمووی پێیان: ((ارجعا حتى تأتياني غدا)) واتە: ((بڕۆن هەتاکو سبەی وەرنەوە لام))، وەحی لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هات دەربارەی دەنگ وباسی کیسرا: کە خوای گەورە شیرویە کوڕی کیسرای زاڵکردووە بەسەر کیسرادا و کوشتویەتی لەو شەوەی ڕابردوو لەفلانە سەعات و فلانە مانگدا، کوڕەکەی خۆیی شیرویە توانی بەسەریدا زاڵ بێت و بیکوژێت. دواتر بانگی کردنەوە و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندن[٨٧٣] فەرمووی: ((اذهبا الى [صاحبكم] الذي تزعمون انه ربكما فاخبراه انّ ربي قتل الذي يزعم انه ربّه])) واتە: ((بڕۆنەوە بۆ خزمەت [فەرمانڕەواکەتان] و هەواڵی پێ بدەن کە ئەو کەسەی کە ئێوە بەخودای خۆتانی دەزانن ئەوە خودای من کوشتویەتی کە بانگەشەی خودایەتی دەکرد بۆ خۆیی)) وتیان: تۆ دەزانی چی دەڵێیت ئیمە لێرە ماوینەوە لەسەر تۆ وەستاوین لەوەش بچوکترمان پێ قبوڵ نەدەکرا ئەوەش بنوسین لەسەر زاری تۆوە و بەپادشای ڕاگەیەنین؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) [فەرمووی: فەرمایشتەکەیان نوسی کەلە چ سەعاتێك و ڕۆژێك ومانگێکدا ڕوویداوە] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((اخبراه ذلك عني وقولا له: ان ديني وسلطاني سيبلغ ما بلغ ملك كسرى وينتهي الى منتهى الخفّ والحافر وقولا له: انك ان اسلمتَ اعطيتك ما تحت يديك وملّكتك على قومك من الابناء)) واتە: ((ئەوەی لە منەوە پێ ڕابگەیەنن و پێی بڵێن: ئەو ئاین و دەسەڵاتەی من بەم زووانە دەگاتە گشت ئەو شوێنانەی موڵکی کیسرای پێگەیشتووە لەوێدا کۆتایی دێت سم ونالی پێ ناگات وەهەواڵیشی پێ بدەن: ئەگەر موسوڵمان بێت ئەوە هەرچی لەژێر دەسەڵاتیەتی پێی دەدەینەوە و دەیکەینەوە بە فەرمانڕەوای سەر نەتەوەکەی خۆی)) دواتر لە خزمەتیا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە لای بازان و هەواڵەکەیان پێ گەیاند، وتی: وەڵڵاهی ئەو قسەی پادشایان نیە من وای بۆ دەچم ئەو

---

فەرمووی: ((ئەوان سمێڵیان درێژ دەکەن وڕیشیان دەتاشن ئێوەش پێچەوانەی ئەوان بکەن)) اخرجه: ابن حبان (٥٤٧٦): وقال محققه: اسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (٣/١٥١)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٨٣٤): اسناده جيّد.

[٨٧٣] وفي رواية ابي بكرة: ان رجلاً من اهل فارس اتى النبي ﷺ فقال (رسول الله ﷺ): ((ان ربي قد قتل ربك)) (يعني كسرى).. أخرجه: احمد (٢٠٤٣٨) قال محققه: حديث صحيح، والبخاري (٢٧٠٤)، والترمذي (٢٢٦٢)، والنسائي (٨/٢٢٧)، والبزار (٣٦٤٩)، والحاكم (٣/١١٨).

پیاوە پێغەمبەر بێت هەر وەك دەفەرموێت دەی باچاوەڕێ بکەین لەوەی کە فەرموویەتی ئەگەر ڕاست دەرچوو ئەوە قسەی ئاسایی نی یە بەڵکو پێغەمبەرێکی نێردراوە لە خوداوە، وە ئەگەر بەپێچەوانەوە دەرچوو ئەوە تێڕوانین و هەڵوێستمان لەبارەیەوە بەهەمان شێوەی پێشوو دەبێت. هێشتا بازان هەڵنەستاو زۆری پێ نەچوو کەنێردراوی (سیرویە) بەنامەیەکەوە گەیشتە خزمەتی کە تێدا نوسرابوو: (...لەپاشان من کیسرام کوشتووە، وە ئەم کارەشم تەنها لەبەر تۆڵە سەندنەوە بووە بۆ فارسەکان چونکە خوێنی پیاو ماقوڵانی گەورە پیاوانیان بەهەدەر دەدرا وبێ هودە دەکوژران و سوپاکەشیان لە ناو وڵاتی خۆیان توندکردوون وگیریان خواردووە بەدەست بەند کرانەوە، ئەگەر ئەم نوسراوەی منت پێ گەیشت بەهەمان دەستوری پێشو گوێڕایەڵی من دەبیت: بەوردی سەرنجی ئەو پیاوە بدە کە باوکم کیسرا نامەکەی لە بارەیەوە بۆ نوسیبوویت هیچ هەڵوێستێکی لە بارەوە مەنوێنە هەتاکو فەرمانی منت لە بارەیەوە پێ دەگات). کاتێك نامەکەی شیرویە گەیشتە بازان و خوێندیەوە وتی: بەڕاستی ئەو پیاوە پێغەمبەرە ئینجا موسوڵمان بوو لەگەڵ ئەو فارسانەی کە لەیەمەن لەگەڵیدا بوون... هەر لەبارەی سەردانەکەی دوو کەسەکە بۆ مەدینە (بازویە) بەبازانی وت: قسەم لەگەڵ هیچ کەسێك نەکردووە ئەوەندەی ئەو پیاوە گەورە و سەنگین بوو بێت لەلام. بازان فەرمووی پێی: لەبەر ئەوەی پاسەوان و داروەستەی لە دووربوو؟ وتی: نەخێر ([بەدڵنیایی و ئەو پەڕی ئاسایشەوە] لە ناویاندا دەهات و دەچوو بێ ئەوەی لە هیچ شتێك بترسێت و بەسادەیی و بێ ئەوەی پاساوانی هەبێت و بەهیچ جۆرێك دەنگیان هەڵنابڕن وقسە لەقسەیدا ناکەن لەخزمەتیدا بێ دەنگ دادەنیشن]..)[٨٧٦].

---

(٨٧٦) اخرجه: الطبري (التاريخ) (٢/٦٥٤-٦٥٧) وابن سعد (١/١٤٧)، وابن ابي شيبة (٣٧٧٨١) وقال محققه: رجاله ثقات – وقال الأرناؤط: مرسل رجاله الصحيح– احمد (٣٤/٨٦) رقم (٢٠٤٣٨)، وابونعيم (الدلائل) (٢٤٠، ٢٤١)، والبزار (٢٣٧٤)، البيهقي (الدلائل) (٤/٣٩٠)، والطبراني كما في (الفتح) (١/٤٠)، وابن ابي الدنيا (الدلائل) كمافي (الأصابة) (٧٥٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٨/٢٨٧): رواه الطبراني ورجاله الصحيح غير كثير بن زياد وهوثقه، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٤٢٩) ٢، و(فقه السيرة) (ص: ٣٨٩).

پاشان ئەوە بوو کیسرای نوێ لە ناو چوو هیچ کیسرایەکی تری بەدوایدا نەهات هەروەک پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموو بووی: ((...اذا هلك كسرى فلا كسرى بعده))[877] واتە: ((...ئەگەر ئەم کیسرایە لە ناو چوو هیچ کیسرایەکی تر لە دوای نایەت و کۆتایان پێ دێت)). ئەوە بوو فارسەکان باروودۆخیان لێ تێك چوو دوچاری نوشستی هاتن و کارەسات دوای کارەسات بەسەریان داهات لە دوای ئەمەوە ئافرەتێك بوو بە فەرمانڕەوایان و دەسەڵاتی گرتە دەست، لەو بارەیەوە ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك کیسرا مرد پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((من ولّوا بعده))؟ واتە: ((کێ هاتە جێگا و بووە فەمانڕەوایان؟)) [پێی گوترا کە کچەکەی (بوران) بۆتە جێنشینی و چۆتە سەرتەختی باوکی]. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لن يفلح قوم اسندوا امرهم الى امراة))[878] واتە: ((گەلێك سەرفراز و سەرکەوتوو نابن کە کاروباررى ولاتیان بە ئافرەتێك بسپێرن)). لەگێڕانەوەیەکی تردا: فەرموویەتی: ((لايفلح قومٌ تملكهم امرأة))[879] واتە: ((گەل و نەتەوەیەك سەرفرازو سەرکەوتوو نابن کە ئافرەتێك سەرۆکایەتیان بکات)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ((لن يفلح قوم ولّوا أمرهم امرأة)) واتە: ((گەل و نەتەوەیەك سەرناکەون وسەرفراز نابن کاروباریان ئافرەتێك بەڕێوەی بەرێت و سەرۆکاری بکات))[880]. وە باسکراوە کە دەقی ئەم نامەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەبۆ کیسرای ناردووە پارێزراوە لەلای کەسێك بەناوی (هنری فرعون) لەولاتی لوبنان.[881]

---

[877] اخرجه: البخاري (٣١٢١)، ومسلم (٢٩١٩)، والترمذي (٢٣١٣).

[878] اخرجه: احمد (٢٠٤٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح، والبزار (٣٦٨٥) واسناده صحيح ايضاً -كما قال الارناؤط (احمد) (٢٠٤٥٥).

[879] اخرجه: احمد (٢٠٤٣٨) وقال محققه: حديث صحيح، والبخاري (٢٧٠٤)، والترمذي (٢٢٦٢)، والنسائي (٢٧/٨)، والحاكم (١١٨/٣).

[880] اخرجه: البخاري (٧٠٩٩).

[881] انظر: (رسائل النبي) خالد سيد علي (ص: ٥٥).

# ٤- نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ هێرقل پادشای وڵاتی ڕۆم

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نامەی نوسیوە بۆ قەیسەر (واتە: هێرقل) تێدا بانگی کردووە بۆ موسوڵمان بوون وبۆ ئەم کارەش دوحیەی کەلبی هەڵبژاردوە ونامەکەی پێدا ناردووە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێکردووە کە بیداتە دەست فەرمانڕەوای (بوسرا) بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە دەستی قەیسەر، ئەویش فرمانەکەی جێبەجێ کرد و دایە دەست گەورەی (بوسرا) ئەویش گەیاندیە خزمەت قەیسەر...)[٨٨٢].

دوحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی ﷺ هەستا بەهەڵگرتن و گەیاندنی ئەم نامەیەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش مژدەی بەهەشتی پێدا، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا فەرمووی: ((من ینطلق بصحیفتي هذه الی قیصر وله الجنة؟)) فقال رجلٌ من القوم (وهو دحیة الکلبي): وان لم أقتل؟ قال: ((وان لم تُقتل)) فانطلق الرجل به....))[٨٨٣]. واتە: ((هەر کەسێك ئەم نامەیەی من بگەیەنێتە لای قەیسەر بەهەشتی بۆ هەیە لە پاداشتیدا)) کەسێك لە ناو خەڵکە فەرمووی: (ئەو کەسە دوحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی بوو)). ئەگەر ئەش کوژرێت؟ فەرمووی: ((ئەگەر ئەش کوژرێت)) ئەوە بوو ئەو کەسە نامەکەی برد...))

ناردنی ئەو نامەیە لە مانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو. هاوکات لەگەڵ گەیشتنی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ کەژاوەیەکی کاروانی بازرگانی قوڕەیش کە بەرەو فەلەستین دەڕۆیشتن گەیشتنە ئەوێ بۆمەبەستی بازرگانی یە قەدەری خودا ئەوان ئامادەی ئەو کۆڕ و کۆبونەوە بوون (واتە: گەیاندنی ئەونامەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە قیسەری پادشای ڕۆم کەناوی هێرقل بوو)، هێرقل داوای کرد کە بازرگانەکانی قوڕەیش بێنەخزمەتی کە ئەبوسوفیانیان تێدا بوو بۆ ئەوەی پرسیاریان لە بارەی پێغەمبەری

---

[٨٨٢] اخرجه: البخاري (٢٩٤٠)، والبیهقي (الدلائل) (٣٧٧/٤) عنه.

[٨٨٣] اخرجه: ابن حبان (٤٥٠٤) وقال محققه: اسناده صحیح، وقال الحافظ (الفتح) (٣٧/١) اخرجه: ابن زنجویة (الأموال) بسند صحیح، وصححه الارناؤوط (زاد المعاد) (١٢١/١) وصححه الشیخ الالباني في (فقه السیرة) (٣٨٦).

خواوە ﷺ لێ بکات لەوبارەیەوە دوو گێڕانەوە هەیە: گێڕانەوەیەکی ئیمامی بوخاری ویەکێکی ئیبن ئیسحاقە ئێمە هەر دووکیانمان هێناوە دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنی هەردووکیان هەتاکو باسکردنی ڕووداوەکە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك بێت:-

زوهری لە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە لە ئیبن ئیسحاقەوە (رحمه الله) دەفەرمووێت: ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بەزاری خۆی بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: ئێمە دەفەرمووێت: (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بەزاری خۆی بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: ئێمە هۆزێکی سەرقاڵی بازرگانی بووین و بازرگان بووین جەنگ و هەراش بەگیری هێنابووین و گەمارۆی دابووین لەوەی دەربچین بۆ بازرگانی هەتاکو هەرچی ماڵ و سامانی هەمان بوو لە ناوچوو، کاتێك ڕێکەوتنامەی حودەیبیەمان مۆرکرد و کەوتینە دانوستان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ کەوتینە ئاسایشەوە و دۆخەکە هێور بۆوە کەلەوە وپێش بەوجۆرە نەبوو وەك بازرگانێك ڕۆیشتم بۆ وڵاتی شام لەگەڵ کۆمەڵێك لەقورەیش وەڵلاهی ئەوەی من زانیومە لە مەککەدا هیچ ژن وپیاوێك نەماوە مەگەر داوای پێویستیەکی لێ کرد وپێ شوێنی ئاڵوگۆڕی بازرگانیەکەشمان لە وڵاتی شام بوو لە شاری غەززەی خاکی فەلەستین ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەوێ، ئەوەش لەسەروو بەندی زاڵ بوونی قەیسەری خاوەن شکۆی ڕۆمەکان بەسەر ئەو ناوچانە کە لەوڵاتەکەیدا داگیرکرابوون لەلایەن فارسەکان توانی لە ژێر ڕکێفی ئەوان دەری بێنێت و خاچەگەورەکەیان کەڕمزیان بوو گەڕایەوە دەستیان کە لەو کاتە لێیان بردرابوو کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت کە خۆی لە شاری (حمص)دا دەنیشت لە خاکی شام بەپیادە وەك نیشانەی سوپاسگوزاری بەڕێ کەوت بەرەو مزگەوتی لە ئیلیاء (واتە: قودس) بۆ ئەوەی نوێژی سوپاسگوزاری بۆ [خوا بکات لە کاتێکدا ئەو دەسکەوتانەی بۆ گەڕاوەتەوە کە پێشتر لێی زەوت کرا بوو] چەندین فەرش و ڕایەخی بۆ ڕاخرابوو وە بۆن و بەرامی خۆشی بەسەرداکرابوو کەبەسەریدا بڕوات، کاتێك گەیشتە (ئیلیاء) کارەکانی تەواوکرد [لەبەجێ هێنانی نوێژ وپاڕانەوە پیاوە ئاینی و گەورەو خانەدانەکانی ڕۆمیش لە خزمەتیا بوون][٨٨٤] [ئیبن ناطور کە فەرمانڕەوای (ئیلیاء) هیرقل کردیە پیاوی گەورەی ئاینی بەسەر (نەصارا)کانی شامەوە دەگێڕێتەوە لەو کاتەی کە

---

[٨٨٤] أخرجه: الطبري (التأريخ) (٦٤٧/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٨١/٤).

هێرقل هاتە (ئیلیاء) ئەو ڕۆژە بووە ڕۆژێکی بەد و شوم [زۆر غەمبار بوو چاوەکانی هەڵبڕی بەرەو ئاسمان] هەندێك لە بەطارقەکان پێیان وت: بەشێوەیەکی ئاسایی نات بینین شێواو دیاری [فەرمووی: بەڵێ ڕاستە] ئیبن ناطور دەفەرموێت: هێرقل زۆر بەخەفەتباریەوە سەیری ئەستێرەکانی ئاسمانی دەکرد کاتێك پرسیاریان لێکرد لەو بارەیەوە لەوەڵامدا وتی: من ئەمشەو کاتێك سەیری ئەستێرەکانی ئاسمانم کرد وسەرنجم دا [پادشایەکی خەتەنەکراو دەرکەوت، لەناو نەتەوەکاندا کێ خەتەنە دەکرێت و خەتەنەکردن پەیڕەو دەکات؟ عەرزیان کرد قوربان: هیچ کەسێك خەتەن ناکات تەنها جولەکەکان نەبێت ئەوانیش ئەوەند جێگای مەترسی نین بۆ تۆ ئەوەندەش بایەخیان نی یە نامەیەك بنوسە بۆ گەورەی شارەکان با هەرچی جولەکەیەك هەیە لە ناویاندا بیان، ئەوان لەسەرو بەندی جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانە دابوون، کە پیاوێکی [عەرەب] هاتە خزمەت هێرقل کەپادشای غەسان ناردبوومیە خزمەتی [پادشاکان ئاڵوگۆڕی دەنگ وباس هەبوو لەنێوانیاندا] [(دەرگاوانەکە) وتی: ئەی خاوەن شکۆ کەسێ: لە عەرەبەکان لەوانەی سەرقاڵی مەڕومالاّتن دەیەوێت قسەت بۆ بکات دەربارەی ڕووداوێکی [سەرسوڕهێنەر] کە لە وڵاتی خۆیدا ڕوویداوە تۆشی پرسیاری لێ بکە لەوبارەوە، کاتێك گەیشتە خزمەتی بەوەرگێڕەکەی وت: پرسیاری لێ بکە ئەو دەنگ و باسە چی یە کە لەوڵاتەکەیدا بڵاوبۆتەوە؟ ئەویش پرسیاری لێکردوو وتی: کەسێك لەناو هۆزی قورەیش دەرکەتووە [لەناوخۆماندا] بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات خەڵکانێك شوێنی کەوتوون و هەندێکیشیان دژایەتی دەکەن لە نێوانیشیاندا چەندین شەڕو هەرابەرپا بووە [لەزۆر] شوێندا لەوڵاتی خۆمان وەدەرمان ناوە هەر لەسەر پەیامی خۆیان بەردەوامن، کاتێك ئەو هەواڵەی پێدا فەرمووی: [بڕۆن سەیری کەن وبزانن خەتەنەکراوە یاخود نا] [جلەکانی لەبەر داکەنن] [کەسەیریان کرد خەتەنەکرابوو، ئینجا هاتنەوە خزمەتی و عەرزیان کرد قوربان خەتەنەکراوە، وەپرسیاریشیان لێ کرد لە بارەی عەرەبەکانەوە وتی: ئەوان خەتەنەکردن لەناویاندا باوە، ئینجا هێرقل فەرمووی: ئەو پادشای ئەم ئومەتەیە کەسەری هەڵداوە [جلوبەرگ و پۆشاکی

پێ ببەخشن بابڕوات لەلامان]))[٨٨٥]. هەر لەو ساتەوەختەدا بوو کە دوحیەی کوڕی خەلیفە ﷺ بە نامەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ هاتە خزمەتی هێرقل قەیسەری ڕۆم، لەوبارەیەوە ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (... ئەوە بوو بردنی نامەکەی پێغەمبەری ﷺ لەلایەن دوحیەوە هاوکات بوو لەگەڵ هاتنی قەیسر بۆ مزگەوتی (ایلیاء)، کە چەندین فەرش و ڕاخەریان بۆ ڕاخستبوو کە تەنها خۆی بەسەریدا دەڕۆیشت، نامەکەی خستە سەر فەرشەکەو بۆی چەمایەوە وەك ڕێز لێنان بۆی، کاتێ: قەیسەر گەیشتە لای نامەکەی هەڵگرتەوە، پاشان بانگی گەورەی پیاوە ئاینیەکانی کرد ئەویش بۆی خوێندەوە و فەرمووی: زانیاری من دەربارەی ئەو نامەیە هەروەك زانیاری تۆیە. ئەوە بوو قەیسەر بانگی کرد: کێ خاوەنی ئەم نامەیە دڵنیا بێت کە پاێزراوە، ئەوە بوو کەسەکە هاتە خزمەتی (واتە: دوحیە)...)[٨٨٦].

لەم گێڕانەوەدا دەردەکەوێت کە خاوەن شکۆ (بوسرا) دوحیەی ناردووە بەنامەکەوە بۆ خزمەتی قەیسەر هێرقل لەمزگەوتی (ایلیاء) نامەکانیش بەپێ نەریتی ئەوان لەسەر فەرشە ڕاخراوەکان لە ڕێگای هێرقل دادەنران لەهەر لایەکەوە بوایە هەروەك لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (ئەبوسوفیان دەڵێت: .... دوحیەی کەلبی بەنامەی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتە خزمەت فەرمانڕەوای (بوسرا) ئەویش ناردیە خزمەت هێرقل).

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك قەیسەر نامەکەی پێغەمبەری خودای پێگەیشت و بۆی خوێندرایەوە فەرمووی: بڕۆن کەسێکی ئەو [هۆزەم بۆ بێنن کەخزمی ئەو پیاوە بێت کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات] بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەم لە بارەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ)[٨٨٧]. هەر ئیبن عەباس ﷺ لە ئەبوسوفیانەوە ﷺ دەفەرموێت: (...ئەو بوو بانگی سەرۆکی جەندرمەکانی کرد بوو پێ فەرموو بوو: دەرەوە و ناوەوەی

---

[٨٨٥] أخرجه: البخاري (٤٥٥٣)، وعبدالرزاق (٩٧٢٤)، ومسلم (١٧٧٣)، واحمد (٢٣٧٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، واللفظ للبخاري والزيادة لابن اسحاق عند الطبري (التاريخ) (٦٤٧/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٨١/٤)، والطبراني (الكبير) (٧٢٧١).

[٨٨٦] اخرجه: ابن حبان (٤٥٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح –كذا قال أيضاً في تحقيق (زاد المعاد) (١٢١/١)، وصححه ايضاً الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٣٨٦).

[٨٨٧] اخرجه: البخاري (٢٩٤٠)، والبيهقي (الدلائل) (٣٧٧/٤).

شام بۆ سەروبن دەکەیت هەتاکو کەسێکی خزم و کەسی [ئەو پیاوەم] [بۆ دێنی] تا پرسیار لە بارەی پلەو پایەی لێ دەکەین و [ئەبو سوفیان ﷺ دەفەرموێت]: وەڵلاهی من و هاوڕێکانم لە ناو شاری غەززە بووین کە [سەرۆکی پۆلیسەکان] هەڵیان کوتایە سەرمان](٨٨٨) پرسیاریان لێکردین ئێوە کێن؟ ئێمەش وەڵاممان دانەوە [وتی: ئێوە خزم و کەسی ئەو پیاوەن کە لە حیجاز دەرکەوتووە؟ وتمان: بەڵێ. وتی: دەفەرموون بابڕۆین بۆ خزمەتی پادشا، ئێمەش لەگەڵیدا ڕۆیشتین] هەموومانیان بەڕاپێچ کرد بۆ خزمەتی[هەتاکو گەیشتینە (ئیلیاء) چوینە ژوورەوە بۆ لای بینیمان دانیشتووە لەسەر تەختی پادشای وتاجی لەسەر ناوە و بەدەوریشیەوە گەورە پیاوانی ڕۆم دانیشتوون](٨٨٩) [ئێمەش لەبەردەمیدا دانیشتین] [بانگی وەرگێڕەکەی کرد] (ئەبو سوفیان دەفەرموێت: وەڵلاهی بەبۆچوونی من ئەوەندەی گەڕاوم هیچ پیاوێکم نەبینیوە ئەوەندەی ئەو خەتەنە نەکراوە (مەبەستی هیرەقلە) ژیرو دانا بێت کاتێك گەیشتینە خزمەتی (بانگی وەرگێڕەکەی کرد) [وتی: ئێوە لەخزم و کەسی ئەو پیاوەن؟ وتمان: بەڵێ] [وتی: کێتان لە ڕووی ڕەچەڵەك و نەژادەوە لە هەمووتان نزیکترن لەو پیاوەی کەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات؟ ئەبو سوفیان دەفەرموێت: وتم: من] [لەهەموویان نزیکترم لە ڕووی ڕەچەڵك و نەژادەوە. فەرمووی: خزمایەتی نێوانتان چی یە؟ وتم: ئەو کوڕی مامەمە لە ناو ئەو کاروانەی ئێمەدا ئەو ڕۆژە هیچ کەسێك لە نەوەی عەبدە مەناف نەبوو تەنها خۆم نەبێت. قەیسەر فەرموو] [نزیکی بخەنەوە لێم هاوەڵەکانیشی بالێی نزیك بن لەلای پشتەوەی ڕایان بگرن](٨٩٠) [منیان لە نزیکیەوە دانیشاند هاوڕێکانیشم] [لەدواوە لای شانمەوە دانیشاند]... بە(وەرگێرەکەی) وت: پێیان بڵێ: من پرسیاری لێ دەکەم لە بارەی ئەو پیاوە وە کەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات ئەگەر درۆی لەگەڵ کردم ئێوەش بەدرۆی بخەنەوە. ئەبوسوفیان ﷺ دەفەرموێت: [وەڵلاهی] [لەو ڕۆژەدا] ئەگەر [لەشەرمی] ئەوەی نەبوایە نەترسامایەکە [هاوڕێکانم] بەدرۆم بخەنەوە لەوکاتەی پرسیاری لێ دەکردم لەبارەیەوە درۆم بەدەمەوە دەکرد بەلام

---

(٨٨٨) اخرجه: الطبري (التاريخ) (٦٤٧/٢).

(٨٨٩) اخرجه: البخاري (٢٩٤١).

(٨٩٠) اخرجه: البخاري (٧).

شەرم وئابڕوچوون لەترسی ئەوەی بەدرۆم بخەنەوە وایکرد بەڕاستی وەڵامی بدەمەوە] لە گێڕانەوەیەکەی ئیبن ئیسحاقدا هاتووە (رحمه الله): [ئەبو سوفیان ﷺ فەرموویەتی: بەدڵنیاییەوە دەمزانی ئەگەر درۆی بەدەمەوە بکەم ئەوە بەدرۆ ناخرێمەوە بەڵام بەخۆم دەوت: فەرمانی کەسایەتیەکی گەورە دەبێت ڕێزی لێ بگیرێت هەر بۆیەشەرمم دەکر بەدرۆی بخەمەوە وە دەشمزانی لایەنی کەمی ئەو کارە [کەمن بەدرۆی بخەمەوە] سەرەنجام قسەکانم دەگێڕدرێتەوە لەمەودا قسەی لەبارەوە دەکرێت و کاردەکاتە سەرکەسایەتیم بۆیە بڕیارمدا بەهیچ جۆرێك درۆی بەدەمەوە نەکەم فەرمووی: پێم بڵێ دەنگ و باسی ئەو پیاوەی لەناوتاندا دەرکەوتووە [ئەو چی یە و چۆنە؟ وتم: گەنجە] پلەو پایەی زۆر بەرز نییە یە ئەو کارەی بانگەشەشی بۆ دەکات لە چوار چێوەیەك دەرنەچووە [وە وتم: ئەی خاوەن شکۆ ئەو کارەی ئەو دەستی داوەتێ ئەوەندە جێگای بایەخ نی یە و بەو ڕادەیش شان و شکۆی نی یە کە بەئێوە گەیشتووە] وەڵلاهی لەو قسانەی کردم ئاوڕیشی لێ نەداوە، فەرمووی: پێم بڵێ لەوەی پرسیارت لێ دەکەم لەبارەی ئەو کارەی دەیزانی وتم: پرسیار بکە لەبارەی هەرچیەك کە بیرتادێت؟][٨٩١] [یەکەم پرسیارێك لەبارەیەوە لێی کردم ئەوە بوو فەرمووی] بەوەرگێڕەکەی: پرسیاری لێ بکە ڕەچەڵك و نەژادی چۆنە لەناوتندا؟ ئەبو سوفیان دەفەرموێت: وتم: ئەو لەناوماندا خانەدان و خاوەن نەژادو ڕەچەڵەکی ڕەسەنە، فەرمووی: ئایە هیچ لەباوك و باپیرانی پادشابوون.

لەگێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقدا [ئایە لەوە و پێش پادشایان هەبوو موڵك و دەسەڵاتی زەوت کرابێت بۆیە ئەو قسەیەم کرد بۆ ئەوەی بزانم ئایا ئایەوێت موڵك ودەسەڵاتی پێشوی بۆ بگێڕنەوە] وتم: نەخێر، فەرمووی: بەر لەو بانگەوازەی ئێستا دەیکات درۆتان لێ بینوە بەوە تاوانبارتان کردووە؟ وتم: نەخێر. فەرمووی: کێ شوێنی دەکەوێت خانەدان و گەورەکان یاخود چەوساوە و ژێر دەستەکان؟ وتم: ژێر دەستەوچەوساوەکان. فەرمووی: زیادەکەن یاخودکەم دەکەن؟ وتم: زیاد دەکەن. فەرمووی: ئایە هیچ کەس لەوانەی کە شوێنی دەکەون لە ئاینەکەی پاشگەز دەبنەوە لەدوای ئەوەی موسوڵمان دەبن لەرقی ئەو؟

---

(٨٩١) أخرجه: الطبري (التاريخ) (٦٤٨/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٣٨٢/٤)، والطبراني (٧٢٧١)، وعن رواية ابن اسحاق وقد رتبنا رواية الطبري مع رواية البيهقي.

وتم: نەخێر فەرمووی: شەڕتان لەگەڵدا کردووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: شەڕەکانتان لەگەڵیدا چۆن بوو؟ وتم: جەنگ لەنێوانماندا بەنۆرە بووە جارێك ئەو سەرکەوتووە و جارێك ئێمە. فەرمووی: ئایە پەیمان شکێنی دەکات؟ وتم: نەخێر ئێمە ئێستا لەگەڵیدا لە دانواستانداین نازانین چی بەسەر دێنێت [وەنێمە مەترسیمان هەیە لەوەی پەیمانەکە بشکێنێت][٨٩٢]. دەفەرموێت: وەڵڵاهی هیچ قسەیەکیانم بەئەندازەی ئەم قسەیەم بێ بایەخ نەبوو لەلای هیچ گومان و دوو دڵییەکی لە دڵدا دروست نەکرد[لەوەترسام بەهۆیەوە کەسایەتیم لەکەدار بێت لە هیچ شتێکی تر نەدەترسام کارم تێ بکات] لەگێرانەوەی موسوی کوڕی عوقبە وعورەوەی کوڕی زوبەیر ﷺ: [دەفەرموێت: ئایە پەیمان دەشکێنێت. ئەبو سوفیان فەرمووی: نەخێر مەگەر ئەمجارە کەشەڕمان وەستاندووە ئەو پەیمان شێکێنی بکات. هێرقل وتی: ئەم جارە بەهۆی چ کارێکتانەوە لە پەیمان شکێنی ئەو دەترسن؟ وتم: خەڵکانێکی ئێمە پشتیوانی هاوپەیمانەکانیان کردووە لەدژی هاوپەیمانەکانی ئەو کە خۆی لەمەدینەیە. هێرقل فەرمووی: کەواتە ئێوە دەست پێشخەریان کردووە و خۆشتان پەیمان شکێنن][٨٩٣]. فەرمووی: [لەناوتاندا] بەر لە ئەو هیچ کەسێك هەبوو ئەم بانگەشەیە بکات؟ دەفەرموێت وتم: نەخێر.

لەگێڕانەوەی عورەوە و موسی (رحمهما الله) [هێرقل فەرمووی: ئێوە بەڕاستگۆی دەزانن یا بەدرۆزن لە بانگەوازەکەیدا؟ دەفەرموێت: بەڵکو بەدرۆزنی دەزانین. هێرقل وتی: ئەو قسانەی پێ مەڵێن. دڵنیابن درۆ لەهیچ کەسێکەوە دەرناکەوێت کە ئەو بانگەشەی ئاوها بکات ئەگەر ئەو پێغەمبەرە لەناوتاندایە شەڕی لەگەڵدا مەکەن چونکە جولەکەکان ئەم کاردەکەن ئەمە تایبەتمەندی ئەوانە][٨٩٤] [فەرمووی: فەرمانتان بەچی پێ دەکات؟ وتم: دەفەرموێت: (خوا بەتاك و تەنها بپەرستن و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن وە دەستبەرداری ئەوقسانەبن کە باوباپیرانتان وتویانە لەسەر بیروباوەڕتان].

---

(٨٩٢) أخرجه: البخاري (٢٩٤١).

(٨٩٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٨٤/٤).

(٨٩٤) نفس المصدر.

لەگێڕانەوەیەکی تردا[فەرمانمان پێ دەکات کە خودا بپەرستین و هاوبەشی بەهیچ جۆرێك بۆ دانەنێین و قەدەغەمان دەکات لەپەرستنی ئەوشتانەی باوباپیرانمان پەرستویانە] وە فەرمانمان پێ دەکات بەنوێژ خوێندن و [زەکات دان]وە بەڕاستگۆی و داوێن پاکی و پەیوەندی خزمایەتی و [بەئەمەك بوون بەرامبەر پەیمان و بەڵێن و پاراستن و گێڕانەوی سپاردەکان][٨٩٥] ئینجا هێرقل بەوەرگێڕەکەی فەرموو کە پێی بڵێ: کەپرسیارم لێ کرد لە بارەی [ڕەچەڵەکیەوە] وە وتت کە لەناوماندا خاوەن بنەماڵە ونەژادی ڕەسەن پێغەمبەرانیش بەهەمان شێوە لەناو بنەماڵەی خانەدان و نەژادی ڕەسەن دەنێردێن، کەپرسیارم لێ کردیت: ئایە هیچ کام لە باوك و باپیرانی پادشا بووە؟ وتت: نەخێر، وتم: ئەگەر یەکێك لەوان پادشا بوو بێت ئەوە ئەو پیاوە داوای موڵك و دەسەڵاتی باوباپیرانی دەکاتەوە وە کەپرسیارم لێ کردی لەبارەی شوێن کەوتوانی [کە خانەدان و خاوەن دەسەڵاتەکانن یاخود چەوساوە و ژێر دەستەکان باست کرد کە ژێر دەستەکانن] ئەوانە شوێن کەوتوانی پێغەمبەرانن. کەپرسیارم کرد: ئایا بەر لەوەی ئەو بانگەشەیە بکات درۆتان لێ دیبوو. وتت نەخێر بۆم دەرکەوت کەسێك بەهیچ جۆرێك درۆ لەگەڵ خەڵکیدا نەکات چۆن دەڕوات درۆ بەناو خواوە بکات، وە کە پرسیارم کرد: ئایە هیچ کەس لەوانەی شوێنی کەوتون پاشگەزبوونەتەوە لەئاینەکەیان لە دوای باوەڕهێنان پێی وەك بێزاربوون ونارەزای لێی وتت نەخێر باوەڕهێنانیش هەروایە کاتێك تێکەڵی دڵ و دەروون وبوو[هیچ کەس لێی وەڕس نابێت][٨٩٦] کەپرسیارم لێ کردی: ئایە زیاد دەکەن یاخود کەم وتت زیاد دەکەن باوەڕیش هەروایە هەتاکو تەواو دادەمەزرێت، وەکەپرسیارم کرد: ئایە شەڕتان لەگەڵدا کردووە؟ وتت بەڵێ جەنگەکەش بەتۆرە بوو جارێك ئێمە سەرکەوتوین و جارێکیش ئەو پێغەمبەرانیش بەو جۆرە بوون تا دواجار بۆ ئەوان بووە، کە پرسیارم لێکردی، ئایە پەیمان شکێنی کردووە وتت نەخێر، وە پێغەمبەران پەیمان شکێنی ناکەن، وەکەلێم پرسی هیچ کەسێك بەر لەئەو لەناوتندا هەمان بانگەشەی کردووە وتت نەخێر وتم: ئەگەر کەسێکی تر بەر لەئەو ئەو بانگەشەیەی کردبێت ئەوە (لاسایی) ئەو قسە وتراوانەی پێش خۆی

(٨٩٥) اخرجه: البخاري (٢٦٨١).

(٨٩٦) اخرجه: البخاري (٥٢).

دەکاتەوە، وەوتت: [فەرمانمان پێ دەکات بە پەرستنی خودا و هاوبەش بۆدانەنانی بەهیچ شێوەیەك وەقەدەغەمان دەکات لەپەرستنی بت و داروبەرد] وە (فەرمانمان) پێ دەکات بەنوێژ خوێندن و زەکات دان و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و [ڕاستگۆیی] و داوێن پاکی و [بەجێگەیاندنی پەیمان و بەڵێن وپاراستنی سپاردە و دانەوەی بەخاوەنەکانیان ئەمەش لە تایبەت مەندی پێغەمبەرانە][٨٩٧] ئەگەر هەموو ئەو شتانەی وتت ڕاست بن ئەوە پێغەمبەرەو [زۆر نزیکە دەسەلاتی] [بگاتە ئەم شوێن پێیانەی من] من وام دەزانی کە ئەو لە دەرەوەی ئێوە دێت هەرگیز گومانم وانە بوو کەلە ناو ئێوەدا بێت وە ئەگەر بمزانیایە دەتوانم بگەمە خزمەتی ئەوە زۆر حەز بەچاوپێکەوتنی دەکەم، ئەگەر ئێستاش لەخزمەتیا بومایە قاچەکانیم بۆ دەشۆری دڵنیابن ئەم شوێن پێیانەی منیش دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی. ئینجا داوای کرد کە نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بێنە خزمەتی ئینجا خوای ڕێك کردەوە و خوێندیەوە نوسرا بوو: ((بسم الله الرحمن الرحيم [من محمد عبدالله ورسوله] الى هرقل عظيم الروم سلامٌ على من اتبع الهدى اما بعد فاني ادعوك بدعاية الاسلام اسلمْ تسلم واسلم يؤتك الله اجرك مرتين وان توليت فان عليك اثم الآريسين و ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍۢ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًۭٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًۭا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ (آل عمران: ٦٤))[٨٩٨] واتە: ((بەناوی خودی بەخشندە و میهرەبان [لەمحمد بەندە و پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆ هێرەقل خاوەن شکۆی ڕۆم سلاو لەو کەسەی کە شوێن ڕێگای هیدایەت دەکەوێت پاشان من بەبانگەوازی ئیسلامەتی بانگتت دەکەم موسوڵمان ببە سەلامەت دەبیت موسوڵمان ببە، خودا دووجار پاداشتت دەداتەوە وە ئەگەر بەدەم بانگەوازەکەمەوە نەیەیت وپشت هەلکەیت ئەوا ئۆباڵی تاوانی ناریسیەکانت لە ئەستۆیە کە لەژێر دەسەلاتی تۆن وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەخاوەن نامەکان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر وشەو بەرنامەیەك سووربین کە

---

[٨٩٧] اخرجه: البخاري (٢٦٨١).

[٨٩٨] اخرجه: البخاري (٤٥٥٣)، ومسلم (١٧٧٣)، واحمد (٢٣٧٠)، وعبدالرزاق (٩٧٢٤)، وابن حبان (٦٥٥٥)، وابوداود (٥١٣٦)، والترمذي (٢٧١٧).

بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانە، و پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری، و واز لەو جیاوازی یە بێنن وەرن باجگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین، و هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك وهاویەشی هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو بپەرستین، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەکدی نەبین، جولەکە عوزەیریان بەخوا دادەناو، گاورەکانیش عیسا! ئینجا ئەگەر هەر روویان لەرقسە راستەیە وەرگێڕاو بۆ یەکتاپەرستیی نەهاتن بەدەمتانەوە، بەراشکاوی پێیان بڵێن: دەسا ئێوە بەشایەت بن و بزانن کە بەڕاستیی ئێمە موسوسڵمان وملکەچی بڕیارەکانی خواین و، سووریشین لەسەر دینی خۆمان و، خواش تاكو تەنیایەو، ئیتر نە عوزەیر خوایەو، نەعیسایش﴾)).

**لەگێڕانەوەیەکی تردا [ئەبو سوفیان دەڵێت: خاوەن شکۆ هێرقل نێوچەوانی ئارەقی لێ دەتکا لەو نارەحەتیەی دوچاری ببوو بەهۆی نامەکەی پێغەمبەری ﷺ کە بۆی نوسیبوو وە کاریگەری ئەوەی تێدا بوو][899] لە گێڕانەوەیەکی تردا [قەیسەر نامەکەی پێغەمبەری خودای ﷺ خوێندەوە فەرمووی: ئەم نامەیە لەدوای سولەیمان پێغەمبەرە ﷺ کەس گوێبستی نەبوو کەتێدا نوسراوە (بسم الله الرحمن الرحيم)][900] ئەبو سوفیان دەڵێت: کاتێ: [کەفەرمایشتەکانی بۆوە] هێرقل ئەوەی ویستی لەو بارەوە قسەی کرد و نامەکەی بۆ خوێندنەوە بووە دەنگە دەنگ و [دەنگی ئەوانەی چواردەوری لەگەورە پیاوانی ڕۆم بەرز بۆوە و کەوتنە قیژە و هەواری زۆر ئێمە نەمان دەزانی دەڵێن چی پاشان فەرمانی کرد ئێمەیان کردە دەرەوە] [کاتێك چووینە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێکانم هەر خۆمان بووین پێم گوتن] بەڕاستی ئاینەکەی کوڕی ئەبوکەبشە (مەبەست ئاینی پێغەمبەری خودایە ﷺ) چاك گەورە بووە و پەرەی سەندووە پادشای (بەنی ئەصفەریش) ڕۆمەکان لێ دەترسێت [بەردەوام لەترس و دڵە ڕاوکێی محمددابوو][901] [هەر بەو جۆرە بەردەوام بووم هەتاکو**

---

(899) اخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٧٤)، وابونعيم (الدلائل) رقم (٢٣٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (٥/٣٠٧) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(900) اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٧٨٢) عن سعيد بن المسيب مرسلاً ومراسيلة صحيحة، وسعيد بن منصور (السنن) (٢٤٨٠).

(901) اخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٧٤)، وابونعيم (الدلائل) (رقم: ٢٣٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (٥/٣٠٧) رجاله رجال الصحيح.

ئەواو دڵنیابووم کە ئاینەکەی بەم نزیکانە سەردەکەوێت و خودای گەورەش ئیسلامەتی خستە دڵمەوە و موسوڵمان بووم کەپێشتر ڕقم لێی دەبۆوە... پاشان هێرقل نامەی نوسیی بۆ هاوڕێکی خۆی لە ڕۆمی یەکان، کە هاوشانی خۆی بوو لە زانست و زانیاری، هێرقل بەرێکەوتەوە بەرەو (حمص) هێشتا نەگەیشت بۆوە (حمص) کەنامەی هاوڕێکە هاتە خزمەتی هەمان بۆچونی ئەوی هەبوو لەهاتنی ئەو پێغەمبەرە وە ئەو پێغەمبەرەش و [ئەو کەسەیە کە چاوەڕێی بوین هیچ گومانی تێدا نی یە شوێنی بکەوە و باوەڕی پێ بێنە] هێرقل ئەم بانگەوازەی خۆی بەگوێی گەورە پیاوانی ڕۆمادا دا (لەسەر بینایەکی بەرز لەسەر شێوەی قەسەر درست کرابوو) لەشاری (حمص) فەرمانی کرد دەرگاکانیان داخست پاشان لەسەر بەلە کۆنەی قەسەرەکەدا دەرکەوت و فەرمووی: ئەی گرۆهی ڕۆم ئایە سەرفرازی و سەرکەوتنتان دەوێت و دەتانەوێت ڕێگای ڕاست بگرن و ئەم دەسەڵات و موڵکەتان بۆ بمێنێتەوە ئەوە شوێنی ئەو پێغەمبەرە بکەون، هەر کە ئەمەیان بیست وەك کەرە کێوی هەڵیان کوتایە سەر دەرگاکان بینیان داخراون، کاتێك ئەم هەڵچوون و ڕاپەرینەی دیت لێیان لەباوەڕهێنانیان بێ ئومێد بوو فەرمووی: بیان گێڕنەوە وتی: من لەوە وبەرنەوقسانەم کرد ویستم تاقیتان بکەمەوە بزانم تاچ ڕادەیەك سورن لەسەر ئاینەکەتان ئێستا دڵنیابووم و بە چاوی خۆم دیتم ئینجا هەموو کەوتنە کڕنوش بردن بۆی و ڕەزامەندیان نیشاندا بەرامبەری)[٩٠٢].

لەگێڕانەوەکەی ئیبن ئیسحاقدا (رحمه الله): (...فەرمانی کرد کە گەورە پیاوانی ڕۆم کە کۆببنەوە لەکۆشکی پاشایەتی فەرمانی کرد دەرگاکان لەسەریان دابخات، پاشان خۆی لەترسی ئەوان لەبەلەکۆنەیەکی بەرزەوە کەبەسەریاندا دەیڕوانی دەرکەوت و فەرمووی: ئەی گرۆهی ڕۆم من نامەیەکی ئەحمەدم پێ گەیشتووە وەڵاهی ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد وەباسی ئەو لەکتێبەکەماندا هاتووە بەکات و نیشانەکانی دەناسینەوە موسوڵمان بن و شوێنی بکەون ئاینەکەتان و دواڕۆژتن سەلامەت دەبێت. هەر کە ئەمەیان بیست هەڵیان کوتایەسەر دەرگاکان و وەك یەك ڕاپەڕین و کاتێك سەیریان کرد

---

[٩٠٢] أخرجه: البخاري (٤٥٥٣)، ومسلم (١٧٧٣)، والنسائي (الكبرى) (١١٠٦٤)، وعبدالرزاق (٩٧٢٤)، وابن حبان (٦٥٥٥).

دەرگاکان لەسەریان داخرا بوو هێرقل ترسا لێیان و وتی: بیان گێڕنەوە بۆ لای من ئەوانیش گێڕایانەوە فەرمووی: ئەی گرۆهی ڕۆمەکان من ئەو قسانەم بۆیە بۆ ئێوە کرد تاقیمکردنەوە تا بزانم چۆنن لە دەستگرتنتان بە ئاینەکەتانەوە بەڕاستی ئەوەی لەئێوەم بینی دڵخۆشی کردم ئەوانیش کەوتنە کڕنوش بردن بۆی پاشان دەرگای کۆشەکەیان لێ کردنەوە وڕۆیشتنە دەرەوە][903].

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: (...هێرقل بە دوحیەی وت: من ئێستا بەرەو شاری (حمص) دەڕۆمەوە وەرە لام لەوێ، کاتێك گەیشتەوە هاتە خزمەتی، قەیسەر فەرمانی کرد دەرگاکانی کۆشکیان داخست، پاشان فەرمانی کرد بەبانگدەرێك کە بانگەوازی بکات، کە قەیسەر شوێنی محمد ﷺ کەوتووە و موسوڵمان بوو و دەست بەرداری ئاینی (نەصرانی) بوو، سەربازەکانی هێرشیان بۆ هێناو خۆیان پڕچەك کرد و دەوری کۆشکەکەیان گرت، ئینجا فەرمووری بەنێردراوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: دوحیە): خۆت دەبینی بەڕاستی من دەترسم لە وڵاتەکەم، پاشان فەرمانی کرد کە بانگدەرەکە بانگەواز بکاتەوە: کە قەیسەر لە ئێوە ڕازیە وە ویستی تاقیتان بکاتەوە تا بزانێت چۆن ئارامگر لەسەر ئاینەکەتان ئێستا بگەڕێنەوە، ئەوانیش بڵاوەیان لێ کرد، قەیسەر نامەی نوسی بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ: من موسوڵمان بووم چەندین دینار پارەی نارد بۆ خزمەتی، پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك نامەکەی خوێندووە، فەرمووی: ((كذب عدوا الله ليس بمسلم وهوعلى النصرانية)) واتە: ((درۆ دەکات دوژمنی خودا موسوڵمان نەبوو ئێستاش نەصرانیە)) پارەکەشی دابەشکرد)[904].

ئەوەی ئەم فەرموودەیە زیاتر بەهێزتر دەکات فەرموودەیەکی ترە کە باس دەکات کە ئەو ترساوە کە دەسەڵاتی لە بەین بچێت هەر بۆیە موسوڵمان نەبووە ئەوەش لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا (ضعیف) لە عەبدوڵڵای کوڕی شەدادەوە هاتووە رضي الله عنه: (.... قەیسەر

(٩٠٣) اخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٢٧١)، والبيهقي (الدلائل) (٣٨٤/٤)، والطبري (التاريخ) (٦٤٨/٢).
(٩٠٤) اخرجه: ابن حبان (٤٥٠٤)، وقال محققه الارناؤط: اسناده صحيح – وكذا قال في (زاد المعاد) (١٢١/١)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٧/١) اخرجه: ابوعبيد في (الأموال) بسند صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٣٨٦).

فەرموویەتی من دەزانم و باوەڕدەکەم بەوەی کەدەیفەرموێت بەڵام ناتوانم شوێنی بکەوم ڕۆمەکان دەمکوژن و موڵك و دەسەڵاتم لەبەین دەچێت. لەگێڕانەوەیەکی تردا: دەفەرموێت: بە هاوەڵەکەت ڕابگەیەنە کەمن باوەڕم هەیە کە ئەو پێغەمبەرە بەڵام دەست بەرداری موڵك و دەسەڵاتەکەم نابم])[905]. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە لە هیشامی کوڕی عاصی ئەمەوی کە دەفەرموێت لەسەردەمی ئەبوبکردا ﷺ لەگەڵ کەسێکی تردا (نێردراوە بۆ لای هێرقل کە بانگی بکات بۆ ئیسلام... لای هێرقل وێنەی ئەم پێغەمبەرانەی بینی بوو (آدم، نوح، إبراهیم، موسى هارون، لوط، ئیسحاق، یعقوب، اسماعیل، یوسف، داود، سولیمان، عیسى، محمد پێغەمبەری خودا ﷺ)... لەکۆتایدا هێرقل فەرمووی: وەڵلاهی بەختەوەر و ئاسودەم بە دەرچوونی خۆم لەم موڵك و دەسەڵاتەم بەجۆرێك ببمە کۆیلەی ئەمیرەکەتان لە ناو موڵك و دەسەڵاتی ئەو دا هەتاکو دەمرم. دەفەرموێت: پاشان باشترین و جوانترین دیاری پێشکەش کردین و بەڕێی کردینەوە...)[906].

بەڵام هێرقل پارێزگاری لە نامەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ کرد وبەڕێزەوە پاراستی هەروەك سوهەیلی (رحمه الله) دەفەرموێت: (هێرقل نامەکەی پێغەمبەری لە ناو لولەکێکی زێڕدا هەڵگرت وەك ڕێزو گەورەییەك بۆ نامەکە و بەردەوام قەیسەر دوای قەیسەر بەمیرات لەیەکتریان وەردەگرت)[907].

لەگێڕانەوەکەی ئەبو ڕاشد ﷺ هاتووە ئەویش لەتەنوخی نێردراوی قەیسەر بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (...نامەیەکم نوسیووە بۆ خاوەنەکەت هەڵیگرتووە بەردەوام خەڵکی لەلای ئەودا سەیری دەکەن بەگەورە و ڕێزەوە

---

[905] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٩٨١)، وابونعيم (الدلائل) (رقم: ٢٤٠)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٠٩/٥) فيه ضعيف، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٠٩/٥) فيه ضعيفان.

[906] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٨٤/١)، والطبراني (الكبير) (١٤٤/٢)، وقال ابن كثير: حديث جيد الاسناد ورجاله ثقات: انظر (كنز العمال) (٣٠٢٩٥)، و(تفسير القران العظيم) (٥٦٤/٣)، وقال ابن دقيق العيد: حديث حسن: انظر (مجمع الزوائد) (٢٣٢/٨).

[907] اخرجه: (فتح الباري) (٦٠/١).

هەر لەبەر ئەوە بەردەوام خێرو خۆشی لەخۆیان دەبینن)[٩٠٨]. لێکۆڵەر (خالید سەید عەلی) ئەوە دووپات دەکاتەوە کە نامەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ قەیسەر پادشای کۆچکردووی ئوردن (مەلیك حوسەین) کڕیویەتی، مۆزەخانەی بەریتانیاش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەو نامەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زاینی واتە: سەردەمی پێغەمبەر ﷺ[٩٠٩]. لەفەرموودەیەکی لاوازدا (ضعیف) هاتووە کە هێرقل دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردووە هەروەك ئەنەس ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (پادشای ڕۆم کەوڵێکی درێژ لە ئاوریشمی تەنك بەدیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد بوو...)[٩١٠] ئەوەی دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوە دوو فەرموودەیە کە ڕوونی دەکەنەوە دوحیە ﷺ دوو دیاری گەیاندوەتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ کەلەوانەیە لەلای پاشای ڕۆمەوە هێنا بێتی ئەوانیش پۆشاکی سپی قیبطی و دوو خووف بوون: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ پۆشاکێکی قیبطی ئەستوری پێدام کە لەوانە بوو دوحیەی کەلبی بەدیاری بۆی هێنا بوو، منیش دامە هاوسەرەکەم کە لەبەری بکات پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((مالك لم تلبس القبطية؟)) واتە: ((لەبەرچی پۆشاکە قیبطیەکەت لەبەر نەکردووە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دامە هاوسەرەکەم تا بپۆشێت، فەرمووی: ((مُرها فلتجعل تحتها غلالة فاني اخشى ان تصف عظامها)) واتە: ((برۆ پێی بڵێ لە ژێرەوە ژێر کراسێك بپۆشێت دەترسێم کەمێسکەکانی لەناویدا دەرکەوێت))[٩١١].

---

[٩٠٨] أخرجه: احمد (١٦٦٩٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابويعلى (١٥٩٧) وقال محققه: رجاله ثقات، وابن زنجوية (الاموال) (١٠٤)، وابي عبيد (الاموال) (٦٢٥)، وقال ابن كثير (البداية) (١٥٠/٥): حديث غريب اسناده لا بأس به، وقال البوصيري (الاتحاف) (٦٣٥٧): اسناده صحيح.

[٩٠٩] انظر: (رسائل النبي ﷺ) (ص: ٣٠).

[٩١٠] أخرجه: احمد (١٣٤٠٠) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابي داود (٤٠٤٧)، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف أبي داود) (٨٧٤).

[٩١١] أخرجه: احمد (٢٧٧٨٦) وقال محققه: اسناده محتمل التحسين، وابن سعد (٦٤/٤)، والطبراني (الكبير) (٣٧٦)، والبزار (٢٥٧٨)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٤/٤).

لەموغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ فەرموویەتی: (دوحیەی کەلبی ﷺ دوو خوفی بەدیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا بوو هەتا کۆن بوون و دڕان لەپێی کردن)[٩١٢].

پێغەمبەری خودا مژدەی داوە بەلەناچوونی کیسرا و قەیسەر و فەرموویەتی کە کیسراو قەیسەری تر لە دوایاندا نایەتەوە، جابر ﷺ دەیگرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموێت: ((اذا هلك قيصر فلا قيصر بعده واذا هلك كسرى فلا كسرى بعده، والذي نفسي بيده لتنفقنّ كنوزهما في سبيل الله عزوجل)) واتە: ((ئەگەر قەیسەر لەناوچوو قەیسەری تر لەدوای نایتەوە، وەئەگەر کیسرا لەناوچوو کیسرای تر لەدوای نایەت، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەنجینەکانیان دەبەخشنەوە لە پێناوی خودای بالادەست))[٩١٣].

## ٥-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پادشای عومان

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەعەمری کوڕی عاصەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ناردمی بۆ لای جیفرو عەبیدی کوڕی جەلنەدی کە لە عومان بوون هەردووکیان پادشا بوون لە بەنی ئەزدبوون: (دەقی نامەکە): ((بسم الله الرحمن الرحيم: من محمد عبدالله الى جيفرو عبيد ابني الجلندي ، سلام على من اتبع الهوى، اما بعد: فاني ادعو كما بدعاية الاسلام، اسلما تسلما فاني رسول الله الى الناس كافة لانذر من كان حيا ويحق القول على الكافرين فانكما ان اقررتما بالاسلام وليتكما، وان ابيتما ان تقرا بالاسلام، فان ملككما زائل وخيلي تحلّ بساحتكما وتظهر نبوتي على ملككما)) واتە: ((بەناوی خوای بەخشندە ومیهرەبان لە محمد بەندەی خوداوە بۆ جیفرو عوبەیدی کوڕانی جەلنەدی، سڵاو لەو کەسەی شوێن ڕێگای هیدات دەکەوێت، پاشان من بە بانگەوازی ئیسلام بانگتان دەکەم، موسوڵمان بن، سەلامەت دەبن من پێغەمبەری خودام بۆ خەڵکی جیهان بەگشتی بۆ ئەوەی هەموو کەسیکی خاوەن هۆش و ژیر بێداربکەمەوە وە وادە بێمنە جێ بۆ سەر بێ باوەڕان،

---

[٩١٢] أخرجه: الترمذي (١٧٧٥)، وفي (الشمائل) (٧٣)، وابوالشيخ (اخلاق النبي ﷺ) رقم (٣٨١) وقال محققه: اسناده حسن، وقال الارناؤط (شرح السنة) (٣١٥١): اسناده صحيح، وصححه ايضاً الشيخ الالباني في (مختصر الشمائل) (٥٩).

[٩١٣] أخرجه: احمد (٩٢/٥)، والبخاري (٣٦١٨)، ومسلم (٢٩١٨)، والترمذي (٢٣١٣).

ئێوە ئەگەر موسوڵمان ببن ئەوا دەبنەوە دەسەڵاتداری ناوچەکەی خۆتان، وە ئەگەر پشت هەڵکەن و دان بەئیسلام دا نەنێن، ئەو موڵك و دەسەڵاتتان لە بەین دەچێت ئەسپ سوارەکانی من دەگەنە سەرتان و پێغەمبەرایەتی منتان بۆ دەردەکەوێت و بەسەر دەوڵەتەکەتان فەرمانڕەوای دەکات)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (هەر دوو پاشا کە دووکیان موسوڵمان بوون (واتە: پادشاکانی عومان) لەگەڵیاندا خەڵکێکی زۆر موسوڵمان بوون و سەرانە و (جزیە) یان دانا لەسەر ئەوانە کە موسوڵمان نەبوون)[914].

پێغەمبەری خودا ستایشی خەڵکی عومانی کردووە وە ئاشکرای کرد کە ئەوان لە نامەبەرو نێردراوەکان نادەن و قسەی ناشرینیان پێ ناڵێن، لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی نارد بۆ ناوچەیەك لە ناوچەکانی عەرەب بۆ پێویستیەك ئەوان لێیان دابوو وە قسەی ناشیرینیان پێ وتبوو [ئەو کەسە گەڕایەوە] وچووە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ [سکاڵای ئەوەی لەخزمەتی کرد] و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((لو انك [اتيت اهل عمان] ماضربوك ولا سبوك))[915] واتە: ((گەر تۆ [بچوایتە لای خەڵکی عومان] دوچاری لێدان و قسە پێ وتن نەدەبووی)). لەگێڕانەوەیەکدا ((لكن اهل عُمان لو أتاهم رسولي ما سبُوه ولا ضربوه))[916] واتە: (بەڵام خەڵکی عومان ئەگەر نێردراوی من بچوا یە لایان قسەیان پێ نەدەوتن ولێیان نەدەدان).

---

(914) أخرجه: ابن سعد (١٨/١)، وابن هشام (٢٢٨/٤)، أخرجه: : الطبراني (الكبير) (٨/٢٠) وفي (الاحاديث الطوال) (٢٣)، وقال الحافظ في (الاصابة) رقم (١٣١٢): رواه عبدان باسناد صحيح الى الزهري

(915) أخرجه: احمد (١٩٧٩٧). وقال محققه: اسناده حسن، ومسلم (٢٥٤٤)، وابي يعلى (٧٤٣٥)، واحمد في (الفضائل) (١٥١٦)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٧٣٠).

(916) خرجه: ابن حبان (٧٣١٠)، وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

## ٦- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی زوهەیر

ئەم نامەیە بانگەواز وڕوونکردنەوە بوو بۆ یەکێك لە عەشیرەتەکانی هۆزی عوکل ئەویش بەنی زوهەیری کوڕی ئوقیش بوون، لە عەبدوڵڵای کوڕی شوخەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لەمەربەدی (بەصرە) بووین پیاوێکی سەرو قژی ئاڵۆسکاوم بینی (ناوی: نەمری کوڕی تولب) بوو پارچەیەك چەرمی بەدەستەوە بوو، پێمان وت: دەڵێی خەڵکی بادیەی؟ وتی: بەڵێ: وە فەرمووی: ئەم نامەیە پێغەمبەری خودا بە ﷺ بۆی نوسیووم] وتمان: ئەو پارچەپێستەی لەناو دەستدایە بمان دەری؟ [فەرمووی: ئایە کەسێکتان تێدایە بیخوێنێتەوە؟ وتم: (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شوخەیر): من دەی خوێنمەوە. فەرمووی: ها لێم وەرگرە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆی نوسیووم] ئێمەش لێمان وەرگرت و خوێندمانەوە بینمان تێیدا هاتووە: (([بسم الله الرحمن الرحيم] من محمد رسول الله الى بني زُهير [انكم ان شهدتم ان لااله الا الله وان محمداً رسول الله واقمتم الصلاة وآتيتم الزكاة وأديتم] الخمس من الغنيمة وسهم النبي ﷺ والصفي [وفارقتم المشركين] فانتم آمنون بأمان الله وأمان رسوله)).....)[٩١٧] واتە: ((بەناوی خودای بەخشندە ومیهرەبان لە محمد پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆ بەنی زوهەیری [ئێوە ئەگەر شایەتمان بێنن کە جگە لەخودا هیچ پەرستراوێك بەحەق بوونی نیە و محمدیش نێردراوی خودایە و نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن] وپێنج یەك لە غەنیمەت دیاری بکەن لەگەڵ بەشی پێغەمبەری خودا و ﷺ هەژاران [وە لەموشریکەکان جیاببنەوە و پشتیوانیان نەکەن] ئەوە ئێوە لە ئاسایشدا مسۆگەر دەبن بەئەمانی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ.....)).

[٩١٧] أخرجه: احمد (٥/٧٧)، وابوداود (٢٩٩٩)، والنسائي (٧/١٣٤)، والبيهقي (الكبرى) (٧/٥٨)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٧٧٩٠) وقال محققه: صحيح، والطبراني (الاوسط) (٤٩٤٠)، ابن حبان (٦٥٥٧) ووقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ المقبل (الصحيح المسند) (١٤٦٩)، وصححه ايضاً الشيخ الالباني (الارواء) (٥/٣٢).

## ٧- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی بەکری کوڕی وائیل

ئەنەس ﷺ دەفەموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نامەی نوسیوە بۆ بەنی بەکری کوڕی وائیل: ((من محمد رسول الله الى بكر بن وائل ان اسلموا تسلموا)) واتە: ((لە محمد پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆ بەنی بەکری کوڕی وائیل ئەگەر موسوڵمان بن سەلامەت دەبن)) مەرثەدی کوڕی ضەبیان دەفەرموێت: (نامەی پێغەمبەری خودامان ﷺ بۆ هات هیچ خوێند وارێکمان دەست نەکەوت بۆمان بخوێنێتەوە هەتا کەسێکی بەنی ضوبەیعە بۆی خوێندنینەوە...)[٩١٨].

## ٨- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی جوذەیمە

ئیبن ئیسحاق (رحمه الله) دەفەرموێت: (لەکاتی دانوستانی حودەیبیەدا ڕیفاعەی کوڕی زەیدی جوذامی هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ وە کویلەیەکی پێشکەش بەپێغەمبەری خودا ﷺ کرد، پاشان موسوڵمان بوونێکی ڕاستەقینە و خواناسانە موسوڵمان بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ نامەیەکی بۆ هۆزەکەی نوسی کەلەنامەکەدا هاتبوو: ((بسم الله الرحمن الرحيم هذا كتابٌ من محمد رسول الله لرفاعة بن زيد اني بعثته الى قومه عامة، ومن دخل فيهم يدعوهم الى الله والى رسوله، فمن اقبل منهم ففي حزب الله ورسوله، ومن أدبر فله أمان شهرين)) واتە: ((بەناوی خودای بەخشندە ومیهرەبان ئەم نامەیە لە محمد ی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ڕیفاعەی کوڕی زەیدی جوذامی من ناردوومە بۆ ناو هۆزەکەی بەگشتی، هەر کەسێك بێتە ناویانەوە و لەگەڵیاندا بێت بانگەوازی بکەن بۆ لای خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەر کەسێك لەوانە قبوڵی کرد ئەوە دێتە ناو کۆمەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە هەر کەسێکیش پشتی هەڵکردوو موسوڵمان نەبوو ئەوا تا دوو مانگ لەئاسایشدا دەبێت)). کاتێك

---

(٩١٨) اخرجه: احمد (٥/٦٨)، وابن سعد (١/٢٨١)، والطبراني (الصغير) (٣٠٧)، وابويعلى (٢٩٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح، والبزار (١٦٧٠)، وقال الهيثمي (المجمع) (٥/٣١٥) رواه ابويعلى والبزار ورجالهما رجال الصحيح، وابن حبان (٦٥٥٨)، وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

ریفاعە گەڕایەوە ناو هۆزەکەی بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتن و موسوڵمان بوون، پاشان ڕۆیشتن بوو مەدینە و لەگەرمەسێری (حرّة الرّجلان) لەوێدا نیشتەجێ بوون)[٩١٩].

## ٩- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئوکەیدر خاوەنی ناوچەی دومە

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ نامەی نوسی بۆ کیسرا و قەیسەر و ئوکەیدری دومە بانگەوازی دەکرن بۆ لای خودای گەورە)[٩٢٠].

وە هەروەها نامەی نوسیوە بۆ مونزیری کوڕی ساوی فەرمانڕەوای بەحرەین و هۆزەیل کوڕی عەلی فەرمانڕەوایە مامە[٩٢١] وەنامەیەکی نوسیوە بۆ خەڵکی جەرەش[٩٢٢] وە بۆ زۆرێکی تریش بێجگە لەوانە، زۆربەری ئەم نامانە بانگەوازی بوون بۆ گەیاندنی ئەم ئاینە تازەیە بەخەڵکی یا ڕوونکردنەوەی هەندێك لەحوکمە خوایەکان بوو[٩٢٣]. پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێك لە دیاریەکانیانی قبوڵ کردووە بۆ ڕاگرتنی دڵیان و ئاشنایەتی و دۆستایەتی زیاتر وە دیاری بۆ ناردونەتەوە، لە ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (ئوکەیدری دومە دیاریکی پێشکەشی پێغەمبەری خودا کرد کە پۆشاکێکی نەرم ونیان بوو خەڵکەکە سەریان سوڕما بوو لە جوانیەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ((دەستە سڕەکەی سەعد (واتە: سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ) لەبەهەشتدا باشترە لەوە))[٩٢٤]. عیکرمە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری

---

[٩١٩] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٥٦٢)، وابن هشام (٢٠٦/٤)، وابن عبدالبر في (الدرر) (ص: ٣١٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٣١٠/٥): اسناده الى ابن اسحاق جيّد.

[٩٢٠] أخرجه: ابن حبان (٦٥٥٣)، وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٩٢١] أخرجه: الطبري (٦٤٤/٢)، وابن سعد (٦٧٦/٢)، وابن كثير (البداية) (٢٦٨/٤)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٣٨٦، ٣٩١، ٣٩٢).

[٩٢٢] أخرجه: احمد (١٩٦١، ٣١١٠)، وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

[٩٢٣] انظر: (اعلام السائلين عن كتب سيد المرسلين) لابن طولون (ص: ٦٦، ٧٠، ١٠٦)، و(مجموعة الوثائق السياسية) لمحمد حميدالله (ص: ٧٠، ٩٠، ...).

[٩٢٤] أخرجه: احمد (١٢٠٩٣) وقال محققه: حديث صحيح.

خودا ﷺ خورمای عەجوەی لەگەڵ نامەکەیدا نارد کە نوسی بوو بۆ ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب، بەعەمری کوڕی ئومیەی ضەمری نارد و ئەویش پێستەی بۆ ناردەوە بەدیاری[٩٢٥].

# غەزای (ذات الرّقاع)

نوسەرانی سیرە و غەزاکان و فەرمودەناسان جیاوازیان هەیە لە دیاری کردنی مێژووی ئەم غەزایە، ئیمامی بوخاری ﷺ دەفەرموێت: ئەو غەزایە ڕووی داوە لە مانگی (ربیع الاول) لە ساڵی حەوتەمی کۆچی لە دوای غەزای خەیبەر[٩٢٦] لەبەر ئەوەی هەریەکە لە ئەبوموسی و ئەبوهورەیرە و ئیبن عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) بەشداری ئەم غەزایەیان کردوە وە نوێژی ترسی تێدا کراوە ئەمەش بە کۆی ڕای زانایان لە دوای ڕێکەوتن نامەی حودەیبەوە بووە، بە فەرمانێکی شەرعی. ئیمامی ئیبن کەثیر[٩٢٧] و ئیبن حەجەر[٩٢٨] وە ئیبن قەیم[٩٢٩] عیمەری و زانایانی تر ئەوانیش لە زاناهاوچەرخەکان پشتیوانی ئەو بۆچونە دەکەن[٩٣٠]. بەویستی خودا ئەمە ڕاسترین بۆ چوونە، بەلام لای ئیبن ئیسحاق ﷺ ئەم غەزایە لەدوای دەرکردنی بەنی نەضیر ڕوویداوە ئەوانەی ئەم بۆ چوونە پشت ڕاست دەکەنەوە کۆمەڵێک لەنوسەرانی سیرە و هەندێك لەزانا هاوچەرخەکانن[٩٣١] بەڵگە بۆ چونەکەیان دێننەوە کە جابر هاوسەری هەبووە لەکاتی ڕوودانی غەزای خەندەقدا خۆی و هاوسەرەکەی ﷺ خواردنیان پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ئامادە دەکرد و لێرەدا هیچ شتێك دەربارەی ژمارەی موسوڵمانەکان و وردەکاریەکانی ترەوە نەهاتوە تەنها لە گێڕانەوەکەی واقیدیدا نەبێت کە پوختەکەی ئەوەیە کە کەسێك هاتوە لەناویاندا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(٩٢٥) أخرجه: ابن سعد (٢/٣٠٠)، وابن عساكر (تاريخ دمشق) (٢٣/٤٤١) وهو مرسل، وقال الحافظ في (الاصابة) (٤٠٦٥): اسناده صحيح.

(٩٢٦) انظر: البخاري (كتاب المغازي) (باب: غزوة ذات الرقاع) حديث رقم (٤١٢٥).

(٩٢٧) انظر: السيرة (ابن كثير) (٣/١٦١)، و(البداية) (٤/ ٨٣).

(٩٢٨) انظر: (فتح الباري) (٧/٥٣١) طبعة (دار الكتب العلمية).

(٩٢٩) انظر: (زاد المعاد) (٣/٢٥٣).

(٩٣٠) انظر: (السيرة النبوية الصحيحة) (٢/٤٦٢).

(٩٣١) انظر: (السيرة) ابن هشام (٣/١٥٤) طبعة (مكتبة العبيكان). و(فقه السيرة) للبوطي (ص: ٢٠٧).

هەواڵی پێداوە کە بەنی مەحاریب و بەنی ئەعلەبە لەهۆزی غەطەفان خەریکی خەڵك کۆکردنەوەن و ئەوان ئامادەیان دەکەن بۆ جەنگ و هەرای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و (٤٠٠ یا ٧٠٠) جەنگاوەرەوە ڕۆیشت بۆیان موسوڵمانەکان گەیشتنە شوێنی نیشتە جێبوونیان و ئەوان بەهەڵەداوان ڕایان کرد بۆ سەر لوتکەی شاخەکان و ماڵ و منداڵیان بە جێ هێشت موسوڵمانەکان نوێژی ترسیان کرد و پاشان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان بە سەلامەتی و بێ ئەوەی دوچاری هیچ زیانێك بن[٩٢٢].

هۆکاری ناونانی ئەم غەزایە بە (ذات الرّقاع) دەڵێن ناوی درەختێك بووە یان چیایەك یاخود ڕەنگی ئاڵاو ئەسپەکانی موسوڵمانان بووە[٩٢٣]، بەڵام ڕاسترین بۆچون لە سەر ناونانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موسوڵمانەکان لەبەر زۆر ڕۆیشتنیان بەپێ پێیە کانیان ئاوسابوون و قڵیشابوون بۆیە پەڕۆیان لە پێیەکانیان پێچابوو هەروەك ئەبوموسی ئەشعەری ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ غەزا بەشەش کەس یەك وشترمان بەردەکەوت بۆ سواربوون بە نۆرە سواری پشتی دەبووین ئەوە بوو قاچەکانمان ئاوسان و قڵیشیان تێکەوت من پێیەکانم قڵیشی بردو نینۆکەکانم وەری ئێمە بەو قاچە قڵیشاوانەوە دەسوڕاینەوە هەر بۆیە ئەو غەزایەش ناونرا (ذات الرّقاع) کاتێك بە پەڕوپاڵی زۆر قاچە قڵیشاوە و هەڵئاوساوەکانمان دەپێچایەوە بۆ ئەوەی لەسەری بڕۆین و ئازاری نەبێت)[٩٢٤].

جابر ﷺ دەفەرموێت: (لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ غەزای (ئەنمار) [لەگێڕانەوەیەکی تردا (ذات الرّقاع)][٩٢٥] لەکاتێکدا من لە ژێر سێبەری درەختێکدا خستبووم پێغەمبەری خوام ﷺ چاو پێکەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرە بۆ ئێرە بۆ ژێر سێبەری ئەم درەختە و پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیە ژێر درەختەکە منیش هەستام بەرەو لای تورەکەکەمان ڕۆیشتم دەستم تێدادەگێڕا ترۆزی تازە پێگەیشتوم تیایدا دەرهێنا

---

[٩٢٢] أخرجه: ابن سعد (٢/ ٤٦) عن الواقدي في (المغازي) (١/ ٣٩٦).

[٩٢٣] انظر: (سبل الهدى والرشاد) (٥/ ١٧٥).

[٩٢٤] أخرجه: البخاري (٤١٢٨)، ومسلم (١٨١٦).

[٩٢٥] أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢/ ٣٢).

و قاشم کرد، پاشان بردمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من این لکم هذا))؟ واتە: (ئەمەتان لەکوێ هێناوە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەدینەوە لەگەڵ خۆماندا هێناومانە، جابر ﷺ دەفەرموێت: هاوەڵێکمان خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بڕوات لە پشتەوەمان پاسەوانیمان بکات فەرمووی: ئامادەمان کرد پاشان ڕۆیشت بۆ پشتەوەمان دوو پۆشاکی خەتخەتی بەسەر شانی دا دابوو پشتی لە ئێمە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەتێڕامانەوە سەیری دەکرد و فەرمووی: ((أما له ثوبان غير هذين؟)) واتە: (ئایا دوو چلی تری نیە جگە لەو جلانەی کەلەبەری دایە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر نارێکی و عەیبی ئەو دووجلەی لەبەر کردووە؟، فەرمووی: ((فادعه فمرُه فليلبـسهما)) واتە: (بانگی بکەوە و پێی بڵێ با لەبەریان بکات). دەفەرموێت: بانگم کرد و لەبەری کردن و ئینجا هەستاو ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ماله ضرب الله عنقه أليس هذا خيراً)) واتە: ((خودای گەورە گەردنی ببڕێت ئایا ئەمەیان باشتر نیە؟)) پیاوەکە گوێی لێبوو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێناوی خوادا؟ فەرمووی: ((بەڵێ لەپێناوی خوا))...)[٩٣٦].

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (...پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە کۆمەڵێکی گەورەی هۆزی غەطفان و لەیەکتری نزیك بوونەوە هیچ جەنگ و هەرایەك لەنێوانیان دا ڕووی نەدا)[٩٣٧]. لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ وهاوەڵانی دا لە دۆڵێکی پڕ لە درەخت دا لایان دا بۆ حەسانەوە لەکاتی نیوەڕۆدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەژێر دارێك دا خەوی لێکەوت کەسێك لە موشریکەکان هەڵی کوتایە سەری و شمشێرەکەی هەڵکێشا لێی پاشان خوای گەورە پاراستی لەدەستی، پاشان پێغەمبەر ﷺ موشریکەکەی عەفوکرد.

ئەم ڕووداوە جابر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بوون لە غەزای (ذات الرقاع) [کاتێك فەرمانی گەڕانەوەی دا (منیش لەگەڵیاندا گەڕامەوە لەکاتی نیوەڕۆدا لە دۆڵێکی پڕدارو درەختی چڕو دڕکاویدا لامان دا بۆ حەسانەوە

---

(٩٣٦) أخرجه: مالك (٢/٩١٠)، والحاكم (٤/١٨٣) وصححه، والبيهقي (الدلائل) (٦/٢٤٤)، والبزار (٢٩٦٢)، وابن حبان (٥٤١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٩٣٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٥٧) برقم (٩٦٤)، والطبري (التاريخ) (٢/٥٥٦).

لە کاتی قەیلولەدا][٩٣٨] ئەوەبوو گەیشتینە درەختێکی سێبەردار بۆ پێغەمبەری خوامان ﷺ جۆڵ کرد[پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و خەڵکەکەش بڵاوەیان لێ کرد بۆ ژێردرەختە چڕوپڕەکان و لەژێر سێبەرەکانی دەحەسانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر سێبەر درەختێکی سەوز و بەلق و پۆپ بەرز دابەزی و شمشێرەکەشی بە لقێکی درەختەکە داهەڵواسی] [خەوێکی قورسمان لێ کەوت] [(موشریکەکان) ئەویان بینی بوو لەناو موسوڵمانەکان ویستیان (لەناکاو) دەستیان لێ بووەشێنن][٩٣٩] ئەوەبوو کەسێك لە موشریکەکان [بەناوی غورثی کوڕی حارث] هات و شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرەختەکەوە هەڵواسرابوو دایگرت و بە دەستیەوە گرت و هاتە سەر سەری پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: [تۆ موحەممەدی؟ فەرمووی: (بەڵێ)][٩٤٠]. وتی لە من دەترسی کەبت کوژم، پێی فەرموو: ((نەخێر)). وتی: کەواتە کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات])) فەرمووی: ((خوا [من لە دەستی تۆ ڕزگار دەکات])) [ئەو موشریکە شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە [لە گێڕانەوەیەکی تردا: شمشێرەکەی خستووە کیلان و هەڵی واسیەوە][٩٤١]، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستیەوە گرتوو و فەرمووی: ((ئەی کێ تۆ لەدەستی من ڕزگار دەکات؟)) وتی: تۆ مەردی خوابە لە من چاکتربە. فەرمووی: ((شایەتی دەدەیت کە جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تر بە حەق نی یە)) وتی: نەخێر بەڵام پەیمانت دەدەمێ شەڕت لەگەڵدا نەکەم و پشتیوانی کەسانێکیش نەکەم کە شەڕت لەگەڵدا دەکەن][٩٤٢] [جابر (رضي الله عنه) دەفەرموێت: .... ئێمە لەسەر دۆخی خۆمان بووین کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردین کاتێك چووینە خزمەتی دەبینین ئەعرابیەك لەلایەوە دانیشتوە فەرمووی: ((إن هذا أتاني وأنا نائم فاخترط سيفي فاستيقظت وهو قائم على رأسي مخترط سيفي صلتا قال [لي]: من يمنعك مني؟ قلت: الله ، فشامه ثم قعد فهو هذا)) واتە: ((ئەوە هاتۆتە سەرم لە کاتێکدا من نوستبووم

---

[٩٣٨] أخرجه: البخاري (٤١٣٥).

[٩٣٩] أخرجه: ابن حبان (٢٨٨٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٤٠] أخرجه: ابن حبان (٢٨٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٤١] أخرجه: مسلم (٨٤٣) واحمد (١٤٩٢٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[٩٤٢] أخرجه: احمد (١٤٩٢٩) وقال محققه: صحيح.

وەستابوو شمشێرەکەی هەڵکێشا بوو بەدەستیەوە وتی بە[من]: کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات؟ پێم وت: الله، شمشێرەکەی خستەوە کیلان ودانیشت لە لام ئەوە خۆیەتی)) پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشتی نەکرد ولێی نەپێچیەوە][٩٤٣] [بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڕەشەیان لێکرد لەسەر ئەو کارەی][٩٤٤] [(پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕێگەی دا بڕوا ئەویش گەڕایەوە ناو هاوەڵانی خۆی وتی: لەلای باشترین کەسی سەر زەویەوە هاتومەوە بۆ ناوتان] [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەڕۆیشتن و هەڵگرتنی چەکەکانمان][٩٤٥] [کاتێک نوێژی نیوەڕۆ بوو یاخود عەسر پێش نوێژی بۆکردین بە نوێژی ترس][٩٤٦] [ئەو بوو بانگ درا][٩٤٧] و [کۆبینەوە بۆ نوێژ][٩٤٨] قامەتی نوێژ کراو کۆمەڵێک لە دوایەوە دوو ڕکاتیان کرد و پاشان هاتنە دوایەوە و دوو ڕکاتی تری بە کۆمەڵێکی ترکرد پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی چوار ڕکاتی کرد و خەڵکەکەش دوو ڕکات بەجیا جیا لەدوایەوە نوێژیان کرد)[٩٤٩].

لە گێڕانەوەیەکی صالحی کوڕی خەواتی کوڕی جوبەیر لە باوکیەوە ﷺ (کە ئەو لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری کردوە لە غەزای (ذات الرّقاع) نوێژی ترسی کردوە: دەفەرموێت: کۆمەڵێک لە پشت پێغەمبەری خوا ﷺ بوون کۆمەڵێکیش بەرامبەر دوژمن وەستابوون نوێژی بەئەوانەکردوە کە لە دوایەوە بوون ڕکاتێک وپاشان هەستانەوە و ڕاوەستاوە بە پێوە و ئەوان خۆیان تەواویان کردوە و پاشان ڕۆیشتونە شوێنی ئەوای تریان گرتەوە و بەرامبەر دوژمن وەستاون و کۆمەڵەکەی تر هاتوون ڕکاتەکەی تری کەماوە

---

(٩٤٣) أخرجه: البخاري (٤١٣٩).

(٩٤٤) أخرجه: البخاري (٤١٣٦).

(٩٤٥) أخرجه: ابن حبان (٢٨٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٩٤٦) أخرجه: احمد (١٤٩٢٩) وقال محققه: حديث صحيح.

(٩٤٧) أخرجه: ابن حبان (٢٨٨٢) وقال محققه: اسناده صحيح.

(٩٤٨) أخرجه: ابن حبان (٢٨٨٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٩٤٩) أخرجه: البخاري (٤١٣٦).

لەگەڵیدا کردوو پاشان خۆی دانیشتوە بۆ تەحیات و ئەوان خۆیان هەستاون و نوێژەکەیان تەواویان کردووە و پاشان سڵاوی نوێژی داوەتەوە و ئەوانیش بەدوایدا)[٩٥٠].

هەر لەو غەزایەدا ئافرەتێکی موشریکەکان کوژرا کە وەك جەنگاوەر هاتبوو بۆ شەڕ[٩٥١]، کاتێك هاوسەرەکەی گەڕایەوە و بە هەواڵەکەی زانی سوێندی خوارد کە دەبێت تۆڵەی خوێنی لە سوپای موسوڵمانەکان بکاتەوە و لێیان بکوژێت، کاتێك پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانەکان لە ڕێگای گەڕانەوەدا بوون بەرەو مەدینە لە ڕێگادا بۆ حەسانەوە لە شوێنێکدا خستیان، کەسێك لە موشریکەکان هات سێ تیری گرتە پاسەوانی موسوڵمانەکان.

ئەم ڕووداوە جابری کوڕی عەبدللە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ غەزای (ذات الرقاع) لە [خاکی نەجد].... دەوریماڵێکی موشریکەکانمان دا لە ناوچەیەکدا کەسێك لە هاوەڵان ئافرەتێکی کوشت لە شەڕدا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە [هاوسەرەکەی] هاتەوە کە بە کارەساتەکەی ئەزانی بوو بۆیان باسکرد سوێندی خوارد ناگەڕێتەوە هەتا کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکوژێت [ڕۆیشت بە شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ] هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنێکدا وەستا بۆ پشودان] کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێك لە ڕێگاکان، لە ناو دۆڵێك لە دۆڵەکان لەگەڵ هاوەڵانیدا خستیان فەرمووی: ((من رجلان يكلانا في ليلتنا هذه من عدونا؟)) واتە: (دوو کەسمان دەوێت لەم شەوەدا پاسەوانیمان بکەن لە دوژمن؟) کەسێك لە موهاجرەکان [کە عەماری کوڕی یاسربوو ﷺ] [وە یەکێکیش لە ئەنصاریەکان [کە عوبادەی کوڕی بەشیر بووﷺ][٩٥٢] [فەرموویان]: ئێمە دەبینە پاسەوانت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی: ((بچنە دەروازەی دۆڵەکە)) [پێغەمبەری خوا ﷺ وهاوەڵانی] [دابەزینە ناوەوەی دۆڵەکەوە] [لە خوارەوەی سەربازگەی کافرەکان] [کاتێك دوو هاوەڵە بەڕێزەکە ڕۆیشتن] بۆ دەروازەی دۆڵەکە بەرامبەر سەربازگەی دوژمنەکان بۆ خوارەوە عوبادە بە عەمماری فەرموو: [کام بەشی شەو حەز دەکەیت تێیدا پاسەوان بیت سەرەتاکەی یا کۆتاییەکەی] بەویستی خۆت

[٩٥٠] أخرجه: البخاري (٤١٢٩).
[٩٥١] انظر: فتاوى الشيخ الالباني رحمه الله (ص: ١١١).
[٩٥٢] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/١٦٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣/٣٧٨).

ئایا سەرەتاکەی بۆ من لێ دەگەڕێیت و خۆت کۆتاییەکەی دەگریت یاخود من کۆتایەکەی و تۆ سەرەتاکەی؟ عەممار فەرمووی: تۆ سەرەتا پاسەوان بەو من لە کۆتایدا پاسەوان دەبم ئەوە بوو عەممار [پاڵکەوت] خەوی لێکەوت] عوبادە هەستا دەستی کرد بە نوێژ خوێندن سورەتی [الكهف]ی دوای فاتحە دەست پێ کرد][٩٥٣] ئەو لەسەر خوێندنی قورئان لە نوێژەکەیدا بەردەوام بوو کە هاوسەری ژنە کوژراوەکە هات کاتێك [ئەو پیاوە]ی بینی ئەوەتادا کەسێك بە پێوە وەستاوە زانی ئەوە پاسەوانی موسوڵمانەکانە [تیریکی تێگرت و پێکای] ئەویش [دەری هێنا دەست بەجێ] و نوێژەکەی نەبڕی لە قورئان خوێندنی خۆی بەردەوام بوو جوڵەی نەکرد حەزی نەکرد بیبڕێت [پاشان ئەو تیری دووەمی تێ گرت و لێیدا ئەویشی دەرهێنا و داینا، هەربەوەستاوی مایەوە] بە پێوە نەجوڵا بەردەوام قورئانی دەخوێندەوە و پێی ناخۆش بوو نوێژەکەی ببڕێت هاوسەری ژنەکە بۆ جاری سێ یەمیش تیرێکی تێگرت و بەری کەوت ئەویشی دەرهێناو خستیە لاوە پاشان ڕکوع وسوجودی برد و سڵاوی دایەوە [ئینجا هاوەڵەکەی هەستاند و پێی فەرموو: هەستە پاسەوانیەکەت بگرە] [من پێکراوم] [عەممار ڕاپەڕی] و هەستا، کاتێك بینیان [کەسەکە] هاوسەری ژنەکەیە ڕادەکات وای زانی [هەموو] سوپاکەی لێ ئاگادار دەکەنەوە [عەممار سەیری کرد عوبادە خوێنی لێ دەتکێت] برینەکەی خەڵتانی خوین بووە بەهۆی تیرەکانی مێردی ژنە کوژراوەکە پێی فەرموو: [سبحان الله]خودا لێت خۆشبێت بۆچی لەگەڵ یەکەم پێکانت بانگت نەکردم؟ فەرمووی: من دەستم بە خوێندنی سورەتێك قورئان کرد بوو حەزم دەکرد بەردەوام بم، پێم خۆش نەبوو بیبڕم [هەتا تەواو دەبێت، کاتێك زانیم بەردەوامە تیر هاوێژەکە چومە ڕکوع ئینجا بانگی تۆم کرد وەڵلاهی لە ترسی ئەوە نەبووایە کە پاراستنی ئەو دەروازەیەم پێ سپێردرابوو بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبووە هۆی لە دەست دانی ئەو ئەرکە گەورەیە ئەوە نوێژەکەم تەواوم نەدەکرد هەتا گیانم دەسپارد یاخود تەواوم دەکرد]))[٩٥٤].

---

[٩٥٣] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/ ٣٧٦).

[٩٥٤] اخرجه: احمد (١٤٧٠٤، ١٤٨٦٥) وقال محققه: حديث حسن، وابوداود (١٩٨)، والحاكم (١/ ١٥٦) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (١٠٩٦)، وابن خزيمة (٣٦)، وابن اسحاق (السيرة) رقم (٧٠١)،

لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا سوپاکە لە (بەیداء) لایاندا و خستیان ملوانکەی خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) ون بوو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەگەڕا تا بۆی بدۆزێتەوە موسوڵمانەکان ئاویان دەست نەدەکەوت هەر بەو بۆنەوە ئایەتەکانی تەیموم دابەزین.

لە خاتوو عائیشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچووین بۆ هەندێك لە سەفەرەکانی [ئەلحافظ کوڕی حەجەر دەفەرموێت: ئەوە لە دوای ڕووداوی ئیفك بوو لە غەزای (ذات الرّقاع)][955]. هەتا ئەوە بوو گەیشتینە بیداء کە ناوچەی (ذو الحليفة)یە یاخود لە (ذات الجيش) بووین (کە دۆڵێکە دەکەوێتە پشتەوەی (ذو الحليفة)) [لەو کاتەدابوو ئێمە دەگەڕاینەوە بەرەو مەدینە][956]. ملوانکەیەکم لێ ون بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەگەڕا بەدوایدا تا بیدۆزێتەوە [وە ئوسەید و کەسانێکی تری لەگەڵدا نارد بۆ ئەوەی بیدۆزنەوە و بیهێنەوە خزمەتی] خەڵکەکەش لە خزمەتیابوون، شوێنەکەش هیچ ئاوی لێ نەبوو، [خەڵکەکە] هاتنە خزمەت ئەبوبەکری صدیق ﷺ فەرموویان: دەبینی خاتوو عائیشە چی کردوە؟ پێغەمبەر و ئەو خەڵکەی ڕاگرتوە لەم شوێنە بێ ئاوەدا هیچ ئاویشمان پێ نەماوە [لە کاتی بەرەبەیاندا] ئەبوبەکر ﷺ تەشریفی هێنا لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوستبوو سەری کردبووە سەر ڕانم، فەرمووی: [کچەکەم لە هەموو گەشت وسەفەرێك دا تۆ مایەی بەڵاو ناڕەحەتی بۆ ئەو خەڵکە][957] پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو خەڵکەت وەستاندوە لەم شوێنە بێ ئاوەدا هیچ ئاویشیان پێ نەماوە. عائیشە فەرمووی: ئەبوبەکر ﷺ سەرزەنشتی کردم وڕەخنەیەکی زۆری لێ گرتم وە بەدەستی لە کەلەکەمی دەدا جوڵەم لێوە نەهات لەبەر ئەوەی پێغەمبەری

---

والطبري (التاريخ) (٥٥٩/٢)، والبيهقي (الكبرى) (١٥٠/٩) وفي (الدلائل) (٣٧٩/٣) وفي (الصغرى) (٣١) وقال محققه: اسناده قابل للتحسين، والدارقطني (٨٥٨) وقال محققه: اسناده حسن، وحسّنه الشيخ الالباني رحمه الله في (صحيح ابي داود) (١٨٢) واللفظ لاحمد والزيادات لابن هشام وابن حبان وابي داود وغيرهم.

[955] انظر: (فتح الباري) (٤٣٤/١) الحديث (٣٣٤).

[956] اخرجه: البخاري (٤٦٠٧).

[957] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣/رقم ١٥٩).

خوا ﷺ سەری خستبووە سەر ڕانم و خەوی لێکەوتبوو، بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا بەیانی نوست لەوشوێنە بێ ئاوە، ئینجا خوای گەورە ئایەتەکانی تەیمومی ناردە خوارەوە، موسوڵمانەکان تەیمومیان کرد ئوسەیدی کوڕی حوضیر ﷺ فەرمووی: ئەوە یەکەم بەرەکەتی ئێوە نیە ئەی بنەماڵەی ئەبوبەکر ﷺ، عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [کاتێك ئایەتی تەیموم هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبکرت ﷺ زۆر دڵخۆش بوو فەرمووی: [وەڵڵاهی کچەکەم ئەوەندەی من بیزانم تۆ فەڕوبەرەکەتت پێویە ئەوە بە هۆی تۆوە بۆمان دابەزی هەندیك کاروبار هەیە پێمان ناخۆشە بەلام خودا دەیگێڕێ بەمایەی خێر بۆ (تۆ) و موسوڵمانان][٩٥٨]. دەفەرموێت ناردیان ئەوە وشترە بێنن کە من سواری دەبووم ملوانکەکەمیان دۆزیەوە لە ژێر وشترەکەدا بوو)[٩٥٩].

وە هەروەها هەر لەڕێگای گەڕانەوەدا بەرەو مەدینە وشتری جابر ﷺ وەستاو نەدەڕۆیشت پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لێدا ئەوە بوو پێش خەڵکەکە کەوتەوە وە پرسیاری لێکرد لە بارەی هۆکاری پەلە کردنەکەی بۆ مەدینە و وەلەبارەی هاوسەرگیریەکەیەوە وە ئامۆژگاری کردن و وە وشترەکەی لێ کڕی، کاتێك گەیشتەوە مەدینە وشترەکەشی دایەوە و پارەکەشی، بۆ ئەم ڕووداوەش گێڕانەوەی زۆر ئاڵۆزو بەیەکدا چوو هەیە بەشێوازو وشەی شێواو، هەوڵمان داوە یەکیان بخەین و ڕێکیان بخەین بۆ ئەوەی ڕووداوێکی گشتگیر و تەواو دەرچێ لە دوای کۆکردنەوەی بەگشتی بۆ ئەم ڕووداوە دووگێڕانەوە هەیە گێڕانەوەی ئیمامی بوخاری ﷺ وکەسانی تر وە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقیش ﷺ:

١-گێڕانەوەی یەکەم کۆکراوەتەوە لە گێڕانەوەکانی ئیمامی بوخاری وموسلم وئەحمەد و نەسائی و ئیبن ماجە (ڕەزای خوایان لێبێت) وە غەیری ئەوانیش: (لە جابروە ﷺ دەفەرموێت: [من لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە غەزایەك کە غەزای (ذات الرّقاع)][٩٦٠] [شەوێك وشترەکەم ون بوو، بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕیم کە قسەی

---

[٩٥٨] أخرجه: عبدالرزاق (٨٧٩)، والطبراني (الكبير) (٢٣/ رقم١٣٠).

[٩٥٩] أخرجه: البخاري (٣٣٤، ٤٥٨٣، ٥٨٨٢) ومسلم (٣٦٧)، واحمد (١٧٩/٦)، وعبدالرزاق (٨٨٠)، والنسائي (١٦٣/١)، وابن خزيمة (٢٦٢)، وابن حبان (١٣٠٠).

[٩٦٠] أخرجه: احمد (١٥٠٢٦) وقال محققه: اسناده حسن والحديث صحيح.

لەگەڵ خاتوو عائیشە دەکرد پێمی فەرموو: (ئەوەچە جابر؟) وتم: وشترەکەم ون بوو یا وشترەکەم بەو شەوە زەنگە ڕۆیشتوە، فەرمووی: ((هذا جملك اذ هب فخذە)) واتە: ((ئەوە وشترەکەتە برۆ بیگرەوە)) هەر بەو ئاڕاستە ئاماژەی بۆ کردم ڕۆیشتم، بەڵام نەم دۆزیەوە، گەڕامەوە خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمدۆزیەوە؟ پێی فەرموومەوە: ((هذا جملك اذ هب فخذە)) واتە: ((ئەوە وشترەکەتە برۆبیگرەوە)) بۆجاری دووەمیش بەهەمان ئاڕاستە ڕۆیشتم نەم دۆزیەوە، گەڕامەوە خزمەتی، وتم: بەدایك وباوکمەوە بە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵلاهی نەم دۆزیەوە فەرمووی پێم: ((چاوەڕێ بکە)) هەتا خۆی ئامادەکرد و هات دەستی گرتم و ڕۆیشتم لەگەڵی هەتا گەیشتینە لای وشترەکە، تێی خوڕی بۆ لای من، فەرمووی: ((ئەوە وشترەکەتە)). خەڵکەکە هەندێکیان ڕۆیشتنبوون][٩٦١] [کاتێك پێیان گەیشتینە بەشێوەی قافڵە دەڕۆیشتن [لە مەدینە نزیك بوونەوە][٩٦٢] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من احب ان یتعجل فلیتعجل)) واتە: (هەرکەسێك پێی خۆشە بەخێرای بڕوات با بڕوات)][٩٦٣] [من وشترێکی بۆزم پێ بوو][٩٦٤] لە ناو خەڵکەکەدا هاوشێوەی ئەوەیان پێ نەبوو، هەر کاتێك سواری ببوومایەو تێمخوڕیایە پێشیان دەکەوتم و خەڵکەکە دەکەوتنە دوای منەوە، منیش وەك جاران هەستام سواری پشتی بم تێی خوڕم بڕوات دەبینم ناڕوات][٩٦٥] [(بۆیە من) کەوتمە دواین کەسی خەڵکەکە [پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای منەوە بوو][٩٦٦] ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە پێم] [کە (ئەو) بەسواری لە دوای منەوە بوو][٩٦٧] [وتم: ئەی هاوار من تەنها ئەو وشترە سستەم هەیە).... (پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ بیستی ئەو قسیە بوو کە وەك حەسرەت وتم، گەیشتەوە پێم [فەرمووی: ((ئەوە

---

(٩٦١) اخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحیح.

(٩٦٢) اخرجه: البخاري (٥٢٤٧).

(٩٦٣) اخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط البخاري.

(٩٦٤) اخرجه: البخاري (٢٨٦١).

(٩٦٥) اخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط البخاري.

(٩٦٦) اخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحیح.

(٩٦٧) اخرجه: البخاري (٥٢٤٧).

کێیە؟)) پێم وت جابری کوڕی عەبدللآیە][٩٦٨] فەرمووی: ((جابر ئەوە چیت وت پێش ئێستا؟)) جابر ﷺ فەرمووی: لەبیرم چوەوە کە چیم وتبوو... وتم: هیچ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچم نەوتوە. جابر ﷺ دەفەرموێت: (پاش کەمێك) بیرم کەوتەوە کەچیم وتووە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (وتم): هاوار بۆ خۆم وەك حەسرەت کێشانێك تەنها وشترێکی سستم هەیە کە ناڕوات][٩٦٩] فەرمووی: ((ماشأن جملك یاجابر))؟ واتە: ((جابر وشترەکەت چیەتی؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [دووچاری نەخۆشی بووە][٩٧٠] نازانم بە هۆی چیەوە ئەوەی بەسەر هاتوە][٩٧١] [زۆر سستە لە ڕۆیشتن دا]... ئەوەند پەکی کەوتوە [کە ناتوانێت بڕوات بەڕێدا][٩٧٢] دوای خستووم لەخەڵکەکە] [فەرمووی: ((یەخی کە)) ئەومیوو یەخم کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ (وشترەکەی) خۆی یەخکرد][٩٧٣] و [دابەزی] و [کەوتە تێخوڕینی و تەمێ کردنی] [بانگی دەکرد و][٩٧٤] [ئاوی دەکردە قوڕگیەوە][٩٧٥] و دەی پرژاند بە دەم و چاوی و پشتی دا][٩٧٦] [وە کلکی گرت و][٩٧٧] [فەرمووی: ((بیگرە و قامچیەکم بدەیە))][٩٧٨] [پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە قاچی لە وشترەکەی دەدا][٩٧٩] [لێدانێکی توندی بە قامچی لە پشتی لای دواوەی وشترەکەیدا][٩٨٠] [ئینجا فەرمووی: ((سواربە] [بەناوی

---

[٩٦٨] أخرجه: البخاري (٢٣٠٩).

[٩٦٩] أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٧٠] أخرجه: مسلم (٤٠٧٦).

[٩٧١] أخرجه: البخاري (٢٣٠٩).

[٩٧٢] أخرجه: مسلم (٧١٠).

[٩٧٣] أخرجه: احمد (١٥٠٢٦) وقال محققه: اسناده حسن.

[٩٧٤] أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

[٩٧٥] أنظر: (فتح الباري) (٥/٣٩٥) نقلاً عن الطبراني.

[٩٧٦] أخرجه: ابن سعد (٢/٤٨).

[٩٧٧] أخرجه: ابن حبان (٦٥١٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

[٩٧٨] أخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

[٩٧٩] أخرجه: احمد (١٤١٢٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٨٠] أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

خواوه))][٩٨١] [منیش سوار بووم] [وشترەکە لەشوێنی خۆی هەستا بەگورجی][٩٨٢] [بازێکی دا ئەگەر جابر خۆی نەگرتایە هەڵی دەدایە خوارەوە][٩٨٣] [دەفەرموێت: بەجۆرێك بۆی دەرچوو هەر هەوڵم دەدا جڵەوەکەی توند بگرم] [ئەوەندە بە توند و خێرای چۆکەکانی هەڵدەدا بەرەو پێشەوە وشتری وەهام هەرگیز نەدیبوو کە دەیویست جڵەوەکەی لە دەستم بکاتەوە] [بە جۆرێك دەڕۆیشت وەك باشترین وشتر کە تۆ دیبێتت][٩٨٤] [لەوشوێنەدا بووە پێشڕەوی خەڵکەکە][٩٨٥] [ئەو وشترە بەهەموو ڕێگاو بانێکدا دەیبردم][٩٨٦] بەردەوام لەگەڵم دایە چەند وشترێك هەبوون لە پێشەوەی خەڵکەکە کەوتبوون پێشیان دەکەوتمەوە][٩٨٧] [کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وەستام و پێشی نەکەوتمەوە][٩٨٨] [پێی فەرمووم: ((کیف ترى بعيرك] [((مأرأى جملك الا قد نشط))][٩٨٩] ((وشترەکەت چۆنە من وشترەکەت تەنها بەگورجی دەبینم)) [وتم: ئەو خێر و بێرەی بەسەریدا ڕژا بەهۆی بەرەکەتی بەڕێزت بوو][٩٩٠] [کاتێك لەمەدینە نزیك بووینەوە [داوای ڕوخسەتم لە خزمەتی دا کرد] و جڵەوم گرت و ڕۆیشتم][٩٩١] [فەرمووی: ((مايعجلك ياجابر؟))][٩٩٢] واتە: ((جابر چ شتێك وای کردوە پەلە بکەیت لەگەڕانەوە؟)) [((بۆ کوێ دەڕۆیت؟))] وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من [تازە

---

[٩٨١] أخرجه: مسلم (٤٠٧٨).

[٩٨٢] أخرجه: البخاري (٢٨٦١).

[٩٨٣] أخرجه: احمد (١٤١٢٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٩٨٤] أخرجه: البخاري (٥٢٤٧).

[٩٨٥] أخرجه: البخاري (٢٣٠٩).

[٩٨٦] أخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

[٩٨٧] أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

[٩٨٨] أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

[٩٨٩] أخرجه: البخاري (٤٦٥٢).

[٩٩٠] أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

[٩٩١] أخرجه: البخاري (٢٣٠٩).

[٩٩٢] أخرجه: البخاري (٥٢٤٥).

زاوام] وهاوسەرم تازە خواستووە][٩٩٣] [ئەویش ڕوخسەتی دام کە بەپەلە خۆم بگەیەنمەوە مالەوە][٩٩٤] [فەرمووی: ((هل تزوجت بعد ابیك][٩٩٥]یاجابر)) ((ئایە دوای باوکت ژنت هێناوە جابر)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: [((کچە یان بێوەژن؟))][٩٩٦] وتم: [بێوەژنم هێناوە][٩٩٧] فەرمووی: ((فهلا جاریة تلاعبها تلاعبك] [وتضاحكها وتضاحكك))][٩٩٨] واتە: ((بۆچی کچت نەهێنا یاری لەگەڵدا بکەیت و یاریت لەگەڵدا بکات بە پێکەنینی بێنی وە بە پێکەنینت بێنێت)). [وتم: (کە (باوکم) عەبدللا [شەهید بوو لەغەزای ئوحود دا][٩٩٩] نۆ کچی لە دوای خۆی بەجێهێشت منیش پێم خۆش نەبوو [هاوسەرگیری لەگەڵ] [ئافرەتێکی هیچ نەزانی وەك خۆیان بکەم] [کە هەڵنەسێت بە پەروەردەکردن و مشورخواردنیان][١٠٠٠] [وە لەوەش ترسام کە نێوانی من و ئەوان تێك بدات][١٠٠١] بۆیە [هەڵسام بێوەژنێکم خواست بۆ ئەوی مشورخۆریان بێت و پەروەردەیان بکات][١٠٠٢] [فێری زانست و زانیاریان بکات][١٠٠٣] [وە کۆیان بکاتەوەو] [خۆشەویستی و تەباییان لە نێواندا دروست بکات][١٠٠٤] [سەریان بشوات وشانەی بکات بۆیان][١٠٠٥] [نەهێڵێت ڕشك و ئەسپێ لەسەری یەکێکیان سەر هەڵدات و جلی

---

(٩٩٣) أخرجه: البخاري (٢٣٠٦، ٢٩٦٧)، ومسلم (٥٢٤٥).

(٩٩٤) أخرجه: احمد (١٤٣٧٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(٩٩٥) أخرجه: احمد (١٥٠١٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(٩٩٦) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(٩٩٧) أخرجه: البخاري (٥٠٨٠).

(٩٩٨) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(٩٩٩) أخرجه: البخاري (٤٠٥٢).

(١٠٠٠) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(١٠٠١) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(١٠٠٢) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(١٠٠٣) أخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

(١٠٠٤) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(١٠٠٥) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

دراوی یەکێکی تریشیان بدورێتەوە ئەگەر درا][1006] [فەرمووی: ((اصبت][بارك الله لك]))[1007] واتە: ((پێکاوتە خودا لێت پیرۆز و موبارەك بکات)) [((بەڕاستی تۆ باشترین بیرو ڕات هەبووە] [هەروەش بووە ئافرەت دەخوازرێت لەبەر ئەم شتانە دینداری و ماڵ و سامان و جوانیەکەی تۆ خاوەن دینەکەت هەڵبژاردوە دۆستی خۆت دیوەتەوە و حەساوێنەوە))][1008] حەساوێنەوە))][1008] [کاتێك ڕۆیشتینەوە و (لەمەدینە نزیك بووینەوە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((امهلوا حتى تدخلوا ليلاً (اي: عشاء) لكي تمتشط الشعثة وتستحد المغيبة)) واتە: ((لەسەر خۆ بڕۆن هەتا لەشەودا (ساتەوەختی عیشا) دەچینەوە شارەوە بۆ ئەوەی هاوسەرەکانتان سەرو قژیان شانە بکەن و موی زیادەی پێستی لەشیان لابدەن))][1009] [کاتێك گەیشتینەوە (صرار) (ناوی شوێنێکە لە دووری (٣ میل) دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە) فەرمانی کرد مانگایەکیان سەربڕی و خواردمان][1010] [فەرمووی (بە من): ((أما انك قادم)) واتە: ((تۆ دەچیتە ماڵەوە))][1011] [((گەر چویەوە وریابە ژیرانە و زیرەکانە بڕۆرەوە)) [((لە کاتی عیشادا بچۆ وە لای هاوسەرەکەت][1012] [ئەگەر شەویش چویتەوە ماڵەوە مەچۆ لای هاوسەرەکەت هەتا خۆی ئەڕازێنێتەوە موی زیادەی پیسی لەشی و لانەبات وە پرچی شانە نەکات))][1013] [کاتێك تەواو لەمەدینە نزیك کەوتینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە من: ((وشترەکەت چۆنە وچی دەکات؟))وتم: ئەوەتە][1014] [فەرمووی: ((پێم بفرۆشە؟)) دەفەرموێت: شەرمم کرد لە خزمەتیا (و) بێجگە لەوە هیچ شتێکی ترم نەبوو ناوی پێ

---

(1006) أخرجه: احمد (١٤٨٦١) وقال محققه: اسناده صحيح.

(1007) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(1008) أخرجه: النسائي (٣٢٢٦)، واحمد (١٤٢٣٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(1009) أخرجه: البخاري (٥٢٤٧).

(1010) أخرجه: مسلم (٤٠٨١).

(1011) أخرجه: ابن حبان (٦٥١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(1012) أخرجه: النسائي (٤٦٥٢).

(1013) أخرجه: البخاري (٥٢٤٦).

(1014) أخرجه: احمد (١٤٣٧٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

بێنم و][١٠١٥] [پێویستیەکی زۆرم هەبوو بەو وشترە][١٠١٦] [ئەویش فەرمووی: ((وشترەکەتم پێ بفرۆشە] وتم: پێشکەشت بێت، فەرمووی: ((نەخێر بەڵکو بەفرۆشتن دەبێت پێم بفرۆشی)) وتمەوە: نەخێر ئەوە پێشکەشی تۆ بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][١٠١٧] [فەرمووی: ((أتبيع ناضحك] [اذا قدمنا المدينة ان شاء الله بدينار والله يغفرلك – في رواية[اللهم اغفر له اللهم ارحمه]) واتە: ((وشترەکەتم پێ بفرۆشە] [ئەگەر گەیشتینەوە مەدینە إنشاء الله بە پارە خودا لێت خۆش بێت.

لە گێڕانەوەیەکی تردا [خودایە لێی خۆشبەو بیخەرە ژێر بەزەی خۆتەوە])[١٠١٨] وتم: ئەگەر گەیشتینوە مەدینە ئەوە دەبێتە ماڵی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: وشترەکە)][١٠١٩] [فەرمووی: ((تبعنيه اذا قدمنا المدينة ان شاء الله بدينار والله يغفرلك])) واتە: ((کە گیشتینەوە مەدینە بە دینارێك پارە پێم بفرۆشە إنشاء الله خودا لێت خۆشبێت))[١٠٢٠] وتم: وشترەی خۆتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [بەردەوام دینار دینار بۆی زیاد دەکردم لە کاتی هەر دینارێکیش دەی فەرموو خوا لێت خۆش بێت هەتا گەیشتە بیست دینار][١٠٢١].

لە گێڕانەوەیەکی تردا [فەرمووی: ((تۆ وشترەکەت بەمن دەفرۆشی؟)) وتم: بەڵێ فەرمووی: ((بەچەند؟)) [وتم: من ئۆقیەیەك زێری کەسێك قەرزارم با بە ئوقیەیەك بێت تا بۆ قەرزەکەی دادەنێم][١٠٢٢] [فەرمووی بە من: ((بخ بخ كم في اوقية من ناضح وناضح))؟ واتە: ((بەخ بەخ (وشەیەکە دەردەبڕا وەك وەی وەی یان هەی هەی) بە چەند ئۆقیەیەك بۆ

---

[١٠١٥] أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

[١٠١٦] أخرجه: النسائي (٤٦٥٥).

[١٠١٧] أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

[١٠١٨] أخرجه: مسلم (٤٦٥٤).

[١٠١٩] أخرجه: مسلم (٤٠٧٨)، وابن ماجة (٢٢٠٥).

[١٠٢٠] أخرجه: احمد (١٥٠١٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٧١٤١) وقال محققه: صحيح.

[١٠٢١] أخرجه: مسلم (٤٠٧٨)، وابن ماجة (٢٢٠٥).

[١٠٢٢] أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

وشترێك ئەوە چ وشترێکە))] وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مەدینەدا هیچ وشترێکی لێ نیە بەلامەوە خۆشەویست تربێت لەوە وە هیچیان ناگەنەوە پێی فەرمووی: ((قد اخذته بأوقیة [فتبلغ علیه الی المدینة])) واتە: ((ئەوە بە ئۆقیەیەك لێم کڕیت [هەتا مەدینە پێی بڕۆ و دامەبەزە])) جابر ﷺ دەفەرموێت: دواتر لە وشترەکە دابەزیمە خواردوە بۆ سەر زەوی، فەرمووی: ((ئەوە چی دەکەیت؟)) وتم: وشترەکە بۆتە هی خۆت. فەرمووی: ((سواری وشترەکەت بەوە))... منیش سوار بومەوە][١٠٢٣] [(پاشان) فەرمووی: ((جابر ئێستا بڕۆ رەوە ماڵەوە لای هاوسەرەکەت إنشاء الله بەجۆرێك دەیان بینیت ئاوا و ئاوا خۆیان بۆت ڕازاندۆتەوە هەتا باسی جێگاکەشی کرد، فەرمووی: ((جێگایەك بۆ پیاوەکە، جێگایەك بۆ هاوسەرەکەی سێیەمیان بۆ میوان و چوارەمیان بۆ شەیتانە))][١٠٢٤] [فەرمووی: ((چەندین ڕاخەر و فەرشتان بۆ ڕاخراوە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەو ئەوانە؟ فەرمووی: ((هاوسەرەکەتان ئەو ڕاخەرو فەرشانەی بۆ داناون))][١٠٢٥] [جابر ﷺ دەفەرموێت: من پێش خەڵکی گەیشتمەوە مەدینە، خاڵم گەیشت پێم، پرسیاری لێکردم لە بارەی وشترەکەمەوە منیش بۆم گێڕایەوە کە چیم لێکردوە][١٠٢٦] [دەنگ و باسی سستی غەزرینەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بەرامبەری و پیداکێشا و چاك بووە وە][١٠٢٧] [سەرزەنشتی کردم (لە سەر ئەوەی کە بۆچی وەك دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خوام ﷺ نەکردوە)] دەفەرموێت (پاشان) سواری وشترەکەم بوومەوە هەتا گەیشتمەوە لای پورم خوشکی باوکم لە مەدینە پێم وت: ئایە دەزانی وشترەکەم بە پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتوە بە ئۆقیەیەك؟ دەفەرموێت: وام هەست کرد ئەوەی بەلاوە زۆر سەیر و سەمەرە بوو][١٠٢٨]

---

[١٠٢٣] اخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحیح.

[١٠٢٤] اخرجه: احمد (١٤١٢٤) وقال محققه: اسناده صحیح.

[١٠٢٥] اخرجه احمد (١٤١٣٢) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرطهما.

[١٠٢٦] اخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

[١٠٢٧] اخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

[١٠٢٨] اخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحیح.

[ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێش من گەیشتەوە مزگەوت][1029] [چوە ناو کۆمەڵێك لە هاوەڵانی کە بەش بەش لەناو مزگەوت بوون][1030] [ئینجا هەندێ گەڵای دارم هەڵگرتەوە و خستمە دەمیەوە، پاشان جڵەویم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ][1031] [گەیشتمە خزمەتی لەکاتی (چێشتەنگاودا) لەلای مزگەوت بوو][1032] [لەبەر دەرگای مزگەوت بینیم و فەرمووی: ((ئێستا (لەم کاتەدا) هێناوتە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((فدع جملك فادخل فصل ركعتين)) واتە: ((وشترەکەت واز لێبهێنە وەرە ژورەوە دوو ڕکات نوێژ بکە]))[1033] (فەرمووی): وشترەکەم لەشوێنێکی نزیك مزگەوت بەستەوە))][1034] ئینجا [چوومە ژورەوە و نوێژم کرد] [پاشان گەڕامەوە] [دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاوە و کەسێك قسەی لەگەڵدا دەکات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەت وەرگرتەوە لێم][1035] [تەشریفی هاتە دەرەوە و بە دەوری وشترەکەدا دەسوڕایەوە و سەیری دەکرد و دەیفەرموو: ((ئەم وشترە وشتری ئێمەیە))] [ئینجا جڵەوی گرت] و [فەرمووی: ((باشترین وشتر وشترەکەی منە))][1036] [پاشان بانگی بیلالی کرد ﷺ و پێی فەرموو: ] [کێشی ئۆقیەیەك [لە زێڕ] [بۆ جابر] بکێشە][1037] وە قیراتێکی بۆ زیاد بکە].

لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: [بیلال لە غەنیمەکەش بیست دیناری پێبدە و زیاتریشی پێبدە][1038] [دەفەرموێت: لەگەڵ بیلال ڕۆیشتم] [داوای تەرازوی کرد [ئوقیەکی]

---

[1029] أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

[1030] أخرجه: البخاري (٢٨٦٦)، واحمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

[1031] أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

[1032] أخرجه: البخاري (٢٣٩٣).

[1033] أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

[1034] أخرجه: البخاري (٢٨٦١).

[1035] أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

[1036] أخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

[1037] أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

[1038] أخرجه: ابن حبان (٧١٤١) وقال محققه: صحيح.

زێڕی بۆ کێشام بە زیادەوە][1039] [بە جۆرێك تەرازووەکە لا سەنگ بوو][1040] [جابر ﷺ دەفەرموێت: گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە پێوە وەستابوو قسەی لەگەڵ ئەو پیاوە دەکرد، وتم: ئۆقیەیەکی بە زیادەوە بۆ کێشام: ئەو مەساری خۆی تێك نەدا کە من بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت ڕێگەی ماڵەوەم گرتە بەر، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردبوو: ((کوا جابرله کوێیە؟)) فەرموویان: [چۆتە وە ماڵەوە] [فەرمووی: ((جابرم بۆ بانگ بکەنەوە))][1041] [بە (کەسێکی) فەرموو: ((برۆ بگە بە [جابر] و بیهێنەوە لام))][1042] [جابر ﷺ دەفەرموێت: کەسێکی بەدوای مندا ناردبوو][1043] [ئەوە بوو نێردراوەکەی بە پەلە هاتە لام و فەرمووی: جابر پێغەمبەری خوا ﷺبانگت دەکات] و [(لەدڵی خۆم دا) وتم: ئێستا وشترەکەم دەداتەوە هیچ شتێکم بەقەد ئەوە پێ خۆش نەبوو][1044] [چومە خزمەتی] و [فەرمووی: ((جابر] [نرخەکەت بەتەواوی وەرگرت؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][1045] [فەرمووی: ((اتراني ماکستك (اي: ناقشت معك ثمن الجمل)) واتە: ((بینیت دەمەتەقێی نرخی وشترەکەتم لەگەڵ کردی تا وشترەکەتم کڕی))][1046] [فەرمووی: وشترەکەت بگرە و بیبەرەوە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تازە وشتری من نیە، بووتە موڵکی خۆت، فەرمووی: ((وشترەکەت بەرەوە)) دیسان وتم: وشتری من نەماوە [من وشتری تۆ نابەمەوە] ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ] [فەرمووی: ((فخذ جملك ذلك فهو مالك)) واتە: ((وشترەکەت بگرەو بیبەرەوە ماڵی تۆیە))][1047] [((الثمن لك والجمل

---

(١٠٣٩) أخرجه: النسائي (٤٠٦٤).
(١٠٤٠) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).
(١٠٤١) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).
(١٠٤٢) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.
(١٠٤٣) أخرجه: مسلم (٧١٥).
(١٠٤٤) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).
(١٠٤٥) أخرجه: البخاري (٢٨٦١)، واحمد (١٥٠٠٢).
(١٠٤٦) أخرجه: مسلم (٧١٥).
(١٠٤٧) أخرجه: البخاري (٢٧١٨).

[و بگەڕێوە بۆ ناو ماڵ ومنداڵەکەت لك))[(١٠٤٨)] واتە: ((وشترەکەش و پارەکەش بۆ خۆت)) [وەرم گرتەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: [وەڵلاهی بەکارمان نەهێناوە بۆ هیچ شتێك لەو کاتەی تۆی لەسەر دابەزیویتە خوارەوە))[(١٠٤٩)] [جابر فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکە و پارەی وشترەکە و بەشی تایبەتی خۆمی لەگەڵ خەڵکەکەش پێ بەخشیم][(١٠٥٠)] [(دواتر لەگەڕانەوەمدا) بەلای کەسێکی جولەکەدا تێپەڕیم دەنگوباسەکەم بۆ گێڕایەوە بەسەر سوڕمانەوە وتی: وشترەکەی لێکڕیت و نرخەکەشی پێدای و پاشان پێی بەخشیت؟ وتم: بەڵێ][(١٠٥١)] [پاشان هاتمەوە بۆ لای پورم بە وشترەکەو ئۆقیە زێڕەکەوە پێم وت: سەیرکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئۆقیە زێڕەکەشی پێدام و وشترەکەشی بۆ گەڕانمەوە][(١٠٥٢)]. جابر ﷺ ئەو قینطارە زیادەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئۆقیەکەدا پێی دابوو لای خۆی پاراستبووی هەر وەك خۆی دەفەرموێت: (وتم زیادەی پێغەمبەری خوا ﷺ نابێت لێم جیابێتەوە [خستمە ناو تورەکەیەکەوە کە هی خۆم بوو]... ئەو (قیراط)ە لە تورەکەی جابری کوڕی عەبدلا جیانەبووەوە)[(١٠٥٣)] وەهەروەها ئەوە وشترەشی لای خۆی پاراست کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەشی کرد هەروەك لەو بارەیەوە خۆی دەفەرمێت: (ئەو وشترە لەلام مایەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبوکری صدیق ﷺ و عومەر ﷺ هەتا توانای نەما هێنامە خزمەت عومەر ﷺ ڕووداوەکەی بیرکەوتەوە و فەرمووی: (بیبە ناو وشترەکانی صەدەقەوە لە باشترین لەوەڕگا داینێ ئەوە بوو بردم بەو شێوەیەی ئەو فەرمووی: هەروامایەوە تاکو مرد)[(١٠٥٤)].

---

(١٠٤٨) أخرجه: البخاري (٢٨٦١).

(١٠٤٩) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤).

(١٠٥٠) أخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

(١٠٥١) أخرجه: احمد (١٤٢٥١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٠٥٢) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤).

(١٠٥٣) أخرجه: البخاري (٢٣٠٩)، ومسلم (٤٠٧٧).

(١٠٥٤) أخرجه: الحافظ (فتح الباري) (٥/٤٠٣) عن ابن عساكر.

٢. گێڕانەوەی دووەم لەسەر ئەو ڕووداوە گێڕانەوەکەی ئیبن ئیسحاقە ﷺ دەفەرموێت: وەهبی کوڕی کەیسان لە جابری کوڕی عەبدللا ﷺ بۆی گێڕامەوە دەفەرمێت: (لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم بۆ غەزای (ذات الرِّقاع) لەکاتی دەرچونی بەروبومی خورمادا [سواری] وشترێکی لاواز بووم [کە زۆر بەسستی ڕێگای دەبڕی] وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی گەڕانەوەی دا هاوەڵەکانم منیان بەجێ هێشت و دواکەوتم هەتا ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێم گەیشت و فەرمووی: ((ئەوە چیتە جابر؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترە دەست خەڕۆی کردم ناڕوات بەچاکی [فەرمووی: ((یەخی کە))] منیش یەخم کرد پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی خۆی یەخدا و فەرمووی: ((اعطني هذا العصا من يدك)) واتە: ((ئەو دارەی دەستم بدەیە)) یا فەرمووی: ((اقطع لي عصاً من شجرة)) واتە: ((داریکم لەو درەختە بۆ ببڕە)) فەرمووی: [دارەکەم دایە دەستی] پێغەمبەری خوا ﷺ وەری گرت و چەندین ئەقیزەی تێوەژاند و فەرمووی: ((سواربەوە [جابر])) منیش سوار بووم بۆی دەرچوو بە جۆرێك سوێند بەوەی کە پێغەمبەری بە حەق بۆ ناردووە پێشبڕکێی لەگەڵ وشترەکەی دەکرد کە جڵەویشم توند کرد بوو، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتینە قسە کردن و فەرمووی پێم: ((اتبيعني جملك هذا ياجابر))؟! واتە: ((جابر ئەو وشترەم پێ نافرۆشی؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەشتی دەکەم، فەرمووی: ((ڕازی نابم بەڵام پێم بفرۆشە)) وتم: باشە چۆن خۆت پێت خۆشە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نرخەکەی چەندە؟))] تۆ ناوی خوای لێبێنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((بەدرهەمێك بمدەیە)) وتم: نەخێر زیاتر دەکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە دوو درهەم)) دەفەرموێت وتم: نەخێر، دەفەرموێت: بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ نرخەکەی بۆ زیاد دەکردم هەتا گەیشتە ئۆقیەیەك، ئینجا وتم: [ئیستا ڕازیم] وتم: بەسە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیم بەوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: [بەڵێ ڕازیم] ئەوەماڵی تۆیە، دەفەرموێت: ((وەری گرت، پاشان فەرمووی: [بەمن]: ((جابر ژنت هیناوە)) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((کچە یان بیوەژن)) وتم: بەڵکو بیوەژنە، فەرمووی: بۆچی کچت نەدەخواست تا یاری لەگەڵدا بکەیت و یاریت لەگەڵدا بکات)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم لە غەزای ئوحودا شەهید بوو حەوت کچی لەپاش بەجێ

ماوە، ئافرەتێکم هێناوە کە مشور خۆریان بێت و کۆیان بکاتەوە و سەریان بۆ شانەکات و [جل و بەرگیان بۆ بشوات] فەرمووی: ((زۆر باشە کارێکی [چاکت کردووە] پێکاوتە انشاء الله))، هەر کەگیشتینە ناوچەی (صرار) فەرمانی پێداین بە سەربڕینی وشتر و کەوتینە گۆشت خواردن، ئەو ڕۆژە مزدەی پێداین کە گۆشەو سەرین مان دەبێت وتم: وەڵاهی سەرین وگۆشەمان نیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((انها ستکون فاذا انت قدمت فاعمل عملا کیساً)) واتە: ((ئەوە لەمەودوا دەبێت بەلام کە چوویتەوە ژیرانە هەڵسو کەوت بکە)) جابر ﷺ دەفەرموێت: کاتێك گەیشتینە ناوچەی (صرار) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سەربڕینی وشتر ئەو ڕۆژە تێر گۆشتمان خوارد، کاتێك ڕۆژ ئاوابوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتەوە ناو شار ئێمەش بەشوێنی ئەودا چووینەوە.

جابر دەفەرموێت: قسەم لەگەڵ هاوسەرەکەم کرد (کەناوی سەهلەی کچی مەسعود بوو) ڕووداوەکەم بۆ باس کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەمن فەرمووە (لەبارەی سەرجێی لەگەڵ هاوسەرەکەی) هاوسەرەکەی فەرمووی: [بیستمان وگوێڕایەڵ دەبین وزوور ئامادەیە] جابر ﷺ دەفەرموێت: ئەو شەوە بەیەکەوە ماینەوە هەتا بەیانی] هەر کەبەیانی بووەوە جڵەوی وشترەکەم گرت و بەرەو مزگەوت بردم هەتا لە بەردەم دەرگای مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ پەخم کرد، پاشان خۆشم لەناو مزگەوت لە نزیکیەوە دانیشتم پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە وشترەکەی بینی فەرمووی: ((ئەو چیە؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترە جابر هێناویەتی فەرمووی: ((جابر خۆی لەکوێیە؟)) بانگیان کردمە خزمەتی و فەرمووی: (([وەرە] کوڕی برام، جڵەوی وشترەکەت بگرە ئەمەش بۆ خۆت دەبێت)) بانگی بیلالیشی کرد وپێی فەرموو: ((بڕۆ لەگەڵ جابر ئۆقیەیەکی بدەیە)) جابر ﷺ دەفەرموێت: لەگەڵی دا ڕۆیشتم ئۆقیەیەك و شتێکی زیادەی پێ بەخشیم وەڵاهی بەردەوام لەلای خۆم دەم پاراست و شوێنێکی تایبەتی بوو لەماڵەکەمدا هەتا

ڕۆژی دووجاری ئەو بەڵایە بووین بردیان وەك شتەکانی تر: (مەبەست لە جەنگی (الحرە)یە لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە دابوو))[١٠٥٥].

## سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵڵا بۆ سەر بەنی مەلوح

دەنگ وباسی ئەو سریەیە بەکورتی هاتوە لای ئەبوداود وحاکم، وە بەدرێژی هاتووە لەلای ئیمامی ئەحمەد و غەیری ئەویش سەنەدەکەی بێهێزە (ضعیف) لێرەدا باسمان کردوە بۆ ئەوەی خوێنەر زانیاری هەبێت لەسەر درێژەی ڕووداوەکانی ئەم سریەیەو لەوبارەیەوە جوندبی کوڕی موکەیت جوهینی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدڵڵای کەلبی (کلب لە لیث) نارد بەسریەیەکەوە بۆ سەر بەنی ملوح لەناوچەی (کەدیر)، فەرمانی پێکردن کە هێرش بەرینەسەریان، بەڕێکەوتن منیش لەسریەکەدا بووم، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە (قەدید) لەوێدا توشی حارثی کوڕی مالك بووین کە ناسرابوو بە کوڕی بەرصائی لەیثی دەستگیرمان کرد وتی: من هاتوم موسوڵمان بم، غالبی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ وتی: ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت هاتووی موسوڵمان بیت ئەوە گیرانی شەو ڕۆژێك هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنێت، ئەگەر بەپێچەوانەوەش هاتبووی ئەوە دەست گیرت دەکەین و دەت بەستینەوە، فەرمووی: بەشەریتێك بیبەستنەوە، دواجار کەسێکی ڕەشمان لەگەڵدابوو بەدیاریەوە جێی هێشت و پێی فەرموو: بەدیاریەوە بمێنەوە هەتا ئێمە دەڕۆین گەر بەربەرەکانی کرد لەگەردنی بدە، دەفەرموێت: پاشان ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ناوجەرگەی ناوچەی (کەدیر)، لەعەسرێکی درەنگ لەوێدا خستمان، هاوەڵانم منیان نارد بۆ ڕێبەری بێشڕەوی سریەکە بەسەر تەپۆڵکەیەك کەوتم کە بەسەریاندا دەیڕوانی، لەسەر ڕوو ڕاکشام لەسەر گردەکە [تۆزیك] بەر لە ڕۆژ ئاوابوون بوو بۆ ئەوەی ئەم بینن، کەسێکیان هاتە دەرەوە منی بینی لەسەر دەم ڕاکشابووم لەسەر گردەکە، بەژنەکەی وت: وەڵلاهی

---

(١٠٥٥) أخرجه: احمد (١٥٠٢٦) وقال محققه: اسناده حسن والحديث صحيح، وأخرجه: ابن هشام (السيرة ١٦٢/٣) برقم (٧٠٠) وقال الارناؤوط (زاد المعاد) (٢٥٤/٣): سنده صحيح، وكذا قال صاحب (صحيح السيرة) (٥٩٦): سنده صحيح، وقد رتبت رواية ابن هشام مع احمد والبيهقي (الدلائل ٣٨٢/٣).

ڕەشاییەك بەدی دەکەم لەسەر ئەو تەپۆڵکەیە سەر لەبەیانی ئەم بینیوە تۆ سەیرکە بزانە سەگەکان هیچ کەلوپەلی تۆیان نەبردووە، ڕۆیشت تەماشای کرد وتی: نەخێر وەڵڵاهی هیچ شتێکمان نەفەوتاوە، پیاوەکە پێی وت: تیروکەوانەکەم بدەیە دوو تیریشم لەناو هەگبەی تیرەکانم بۆ دەربهێنە، دایە دەستی ئەویش تیرێکی هاویشت و دای لەگەڵەکەم دەرم هێناو جوڵەم نەکرد لەجێگای خۆم پاشان ئەوی تریشی تێگرتم لەسەر شانی دام دەرم هێناو خستمە لایەکمەوە و جوڵەم نەکرد، بە خێزانەکەی وت: وەڵڵاهی تیرەکانم بەری کەوتن ئەگەر ئاژەڵ بێت لە جوڵە کەوت سبەی دەچم تیرەکانم دێنمەوە وە ئەگەر بشخوریت تیرەکانیان پێ ناخورێت سەگەکان.

دەفەرموێت لێیان گەڕاین هەتا مەڕو ماڵاتەکەیان هێناو ئاویان دان و پاشان یەخیان کردن و کردیانە ناو تەویلەکانیان و دونیا کش و مات بوو، ماوەیەك لەشەو تێپەڕی ئینجا لەهەموو لایەکەوە هێرشمان کردنە سەروو ئەوەی کوژرا لێیان کوشتمان و مەڕوماڵاتەکەشیانماندایە پێش خۆمان ڕێگەمان گرتە بەر بەشێوەی قافڵەو گەڕاینەوە ئەوە بوو هاواری فریاکەوتنیان لێدا بۆ هۆزەکانیان داوای هاوکاریان لێ کردن ئێمەش بە پەلە بۆی دەرچوین و هەتا گەیشتینەوە حاریثی کوڕی بەرصاء و پاسەوانەکەی لامان دانابوو ئەوانیشمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت و ڕۆیشتین، هاوار و دەنگەدەنگی خەڵکەکە گەیشتە لامان، خەڵکی زۆریان بۆ کۆکردینەوە کە چارمان نەدەکردن، هەتا وای لێهات نێوانمان لەناوچەرگەی دۆڵەکەدا بوو کە خودای گەورە لە هەموو لایەکەوە کردی بە بارانێك کە هەرگیز بەرلەوە باران و هەوری ئاوامان نەدیبوو لافاوێکی بەخوڕی هێنا لەناو دۆڵەکە ئێمەی لە ئەوان جیاکردەوە بەجۆرێك بوو کە هیچ کەس لەوان نەی دەتوانی بیپەڕێتەوە و بگاتەوە پێمان ئێمەش بەپەلە ماڵاتەکانمان دایە پێش خۆمان هەتا گەیاندمانە ناوچەی (مەشلەل) (کەشوێنێکە) پاشان لێژ بووینەوە بەرەو خوار و دوژمنەکان نەیان توانی بێن بەدوامانداو دەستە پاچەبوون لەوی ماڵاتەکانیان وەرگرنەوە لێمان)[١٠٥٦].

[١٠٥٦] أخرجه: احمد (١٥٨٤٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن هشام (السيرة) (٢٥٧/٤)، والطبراني (الكبير) (١٧٢٦)، وابوداود (٢٦٧٨)، والحاكم (١٢٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٨٨/٩) وفي (الدلائل) (٢٩٨/٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٠٢/٦): رواه

## ٢ـ سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵڵای لەیثی بۆ ناوچەی (حرقات) لەبەنی جوهینە

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدڵڵای کەلبی (کەلب لیث) بەفەرماندەی سریەیەك نارد بۆ خاکی بەنی موڕە، (مەرداسی نوهەیك) کە هاوپەیمانیان بوو لەبەنی حەرقەی هۆزی جوهەینەبوو، ئوسامەی کوڕی زەید کوشتی لەگەڵ کەسێکی ئەنصاری)[١٠٥٧].

لە گێرانەوەی واقیدی دا: (یەسار خزمەتکارێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زانیومە کە بەنی عەبدی کوڕی ئەعلەبە لە هەلێك دەگەڕێن کە لەناکاو بدەن بەسەرمان دا، سریەیەك بنێرە من لەخزمەتیاندا دەبمە چاو ساغیان تا بەسەریاندا بدەین، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدڵڵا بە سەد و سی کەسەوە نارد لەگەڵی.....)[١٠٥٨] وەك باسکراوە ئەم سریەیە نێردراوە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا. چەندین گێڕانەوە هاتووە بە وشەکاری جۆراو جۆر لە ڕێگەی جیاوازەوە لەسەر چۆنێتی کوشتنی موشریکەی کە وتویەتی (لا اله الا الله) دواجار کە لەلایەن ئوسامەوە کوژراوە ئێمە لێرەدا هەموویمان کۆکردۆتەوە لە دوو گێرانەوەدا:

١ـ لەو بارەوە ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ خۆی دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد بۆ ناوچەی حرقە. [لەگێرانەوەیەکدا: (حرقات) بۆناو هۆزی جوهەینە]، لە بەرەبەیاندا یامان بەسەریان دا لەسەر ئاوەکەیاندا کەوتینە شەڕ لەگەڵیاندا [کەسێکیان تێدابوو جەربەزەبوو کاتێك ڕووبەڕوومان دەبوونەوە ئەو لە پێشڕە و پاڵەوانەکانیان بوو لە دژمان دەوەستایەوە وە ئەگەر پشتیان هەڵدەکرد ئەوە دەبووە پارێزەرو پاسەوانیان تا ڕایان دەکرد]وە ئەگەر کەسێکی لە موسوڵمانەکان مەبەست بووایە ئەوا بۆی دەچوو دەی کوشت]

---

احمد والطبراني ورجاله ثقات، وقال الحافظ (الاصابة) (٣/١٨٤) (رقم: ٦٩٠٤): وقال ابوعمر رواه احمد بسند حسن، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (٥٧٣).

[١٠٥٧] اخرجه: الطبري (التاريخ) (٣/١٥٧)، وابن هشام (السيرة) (٤/٢٣٥)، والبيهقي (الدلائل) (٥٧٣).

[١٠٥٨] انظر: (المغازي) للواقدي (٢/٧٢٦)، و(الدلائل) للبيهقي (٤/٣٠٠).

[ئەوەبوو تێکمان شکاندن] و [ڕایان کرد] من و پیاوێکی ئەنصاری گەیشتین بەو پیاوەی باسمان کرد کاتێك دەورمان دا بەهەردووکمان وتی: (لا اله الا الله)، کە ئەمەی وت ئەنصاریەکە دەستی لێ هەڵگرت و وازی هێنا، بە ڕمەکەم لێمدا هەتا کوشتم [شتێك لە دڵمدا دروست بوو لەسەر ئەو کارە] [ئەوە بوو سەر کەوتین وە موژدە دەر گەیشتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد لەو بارەوە ئەویش دەنگ و باسەکەی بۆ گێڕایەوە و هەتا کوشتنی ئەو پیاوە کەچی بەسەر هاتووە و چۆن کوژراوە... فەرمووی: ((بۆچی کوشتت؟)) منیش (ئوسامە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانەکانی دووچاری ناڕەحەتی کرد بوو ئازاری پێگەیاندن فلان و فیساری کوشت ناوی چەند کەسێکم هەڵدا منیش هەڵم کوتایە سەری کاتێك شمشێری بینی وتی: (لا اله الا الله)] [فەرمووی: ((کوشتت)) وتم: بەڵێ] فەرمووی پێم: ((یااسامة اقتلته بعد ما قال لا اله الا الله)) واتە: ((ئوسامە کوشتت لە دوای ئەوەی وتی (لا اله الا الله)). لە گێڕانەوەیەکی تردا [((أقال: لااله الاالله وقتلته))؟] واتە: ((ئایا فەرمووی: ((لا اله الا الله) و تۆ کوشتت؟)) وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [ئەوە لە ترسی چەك بووە] تا خۆی [لەکوشتن] ڕزگار بکات فەرمووی: ((افلا شققت عن قلبه حتى تعلم أقالها [من اجل ذلك] ام لا، [من لك لااله الا الله اذا جاءت يوم القيامة)) واتە: ((ئایا دڵت لەت کرد بوو هەتا بزانی [لەبەر ئەوە] ئەمەی وتووە یاخود نا و [کێ ڕزگارت دەکات لە (لا اله الا الله) کە ڕۆژی قیامەت هات)) [(وتم): ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لای خوا؟ فەرمووی: ((کیف تصنع بلا اله الاالله اذا جاءت يوم القيامة)) واتە: ((چیت کرد وە بەرامبەر (لااله الا الله) چی دەکەیت ئەگەر ڕۆژی قیامەت هات))] بەردەوام ئەمەی دوبارە دەکردەوە [لە ڕوومدا] هەتا خۆزگەم دەخواست کە [بەر لەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە]))[(١٠٥٩)].

٢- لە عوتبەی کوڕی مالکەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بۆ سەر هۆزی موشریکی عەرەب هەڵیان کوتایە سەریان و کەسێکیان بە تەنیا دابڕا لە

(١٠٥٩) اخرجه: البخاري (٤٢٦٩، ٦٨٧٢)، ومسلم (٩٦، ٩٧، ١٥٨، ١٥٩)، واحمد (٢١٧٤٥، ٢١٨٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن حبان (٤٧٥١) واللفظ للبخاري والزيادات لمسلم والامام احمد.

خەڵکەکە، پیاوێك لەسریەی موسوڵمانان شمشێریکی لێ هەڵکێشاو شوێنی کەوت، پیاوەکە وتی: من موسوڵمان بووم، هیچ گوێی بە قسەکەی نەدا کە چی دەڵێت شمشێریکی پێدا و کوشتی [کاتێك گەڕایەوە و هەواڵەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە بەو شێوەی کە ڕووی دابوو] فەرمایشتێکی زۆر توندی فەرموو لە بارەی ڕووداوەکەوە گەیشتەوە بکوژەکەی] پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و وتارێکی خوێندەوە حەمد وستایشی خودای کرد و پاشان فەرمووی: ((أما بعد فما بال المسلم يقتل الرجل وهو يقول اني مسلم؟)) واتە: ((سەرنج بدەن چۆن دەبێت موسوڵمانێك کەسێك بکوژێت کە بڵێت من موسوڵمان بووم؟)) پیاوە (بکوژەکە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵڵاهی ئەوەی دەربڕی و گوتی تەنها لە بەر ئەوەی لە کوشتن ڕزگاری بکات. دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕووی لە پیاوەکە وخەڵکەکەشی وەر گێڕا کە لەلای ئەو بوون، کەوتە سەرزەنشتی بە توندی لە خوتبەکەی دا، پیاوەکە خۆی پێنەگیرا بۆ جاری سێهەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵڵاهی ئەوی فەرموو تەنها بۆ ئەوەی لە کوشتن ڕزگاری بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا [ڕووی] تیکرد و سەیری کرد و ناڕەحەتی و نائومێدیم لەدەم و چاویدا هەست پێکرد [دەستی ڕاستی بۆ درێژ کرد و] پێی فەرموو: ((ان الله عزوجل ابى علي[فيمن] قتل [مسلما])) واتە: ((خودای گەورە داوام لێ دەکات پشت [لەو کەسە]بکەم کە [موسوڵمانێك] بە ناحەق دەکوژێت)). [لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((خودای گەورە حەرامی کردوە لەسەرم کە باوەڕدارێك بەناحەق بکوژم] ((سێ جار ئەمەی فەرموو))[١٠٦٠].

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێی فەرموو: ((فلا انت قبلت ما تكلّم به ولا انت تعلم ما في قلبه)) واتە: ((نە تۆ ئەوەت لێ قبوڵ کرد کە وتی وە تۆ نەت زانیوە دڵی چی تێدایە)) لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((قد قال لك بلسانه فلم تُصدّقه على ما قال في قلبه)) واتە: ((بە زمان

[١٠٦٠] أخرجه: ابن ابي شية (المصنف) (٢٩٥٤٦)، والنسائي (الكبرى) (٨٥٩٣)، واحمد (١٧٠٠٩، ٢٢٤٩٠) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (٩٨٠/١٧)، وابي يعلى (٦٨٢٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن سعد (٤٨/٧)، والحاكم (١٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٥٩٧٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٩٤٨).

پێی وتی بەڵام تۆ بڕوات پێ نەکرد بەوەی کەلە دڵی دایە))[١٠٦١]. ئوسامە ﷺ پابەند بوو بە وەسیەتەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ وە عەرزی کرد: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمان دەدەم بە خوا هیچ کەسێك نەکوژم هەتا ماوم لە ژیانم دا کە بڵێت (لا اله الا الله)...)[١٠٦٢] هەر لەبەر ئەوەش بوو ئوسامە ﷺ بەشداری نەکرد لەو جەنگەی کە هەڵگیرسا لەنێوان ئیمامی عەلی و موعاویە دا (رضي الله عنهم جميعاً).

## ٣- سریەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهەمی

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك وەقاصی کوڕی موجززی مەدلەجی لە غەزای (ذي قرد) کوژرا، عەلقەمەی کوڕی موجەززی برای داوای کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمان بکات بەناردنی بە شوین بکوژەکانی دا بۆ ئەوەی پێیان بگات و تۆڵەیان لێ بکاتەوە)[١٠٦٣].

لە ئەبو سەعیدی خدریەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەلقمەی کوڕی موجەززی کردە فەرمان دەی سریەیەك وناردی منیش لەگەڵی بووم هەتا گەیشتینە سەر ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ کردین یاخود لە نیوەی ڕێگا [کۆمەڵێك لە سریەکە داوایان کرد کە ڕوخسەتیان بدات تا بگەڕێنەوە] ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی خوزافەی کوڕی قەیس سەهەمی کردە ئەمیریان، کە لە بەژداربووانی غەزای بەدر بوو، کە کەسێکی قسە خۆش و سوعبەت چی بوو [لە یەکێك لە سەفەرەکانی دا وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ برد بوو بۆ ئەوەی بەو کارەی بە پێکەنینی بێنێت][١٠٦٤].

منیش لەو کەسانە بووم کە گەڕامەوە، لە بەشێکی ڕێگاکە لاماندا بۆ حەسانەوە، خەڵکەکەش ئاگریان کردەوە بۆ خواردن ئامادەکردن و خۆ گەرم کردنەوە لەبەری [ئەوە

---

(١٠٦١) أخرجه: احمد (١٩٩٣٧) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن ماجة (٣٩٣٠)، والطبراني (الكبير ١٨٩/١٨)، وحسّنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣١٧٥).

(١٠٦٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤/ ٢٣٥) (برقم: ١١٧٧).

(١٠٦٣) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٥١/٤) (برقم: ١١٩٢).

(١٠٦٤) أخرجه: الحاكم (٦٣٠/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

بوو عەبدڵڵای کوڕی حوزافە ﷺ فەرمووی پێیان]: ئایا گوێڕایەڵی کردنی ئێوە بۆ من پێویست نیە؟ وتیان: بەڵێ وایە. فەرمووی: من فەرمانتان بە هەرچی شتێك پێبدەم دەبێت جێ بەجێ بکەن؟ فەرموویان: بەڵێ. فەرمووی: [من فەرمانتان پێ دەکەم] بەو مافە گوێڕایەڵیەی لەسەرتانە بۆ من کە خۆتان فڕێ دەنە ناو ئەو ئاگرە. خەڵکەکە هەستان و ڕاوەستان بەرامبەری هەتا دڵنیا بوو کە خۆیان فڕێ دەدەنە [ناو ئاگرەکە] ئینجا فەرمووی: ڕاوەستن ئەوە تەنها سوعبەتم لەگەڵ کردن [کاتێك گەڕانیەوە] گەیشتنەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان بۆ گێڕایەوە فەرمووی: واتە: ((من امركم منهم (اي: من ولاة) بمعصية فلا تطيعوه)) واتە: ((هەر کەسێك فەرماندەیەکتان پێکردن بەسەرپێچی خودا و پێغەمبەر ئێوە گوێڕایەڵی مەکەن))[١٠٦٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە لە ئیمامی عەلیەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد کەسێکی ئەنصاری کردە ئەمیریان فەرمانی پێکردن کە گوێ ڕایەڵی بکەن و مل کەچ بن دواتر لە شتێکدا توڕەیان کردبوو فەرمووی: [فەرمانتان پێ دەکەم] کە چیلکەو چەواڵم بۆ کۆ بکەنەوە، ئەوانیش بۆیان کۆ کردبووە و پاشان فەرمووی: ئاگرێ تێ بەردەن ئەوانیش هەڵیان گیرساند، ئینجا فەرمووی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەکردن کە گوێ ڕایەڵیم بکەن و ملکەچی فەرمانەکانم بن؟ فەرموویان: بەڵێ وایە. فەرمووی: دەچنە ناو ئاگرەکەوە [خەڵکانێك ویستیان بچنە ناویەوە] [و هەستانەوە و خۆیان ئامادەکرد کە بچنە ناویەوە] و سەیری یەکتریان دەکرد [هەندێکیان فەرموویان]: لە ترسی ئاگر باوەڕمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە و چووینە لای ئەو، هەر بەو شێوەیە مانەوە هەتا هاتەوە سەر خۆی و توڕەیی یەکەی ئەما ئینجا ئاگرەکەی کوژاندەوە، کاتێك گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان بۆ باس کرد [فەرمووی بەوانەی کە دەیان ویست بچنە ناویەوە: ((لو دخلتموها لم تزالوا فيها الى يوم القيامة)) واتە: ((ئەگەر بچوونایەتە ناو ئاگرەکە هەتا ڕۆژی قیامەت تیایدا دەمانەوە)) بەئەوانەی تریشی فەرمایشتێکی جوان

---

[١٠٦٥] اخرجه: احمد (١١٦٣٩) وقال محققه: اسناده حسن، وابن ابي شيبة (٣٤١/١٤)، وابن ماجة (٢٨٦٣)، وابن حبان (٤٥٥٨) وقال محققه: اسناده حسن، وابي يعلى (١٣٤٩) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٣٢٤)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٣١٢).

فەرمووی: ((لاطاعة في معصية الله، انما الطاعة في المعروف)) واتە: ((گوێڕایەڵی ناکرێت لە سەرپێچی کردنی خوا، بەڵکو گوێ ڕایەڵی کردن تەنها لەکاری چاکەدایە))[١٠٦٦].

لەو بارەیەوە ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: ((خوای گەورە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٞ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ (النساء: ٥٩) واتە: ﴿ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵیی فەرمانی خواو پەیامبەرین لەهەموو کاروبارێکدا وە فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بەقسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لەخۆتانن. واتە: لەچوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر ﷺ، واتە: باتەنها قورئان و سوننەت داوەرو حەکەمتان بن. بەڵێ پێویستە لەهەمووشتێکدا بگەڕێینەوە لای خواو پەیامبەر ﷺ، دیارە کەبڕیاری پەیامبەریش ﷺ هەر بڕیاری خوایە، وە نابێ بەهیچ تاغووتێك باوەڕت هەبێ، ئەگەر باوەڕتان بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە، دەبێ ناوابێت ئەوگێڕانەوەی کێشەو هەرایە بۆلای قورئان و سوننەت، جوانترو چاکترە بۆتان، چاکترین ڕەفتاریشە بۆداهاتووتان.﴾ **(لەسەر عەبدڵلای کوڕی حوزافەی سەهەمی خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بووی بە فەرماندەری سریەیەك و نارد بووی)**[١٠٦٧].

**لەلای ئیبن وسەعد ﷺ ئەو سریەیە لەمانگی (ربيع الاخر)ی ساڵی حەوتەمی کۆچی دا ڕوویداوە**[١٠٦٨].

---

[١٠٦٦] اخرجه: البخاري (٧٢٥٢، ٤٣٤٠)، ومسلم (١٨٤٠)، واحمد (٦٢٢)، وابي داود (٢٦٢٥).

[١٠٦٧] اخرجه: احمد (٣١٢٤)، والبخاري (٤٥٨٤)، ومسلم (١٨٣٤)، وابي داود (٢٦٢٤).

[١٠٦٨] انظر: (فتح الباري) (٧٣/٨)، (دلائل النبوة) (٢٩٠/٤).

## ٤- سریەی ئیبن ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بۆ ناوچەی غابە

باسی ئەم سریەیەش هاتوە لەلای ئیمامی ئەحمەد و ئیبن هیشام بەسەنەدێکی بێ هێز (ضعیف) ئێمە لێرەدا بە کورتی باسی دەکەین بۆ زانیاریتان، لە ئیبن ئەبو حەدرەوە ﷺ دەفەرموێت: (داخوازی ئافرەتێکم کرد لە هۆزەکەی خۆم دووسەد درهەم مارەیەکەی بوو هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای یارمەتیم لێ کرد بۆ هاوسەرگیریەکەم فەرمووی: ((چەندت مارەی بۆداناوە؟)) وتم دووسەد درهەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سبحان الله لوكنتم تأخذون الدّراهم من بطن وادٍ مازدتم والله ما عندي ما أعينك به)) واتە: ((سبحان الله ئەگەر ئێوە درهەمەکان لەناو جەرگەی ئەو دۆڵانە دەست خەن ئەوجار بۆتان دەستەبەر نابێت و زیاد ناکات وەڵڵاهی ئەوەندەم لەلانیە کە یارمەتی هاوسەرگیری تۆی پێ بدەم))[١٠٦٩].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئافرەتێکی ئەنصاریم مارەکردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((هل نظرت اليها فان في عيون الانصار شيئاً (يعني: صغراً))) واتە: ((ئایە سەیرت کردوە بەوردی چونکە لە چاوی ئەنصاریەکاندا شتێك هەیە (واتە: چاویان بچوکە) فەرمووی: سەیرم کردووە بە جوانی، فەرمووی: ((لەسەر چەند مارەت کردووە؟)) فەرمووی: لەسەر چوار ئۆقیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((على اربع اواق كأنما تنحتون الفضة من عرض هذا الجبل ماعندنا مانعطيك ولكن عسى ان نبعثك في بعث تصيب منه)) واتە: ((لە سەر چوار ئۆقە وەك ئەوەیە کە زیو لەڕووی ئەو شاخە دەربێنن ئەوەندەمان لەلا نیە کە ببەخشین بەڵام بەڵکو لەمەودوا لەگەڵ سریەیەکدا بتنێرین ودەسکەوتێك ببێت)). ئەبو هورەیرە ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بۆسەر بەنی عەبەس و ئەو

---

[١٠٦٩] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤/٢٤٢) رقم (١١٨٤)، وعنه البيهقي (الدلائل) (٤/٣٠٣)، واحمد (١٥٧٠٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير)، (٢٢/ (٨٨٢)).

پیاوەشی نارد لەگەڵیاندا))[١٠٧٠] ئەو فەرمودەیە ڕاستە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە سریەكە و ڕووداوەكە ڕاستەقینەن، بەڵام ئیبن ئیسحاق لە گێڕانەوەیەكدا دەفەرموێت: (ناردنی سریەكە بۆ سەر بەنی جوشم بووە، هەروەك ئیبن ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە ئیبن وئەبی حەدرەوە ﷺ دەفەرموێت: (چەند ڕۆژێك بەو جۆرە ماینەوە تا كەسێك هات لەبەنی جوشمی كوڕی معاویە كەناوی: ریفاعەی كوڕی قەیس یا قەیسی كوڕی ریفاعەبوو بە بەشێكی گەورەو زۆری هۆزەكەی خۆی بنی جوشەیم بۆ پشتیوانی هاتبوون لەناوچەی (غابە) دابەزین وخستیان مەبەستی بوو كە هۆزی (قەیس) كۆبكاتەوە بۆ جەنگ وهەرا بەرپاكردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كە خۆی كەسێكی خانەدان و بەناو بانگ بوو لەناو هۆزی جوشم.

لە گێڕانەوەیەكی تردا: (بەو شیوەیە مامەوە و پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی كردم وكردمیە فەرماندەری سریەكە ناردمی بەرەو خاكی نەجد فەرمووی پێمان: ((اخرج في هذه السرية لعلك ان تصيب شيئا فانفلكه)) واتە: ((برۆ لەگەڵ ئەو سریەیەدا بەلكو شتێكت دەسكەوێت بیدەم بەخۆت)) دەفەرموێت: ڕۆیشتین تا دەمەو ئێوارە گەیشتینە ناوچەكەیان، كاتێك تاریكی شەو ڕۆیشت ئەمیرەكەمان دووكەس دوو كەس دەیان ناردین تا دەوری سەربازگەكەیان گرت....)[١٠٧١].

لەدوایین گێڕانەدا هاتووە: (...وشترو مەڕ و ماڵاتێكی ئێجگار زۆرمان دەست خست پێشخۆمان داو هێنامانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ... پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو وشترەكان بە سیانزە وشتر هاوكاری كردم بۆمارەیەكە وەمنیش كۆمكردەوە و بردم بۆ هاوسەرەكەم)[١٠٧٢].

چەندین سریەی تریش هاتووە لەبەر بێهێزی سەنەدەكانیان لێرەدا باسمان نەكردوە لەوانە: سریەی عومەری كوڕی خەطاب ﷺ بۆ (توربە)، سریەی (بەشیری كوڕی سەعیدی ئەنصاری ﷺ بۆ بەنی مورە، بۆ سەر خاكی غەطفان و شوێنی تریش.

---

[١٠٧٠] اخرجه: احمد (٧٩٨٤٩)، ومسلم (٣٤٧١)، والنسائي (٣٢٣٤)، وابن حبان (٤٠٤١).

[١٠٧١] اخرجه: احمد (٢٣٨٨٢) وقال محققه: اسناده ضعيف.

[١٠٧٢] اخرجه: ابن هشام (السيرة (٢٤٢/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٣/٤).

# عەمرەی قەضاء

موسى كوڕی عوقبە ﷺ لە ئیبن و شیهابی زهرویەوە ﷺ دەفەرموێت: (ئەوە بوو ساڵێك لە دوای ڕێکەوتننامەی حودیبیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجلی عەمرەوە دەرچوو بەرو مەککە لە مانگی (ذي القعدة) ساڵی حەوتەمی کۆچی کەهاوکات بوو لەگەڵ ئەو مانگەی کە موشریکەکان ڕێگەیان نەدا بچینە (مزگەوتی حەرام)[١٠٧٣] هەموو ئەوانەی لە حودیبیە بەشداربوون بەشداری ئەم عەمرەیەیان کرد تەنها ئەوانە نەبێت کە کۆچی دوایان کردبوو یان شەهید بوو بوون، وە لەگەڵیاندا خەڵکی تریش بەشداربوون ژمارەیان بەگشتی بووە دووهەزار کەس[١٠٧٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لەشاری مەدینە دەرچوو لە ناوچەی (ذي الحليفة) ئیحرامیان بەست بە ویردی (لبيك)وە ڕۆیشتن، شەست وشتری (هەدیە)یان بۆ قوربانی پێش خۆیان دابووبە سەرپەرشتی ناجیەی کوڕی جوندب ﷺ[١٠٧٥] وە چەك و پێداویستی جەنگیان بەتەواوی ئامادە کردبوو و هێنا بوویان لەگەڵ خۆیان لە ترسی پەیمان شکێنی قوڕەیش، عەمری کوڕی قەتادە ﷺ دەفەرموێت: (چەك و پێداویستیەکانی شەڕیان لە شمشێر و ڕم و تیروکەوان هەڵگرت و هێنایان بەسەرکردایەتی سەد ئەسپ سوار بەشیری کوڕی سەعدی ئەنصاری ﷺ کردە سەرپەرشتیاری چەکەکان، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ﷺ کرایە فەرماندەری ئەسپ سوارەکان)[١٠٧٦].

---

[١٠٧٣] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٣١٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

[١٠٧٤] اخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٣/٦٧)، والحاكم (الأكليل) كما في (الفتح) (٧/٦٣٧).

[١٠٧٥] في رواية عن ابي حدرد ان النبي ﷺ قال: ((من يسوق ابلنا هذه)) ؟ فقام رجل، فقال ((ما اسمك)).. قال: ناجية. قال ((انت لها فسقها)). اخرجه: البخاري (الادب)، (٨١٢)، والحاكم (٤/٢٧٦)، وضعفه الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٤٨٠٤)، و(ضعيف الادب المفرد) (١٢٨).

[١٠٧٦] اخرجه: الطبري (التاريخ) (٣/٢٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێگەی مەککەدا حیجامەی بۆ کرا کە لە ئیحرامیشدا بوو لە ناوەڕاستی سەری[1077]. لەگێڕانەوەیەکی بێهێزدا (ضعیف)دا هاتوە ئێمە لێرەدا باسی دەکەین تەنها بۆ زانیارتان کە واقیدی دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ (لبیك) دەفەرموو موسوڵمانەکانیش لە خزمەتیا (لبیك) یان دەفەرموو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ﷺ بە ئەسپ سوارەکانەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە (مرّ الظهران) لەوێدا (چاویان کەوت بە چەند کەسێکی قوڕەیش، پرسیاریان لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ کرد ئەویش فەرمووی: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سبەی إنشاء الله دەگاتە ماڵی خوا، کە ئەو چەك و تفاقە زۆرەیان بینی لەگەڵ بەشیری کوڕی سەعد ﷺبەپەلەو خێرا ڕۆیشتنەوە هەتا گەیشتنەوە لای قوڕەیش هەواڵیان پێدان بەوەی کە دیبوویان لە چەك وئەسپی جەنگ، قوڕەیش دوچاری ترس و دڵە ڕاوکێ بوون و وتیان: وەڵلاهی هیچ کارێك لەسەر دەستی ئێمە ڕووی نەداوە ئێمە لەسەر دانوستانی خۆمانین لەبەرچی مەحەممەد وهاوەڵانی هێرشمان بۆ دێنن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە (مرّ الظهران) لای داو دابەزی چەك وپێداویستیەکانی جەنگی ڕەوانەی ناوچەی (یأجج) کرد (کە هەشت میل لە مەککەوە دوورە) بەشێوەیەك هەڵگەوتوە لێیەوە دەڕووانی بۆ پایەکانی حرەم).

قوڕەیش بۆ ئەو مەبەستە موکەریزەی کوڕی حەفصی کوڕی ئەحنەفیان لەگەڵ چەند کەسێکی تر نارد.... لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هاوەڵانی بوو وشترەکانی قوربانی (هدیە) و چەك و تفاق کەوتبوونە ئەو ناوچەیە، وتیان: موحەممەد ﷺ ئەمزانیوە وئێمە لە بچوکەوە تا گەورە پەیمان شکێنمیان لە تۆ نەبینیوە لەبەر چی دەتەوێت بەچەکەوە بێیتە حەرەمەوە بەسەر خزم و کەسوکارەکانتدا بدەیت ئەوان مەرجیان لەگەڵ داناى کە بە چەکی گەشتیارەوە نەبێت نەیەیتە مەککەوە ئەویش شمشیرە لە کیلاندا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من بەچەکەوە نایەمە سەریان))، موکەریزەی کوڕی حەفص وتی: ئەو تایبەت مەندیەی کە تۆی پێ دەناسریتەوە چاکی وەفاداریە بەرامبەر پەیمان، پاشان خۆی و هاوەڵانی بەپەلە گەڕانەوە بەرەو مەککە وتی: موحەممەد نایەتە مەککەوە بە چەکەوە و

---

[1077] اخرجه: البخاري (١٨٣٦)، ومسلم (١٢٠٣) واللفظ له.

لەسەر ئەو شەرت وبەڵێنەیە کەلەسەری ڕێکەوتوون))[١٠٧٨].پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست هاوەڵانی بەهێزو چوست وچالاکیەوە بچنە ناو مەکەوە هەر لەبەر ئەوە داوای کرد هەموو زادەو زەخیرەیان بۆ کۆکردەوە و نزای خێری لەسەر خوێند ودوعای بەرەکەتی بۆ کردن دەستیان کرد بە خواردن و تێریان خوارد.

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کە پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی لە (مرّ الظهران) لەکاتی [عەمرەکەیدا] کە لەڕێکەوتندابوو لە گەڵ قورەیش، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان گەیشتبوو کە قورەیش وتویانە: [ناتوانن هەستن وبڕۆن لەبەر نەخۆشی وبرسێتی، هاوەڵان عەرزی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەندێك لە وشترەکانمان سەر بڕین]، [گۆشتەکەی] بخۆین ولە گۆشتاوەکەی بخۆینەوە سبەی کە چووینە مەککەوە بۆ ناو قورەیش تا بە تێری و چوست وچالاکیەوە بمان بینن؟ فەرمووی: ((لا[تفعلوا] ولکن ائتوني[واجمعوا لي] من فضل ازوادکم)) واتە: ((نەخێر [وشترەکان سەر مەبڕن] بەڵام هەرچی زادو زەخیرەتان هەیە [کۆیکەنەوە بۆم] و بیهێنەوە ئێرە)) ئەوە بوو سفرەیان ڕاخست و هەرچی پێخۆرێ هەیان بوو کۆیان کردەوە لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ کردن، ئینجا کەوتنە خواردنی هەتا تێریان خوارد و ئەوەی زیادەش بوو خستیانە تورەکەو جەواڵەکانیانەوە...)[١٠٧٩].

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ئامۆژگاری کرد کە چونە مەککەوە بە چوست وچالاکی و جەربەزییەوە بچنە ناویەوە وهێزی خۆیان دەربخەن، لە ئیبن وعەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: کە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی بە هاوەڵانی کاتێك وستویانە بۆ عەمرە بچنە مەککەوە لە دوای ڕێکەوتن نامەی حودەیبیە: ((ان قومکم غدا سیرونکم فلیرونکم جُلداء)).

---

[١٠٧٨] اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٧٣٤) وعنه ابن كثير (البداية) (٤/٢٢٦).

[١٠٧٩] اخرجه: ابوداود (١٨٨٦)، وابن خزيمة (٢٧٠٧)، والبيهقي (٥/٧٩)، واخرجه: احمد (٢٧٨٢) وقال محققه: اسناده قوي، وابن حبان (٣٨١٢) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٦١).

واتە: ((سبەی خزم و کەسەکانتان لە قورەیش تەماشاتان دەکەن بابە هێزو تواناوە بتان بینن وسەیرتان بکەن))[١٠٨٠].

ئیبن شەهاب ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ) گەیشتە ناوچەی (یأجج) و هەرچی چەك و تفاقی شەڕبوو داینا لە شمشێر و تیروکەوان و ڕم و قەڵغان و زرێ، تەنها بەچەکی سواریەوە کە شمشێر بولە کیلانە چووە مەککەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ﷺ ئامۆزای لەبریکاری خۆیەوە نارد بۆ خوازبێنی مەیمونەی کچی حارثی کوڕی حەزنی عامیری بۆ ئەوەی لێی مارە بکات بەوەکالەت...)[١٠٨١] موشریکەکان کەوتنە بڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندەی ئەوەی کە موسوڵمانەکان برسێتی و ماندبوون لاوازی کردون بەرلەوەش تاو گەرمای مەدینە بێ هێزی کردبوون، لەو بارەوە ئیبن عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی گەیشتنە شاری مەککە کە تای گەرمی مەدینە لاوازی کردبوون وبێ هێز بوون موشریکەکان وتیان: سبەی خەڵکانێك دینە ناوتان تای گەرم بێ هێز و لاوازی کردوون و دووچاری ناڕەحەتی و دژواریەکی زۆربوون)[١٠٨٢]. هەندێك لە پیاو ماقوڵ و گەورە پیاوانی قورەیش بەردەوام ڕق وقین و حەسادەتیان لە دڵ و دەروونیاندا دەشاردەوە چاویان بەوە هەڵنەدەهات کە سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانەکان بکەن کە بە ئاشکرا لەمەککەدا مەراسیمی دینداری خۆیان ئەنجام بدەن و دروشمەکانیان بە دەنگی بەرز بڵێنەوە، هەندێکیان سەرکەوتنە سەر کێوی (قعیقعان) (ئەو کێوەیە کە دەکەوێتە لای روکن و مەقام) لەویوە سەیری موسوڵمانەکانیان دەکرد[١٠٨٣] هەندکیان لە دوای (حجر)ەوە دانیشتن[١٠٨٤] ئەوەی مابووەوە لە خەڵکی مەککە بە دوو ڕیز وەستابوون

---

[١٠٨٠] اخرجه: احمد (٣١٤/١)، وابوداود (١٨٩٠)، وابي يعلي (٢٥٧٤) وقال محققه: اسناجه صحيح، وابن حبان (٣٨١٤)، وقال محققه: اسناده صحيح.

[١٠٨١] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٤/٤) عن موسى بن عقبة.، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

[١٠٨٢] اخرجه: مسلم (١٢٦٦).

[١٠٨٣] اخرجه: البخاري (٤٢٥٦)، وابن حبان (٣٨١١).

[١٠٨٤] اخرجه: مسلم (١٢٦٦).

چاویان بڕیبووە موسوڵمانەکان لەسەر تەپوڵکە و بەرزاییەکانەوە[١٠٨٥]. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی ڕۆیشتن لەسەر وشترەکەی (قصواء) بوو [هاوەڵان دەوریان دابوو دەیان پاراست لەمنداڵ و هەرزەکانی قوڕەیش کەهەیان بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار نەدرێت][١٠٨٦].

(لبيك اللهم)یان دەوتەوە و بەشمشێرەکانیانەوە خۆیان ساز و ئامادە کردبوو کاتێک گەیشتنە (ذي طوى)، پێغەمبەر ﷺ لەسەر وشترەکەی (قصواء) بوو وەستا موسوڵمانەکانیش بەدەوروبەریەوە بوون، ئینجا لە (ثنية) چونەوە ناو مەککەوە کەبەسەر (حەجون) دا دەڕوانیت[١٠٨٧]، موشریکەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە قسەکردن دەیان وت: [محمد و هاوەڵانی [تاو گەرمای یەثریب بێ هێزو لاوازی کردوون] ناتوانن لەبەر لاوازیان تەواف کەعبە بکەن و ئیرەییان پێ دەبردن][١٠٨٨].

ئەنەس ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەمرەی (قضاء) دا چووە ناو شاری [مەککە وە خەلکی مەککە وەستابوون (بە دوو ڕیزەوە) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ [شمشێرەکەی بەدەستەوە بوو] دەڕویشت و ئەم پارچە هۆنراوەی دەخوێندەوە:

[خلّوا بني الكفار عن سبيله اليوم نضربكم على تنزيلهِ
ضـرباً يزيل الهام عـن مقيله ويـذهلُ الخليل عن خليله]
[خلّوا بني الكفار عـن سبيله أنـا الشهيدُ انـه رسـوله
قـد أنـزل الرحمن في تنزيله في صُحفٍ تتلى على رسوله]
[بـان خـير القتل في سبيله انـي رأيـتُ الحق في قبوله]
[خلّوا بني الكفار عـن سبيله خـلّوا فكل الخير في رسوله

---

[١٠٨٥] اخرجه: الترمذي (٢٨٤٧)، والنسائي (٥/٢٠٢)، ابي يعلى (٣٣٩٤)، وابن حبان (٥٧٨٨) وقال محققه حديث صحيح.، وقال الحافظ في (الاصابة) (٦/٨٠): اخرجه ابي يعلى بسند حسنٍ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٢٨٣)، وفي (مختصر الشمائل) (٢١٠).

[١٠٨٦] اخرجه: البخاري (٤٢٥٥).

[١٠٨٧] اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/ ٧٣٤) وهذه الفقرة أوردناه للعلم.

[١٠٨٨] اخرجه: البخاري (٤٢٥٦)، ومسلم (١٢٦٤) واللفظ له.

[اعـــرف حق الله في قبوله]　　يـارب انـــي مـــؤمنٌ بقيله][1089].

واتە: [١- ئەی گرۆهی بێ باوەڕان ڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆڵکەن و مەبنە بەربەستی.

٢- ئەمڕۆ کەبەفەرمانی خوا لە قورئاندا لێتان دەدەین و تارو مارتان دەکەین؟

٣- لێدانێك سەرتان لە لاشە جیا بکاتەوە و لای بدات.

٤- لێدانێك دۆستی گیانی بەگیانی لەیەکتر فەرامۆش بکات.

٥- ئەی کۆمەڵی بێ باوەڕان ڕێگەی مەگرن و لێی گەڕێن با بڕوات.

٦- من شاهێدی بەردەوامم کە پێغەمبەری خوایە.

٧- خودای بەخشندە لە قورئاندا وای فەرمووە لەو پەراوەدا کە بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێندراوەتە.

٨- ڕوون و ئاشکرایە کە باشترین کوژراوان لە پێناوی ئەو دایە من حەق و ڕاستی وا دەبینم کە ئەو پێی ڕازی بێت.

٩- ئەی بەرەی بێ باوەڕان ڕێگەی مەگرن بابڕوات هەموو خێرێك لە پێغەمبەرەکەی دایە.

١٠- ئەی پەروەردگار من باوەڕدارم بە فەرموودەکانی وە ماق خوام ناسیوە لە وەرگرتنی ئەودا.

عومەر ﷺ فەرمووی: کوڕی ڕەواحە ئەرێ ئەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ شعر دەخوێنیتەوە و [لەحەرەمی خوا] (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەسەر خۆبە عومەر ﷺ (لێی گەڕێ) ئەو شعرە بەهێزترە بۆ سەردڵ و دەرونیان لە هاویشتنی تیر))[1090].

---

(1089) اخرجه: ابن اسحاق كما في (السيرة) (٣/٣٢٥)، والطبري (التاريخ) (٣/٢٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤/٣٢٣)،، والبيت الأول والثاني عند الترمذي (٢٨٤٧)، والنسائي (٥/٢٠٢)، والبيت الثالث والرابع عند البيهقي (دلائل) (٤/٣١٤)، والبيت الخامس عند ابن حبان (٤٥٢) وغيره، والبيت السادس والسابع عند ابن هشام (السيرة) (٣/٣٢٥)، والبيهقي (دلائل) (٤/٣٢٣).

(1090) اخرجه: الترمذي (٢٨٤٧) وفي (الشمائل) (٢١٠)، والنسائي (٥/٢٠٢)،وابي يعلى (٣٥٧١/٣٣٩٤)، والبزار (٢٠٩٩)، والبيهقي (١٠/٢٢٨) وابن حبان (٤٥٢١/ ٥٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح،

ئیبن عەبباس ﷺ دەفەرموێت: ((پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت هەتا چووە ناو مزگەوت] قورەیشیەکان لەلای (حجر)ەوە کۆ بوونەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی هەڵبڕی (بە عەباکەیەوە) بە هاوەڵانی فەرموو: ((لایری القوم فیکم غمیزة (اي: ضعفاً) [ارملوا لیری المشرکون قوّتکم])) ((با موشریکەکان لاوازیتان تێدا بەدی نەکەن)) [بە گورگە لۆقێ بڕۆن بۆ ئەوەی موشریکەکان هێزو تواناتان ببینن][1091].... ئینجا خۆی و هاوەڵەکانی ڕۆیشتن بە پێ هەتا دەستیان دایە (الرکن الاسود) [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن سێ قۆناغەکە بە گورگە لۆقێ ببڕن][1092] [(چوارەمیشیان) بە ڕۆیشتنی ئاسایی ببڕن][1093] [هیچ شتێك ڕێگر نەبوو لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمانیان پێ بکات کە هەموو قۆناغەکانی تر بە هەروەلە ببڕن تەنها لەبەر مانەوەیان نەبێت بەسەریانەوە کە ماوەیەك دیاری کرابوو][1094].

لەو بارەوە قورەیشیەکان دەیان گوت کاتێك بە هەروەلە بەلایاندا تێ دەپەڕین: دەڵێی ئاسکن [هەر بەڕۆیشتن ناوەستن بەڵکو وەك ئاسك خۆیان هەڵدەدەن][1095]. پاشان بە گورجی ڕاکردنی نێوان (صەفا) و (مەروە)یان ئەنجامدا تا موشریکەکان هێز و توانایان ببینن[1096].

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لەناوچوونی لێکردن لەوبارەوە عەبدڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکی عومرەی لەبەر کرد و عومرەی بەجێ هێناو تەواف کەعبەی کرد و پاشان ڕۆیشت ڕاکردنی نێوان (صەفا) و (مەروە)ی ئەنجامدا ئێمەش

---

وصحیح الحدیث کل من الحافظ (الفتح) (٦٣٨/٧) تحت الحدیث (٤٢٥١)، وفي (الاصابة) (٤٦٧٦)، والشیخ الالباني في (فقه السیرة) (ص:٣٩٤)، و(صحیح الترمذي) (٢٢٨٣) و(مختصر الشمائل) (٢١٠).

[1091] اخرجه: البخاري (٤٢٥٦).

[1092] اخراجه: البخاري (٤٢٥٦)، ومسلم (٣٠٤٤).

[1093] اخرجه: مسلم (١٢٦٤).

[1094] اخرجه: البخاري (٤٢٥٦-٤٢٥٧)، ومسلم (١٢٦٦).

[1095] اخرجه: احمد (٢٧٨٢) وقال محققه: اسناده قوي، وابي داود (١٨٨٦)، وابن خزیمة (٢٧٠٧)، والبیهقي (الکبری) (٧٩/٥)، وابن حبان (٣٨١٢) وقال محققه: حدیث صحیح.

[1096] اخرجه: البخاري (٤٢٥٧).

پارێزگاریمان لێ دەکردلە دەست خەڵکی مەککە نەوەکو کەسێك بیەوێت بیپێکێت یاخود دوچاری شتێك بێت گوێم لێبوو دوعای لە ئەحزاب دەکردو دەی فەرموو: ((خوایە گیان تێکیان بشکێنی زەوی لە ژێریاندا بلەرزێنی ئەی دابەزێنەری قورئان وخاوەنی لێپرسنەوەی خێرا تێك شکێنەری ئەحزاب خوایە تێکیان بشکێنی))[١٠٩٧].

خەڵکی مەککە بە ژن و پیاو و منداڵانیانەوە کۆ بیوونەوە و سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانیان دەکرد لەوکاتەی کە تەواف کەعبەیان دەکرد... کەسێك لە پیاو ماقوڵ و گەورەکانی موشریکەکان ڕقی ناو دڵیان دەشاردەوە لەبەر ڕق وکینەوە حەسادەت و لایەنی دەرونیان ڕێگەی نەئەدان و چاویان هەڵنەدەهات کە سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن بۆیە ڕۆیشتن بۆ (خەندەمە))[١٠٩٨].

کاتێك تەواو بوون لە ڕاکردنی صەفا ومەروا (هدیە)کانیان هێناو لای مەروە وەستاندی و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: : ((هذا المنحر وكل فجاج مكة منحر)) واتە: ((ئێرە قوربانیگەیە وە هەموو شوێنێکی مەککە قوربانی گەیە))[١٠٩٩]. هەرلەوێدا (لای مەروەوە) قوربانیەکەی سەر بڕی و سەریشی تاشی، پاشان خەڵکانێکی نارد بۆ ناوچەی (یأجج) هەتاکو بچن ببن بەپاسەوانی چەکەکان وە ئەوانەی لەوێن بێن دروشمەکانی خوا پەرستی بەجێ بێنن بەو شێوەیە موسوڵمانەکان ئاڵا و پەرچەمی یەکتاپەرستی و(لبیك) و بانگ ونوێژی بە کۆمەڵیان لەپێش ئاشکرا دا بە چاو گوێی خەڵکی مەککە و ئەوان دوچاری سەرسوڕمان بوون بەرامبەر بەو ئاینە تازەیەو پێغەمبەرەکەی وهاوەڵانی.

لە ماوەی مانەوەی لەمەککە دا پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو مەیمونەی مارەکرد ئەمەش خستە ئەستۆی عەباسی مامی ﷺ کە خوشکی هاوسەرەکەی بوو کە ناوی ئوم فەضلی کچی

---

(١٠٩٧) اخرجه: احمد (٤/٣٥٥)، وابي داود (١٩٨٢)، وابن ماجة (٢٩٩٠)، والحميدي (٧٢١٩)، وابن حبان (٣٨٤٣) وقال محققه اسناده صحيح على شرطها، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٧٣).

(١٠٩٨) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٤/٣١٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه: الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(١٠٩٩) اخرجه: ابي داود (١٩٠٧)، و(ابن ماجة) (٣٠٤٨)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٤٦٤)، و(صحيح ابي داود) (١٦٧٨).

حارثی ﷺ عەباس ﷺ لە جیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو چوار سەد درهەمی کردە مارەیی[١١٠٠].

پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی سێ ڕۆژ لە شاری مەککە مایەوە، کاتێك ماوەکەی تەواو بوو دوایان لێ کرد کە مەککە بەجێ بهێڵێت ئەویش وەفای بە جێ گەیاندو چوە دەرەوە لێی، لەو بارەیەوە بەراء ﷺ دەفەرموێت: (... پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە شاری مەککەوە و ماوەی مانەوەی تەواو بوو موشریەکان نوێنەریان هاتە لای ئیمامی علی ﷺ وتیان: بە هاوەڵەکەت بڵێ با مەککە جێ بهێڵێت چونکە ماوەکەی تەواو بوو)[١١٠١].

موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرویت: کە ئبین شیهابی زوهری ﷺ فەرموویەتی: (...کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە بەیانی ڕۆژی چوارەمەوە سوهەیلی کوری عەمرو حووەیطبی کوری عەبدلعزا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو کۆڕو دانیشتنی ئەنصاریەکان بوو لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ قسەی دەکرد، حووەیطیب هاواری کرد: خودا و پەیمانەکەت دەخەمەوە یاد لە خاکەکەمان بچۆ دەرەوە [ماوەکەت تەواو بوو لای ئێمە و ئێرە جێ بهێڵە] سەعدی کوری عەبادە ﷺ فەرمووی: درۆت کرد ئێرە نەخاکی تۆیە نە بەمیرات لە باوك وباپیرتەوە بۆت جێماوە وەڵاهی ناچینە دەرەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی سوهەیل وحووەیطیبی کرد وپێیانی فەرموو: ((اني قد نكحت فيكم امراة [وماعليكم لو تركتموني فاعرست بين اظهركم وصنعنا لكم طعاما فحضر تموه][١١٠٢] فناكل وتأكلون معنا)) واتە: ((من ئافرەتێکم هێناوە لە ناوتان [ئەگەر بکرێت دەرفەتم پێ بدەن لێرەدا وە لیمەی ژن گواستنەوەکەم بکەم خواردنێك ئامادە بکەم و بۆتان و ئێوەش میوانی من بن] تابە یەکەوە خواردنێك بخۆین)) [وتیان: ئێمە پێویستمان بە میوان داری تۆ نیە] تکات لێ دەکەین بە خواو ئەو پەیمانەی کە لە نێوانماندانە کە برۆ دەرەوە لە ناومان ئینجا [پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لە مەککە]. هەتا

---

(١١٠٠) اخراجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٣٢٧)، والبيهقي (الدلائل) (٤/ ٣١٥) عن ابن شهاب.

(١١٠١) اخرجه: البخاري (٤٢٥١).

(١١٠٢) اخرجه: الطبراني (١١٤٠)، وابن هشام (السيرة) (٣/٣٢٨)، والطبري (التاريخ) (٣/٢٥)، والبيهقي (الدلائل) (٤/٣٣٠) مرسلاً.

گەیشتنە ناوچەی (سرف) لە وێدا خستیان (کە ناوچەیەکە نزیک لە تەنعیم)، موسوڵمانەکان مانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو ڕافعی ﷺ جێهێشت بوو تاکو خاتوو مەیمونە لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت لە کاتی ئێوارەدا خۆی بگەیەنێتە خزمەتی، ئەوە بوو لە (سرف) مانەوە هەتا خاتوو مەیمونە گەیشتە خزمەتی، خاتوو مەیمونە و ئەوانەی لەگەڵی دا بوون دوچاری ئازار و مەینەتی بوونەوە لە سەر دەستی هەرزە و منداڵەکانی قوڕەیش، لە (سرف) گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا گواستیەوە و ئەو شەوە لەوێ بوون دواتر کەوتنە ڕێ هەتا گەیشتنەوە مەدینە...)[١١٠٣].

لەسەر کچی ئیمامی حەمزە ﷺ هەریەکە لە جەعفەر و زەید وعەلی ﷺ بوو بە هەرایان کاتێک گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای بڕانەوەی کێشەکە دای بە جەعفەر ﷺ، لەو بارەوە بەراء ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەرچوو لە شاری مەککە کچۆڵەکەی ئیمامی حەمزەی ﷺ مامی کەوتە دوای و بانگی دەکرد: مامە مامە عەلی هەڵی گرت و دەستی گرت و بردیە خزمەت خاتوو فاطمە (رضي الله عنها) پێی فەرموو: کچە مامەکەت بگرە و لەگەڵ خۆت هەڵی بگرە [عەلی ﷺ دەفەرموێت کاتێک گەیشتینەوە مەدینە لەسەر ئەو کچە من و زەید جەعفەر بووە دەمە قڕەمان] عەلی فەرمووی: من هەڵمەگرتەوە [من شایستە ترم پێی] ئەوە کچی مامە [وە هاوسەرەکەشم کچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بۆی لە پێشتر و شایستە ترە]، جەعفەر ﷺ فەرمووی: [من دەیگرمە خۆم من لە پێشترم لە ئێوە بەو] کچی مامە و پوریشی هاوسەرمە [پوریشی خوشکی دایکە و لە جێگەی دایکە] وە زەید ﷺ فەرمووی: [من شایستەترم بەو] کچی برامە (برای ئاینی کە پێغەمبەر لە مەککەش و مەدینەش ئەو برایەتیەی نێوانمان دروست کرد بوو حەمزە و زەیدی کردە بوو برا)[١١٠٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کرد لە نیوانمان و گێڕایەوە بۆ پوری فەرمووی: ((الخالة بمنزلة الام)) واتە: ((پور خوشکی دایك و لە جێگەی دایکە)) وە بە عەلی ﷺ فەرموو: ((وە

---

(١١٠٣) اخرجە: البیهقي (الدلائل) (٤/٣١٤).

(١١٠٤) في روایة: (.. وكان زید مؤاخیاً لحمزة، اخی بینهما رسول الله ﷺ) اخرجە: احمد (٢٠٤٠) وقال محققه صحیح لغیره، وابویعلی (٢٣٧٩).

تۆ عەلی لە منی منیش لە تۆم])) بە جەعفەریشی ﷺ فەرمووی: (([تۆ جەعفەر] شێوە و ئاکارت لەمن دەچێت)) وە بە زەیدیشی ﷺ فەرمووی: (([تۆ زەید] برامانی و سەردارمانی [کچەکە بالای پوری بێت چونکە پور وەك دایکە] وە عەلی ﷺ فەرمووی: بۆچی کچی حەمزە ﷺ ناخوازیت؟ فەرمووی: ((انها ابنة اخي من الرضاعة)) واتە: ((ئەو کچی برای شیریمە)))[١١٠٥]. (ثوێبە کەنیزەی ئازاد کراوی ئەبو لەهەب شیری داوە بە حەمزە و پێغەمبەر بەیەکەوە).

## موسوڵمان بوونی کەڵە پیاوانی قورەیش (عەمری کوڕی عاص و خالیدی کوڕی وەلید و عوسمانی کوڕی ئەبو طەلحە)

بە دڵنیایەوە ڕێکەوتننامەی حودەیبیە و عەمرەی (قضاء) ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاوی هەبوو لە گەیاندنی ئیسلام و بڵاو کردنەوەی بەناو خەڵك دا و ناساندنی پێیان وەك خۆی، بەتایبەتی لای موشریکەکانی خەڵکی مەککە، کە بەرێز وەستابوون لەسەر بەرزاییەکانی شاری مەککەوە و بە دیقەتەوە دەیان ڕوانیە پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانەکان کە چۆن مەککە و ئەو شارە پیرۆزە بەرز و پیرۆز ڕادەگرن، بە دەنگی بەرز بانگی یەکتا پەرستی دەدەن بەگوێیاندا و لەمزگەوتدا بەیەکەوە نوێژ بەکۆمەڵ بەجێ دەگەیەنن جیا لەو پەرستە شێوێنراوە و بێ بنەمایەی ئەوان کە بریتی بوو لە فیکەو چەپڵە ڕێزان، موسوڵمانەکانیان دەبینی تێکەڵاوی خەڵك دەبوون بەو ڕەوشتە بەرزو سەنگینانەی ئیسلام هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد، هەموو ئەمانە بوونە هۆکار و پاڵنەری بەهێز بۆ ئەوی گۆڕانکاری لە دید و تێڕوانینی خەڵکیدا ڕوو بدات بەرامبەر بە ئیسلام وکەسایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە موسوڵمانەکان هەتا گەیشتە ئەوەی هەندێکیان پەلە بکەن لە چوونە ناو بازنەی ئیسلامەتی و شوێن ئەم پەیامە خواییە بکەون نەك لەخەڵکی سادە

---

[١١٠٥] اخرجه: البخاري (٤٢٥١)، واحمد (٧٧٠) وقال محققه: اسناده حسن، وابي داود (٢٢٧٨)، والحاكم (١٢٠/٣)، وابي يعلي (٥٢٦)، وانظر: (صحيح ابي داود) (١٩٩٣)، و(الصحيحه) (١١٨٢)، واللفظ للبخاري والزيادات لأحمد وابي داود.

بەتەنها بەڵکو لە سەرکردەو پیاو ماقوڵ و خاوەن بیر و رەئەکانیان، لە ناویشیاندا عەمری کوڕی عاص و خالدی کوری وەلید و عوسمانی کوڕی طەلحە، عەمری کوڕی عاص لەوبارەوە دەفەرموێت: (کاتێك گەڕاینەوە لە غەزای (ئەحزاب) لە ڕۆژی خەندەق دا چەندین کەسایەتی مەککەم کۆکردەوە ئەوانەی پلەو پایەی منیان بەلاوە گرنگ بوو گوێیان بۆ دەگرتم پێم وتن: وەڵڵاهی بزانن من وادەبینم کە ئاینەکەی موحەممەد ﷺ بەسەر هەموو ئاینە کاندا زاڵ دەبێت بە سەر کەوتن و زاڵبوونێکی گەورە و نەخوازراو کە حەزی پێ ناکەین، من لەسەر ئەمە بۆ چونێکم هەیە [نازانم بڕوای ئێوە لەو بارەیەوە چۆنە؟ وتیان رەئو بۆچونی تۆ چییە؟ وتی: من پێشنیارەکەم بە ڕێی خۆم کە پەیوەندی بکەین بە نەجاشی پادشای حەبەشە کەلەلای خۆی داڵدەمان بدات و بمێنینەوە، ئەگەر موحەممەد سەرکەوت بەسەر هۆزەکەمان ئەوە ئێمە دوچاری هیچ نابین لە خزمەت نەجاشین وە ئێمە لە لای ئەوبین پێمان خۆشترە لەوەی بکەوینە ژێر دەستی موحەممەد، وە ئەگەر خزم و کەسوکاریشمان سەرکەوتن ئەوە ئێمە بەوان ناشناین، خۆ دواجارمان نابێت کە بێینەوە ناویان، وتیان: بەڕاستی بۆ چونێکی جوانە و لە جێی خۆیەتی، پێم وتن: دەی دیاریم بۆ کۆبکەنەوە تا بۆی ببەم خۆشەویست ترین شتێك کەپێی خۆشبێت کە لە وڵاتی ئێمەوە بۆی بچێت وبێشکەشی بکرێت پێستەیە، ئەوەبوو پێستەیەکی زۆریان بۆ کۆکردمەوە، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە خزمەتی، وەڵڵاهی من لە خزمەتی دابووم کە عەمری کوڕی ئومەیەی ضەمری هاتە لای، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردبووی بۆ کارو باری جەعفەر و هاوەڵانی بە مەبەستی ناردنەوەیان. دەفەرموێت: هاتە ژوورەوە بۆ خزمەتی منیش هاتمە دەرەوە، بەو هاوەڵەمانم وت: ئەوە عەمری کوڕی ئومەیەی ضەمریە ئەگەر چوومە لای نەجاشی و [دیاریەکانم] بردە خزمەتی داوای لێدەکەم بیداتە دەستم و لەگەردنی بدەم ئەگەر ئەوەم کرد قورەیش ئەوە ببیستن دەزانن من تۆڵەیان بۆ دەکەمەوە و پاداشتیان دەدەمەوە لە کاتێکدا کە نێردراوی موحەممەدیان بۆ دەکوژم من چوومە خزمەتی وە کڕنوشم بۆ برد هەروەك و پێشتر ئەو کارەم دەکرد وتی: سڵاو لە هاوڕێکەم شتێکت بەدیاری لە وڵاتی خۆتەوە بۆ هێناوم؟ وتم: بەڵێ ئەی خاوەن شکۆ پێستەیەکی زۆرم بەدیاری بۆ هێناوی، ئینجا پێشکەشم کرد و بردمە خزمەتی زۆر حەزی پێ دەکرد و سەری سوڕما بەرامبەری [کاتێك وەری گرت دوچاری ئەو سەرسامیە بوو لەبەر دیاریەکان] وتم خاوەن شکۆ من

[بینیم نێردراوی موحەممەد هاتە خزمەتت] و لە لای تۆ هاتە دەرەوە، ئەوە نێردراوی پیاوێکە دوژمنی ئێمەیە، بیدە دەستم با بی کوژم چونکە ئەو [پەرتەوازەی کردووین و] خانەدان و پیاو ماقوڵەکانی کوشتین، دەفەرموێت: ئەجاشی توڕەبوو دەستی برد و کێشای بە لوتی خۆیدا و گومانم برد کە ڕەنگە شکاندبێتی[١١٠٦].

لەو کاتەدا ئەگەر زەوی شەق بووایە حەزم دەکرد بچمە ناویەوە تا لێی جیا ببمەوە، پاشان وتم: ئەی خاوەن شکۆ، وەڵلاهی من وادەبینم تۆ ئەو داوایەی منت پێ ناخۆش بوو بێت، فەرمووی: داوام لێ دەکەیت نێردراوی کەسێکت پێ بدەم بیکوژێت کە جبریل دێتە خزمەتی و ئەو وەحیەی بۆ دێنێ کە پێشتر دەیبردە لای موسی ﷺ وتم ئەی خاوەن شکۆ ئەو بەو شێوەیە؟ [فەرمووی: بەڵێ وەڵلاهی وایە هاوار بۆ تۆ عەمر من ئامۆژگاریت دەکەم] بەگوێم دەکەیت شوێنی بکەوە و [بچۆ خزمەتی و موسوڵمان بە] وەڵلاهی ئەو لەسەر حەقە وە پەیامەکەی ڕاستەقینەیە، بە دڵنیاییەوە [ئەو لەگەڵ ئەوانەی لە خزمەتیان] سەردەکەن بە سەر ئەیارەکانیان دا هەروەك موسی سەرکەوت بەسەر فرعەون و دارو دەستەکەی، وتم: [خاوەن شکۆ] پەیمان وبیعەت دەدەم [بەتۆ] لەسەر ئەوەی موسوڵمان ببم. فەرمووی: بەڵێ دەستی درێژ کرد و بەیعەتم پێدا لەسەر ئەوەی کە موسوڵمان بم، پاشان ڕۆیشتمەوە لای هاوەڵەکانم ئەوان هەر لەسەر بۆچون و حاڵی خۆیان بوون، موسوڵمان بوونی خۆمم دەشاردەوە لە هاوەڵەکانم [وتیان: دەنگ وباس چییە؟ وتم: خۆشیتان][١١٠٧] کاتێ ئێوارە داهات سەرکەوتمە سەر وڵاخەکەم و بۆی دەرچوم و ئەوانم بەجێ هێشت] مەبەستم بوو بڕۆم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا موسوڵمان بوونی خۆم ڕاگەیەنم، لەڕێگادا گەیشتم بە خالدی کوڕی وەلید ﷺ ئەوەش ماوەیەك بەر لە فەتحی مەککە بوو لەشاری مەککەوە

---

[١١٠٦] وفي رواية: (فغضب فرفع يده فضرب بها انفي ضربة ظننت انه كسره فابتدرت منخراي فجعلت اتلقى الدم بثيابي فاصابني من الذل مالوانشقت لي الارض دخلت فيها فرقا منه). اخرجه: الواقدي (٢/٧٤١) وعنه ابن كثير (البداية) (٤/٢٣٦) والبيهقي (الدلائل) (٤/٣٤٧).

[١١٠٧] وفي رواية الواقدي: (ففارقتهم كأني اعمد لحاجة، فعمدت الى موضع السفن فاجد سفينة قد شحنت تدفع فركبته معهم، ودفعوها حتى انتهوا الى الشعيبة (وهي ميناء قريب من جده) وخرجت من السفينة ومعي نفقة فابتعت بعيرا، وخرجت اريد المدينة، حتى خرجت على مرالظهران..) اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٧٤١).

دەهات پێم وت: بۆکوێ دەچیت باوکی سولەیمان؟ وتی: وەڵڵاهی ڕێگای ڕاست ڕوون بۆتەوە و دەمەوێت ڕێگای ڕاست بگرم، ئەو پیاوە پێغەمبەرە وەڵڵاهی دەچمە خزمەتی و موسوڵمان دەبم، وتم: وەڵڵاهی منیش تەنها بۆ ئەوە هاتووم کە موسوڵمان بم. دەفەرموێت: گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خالید کوڕی وەلید پێش کەوت و موسوڵمان بوو بەیعەتی پێدا، پاشان من نزیک بوومەوە و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بەیعەتت پێ دەدەم لەسەر ئەوەی کە داوای لێخۆشبوونم بۆ بکەی تا خوا لەتاوانەکانی ڕابردومخۆشی ببێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یاعمرو بایع فان الاسلام یَجُب ماکان قبله وان الهجرة تَجب ماکان قبلها)) واتە: ((عەمر بەیعەتم پێ بدە ئیسلام ئەوی پێش خۆی پاک دەکاتەوە و نایهێڵێت وە کۆچکردنیش لەبەر خوا ئەوەی پێش خۆی ناهێڵێت)) دەفەرموێت: بەیعەتم پێداو گەڕامەوە.

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (بۆیان گێڕامەوە لەکەسێک کە تۆمەت بارناکریت بەهیچ شتێک کە نەشیاو بێت وە قسەی لێ وەردەگیرێت کە عوثمان کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحەش ﷺ لەگەڵیاندا موسوڵمان بووە لەوکاتەدا ئەوان تیایدا موسوڵمان بوون)[١١٠٨].

لە گێڕانەوەیکی تردا هاتووە عەمر ﷺ دەفەرموێت: (....کاتێک خوای گەورە ئیسلامەتی خستە دڵمەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: دەستی ڕاستت بینە جارێ بەیعەتت پێ نادەم و دەستی ڕاستی هێنا، دەستم درێژ نەکرد فەرمووی: ((ئەوە بۆچی وادەکەی عەمر؟)) وتم: دەمەوێت مەرج دابنێم فەرمووی: ((چ مەرجێکت هەیە؟)) وتم: بەیعەتت پێ دەدەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە تاوانەکانی ڕابردوم خۆشبی] فەرمووی: (([یاعمرو]اما علمت ان الاسلام یهدم ماکان قبله [من الذنوب]، وان الهجرة تهدمُ ما کان قبلها[من الذنوب]، وان الحج یهدم ماکان قبله)) واتە: (([عەمر] نەت زانیوە موسوڵمان بوون [تاوانی] پێش خۆی دەسڕێتەوە، وە کۆچکردن لە پێناوی خوا [گوناهی] پێش خۆی

---

[١١٠٨] أخرجه: احمد (١٧٧٧٧) وقال محققه: اسناده حسن في المتابعات والشواهد والقصة محتملة للتحسين، والبخاري (التاريخ الكبير) (٣١٢/٢)، والحاكم (٢٩٧/٣)، البيهقي (الكبرى) (١٢٣/٩) وفي الدلائل (٣٤٣/٤)، والطبراني (الاحاديث الطوال) (١٢) وابن هشام (السيرة) (٢٣١/٣)، والطبري (التاريخ) (٢٩/٣) واللفظ لاحمد والزيادات للبيهقي.

دەسڕێتەوە، وە حەج کردن گوناهی پێش خۆی دەسڕێتەوە)) دەفەرموێت: هیچ کەسێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویست تر نەبوو بەلامەوە وە لەبەرچاویشم گەورەتر و ڕێزدار تر نەبووە لەبەر ئەوە ئەم دەتوانی بە چاوەکانم سەیری بکەم بەتەواوی لە بەر گەورەیی و سام و هەیبەتی ئەو ئەگەر ئێستا داوام لێ بکرێت وەسفی بکەم ناتوانم چونکە چاوەکانم پڕنەبوون و تێرنەبوون لە تەماشاکردنی تا من باسی بکەم)[1109].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ((کاتێك بەیعەتم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر و زۆرتر شەرمم لێ دەکرد هەرگیز چاوەکانم تێرنەدەبوون لە سەیرکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ وە نەدەگەڕامەوە خزمەتی بۆ شتێك کەبمویستایە [لە بەر شەرم کردن و ڕێز گرتنم بۆی] هەتا گەیشتەوە بە خزمەتی خوای گەورە))[1110]. موسوڵمان بوونی عەمر و هاوەڵانی لەمانگی سەفەری ساڵی حەوتەمی کۆچی بووە[1111].

حافظ ﷺ دەفەرموێت: ڕاسترین بۆچوون لەسەر ئەوەی کە موسوڵمان بوونیان دوومانگ بەر لە غەزای (مۆتە) بووە[1112]. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووەکە عەمری کوڕی عاص ﷺ لە حەبەشە لەسەر دەستی جەعفەر ﷺ موسوڵمان بووە.

لە عومەیری کوڕی ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (جەعفەر کوڕی ئەبوطالب ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ڕوخسەتی لێکرد و وتی: کە ڕێگەم بدە بچمە خاکێك خوای گەورەی تێدا بپەرستم و لە هیچ کەسێك نەترسم، ئەویش ڕوخسەتی پێداو کۆچی کرد و چووە خزمەت نەجاشی دەفەرموێت: عەمری کوڕی عاص ﷺ بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: کاتێك پلەو پایەی ئەوم دی لای نەجاشی ئیرەیم پێدەبرد وتم وەڵاهی دەبێت بچمەوە لای ئەو و هاوڵەکانی پاشان چوومەوە خزمەت نەجاشی.... بڕواناکەم هیچ کەسێك هەبێت بەقەد من پێی خۆش بوو بێت کە بچێتە خزمەت نەجاشی و جەعفەری لێ

---

(1109) اخرجه: مسلم (١٢١) واللفظ له والزيادة لأحمد (١٧٨٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(1110) اخرجه: احمد (١٧٧٨١، ١٧٨١٣) وقال محققه: اسناده حسن.

(1111) اخرجه: الحاكم (٣/٤٥٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤/٣٥٢).

(1112) انظر: (فتح الباري) (٥/١٠١).

نەبێت ڕۆژێکیان لەڕێگادا گەیشت بەجەعفەر سەیری پێش خۆمم کرد هیچ کەسێکم بەدی نەکرد ئاوڕم دایەوە پشتەوە کەسم نەبینی لە درێژەی قسەکانی دا دەفەرموێت: لێی نزیک کەوتمەوە و دەستم برد بۆ دەستی و پێم وت: تۆ شایەت ببەکە من موسوڵمان بووم و شایەتی دەدەم کە جگە لە خوای گەورە هیچ پەرستراوێك بەحەق نی یە، وە موحەممەدیش پێغەمبەر وبەندەی خوایە فەرمووی: خودا هیدایەتی دای بۆ ئیسلام ئینجا تۆش بەردەوام بە لەسەری و کۆڵ مەدە.....)[١١١٣].

## غەزای مۆتە

لەساڵی هەشتەمی کۆچی دا خێل وهۆزە عەرەبە گاورەکانی گۆێ لەمست و هاوپەیمانی ڕۆم کەوتنە دوژمنکاری ئەوانەی دەهاتنە ژێرسایەی ئیسلام و موسوڵمان دەبوون لەو ناوچەیەدا وڕێگاکانی بازرگانی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیە تازە سەرهەڵدراوەیان دەخستە مەترسیەوە و کەوتبوونە هەڕەشەو گوڕەشەکردن، لەگەڵ هەموو ئەوانەش دا هەستان بەکوشتنی نێردراوی موسوڵمانەکان حاریثي ئوزدی ﷺ کە ئەو کاتە بەهیچ پاساوێك نێردراو نەدەکوژرا، هەموو ئەوانە پێویستیان کرد کە ڕێگەچارەیەك بدۆزرێتەوە بۆ تەمێکردنی ئەو خێڵە عەرەبانە بەتایبەتی دوای ئەوەی بانگەوازی ئیسلامیان ڕەتکردەوە و قبوڵیان نەکرد، بووە ئەرك و پێویستیەکی حاشا هەڵنەگر کە ئەو شان و شکۆ و لوت بەرزیەیان تێك بشکێنرێت و ملکەچ و زەبوون بکرێن ئیسلامیش لەناوچەکەدا بڵاو بکرێتەوەو ئاسایش بگێڕدرێتەوە بۆ ڕێگا بازرگانیەکان.

ئەم غەزایە لە مانگی (جمادی یەکەم) ڕوویداوە هەروەك عورەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ بەسریەیەکی نارد بۆ مؤتة لەمانگی (جمادی یەکەمی) ساڵی هەشتەمی کۆچیدا)[١١١٤]. بەلەبەرچاو گرتنی دووری ڕێگەکە و مەزندەکردنی ڕووبەڕوو بوونەوە

(١١١٣) أخرجه: ابويعلى (٧٣٥٢) وقال محققه: اسناده جيد، والبزار (١٧٤٠)، والبيهقي (الدلائل) (٢/٢٨٥)، وقال البوصيري (اتحاف الخيرة المهرة) (٥٨٤٢): عمير بن اسحاق اختلف فيه وباقي رجاله ثقات، وقال الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٢٨): اسناده حسن الا انه مخالف للمشهور ان اسلام عمرو ﷺ كان على يد النجاشي نفسه.

(١١١٤) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٥٧)، وابن هشام (٣/٣٢٨)، والطبري (٣/٣٦)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٤/٣٥٨).

لەگەڵ هێزێکی پڕ چەك و زەبەلاح و ژمارە زۆردا، وە لەپێناو پاراستنی یەك ڕیزی سوپاکە و ڕێگرتن لە پاشاگەردانی و گوێنەدان بەیەك تری پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سەرگردەی تری سوپای وەك یەدەك دانا بۆ ئەمیری سوپاکە.

لەوبارەوە ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەفەرموێت: ((علیکم زید بن حارثة [فان قتل زید واستشهد فأمیرکم جعفر، وان قتل واستشهد فأمیرکم عبدالله بن رواحة][١١١٥]الأنصاري)) (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەی (ئەمیرەکانی) نارد [زەیدی کوڕی حارث ﷺ کردە فەرماندەریان وە فەرمووی پێیان]: ((زەید کوڕی حارث ئەمیرتان بێت [ئەگەر زەید شەهید کرا ئەوە با جەعفەر ﷺ ئەمیرتان بێت، ئەگەر ئەویش شەهید کرا ئەوە با عەبدڵڵای کوڕی ڕەواحەی (ئەنصاری) ئەمیرتان بێت].

جەعفەر هەوڵیدا و فەرمووی: بەدایك باوکەوە بەفیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەترسم کە زەید بەسەرمەوە ئەمیر بێت کە شتێك لەلام دروست ببێت؟ فەرمووی: ((امضه فأنك لاتدري اي ذلك خیر))[١١١٦]. ((بڕۆ لە خزمەتیا تۆ نازانیت خێر لە چیدایە)).

## ماڵئاوای کردن لە سوپاکە

عورەوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت خەڵکەکە کە خۆیان ئامادەکرد پاشان کەوتنە ئامادە باشی بۆ بەڕێکەوتن ژمارەیان سێ هەزار کەس بوو، کاتێکدەیان وست بڕۆن خەڵکەکە بەشێوەی مەراسیمێکی شایستە ماڵئاوایان لێ کردن سڵاوی جۆشدانیان لە ئەمیرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، لەکاتی خوا حافیزی ماڵئاوایەدا کە ماڵئاوای لە عەبدوڵڵای کوڕی

---

[١١١٥] اخرجه: احمد (١٧٥٠) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط مسلم، وأبي داود (٤١٩٢)، والنسائي (الکبری) (٨٦٠٤)، والطبراني (١٤٦١)، والحاکم (٢٩٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وصحح اسناده الحافظ في (الفتح) (٦٥١/٧)، والنووي (ریاض الصالحین) (١٦٤٠)، والشیخ الألباني في (صحیح ابي داود) (٣٥٣٢)، و(فقه السیرة) (ص: ٤٠١)، و(أحکام الجنائز) (٦٦).

[١١١٦] اخرجه: احمد (٢٥٥١) وقال محققه صحیح لغیره، وابن أبي شیبة (٣٨١٢١)، والدارمي (٢٤٤٨)، والنسائي (الکبری) (٨٢٤٩)، وابن حبان (٧٠٤٨) وقال محققه: اسناده صحیح، والبیهقي (دلائل النبوة) (٣/ ٣٦٧)، وصححه الشیخ الألباني في (أحکام الجنائز) (ص: ٤٦)، و(الإرواء) (٢٨٥/٥)، وصححه ایضاً الشیخ مقبل في (الصحیح المسند) (٢٧٧).

ڕەواحە دەکرا ﷺ کە یەکێك بوو لە ئەمیرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دای نابوو دەستی کردە گریان، وتیان بۆ چ شتێك دەگریت کوڕی ڕەواحە؟ لە وەڵام دا فەرمووی: وەڵلاهی لەبەر خۆشەویستیم بۆ دنیا و جیابوونەوە لە ئێوە ناگریم، بەڵام گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتێکی دەخوێندەوە لە کتێبە پیرۆزەکەی خوای گەورە کە تێیدا باسی ئاگری دۆزەخ دەکات: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ (مريم: ٧١) واتە: ﴿ئەی خەڵکینە! ئیللا دەبێ هەمور نزیکی ئاگری دۆزەخ ببنەوەو بەسەر پردەکەی (صیراط)دا تێپەڕن، ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەوە دراوەو بڕاوەتەوەو شتێکی حەتمییە﴾.

من نازانم لەکاتی تێپەڕبووندا چۆن بەسەری دا دەڕۆم ڕزگارم دەبێت یاخود نا، موسوڵمانەکان پێیان فەرموون: خوا پشتیوانتان بێت و دوژمنەکانتان تێك بشکێنێت وە بەڵاتان لەسەر لابدات و بەسەلامەتی بگەڕێنەوە بۆ ناومان... پاشان سریەکە بەڕێکەوتن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیاندا تا دەرەوەی مەدینە ڕۆیشت تا ماڵئاوای لێکردن و دیار نەمان پاشان گەڕایەوە)[1117].

لەگێڕانەیەکدا هاتووە لە عەبدوڵلای کوڕی یەزیدەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوپاکە ڕۆیشت بەمەبەستی ماڵئاوای کردن کە گەیشتە (ثنية الوداع) فەرمووی: ((استودع الله دينكم وأماناتكم وأخواتيم أعمالكم))[1118].((خۆتان و ئاینەکەتان و کۆتای کردەوەکانتان بە خوای گەورە دەسپێرم)).

دوو گێڕانەوەی تری هاتووە لە بارەی دواکەوتنەکەی عەبدوڵلای کوڕی ڕواحەوە ﷺ، لەو بارەیەوە ئیبن و عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کە پێغەمبەری خوا ﷺ سریەکەی نارد بۆ مۆتە... کوڕی ڕەواحە دواکەوت نوێژی هەینی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامدا

---

(1117) أخرجه: الطبراني (٤٦٥٥)، والطبري (٣٦/٣)، وابن هشام (٣٣٢)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٥٨/٤)، وقال الهيثمي (المجمع (١٠٢٢٠): رجاله ثقات إلى عروة، وقال العمري (السيرة الصحية) (٤٦٧/٢): اسناده حسن.

(1118) أخرجه: ابوداود (٢٦٠٠)، واحمد (٢٥٥/٢)، والحاكم (٩٧/٢)، وابي يعلى (٥٦٢٤)، وابن حبان (٢٣٧٦)، واللفظ للبيهقي (الكبرى) (٣٧٢/٧) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٤)، و(صحيح الجامع) (١٩٥٧)، و(الكلم الطيب) (١٦٩).

پێی فەرموو: ((بۆ چی دواکەوتویت؟)) وتی بۆ ئەوەی نوێژی جومعە لە خزمەتتدا بکەم. فەرمووی: ((لغدوة أو روحة في سبيل الله خيرٌ من الدنيا وما فيها)))[١١١٩]. ((دەرچوونی بەیانیان یان ئێواران لەپێناوی خوا باشترە لە دونیاو لەوەی تێیدایە)).

هەروەها گێڕانەوەیەکی تریش لەو بارەوە هەیە: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدللای کوڕی ڕەواحەی ﷺ لەگەڵ سریەکەدا نارد هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی هەینی هاوەڵان هەموو ڕۆیشتن و عەبدللا فەرمووی: (من دوا دەکەوم نوێژی جومعە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم فەرمووی: وستم کە نوێژی هەینی لە خزمەتدا بکەم پاشان بگەمەوە پێیان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگە هەرچی لە زەویدا هەیە بیبەخشی ناگەیتەوە بە خێر و چاکەی زوو چونە دەرەوەیان بۆ غەزا))[١١٢٠]. لە گێڕانەوەیەکدا: ((...والذي نفسي بيده لقد سبقوك بابعد مما بين المشرق والمغرب [في الفضيلة]))[١١٢١]. ((...سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە پێشت کەوتن [لەچاکەو خێردا] زیاتر لە دووری نیوان ڕۆژ هەڵات ڕۆژ ئاوادا)).

---

(١١١٩) أخرجه: أحمد (٢٣١٧) وقال محققه: حسن لغيره، وابن ابي شيبة (١٩٦٤٩) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابي يعلى (٢٥٠٦)، وقال محققه: اسناده ضعيف، وقوله ﷺ(لغدوة أوروحة...مافيها) أخرجه: البخاري (٢٧٩٣)، ومسلم (١٨٨٢).

(١١٢٠) أخرجه: أحمد (١٩٦٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، والترمذي(١٦٤٩)، والطيالسي (٢٦٩٩)، والطبراني (١٢٠٨١).

(١١٢١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٥٧/٢٠) وقال محققه: فيه ثلاثة ضعفاء، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٨٤/٥) فيه زباد بن فايد وثقه ابوحاتم وضعفه الجمهور وبقية رجاله ثقات، وقال أحمد شاكر(سنن الترمذي) (٤٠٦/٢) رواه عبدالحكم (فتوح مصر) (ص: ٢٩٨) واسناده جيّد.

# گەیشتنی سوپاکە بەمەیدانی جەنگ

سوپای موسوڵمانەکان ڕۆیشتن بەو بیابان و گەرمەسێرە و خاکەبەردەڵانە دا هەتاکو گەیشتنە دەووری خاکی (بەلقا) وە لەوێدا بۆیان دەرکەوت کە ژمارەی دوژمنەکانیان دەهێندەی ئەوانن، هەندێکیان کەوتنە دوو دڵییەوەو ویستیان کە لەشوێنی خۆیاندا بمێننەوە و نەجوڵێن و داوای هاوکاری و پشتیوانی زیاتر بکەن، بەڵام عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ﷺ کەوتە جۆش دانیان لەسەر جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا و شەڕکردن لەگەڵ دوژمدا لە ئەنجامدا هەموویان بۆچوونەکەی ئەویان پەسەند کرد و یەکلایی بوونەوە لەسەر ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن.

لەوبارەوە عورەوە ﷺ دەفەرموێت: (پاشان ڕۆیشتین هەتا گەیشتنە ناوچەی (معان) لە خاکی شام لەوێدا خستیان، هەواڵیان پێدان کە هێرەقل بەر لەوان لە (ماب) لە ناوچەی (بەلقاء) دابەزیووە بەسەد هەزار سەربازی ڕۆمیەوە، وە سەد هەزاریش لەو عەرەبانەی کە لەڕەچەڵەکدا عەرەب نەبوون چونە پاڵی و کۆبوونەوە لە هۆزەکانی (لەخم و جوزام و بکی و بلقین و بهراء) بەسەرکردایەتی کەسێکی خێڵی (بەلی) کە ئاڵاکەی هەڵگرتووە و ناوی مالیکی کوڕی زافیلەیە، کاتێك ئەو دەنگ باسە بەو جۆرە گەیشتە موسوڵمانەکان دوو ڕۆژ لەناوچەی (معان) مانەوە لە بارودۆخی ڕۆمیەکانیان دەڕوانی تا بزانن هەڵوێستیان چی دەبێت، وتیان: نامەیەك دەنوسین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە لە ژمارەی دوژمن ئاگاداری دەکەینەوە، یا ئەوەتا هاوکاریمان بۆ بنێرێت یاخود فەرمانێکمان بۆ دەرکات بە پێی ئەوە بڕۆین بەڕێوە.

عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ﷺ کەوتە هاندانی خەڵکەکەو بە دێڕە شعرەکانی جۆشی دان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەوەی ئێوە لەسەر دڵتان گرانە ئەوەیە کە بۆی دەرچوون ئەویش داواکردن و گەڕانە بۆ بەدەست هێنانی شەهیدی ئێمە ناجەنگین لەگەڵ ئەوە خەڵکەدا بە زۆری ژمارەی هێز و توانای سەربازیمان، ئەم شەڕەیان لەگەڵدا دەکەین بەو ئاینەی کە خوا ڕێزی لێگرتوون پێی کە ئیسلامە کەواتە هەستن با بڕۆین ئێمە تەنها دوو شتمان لا مەبەستە یا سەرکەوتن یا شەهید بوون...

زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەفەرموێت: من هەتیو بووم لەماڵی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەژیام لە وسەفەرەدا دەرچووم لەگەڵی لە پشتەوەی لەسەر شتوومەکی وشترەکەی دانیشتبووم، وەڵڵاهی لە شەوێکدا دەڕۆیشتین کە گوێم لێبوو ئەم دێڕە هۆنراوە یەی خۆی دەخوێندەوە:

إذا إدّيتي وحملت رحلي      مسيرة اربع بعد الحساء

فشأنك انعم وخلاك ذم      ولا ارجع الى اهلي ورائي

واتە: ئەگەر نزیك یان کردمەوە ئەم گەشتە هەڵی گرتم ماوەی چوار ڕۆژ لە دوای ئەو ڕێگا بەردەڵانە پلەو پایەت بەرزەو ژینێکی پڕ نازونعمەتە ڕزگارت دەبێت، وە زەم کرا و دەبێت ئەو کەسەی بە پێچەوانەت هەڵسوکەوت وەرگرێت دوای ئەمە ناگەڕێمەوە ناو کەسوکارم.

کاتێك گوێبیستی ئەم دوو دێڕە هۆنراوەیە بووم دەستم کرد بە گریان بە قامچیەك بەزەردەخەنەوە لێی دام و فەرمووی: ئەوە چیە کوڕە بەلاتەوە ناخۆشە خوای گەورە شەهادەت بەمن ببەخشێت وە تۆش لەسەر کۆپانی ئەم وشترە بگەڕێیتەوە...

عورەوە ﷺ دەفەرموێت: سوپاکە ڕۆیشت تاگیشتە سنوری (بەلقاء) گەیشتن بە سوپای بێ ژمارەی هیرەقل کە ڕۆمەکان بوون، عەرەبەکانیش لە ئاوەدانیەك لە ئاوەدانیەکانی (بەلقاء) بوون پێیان دەوت (مشارف ماب) پاشان دوژمن لێیان نزیك دەبوونەوە و موسوڵمانەکانیش لایاندا بۆ دێیەك پێی دەوترا (مؤتة) کە (١١٠٠)کم لە شاری مەدینەوە دوور بوو، خەڵکەکە لەوێدا ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، موسوڵمانەکان خۆیان ساز و ئامادە دەکرد ئەوەبوو لە لای ڕاستیانەوە کەسێکی بەنی (عوذرە) یان دانا بەناوی قوطبەی کوڕی قوتادەﷺ، وە لەلای چەپیشیانەوە کەسێکی ئەنصاریان دانا بەناوی عەبادەی کوڕی مالیك [موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (...ڕۆیشتین هەتا گەیشتین بە کوڕی ئەبوسەبرەی غەسانی لە (مؤتة) ژمارەیەکی زۆری لە گاورەکانی عەرەب ڕۆم لەگەڵدابوو لە خێڵەکانی (تەنوخ و بەهراء) کوڕی ئەبو سەبرە دەرگای قەڵاکەی سێ ڕۆژ لە موسوڵمانەکان داخست پاشان چوونە دەرەوە لەسەر شینایییەك کە کرابووە کوشتوکاڵ ڕوو بەڕووی یەك

یەک))][1122]. عورِوە ﵁ دەفەرموێت: بوونەوە شەڕێکی سەخت و دژواریان کرد لەگەڵ (زەیدی کوڕی حاریثە ﵁ بە ئاڵاکەی پێغەمبەری خواوە چووە مەیدان و کەوتە شەڕکرن هەتا کەوتە بەر وێزەی ڕم و نیزەی دوژمنە سەرسەختەکانەوە، پاش ئەو جەعفەر ﵁ ئاڵاکەی هەلگرت و کەوتە شەڕکردن و کوشتاری ڕۆمەکان بە ئاڵاکەوە هەتا شەڕەکە تاوی سەند دواجار دەوریان داو ئەویش لە ئەسپەکەی دابەزی کە ئەسپێکی سورباو بوو شمشێرێکی لیداو کوشتی ئینجا بە پیادە کەوتە شەڕکردن لەگەڵیاندا هەتا کوژرا)[1123].

لە گێڕانەوەیەکدا کەسێکی بەنی مورەی کوڕی عوف دەگێڕنەوە دەفەرموێت: ([وەڵڵاهی لەبەر چاومە ئێستاش لەو کاتەی کەدەوری جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبیان دا ئەویش لە ئەسپە سورباوەکەی هاتە خوارەوە وە شمشێرێکی لە ئەسپەکەی داو کوشتی، ئینجا بە پیادەکەوتە شەڕلەگەڵیان تا کوژرا] دەفەرموێت: ئای لە خۆشی نزیک بوونەوە لەو بەهەشتەی کە بۆنی خۆشە وە ئاوەکەشی سازگار و فێنکە][1124]. کاتێک جەعفەر ﵁ شەهید کرا عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ﵁ ئاڵاکەی هەلگرت، بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت بەسەر ئەسپەکەیەوە، دڵ و دەرونی هەندێ شتی بۆ دروست کرد، هەندێ دڵە ڕاوکێ دوو دڵی ڕووی تێکرد پاشان کەوتە سەرزەنشت و شکاندنی نەفسی خۆی بە هۆنراوە فەرمووی:

اقسمت يا نفسي لتنزلّنه طـائـعـة أو لتـكـرهـنـه
مالي أراك تكرهين الجنة إن اجلب الناس و اشدّ و الرّنة[1125]

---

[1122] أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٣٦٤/٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٦١/٦) (١٠٢٢٢): رواه الطبراني ورجاله ثقات، وهي رواية موسى بن عقبة قال الحافظ (الفتح) (٦٥٤/٧): مغازى موسى بن عقبة هي أصح المغازي.

[1123] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٣١/٣)، والطبري (التاريخ) (٣٨/٣)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٦٠/٤).

[1124] أخرجه: أبوداود(٢٥٧٣)، وابن ابي شيبة (١٩٧٥٩) وقال محققه: حديث حسن، والحاكم (٢٠٩/٣)، والطبراني (الكبير) (١٤٦٢)، وقال الحافظ في (الفتح) (٦٥١/٧): اسناده حسن، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٦٨/٢): سنده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٢٤٣).

[1125] أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٨٢/٣)، وقال العدوي في (الصحيح المسند من فضائل الصحابة) (ص: ٢٨١): اسناده حسن.

واتە: سوێنت لێ دەخۆم ئەی نەفس دەبێت بۆیان دابەزیتە مەیدان بە خۆشی خۆت بێ یان بە زۆرداری، بۆ دەبینم بە هەشتت لاناخۆشە لەکاتێك دا دوژمن هێرشی هێناوەتە سەرمان بە هاواری گران پاشان دابەزی لە ئەسپەکەی.

لەوکاتەدا کە دابەزی بوو کوڕە مالکیەکە هاتە خزمەتی پارچەیەك گۆشتی بۆ هێنا و پێی وت: ئەمە بگرە با ناهێکت بێتەوە بەبەردا تۆ ئەم چەند ڕۆژە دوچاری نارەحەتی برسێتیەکی زۆر بووی هیچت نەخواردوە ئەویش لەدەستی وەرگرت و قەپێکی لە گۆشتەکەدا و پاشان گوێی لە گرم و هوڕی شەڕەکە بوو خەڵکەکە کەوتبوونە ناویەك فەرمووی: تۆ هیشتا لە دونیای، ئینجا گۆشتەکەی فڕێدا، شمشێرەکەی هەڵکێشاو چووە پێشەوە، کەوتە شەڕکردن هەتا ئەویش کوژرا، دوای ئەو ثابتی کوڕی ئەرقەم کە یەکێکە لەبەنی عەجلان و فەرمووی: خەڵکینە، ڕێکەون لەسەر کەسێکی ناو خۆتان یەکێکتان بکەن بە ئەمیری خۆتان؟ فەرموویان خۆت ببە بە ئەمیر و سەرکردەمان. فەرمووی: من ئەو کارەناکەم. [(ثابت) ئاڵاکەی دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید ئەویش وتی: بۆچی دەیدەیت بە من؟ وتی: تۆ شارەزاتری لە من بە جەنگ کردن و پیلان دانان][1126]. ئەوە بوو خەڵکەکە ڕازی بوون بە فەرماندەری خالیدی کوڕی وەلید ﷺ، کاتێك ئاڵاکەی هەڵگرت کەوتە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن و بەرگری کردن لە موسوڵمانان...)[1127].

بەو شێوەیە خالید ئاڵاکەی وەرگرت و کەوتە شەڕکردن لەگەڵیاندا ئەو ڕۆژە سەختترین جەنگ ڕوویدا هەتا نۆ شمشێر لەدەستیا شکان، خالید لەوبارەیەوە دەفەرموێت: (لە جەنگی مۆتە دا نۆ شمشێر لەدەستم شکا، هیچ شمشێرێك لە دەستم خۆی نەدەگرت هەتا شمشێرێکی یەمانی نەبێت)[1128].

---

(1126) أخرجه: الطبراني (الأوسط) (١٦٤٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢١٩) رواه الطبراني في (الأوسط) فيه حمزة الشمالي ضعيف، وقال الحافظ (الإصابة) (٩٠/١): رواه ابن منده باسناد ضعيف.

(1127) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٣٢/٣)، والطبراني (١٢١/١٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٢٢١): رواه الطبراني ورجاله، ثقات وقال الحافظ (الفتح) (٦٥١/٧) اسناده حسن، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٦٨/٢): سنده حسن.

(1128) أخرجه: البخاري (٤٢٥٦).

موسوڵمانەکان شەڕێکی بەجگار سەخت و دژواریان لەگەڵ دوژمن دا کرد کە مەزەندە نەدەکرا بە جۆرێك دەسکەوتیان دەست خست دوژمنیان دوچاری زەروزیانێکی چاوەڕوان نەکراو کرد.

ئەوەی پشت ڕاستی ئەمە دەکاتەوە گێڕانەوەکەی عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیە ﷺ دەفەرموێت: (بەژداریم کرد لە سریەی زەیدی کوڕی حاریبە ﷺ هاوشانی موسوڵمانەکان ڕۆیشتم بۆ مؤتة)[١١٢٩]. کەسێکی خێلی حەمیر بووە هاوڕێم کە وەك کۆمەکی و هاوکاری خێلی حەمیر لە [وڵاتی یەمەنەوە] هانبوونە پاڵ ئێمە و لەو سەفەرەدا لەگەڵماندا بوون هیچ چەك و تفاقێکی پێنەبوو تەنها شمشێرێك نەبێت، کەسێك لە موسوڵمانەکان چەندین وشتری سەربڕی بوو بۆ خواردن [کابرای هاوکار و پشتیوان داوای کرد هەندێك لە پێستەکەی پێبدات ئەویش پێی بەخشی] زۆری نەبرد کە پێستەکەی وەرگرت شێوەی قەڵغانێکی لێ دروست کرد ڕای خست لەسەر زەوی و لێی گەڕا هەتا وشك بووە وە پاشان دەسکێکی بۆ کردبوو لە شێوەی قەڵغان و ڕێکی خست ئینجا [ڕۆیشتن ڕووبەڕووی] دوژمنەکانمان بوونەوە کە ڕۆم و عەرەبەکانی خێلی قوضاعە بوون، شەڕێکی سەختیان لەگەڵدا کردین.

لە ناوخەڵکەکەدا کەسێکی ڕۆمی هەبوو لەسەر ئەسپێکی سورباو بوو زینی ئەسپەکە و پشتوێن و شمشێرەکەی زێڕ پۆش کرابوو، بەسەر خەڵکەکەوە دەهات و دەچوو هانی دەدان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسوڵمانەکان) [پیاوە حەمیریە کۆمەکیەکە لە پشت بەردێکی گەورەوە بۆسەی بۆ دانا، ڕۆمیەکە بەلای دا تێپەڕی] لە پشتەوە بە شمشێرەکە کێشای بەپشتی پێی ئەسپەکەی داو شادەماری بڕی پیاوەکە کەوتە خوارەوە] پاشان شوێنی کەوت و [دای بە زەویدا] دایە بەر شمشێر هەتا کوشتی [ئینجا چەك و ئەسپەکەی هێنا] [هاتەوە بەزین و لغاو و شمشێر و پشتوێنەکەی، چەك و تفاقەکەی هەموو زێڕو گەوهەر بوو بردیە خزمەت خالیدی کوڕی وەلید ﷺ] کاتێك خوای گەورە فەتح سەرکەوتنی [بەخشی بە موسوڵمانەکان] [خالید کوڕی وەلید ﷺ ناردی بەشوێنیدا و دەسکەوتەکانی کابرای کوژراوی دەستی خۆی لێوەرگرت]، کە هاتە خزمەتی داوای دەسکەوتەکانی لێکردەوە خەڵکەکە

---

(١١٢٩) أخرجه: مسلم (١٤/١٧٥٣)، وأحمد (٢٣٩٩٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

شایەتیان بۆ دا کە ئەو بکوژیەتی، خالید هەندێکی پێ بەخشیەوە، ئەوەی تریشی هەمووی گلدایەوە کاتێك گەڕایەوە لای هاوسەفەرەکەی عەوف بۆی باسکرد، عەوفیش پێی فەرموو: بگەڕێوە لای با ئەوەی تریش بداتەوە، ئەویش چووە خزمەتی بەڵام نەیدایەوە، عەوف ڕۆیشت هەتا گەیشتە خزمەتی خالید ﷺ فەرمووی: [خالید ئەوە چیە؟] باش بزانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری [هەموو] دەست کەوتی کوژراوی داوە بە بکوژەکەی؟ فەرمووی: ڕاستە. وتی: ئەی چی ڕێگرتە کە کەلوپەلی کوژراوی دەستی خۆی بۆ بگێڕیتەوە و پێی ببەخشی؟ خالید ﷺ فەرمووی: [بەڵام من] ئەمە بە زۆر دەزانم بۆ ئەو. فەرمووی: [یا بۆی دەگێڕیتەوە و پێی دەدەی یا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەگێڕمەوە و باسی دەکەم خالید ڕازی نەبوو کە بیداتەوە]، عەوف ﷺ فەرمووی: [وەڵلاهی] ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بۆی بگێڕمەوە و پێی بڵێم)[١١٣٠].

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە جابرەوە ﷺ دەفەرموێت: عوقەیلی کوڕی ئەبوطالب ﷺ کەوتە شەڕی مەیدانی و زۆران گرتن لەگەڵ کەسێکدا، دواتر کوشتی شمشێر وقەڵغانەکەی بۆ ئەو بوو، ئەنگوستیلەکەشی دەست کەوت کەنقێمی سوری لێ هەڵکەنرا بوو)[١١٣١].

---

[١١٣٠] اخرجه: مسلم (١٧٥٣)، واحمد (٢٣٩٨٧، ٢٣٩٩٧) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم، وابوداود (٢٧١٩)، والطبراني (الكبير) (١٨/١٨٥)، والبيهقي (٦/٣١٠)، والطحاوي (٢/١٣٠)، وابن حبان (٤٨٤٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وانظر: (ارواء الغليل) (١٢٢٣) واللفظ لهم جميعاً.

[١١٣١] خرجه: البيهقي (الكبرى) (٣/٣٠٩) ورواه بلفظ اخر الواقيد (المغازي) (٢/٧٦٨)، وعنه البيهقي (دلائل النبوة) (٤/٣٧٣).

# کۆتای جەنگەکە

موسوڵمانەکان بەوردیەکی پۆڵاینەوە خۆراگرانە بەرامبەر لەشکری بێ ژمارە و زۆر و زەوەندی پڕچەك و تفاقی ڕۆم وەستان و توانیان لە بەردەم ئەو دوژمنە سەر سەختەدا یەك ڕۆژی تەواو دان بەخۆیاندا بگرن سەرەڕای شەهید بوونی سێ سەرکردەکانیان وە سەخترین شەڕیان ئازایانە و دلێرانە لەگەڵدا بکەن، [لە دوای ئەوەی کە خالیدی کوڕی وەلید ﷺ ئالآکەی وەرگرت بووە سەرکردەی سوپای موسوڵمانەکان کەوتە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی توند لەگەڵ دوژمندا و دووری خستنەوە لە موسوڵمانەکان پاشان کەوتە خۆلادان و کۆکردنەوەی موسوڵمانەکان بەلایەکدا بەجۆرێك ڕزگاریان کات لەو جەنگە نالەبارە پاشان نەخشەکەی سەری گرت و کەوتە گەڕانەوە و پاشەکشە پێکردنی موسوڵمانەکان ئەمە بۆچونی ئیبن ئیسحاق ﷺ و ئیبن قەیمە (رحمة الله) پشت ڕاستی دەکاتەوە][1132].

بەڵام لە ڕاستی دا موسوڵمانەکان سەرکەتنیان مسۆگەر کرد هەروەك موسی کوڕی عوقبەﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (...خوای گەورە دوژمنی دوچاری شکست وتێکشکان کرد وە موسوڵمانەکانی سەرخست بەسەریاندا)[1133]. وە زهریش (رحمه الله) هەمان بۆچونی هەیە وە دەفەرموێت: (خالید کوڕی وەلید ﷺ بووە فەرماندەری موسوڵمانەکان وە خوای گەورە فەتح و سەرکەوتنی پێ بەخشین و بەسەر ڕۆمەکاندا سەری خستن)[1134].

وە ئەوەی پشت ڕاستی بیروڕاکەی دەکاتەوە ئەم بۆچونەی ئیمامی بەیهەقیە (رحمه الله) دەفەرموێت: (...موسوڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر موشریکەکانی ڕۆم و عەرەبەکانیان، موشریکەکان دوچاری شکست و دۆڕان بوون، وە ئەو فەرموودەیەی ئەنەسی کوڕی مالیكﷺ کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوەتەوە وە دەفەرموێت: (...ثم اخذ خالد بن الولید من غیره

---

(1132) انظر: (السیرة) ابن هشام (٣/٣٣٤) (رقم: ٨٩٨)، وقال العمري (السیرة الصحیحة) (٢/٤٦٨): اسناده حسن، وابن القیم (زاد المعاد) (٢/١٧٣).

(1133) انظر: (دلائل النبوة) للبیهقي (٤/٣٦٤)، وهوراي الواقدي ایضاً (المغازي) (٢/٧٦٤).

(1134) انظر: (السیرة النبویة) لابن هشام (٣/٣٣٨).

امرۆ [ففتح الله عليه] وفي رواية [حتى فتحه الله عليهم]))(١١٣٥).هذا يدل على ظهوره عليهم والله أعلم بالصواب)(١١٣٦). (...پاشان خالیدی کوڕی وەلید بەبێ ڕاوێژێکی گشتی کرا بە فەرمان دەر و ئاڵاکەی گرتە دەست [خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو ڕزگاری کردن و سەرکەوتن]). ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەخوای گەورە سەری خستوە و موسوڵمانەکان زاڵ بوون بەسەریان دا خوای گەورە زاناترە بە ڕاستی ئەم داستانە).

وە هەروەها فەرمایشتەکەی عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ ئەم بۆچونە بەهێز تر دەکات هەروەها لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (...کاتێک خوای گەورە [موسوڵمانەکانی] سەرخست و فەتحی پێ بەخشین چۆن فەتحێك...)(١١٣٧).

ئیبن کثیر (رحمه الله) دەفەرموێت: (دەتوانین لە کۆکردنەوەی بیروڕای ئیبن ئیسحاق و ئەوانی تر بگینە ئەوڕاستیەی کە: کاتێك خالید ﷺ ئاڵاکەی وەرگرت موسوڵمانەکانی کۆکردەوە و خستینیە پاڵ یەکەوە بەجۆرێك هەتا ڕزگاری کردن لەو لەشکرە زۆر زەوەندەی بێ باوەڕەکان، کاتێك خالید ﷺ سوپاکەی بەشیوازی سەربازی ئەوکات وەك تەکنیکی جەنگی ڕێکخست کە شیوەی پێنج بەشی یە بەئاڵوگۆڕی بەشەکان بۆ شوینی یەکتر گۆڕینی لای ڕاست و لای چەپ پێشەوە و دواوە ڕۆمەکان کەوتنە واق وڕمان وا بە بیریانا هات کە ئەوە هێزی پشتیوانیە بۆ موسوڵمانەکان نێردراوە و هاتووە، دوای ئەوە خالید ﷺ هەڵی کوتایە سەریان بەپشتیوانی خوای گەورە شکاندنی و دوچاری شکستی کردن خوا باشتر دەزانێت) وە هەروەها دەفەرموێت: (موسوڵمانەکان کوشتارێکی زۆر و زەوەندیان لێکردن و دوچاری سەختترین زیانیان کردن وە چەندینیان لە سەرکردە و پیاو ماقوڵ و خانەدانەکانیان کوشت وە ئەگەر بارو دۆخەکەش بەوشیوەیە لە بەرژەوەندیاندا نەبووایە ئەیان دەتوانی پاشەکشە بکەن و بێوەی لە جەنگەکە دەربچن)(١١٣٨).

---

(١١٣٥) أخرجه: البخاري (١٢٤٦، ٣٠٣٦، ٤٢٦٢).

(١١٣٦) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣٧٥/٤).

(١١٣٧) أخرجه: أحمد (٢٣٩٨٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وأخرجه: مسلم (١٧٥٣).

(١١٣٨) انظر: (البداية والنهاية) (٤٨٤/٤، ٤٨٧).

ڕاستی ڕوداوەکە بەوجۆرەبوو کە موسوڵمانەکان لە ڕۆژی یەکەمدا تاکۆتای ئەو ڕۆژە پڵنگ ئاساو بە گوڕو هێزەوە دڵێرانە دەجەنگان لە تاریکی شەودا خالید توانی دوو سوپاکە لەیەکتر جیا بکاتەوە وە لەشەوە زەنگدا گۆڕانکاری لە پایەکانی سوپاکەدا کرد و دەستەیەکی لە سوپاکە پاشەکشە پێکرد بۆ پشتەوە بۆ ئەوەی لەبەرەبەیاندا دەنگ و هەرایەکی زۆر بنینەوە و تەپ و تۆزیکی زۆر بکەن هەتا دوژمن وابزانیت کە موسوڵمانەکان پشتیوانیان بۆ هاتووە.

کە بەیانی شەبەقی دا خالید ﷺ هەستا بە ئەنجامدانی چەندین هەڵمەتی خێراو یەك لە دوای یەك و بێ وچان زۆر بە گوڕو تینەوە، کە ڕۆمەکانی دوچاری زەرەرو زیانێکی بەجگار گەورە کرد، ئەوەبوو ڕۆمەکان کەئەمەیان بینی وایان زانی کە موسوڵمانەکان هێز و پشتیواتی تریان بۆ هاتوە ئیتر ئەوان بەرە بەرە کەوتنە خۆ دواخستن و تەمبەڵی لەوەی کە هێرشەکانیان درێژە پێنەدەن بۆسەر موسوڵمانەکان تەنها کەوتنە بەرگری وەستان لەڕووی ئەو هێرش و پەلامارانەی موسوڵمانان کە دەکرایە سەریان، لەوکاتە دا خالید ﷺ کەوتە کیشانەوەی هەردوو باڵی سوپاکە لای ڕاست ولای چەپ بە پارێزگاری کردنیان بە هێزەکانی ناوەوە، کاتێك دوو باڵەکەی سوپاکە دوورکەوتنەوە لە شەڕی دوژمن و ڕزگاریان بوو بەو دوورخستنەوەیەیان، هەستا بە هێزەکانی ناوچەرگەی سوپاکە کە دەکەوتە بەشی ناوەڕاستەوە بە پارێزگاری کردنی هەردوو باڵەکەی سوپاکە بەمەش دەستەبەری بێزیانی سەپاکەی کرد لەکاتی پاشەکشەی گشتی دا وە بەوجۆرە هیچ بەربەستێکیان نەهاتە ڕێکا، ئەو کێشانەوەیە هەر خۆی لە خۆیدا بەسەرکەوتنێکی گەورە هەژمار دەکرێت بۆ موسوڵمانەکان[١١٣٩].

زەرەرو زیانی گیانی موسوڵمانەکان بە بەراورد لەگەڵ ڕۆمەکان شتێکی وەهانەبوو شایەنی باسکردن بێت ژمارەی شەهیدەکانیان گەیشتە دوانزە شەهید یاخود سیانزە شەهید[١١٤٠].

---

[١١٣٩] انظر: (المغازي) للواقدي (٢/٧٦٤)، و(السيرة النبوية الصحيحة) (٢/٤٦٦)، و(معارك خالد) (ص: ١٧٣)، و(الرسول القائد) (ص: ٢٠٦)، و(دفاع عن السيرة) (ص: ٣١) للشيخ الألباني.

[١١٤٠] انظر: (السيرة النبوية) لابن هشام (٣/٣٤٢)، و(جوامع السيرة) لابن حزم (ص: ٢٢٠).

ئەو پاشەکشە و سەرکەوتنە بەرچاوە گەورەیە بەبەرەکەتی نزاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خالید موسوڵمانەکان لەو غەزایەدا.

لە ئەبوقەتادەوە ﷺ دەفەرموێت: (....پێغەمبەری خوا ﷺ (دەستەکانی) بەرزکردەوە بۆ ئاسمان وە فەرمووی: ((اللهم هو سيف من سيوفك فانصره وفي رواية: [فانتصـر بـه])) فیرمنـذ سمي خالـد سيف الله)) ((ئـەی خوایە گیان ئـەو شمشێرێك كە لـە شمشێرەكان تـۆ سـەری بخەیت)). لـە گێڕانەوەیـەكی تـردا: [موسـوڵمانان سـەربخە بەهۆیـەوە])) لـەو ڕۆژەوە خالید ئیتر بە (سيف الله) شمشێری خوا ناسراوە))[1141].

بـەهۆی ئـازایی و ئەبـەردی موسـوڵمانەكان بـە گشـتی وە سـێ فەرمانـە شـەهید كراوەكانیانەوە بەتایبەتی كە ڕۆڵێكی كاریگەرو سەرەكیان هەبوو لە دەستەبەر كردنی ئەو سەركەوتنە كە بەفەرمانی خوا هاتەدی ئەوەبوو جەعفەر ﷺ ئاڵاكەی بەدەستی ڕاستی گرت دواتر قرتاندیان پاشان بەدەستی چەپی هەڵی گرت ئەویشیان قرتاند ئینجا لەباوەشی گرت وەخۆی بەسەردا دا ئەوەبوو دواجار لە هەموو لایەكەوە بە ڕم و شمشێر و تیر ڕوویان تێكرد و تیربارانیان كرد ئەویش دەست بەرداری نەبوو هەتا گیانی سپارد وە شەهید بوو.

هەروەك ئیبن هیشام (رحمه الله) لەوبارەیەوە دەفـەرموێت: (كەسـانێكی خـاوەن زانست كـە جێگای متمانەی ئێمە بوون بۆیان گێڕامەوە كـە جـەعفەری كوڕی ئـەبوطالب ﷺ ئاڵاكەی بەدەسـتی ڕاسـتی گـرت هـەتا قرتانـدیان، پاشـان بەدەسـتی چـەپی ئاڵاكـەی گرتـەوە هـەتا ئەویشیان قرتاند، دواتر بـە هـەردوو قـۆڵی گرتـی وەخـۆی بەسـەردا هـەتا شـەهید كرا لـەو كاتەدا لە تاق لاویتی دابوو تەمەنی سی و سێ ساڵان بوو)[1142].

عەبـدڵڵای كـوڕی عومـەر ﷺ دەفـەرموێت: (مـن لـەو غەزایـەدا بەشـداریم كـرد دوای جەنگەكە بۆ جەعفەری كوڕی ئەبوطالب ﷺ گەڕاین دواتـر دۆزیمانـەوە لـەناو كوژراوەكان

---

(1141) أخرجه: أحمد (٢٢٥٥١، ١٧٥٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٧٠٤٨) وقال محققه: اسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (ارواء) (٢٨٥/٥): صحيح على شرط مسلم وقال في (احكام الجنائز) (ص: ٤٦)، وأخرجه: أحمد واسناده حسن.

(1142) انظر: (السيرة النبوية) لابن هشام (٣٣٣/٣)، و(البداية) لابن كثير (٤٨٠/٤).

بینیمان نەوەت و نەوەندە برین بەلاشەیەوە بوو بە تیروشیر لێی درابوو [هیچیان لەو لێدانانە لە پشتەوە لێی نەدرابوو]))[1143].

ئەو غەزایە چەندەها پەند و ئامۆژگاری بۆ خالید ﷺ وە موسوڵمانەکان دەرخست کە پێشتر نەیان دەزانی تا لە غەزاکانی داهاتوویاندا سود و کەڵکی سەربازی لێوەربگرن ئەوەتا بۆ یەکەمین جار توانیان لەگەڵ ڕۆمدا بجەنگێن وە ئاگاداری لایەنە تایبەتەکانی ئەوان بن لەشەڕدا بزانن و شارەزای هێزو توانای پڕ چەکیان و شێوازی جەنگ کردنیان ببن تا دواتر موسوڵمانەکان سودیان لێوەرگرتن لەو جەنگانەی کە لە داهاتوو دژی ڕۆمەکان ئەنجامیان دەدا)[1144].

# پێغەمبەری خوا ﷺ بەوردی جەنگەکە بۆ هاوەڵانی باس دەکات

پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگ وباسی شەڕەکەی بۆ باسکردن وە هەواڵی شەهید بوونی هەرسێ سەرکردەکەی پێدان، داواشی لە هاوەڵان کرد کە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن وە بچن بۆ فریاکەوتن و پشتیوانیان هیچ کەس دوانەکەوێت، ئەوە لە چەندین گێڕانەوە دا هاتووە لەوانە:

١- لە ئەنەس ﷺ وە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهید بوونی هەریەکە لە زەید ﷺ وە جەعفەر ﷺ وە کوڕی ڕەواحە ﷺ ڕاگەیاند وە بەخەڵکەکەی فەرموو: ((أخذ الراية زيدٌ فأصيب، ثم أخذ جعفرفأصيب، ثم أخذ ابن رواحة فأصيب وعيناه تذرفان حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله [خالد بن الوليد] حتى فتحه الله عليهم))[1145] ((زەید ئاڵاکەی هەڵگرت دواتر شەهیدکرا، پاشان جەعفەر ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش شەهید کرا، دوای ئەوان کوڕی ڕەواحە ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت ئەویش پێکرا وە شەهید بوو، (لەوکاتەدا چاوەکانی فرمێسکی ماڵئاوای لەیارانی لێ دەباری) هەتا شمشێرێک لە

(١١٤٣) انظر: البخاري (٤٢٦٠، ٤٢٦١).

(١١٤٤) انظر: (الرسول القائد) لمحمود شيت خطاب (ص: ٢٠٦).

(١١٤٥) أخرجه: البخاري (٤٢٦٢).

شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی هەڵگرت [ئەویش خالید کوڕی وەلید ﷺ] ئەو بوو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو دەرووی خێری لێکردنەوە و سەری خستن بەسەریاندا)). وە فەرمووی: ((مایسرهم انهم عندنا وعيناه تذرفان))[1146] ((بەچاوی فرمێسکاویەوە: ئێستا پێیان خۆش نیە لای ئێمە بمانایەتەوە)).

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهید بوونی بەخەڵکەکە گەیاند پەرلەوەی دەنگ و باسیان بگاتەوە مەدینە[1147].

٢- لەوبارەیەوە ئەبو قوتادەش (رحمه الله) دەفەرموێت: (بەویستی خوا ماوەیەکیان پێچوو بوو کە دەرچوو بوون ولەوێ مابوونەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتە سەر مینبەر و فەرمانی کرد کە بانگ بدرێت: (الصلاة جامعة) (ئەوەش بانگێك بوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی بۆ کاری پێویست و گرنگ) (([فحمد الله واثنى عليه وقال [اما بعد] ثاب خير... الا أخبركم عن جيشكم هذا الغازي [إنَّ اخوانكم] انطلقوا حتى لقوا العدو [وإنَّ زيداً اخذ الراية فقاتل حتى أستشهد] فاستغفروا له)) فاستغفر له الناس ((ثم أخذ اللواء [بعده] جعفر بن أبي طالب فشد على القوم [فقاتل] حتى قُتِل شهيداً، اشهد له بالشهادة فاستغفروا له، ثم استغفروا له، ثم اخذ اللواء عبد الله بن رواحة فاثبت قدميهِ حتى أصيب شهيداً فاستغفروا له، ثم أخذ اللواء [سيف من سيوف الله] خالد بن الوليد ولم يكن من الامراء هو أمَّر نفسه [ففتح الله عليه])) [ئینجا حەمد و ستایشی خوای گەورەی کرد و فەرمووی: [لەپاشان] دەستی کرد بە گێڕانەوەی دەنگ و باسی شەڕەکە.... و فەرمووی: ((ئایا هەواڵی سوپاکەتان پێبڵێم کە بۆ ئەو غەزایە دەرچوون لە چ بارودۆخێکدان [براکانتان] ڕۆیشتن هەتا ڕووبەڕووی دوژمنەکانتان بوونەوە [زەید ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت و کەوتە شەڕکردن لەگەڵیان هەتا شەهید کرا] داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن)) خەڵکەکەش داوای لێخۆشبوونیان بۆ کرد (([لەدوای ئەو جەعفەری کوڕی ئەبوطالب ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت و بوێرانە هەڵمەتی بردە سەر دوژمن بەسەختی ڕووبەڕوویان بووەوە [کەوتە شەڕکردن لەگەڵیان] هەتا شەهید کرا، شاهیدی

---

[1146] اخرجه: البخاري (٢٧٩٨).

[1147] اخرجه: البخاري (٣٧٥٧).

دەدەم کە شەهیدە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن، ئەوە بوو داوای لێخۆشبوونیان بۆکرد، پاشان عەبدڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت وەهەڵوێستەیەکی کرد پاشان کەوتە شەڕکردن هەتا شەهید بوو داوای لێخۆشبوونیش بۆ ئەو بکەن، پاشان [شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا] خالیدی کوڕی وەلید ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت ئەو لە فەرماندەرە هەڵبژاردراوەکان نەبوو بەس لێهاتووی خۆی وای کرد کە بیکەنە سەرکردە [بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە سەری خستن و ڕزگاریان بوو])).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی: ((خوایە گیان ئەوە شمشێرێکە لە شمشێرەکانت سەری بخە بەسەر دوژمن کانی دا)). لەوساوە خالید ناونراوە (سیف الله)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەربچن بڕۆن بەهاواری براکانتانەوە فریایان بکەون با هیچ کەسێکتان دوانەکەوێت)) خەڵکەکەش دەرچوون لە گەرمایەکی سەخت دا بە سواری بەپیادە بۆ پشتیوانیان))[١١٤٨].

٢- هەر لەوبارەیەوە ئەبو مسیرە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهید بوونی زەید وجەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی (ڕەزای خوایان لێبێت) پێ ڕاگەیاندن وە دەنگ وباسەکانی بۆ باسکردن ئینجا فەرمووی: ((اللهم اغفر لزيد، اللهم أغفر لزيد، اللهم أغفر لزيد، اللهم أغفر لجعفر اللهم أغفر لعبدالله بن رواحة))[١١٤٩]. ((خوایە لە زەید خۆشبە، خوایە لە زەید خۆشبە، خوایە لە زەید خۆشبە، خوای لە جەعفەر خۆشبە خوایە لە عەبدڵڵای کوڕی ڕەواحە خۆشبە)).

---

(١١٤٨) أخرجه: أحمد (١٧٥٠) ومن حديث عبدالله بن جعفر، وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وأحمد (٢٢٥٥١) ومن حديث ابي قتادة وقال محققه: صحيح لغيره، وابن سعد (٤٦/٣)، وابن ابي شيبة (٣٨١٢)، والدارمي (٢٤٤٨)، والنسائي (الكبرى) (٨٢٤٩، ٨٦٠٤)، والحاكم (٩٨/١٣)وصححه ووافقه، البيهقي (دلائل النبوة) (٣٦٧/٤)، وابن حبان (٧٠٤٨)، وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني رحمه الله في (الاحكام الجنائز) (ص: ٤٦)، و(الارواء) (٢٨٥/٥)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٢٧٧): حديث صحيح.

(١١٤٩) أخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٥٣١) وقال محققه: رجاله ثقات مرسل، وابن ابي شيبة (المصنف) (١٢١٠١) وقال محققه: اسناده صحيح مرسل، وابن سعد (الطبقات) (٤٦/٣).

موسی کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (واباسیان کردوە خوای گەورەش باشتر دەزانی کە یەعلی کوڕی مەنیە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی غەزای (مؤتة)ی هێناوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ((ان شئت فاخبرني و إن شئت أخبرتك)) ((ئەگەر حەز دەکەیت هەواڵەکەم بۆ بگێڕەوە وە ئەگەر حەزیش دەکەیت من بۆت باس دەکەم)) وتی: تۆ بۆم باس بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە باسکردنی (یەعلی) وتی: سوێند بەوەی کەتۆی بەحەق ڕەوانە کردوە هیچ شتێکت وەلا نەناوە و هەمووت باس کرد و ڕووداوەکەش بەو شێوەیە ڕویداوە کە گێڕاتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((انّ الله تبارك وتعالى رفع لي الأرض حتى رأيتُ معتركهم)).)[١١٥٠]. ((خوای بەرزو بێ هاوتا زەوی بۆ بەرزکردمەوە هەتا شوێنی ڕووبەڕوو بوونەوەکەیانم بینی)).

## دڵتەنگی و ماتەمینی موسوڵمانەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهید بوونی هەرسێ فەرماندەکەی دا بە موسوڵمانەمان و چاوەکانیش فرمێشکیان پیدا دەهاتە خوارەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ و هەرچی لە مەدینە دادەنیشت لە موسوڵمانەکان هەموو دوچاری خەمباریەکی زۆر بوون پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی ڕۆیشت بۆ ماڵی جەعفەر ﷺ هەواڵەکەی دابە هاوسەرەکەی سەرەخۆشی و تەعزێباری لێ کردن هەروەك لەوبارەیەوە هاوسەری جەعفەر ﷺ ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کاتێك جەعفەر و هاوەڵانی شەهید کران پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە ماڵمان منیش چل پێستەم دەباغ کردبوو هەویرەکەم شێلابوو سەری منداڵەکانم شۆردبوو پاك وخاوێنم کردبوون ڕۆنم لە قژیان دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە من: ((ائتني ببني جعفر)) ((منداڵەکانی جەعفەرم بۆ بێنە)). دەفەرموێت:

---

(١١٥٠) اخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٤/٤٦٥) من مغازي موسى بن عقبة وهي اصح المغازي، فقد اخرج البيهقي ايضاً في (دلائل النبوة) (٣/١٠١) بسنده عن مطرف ومعن ومحمد بن الضحاك قالوا: كان مالك رحمه الله اذا سأل عن المغازي قال: عليك بمغازي الرجل الصالح موسى بن عقبة فإنه أصح المغازي، وقال الحافظ في (الفتح) (٧/٦٥٤): مغازي موسى بن عقبة من أصح المغازي. وفي رواية ضعيفة عن الطبراني (٢٠/٣٧٨): (ان ابا عامر الاشعري اخبر النبي ﷺ بأخبار مؤتة).

منیش منداڵەکانم بردە خزمەتی، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك وە لە باوەشی گرتن وە بۆنی کردن، وتم: بە دایك و باوکمەوە بە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی دەگریت شتێکت پێگەیشتوە لە بارەی جەعفەر و هاوەڵانیەوە؟ فەرمووی: ((نعم أصيبوا هذا اليوم)) ((بەڵێ ئەمڕۆ شەهید کران)) منیش هەستام هاوارم لێ هەستاو دەستم کرد بە گریان [فەرمووی: ((يا أسماء لاتقولي هجراً و لاتضربي صدراً])) ((ئەسماء قسەی نارێك و پێك بە دەمتا نەیەت وە لە سنگ و بەرۆکی خۆت نەدەیت]]).

ئەوەبوو ئافرەتان هاتنەلام وە لەدەورم کۆبوونەووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە وە فەرمووی: ((لا تغفلوا آل جعفر من ان تصنعوا لهم طعاماً فإنهم قد شغلوا بامر صاحبهم))[1151]. ((وریابن ماڵی جەعفەر پشت گوێ مەخەن لەوەی کە خواردنیان بۆ دروست بکەن چونکە ئەوان بەهۆی سەرقاڵیان بە خەمی هاوسەرەکەیان نایان پەرژێتە سەر خواردن ئامادەکردن)). لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((ان آل جعفر قد شغلوا بشأن ميتهم فاصنعوا لهم طعاماً))[1152]. ((ماڵی جەعفەر سەرقاڵی شەهید بوونی هاوسەرەکەیانن ئێوە خواردنیان بۆ دروست بکەن)).

هەر لەوبارەوە خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵی شەهید بوونی زەیدی کوڕی حاریثە وە جەعفەری کوڕی ئەبوطالب و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە (ڕەزای خوایان لێ بێت) هات پێغەمبەری خوا ﷺ [لەناو مزگەوت] دانیشتبوو [لەدەم و چاوی دا] هەست بەخەمباری دەکرا.

خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: من لە درزی دەرگاکەوە سەیرم کرد کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: [ئەی] پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و خێزانی جەعفەر

---

(1151) أخرجه: عبدالرزاق (٦٦٦٦)، واحمد (٢٧٠٨٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن هشام (السيرة ٣٣٥/٣)، والطبراني (الكبير)(٢٤/(٣٨٠، ٣٨١))، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٧٠/٤)، وابونعيم (دلائل النبوة) رقم (٤٥٩).

(1152) أخرجه: الترمذي (٩٩٨)، وابوداود (٣١٣٢)، وابن ماجة (١٦١١)، وعبدالرزاق (٦٦٦٥)، واحمد (١٧٥١) وقال محققه: اسناده حسن، والحاكم (٣٧٢/١) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني (صحيح أبي داود) (٢٦٨٦) و(صحيح ابن ماجة) (١٣٠٧) و(صحيح الجامع) (١٥١٨).

[توشی بەڵاو کارەساتی کردین] باسی شێوەی گریانەکەی بۆ گێڕایەوە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکردکە قەدەغەیان بکات لەو کارە (لە گێڕانەوەیەکی تردا): ((فارجع الیهنَّ فاسکتهُنّ)) [پێی فەرموو: بڕۆ بێدەنگیان بکە]) دەفەرموێت: پیاوەکە ڕۆیشت و پاشان هاتەوە خزمەتی و فەرمووی: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵڵاهی] من قەدەغەم کردن و ڕێگریم کردن ئینجا باسی ئەوانی کرد کە بەقسەیان نەکردوە پێغەمبەر ﷺ دیسان فەرمانی پێکرد [کە بۆ دووەم جار بگەڕێتەوە و ئەوکارەیان لێ قەدەغەبکات] پیاوەکە ڕۆیشت پاشان هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاریان ناکەم ئەوان زاڵ بوون بەسەر مندا... (لە گێڕانەوەیەکی تردا) [پێی فەرموو: ((فاذهب فاسکتهن فان ابین فاحث في افواههن)): بڕۆ بێدەنگیان بکە ئەگەر ملیان نەدا و بەردەوام بوون ئەو کات خۆڵ لە دەمیانکە. [(لەگێڕانەمیەکی تردا: ((في وجوههن))] التراب)) ((خۆڵ بە دەم و چاویاندا بکە))].

خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: [لە دڵی خۆمدا وتم] خوای گەورە لوتت لە خۆڵ وەردەدات وەڵڵاهی تۆ ئەو کارەت پێ ناکرێت و پێغەمبەری خواش ﷺ بەو نارەحەتیەوە دەهێڵیتەوە و دەست بەرداری نابیت، دەمزانی کە ئەو ناتوانێت خۆڵ بکاتە دەمیانەوە)[1153].

ئیمامی شەعبی (رحمه الله) دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵی شەهید بوونی جەعفەری کوڕی ئەبوطالب ﷺ گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ڕێگەی بەهاوسەرەکەی ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها) دا کە بگری هەندێ لە خەم و خەفەت نارەحەتی خۆی دەربڕێت نەمێنێت، ئەسماء لە پاش نەمانی فرمێسکەکانی ئەوە بوو پێغەمبەری خواﷺ هاتە ماڵیان و سەرەخۆشی لێکردن و دڵی دانەوە و بانگی منداڵەکانی جەعفەری کرد

---

[1153] اخرجه: البخاري (٤٢٦٣)، ومسلم (٣٠، ٩٣٥)، وابي داود (٣١٢٢)، وابن ابي شيبة (٣٨١٢٢، ١٢٢٤٦) وقال محققه: حديث حسن، واحمد (٢٧٦/٦)، والطبراني (١٤٧١)، والحاكم (٢٠٩/٣، ٢١٥) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٣١٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن هشام (السيرة) (٣٣٦/٣)، واللفظ للبخاري والزيادات لابن ابي شيبة وابن هشام والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٧٢/٤).

و دوعای خێری بۆکردن بە تایبەتی دوعای بۆ عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر کرد پارایەوە لە خوا کە بەرەکەت بخاتە ئەوەی کەدەستی دەداتێ لە کەسابەت وە هەرشتێک دەیفرۆشێ قازانجی لێبکات)[١١٥٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها) کە تەنها سێ ڕۆژ بۆی هەیە کە جلی تەعزیە بپۆشێ پاش ئەوە هەرجلێك دەپۆشیت بە ئارەزووی خۆی بێت باوانەی کە ڕێگە پێدراوە بۆ ئافرەتێك کە لە (عدە) دابێت لەوانەی کە نەڕازێنرابێتەوە وە بۆن خۆش نەکرابێت وە پۆشاکی تەعزیە نەبێت[١١٥٥]. لەو بارەیەوە ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کاتێك جەعفەر شەهید کرا پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردین وە فەرمووی: ((تسلبي[١١٥٦] ثلاثا ثم اصنعي ماشئت))[١١٥٧]. ((سێ ڕۆژ پۆشاکی تەعزیە بپۆشە پاشان بەویستی خۆتە چی دەپۆشی)).

لە گێڕانەوەی ئیمامی ئەحمەد (رحمه الله) سێ ڕۆژ جلی تەعزیە بپۆشە پاشان بەویستی خۆت بکە لەوەدا کەچی دەپۆشیت))، ئیبنو ئەثیر (رحمه الله) دەفەرموێت: (پۆشاکەکە ناوی (السلاب) بووە وتراوە پۆشاکی ڕەش بووە ئافرەتی تەعزێ بار سەری پێ داپۆشیوە).

پاش ڕۆیشتنی ماوەی سێ ڕۆژەکە پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردن و سەرەخۆشی لێکردن و دوعای بۆ کردن، وەفەرمانی کرد کە سەری منداڵەکانی جەعفەر ﷺ بتاشن هەرسێکیان، لەوبارەیەوە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەفەرموێت: (...پاش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ لەماڵی جەعفەر گەڕا تا تەعزیە بەسەر چوو، ئینجا تەشریفی

---

(١١٥٤) اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٣٦) وقال محققه: مرسل اسناده حسن ومراسيل الشعبي صحيحة.

(١١٥٥) انظر: (تفسير الطبري) (٥/٩٠) تحقيق: احمد شاكر.

(١١٥٦) وفي رواية أحمد (٦/٤٣٨): ((البسي ثوب الحداد ثلاثاً ثم اصنعي ما شئت))، وقال ابن الأثير (النهاية) (٣٨٧/٢) (والسلاب: قيل هوثوب اسود تغطي به المُحدُّ رأسها).

(١١٥٧) اخرجه: أحمد (٢٧٤٦٨)، والطبري (التفسير (٥٠٨٨، ٥٠٨٩)، والطبراني (الكبير) (٢٤/ ١٣٦٩)، وابن سعد (الطبقات) (٣٨٢/٨)، والبيهقي (الكبرى) (٤٣٨/٧) و(معرفة الأثار) (٤٦٧٦)، وابن حبان (٣١٤٨) وقال محققه قوي، وقال الحافظ (الفتح) (٤٨٧/٩): حديث قوي الإسناد، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٣٢٢٦): اسناده صحيح.

هێنایە ماڵەوەیان وە فەرمووی: ((لەدوای ئەمڕۆ وە براکەم مەگرێنن وە شین و گریانی بۆ مەکەن منداڵەکانی براکەمم بۆ بهێنن)).

عەبدوڵڵا دەفەرموێت: ئێمەیان بردە خزمەتی ((کە عەبدوڵڵا وە موحەممەد و عەون بوون)) وابزانم سەرمان ڕشك و ئەسپێی تێ داوە، فەرمووی: ((ادعوا الیَّ الحلاق)) ((بانگی سەرتاشم بۆ بکەنە ئێرە)) سەرتاشیان هێنا سەری تاشین پاشان فەرمووی: ((أما محمدٌ فشبیه عمنا ابي طالب و أما عبدالله (في روایة) [وأما عونٌ][1158] فشبیهٌ خلقي وخُلقي)) ((موحەممەدیان لە ئەبوطالبی مامان دەچێت وە عەبدوڵڵاش (لەگێڕانەوەیەکی تردا: [وەعەونیش] شێوە و ئاکاری لە خۆم دەچێت)) پاشان دەستەکانی گرتم و بەرزی کردمەوە و فەرمووی: ((اللهم اخلف جعفراً في اهله و بارك لعبدالله في صفقه یمینه)) ((خوای جێگەی جەعفەر بگرێتەوە لەناو خانەوادەکەی وە بەرەکەت بخیتە کاروکاسپی عەبدوڵڵا وە ئەوەی لە دەستی دادەبێت)) ئەمەی سێ جار فەرموو.

(لە گێڕانەوەیەکی ترا): [پاشان سێ جار دەستی بەسەرمدا هێناو هەرجارێك دەستی بەسەرمدا دەهێنا دەیفەرموو: ((اللهم اخلف جعفراً في ولدِهِ))][1159] ((خوای جێگای جەعفەر بە کوڕەکەی پڕبکەیتەوە و شوێنی ئەوی بۆ بگرێتەوە))].

(عەبدڵڵا) دەفەرموێت: دایکمان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و باسی هەتیوەکانی بۆ کرد (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد کە باوکیان شەهید بووە و هیچ خزم و کەسوکاریان نیە سەرپەرشتیان بکات) ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دڵ خۆشی کرد و فەرمووی: ((تۆ لە هەژاری لێیان دەترسی من سەرپەرشتیاریان دەبم لە دونیاو دوارۆژدا))[1160].

---

[1158] اخرجه: ابن ابي شیبة (٣٨١٢٩)، وقال الحافظ في (الإصابة) (٤٤/٣) (رقم: ٦١٠٧): اسناده صحیح.

[1159] اخرجه: النسائي (عمل الیوم واللیلة) (١٠٦٦)، واحمد (١٧٦٠) وقال محققه: اسناده حسن، والحاکم (٣٧٢/١).

[1160] اخرجه: احمد (١٧٥٠) وقال محققه: اسناده صحیح علی شرط مسلم، وابي داود (٤١٩٢)، والطبراني (الکبیر) (١٤٦١) قال محققه: صحیح علی شرط مسلم، والنسائي (الکبری) (٨٦٠٤)، والحاکم (٢٩٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه علی شرطهما النووي (ریاض الصالحین) (١٦٤٠)، وقال

پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکانی جەعفەری بینی لەڕو لاوازبوون فەرمانی بە داکیان کرد دوعایان بەسەردا بخوێنیت تا لە چاوی پیس بیان پارێزێت، لەوبارەوە جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە ئەسمای کچی عومەیس (رضي الله عنها): ((مالي أرى أجسام بني أخي ضارعة (يعني: نحيفة) أتصيبهم الحاجة؟)) ((ئەوە بۆچی لەشولاری منداڵەکانی براکەم بە لاوازی دەبینم پێوستیان بە چیە ئایا دوچاری شتێك بوون؟)) وتی: نەخێر بەلام [چاو پیس زۆر کاری تێکردن ئایا دوعایان بەسەردا بخوێنم؟ فەرمووی: ((بەچی؟)) ئەویش بۆی باسکرد وە فەرمووی: ((أرقيهم))][1161] ((ئەو دوعایەیان بەسەردا بخوێنە))].

لە گێڕانەیەکی تردا: لە ئەسمائی کچی عومەیس (رضي الله عنها): کە ئەو فەرموویەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە منداڵەکانی جەعفەر ﷺ چاو پیس لێی داون ئایا دوعایان بەسەردا بخوێنم؟ فەرمووی: ((نعم لو كان شيء سابق القدر لسبقته العين))[1162]. ((بەڵێ ئەگەر شتێك پێش قەدەری خوا بکەوتایە ئەوە چاوپیسی دەبوو)).

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام منداڵەکانی جەعفەری بەسەر دەکردەوە لە خوا بۆیان دەپاڕایەوە، لەو بارەیەوە عامیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆلای هاوسەرەکەی جەعفەری کوڕی ئەبوطالب (رضي الله عنها) کە منالەکانی جەعفەری ﷺ بۆ بهێنێت، ئەوە بوو هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفەرمووی: ((اللهم انَّ جعفراً قد

---

الحافظ في (الفتح) (٦٥١/٧) وفي (الأصابة) (٦١٠٧): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني (فقه السيرة) (ص: ٤٠١)، و(صحيح ابي داود) (٣٥٣٢)، و(احكام الجنائز) (٦٦)، وصححه ايضاً كلٌ من الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦٥٠) والعدوي (الصحيح المسند من فضائل الصحابة) (٤٥٣).

(1161) اخرجه: (١٤٥٧٣)، ومسلم (٢١٩٨).

(1162) اخرجه: أحمد (٢٧٤٧٠) وقال محققه: حديث حسن، والترمذي (٢٠٥٩، ٢١٥١)، وابن ماجة (٣٥١٠) واللفظ له، والطبراني (الكبير) (١٣٧٩/٢٤)، والحميدي (٣٣٠)، والنسائي (الكبرى) (٧٥٣٧)، وصححه الشيخ الألباني رحمه الله في (صحيح الترمذي) (١٦٨٢)، و(صحيح ابن ماجة)(٢٨٢٩)، و(الصحيحة)(١٢٥٢).

قدم إليك احسن الثواب، فاخلفه في ذريته بخير ما خلفت عبداً من عبادك الصالحين)))[١١٦٣].
((خوایە گیان جەعفەر گەڕایەوە خزمەتت باشترین پاداشتی بدەرەوە، منداڵەکانی بە خێر و چاکە جێگەی باوکیان بۆ پڕ بکەرەوە هەروەك چۆن جێگە بۆ بەندەیەك لەبەندە چاکەکانت پڕ دەکەیتەوە)).

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ چاو پێکەوت لە دوای شەهید بوونی باوکی چاوەکانی فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوە، لەوبارەوە ئیبن مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك زەیدی کوڕی حاریثە ﷺ شەهید کرا ئوسامە بەکەمی دەچووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەستی دەنواند، لە دوای ئەوەی چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەبەردەمیدا وەستا و پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك فرمیسکەکانی وەستا وە گریانی نەما پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((لِمَ أبطأت عنّا ثم جئت تُحزِنُنا؟)) ((لەبەرچی سەرمان لێ نادەیت پاشان دێیت و خەمبارم دەکەیت؟)) ئوسامە بۆ ڕۆژی دواتر هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ڕووی چوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اني للاقٍ منك اليوم مالقيتُ منك أمسِ)))[١١٦٤]. ((دوێنی چیم بەسەر هات لە بینینت ئەمڕۆش هەر وام لێ بەسەر دێت)).

لە گێرانەوە یەکی تردا: قەیسی کوڕی حازەم ﷺ دەفەرموێت: (ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ کاتێك کە باوکی شەهید کرا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، کە بەو جۆرە بینی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پڕبوون لە فرمێسك پاشان سبەی هاتەوە خزمەتی و لە هەمان شوێن لە خزمەتیدا دانیشتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((ألاقي منك اليوم مالقيتُ منك بالأمس))[١١٦٥]. ((ئەوی دوێنی بەسەرم هات لە بینیتدا ئەمڕۆش هەروام بەسەر دێت)).

---

[١١٦٣] اخرجه: أحمد (فضائل الصحابة) (١٦٩٠) وقال محققه: اسناده مرسل رجاله ثقات.

[١١٦٤] اخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٦٦٩٨)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٨٣٢): حديث صحيح.

[١١٦٥] اخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٣٢٩٧٠) وقال محققه: اسناده على شرط مسلم، وأحمد (الفضائل) (١٥٣٠) وقال محققه: مرسل اسناده صحيح.

# گەڕانەوەی سوپاکە

کاتێك خوای گەورە دەرووی لە موسوڵمانەکان کردەوە ڕزگاری کردن و ترسی خستە دڵی ڕۆمەکانەوە وە پاشان موسوڵمانەکان پاشەکشەیان کردو گەڕانەوە ڕۆمەکانیش ورەوزاتی ئەوەیان نەکرد بۆ جاری دووەم هێرش بکەنەوە سەریان و بکەونە ڕاوەدونانن و شوین کەوتنیان و سوپای موسوڵمانەکانش دەستیان کرد بە گەڕانەوە بەرەو مەدینە لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا دەگێڕنەوە کە پەلاماری قەڵاکەیان داوە و لادێیەکان هەڵیان کوتاوەتە سەریان چونکە لە کاتی ڕۆیشتنیاندا بەرەو مؤتة نیشتەجی بووانی ئەو جێگەیە کەسێکیان لە موسوڵمانەکان کوشت و موسوڵمانەکانیش لە گەڕانەوە دا کەمارۆیان دان و هەتا خوای گەورە فەتحی کرد بۆیان هەرچی شەرکەری تێدابووە کوشتبوویان[١١٦٦].

وە هەر لە ڕێگای گەڕانەدا ئەو هێزە پشتیوانەکانیان پێ گەیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردبونی دوای گەیشتنی هەواڵی شەهید بوونی سێ فەرماندەرەکە بە موسوڵمانەکان، موسوڵمانەکان لەکاتی چونە ناوشاری مەدینە بەرێز و شکۆمەندیەوە پێشوازیان لێکردن وە ئەو پێشوازیە گەرم گوڕە و ڕێز لینانە بۆ زۆربەی سوپاکە بوو کە شەڕیان لەگەڵ دوژمن کردبوو وە بەهیچ جۆرێك پشتیان لێ هەڵنەکردبوون بەڵام ئەو پێشوازیە گەرمە بۆ ئەوانە نەبوو کە تاقمێکی بچوك بوون لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە دا و زۆری ژمارەی ڕۆمەکانیان کردبوو پاساو بۆ ڕاکردن وپشتیان هەڵکردبوو لە دوژمن.

ئەو کۆمەڵە خەڵکی مەدینە بەشێوەیەکی تر پێشوازیان کردن و خاك و خۆڵیان پێدا دەکردن و پیان دەوتن: ئەی ڕاکردوەکان ڕاتان کردوە لە تێکۆشان لەپێناوی خوا، هەروەك عورەوە ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ([کاتێك سوپای مؤتة گەڕایەوە] کاتێك نزیك بوونەوە لە دەروازەی مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانەکان پێیان گەیشتن وە منداڵەکانی مەدینەش بە توند و تیژی پێیان هەڵپڕان و پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکەکە بەرەو ڕوویان هات لەسەر وڵاخێکەوە فەرمووی: ((منداڵەکان بگرن و لەگەڵ خۆتان سواریان بکەن کوڕەکەی جەعفەریش بدەن بەمن)) عەبدڵڵایان پێدا لەگەڵ خۆی سواری کرد، خەڵکەکە

---

(١١٦٦) اخرجه: ابن عائد في (المغازي) بسند مقطع كما قال الحافظ (الفتح) (٧/٦٥٤).

خۆڵیان بەسەر سوپاکەدا دەکرد و دەیان وت: ئەی ڕاکردوەکان ڕاتان کردوە لە ڕووبەڕوو بوونەوە لە پێناوی خوا. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ليسوا بالفرار ولكنهم الكرّار ان شاء الله تعالى))[1167]. ((ئەوانە ڕاکردوو نین بەڵکو ئەوانە هەڵمەت بەرن إن شاء الله تعالى)).

هەر لەسەر ئەم گێرانەوەیە ئیبنو کثیر (رحمه الله) دەفەرموێت: (ئیبن ئیسحاق لە ئەم چوارچێوەیەدا بە هەڵەدا چووە و گومانی وابووە کە ئەم جۆرە پێشوازیە بۆ زۆرینەی سوپاکەبووە، بەڵام لەڕاستی دا ئەوە تەنها ئەوانەیان بووە کە لە ڕووبەڕوو بوونەوەکەدا ڕایان کردوە پێیان وتون (ڕاکردوەکان). بەڵام زۆرینەی سوپاکە ڕایان نەکردوە بەڵکو جەنگان وە سەرکەوتو بوون. هەروەك لەوبارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دا وە فەرمووی: ((ثم أخذ الراية سيف من سيوف الله ففتح الله عليه)) ((پاشان ئاڵاکە شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا هەڵی گرت خوای گەورە لەسەر دەستی ئەوە ڕزگاری کردن)) لە دوای ئەوە وە چۆن موسوڵمانەکان ناوزەندیان دەکەن بەڕاکردو بەڵکو بەڕێز و گەورەییەوە پێشوازیان لێکردن بەڵام خۆڵ بەسەردا کردنیان وە ناونانیان بە ڕاکردو تەنها بۆ ئەوانەیان بوو کە ڕایان کردبوو لەوێدا وە بەجێیان هێشتبوون)[1168].

کەاتە ئەوانەی لە مەیدانی جەنگدا پشتیان هەڵکردبوو وە گەڕابوونەوە مەدینە موسوڵمانەکان سەرزەنشتیان دەکردن وە پیان دەفەرموون: ڕاکردوەکان لەم بارەیەوە سێ گێرانەوەی بێهێز هاتوە، هەروەك لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (کە ئەو بە هاوسەری سەلەمەی کوڕی هیشامی کوڕی عاصی کوڕی موغیرەی فەرمووە: ئەوە بۆچی سەلەمە ﷺ نابینم ئامادەی نوێژی جەماعەت بێت لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لەگەڵ موسوڵمانەکان؟ ئەویش وتی: وەڵلاهی ناتوانێت لەماڵ بێتە دەرەوە هەرکە دێتە

---

[1167] أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٣٧/٣)، والطبري (التاريخ) (٤٢/٣)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٧٤/٤)، وقال ابن كثير (البداية) (٤٨٤/٤) مرسل وفيه غرابة، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٤٦٩/٢) سنده حسن الى عروة ولكنه مرسل، واورده البرزنجي (ضعيف تاريخ الطبري) (٣٠٠).

[1168] انظر: (البداية والنهاية) لابن كثير (٤٨٤/٤).

دەرەوە خەڵکی بە هاوارکردن بەڕووی دا دەڵێن: ئەی ڕاکردووەکان ڕاتان کردوە لە جیهاد و لە پێناوی خوا هەتا وای لێهات لەماڵەوە دانیشتوە وە ناتوانێت بێتە دەرەوە)[١١٦٩].

لە گێڕانەوەیەکی تری بێهێزدا لە ئیبن عومەرەوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (من لەسریەیەکدا بووم لە سریەکانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردبوونی هەندێك لە خەڵکەکە پشتیان هەڵکردوو ڕایان کرد منیش لەوانەدا بووم کە ڕایان کرد، وتمان: ئەوە چیمان کرد بە خۆمان کە رامان کردوە لە ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوە تورەی خوامان خستە سەر خۆمان [چۆن چاومان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت لە کاتێك دا رامان کردووە ئەوە بوو ئەو ئایەتەی خوا دابەزی: ﴿.... وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ (الأنفال: ١٦).

[پاشان فەرمووومان: با بگەڕێینەوە شاری مەدینە لە شەودا تا بەیانی پاشان وتمان: با بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا ڕێگە چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە ئەگەر بۆمان هەبێت تۆبە بکەین ئەگەر نا دەڕۆین و ماڵوێران دەبین [ئینجا لەگەڵ کۆمەڵێك شەو چوینەوە مەدینە خۆمان شاردەوە بە نهێنی] پاشان چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لە نوێژی بەیانی، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوەفەرمووی: (کەسانێك لە خەڵکەکە) عەرزیان کرد: ئێمە ڕامان کردوە لە مەیدانی جەنگ و ڕووبە ڕووبوونەوە، فەرمووی: ((لا بل انتم العكارون أنا فئتكم وأنا فئة المسلمين)) فأتينا حتى قبلنا يده)[١١٧٠].

---

(١١٦٩) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٨٨/٣)، والطبري (التاريخ) (٤٢/٣)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٧٥/٤)، والحاكم (٤٢/٣) وصححه على شرط مسلم، ووافقه الذهبي وقال محقق (المستدرك) رقم: (٤٤١٢): صحيحة الاسناد، واورده البرزنجي في (ضعيف تاريخ الطبري) (٣٠١).

(١١٧٠) اخرجه: احمد (٧٠١٢) وقال محققه: اسناده ضعيف، والبخاري (الأدب المفرد) (٩٢)، والحميدي (٦٨٧)، وابي داود (٢٦٤٧)، والترمذي (١٧١٦)، وابن ماجة (٣٧٠٤)، وقال الحافظ العراقي (الأحياء (٢٠٢/٢) رواه ابوداود بسند حسن، وضعّفه الشيخ الألباني رحمه الله تعالى في (ضعيف ابي داود) (٥٦٧)، و(ضعيف الترمذي) (٦٤/١)، و(ضعيف الأدب المفرد) (١٥٢)، و(دفاع عن السيرة) (٣٦)، وفي (الارواء) (١٢٠٣). والحديث ضعيف اوردناه للعلم فقط.

((نەخێر بەڵکو ئێوە هەڵمەت بەرن من لە کۆمەڵی ئێوەم من لە کۆمەڵی موسوڵمانانم)) ئێمەش چووینە خزمەتی و هەتا دەستمان ماچ کرد).

## پلەو پایەی سێ فەرماندەرەکە

پێغەمبەری خوا ﷺ لەخەویدا جەعفەری ﷺ بینی بوو دووباڵی هەبوو پێی دەفڕی لەگەڵ فریشتەکاندا لەناو بەهەشتدا بۆ هەرشوێنێك خۆی بیویستایە، لەبەر ئەوەی جەعفەر ﷺ هەردوو دەستی لە پێناوی خوا بڕانەوە خوای گەورە لە جیاتی ئەو دوو دەستە دوو باڵی پێ بەخشی لەبەهەشتدا تا پێی بفڕێت هەروەك لەم فەرموودە پیرۆزانەی خوارەوەدا هاتوە:

١. لە ئەبوهرەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مرَّ بي جعفر في ملأ من الملائكة وهو مُخضبُ الجناحين بالدم ابيض الفؤاد))[١١٧١]. ((جەعفەر بەلامدا تێپەڕی لەگەڵ کۆمەڵی فریشتەدابوو پێشی باڵەکانی خوێنی پێوە بوو دڵیشی پاك وسپی بوو)).

٢- هەر لە ئەبوهریرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((رأيتُ جعفر بن ابي طالب ملكاً يطير في الجنة مع الملائكة بجناحين)). وفي رواية ((...يطير منها حيث شاء مضرّجةٌ قوادمه (اي: مدمية مقدمة جناحية) بالدماء))[١١٧٢]. ((جەعفەری کوڕی ئەبوطالبم بینی وەك باڵندەیەك لەگەڵ فریشتەکان بە دووباڵ دەفڕی لەناو بەهەشتدا)). لە گێڕانەوەیەکی تردا: (...پێشەوەی باڵەکانی سور کرابوو بەخوێن لەناو بەهەشتدا دەفڕێ بەویستی خۆی بۆ هەرشوێنێك حەزی پێ بکردایە).

---

[١١٧١] اخرجه: الحاكم (٣/ ٢١٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه ابن حجر (الفتح ٧/ ٧٦)، والشيخ الألباني (الصحيحة) (٣/ ٢٢٨).

[١١٧٢] اخرجه: الترمذي (٣٧٦٣)، والحاكم (٣/ ٢٠٩) وصححه، والطبراني (الكبير) ((١٤٧٤))، وابن حبان (٧٠٤٧) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١٢٢٦) و(صحيح الجامع) (٣٣٦٣) و(صحيح الترمذي) (٢٩٦٣).

٣- هەروەها لە ئیبن عەباسەوە ﷺ دەگێڕیتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((دخلت الجنة البارحة فنظرتُ فيها فاذا جعفر يطير مع الملائكة واذا حمزة متكيءٌ على سرير))[١١٧٣]. ((دوێنێ چوومە بەهەشت سەیرێکی ناوبەهەشتم کرد جەعفەرم بینی لەگەڵ فریشتەکان دەفڕی حەمزەشم بینی لەسەر تەختێك پاڵی دابووەوە)).

هەر لەبەر ئەوەش بوو ناونرا جەعفەری باڵدار (جعفر الطيار) ﷺ، لەوبارەوە عامیر ﷺ دەفەرموێت: (ئیبن عومەر ﷺ کە سڵاوی لە کوڕی جەعفەر دەکرد دەیفەرموو: سلام عليك ئەی کوڕی خاوەن دووباڵەکە)[١١٧٤].

جەعفەر ﷺ خۆی و دوو کوڕەکەی (عەبدوڵلا و عەون) لە شێوە و ئاکاریان لە پێغەمبەری خواﷺ دەچوون، هەروەك لەوبارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەکوڕی جەعفەری فەرموو: ((...اما عبدالله- في رواية- أما عون فشبيهٌ خَلقي وخُلقي))[١١٧٥]. ((...بەڵام عەبدوڵلا یان (لە گێڕانەوەیەکدا): بەڵام عەونیان چوتەوە سەر خۆم لە شێوە و ئاکارو ڕەوشت دا)).

هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ خۆشی ئەمەی بە جەعفەر ﷺ وە زەید ﷺ فەرمووەکە ستایش کردن و دەفەرموێت: ((اشبهت خَلقي و خُلقي)): (...بە جەعفەری فەرموو: ((تۆ شێوە و ئاکارت لە خۆم دەچێت)) وە بە زەیدیشی فەرموو: ((انت اخوناومولانا)))[١١٧٦]. ((تۆ برامانی و خۆشەویست و پەنا دراومانی)).

---

(١١٧٣) اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٦٦، ٢٩٤٤)، والحاكم (٣/٢٠٩، ١٩٦) وصححه، وقال الحافظ (الفتح) (٧/٧٦): اسناده جيّد، وصححه الضياء المقدسي في (المختارة) (١٦٤٣٢)، وصححه كل من الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٣٦٣)، والشيخ الأرناؤوط في تحقيق لـ(شرح السنة) (٣٩٣٨).
(١١٧٤) اخرجه: البخاري (٣٧٠٩)، والطبراني (١٤٧٤).
(١١٧٥) اخرجه: أحمد (١٧٥٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابي داود (٤١٩٢)، والنسائي (الكبرى) (٨٦٠٤)، وابن ابي شيبة (المصنف) (٣٨١٢٩)، والحاكم (٣/٢٩٨) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الحافظ (الفتح) (٧/٦٥١) و(الإصابة) (٦١٠٧): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٣٥٣٢)، و(فقه السيرة) (٤٠١)، و(احكام الجنائز) (٦٦).
(١١٧٦) اخرجه: البخاري (٤٢٥١).

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((...أما أنت يا جعفر فأشبه خُلُقك خُلُقي، و أشبه خَلقي خلقَك، وانت مني وشجرتي... وأمّا انت يا زيد فمولاي ومنّي والِيّ، وأحبُ القوم اليّ)) [1177]. واتە: ((...تۆ ئەی جەعفەر ڕەوشت و ئاکارت لە ڕەوشت و ئاکاری خۆم دەچێت، شێوەشت لە شیوەی خۆم دەچێت، تۆ لە منی وەلە ڕەچەڵەکی منی... وە تۆش ئەی زەید ئازاد کراو پەنادەری خۆمی و لەمنی، وە خۆشەویست ترین کەسی بەلای منەوە)).

وە هەرسێ فەرماندەرەکەش زەید ﷺ و جەعفەر ﷺ و عەبدوڵڵا ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی داوای لێ خۆشبوونی بۆ کردن لە خزمەت خوای گەورە دا وەشایەتی بۆدان کە شەهیدن و فەرمانیش کرد بە خەڵکەکە کە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن)) [1178].

ئەو پلەوپایە گەورە و شکۆمەندارە تەنها شایستەی ئەوانە، هەر ئەوەشیان بەسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا بینیونی لەگەڵ یەك دانیشتون لەناو بەهەشدا، هەروەك لەوبارەیەوە ئەبوئومامە ﷺ دەفەرموێت: گوێ بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: ((بينا أنا نائم إذ آتاني رجلان.... ثم أشرفا بي شرفاً فإذا بنفر ثلاثةٍ يشربون من خمر لهم فقلت: ((من هؤلاء؟)) قالا: هؤلاء جعفر بن ابي طالب، وزيد بن حارثة، و عبدالله بن رواحة....)) [1179]. ((لە کاتێکدا من نوستبووم دوو کەس هاتنە لام... پاشان بەرزیان کردمەوە بۆ شوێنێکی بەرزو بڵند چاوم کەوت بەسێ کەس لەلای یەك کۆبوونەوە لە خواردنەوەی بەهەشتیان

---

[1177] أخرجه: أحمد (٢١٧٧) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن سعد (٣٦/٤)، والبخاري (التاريخ الكبير) (١٩/١)، والنسائي (الكبرى) (٨٥٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (٣٧٨)، والحاكم (٢١٧/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والخطيب (تاريخ بغداد) (٦٢/٩)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٧٥/٩) (رقم: ١٥٥١٠): رواه أحمد واسناده حسن، وقال الشيخ الألباني رحمه الله تعالى في (السلسلة الصحيحة) (١٥٥٠): حديث صحيح.

[1178] أخرجه: أحمد (١٧٥٠) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، و(برقم: ٢٢٥٥١) وقال محققه: صحيح لغيره.

[1179] اخرجه: الطبراني (الكبير) (٧٦٦٦، ٧٦٦٧) واللفظ له، والنسائي (الكبرى) (٣٢٨٦)، وابن خزيمة (١٩٨٦)، وابن حبان (٧٤٩١) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (٤٣٠/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني رحمه الله تعالى (الصحيحة) (٣٩٥١)، و(صحيح الترغيب) (٩٩٥).

دەخواردەوە وتم: ((ئەوانە کێن؟)) وتیان: ئەوانە جەعفەری کوڕی ئەبوطالب، زەیدی کوڕی حایثە، عەبدڵڵای کوڕی رەواحەن...)).

## سریەی (ذات السلاسل)

ئەم سریەیە بەناوی ئاوێکەوە ناونراوە کە دەکەوێتە ناوچەی خێڵی (قوضاعە) ناوی (سلاسل)ە بەپێی ڕاسترین بۆچون لە مانگی (جماد الاخرە) لە ساڵی هەشتەمی کۆچی ئەم سریەیە نێردراون. هۆکاری ناردنەکەی ئەوەبوو کە خێڵی (قوضاعە) هاوپەیمان و دۆستی ڕۆمەکان بوون وە بەژداریەکی کارایان کرد هاوشانی ئەوان لە دژی موسوڵمانەکان لە غەزای مۆتە دا بە پاشەکشەی موسوڵمانەکان لە خۆیان بای بوون و کەوتنە خۆکۆکردنەوە دەیانویست خۆیان نزیك بکەنەوە لە سنورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بۆئەوەی بکەونە بەر بەرەکانی و ڕووبەڕوو بوونەوەی، وە کۆببنەوە لەگەڵ خێڵەکانی عەرەبی دەوروبەر و بەرامبەر موسوڵمانەکان. بەڕێکردنی سریەکە مانگێك دوای جەنگی مۆتە بوو. لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست سریەیەکیان بۆ بنێرێت و کەسێکی لێ هاتوو کارا لە بواری سەربازی وە شارەزا لە جەنگ کردن بۆ ئەو مەبەستە دەست نیشان بکات لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیەکی باشی خزمایەتی لەگەڵ یەکێك لەو شەش خێڵە گەورانەی ناوچەکەدا هەبێت ئەویش خێڵی (بەلی) بوو لەوبارەیەوە ئیبن ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (...(عەمری کوڕی عاصی ﵁) بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژارد) لەبەر ئەوەی نەنکی عەمر دایکی باوکی عاصی کوڕی وائیل لە خێڵی (بەلی) بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ سەریان بۆ ئەو مەبەستەش داوای لێکرد پارمەتی وەربگرێت لەهەریەك لەو هۆزانەی ئەو ناوچەیەدان)[١١٨٠].

عورەوەی کوڕی زوبەیر ﵀ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاصی ﵁ نارد) لەگەڵ تاقمێکی هۆزی (بەلی) کە لەخاڵوانی عاصی کوڕی وائیلی باوکی بوون وە ئەوانیش کە لە خێڵی (قوضاعە) هاوپەیمان و دۆستیان بوون لەگەڵیدا ناردنی و ئەوی کردە فەرماندەریان)[١١٨١].

---

(١١٨٠) اخرجه: ابن هشام (السیرة) (٢٣٦/٤).

(١١٨١) اخرجه: البیهقي (دلائل النبوة) (٣٩٨/٤).

بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاصی ﷺ هەڵبژارد و کردیە ئەمیری ئەوسریەیە، لەبەر لێزانی زیرەکی ودانایی و شارەزا بوون لە بواری سەربازی و جەنگ کردن هەروەها بەهۆی ئەو پەیوەندیە خزمایەتیەی کە هەیبوو لەگەڵ ئەو خێڵە عەرەبە دوورە دەستانەدا، عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێنم دا و فەرمووی: ((یاعمرو اشدد علیك سلاحك وثیابك [وأتني])) ((عەمر برۆ خۆت توند و تۆڵ بکە و چەك وتفاقت ببەستەوە [ومرەوە لامان])) دەفەرموێت: منیش چی فەرموو بوو وام کرد و گەڕامەوە خزمەتی دەبینم: [دانیشتوە] دەست نوێژ دەشوات سەری بەرز کردەوە، بەوردی سەیری کردم وتیم ڕاما [پاشان سەری دانەواند] فەرمووی: ((یاعمرو أني أُرید ان ابعثك وجهاً [علی جیشٍ] فیسّلمك الله ویغنمك وأرغب لك من المال رغبةً صالحةً)) ((عەمر من دەمەوێت بەفەرماندەری سوپایەکەوە بتنێرم تا خوای گەورە سەلامەتت بکات و دەسکەوتی باشت بەدەست بخات من ناوەتە خوازی ماڵێکی چاکم بۆت و هیوادارم دەستت بکەوێت)) دەفەرموێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [من لەبەر ماڵ و سەروەت دەست خستن موسوڵمان نەبووم بەڵکو لەبەر حەزو خۆشەویستیم بۆ ئیسلام موسوڵمان بووم. (لە گێڕانەوەیەکی تردا): [لەبەر خۆشەویستی حەزم بۆ جیهاد] و لەبەر ئەوە کە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بم فەرمووی: ((یاعمرو نعم المال الصالح للمرء الصالح]))(1182). ((عەمر باشترین ماڵ و سەروەتی چاك بۆ مرۆڤی چاك و باشە])). پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردەوە بۆ هاوەڵانی هۆکاری دەست نیشان کردنەکەی وەك ئەمیری ئەو سریەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە تازە موسوڵمان ببوو.

---

(١١٨٢) اخرجه: أحمد (١٧٧٦٣، ١٧٨٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وفي (فضائل الصحابة) (١٧٤٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن ابي شيبة (١٧/٧)، والبخاري (الأدب المفرد) (٢٩٩)، والحاكم (٢: ٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٣٢١١) وقال محققه: اسناده قوي على شرط مسلم، والبيهقي (شعب الأيمان) (١٢٤٨)، وابي يعلى (٧٣٣٦) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (الأوسط (٩٠١٢)، وقال الحافظ العراقي (الأحياء) (٢٢٨/٣)/ اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٢٢٩)، و(غاية المرام) (٤٥٤)، و(مشكلة الفقر) (١)، وصححه ايضاً الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحن) (١٠٠٩).

لە گێڕانەوەکەی ئیبن سیرینەوە ﷺ (کە یەکێکە لە تابیعیەکان) دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاصی ﷺ نارد و کردیە فەرماندەری سوپایەك فەرمووی: ((اني لأبعث الرجل و ادع من هو أحبُّ اليَّ منه ولكنه لعله ان يكون ايقظ عيناً أو اشدَّ مكيدةً))[١١٨٣]. ((من ئەو پیاوە دەنێرم بە فەرماندە ئەوە ناگەیەنێت کە هیچ کەس لەو خۆشەویست تر نیە بەلامەوە لە ئەو بەڵکو لەبەر ئەوەی وریاترین و بەئاگاترین و چاوساغ وڕێبەر و بە ئەزموونترین وشارەزاترین پلان دانەر و بەتەگنیکە)).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵانی کە خۆیان ساز و ئامادە بکەن بۆ دەرچوون لەگەڵیدا لەوبارەیەوە حارثی کوڕی یەزیدی بەکری ﷺ دەفەرموێت: (گەیشتمە شاری مەدینە چوومە ناو مزگەوتەوە بینیم زۆرێك لەخەڵکی کۆبوونەوە چەندین ئاڵای ڕەش دەشەکانەوە [پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وەستا بوو لەسەر دوانگە] لەولاشەوە بیلال بەشمشێرێك بەوریایەوە لە خزمەتیا وەستابوو وتم: ئەو خەڵکە بۆچی کۆبونەتەوە؟ فەرموویان: [ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ] دەیەوێت عەمری کوڕی عاص ﷺ وەك فەرماندەری سوپایەك بنێرێت...)[١١٨٤]. لە گێڕانەوەیەکی تردا: (پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی عەمر کوڕی عاصی کرد و ئاڵایەکی سپی بۆ هەڵکرد ودایە دەستی و کردی بەفەرماندەری سێ سەد کەس و ناردی بۆ سەر دوژمن)[١١٨٥].

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەمری کوڕی عاص ﷺ ڕۆیشت هەتا گەیشتە سەر ئاوێك بەناوی (سلاسل) لەسەر خاکی (بەنی جوذام) هەر بەناوی ئەوەشەوە ناونرا سریەی (ذات السلاسل) کاتێك کە لەسەر ئاوەکە بوو ترسی ئەوەی هەبوو کە نەتوانێت بەو ژمارەیەوە لەڕوویاندا بوەستێت بۆیە ناردی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆمەکیان بۆ

---

(١١٨٣) أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٢٠٦٥٨)، وسعيد بن منصور (السنن) (٢٦٠٩).

(١١٨٤) أخرجه: أحمد (١٥٩٥٣) وقال محققه: اسناده حسن، والترمذي (٣٢٧٣- ٣٢٧٤)، وابن ماجة (٢٨١٦)، والنسائي (الكبرى) (٨٦٠٧)، والطبراني (الكبير) (٣٣٢٥، ٣٣٢٨)، وابن ابي شيبة (٥١٢/١١)، وابن سعد (٣٥/٦) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦١١-٢٦١٢)، وصحيح ابن ماجة (٢٢٧٢)، و(الصحيحة) (٢١٠٠)، و(الضعيفة) تحت الحديث (رقم: ١٢٢٨).

(١١٨٥) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٩٤/٢)، وعن الواقدي (٧٧/٢)، وأورده الحافظ (الفتح) (٩٣/٨).

بنێرێت، ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی ﷺ بۆنارد [بە دووسەد کەسەوە][١١٨٦].

لە کۆچکەرە پێشینەکان کە ئەبوبەکر ﷺ و عومەریشیان ﷺ لەناودابوو لەو کاتەی کە کردیە فەرمانده بە ئەبوعبیدە ﷺ فەرموو: ((کە گەیشتیتە ئەوەێ لەگەڵ عەمر ناکۆك مەبن)) ئەبوعوبەیدە ڕۆیشت تاگەیشتە لای عەمر [لەوێدا ئەبوعوبەیدە ﷺ وستی پێش نوێژیان بۆ بکات عەمر ڕێگەی نەدا] وتی: [من ئەمیرم ناردومەتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆمەکیم بۆ بنێرێت ئێوەی بۆ ناردوم] (بە ئەبوعوبەیدەی فەرموو): تۆ بە کۆمەکی نێردراوی بۆلای من، ئەبو عوبەیدە ﷺ فەرمووی: نەخێر بەڵکو من فەرمانده‌ری ئەوانەی خۆم دەبم تۆش فەرماندەری ئەوانی ژێر دەستی خۆت بە [کوچکردوەکان فەرموویان (بەعەمر): تۆ ئەمیری ئەوانەی ژێر دەستی خۆت بەو ئەبو عوبەیدە ﷺ ئەمیری کۆچ کردوەکان بێت].

ئەبو عەبەیدە ﷺ کەسێکی نەرم نیان و لەسەر خۆو دنیا نەویست بوو، عەمر پێی وت: بەڵکو تۆ وەك کۆمەکی بۆمن نێردراوی [ئەبو عوبەریدە ﷺ کاتێك ئەمەی بیست خۆی کەسێکی ڕەوشت بەرز وناکار جوان و لەسەرخۆ بوو بە گورجی بەدەم فەرموودە و پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە چوو بیری کەوتەوە و فەرمووی: ((اذا قدمت علی صاحبك فتطاوعـا] (و) لاتختلفـا)) ((ئەگەرگەیشتیتە براکەت گوێ بۆیەکتری بگرن] و لەگەڵیاندا ناکۆك مەبە))، ئەگەر تۆ سەرپێچیم بکەیت دڵنیابە من گوێڕایەڵیت دەکەم، عەمر پێی وت: من ئەمیرم بەسەر تۆوە و تۆ کۆمەکی بۆ من نێردراوی، ئەبو عوبەیدە ﷺ فەرمووی: با بۆ تۆبێت فەرموو نوێژ بۆ خەڵکەکە بکە[١١٨٧].

لەگێڕانەوەی عامیری کوڕی شاجیل ئشجەعی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ساز کرد و ناردی بۆ (ذات السلاسل)، ئەبو عوبەیدەی ﷺ کردە فەرماندەری کۆچکردوەکان، وە عەمری کوڕی عاصی ﷺ کردە فەرماندەی ئەعرابیەکان پێی فەرموون:

---

(١١٨٦) اخرجه: الواقدي (٧٧/٢).

(١١٨٧) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣٦/٤) عن ابن اسحاق، والبيهقي (دلائل النبوة) (٣٩٨/٤) عن موسى بن عقبة واللفظ لابن اسحاق والزيادات لموسى عن عقبة.

((کە گوێ بۆ یەکتر بگرن)) فەرمانیان پێکرابوو کە هێرش بەرنە سەر بنی بەکر، عەمر لەبری ئەوە هەڵی کوتایە سەر خێڵی قوضاعە چونکە خێڵی بەکر خاڵوانی بوون، موغیرە کوڕی شوعەیب ﷺ ڕۆیشت بۆ خزمەت ئەبو عوبەیدە ﷺ وە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی کردوە بە ئەمیری ئێمە و کوڕی فلانیشی کردۆتە ئەمیری ئەوخەڵکە بەڵام ئەو کارەکەی تێك داوە و پێچەوانەی ئەوەی فەرمانی پێکراوە کاری کرد لە بەر خوا نابێت گۆڕایەڵی بکرێت، ئەبو عوبەریدە ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوین کە گوێ بۆ یەکتر بگرین وە لەفەرمانی یەکتردا بین من گۆڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم ئەگەر عەمریش سەرپێچی بکات)[1188].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: (ئەبو عوبەیدە ﷺ چووە ژێر فەرمانی عەمرەوە ئەویش بووە ئەمیری هەردوو سریە نێردراوەکە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ لەبەر ئەو کارە زۆر لە ئەبو عوبەیدە ﷺ توڕەبوو بە توندی لەو بارەیەوە قسەی کرد لەگەڵ ئەبو عوبەیدە ﷺ وە فەرمووی: چویتە ژێر فەرمانی کوڕەکەی نابیغەت کردت بە ئەمیر بەسەر خۆت و ئەبوبکر و ئێمەش بەڕاستی ئەوە ڕاو بۆچوون نی یە و کارێکی باشت نەکرد؟ ئەبو عوبەیدە ﷺ بە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرموو: براکەم پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردین کە سەرپێچی یەکتر نەکەین لەوە ترسام ئەگەر بە گوێی نەکەم سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم)[1189].

بەوجۆرە خوای گەورە یەکریزی موسوڵمانەکانی پاراست بە هۆی ئەبو عوبەیدەوە ﷺ لەژێر فەرماندەیەك کۆی کردنەوە ئەویش عەمری کوڕی عاص ﷺ بوو کەشارەزای باشی لە بواری جەنگ دا هەبوو، عەمر ﷺ هێرش وپەلاماری بردە سەر خێڵی قوضاعە تاکو دڵنیاو پشت ڕاست بێت لە خێڵی بەکر کە خاڵوانی بوون.

---

(1188) أخرجه: أحمد (١٦٩٨) وقال: مرسل رجاله ثقات رجال الصحيح، وقال الحافظ في (الإصابة) (٢/٢٥٣) (٤٤٠٠) رواه موسى بن عقبة بسند صحيح الى الشعبي، وضعفه الشيخ الألباني رحمه الله في (فقه السيرة) (٤٠٢)، وقال العمري (السيرة الصحيحة) (٢/٤٧١): اسناده صحيح الى الشعبي، وهذا الاثر رواه موسى بن عقبة في مغازيه وهي من أصح المغازي ورواه عن الشعبي ومراسيله صحيحة عند أهل العلم.

(1189) أخرجه: عبد الرزاق (المصنف) (٩٧٧٠) عن الامام الزهري.

عەمری کوڕی عاص ﷺ بەهۆی ڕێبەری و چاوساغیەوە دەستی کرد بە ڕۆیشتن کە ڕیبەر و چاوساغیان لەو غەزایەدا: ڕافعی کوڕی عەمر ﷺ بوو[١١٩٠]، لەوبارەوە یەزیدی کوڕی ڕمان ﷺ دەفەرموێت: (کە ئەبو عوبەیدە ﷺ گەڕایەوە وهاتە پاڵ عەمری کوڕی عاص ﷺ ژمارەیان بوو بە پێنج سەد کەس بەشەو بە ڕۆژ دەڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناوچەی خێڵی (بەلی) دەستی گرتبەسەریاندا و هەرکە دەگەیشتە ناوچەیەك پێیان دەوت ئالێرەدا پێشتر تاقمێك بۆتان کۆبببوونەوە بەڵام کە هەواڵی هاتنی ئێوەیان بیست بڵاوەیان لێ کرد تا گەیشتە ئەوپەڕی ناوچەی هۆزی (بەلی) و (عودە) و (بەلقین)[١١٩١].

ئەو ناوچەیە زۆر سارد بوو هاوەڵان داوایان کرد لە عەمری کوڕی عاص ﷺ کە ئاگر بکەنەوە بۆ خۆ گەرم کردنەوە بەڵام عەمری کوڕی عاص ﷺ ڕێگەی نەدان ئەو کارە بکەن وە هەروەها ڕێگەشی نەدان شوێنی دوژمن بکەون قوناغ لە دوای قوناغ، لەو بارەوە قەیسی کوڕی حازم ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ (عەمری کوڕی عاص ﷺ نارد بەسریەکەوە بۆ (ذات السلاسل) وە هاوەڵانی لە وێدا داوایان لێکرد کە ئاگر بکەنەوە بەڵام ئەو ڕێگەی نەدان دواتر چونە خزمەت ئەبو بکری صدیق ﷺ بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات ئەبو بەکر ﷺ کەوتە قسە کردن لە گەڵی وە فەرمووی: هیچ کەسێك لەوانە نابێت ئاگر بکاتە وە ئەگەر ئاگر بکاتەوە فڕێی دەدەمە ناو ئاگرەکەوە. دەفەرموێت: دواتر ڕووبەڕووی دوژمن بوینەوە و تێکمان شکاندە ویستمان شوێنیان بکەوین بە مەبەستی ڕاوەدونانیان بەڵام ڕێگەی پێنەداین...)[١١٩٢].

لە گێرانەوەیەکی تردا لە عەبدڵڵای کوڕی بورەیدەوە ﷺ دەفەرموێت: (...کاتێك گەیشتینە شوێنی شەڕەکە عەمر ﷺ فەرمانی پێکردین کە بەهیچ جۆرێك ئاگر نەکەینەوە عومەر ﷺ توڕەبوو ویستی [بچێت بە گژیدا] ئەبوبەکر ﷺ نەیهێشت وپێی وت ک

---

(١١٩٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥/٢١)، وقال الهيثمي (المجمع) (٥/٢٠٢): رواره الطبراني ورجاله ثقات.

(١١٩١) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/٧٧)، والواقدي حديثه متروك لايحتج به.

(١١٩٢) أخرجه: ابن حبان (٤٥٤٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ کردویەتیە ئەمیر بەسەر تۆوە لەبەر ئەوە بوو کە شارەزای لە شەڕو جەنگ کردندا هەیە عومەر ﷺ بەو قسەیە هێور بووەوە[١١٩٣].

عەمری کوڕی عاص ﷺ سووربوو لەسەر کارەکەی لەبەر ئەوەی ئەگەر ئاگریان بکردایەتەوە ئەوان بیان بینیایە ژمارەیان بۆ دوژمن دەردەکەوت ژمارەشیان کەم بوو ئەو کات دوژمن بە ژمارەیەکی زۆرترەوە هێرشیان دەکردە سەریان.

لە گێڕانەوەیەکی یەزیدی کوڕی ڕومان ﷺ دەفەرموێت: (....(موسوڵمانەکان) لە کۆتا قۆناغی ئەم سریەیەدا ڕووبەڕووی تاقمێك بوونەوە کە ژمارەیان زۆر نەبوو کاتژمێریك بوو بەشەڕیان وکەوتنە تیر باران کردنی یەکتری لەو ڕۆژەدا عامری کوڕی ڕەبیعە ﷺ تیریك بەر قۆڵی کەوت موسوڵمانەکان هەواڵیان کوتایە سەر و ڕایان کرد و دواتر عەمر دەستی گرت بەسەرباردوۆخەکەدا...)[١١٩٤].

هاوڕێی ئەبوبکری صدیق ﷺ (ڕافعی کوڕی عەمری طائی) لەو سریەیەدا بووە ڕێبەر و چاو ساغی موسوڵمانەکان لەوبارەوە ڕافیعی کوڕی ئەبو ڕافیع ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاص ﷺ بە سوپایەکەوە نارد بۆ (ذات السلاسل) لەگەڵ ئەو سوپایەشدا ئەبوبەکر ﷺ و عومەر ﷺ وکەڵە پیاوانی هاوەڵانی لەگەڵ دا نارد ئەوان ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کێوی (طي) عەمر ﷺ فەرمووی: کەسێکم پێ بڵێن کە ببێتە چاوساغی ڕێگامەن وتیان: کەسی وا ناناسین مەگەر ڕافعی کوڕی عەمر...)[١١٩٥].

ڕافیع ﷺ بووە ڕێبەر و چاوساغی موسوڵمانەکان بۆ ڕێگای و پاشان هاتنە ناو ئیسلام موسوڵمان بوون هەر وەك خۆی لەوبارەیەوە دەفەرموێت: (کاتێك موسوڵمان بووم لەگەڵ ئەو سریەیەدا دەرچووم...وتم: وەڵڵاهی دەبێت برادەرێکی [خواناس] بۆ خۆم لەو سەفەرەدا دەست نیشان بکەم [ورد بوومەوە لێیان هیچ کەسێکم نەبینی ڕێك و پێکتر بێت لە

---

(١١٩٣) أخرجه: الحاكم (٤٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (دلائل النبوة) (٤٠/٤) وقال الحافظ (الفتح) (٩٨/٤): اسناده صحيح.

(١١٩٤) أخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٧/٢) وهوضعيف.

(١١٩٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٤٦٧)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٠٢٠/٥): رجاله ثقات.

ئەبوبەکری صدیق ﷺ][١١٩٦]. ئەبوبکرم ﷺ کردە هاوەڵی خۆم لە خزمەتیا بووم لەو گەشتەدا لەسەر وشترەکەی ئەو بووم عەبایەکی هەبوو ئەگەر لە جێگایەک دابەزینایە ڕای دەخست ئەگەر بڕۆیشتینایە لەبەری دەکردەوە) [لەسەرجێگاکەی خۆی دەینواندم و جل و بەرگی خۆی لەبەر دەکردم][١١٩٧] )[١١٩٨].

موسوڵمانەکان لەو دەرچوونەیاندا دووچاری برسێتیەکی سەخت بوون عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ بەلای خەڵکانێکدا ڕۆیشت دەیانویست چەندین وشتر سەر بڕن کە هی خۆیان بوو ئەو ڕێکەوت لەگەڵیان کە بۆیان کەوڵ بکات و چاکی بکات دابەشیی بکات لە نێوانیاندا لەبەرامبەردا ئەوانیش بەشێکی پێ بدەن.

لەوبارەیەوە عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ دەفەرموێت: (من لەو غەزایەدا بەژداریم کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاص ﷺ تێدا کردە فەرماندەر وناردی بۆ (ذات السلاسل)، من هاودەمی ئەبوبکر ﷺ و عومەر ﷺ بووم [دوچاری برسێتیەکی سەخت بووین ڕۆیشتم پێخۆرێك دەست بخەم بۆ خۆمان] بەلای کەسانێکدا تێپەڕیم کەلەسەر چەند وشترێك وەستابوون کە سەریان بڕی بوو نەیان دەتوانی کەوڵی بکەن و پاچەپارچەی بکەن و دابەشی بکەن بەسەر خۆیاندا).

(لە گێڕانەوەیەکی تردا): [بە خەڵکانێك گەیشتم دەیان ویست کە چەندین وشتر سەری بڕن پێم وتن: ئەگەر حەز دەکەن لێی گەڕێن من سەری دەبڕم و بۆتان کەوڵ دەکەم وکێشی دەکەم] چونکە من قەسابێکی کارامە و لێهاتوو بووم پێم وتن: [بۆتان چاك دەکەم بەمەرجێك (دەیەکی) گۆشتەکەی بدەن بە من] و دابەشی دەکەم لە نێوانتان؟ وتیان: زۆر باشە منیش کردم بەدوو بەشەو و پارچەپارچەم کردن هەرلە شوێنی خۆم [چاکم کردن پاشان[ئەو بەشەی خۆمم لێیان] وەرگرت کە پێیان دابووم] ئینجا هەڵمگرت و بردمەوە لای هاوەڵەکانم و کولاندمان [ئەوە بوو هەندێکم برد بۆ خزمەت عومەری کوڕی خەطاب ﷺ

---

[١١٩٦] أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٤٦٨)، وقال الهيثمي (المجمع) (٩/٤٢): رجاله ثقات.

[١١٩٧] أخرجه: ابن ابي عاصم (الآحاد والمثاني) (٢٤٩٦).

[١١٩٨] أخرجه: أحمد (٤٢) مختصراً وقال محققه: اسناده جيّد، وابن هشام (السيرة) (٤/٢٣٦)، والطبري (التاريخ) (٣/٣٢).

[فەرمووی گرێ یەکە بێ ماندبوون دەستت کەوتووە من لێی ناخۆم] ڕازی نەبوو لێی بخوات و پاشان بردمە خزمەت ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ [دەنگ و باسەکەم بۆ باس کرد] بەهەمان شیوەی عومەر کوڕی خەطاب ﷺ قسەی لەگەڵ کردم وە ڕازی نەبوو بیخوات] [کاتێك ئەوەم بینی منیش دەستم لێ هەڵ گرت])(١١٩٩).

لەگێڕانەوەی ئیبن ئیسحاق دا ﷺ هاتوە: (گۆشتەکەمان کوڵاند وە خواردمان، ئەبوبەکر ﷺ و عومەر ﷺ فەرموویان: ئەو گۆشتەت لە کوێ بوو عەون؟ ومنیش دەنگ و باسەکەم بۆ گێڕانەوە، فەرموویان: وەڵڵاهی کارێکی باشت نەکرد ئەوەت دەرخوار داین لەوێدا هەردووکیان هەستان خۆیان ڕشاندەوە هەرچی چوو بووە سکیان لەوە هێنایانەوە)(١٢٠٠).

عەمری کوڕی عاص ﷺ ئەمیریان بوو پێش نوێژی بۆ دەکردن لە کاتی نوێژەکاندا، لە شەوێکی ساردا عەمر ﷺ لەش گران بوو مەترسی ئەوەی هەبوو کە خۆی بشوات لەسەرماندا ڕەق ببێتەوە لەبەر ئەوە تەیمومی کرد یاخود دەست نوێژی شورد و پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی کرد ئەمەش لە دوو گێڕانەوە دا هاتووە:

١- لە عەمری کوڕی عاصەوە، عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (دوچاری لەش گرانی بووم لە شەوێکی ساردو سەختدا لە غەزای (ذات السلاسل)، مەترسی ئەوەم هەبوو ئەگەر خۆم بشۆم بمرم لەسەرما، ئەوە بوو تەیمومم کرد پاشان پێش نوێژیم کرد بۆ هاوەڵانم لە نوێژی بەیانیدا...)(١٢٠١).

٢- وە لەوبارەوە قەیسی کوڕی حازم ﷺ یاخود ئەبو قەیسی خزمەتکاری خانەوادەکەی عاص ﷺ دەفەرموێت: (عەمری کوڕی عاص ﷺ بوو بە فەرماندە سریەی [ذات السلاسل] لەوێدا دوچاری سەرمایەکی سەخت بوون کە هاوشێوەی نەبینراوە بوو،

---

(١١٩٩) أخرجه: أحمد (٢٣٩٧٨) وقال محققه: اسناده جيد، والطبراني (الكبير) (١٣٠/١٨)، والبخاري (التاريخ الكبير) (٢٨٣/٣)، والبيهقي (الكبرى) (٤٠٥/٤) وفي (دلائل النبوة) (٤٠٤/٤، ٤٠٥) و(٣٠٨/٦).

(١٢٠٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣٨/٤) (رقم: ١١٧٩) وقال محققه: اسناده منقطع.

(١٢٠١) أخرجه: أحمد (١٧٨١٢) وقال محققه: حديث صحيح، وابي داود (٣٣٤)، والدارقطني (٦٧٠) وقال محققه: اسناده صحيح، والحاكم (١٧٧/١) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٣٢٣).

هاتە دەرەوە بۆ نوێژی بەیانی فەرمووی: وەڵڵاهی ئەم شەو دوچاری لەش گرانی بووم [بەڵام وەڵڵاهی سەرمای وەهام نەبینیوە کە دوچاری بوین بەوشێوە][١٤٠٢]. ئینجا سەر ئاوی کرد و دەست نوێژێکی وەك دەست نوێژ نوێژی شۆرد، پاشان پێش نوێژی بۆ کردن)[١٤٠٣].

ئیبن قەیم (رحمه الله) دەفەرموێت: (واپێدەچێت ئەم گێڕانەوە یە بە هێزتر بێت لە گێڕانەوەکەی تر کە دەڵێت تەیمومی کردووە)[١٤٠٤].

موسوڵمانەکان لە خاکی دوژمن جێگیربوون و لە هەموو لایەکەوە کەوتنە هێرش و پەلامار بۆ سەریان و بەتەواوی ناوچەکەیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە بە جۆرێك خێڵە عەرەبەکانی ناوچەکە توانان بەرگری و جەنگ کردنیان لە گەڵیاندا نەماو بەڵکو پەنایان بردە بەر ڕاکردن و پشت هەڵکردن لە هەرلایەکەوە گوی بیستی هاتنی سوپای موسوڵمانەکان دەبوون کە بە ئاراستەیان دەهاتن، لە دوای ئەمەوە سوپای موسوڵمانەکان گەڕانەوە و بەم سەرکەوتنانەیان ئەو ورەی و جەربەوییەی کە ئەو خێڵە عەرەبانە هەیان بوو بە هۆی پاشەکشەی موسوڵمانەکان لە مۆتە دا سەرەو نگومیان کردو کپیان کردەوە.

ئەم غەزایە ئاسایشی گێڕایەوە بۆ سنورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی وە سام و هەیبەتی دەستی کێشایەوە بەسەر ناوچەکەدا هەموو هەوڵەکان هەڵمەت و پەلامارەکانی خێڵە عەرەبەکانی دوچاری نوشستی کرد بۆ سەر شاری مەدینە و عەرەبە دۆست و هاوپەیمانەکانی ڕۆمە بێزەنطینیەکانیان خستە ناو ترس و دڵە ڕاوکی و وە تێیان گەیاندن کە دەستی موسوڵمانەکان دەگاتە بینا قاقایان وە لە ناوچەرگەی ماڵەکانیان پێیان دەگەن و هاوپەیمانیەکانیان لەگەڵ ڕۆمەکان سودیان پێ ناگەیەنێت.

وە لە ڕێگای گەڕانەوەدا ئەبوبکر ﷺ ئامۆژگاری هاودەمی ئەو سەفەرەی خۆی کرد کە ڕافیعی کوڕی عەمری طائی بوو لە دوای ئەوەی ماڵئاوای لێکرد لەوشوینەدا، لەوبارەیەوە

---

[١٤٠٢] اخرجه: الدارقطني (السنن) (٦٧١) وقال محققه: اسناده حسن.

[١٤٠٣] اخرجه: ابوداود (٣٣٥)، والحاكم (١٧٧/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٢٢٦/١) وفي (دلائل النبوة) (٤٠٣/٤)، ابن حبان (١٣١٥) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٣٢٤).

[١٤٠٤] انظر: (زاد المعاد) (٣٨٨/٣).

ڕافیعی کوڕی طائی دەفەرموێت: (...کاتێك غەزاکە تەواو بوو گەیشتینە ئەو شوێنەی کە بۆی هاتبووین، ئەبوبەکرم ﷺ وەك هاوڕێتی ئەو سەفەرەم بۆ خۆم دەست نیشان کردبوو هەموو خێرو چاکەیەکم لێی چاوەڕێ دەکرد و چوومە خزمەتی و عەرزم کرد: ئەی هاوڕێ ئەلەم سەفەرەم من تۆم هەڵبژارد و چاوەڕێ چاکەم لێکردیت لە ناو گشت هاوەڵاندا شتێکم پێبڵێ ئەگەر من لەبەرم کرد و کارم پێکرد وەك ئێوەم لێ بێت؟ فەرمووی: پێنج پەنجەکەی خۆت پێ لەبەر دەکرێت وتم: بەڵێ، فەرمووی: شایەتی بدە کە جگە لە خوای گەورە هیچ پەرستراوێك نیە وە موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، پێنج نوێژەکەت بەجوانی ئەنجام بدە و زەکاتی ماڵەکەت بدە ئەگەر [ماڵت] هەبوو، حەجی ماڵی خوابکە و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبە.

[لە گێڕانەوەیەکی تردا: لەکاتی لەشگرانی دا خۆت بشۆ] [کۆچ بکە لە پێناوی خوا لەناو موشریکەکاندا] ئایا ئەم پێنجەت لەبەر کرد؟ فەرمووی: بەڵێ، فەمووی: شتێکی ترماوە ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز نەبیتە ئەمیری دوو کەس [لە موسوڵمانەکان]، وتم: ئایا ئەمیر دەبێت ببیت بۆ خەڵکی تر کە بەژدار بووانی بەدرتان لە ناودا بێت؟ فەرمووی: لەوانەیە و نزیکە ئەم ئاینە بڵاو بێتەوە و وە هەموو شوێنێك بکرێتەوە و کاربەدەستی یەخەی تۆش بکرێت وە خوار تۆش بگرێتەوە، خوای گەورە و باڵا دەست کاتێك پێغەمبەرەکەی ڕەوانەکرد بەو پەیامە خەڵکانێك هاتنە ناو ئیسلام و موسوڵمان بوون، ئەوان هاتنە ناو ئاینەکەوە خوا ڕێنمونی کردن، وە هەندێکیشیان لە ترسی شمشێر هاتنە ناو ئاینەکەوە ئەوە لە پەنای خوادان و دراوسێی خوان و لە ژێر سایە و سێبەری خودان کەسێك کاتێك دەبێتە کار بەدەست، خەڵکی ستەم لەیەکتر دەکەن وە ئەویش مافیان بۆ لەیەکتر وەرناگرێت خوداش تۆڵەی لێ دەکاتەوە، کەسێك مەڕێکی دراوسێکەی دەدزێت بەڵام ئەو بەردەوام دەم و چاو گرژ دەکات لە داخی ئەو زیانەی کە گەیشتوە بە دراوسێکەی، خوای گەورە بۆ ئەو کەسانە [تورە تر دەبێت] لێی زیاتر لەو کەسە بۆ دراوسێکەی، دەفەرموێت: لەو ساتەوەختەدا لێك جیابووینەوە و ماڵئاوایمان لەیەکتر کرد]...)[١٢٠٥].

---

(١٢٠٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٤٦٧) واللفظ له، وابن ابي عاصم (الاحاد والمثاني) (٢٤٩٦) مختصراً جداً وقال محققه: اسناده جيد، وقال الهيثمي (المجمع) (٥/٢٠٢): رجاله ثقات، وأحمد (٤٢)

عەمری کوڕی عاص ﷺ عوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ ناردەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دەنگ وباسی سریەکەی پێ ڕابگەیەنێت بەر لەگەڕانەوەیان.

لەوبارەیەوە عوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ دەفەرموێت: (...کاتێك سوپاکە گەڕایەوە لەو غەزایە ئەوە بوو [منیان ڕاسپارد کە کە هەواڵەکە بگەیەنمەوە] [منیش ناردمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەگەڕانەوەی سریەکە] من یەکەم کەس بووم کە گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەیشتم پێ لە ماڵەوە بوو نوێژی دەکرد وتم: (السلام عليك ورحمة الله وبركاته) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((عوفی کوڕی مالیك؟)) وتم: بەدایك وباوکمەوە فیدات بم بەڵێ، فەرمووی: ((انت صاحب الجزور؟)) ((تۆ خاوەنی وشترە سەربڕاوەکانی؟)) [وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ]لەوە زیاتر هیچ شتێکی تری پێ نەفەرمووم)[١٢٠٦].

کاتێك هاوەڵان گەڕانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکردن لە بارەی ئەمیرەکەیانەوە عەمری کوڕی عاص ﷺ بە خێر وچاکە باسیان کرد و پێیان ڕاگەیاند کە پێش نوێژی بۆ کردوون بە لەش گرانیەوە ڕێگەی نەداون لە سەرمای سەختدا ئەوان ئاگر بکەنەوە.

لە ئەبوقەیسی کۆیلەی ئازاد کراوی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (...کاتێك عەمری کوڕی عاص گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد لە هاوەڵانی وە فەرمووی: ((عەمر و هاوەڵان چۆن بوون؟)) ئەوانیش بە چاکە باسیان کرد و فەرموویان: پێش نوێژی بەلەش گرانیەوە بۆ کردین، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێن عەمردا و پرسیاری لێ کرد لەوبارەیەوە ئەویش بۆی گێڕایەوە و تێی گەیاند و بەوەش کە دوچاری ببوو لە سەرما [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يا عمرو صليتُ باصحابك وانت جُنُبٌ؟)). ((ئەی عەمر پێش نوێژی بۆ هاوەڵان کردووە بە لەش گرانیەوە؟)). وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من دوچاری لەش گرانی بووم لە شەوێکی ساردو سەرما و سەختدا ترسام ئەگەر خۆم بشۆم لەبەین بچم، ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە

---

[١٢٠٦] أخرجه: أحمد (٢٣٩٧٨) وقال محققه: اسناده جيد، والطبراني (الكبير) (١٨/١٣١)، والبخاري (التاريخ الكبير) (٣/٢٨٣)، والبيهقي (الكبرى) (٤/٤٠٥) وفي (دلائل النبوة) (٤/٤٠٤، ٤٠٥) و(٦/٣٠٨)، وابن هشام (السيرة) (٤/٢٣٦) رقم (١١٧٨).

کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ...وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ (النساء: ٢٩). پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و هیچ شتێکی نەفەرموو][١٢٠٧].

عەمر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوون کردەوە کە بۆیە ڕێی لە سوپاکە گرتوە کە ئاگر بکەنەوە بەو سەرمایە هەتا دوژمن پێیان نەزانن و لەکەمی ژمارەیان ئاگادار نەبێت وە هەروەها ئەی هێشتوە شوێنی دوژمن بکەون بۆ ئەوەی کە دوژمن ئەوهەلە نەقۆزنەوە و لە پشتەوە هەڵکوتنە سەریان.

لەوبارەیەوە عەمری کوڕی عاص ﷺ خۆی دەفەرموێت: (کاتێك سوپای سریەکەی من گەڕایەوە ئەوەیان گێڕایەوە (واتە: مەسەلەی هەڵکرتنی ئاگرەکە) سکاڵایان لێکردم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ من کە پێم خۆش نەبوو ڕێگری ئاگر کردنەوەیانم کرد چونکە دوژمن کەمی ژمارەیانی بۆ ئاشکرادەبوو کە لەبەرژەوەندیان نەبوو، وە حەزیشم نە کردووە کە شوێنیان بکەین ئەوان کۆمەڵێك پشتیوانیان هەبوو بۆیان دەسوڕانەوە و لە پشتەوە هەڵیان دەکوتایە سەریان، پێغەمبەری خوا ﷺ ستایشی کارەکەی کرد). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویسترین کەس بەلای تۆوە کێ یە؟ فەمووی: ((لەبەرچی ئەو پرسیارە دەکەیت؟)) وتم: پێم خۆشە بزانم کێت خۆشدەوێت. فەرمووی: ((عائیشە)) وتم: لە پیاوان؟ فەرمووی: ((ئەبوبەکر ﷺ))[١٢٠٨].

لە گێڕانەوەیەکی تردا عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ منی کردە فەرماندەی سریەیەك و ناردمی بۆ (ذات السلاسل) لە ناو سوپاکەدا ئەبوبەکر ﷺ و عومەریش ﷺ تێدابوو شتێك بەدڵ و دەروونم داهات کە ئەو بۆیە منی کردوە بە ئەمیری ئەبوبکر ﷺ و عومەر ﷺ منی بەسەر ئەوانەوە داناوە لەبەر ئەوەیە کە پلە و پایەیەکم لای ئەو هەیە، چوومە خزمەتی لەبەردەمی دانیشتم و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەوسترین کەس لەناوخەڵك دا بەلای تۆوە کێ یە؟ فەرمووی: ((عائیشە)) وتم: من لەو

---

(١٢٠٧) اخرجه: أحمد (٢٣٩٧٨) وقال محققه: اسناده جيد، والطبراني (الكبير) (١١٣١/١٨)، والبخاري (التاريخ الكبير) (٢٨٣/٣)، والبيهقي (الكبرى) (٤٠٥/٤) وفي (دلائل النبوة) (٤٠٤/٤، ٤٠٥) و(٣٠٨/٦)، وابن هشام (السيرة) (٢٣٦/٤) رقم (١١٧٨).

(١٢٠٨) اخرجه: ابن حبان (٤٥٤٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

پرسیارەدا مەبەستم هاوسەری بەرێزت نی یە، فەرمووی: ((باوکی عائیشە))، وتم ئەی پاشان کێ؟ فەرمووی: ((پاش ئەو عومەر)) وتم: لەپاش ئەو کێ؟ هەتا کۆمەڵێکی باس کرد لە دڵی خۆمدا وتم جارێکی تر پرسیاری لەوبارەوە لێ ناکەم)[١٢٠٩].

## سریەی ئیبن ئەبوحەدرەد بۆ دۆڵی (ئیضم)

لە عەبدوڵڵای کوڕی حەدرەدەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد بۆ ناوچەی (ئیضم) (کە دۆڵێکە خێڵی ئەشجەعی تێدا نیشتەجێ بوون دەکەوێتە پشت چیای ئوحودەوە) دەرچووم وەك فەرماندەری کۆمەڵێك لە موسوڵمانەکان، ئەبو قەتادەی ئەنصاری حرثي کوڕی ڕەبعی و موحلیمی کوڕی جوثامەی کوڕی قەیسیان تێدابوو، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناو دۆڵی (ئیضم) لەوێدا عامری کوڕی ئەضبطی ئەشجەعی بەسواری وشترێکەوە بەلاماندا تێپەڕی کە کەلوپەلی بەنرخ و کوندەیەك (مەشکەیەك) شیری پێ بوو، کاتێك گەیشتە لامان بە سڵاوی ئیسلام و موسوڵمانان سەلامی لێکردین، ئێمە ڕێگەمان نەدا بڕوات و گرتمان، موحەلەمەی کوڕی جوثامە هەڵی کوتایە سەری کوشتی لەبەر شتێك کە لە نێوان خۆیاندا پێشتر ڕوویدا بوو، کەلوپەلی وشترەکەشی برد کاتێك گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ودەنگ و باسەکەمان بۆ گێڕایەوە ئەو ئایەتەی خوا لەوبارەمانەوە هاتە خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ (النساء: ٩٤)[١٢١٠]. واتە: ﴿ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ لەبەر ڕێی خوا دەچنە جیهاد، یان هەرکارێکی تر دەکەن بەباشی بکۆڵنەوە لەو خەڵکەی پێیان دەگەن و لەخۆتانەوە بە کافریان دامەنێن و

---

[١٢٠٩] اخرجه: البخاري (٣٦٦٢)، ومسلم (٢٣٨٤)، والترمذي (٣٨٨٦)، وأحمد (الفضائل) (١٦٣٧)، وابي يعلى (٧٣٤٥)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٤/٤٠٠) واللفظ له.

[١٢١٠] اخرجه: أحمد (٢٣٨٨١) وقال محققه: اسناده يحتمل التحسين، والطبري (التاريخ) (٣/٣٤) وابن الجارود (٧٧٧)، والبيهقي (دلائل النبوة) (٤/٣٠٥)، وابن هشام (السيرة) (٤/٢٣٩) رقم (١١٨٠) وقال محققاه: اسناده ضعيف، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند من اسباب النزول) (ص٨٦): حسنٌ لغيره.

مەیانکوژن و ئەوکەسە داوای ئاشتیی دەکاو دەیەوێ فەرمانبەردار بێ، ئێوە پێی مەڵێن: ئیماندار نیت دەتانەوێ بەوە سامان و داراییەکی ژیانی دونیا بەدەست بهێن خۆ بەلای خواوە غەنیمەتێکی زۆرو فراوان هەیە ئێوەیش -بەر لەمە- هەر ئاوابوون و ئیمان هێنانتان هەر بەوشێوە بوو لێیشتان وەرگیرا جاخوا بەبەزەیی خۆی رێزی گرتن و منەتی نایە سەرتان و دینی خۆی سەرخست، و ئێوەش ئیمانی خۆتانتان دەربڕی جا بۆجارێکی تر پێیان دەڵێتەوە: لەکارەکانتان بکۆڵنەوە ئەوسا ئەنجامیان بدەن. واتە: پەلە مەکەن لەبڕیارداو وردو لەسەرخۆبن بەراستی خوا هەمیشە لەوکاروکردەوە دەیکەن بەئاگایەو، هەر بەپێی ئەوەش پاداشت وتۆڵەتان ئەداتەوە.﴾.

**ئەو دەنگ وباسە لە لای ئیبن عەباس ﷺ بە جۆرێك تر هاتووە و باس کراوە کە دەفەرموێت: (کەسێکی خێڵی سولەیم بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی کە مەڕی خۆی [دەلەوەڕاند] و شوانی دەکرد سڵاوێکی موسوڵمانانەی لێ کردن ئەوان بە گومانەوە وتیان: ئەوە بۆیە سڵاوی [لێ کردین] بەوشێوەیە بۆ ئەوەی خۆی ڕزگاربکات [لەدەستمان] ئەوانیش هەڵیان کوتایە سەری و کوشتیان و مەڕومالاَتەکەیان برد لەگەڵ خۆیان و بردیانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە ئەم ئایەتەی لە بارەوە دابەزاندن:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ (النساء: ٩٤)[١٢١١].

**ئەم ڕووداوە بەکورت گراوەیی هاتوە لەلای ئیبن عەباسەوە ﷺ کەدەفەرموێت: (کەسێك ڕانە مەڕێکی خۆی پێ بوو موسوڵمانەکان پێی گەیشتن فەرمووی: السلام علیکم ئەوانیش کوشتیان و مەڕو مالاَتەکەیان برد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەبارەوە دابەزاندن**

---

[١٢١١] اخرجه: أحمد (٢٤٦٢) وقال محققه: حسن لغيره، وابن ابي شيبة (٢٩٥٤٤)، والترمذي (٣٠٣٠)، وابن حبان (٤٧٥٢) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٢/٢٣٥) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٩/١٦٥)، والطبري (التفسير) (١٠٢١٧)، وقال محققه احمد شاكر: اسناده صحيح، والطبري (الكبير) (١١٧٣١)، وقال ابن كثير (التفسير) (٢/١٤٠): اسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني رحمه الله في (صحيح الترمذي) (٢٤٢٨).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ (النساء: ٩٤)[١٢١٢].

ناردنی ئەو سریەیە کەمێك بەر لە فەتحی مەککە بووە هەروەك ئیبن ئیسحاق ﷺ لەوبارەوە دەفەمویت و باسی کردوە[١٢١٣].

## سریەی ئەبو قەتادە ﷺ بۆ ناوچەی خضر

ناردنی ئەم سریەیە لە ساڵی هەشتەمی کۆچی دا بوو بەر لە فەتحی شاری مەککە، کاتێك کە هەواڵەکە گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە هۆزی غەطفان لەناوچەی (خضر) کە خاکی (خێڵی محارب)ە لە ناوچەی (نجد) خەریکی خۆ کۆکردنەوەن، ئەویش دەست بەجێ پانزە کەس یان بیست و پێنج کەسی بەسەرکردایەتی ئەبو قوتادە بۆ ناردن و هێرشیان بردە سەریان و دوو سەد وشترو هەزار مەڕ دەسکەوتیان بوو[١٢١٤]. خەڵکەکەش کەوتە ڕاکردن و بڵاوەیان لێ کرد موسوڵمانەکانیش بە سەلامەتی گەڕانەوە.

گێڕانەوەیەك هاتووە لە بارەی ئەم سریەوە لە ئیبن عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بەرەو خاکی (نجد) منیشیان لەگەڵدابووم و دەسکەوتی هەریەکەمان لە غەنیمەتەکەیان دوانزە وشتر بوو کەپێمان درابوو پاشان هەریەکەمان وشترێکی تری پێدرا کە گەڕاینەوە بە سیانزە وشترەوە گەڕاینەوە (واتە: هەریەکەمان ئەوەندەی بەرکەوت))[١٢١٥].

---

[١٢١٢] أخرجه: البخاري (٤٥٩١)، ومسلم (٣٠٢٥)، وابي داود (٣٩٧٤)، والنسائي (الكبرى) (١١١١٦).

[١٢١٣] انظر: (السيرة) لابن هشام (٢٣٩/٤).

[١٢١٤] انظر: (فتح الباري) (٥٦/٨).

[١٢١٥] أخرجه: البخاري (٤٣٣٨)، ومسلم (١٧٤٩)، ومالك (٤٥٠/٢)، وأحمد (٦٢/٢)، وابي داود (٢٧٤٤)، والدارمي (٢٢٨/٢)، وابن حبان (٤٨٣٣).

# ناوەڕۆك



| ژمارەی | بابەت | ز |
|---|---|---|
| ٣ | پێشەکی | ١. |
| ٦ | سریە و غەزاکانی نێوان ئوحود و خەندەق | ٢. |
| ٦ | سریەی ئەبو سەلەمە بۆ ناوچەی (قطن) | ٣. |
| ٧ | ناردنی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس | ٤. |
| ١٠ | ناردنی هەندێك بانگخواز بۆ (الرّجیع) | ٥. |
| ١٥ | کارەساتەکەی بیری (المعونة) | ٦. |
| ٢٣ | غەزای بەنونەضیر | ٧. |
| ٣٤ | غەزای نەجد | ٨. |
| ٣٤ | غەزای بەدری کۆتایی | ٩. |
| ٣٧ | غەزای (دومة الجندل) | ١٠. |
| ٣٩ | غەزای (بنی مصطلق) یان (مریسیع) | ١١. |
| ٤٤ | هەوڵدان بۆ هەڵگیرساندنی ئاژاوە لەنێوان کۆچکارەکان و ئەنصاریەکاندا | ١٢. |
| ٤٩ | هەڵگردنی بایەکی بەهێز بۆ مردنی سەرکردەیەکی دووڕووەکان | ١٣. |
| ٥٢ | عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی داوای مۆڵەت دەکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کوشتنی باوکی | ١٤. |
| ٥٤ | ڕووداوی ئیفك (واتە: بوختان) | ١٥. |
| ٦٦ | صەفوان لە حەسانی کوڕی ثابت دەدات | ١٦. |
| ٦٨ | ئازادکردنی گیراوەکانی (بنی مصطلق) | ١٧. |
| ٧٢ | حارث و هۆزەکەی دێنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەکاتی ماڵەکانیانەوە | ١٨. |
| ٧٥ | غەزای خەندەق | ١٩. |
| ٧٥ | هۆکاری ڕوودانی ئەم غەزایە | ٢٠. |
| ٧٨ | دەرچوونی هاوبەشی پەیداکەران بەرەو مەدینە | ٢١. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢. | خەندەق هەڵکەندن | ٧٩ |
| ٢٣. | پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا بەژداری هەڵکەندنی خەندەق دەکات | ٨٢ |
| ٢٤. | کەم بوونی خواردەمەنی لەکاتی هەڵکەندنی خەندەق | ٨٥ |
| ٢٥. | پێغەمبەر ﷺ مژدەی فەتح کردنی وڵاتی فارس ورۆم دەدات بەهاوەڵانی | ٩٠ |
| ٢٦. | کۆکردنەوەی ژن و منداڵ لەناو قەڵای بەنی حارثە | ٩٤ |
| ٢٧. | گەیشتنی سوپای موشریکەکان (بێ باوەڕانەکان) | ٩٥ |
| ٢٨. | موشریکەکان هەوڵی هێرش کردنە سەر موسوڵمانەکان دەدەن | ٩٨ |
| ٢٩. | خیانەتی بەنی قورەیظە و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی مەدینە | ١٠٧ |
| ٣٠. | زیادبوونی مەینەتی موسوڵمانەکان | ١١٧ |
| ٣١. | هەوڵدان بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ غەطەفاندا | ١٢٥ |
| ٣٢. | بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بۆ پەرتەوازەکردنی ڕیزی دوژمنان | ١٢٩ |
| ٣٣. | زانینی بارودۆخی موشریکەکان | ١٣٦ |
| ٣٤. | گەڕانەوەی سوپای موشریکەکان | ١٤٢ |
| ٣٥. | غەزای بەنی قورەیظە | ١٤٥ |
| ٣٦. | گەمارۆدانی بەنی قورەیظە | ١٤٩ |
| ٣٧. | خۆ بەدەستەوە دانی بەنی قورەیظە و ڕازی بوونیان بە حوکمی سەعدی کوڕی موعاذ | ١٥٨ |
| ٣٨. | دابەش کردنی دەسکەوتەکان | ١٦٧ |
| ٣٩. | کۆچی دوای سەعدی کوڕی موعاذ رضي الله عنه | ١٧١ |
| ٤٠. | پاشماوەی ڕوداوەکانی غەزای خەندەق | ١٧٩ |
| ٤١. | کوشتنی ئەبو ڕافیعی سەلامی کوڕی ئەبولحەقیق | ١٨١ |
| ٤٢. | سریەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بۆ لای ئەلیە سیری کوڕی ڕوزام | ١٨٨ |
| ٤٣. | سریەیی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بۆ هۆزی (بنی القرطاء) | ١٩٠ |
| ٤٤. | موسوڵمان بوونی ثومامەی کوری ئاثاڵ حەنەفی | ١٩٠ |
| ٤٥. | غەزای بەنی لحیان | ١٩٤ |
| ٤٦. | سریەی عوکاشە بۆ ناوچەی (الغمر) | ١٩٦ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٧. | سریەیی زەیدی کوڕی ئەلحارسە بۆ ناوچەی (العیص) | ١٩٧ |
| ٤٨. | سریەی (الخبط) | ٢٠٠ |
| ٤٩. | سریەکەی عەبدولڕحمانی کوڕی عەوف | ٢٠٢ |
| ٥٠. | سریەکەی عەلی کوڕی ئەبو طالب | ٢٠٤ |
| ٥١. | سریەکەی ئەبو بکری صدیق | ٢٠٥ |
| ٥٢. | سریەکەی کورزەی کوڕی جابری ئەلفهری | ٢٠٦ |
| ٥٣. | ڕێکەوتننامەی حودەیبیە | ٢١١ |
| ٥٤. | گۆڕینی ڕێگا | ٢٢١ |
| ٥٥. | خوزاعە هەڵدەستێت ناو بژیوانی نێوان موسوڵمانان و قوڕەیش دەکات | ٢٢٥ |
| ٥٦. | بارو دۆخی موسوڵمانەکان | ٢٢٨ |
| ٥٧. | ناردنی شاندێکی موسوڵمانەکان بۆلای قوڕەیش | ٢٣٢ |
| ٥٨. | بەیعەتی (رضوان) | ٢٣٥ |
| ٥٩. | شاندێکی نێردراوەکانی قوڕەیش | ٢٤١ |
| ٦٠. | دانوستان و ڕێکەوتن | ٢٤٨ |
| ٦١. | دەست درێژی تاقمێك لە موشریکەکان | ٢٥٦ |
| ٦٢. | لابردنی ئیحرام و کۆتایی پێ هێنانی عومرە | ٢٥٨ |
| ٦٣. | گەڕانەوە بەرەو مەدینە | ٢٦١ |
| ٦٤. | ڕاکردنی ئەبو بەصیر | ٢٦٨ |
| ٦٥. | نامەگۆڕینەوە | ٢٧٦ |
| ٦٦. | سودەکانی ڕێکەوتننامەی حودەیبیە | ٢٨٠ |
| ٦٧. | غەزای ذی قرد | ٢٨٣ |
| ٦٨. | غەزای خەیبەر | ٢٩٤ |
| ٦٩. | ئەو خواردنانەی موسوڵمانان لەبرسێتیدا خواردیان | ٣١٢ |
| ٧٠. | ١ـخواردنی گزوگیا و بەروبومی میوەی کاڵی پێ نەگەیشتوو | ٣١٢ |
| ٧١. | ٢ـخواردنی سیرو پیاز | ٣١٢ |
| ٧٢. | ٣ـخواردنی کەری ماڵی | ٣١٣ |
| ٧٣. | چەند ڕوداوێك کە لەلای قەڵاکانی خەیبەردا ڕوویاندا لەوان | ٣١٦ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٤. | ١-سەرکەرێکی دووڕوو(منافق) | ٣١٦ |
| ٧٥. | ٢-کۆچکەرە دەشتەکیەکە | ٣١٩ |
| ٧٦. | ٣-شوانە ڕەشەکە | ٣٢٠ |
| ٧٧. | ٤-ڕانە مەڕەکەی (ئەبوالیسر کعب بن عمرو ﷺ الانصاری) | ٣٢٢ |
| ٧٨. | ٥-ئەو پیاوەی کە دزی لە غەنیمەت کرد | ٣٢٣ |
| ٧٩. | دانوستان | ٣٢٤ |
| ٨٠. | دابەش کردنی دەسکەوتەکان (غەنیمەت) | ٣٢٨ |
| ٨١. | بەخشینی غەنیمەت بەسەر کۆیلەو ژنەکاندا | ٣٣١ |
| ٨٢. | چاکتربوونی باروذۆخی موسوڵمانان | ٣٣٢ |
| ٨٣. | ڕونکردنەوەی هەندێك لە حوکمە شەرعیەکان | ٣٣٦ |
| ٨٤. | هاتنی ئەبوهورەیرە ﷺ و سریەکەی ئیبان وهاوەڵانی | ٣٤٤ |
| ٨٥. | ڕووداوی مەڕە ژەهراوییەکە | ٣٤٦ |
| ٨٦. | فەدەك | ٣٤٩ |
| ٨٧. | دۆڵی قورا | ٣٥٠ |
| ٨٨. | هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو (صەفیە) | ٣٥٣ |
| ٨٩. | پاسەوانی کردنی هاوەڵی بەڕێز ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بۆ پێغەمبەر | ٣٥٥ |
| ٩٠. | حجاجی کوڕی علاط و خەڵکی مەککەی | ٣٥٧ |
| ٩١. | هۆنراوەی سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع | ٣٦١ |
| ٩٢. | نوستن لەکاتی نوێژی بەیانیدا | ٣٦٢ |
| ٩٣. | کەوتنی وشترەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ | ٣٦٥ |
| ٩٤. | چوونە ناو شاری مەدینە | ٣٦٧ |
| ٩٥. | گەڕانەوەی جەعفەرو ئەشعریەکان | ٣٦٩ |
| ٩٦. | پلەو پایەی کۆچکەرانی حەبەشە | ٣٧٢ |
| ٩٧. | گێڕانەوە زەوی و زارە خوازراوەکان | ٣٧٣ |
| ٩٨. | ناپاکی جوولەکە و دەرکردنیان لە خەیبەر | ٣٨٠ |
| ٩٩. | نامە ناردن بۆ سەرۆك و پادشاکان | ٣٩٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠٠. | ١-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە | ٣٩٣ |
| ١٠١. | ٢-نامە ناردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ (موقەوقس) پادشای میسرو ئەسکەندەریە | ٤٠٠ |
| ١٠٢. | ٣-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ کیسرا پادشای وڵاتی فارس | ٤٠٥ |
| ١٠٣. | ٤- نامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ هێرقل پادشای وڵاتی ڕۆم | ٤١١ |
| ١٠٤. | ٥-نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پادشای عومان | ٤٢٥ |
| ١٠٥. | ٦- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی زوهەیر | ٤٢٧ |
| ١٠٦. | ٧- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی بەکری کوڕی وائیل | ٤٢٨ |
| ١٠٧. | ٨- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەنی جوذمیە | ٤٢٨ |
| ١٠٨. | ٩- نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئوکەیدر خاوەنی ناوچەی دومە | ٤٢٩ |
| ١٠٩. | غەزای (ذات الرّقاع) | ٤٣٠ |
| ١١٠. | ١-سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵلا بۆ سەر بەنی مەلوح | ٤٥١ |
| ١١١. | ٢-سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵلای لەیثی بۆ ناوچەی (حرقات) لەبەنی جوهینە | ٤٥٣ |
| ١١٢. | ٣- سریەی عەبدوڵلای کوڕی حوزافەی سەهەمی | ٤٥٦ |
| ١١٣. | ٤-سریەی ئیبن ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بۆ ناوچەی غابە | ٤٥٩ |
| ١١٤. | عەمرەی قەضاء | ٤٦١ |
| ١١٥. | موسوڵمان بوونی کەڵە پیاوانی قوڕەیش (عەمری کوڕی عاص و خالیدی کوڕی وەلید وعوسمانی کوڕی ئەبو طەلحە) | ٤٧١ |
| ١١٦. | غەزای مؤتە | ٤٧٦ |
| ١١٧. | ماڵئاوای کردن لە سوپاکە | ٤٧٧ |
| ١١٨. | گەیشتنی سوپاکە بەمەیدانی جەنگ | ٤٨٠ |
| ١١٩. | کۆتای جەنگەکە | ٤٨٦ |
| ١٢٠. | پێغەمبەری خوا ﷺ بەوردی جەنگەکە بۆ هاوەڵانی باس دەکات | ٤٩٠ |
| ١٢١. | دڵتەنگی و ماتەمینی موسوڵمانەکان | ٤٩٣ |
| ١٢٢. | گەڕانەوەی سوپاکە | ٥٠٠ |
| ١٢٣. | پلەو پایەی سێ فەرماندەرەکە | ٥٠٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢٤. | سریەی (ذات السلاسل | ٥٠٦ |
| ١٢٥. | سریەی ئیبن ئەبوحەدرەد بۆ دۆڵی (ئیضم) | ٥١٩ |
| ١٢٦. | سریەی ئەبو قەتادە ﷺ بۆ ناوچەی خضر | ٥٢١ |
| ١٢٧. | ناوەرۆك | ٥٢٢ |

الشكل ( )

خريطة السرايا والغزوات بين أحد والخندق



الشكل ( )

خريطة يوم الرجيع



الشكل ( )

غزوة بني المصطلق شعبان ٥ هجرية



الشكل ( )

خريطة إجلاء بني النضير ربيع الأول سنة ٤ هجرية



الشكل ( ١ )

خريطة غزوة الخندق شوال ٥ هـ



الشكل (١)

خريطة غزوة الحديبية ذي القعدة ٦ هجرية



الشكل ( ١ )

خريطة غزوة خيبر محرم ٧ هجرية



الشكل ( ١ )

خريطة كتب رسول الله ﷺ إلى الملوك



الشكل (   )

خريطة عمرة القضاء ٧ هجرية

